# ئەو ئایدیایانەی کە دەستیان بەسەر جیهاندا گرت

**پرۆفیسۆر: مایكڵ ماندلبۆم**

**وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە**

**گۆران سەباح غەفوور**


**ناوی کتێب: ئەو ئایدیایانەی کە دەستیان بەسەر جیهاندا گرت**

- نووسینی: مایكڵ ماندلبۆم
- وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: گۆران سەباح غەفوور
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جمال رواندزی
- بەرگ: هۆگر سدیق
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- ژمارەی سپاردن: ٦٩٠
- تیراژ: ٥٠٠ دانە
- چاپی یەکەم ٢٠٠٦
- نرخ: ٦٠٠٠ دینار
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

**زنجیرەی کتێب -٨٩- (١٩٢)**

**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**
**www.mukiryani.com**
**asokareem@ maktoob.com**
**Tel: 2260311**

ئاشتی و دیموکراسی و بازاڕی ئازاد

له سەدەی بیست و یەکدا

پێشکەشە بە:

دایك و باوکم کە ژیانیان بە من بەخشی

کانی کە خۆشەویستی بە ژیانم بەخشی



## ناوەڕۆک

**بەشی سێیەم**

## پێشواژە

ئەم کتێبە باس لە گەمە نێودەوڵەتییەکان دەکات،  بەڵام هەمان ئەو گەمە پڕ بەڕائەتەی منالاَن نا، بەڵکو گەمەیەك پڕ لە ڕقی بەربەرەکانی، دوور لە دنیای بەڕائەت، پڕ لە کێشمە کێشی گرتنە دەستی جڵەوی دەسەڵات و کەڵکەکردنی سامان بەسەر یەکەوە. من دەبێ چەکی ناوکیم هەبێت، دەبێ دەوڵەمەند بم و بە خۆشی بژیم، بەڵام تۆ دەبێ ببی بە پرد بۆ ئەوەی من بە خۆشی بژیم و بگەم بە مەرامەکانی خۆم، تۆ هەرگیز مافی چەکی ناوکیت نییە. مافت نییە تۆ لە پێستی هەژاری بێیتە دەرەوە و کەمێك لەزەت لە دونیا بکەیت، بۆ؟!! ئەم کتێبە باس لە نەوەد ساڵ نهێنی گەمەی سیاسی بەر لە ئەمڕۆ، کاریگەری جەنگی سارد و نهێنییەکانی دەکات، باس لە کاریگەری گەمەی سیاسی لە سەر ئابووری و دیموکراسی و ئاشتی و بازاڕی ئازاددا دەکات. شیکردنەوەی گەمەی چەکی بایەلۆژی و ناوکی و ئەتۆمی و کیمیایی، هەروەها کاریگەری هەردوو شۆڕشی پیشەسازی و فەڕەنسی لە سەر ئەمڕۆ، نهێنییەکانی ئەم دوو شۆڕشە ئەم کتێبە بە پێزتر دەکەن، باس لە چۆنیەتی هاوردەدی ئاشتی و ئاسایش و سەقامگیری دەکات، دیموکراسی لە کۆی زیاتر لە دوو سەد وڵاتی جیهان چۆن سەیر دەکرێت چۆن بە جیا هەریەکەو لە ماڵی خۆی پەیڕەوی بنەماکانی دەکات؟ ئەم کتێبە شرۆڤەی کێشمە کێش و ڕکابەری وڵاتان لە نێو بازاڕە ئازادەکاندا دەکات. لە سەرووی هەموو ئەوانەشەوە، وەڵامی ئەم پرسیارانە و دەیان پرسیاری دیکەی لەم جۆرە دەداتەوە:

ئایا کێ دەتوانێت دیاردەی تیرۆر بنبڕ بکات؟ ئایا جەنگێکی ناوکی بەرپا دەبێت لە داهاتوویێکی نزیکدا؟ گەر ڕوو بدات، بۆ کەس نایباتەوە؟ ئایا ڕووسیا و چین مەترسیدارترن یان تیرۆریستان لە داهاتووی سەدەی بیست و یەکدا؟ بۆ دەبێ ئەمریکا سەرکردەی هەموو جیهان بێت؟ کاریگەربی ڕووخانی ئابووری و گەرمبوونی جیهان چییە؟ بۆچی ڕووسیا و چین جێگای مەترسین لە ئاییندەدا؟ بۆچی ئەمریکا دەبێ هەر جارەو لایەنگیری وڵاتێك بکات لە گەمەی سیاسیدا؟ بۆچی دەبێ خەڵکی بن بە گەمەی ژێر دەستی بەرژەوەندی وڵاتە زلهێزکان؟ بۆچی سەدەی بیست، سەدەی جەنگ و سەدەی نۆزدەش سەدەی شۆڕشە؟ کاریگەری جیهانگیری چییە لە سەر ئابووریی بازاڕدا؟

*وەرگێڕ*

***goforspring1@yahoo.com***

***goransabah@hotmail.com***





## پێشەکی

لە بەیانی ڕۆژی سێ شەممەی (١١ / ٩ / ٢٠٠١) دا، دوو فڕۆکەی ڕفێنراوی سەر بە هێڵی ئاسمانی بازرگانی راستەوخۆ هەڵفڕینە سەر هەردوو تاوەرە جمکانەکەی سەنتەری بازرگانی جیهان، کە هەرە بەرزترین دوو باڵەخانەن لە نیۆرك. گەرمایی تەقینەوەی هەردوو فڕۆکەکەو گڕی ئاگرەکە ستوونە پۆڵاینەکانی پرۆژە بیناکانی (چیرۆکی / ١١٠) یان تواندەوە و بەسەریەکدا کەوتن کە زیاتر لە ٢٨٠٠ کەس بوونە قوربانی. هەر لە هەمانکاتدا، فڕۆکەیەکی تر بەئاراستەی مەڵبەندی سەرۆکایەتی وەزارەتی بەرگری ئەمریکا – پنتاگۆن- لە واشنتۆن دی سی کەوتە خوارەوە.

ڕووداوەکەی یانزەی سێپتەمبەر توندوتیژترین و کاریگەرترین و سەرنجڕاکێشترین و بەهێزترین زەبری تیرۆریزمە لە مێژوودا. هێرشەکان هێندە سەرسام بوون تەواوی ویلایەتە یەکگرتووەکان و سەراپای جیهانیان هەژاند. ئاکامی هێرشەکانی یانزەی سێپتەمبەر بە پڕ ئەسرینترین کارەسات ناوزەد دەکرێت، ڕاچڵەکینێك هەموو پێوەرەکانی حوکمی لە سەرانسەری جیهان لە پڕێکدا ڕامالّی و گریمانەکانی ئاوەژووکردەوە، بە هەقیقەت هێرشەکان دەستپێکی جیهانێکی نوێ نەبوون، بەڵکو خاسیەتە سەرەکییەکانی ئەو جیهانەیان ڕۆشن کردەوە کە پێشتر وجودی هەبوو، جیهانێك بەتەواوی فۆرمەکانییەوە دە ساڵ بەر لەو ساتە هاتبووە کایەوە، بەڵام لەماوەی دوو سەدەی رابردوودا لە دروستبووندا بوو. ئەمە جیهانێکە سێ ئایدیای سەرەکی زاڵە بەسەریدا : ئاشتی وەك بنەمایەکی پەسندکراو بۆ پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان، دیموکراسی وەك ڕێگایەکی ڕۆشن بۆ ڕێکخستنەوەی رەوشە سیاسییە نێودەوڵەتییەکان، هەروەها بازاڕی ئازاد وەك ناوەندێکی زۆر گرنگ و پێویست بۆ بەرهەم هاوردەی سامان. ئەو جیهانەی کە ئاشتی و دیموکراسی و بازاری ئازاد دەستی بەسەرا گرتووە ! جیهانی سەدەی بیست و یەك بنەڕەتییەکانی، بنەماکانی تایبەتمەندییەکانی و داهاتووی ئەم جیهانە بابەتگەلێکی ئەم کتێبەن کە لە بەردەستاندایە.

کۆمەڵگاکان پەیکەرە مەزنەکانی خۆیان بەرز دەکەنەوە تاوەکو کەلتووری خۆیان پڕ بەهاتر بکەن. مادام، هەمیشە لە شارەکاندا سەرنجی بینا بەرزەکان دەدرێت، ئەوا هەردوو تاوەرە

جمکانەکەی سەنتەری بازرگانی جیهانی بەڕاستی شا پەیکەر بوون. ئەم دوو تاوەرە بۆ ئەمریکا لە سەدەی بیست و یەکدا وەك هەرەمی مەزنی گیزە (Giza) ی میسرییە کۆنەکان و کاتیدرالی چارترێسی چاخی ناوەڕاستی فەرەنسا وابوون. دەزگایەك، سەنتەری چالاکییە بازرگانییەکان بوو، بۆ بازاڕی ئازاد تەرخانکرابوو و نوێنەری بازرگانی جیهانی بوو. زەمینەیەك بوو بۆ ڕێکخستنی چالاکییە ئابوورییەکان. ئەوەی ڕاستی بێت، بازاڕ ئاقارێکی فراوانی لە کۆمەڵگای ئەمریکی داگیرکردووە.

بازاڕی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە دەرەوەش لە چڵەپۆپەیە و ڕۆڵێکی بەرچاوی هەیە، هێرشەکانی یانزەی سێپتەمبەر مەزنی و بەجیهانی بوونی ئەم بازاڕەیان سەلماند. بیناگەلێکی زۆر بەرزی تر هەن لە ئەمریکا، وەك باڵەخانەی مانهاتان (Manhattan) هەربەناوی نیۆرکەو باڵەخانەی ئیمپراتۆری ئەم وڵاتەیە. هەروەها باڵەخانەی کریسلەر (Chrysler) مەڵبەندی سەرۆکایەتی کارگەیەکی ئەمریکییە بۆ ئۆتۆمبێل لە ساڵی / ٢٠٠١ / دا بووە شەریك لەگەڵ کارگەیەکی ئەڵمانی، بەڵام ئەو باڵەخانانەی کە لە یانزەی سێپتەمبەر ڕووخێنران باڵەخانەی سادە و ساکاری بازرگانی نەبوون، بەڵکو باڵەخانەیەکی بازرگانی جیهانی بوون.

سەرەنجام، بە کڵپەی ئاگرو ڕووخانی ئەو دوو تاوەرە خەڵکی جۆراوجۆر، زیاتر لە هەشتا وڵاتی جیاجیاوە، گیانیان لە دەستدا کە زۆربەیان بۆ کۆمپانیا بازرگانییەکان وەك بەرپرس لەبواری دارایی و فەرمانبەر لە بوارەکانی تردا کاریان دەکرد.

گەر لە سەر باڵەخانەی نزمی مانهاتان بوەستین، پیشەسازی لە سەر ئاستی جیهان، لە ڕووی داراییەوە، زەبەلاحترین پیشەیە لە جیهان، چونکە خێرو بەرهەمەکەی زیاترەو قازانجی پارەی زیاتر لێ دەکەوێتەوە لە هەر پیشەیەکی تر، بەرهەمەکەی کلیلێکە بۆ گەیشتن بە بازاڕە نێودەوڵەتییەکان. ئەمە لەکاتێکدا پیشەی مەحەلی (واتە لە سەر ئاستی ناوخۆدا) دەتوانێت کار لەسەر بنەمای ئاڵوگۆڕکردن بکات، بەڵام بازاڕە نێودەوڵەتییەکان کات و شوێنی تایبەتی خۆیان هەیە بۆ داواکردنی پارەو بەگەڕخستنی.

ئەو پارەیەی کە پیشەسازی و بازرگانی نێودەوڵەتی پشتی پێ دەبەستێت لە مانهاتان (باڵەخانەیەکی نزمتر)کۆدەکرێتەوە لەوێشەوە دابەشدەکرێتە سەر کیشوەرەکان. بەم شێوەیە سەنتەری بازرگانی جیهانی سیمبولی تۆڕی ئاڵوگۆڕکردنی بازرگانی و دارایی بوو کە لە ساڵی (٢٠٠١) دا لە تەواوی سەر ئەم زەمینەدا بڵاوببووەوە. تیرۆرستان لە هەڵبژاردنی ئەم سەنتەرە



بە ئامانجی خۆیان زۆر بە خراپی بازاڕی گەرم و گوڕی ئازادیان لەنگ کردو سیستەمی سیاسی ئەمریکا و شوێنەکانی تریشیان خستەژێر مەترسییەکی گەورەوە. بەواتایەکی تر دیموکراسی، وەك پێناسی خاسیەتەکانی سەدەی بیست و یەك، خستەژێر مەترسییەوە. هێرشەکانی سەر (نیۆرك و واشنتۆن) کردەی جەنگ بوون، ئەو جەنگەی ئەوان دەستیان پێکرد، بوو بە جەنگی ئەمریکا دژی تیرۆر. بوو بە یەکەم جەنگی سەدەی نوێ. بەم هێرشە، تیرۆرستان هێرشی بەندەری پێرل (Pearl Harbor) یان خستەوە یاد کە شەست ساڵ لەمەوبەر ڕوویدا. وەك هێرشە کتوپڕەکەی ساڵی (١٩٤١) و ڕووداوی یانزەی سێپتەمبەر هەڵمەتێکی دژی هێرش بەران بەرپاکرد، لەگەڵ ئەوەشدا حکوومەتی ئەمریکای بەرەو کردەی سەربازی ڕاگوێزا. حکوومەتی ئەمریکا هێزەکانی خۆی رەوانەی ئەفغانستان کرد بۆ هەڵکێشانی رەگ و ریشەی تیرۆرستەکان و ڕووخاندنی ئەو حکوومەتەی کە پەناگەی تیرۆرستان بوو لەوێ.

جەنگی دژی تیرۆرزم بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەو جەنگە نییە کە لە/ ٧ / ١٢ / ١٩٤١ دا بەرپا بوو، یان وەك هەر جەنگێکی گەورەی دیکە لە مێژووی مۆدێرندا بۆ نموونە: جەنگی دژی تیرۆر جیایە لەگەڵ هەردوو جەنگی جیهانی لە سەدەی بیستدا، ململانێی ئەوروپا لەگەڵ هەڵگیرسانی شۆڕشی فەرەنسا لە کۆتایی سەدەی هەژدەدا دەستی پێکرد، یان ئەو ململانێی سیاسی و سەربازییەی کە چواردەیەی خایاند بەجەنگی سارد ناوزەد کرا.

لە جەنگەکانی پێشوودا دەوڵەتەکان دژی یەکتر دەوەستانەوە، هەریەکەیان بەدوای کۆنترۆڵکردنی هەرێمێکدا وێڵ بوون. جەنگەکان مەزن بوون و سوپای مەزن لە مەیدانەکانی جەنگدا دەجەنگان... ئەوەتا وۆتەرلۆ (Waterloo) ژە سەر (TheSomme) و ستالینگراد (Stalingrad) چارەنووسی نەتەوەی مەزن و ئیمپراتۆری گەورەیان هاوسەنگ هەڵواسی. لە قەیرانی موشەکی کوبی ساڵی (١٩٦٢) دا، کاتێ ویلایەتە یەکگرتووەکان و یەکێتیی سۆڤیەت ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوە لە ململانێی چەکی ناوکیدا، چارەنووسی تەواوی مەخلوقەکانی سەر ئەم ئەستێرەیە و بە تایبەتیش چارەنووسی مرۆڤ لە مەترسیدا بوو. بەم پێیە، جەنگی دژی تیرۆر بە جەنگی هەموان دادەنرێت.

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەڵمەتێکی بۆردوومانی فرۆکەیی و کردەیەکی لە ئەفغانستان ئەنجامدا بە مەبەستی پاکردنەوەی ئەفغانستان لە تیرۆریستان. مەبەستیشی لەم جەنگە پاراستنی هاوڵاتییەکانی بوو لە هێرشی تیرۆریستی. لەم جەنگەدا ئەمریکا و وڵاتانی

تر تا ڕادەیەکی کەم پشتیان بە هێزەکانی خۆیان بەست، بەڵکو زیاتر پشتیان بە ناوەندە هەواڵگرییەکان بەستا، هەروەها بە ئاژانسە بە هێزەکانی یاسای ناوخۆیی و پاڵەوانەکانی سنوور و بەرپرسەکانی گومرگ و کۆچکردن و سیستەمی گشتی تەندروستی گشتی خۆیان، لە بەر ئەوەی توڕەبوونی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە هەڵمەتی دژی تیرۆری ئەنجامدا تەنها لەسەر پنتاگۆن نەبوو کە یەکێك بوو لە ئامانجەکانی هێرشی یانزەی سێپتەمبەر.

بۆیە هێرشەکان چەند خاسیەتێکی تریان خستە پاڵ جیهانی سەدەی بیست و یەك ! ئەویش قۆناغی گواستنەوەیە، یان بەلایەنی کەم بڵێین بەها شکاندنێکی کتوپڕە، ئەم خاسیەتەش لەماوەی جەنگدا پراکتیزە کراوە. لە دوو سەدەی یەکەمی چاخی مۆدێرندا، قۆناغی گواستنەوە چێوەیەکی فراوانتری لە هەر قۆناغێکی تر بەخشی بە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان. هیچ ئەگەرێکی ئەوتۆ لەئارادا نییە کە هێرشەکانی یانزەی سێپتەمبەر ململانێیەکی لە چەشنی جەنگە مەزنەکانی چاخی مۆدێرن بەرپابکەن. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سەر تایبەتمەندیی سێیەمی جیهانی سەدەی بیست و یەکەم، لە ڕابردوودا، هەر کێشەیەك بهاتایە بەردەم بەهێزترین دەسەڵاتی سیستەمی نێودەوڵەتی ئەوا لەلایەن ڕکابەرەکانی پێشوازی لێ دەکرا، بەڵام سەبارەت بە مەسەلەی یانزەی سێپتەمبەر هەموو حکوومەتە گرنگەکانی سەرانسەری جیهان پشتگیری خۆیان بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان ڕاگەیاند. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هەقیقەتە ئاشکرایەی کە هەموو حکوومەتە بەهێزەکانی جیهان پاڵپشتی ئەو بازاڕە جیهانییەیان دەکرد کە هێرشی کرایە سەر، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش بەردی بناغەی ئەو بازاڕە جیهانییە بوو. لە کاتێکدا کەم کەس بەشداری کرد لەو بەها سیاسیانەی کە دەرئەنجامەکانی بازاڕی لوتکەی دوورگەی مانهاتان و پەیکەری ئازادییەوە دەست دەکەوت، بەڵام هەموو چاویان بڕیە ئەو بازاڕە ئازادە جیهانییەی سەدەی بیست و یەك، چونکە ئامانجێکی باڵای نەتەوەیی تیادا بەدی دەهات ئەویش ئامانجی دروستکردنی سامان بوو. بۆیە هیچ وڵاتێك نەبوو لە سەرمایەی دارایی نیۆیۆرك نەخوات، یان بەهیوای ئەوە نەبوبێت کە سوودێکی لێ وەرگرێت. سەنتەری بازاڕی نێودەوڵەتی فەرمانی بە دڵسۆزی و وەفادارییەتی سەرتاسەریدا نەك تەنها لەبەرئەوەی هەموو وڵاتێك سوودی لێوە ئەبینێ، بەڵکو لەبەرئەوەی کە هیچ ئەڵتەرناتیڤێکی ئەوتۆی درێژخایەن نەبوو بەرابەر ئەو سەنتەرە، بەڵام لە رابردوودا،



ئەوانەی ڕووبەڕووی ڕێکخستنی ڕەوشەکان دەبوونەوە، خۆیان پڕ چەك کردبوو بە پرۆگرامی ئەلتەرناتیڤ بۆ ڕێکخستنەوەی ڕەوشی ئابووری و سیاسی.

کاتێ شۆڕشی فەڕەنسا هەڵگیرسا، دروشمەکانی: سەربەخۆیی و یەکسانی و برایەتی بوون، هەروەها شۆڕشگێرەکانی سەدەی نۆزدەهەمیش دروشم و ئامانجەکانیان لە ناخەوە هەڵبژاردبوو ئەوانیش : کۆتایی حوکمی پاشایەتی و نووسینی دەستوور، دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی لەبڕی سیستەمی فرە ئیمپراتۆری بوون. هەروەها شۆڕشگێڕەکانی سەدەی بیستەمیش دروشمێکیان هەبوو ئەویش دروشمی (کرێکارانی جیهان یەکگرن) بوو، پرۆگرامەکەشیان خستەڕوو کە سەبارەت بە هەڵوەشاندنەوەی موڵکایەتی تایبەت و وەرگرتنی دەسەڵات لە لایەن حیزبە کۆمۆنیستەکانەوە بوو، بەڵام ئامادەکارییەکانی یانزەی سێپتەمبەر هیچ یەکێك لەم دروشمانەی تیا بەدی نەکرا. هیچ ئامانجێکی لە جێیان نەبوو بۆ ڕاپەڕاندنی ئەو کارەیان. کارێکی توندرەوانەیان ئەنجامدا لەژێر ناوی ئیسلام کە بە هەموو شێوەیەك دوور بوو لە وتار و نەریتە مەزنەکانی مێژووی شارستانیەتی ئیسلام. هەر جۆرە پرۆگرامێکی سیاسیان پێشکەش کردبێت گەرەکیان بووە لەسەر موسڵمانەکان جێ بە جێ بکەن کە سەدا پەنجای دانیشتوانی هەموو جیهان کە شەست بیلۆنە پێك دەهێنن. کەواتە، هێرشەکانی یانزەی سێپتەمبەر سێیەم مۆری خۆیان بە ڕووی جیهانەوە نا ئەویش ئەوەیە میتۆدە باڵاو زاڵەکان بۆ ڕێکخستنی ئەرکە جیهانییەکان و ڕەوشی ئابووری هیچ ڕکابەرێکی جدی نییە لە جیهانی سەدەی بیست و یەکدا.

لوتکەی بازاڕی ئازاد، تاڕادەیەکی کەمتر، دیموکراسی نەبوونەتە شکاندنی بەهای جەنگ، یاخود ئەلتەرناتیڤێکی شیاو بۆ ڕێکخستنی جیهان، بەڵکو دوو توخمی سەرەکی ڕێبەری ڕێگای کاروبارە مرۆیەکانن لە سەرەتای هەزارەی سێیەمدا. هەموو ئەمانە بەردی بناغەی ئەم کتێبە پێك دەهێنن.

ئەم کتێبە دابەشکراوەتە سەر سێ بەش کە چەند بابەتێك لە دەوری ئەو سێ بەشەدا دەخولێنەوە. لە پەڕەکانی دواتری ئەم کتێبەدا ڕیزبەندی بابەتە سەرەکییەکان ئاوەژوو دەبنەوە. ڕەوشی زاڵی بازاڕەکان و دەزگا پەیوەندیدارەکان و پراکتیزەکردن، دواتر گۆڕانی دراماتیکی لە جەنگدا، لە کۆتایشدا هۆکارەکانی سەرکەوتن و مسۆگەرکردنی دیموکراسی و بازاڕی ئازاد. بابەتەکان بە چەشنە زنجیرەیەك ڕێکخراون تاوەکو چیرۆکی جیهانی سەدەی بیست و یەك بە شێوەیەکی کرۆنۆلۆژی بخەنە ڕوو. بەشی یەکەمی کتێبەکە باسی ڕابردوو دەکات - بەشی دووەم

- دەربارەی ئێستایەو بەشی سێیەمیش باس لە داهاتووی جیهان دەکات کە بەهۆی هێرشی یانزە سێپتێمبەرەوە پێش هات. ئەم کتێبە کە لە بارەی جیهانی سەدەی بیست و یەکە بە پوختەیەکی بنەڕەتە مێژووییەکان دەست پێ دەکات لەبەر سێ هۆ : یەکەم - ماوەی مێژوویی بۆ نموونە : کەسایەتییە نێودارەکان و ئەزموونەکانیان لە ڕابردوودا کە بایۆگرافیانە ڕوون کراوەتەوە، هەروەها بەشی یەکەمی (ئەو ئایدیایانەی کە دەستیان بەسەر جیهاندا گرت) لەسەر کورتە باسێکی مێژوویی ڕێکخستنی نێودەوڵەتییە کە ڕووداوەکانی یانزەی سێپتەمبەر لەسەرووی هەموویانەوەیە.

دووەم - جیهانی سەدەی بیست و یەك ڕەگێکی قوڵی داکوتاوە، چونکە بەرهەمی دووسەدەی پڕ لە ڕووداوی مێژووییە، کە ئەمەش یارمەتیمان دەدات بۆ شیکرنەوەی هێرشەکان بۆ سەر ویلایەتە یەکگرتووەکان و ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە ئەو هێرشانە شکستیان بە جیهانی سەدەی بیست و یەك نەهێناو بەڵکو خاسیەتە سەرەکییەکانی بۆ ماوەیەك درێژەی دەبێت.

سێیەم - ئەو هێزانەی کە ڕێکخستنی بازاڕی زاڵی نێودەوڵەتیان دروستکرد ناوەستن لە پاڵپشتکردن و پشتگیریکردنی ڕووخانی کۆمۆنیست — بەڵکو ئەو هێزانە وەك بەهێزترین دەسەڵاتی جیهانی سەدەی بیست و یەك دەمێننەوە، هەر لەبەر ئەم هۆیەش ڕابردوو وێنەیەکی داهاتوومان پێ دەبەخشێت، چاخی مۆدێرن تەمەنی دوو سەد ساڵە و جیهانی سەدەی بیست و یەکیش دواهەمین قۆناغیەتی. بەشی یەکەم لە ناوەڕاستی چیرۆکەکە دەست پێ دەکات لەگەڵ ئەو ئایدیایانەی کە لەلایەن سەرۆکی ئەمریکا (ودرۆ ویلسون) وە (Wood Roe) خراونەتە ڕوو سەبارەت بە جەنگی جیهانی یەکەم وەك بنەما بۆ ڕێکخستنەوەیەکی باشترو نوێی نێودەوڵەتی. هەشت دەیە دواتر ئەم ئایدیانە — ئاشتی و دیموکراسی و بازاڕی ئازاد — دەستیان بەسەر کاروباری نێودەوڵەتی داگرت (لەو ڕووەی نا) کە هەر یەك لەو ئایدیانە بەپەرۆشەوە لە ئامێزگیران و بەدڵسۆزییەوە لە هەموو شوێنێك هەوڵی جێ بەجێ کردنیان و پەیڕەوکردنیان درا بەڵکو لەو ڕووەوەی کە هیچ ڕکابەرێکی سیاسی ئەوتۆیان نەبوو پاش ئەوەی ویڵسن بۆ یەکەم جار ئەو ئایدیانەی پێشکەش بە جیهان کرد، لە دوو ململانێی یەك بەدوای یەکدا (سێینەی ویڵسن) (Wilsonian Triad) زۆر خوازراو بۆ دەستەبەرکردنی سەرکەوتنێکی جیهانی. یەکێك لەو دوو ململانێیە، جەنگی جیهانی دووەم بوو کە خوێناویترین ململانێیە لە مێژووی مرۆڤدا. ئەوەکەی تر، ئەو ململانێ درێژدادڕەی کە بەسەر کەوتنی لیبراڵەکان کۆتایی هات بوو





ئەویش ململانێی هاوکێشەکانی ویڵسن بوو بۆ ڕێکخستنی ڕەوشی سیاسی و ئابووری و مسۆگەرکردنیان لە جیهانی وڵاتە سەروەرییەکاندا. ململانێی دووەم کە پێی دەوترێ جەنگی سارد بابەتی چاپتەری دووەمە کە لە ناخیدا دژایەتییەك هەیە دەیخاتە ڕوو، جەنگی سارد هەمان کاریگەری ململانێ مەزنەکانی سەردەمی مۆدێرنی هەیە، گۆڕانکارییەکی زۆر لە زۆربەی حکوومەت و سنوورەکانی جیهاندا دەکات، بەڵام بەبێ ئەوەی میتۆدێکی چڕوپڕی جەنگی هەبێت. کاریگەرییەکانی جەنگی سارد ڕووداوێکی جیابوون لە ململانێکانی تر، چونکە یەکێکە لە هەرە کۆنترین پرۆسەی مێژوویی: بڵاوبوونەوەی ئایدیاو دەزگا و پراکتیزەکردن و بەرهەمی نوێ لەنێو وڵاتانی ناوەوەی جیهان[*] (The world's core) دەگوازرێنەوە بۆ وڵاتانی دەرەوەی جیهان (peripgrey) و بەکاریان دەهێنن، وڵاتانی ناوەوە و دەرەوەی جیهان لە وڵاتە سەروەرییەکان لە دایك دەبن کە هەمان گرنگی ڕابردوویان هەیە لە سەدەی بیست و یەکدا ئەمانەش بابەتی چاپتەری سێیەمن کە نەخشەیەکی سیاسیی جیهانی هاوچەرخ دەخەنە ڕوو. هەروەك لە رابردووشدا هەندێ وڵات لە هەندێکی دیکە گرنگتر بوون.

ئەڵمانیا و ژاپۆن لە وڵاتانی ناوەوەی جیهانن و گرنگی تایبەتی خۆیان هەیە، چونکە گوتاریان بۆ بازاڕی ئازاد و دیموکراسی و ئاشتی لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا، پاش ئەوەی جەنگ لە دژیان بەرپا بوو لە نیوەی یەکەمی هەمان سەدە، کاریگەری بێ وێنەیان لەسەر مێژووی مۆدێرندا هەبوو، گۆڕانی ئەوان لە دوژمنایەتییەوە بۆ پاڵەوانانی لیبراڵیزم بە شێوەیەکی فراوان بناغەی سێینەی وێڵسنیان لە جیهان بەهێزکرد و هەروەها پێشینەیەکیشیان بە داهاتوو پێشکەش کرد تاوەکو ئەوانی دیکەش بەدوای پێوەرە لیبراڵییەکان بکەون.

زلهێزترین و بەتەمەنترین ئەندامی جیهان لەسەر تاسەری سەدەی بیست و یەکدا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە، ئەمریکا لەناو زلهێزەکان بەهێزترینیانە، بۆیە هێرشێك بۆ سەر پایتەختی سیاسی ئەمریکا کە واشنتۆنە و سەنتەری ئابووری کە نیۆرکە بەرێکەوت نەبوو. ویلایەتە یەکگرتووەکان خاوەن گەورەترین دەسەڵاتی ئابووری و سەربازییە و قورسترین

* مەبەست لە وڵاتانی ناوەوەی جیهان ئەو وڵاتانە دەگرێتەوە کە لە ڕووی ئابوورییەوە دەوڵەمەند و بەهێزن وەك ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ژاپۆن. هەروەها مەبەستیش لە وڵاتانی دەرەوەی جیهان ئەو وڵاتانە دەگرێتەوە کە لە ڕووی ئابوورییەوە بێهێز و هەژارن وەك رووسیا و چین. (وەرگێڕ)

بەرپرسیارێتی لە ئەستۆدایە بۆ بەرگریکردن و پاڵپشتکردنی دەزگا و پراکتیزە جیهانییەکان کە دەبنە هۆی دەستەبەرکردنی سێینەی ویلسن، چارەنووسی لیبراڵی جیهانی تاڕادەیەکی زۆر پشت دەبەستێت بەوەی تا چ رادەیەك ئەمریکا دەتوانێت ئەو بەرپرسیارێتیانە جێ بە جێ بکات ئەمەش لە چاپتەری سێیەم باس دەکرێت. زۆربەی وڵاتانی دەرەوەی جیهان لە ئاست کاروباری نێودەوڵەتیدا بەکەم سەیر دەکرێن هەرچی گۆرانکارییەك لە سنووردا بکرێت تەنها کار لەوان دەکات، بەڵام لە یاسای دوای جەنگی ساردا، سێ بیرۆکە لە ئارادایە. یەکەمیان هەرێمەکە واتە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. دووەکەی تر هەردوو وڵاتی سەرەکی (ڕوسیا و چین) ن کە بە دوو وڵاتی دەرەوەی جیهان دادەنرێن لە ڕووی ئابوورییەوە، بەڵام لە ڕووی ئاسایشەوە بەزلهێز سەیر دەکرێن. شان بەشانی سیاسەتەکانی ئەمریکا، داهاتووی نەتەوەیی ڕوسیا و چین کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر جیهانی سەدەی بیست و یەك و ئەوانی تردا دەبێت. هۆیەکەشی ئەوەیە کە جیهان بە دەسەڵاتی زل و ئایدیای فراوان دەچێت بەڕێوە، تیرۆرستانی یانزەی سێپتەمبەر نە دەسەڵاتی زل و نە ئایدیای فراوانیان هەبوو، بەڵام ڕوسیا و چین بە زیادەشەوە دەسەڵاتی زل و ئایدیای بەرفراوانیان هەیانە.

لە دەیەی یەکەمی سەدەی نوێدا هیچ یەکێکیان هێزی سەربازی و دەسەڵاتی ئابوورییان بەو شێوەیە نەبوو کە بەرەنگاری مەیدانی ئێستای نێودەوڵەتی ببنەوە، بەڵام هەردووکیان دەتوانن هەردوو هێزی سەربازی و ئابووری بەدەست بێنن لە داهاتوودا. هیچ یەکێکیان ئەلتەرناتیڤێکیان بۆ سێینەی ویلسن پێشکەش بەجیهان نەکردووە، بەلکو هەلگری چەند بیروباوەرێکی سیاسی جوداو دژبە پراکتیزەکردنی بەها لیبراڵییەکانی ودرۆ ویلسن بوون، دواتر، ئایدیۆلۆژیای نالیبراڵیان (illiberal) ژێرکەوت و هەریەکە لە ڕوسیا و چین دەستیان لەو ئایدیۆلۆژیانە هەلگرت، بەڵام لە ئۆرتۆدۆکسی کۆمەنیزمدا هیچ یەکێکیان سێینەی وێلسنیان لە باوەش نەگرت، هەریەکەیان چەشنە سیاسەتێکی دەرەوەیان خستەڕوو کەبە تەواوی ئاشتیخوازانە بوو، سیاسەتە ناوخۆییەکانیشیان بەرێگایەکی نیمچە دیموکراسی پەیڕەوکرد و سیستەمێکی ئابووریشیان بەکاربرد کەزۆر بازاڕی نەبوو، بۆیە ڕوسیا و چین دەتوانن مەیدانی نێودەوڵەتی بهەژێنن گەربیانەوێ و سووربن لەسەر دژایەتیکردنی، کەچی تیرۆرستانی یانزەی سێپتەمبەر نەیانتوانی ئەو کارە بکەن، داهاتووی هەر یەکێك لەمانە بابەتی سەرەکی ئەم کتێبەیە و بەتایبەتیش لە بەشی دووەمدا باس لەمانە و جەنگ و ئاشتی کراوە.





لە چیرۆکی (گڕی زیوین) (Silver Blaze) ی ئارسەرکۆنان دۆیلی (Arthur Conan Doyle)، شارلۆك هۆڵمز ئاگادارییەك بڵاودەکاتەوە لەبارەی (ڕووداوێکی نامۆی سەگێك لە شەودا) کەچی سەگەکە لەشەودا هیچ شتێکی نامۆی نەکرد و نەشحەپی پاشان هۆڵمز وتی : (ئەوە ڕووداوە نامۆکە بوو کە سەگەکە نەحەپی). لە جیهانی سەدەی بیست و یەکدا، جەنگی گەورە سەگێکی بێ حەپەیە.

بێ دەنگی سەگەکە کلیلێکە بۆ هۆڵمز— بۆ گەڕان بەدوای نهێنییەکان، بەهەمان شێوەش بارودۆخی گۆڕاوی جەنگی سەرەکی زۆر گرنگە بۆ تێگەیشتن لە جیهانی سەدەی سێیەمی چاخی مۆدێرن. لە تەواوی ئەم چاخە و زۆربەی مێژووی تۆمارکراوی پێش ئەو چاخەش هەقیقەتی یان هەڕەشەی جەنگ کاریگەرییەکی مەترسیدار و گەورەی لەسەر کاروباری دەرەوە و ناوەوەی وڵاتە سەروەرییەکاندا هەبووە. قسە نەستەقەکەی مێژوونووسی یۆنانی کۆن هێرا کلیتەس (Heraclitus) راست دەرچوو کە دەڵێ : "جەنگ باوکی هەموو شتەکانە".کەمترین ئەگەری ڕوودانی ململانێیەکی لەم جۆرە بەهۆی جەنگی ساردەوە سەدەی بیست و یەك بەدوور دەگرێت لە هەردوو چاخەکەی دوای خۆیدا.

شکاندنی بەهاکانی جەنگ خاسیەتێکی گرنگی جیهانی سەدەی بیست و یەکە بە قەد گرنگی هەڵسان و بەگەرخستنی بازاڕ. بە هەقیقەت هەردووکیان تێکهەڵکێشراون : کاتێ بازرگانیە سەرەکییەکانی حکوومەتەکان دەبنە بەرگرییەك بۆ سەروەری سنوورەکانیان، مەیدانەکەش پاك دەکرێتەوە بۆ ئەوەی پاراستن و بەرەوپێشبردنی ئەرکی بازاڕی ئازاد ببێتە بەرپرسیارێتییەکی گرنگی ئەو حکوومەتانە. ئێستاشی لەگەڵدا بێت، ئاشتی دوورە لە جیهان، لە کاتێکدا سەدەی سێیەمی چاخی مۆدێرن ئاشتی خوازترە لە هەردوو سەدەکەی پێش خۆی.

تۆڕی تیرۆرستی کە بنکەکەی لە ئەفغانستان بوو بەرپرسن لە هێرشەکانی یانزەی سێپتەمبەر. ئەفغانستان بە ململانێیەکی بە زەبری چەك تێکشکێنرا، هیچ لێکدانەوەیەك لەدوای جەنگی ساردا تەواو و شیاو نابێت بەبێ مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو شوێنانەی کە ململانێی تێدا بەردەوامە و لەگەڵ ئەو هۆیانەی کە دەبنە بەردەوامبوونی ئەو ململانێیانە. وێڕای ئەوەش شکاندنی بەهای ململانێ چەکدارییەکان بگات بەهەر شوێنێك، ئەوا هیچ وڵاتێك ناتوانێت بەتەواوی واز لەو کاروبارانە بهێنێت کە داهاتووی ڕەوشی نێودەوڵەتی جیهانی سەدەی بیست و یەك تەواو پشت ئەستوورە بەچۆنیەتی جێبەجێکردنی ئاشتی لەو شوێنەی کەلێیەوە هاتووە.

بەهۆی داهێنانی سیاسەتەوە دەبێ بەهاکانی جەنگی گەورە تێك و پێك بشکێنرێن، چونکە شکاندنی بەهای جەنگ زۆر گرنگە بۆ پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان هەروەك چۆن بازاڕی ئازاد بۆ ئابووری و دیموکراسیش بۆ سیاسەت گرنگن. لە ئەوروپا توندوتیژییەکی ڕێکخراو لە ماوەی پێنج سەدەدا پێش سەدەی بیست و یەك پێشهات، هاوکێشەیەکیش بۆ ئاشتی لە سەدەی بیستەمدا هاتەکایەوە. ئەو هاوکێشەیەش ئاسایشی گشتییە و دوو بنەمای هەیە : شەفافیەی هەموو هێزە سەربازییە نەتەوەییەکان و کردە سەربازییەکان، هەروەها ئامادەکردنی ئەو هێزە سەربازیانە بە شێوەیەك تەنها بۆ بەرگریکردن نەك هێرش کردن بەکاربێن. ئاسایشی گشتی لە ئەوروپا بابەتی چاپتەری چوارەمە.

هەرچەندە بنەماکان بە شێوەیەکی جیهانی کردەین، بەڵام تەنها وڵاتە ئەوروپییەکان و وڵاتانی ئەمریکای باکوور ئیرادە سیاسییەکانیان گردکردۆتەوە و بەکاریاندەهێنن. ئەو بڕیارەی کە بۆ ئاسایشی گشتی درا سەرچاوەی گرتبوو لە ژمارەیەك بیروبۆچوون لەسەر ململانێی چەکداری کە لێرەدا پێی دەڵێین (بێ جەنگی) (warlessness)، ئەوروپییەکان و ئەمریکییەکان بنەماکانی (ئاسایشی گشتی) یان جێبەجێکرد لە ڕێگای سازدانی زنجیرە ڕێکەوتننامەیەك بۆ سنووردار کردنی چەك کە لە کۆتایی جەنگی ساردا دەستەبەر کرا. بیروڕاکان لەمەڕ گەشە و بڵاوبوونەوەی بێ جەنگی لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا لە خۆرئاوا گەڵاڵە بوو.

پابەندبوون بە پاراستنی ئاسایشی گشتی لەسەرەتای سەدەی نوێدا لە سەرانسەری ئەوروپا نەهاتبووە کایەوە، شلۆقترین سیاسەت لە ڕوسیا، سیاسەتی ئاسایش بوو کە لە چاپتەری چوارەم باس کراوە. سەرەڕای ئەوروپا کە دەکرا جەنگێکی وێرانکەر تیایدا دەست پێ بکات، جەنگێك کە نەك تەنها باڵەخانە بەرزەکانی تێك و پێك شکاندبا، بەڵکو یاسای نێودەوڵەتیشی دەهێنایە هەژان، بنەماکانی ئاسایشی گشتی بە شێوەیەکی تۆکمە لە هیچ هەرێمێکی تر پەیڕەو نەدەکرا جگە لە ڕۆژئاوای ئاسیا نەبێت. ڕوانگەکان لەمەڕ شەڕ و ئاشتی لەم هەرێمەدا (ئاسیای خۆرهەڵات) بابەتی چاپتەری پێنجەمە.

سەبارەت بە کێشەکانی شەڕو ئاشتی لە ئاسیای خۆرهەڵاتدا، چین هەمان ڕۆڵی ڕوسیای هەیە کە لە ئەوروپا دەیگێڕێ. هەروەها بەردەوامیش دەبێت لەسەر پەیڕەوکردنی ئەو بنەمایانەی کە دەبێتە هۆی بەرپابوونی جەنگ لە دەرەوە، چونکە لەسەردەمی ئۆرتۆدۆکسی کۆمۆنیست ئەو بنەمایانە سەرکەوتوو بوون، بەڵام هەردوو وڵات چین و ڕوسیا زۆر کەم پابەندن بە ئاشتی لەچاو



دراوسێکانیان و هەریەکەشیان بەو وڵاتانە دەژمێردرێن کە سیاسەتی دەرەوە و سەربازیان زۆر گرنگە بۆ ئاشتی لە ناوچەکە. لەبەرئەوەی بنەماکانی ئاسایشی گشتی بەباشی نەچەسپێندراون لە ئاسیای خۆرهەڵات لەچاو ئەوەی لە ئەوروپا چەسپاوە، هەلی ڕوودانی جەنگێکی گەورە لەم هەرێمە زیاترە بەتایبەتی لەدوو بەشی هەرێمەکەدا کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕاستەوخۆ بەرژەوەندییەکانی لەم دووبەشەدا دەبینێتەوە، یەکەم نیمچە دوورگەی کۆریا کە ڕاستەوخۆ پەیوەست نییە بەچین. ئەوەکەی ترگەرووی تایوانە (Taiwan Strait)، بەترسناکترین ناوچە دادەنرێت، چونکە ڕاستەوخۆ وڵاتی چین بە شێوەیەکی گشتی تێوەدەگلێنێت، زۆربەی وڵاتانی ناوەوەی جیهان بەهۆی جەنگی ساردەوە بەرەو ئاشتی هەنگاو دەنێن، لەهەمانکاتدا زۆربەی وڵاتانی دەرەوەی جیهانیش بە پێچەوانەی ئەوان زیاتر ڕوو لە توندوتیژی دەکەن. کۆتایی جەنگی سارد لە وڵاتانی دەرەوەی ئەوروپا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بووە هۆی ئاوسانی توندوتیژی. چۆنیەتی و هۆی ڕوودانی ئەمەش لە چاپتەری شەشەم شی کراوەتەوە. هۆیەکیان ئەوەیە کە لەگەڵ کۆتایی هاتنی ململانێی ئەمریکا و یەکێتیی سۆڤیەت لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا جۆرە هەڵواسینێك بە شێوەیەکی کاتی لەو زلهێزە پەیدابوو کە زاڵ بوو بەسەر پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان بۆ چەند سەدەیەك، ئالێرەدا وڵاتانی ناوەوەی جیهان هیچ بەرژەوەندییەکیان لەگەڵ وڵاتانی دەرەوەی جیهاندا نەما بۆیە هیچ کارێکیان نەکرد بۆ وەستاندنی توندوتیژی لەو ناوچانەدا، بەڵام پچڕانی پەیوەندی لە سەدەی بیست و یەکدا لە نێوان هەردوو بەشە سەرەکییەکەی سیستەمی نێودەوڵەتیدا، هەرێمێکی ناوازە و زەق قووت دەبێتەوە ئەویش ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە (Middle East) هەروەکو لە چاپتەری حەوتەمدا باس کراوە، وڵاتانی ناوەوەی جیهان لەسەرووی هەمووشیانەوە ویلایەتە یەکگرتووەکان ناچاربوون بەرژەوەندییەکانیان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بدۆزنەوە، چونکە ئەو هەرێمە سێ سەرچاوەی زۆر بەهێزی تێدایە کە بوونە هۆی زیانێك بۆ بەهێزترین و دەوڵەمەندترین ئەندامی سیستەمی نێودەوڵەتی.

یەکەمیان / تۆڕەکانی تیرۆرستان کە بەهۆی یانزەی سێپتەمبەرەوە بەدیارکەوتن بەتایبەتی ئەو تۆڕەی کە بەرپرسیارە لە هێرشەکانی بۆ سەر نیۆیۆرك و واشنتون، ئەوەی دیکە، نەوت و سەرچاوە کانزاییەکانە کە بەسوودترین گەنجینەن لە جیهان بەشێوەیەك ئابووری جیهانیان لەسەر بەندە. دەستێوەردان لە سامانی نەوت لەلایەن وڵاتانی ناوەوەی جیهان، جیهان بەجەنگەوە دەبەستێتەوە. سێیەم سەرچاوەی ڕووخێنەر لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا چەکی بەکۆمەڵ کوژ بوو

سەرەڕای هەموو چەکە ناوکییەکان، ئەم چەکانە بەهۆی داهاتی زۆری نەوتەوە بەدەست هێنراون و تیرۆریزمیشی چالاك کردووە، هەڕەشەی هەریەکێك لەوسێ سەرچاوەیە لە چاپتەری حەوتەمدا باس کراوە.

ئایا ئەو ڕوانگانە چین کە ئەوروپا و ڕۆژهەلاتی ئاسیا بەهۆیەوە بە ئاشتی دەمێننەوە و ولاتانی دەرەوەی جیهانیش بە تایبەتی لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا لە سەدەی بیست و یەکدا ئاشتی دەستەبەر بکەن؟

ولاتانی ناوەوەی جیهان بەتایبەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان بە ئایدیاکانیشیانەوە پشت دەبەستن بەگەشە سەندنی هەردوو بەشەکەی تری سێینەی ویلسن کە حکوومەتی دیموکراتی و ئابووریی بازاڕی ئازادن. ئەمانە بابەتی بەشی سێیەمی ئەم کتێبەن. باس کردن و شیکردنەوەی ئەسڵەکانی جیهان لە سەدەی بیست و یەکدا لەبەشی یەکەم و گەڕان بەدوای مەرجە پێناس کراوەکانی شکاندنی بەهای جەنگ لەبەشی دووەم، کتێبەکە دەپەڕێتەوە بەشی سێیەم بۆ باسکردنی دوو خالی هەرە گرینگ ئەوانیش دیموکراسی و بازاڕی ئازادن کە لە ژێر سایەی هێرشی / ١١ / ی سێپتەمبەری / ٢٠٠١ / دا زەق بوونەوە. تێگەیشتن لە جیهانی سەدەی بیست و یەك ولاتانی ناوەوەی جیهاندا ڕەنگ دەداتەوە، یان بلێین تێگەیشتن لە مێژووی تیۆری لیبرالی دوو وتە دەگرێتە خۆ، یەکەمیان (دیموکراسی بە ئاشتی دەبێتە هۆی خێرا جێبەجێکردنی سیاسەتی دەرەوە) ئەوەی دیکە (لە هەر شوێنێك بازاڕی ئازاد هاتە کایەوە ! ئەوا کۆششێکی گەرەکە بۆ پەرەپێدانی) چاپتەری هەشتەم هەردوو وتەکە تاقی دەکاتەوە و بەتایبەتمەندی زۆر گرنگ دایاندەنێت و باسی شەرعییەتیان دەکات. تا هەرچ ڕادەیەك ئەو دوو وتەیە شەرعی بن ئەوا سیاسەتی دەرەوە و ناوەوە لە سەدەی بیست و یەك ئەوەندە پشت دەبەستێت بە ئابووری داهاتووی پەیوەندییە نێودەولەتییەکان و ژیانی خەلکی گشتیش لە جیهانی ولاتە سەروەرییەکاندا دەوەستێتە سەر چارەنووسی میتۆدی لیبرالی بۆ ڕێکخستنی چالاکییە ئابوورییەکان و بازاڕی ئازاد.

لەسەرەتای سەدەی بیست و یەکدا، دوو شتی گرنگ ڕاست بوون دەربارەی ڕەوشی بازاڕی ئازاد، یەکێکیان، بازاڕی ئازاد بەپێی میتۆدی ڕێکخستنی ئابووری لە لوتکەی خۆیدا بوو لە جیهان، خەریك بوو وەك پەسندکردنی وجودی مێژووی مرۆڤ بازاڕی ئازادیش ئاوا پەسند بکرێت، چاپتەری نۆیەم باسی زالبوونی بازاڕ بەسەر جیهاندا دەکات و شی دەکاتەوە. دووەمیان دروستکردن و پاراستنی بازاڕی ئازاد وەك دروستکردن و پاراستنی چاخی مۆدێرن ئاستەم و



قورس بوو. لەئەنجامدا هەموو ولاتە خاوەن سەروەرییەکان هەولی ئەوەیاندا، بەلام هەریەکە و بەپێی توانای خۆی لەم هەولەدا سەرکەوت. سەبارەت بە ئەزموونەکانی چین و ڕوسیاش چاپتەری دەیەم باس لە ئاستەمی دامەزراندن و چالاك کردنی بازاڕی ئازاد دەکات.

دروستکردنی بازاڕێکی ئازادی چالاك دەوەستێتە سەر هەول و کۆششەکانی کۆمەلگا و هەندێ جاریش حکوومەت . هەروەها دەوەستێتە سەر پێویستی یاسای ئابووری نێودەولەتی، بەتایبەتی ئەو یاسا و دەزگایانەی کە بۆ گواستنەوەی کەل و پەل و پارە لە نێوان سنوورەکاندا دانراون. مێژووی ئابووری جیهانی سەدەی بیستەم فێری ئەوەمان دەکات کە ئابووری نەتەوەیی تا ڕادەیەك بەرەوپێش دەچێت گەر پەیوەندی بکات بە بازاڕی جیهانی. ڕووخانی بازاڕە نێودەولەتییەکان لە سستیە ئابوورییە درێژخایەنەکەی (Great Depression) ی سالانی سییەکان (1930s) کە گەورەترین کارەساتی ئابووری بوو سەرچاوەی گرت و دواتریش هەر ئەو کارەسات کاریگەری و ڕەنگدانەوەی سیاسیشی لەسەر هەموو جیهان هەبوو. ڕووخانی سەدەی بیست و یەکیش ئابەم شێوەیە وێرانکەرترو ڕوخێنەرتر دەبێت لەبەرئەوەی یاسای ئابووری نێودەولەتی دروست کراوی ولاتانی ناوەوەی جیهانە.

پاراستنی بەردەوامی ئەو یاسایەش بەرپرسیاریەتێکی ولاتانی ناوەوەی جیهانە بەتایبەتی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا. چاپتەری یانزەهەم باس لەپەرەسەندنی سیستەمی بازرگانی و پارە دەکات، هاوکات چاپتەری دوانزەهەم ڕوانگەی ئەو سیستەمانە لە سەدەی بیست و یەکدا هەلدەسەنگێنێت. لەهەمانکاتدا ئامانجی هێرشەکانی یانزەی سێپتەمبەر ناخی یاسای نێودەولەتی بوو لە سەدەی بیست و یەکدا، کاریگەری ئەو هێرشانە وەك ساتمەیەکی زۆر خراپ بەسەر بەردێکەوە، سەرسامی و ئازارێکی زۆریان نایەوە، وایان کرد هەموو جیهان بوەستێت لەسەر پشکنین و چارەسەرکردنی زامدارەکان. هۆشیار و ئاگادارکردنەوەیەکی چڕوپڕیان بەرهەم هێناو هەول درا کارەساتێکی لەم جۆرە هەرگیز ڕوونەداتەوە، بەلام بەهۆی ئەم هێرشانە جیهان وەك پێشتر هەروەك خۆی بەردەوام بوو، تیرۆرستەکان توانیان تاوەرە جمکانەکە بڕووخێنن کە سەنتەری بازرگانی جیهانی بوو، بەلام نەیانتوانی ئەو سیستەمە هەلوەشێننەوە کە ئەو بالەخانانەی بە شێوەیەکی زۆر پتەو تۆکمە لەسەر دروست کرابوو، نەیانتوانی ئەو ئایدیاو ئەزموونانە پووچەل بکەنەوە کە تیرۆر هەرگیز پەی پێ نابات و ناپڕوخێنێت. تیرۆر وەك

کێشەیەکی جدی دەردەکەوێت، بەڵام نەك وەك هەڕەشەیەك لە جیهانی سەدەی بیست و یەکدا هەروەها هەڕەشەیەکیش نییە لەسەر سێینەکەی ویلْسن کە دیموکراسی و ئاشتی و بازاڕی ئازادن.

دەرەنجامی کتێبەکە تێڕوانینێکی گشتی دەخاتە ڕوو بۆ سەرچاوەکەی تری لێك ترازان، کە زۆربەیان ڕەگیان داکوتاوە لە نێو وڵاتانی خاوەن سەروەری بۆ بەکاربردنی پڕاکتیزەکردن و دەزگاکانی سێینەی ویلْسن، تەنانەت گەر خۆزگەی ئەنجامدانی ئەو کارەشیان هەبێت ئەوا هەڕەشەکان ئەوانەی لە چاپتەری دواتریش باس کراون دەگرێتە خۆ بۆ نموونە : چارەنووسی نەتەوەیی ڕوسیا و چین و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بڵاوبوونەوە و بەکارهاوردەی چەکی بەکۆمەڵ کوژ، ڕووخان و شکستی ئابووری جیهانی هەروەها ئەمەش دەگرێتەوە : زیادکردن و گەشەی نایەکسانی سامان لە نێوان وڵاتانی ناوەوە و دەرەوەی جیهان. هەروەها جیهان دووچاری گۆڕانێکی گەورەش دەبێتەوە کە ئەویش گۆڕانە لە پلەی گەرمی کەش و هەوای زەویدا بە چەشنێك کە هەموو وجودەکانی ژیان لە تەواوی سەر گۆی زەوی لێك دەترازێنێت گۆڕانەکەش ڕوودەدات بەهۆی فراوانبوونی جیهان نەك بەهۆی ژێرکەوتنی چالاکی پیشەسازی بازاڕ.

ڕەنگدانەوەی کۆتایی ئەو هەموو مەسەلەیە وتەکەی (یۆگی بێرا / Yogi Berra) فەیلەسوفی ئەمریکی و یاریزانی بەیس بۆل دووپات دەکەنەوە کە دەڵێ : (هەرگیز پێشبینی مەکەن، بەتایبەتی دەربارەی داهاتوو) لەم ڕووەوە، دەرەنجام و چاپتەرەکانی دواتر وەك یاری بەیس بۆڵن، کە دەتوانرێت یاساکانی وەسف بکرێت، باسی مەرجەکانی گۆڕەپان و یاریزانە گرینگەکان و ستراتیژیە سەرەکییەکانی بکرێت، ڕەنگە بشتوانرێت پەی بە ئەنجامەکەی ببرێت. بەهەمان شێوە هەر خوێنەرێك کە ئەم کتێبە دەخوێنێتەوە دەتوانێ لە ڕێگەی پەڕەکانی ئەم کتێبەوە پێشبینی بکات سەبارەت بە مێژووی جیهانی سەدەی بیست و یەك، بەڵام ناتوانێ پێشبینی ئەنجامەکەی بکات.

# بەشی یەکەم

# جەنگی سارد و دەرهاویشتەکانی

"ئەڵمانەکان بە (٢٠) ڕۆژ فەرەنسایان داگیرکرد، کەچی ئەمە وا بۆ دوو ساڵ دەچێت، ئەمریکا هێشتا نەیتوانیوە زاڵ بێت بەسەر کۆریایەکی ئاوا بچووك، ئەمە چ جۆرە بەهێزییەکە؟ چەکە سەرەتاییەکانی ئەمریکا لە لایەك و... گۆرەوی و جگەرە و شتومەکی بازرگانیشی لە لایەکی ترەوە، دەشیانەوێ هەموو جیهان ببەزێنن، کەچی تا ئێستا نەیانتوانیوە زاڵ بن بەسەر ئەو کۆریا بچووکە"

جۆزێف ستالین
١٩٥٢

# چاپتەری -١-

## سەرکەوتنی ویڵسن

لە کورتە وتارێکی زستانی (١٩١٨- ١٩١٩) دا، بیست و هەشتەمین سەرۆکی ئەمریکا ودرۆ ویڵسن بە بایەخەوە لە سەر جیهان وەستا. بە ئایدیاگەلێك گەیشتە کۆنفرانسی ئاشتی، کە لە پاریس سازدرا لە سەر مەرگەساتی جەنگی جیهانی یەکەم، بۆ دارِشتنەوەی سیستەمی نێودەوڵەتی تاوەکو دووپاتی کاتەوە ململانێیەکی لەم چەشنە هەرگیز روونەداتەوە. ویڵسن لە هەموو ئەمریکییەکی پێش خۆی و دوای خۆی پەرۆشتر تیشکی خستە سەر هۆشدارییەکی فراوان و ئاواتێکی مەزنی وروژاند. نووسەری بەریتانی ئێچ.جی. وێڵس لە بارەی ویڵسنەوە دەنووسێت" مرۆڤایەتی هەڵبەزییەوەو ویڵسنی پەسەند کرد و شکۆمەندی پێ بەخشی... هەڵیقۆزییەوەو کردی بە سیمبۆلی خۆی. ویڵسن پیاوانە و دلێرانە هاتە پێش چاوان. وەك سیاسەتمەدارێکی کاریگەر دەرکەوت. بوو بە حەزرەتی مەسیح".

دوو دەیە دواتر کە هێشتا ئایدیاکانی ویڵسن نەکەوتبوونە سەر پێیان، جەنگێکی خوێناوی دەستی پێکرد، پەیامەکەی بە ژێرکەوتوو ناوزەند کرا. هەموو لایەك ورد و دارِشتی پەیامەکەی ویڵسنی لە بیرکرد تەنها مێژوونووسان نەبێت، بەڵام لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا، ئایدیاکانی ویڵسن زاڵ بوون بەسەر هەموو جیهاندا. پێشبینییەکانی ویڵسن بۆ رێکخستنەوەی ڕەوشی ئابووری و سیاسی و پەیڕەوکردنی سیاسەتی دەرەوە کلیلی سەرەکین بۆ تێگەیشتن لەو جیهانە نوێیەی کە بە کۆتایی هاتنی ململانێی گەورەی جیهانی، بە واتایەکی تر بە کۆتایی هاتنی جەنگی سارد لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستدا، دروست بوو.







جیهان بەهۆی جەنگی ساردەوە خاوەن شارێکی فراوانی پڕ لە ترس و نامۆیی بوو، ئەو شارە پڕ لە ترسە لە پڕێکا ونبوو. ململانێی نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوا کە زاڵبوونێکە بەسەر پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا بە هاوسەنگییەکی جیۆپۆلەتیکی شارێکی ئاسۆ فراوان و مەزن و پتەو ئاشنابوو. لە کۆتایی ساڵی (١٩٩١) دا ئەو ململانێیەش نەما. هێڵە درێژەکانی سنوور و، خزمەتی زۆری حکوومەتەکان و هەموو ئەو دوژمنکاری و ئاشنایەتیەی کە گەلان و وڵاتانی جیهان خۆیان پێوە گرتبوو و ڕێکخستنی سیاسەتی دەرەوە و ناوەوەیان بۆ تەرخان کردبوو، بەسەرچوو، دارِشتنەوەو بوژاندنەوەی سەر لەنوێی ڕەوشەکان بە شێوەیەك پێناس کرا پێشتر وجودی نەبوو. جیهان پاش رووخانی کۆمۆنیزمی ئەوروپا چووە نێو چەرخی دوای جەنگی سارد.

وێڕای ئەمەش، جیهانی دوای جەنگی سارد جیهانێکی نامۆ نەبوو ! بەڵکو ئەزموونێکی دووبارەیە لە مێژوودا، ئەمەش خۆی لەخۆیدا ڕاستە، چونکە جیهان پێشتر سێ جار بەم ئەزموونەدا تێپەڕیوە. کارەساتی جەنگی سارد دواهەمین قۆناغە لە ڕەوڕەوەی دووبارەبوونەوەی مێژوودا. لە جەنگی ساردا، بۆ جاری چوارەم لە ماوەی دوو سەدەدا هەر دەسەڵاتێکی مەزن هەوڵێکی خستە گەڕ بۆ زاڵ بوون بەسەر باری سەربازی و سیاسی لە کیشوەری ئەوروپا. هەر هەوڵە و هێزێکی هاوپەیمان دژی دەوەستایەوە. لە هەر ڕووداوێکدا، دوای هەر ململانێیەکی سەخت و درێژ و دژواردا ئەو هاوپەیمانەی زۆرترین بەرگری دەکرد سەرکەوتن و دەسکەوتی لە ئەوروپا بەدەستدەهێنا. لە هەر ڕووداوێکدا جەنگ ڕەوتە کۆنەکەی ئابووری و سیاسی تێکدەشکاند و ڕەوتێکی نوێی لەبری بینادەکردەوە.

شۆڕشی فەرەنسا یەکەم خولی ئەم ڕەوڕەوەیەی دەست پێ کرد، ئەو لەشکرانەی لەلایەن شۆڕشگێڕانەوە پێکدەهاتن و ناپلیۆن سەرکردایەتی دەکرد سەراپای ئەوروپای ڕامالی و گەیشتنە ڕۆژهەڵات دواتر بۆ مۆسکۆ و لەوێشەوە بۆ باشووری میسر. هێزەکانی تری ئەوروپا سێ جاران کۆبوونەوە تاوەکو دژی فەرەنسییەکان بوەستنەوە، بەڵام هەر ژێرکەوتن. لە کۆتاییدا لە ساڵی (١٨١٥) هاوپەیمانی چوارەم سەرکەوت. سەدەیەك دواتر ئیمپراتۆری ئەڵمانی چاوی بڕیە سەروەری ئەوروپا. ئاکامی ململانێکە لە چاو هەر جەنگێکی پێش ئەوکاتە گەلێ

وێرانکەرتر بوو، کە لە (٦٥) ملیۆن جەنگاوەر هەشت ملیۆن و نیو کوژران و (٢١) ملیۆنیش برینداربوون. لە بەرەی رۆژهەڵاتدا ئەڵمانیا شکستی بە ئیمپراتۆری ڕوسیا هێنا و ئاشتییەکی توندی داسەپاند، بەڵام لەبەرەی رۆژئاوادا هاوپەیمانی بەرابەر بە یاوەری بەریتانیا و فەرەنسا و دواتریش ویلایەتە یەکگرتووەکان کە لە ساڵی (١٩١٧) دا هاتە نێو مەیدانەکە، هێزی سەربازی ئەڵمانیا بەرامبەر ئەو سێ بەرەیە لە رۆژئاوا لە پایزی (١٩١٨) دا چۆکی داداو شکستی هێنا. دوو دەیە دواتر، ئەدۆڵف هیتلەر و حیزبی نازی حوکمی ئەڵمانیایان کرد، ئەویش چاوی برِیە سەروەری و سەپاندنی دەستێکی باڵا لە ئەوروپا.

حیزبی نازی دژایەتی کرا و دواتریش پاش پێنج ساڵ و نیوی زۆر سەخت و دژوار لەلایەن ئەو وڵاتانەوە شکستی پێهێنرا کە لە ساڵی / ١٩١٨ / دا سەرکەوتن بەسەر ئیمپراتۆری ئەڵمانیا. یەکێتیی سۆڤیەت کە جێگای ئیمپراتۆری ڕوسیای گرتەوە یەکێك بوو لە ڕکابەرەکانی حیزبی نازی ئەڵمانیا پێش ئەوکاتە، حکوومەتی یەکێتیی سۆڤیەت لە جەنگی پێشوودا ڕووخا بەهۆی ژێرکەوتنی هێزی سەربازی. لە ناوچەی ئاشتیخوازی ئاسیادا، ژاپۆن ڕۆڵی ئەڵمانیای گێڕا، هێزێك بوو چاوی بریبووە تەنها داگیرکردن و زاڵبوون بەسەر ئەوانی تردا. ئەو هێزە گەورەیەش بەهۆی کاریگەری ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە دۆڕا. یەکسەر دوای ئەم کێشمە کێشانە ململانێی چوارەم سەریهەڵدا. جەنگی ساردیش ئەم ڕەوڕەوە ئاشنایەی دووپات کردەوە. یەکێتیی سۆڤیەت بە بەگەڕخستنی سەتەلایتەکانی و هاوپەیمانە ئایدیۆلۆژییەکانی گەرەکی بوو ڕژێمی کۆمۆنیزم لە هەموو ئەوروپادا بچێنێت، دواتریش لە سەرانسەری جیهاندا هاوپەیمانی ویلایەتە یەکگرتووەکان و سیستەمە دیموکراسییەکانی ئەوروپای ڕۆژئاوا و لەولاشەوە ژاپۆن سەرکەوتن. ڕووخانی کۆمۆنیزم و خودی یەکێتیی سۆڤیەت جیهانی بۆ جاری چوارەم لە مێژووی مۆدێرندا بەرەو دواهەمین قۆناغی ئەو ڕەوڕەوەیە ڕاپێچا. ئەمە قۆناغی بوژاندنەوەیە. لە هەر سێ ڕووداوی پێشتر،لایەنە سەرکەوتووەکان هەستان بەسازدانی کۆنفرانس لەسەر ئاشتی بۆ دارشتنی پلانێك بۆ کاتی دوای جەنگ. سەرەنجام، سنووری نوێیان کێشا، حکوومەتی تازەیان پێکهێنا، دەزگای نێودەوڵەتی نوێیان دامەزراند، هەروەها یاسای نوێیان بۆ پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان دانا... یان بڵێین هەوڵی ئەوەیاندا یاسای نوێ بخەنە کار. تاچ ڕادەیەکی باش ئەم کارانەیان کرد ؟ بەتاکە پێوەرێك بە شێوەیەکی مەنتیقی حکوومیان لەسەردرا.



لە ئاوەدانکردنەوە و بوژاندنەوەی شارێکی وێرانکراو بە ئاگر، یەکەم شت کە پێویستە بکرێت ئەوەیە کە چۆن بینای ئەو شارە دەکەیەوە بە شێوەیەك بەرگەی ئاگر بگرێت بێگومان ناتوانرێت کارێکی وابکرێت کە هەرگیز ئاگر نەکەوێتەوە، بەڵام دەکرێ خانوو بە سیستەمێکی وا دروست بکرێت کە بەرگەی ئاگربگرێت و ڕێگای چوونە دەرەوەو دەرباز بوونی هەبێت و ئاگرەکە بەخێرایی بڵاونەبێتەوە و پێکهاتە سەرەکییەکانی پتەوبن، لەپاڵ هەموو ئەمانەش کردنەوەی بەشی فریاگوزاری ئاگرکەوتنەوەیە. بەهەمان شێوە، یەکەم و گرنگترین ئامانجی ئاوەدانکردنەوەی دوای جەنگی ئەوروپا نەهێشتن و دووبارەنەبوونەوەی ئەو جۆرە جەنگانەیە، بە پێی توانا هەوڵ بۆ نەهێشتن و بنبڕکردنی ئەو ململانێیانە بدرێت. بەم پێیە، یەکەم هەنگاوی ئاوەدانکردنەوەی دوای جەنگ، کە بەردی بناغەی لە کۆنگرەی ڤیەننا لە ساڵی (١٨١٥) دانرا لە پێشی پێشەوەی هەنگاوەکانی ترە.

ئەو کاتە، ئەوروپا لە سەدەی داهاتوویدا دوور بوو لە جەنگی گەورە. ئەوەش دەرفەتێکی باش نەبوو بۆ ئەوروپا، لەوکاتەدا زۆر کەم لەلایەنە سیاسییەکان چوست و چالاك بوون، بەپێچەوانەشەوە سەدەی نۆزدە وێرای داهێنانی پیشەسازی و بزووتنەوەگەلێك بۆ گۆڕانی سیاسی کۆمەڵایەتی، سەدەیەکی پڕ لە ڕووداو و هەرا و هۆسە بوو زیاد لە هەر سەدەیەکی تۆمارکراوی ناومێژوودا. بێگومان ماوەی دوای جەنگی جیهانی دووەم سەرکەوتووترین ماوە بوو، بە هەقیقەت ماوەی جەنگی سارد بەدەر نەبوو لە ململانێ و گرژی و بەیەکاچوون، جەنگی نێوان دوو کەرتی دژیەك بەردەوام لە ئارادا بوو، بەڵام بۆ ماوەی زیاتر لە نیو سەدە هیچ تەقەیەك ڕاستەوخۆ بەتورەیی نەکرا لە نێوان هەردوو کەرتی رۆژهەڵات و رۆژئاوای کیشوەری ئەوروپا. هەردوو کەرت جەنگیان بەرپا کرد لە دەرەوەی ئەوروپا، بەڵام دوژمنە سەرەکییەکان هەرگیز ڕاستەوخۆ بەشەڕ نەدەهاتن ئەوەی کە حوکمی لەسەر دراوە، خراپترین ڕەوشی ئاوەدانکردنەوەی دوای جەنگ ماوەی دوای جەنگی جیهانی یەکەم بوو، کە ئەوروپا و هەموو جیهانی تەنها بۆ ماوەی بیست ساڵ بەدوور گرت لە ترس و ڕاڕایی و جەنگ.

هەمان هاوکێشەی دوای جەنگی جیهانی یەکەم لەسەر ڕەوتی نێودەوڵەتی جێ بە جێ دەبێت، ئەویش دوای ڕووخانی کۆمۆنیزم ئاوڕدانەوەیە لە ئاکامی کارەساتی جەنگی جیهانی یەکەم و ئەزموونێکە دووبارە دەبێتەوە. خاڵی باشی دەستپێکردن بۆ تێگەیشتن لەو گرفت و تێڕامانانەی کە دووچاری جیهان دەبێتەوە دوای ڕووخانی کۆمۆنیزم، بەگەڕخستنی هەمان

کۆششی دوای جەنگی جیهانی یەکەمە، بەتایبەتیش ئەو نەخشەیەی کە بۆ بوژاندنەوەی کاروبارە نێودەوڵەتییەکان دانرا لە کۆنفرانسی ئاشتی لە پاریس لە (١٩١٨ – ١٩١٩) دا لەلایەن سەرۆکی ئەمریکا ودرۆ ویڵسن.

### *نێردراو و سیاسەتمەدار*

ودرۆ ویڵسن کەسێکی بەرچاو بوو لە پاریس کە لەپڕێکا و دوور لە هەموو پێشبینییەك گەیشتە ئەوێ. وڵاتەکەی لەزۆربەی جەنگەکاندا وەك ناوەندێك وابوو. ویڵسن هەوڵیدا هەروەك ناوەندێك بمێنێتەوە پێش ئەوەی بچێتە نێو ململانێوە لە ساڵی(١٩١٧) قوربانیدانی ئەمریکا بەرێژەیەکی مامناوەند بوو بە بەراورد لەگەڵ زیانەکانی زۆربەی ئەو هێزانەی کە لە جەنگدا بەشداربوون (یان بڵێین حاڵەتی وڵاتێکی وەك ڕوسیا) کیانی ئەمریکی هەماهەنگی و هاوسەنگی سەربازی دەکرد دژی ئەڵمانیا. بەتەنها لەنێو هەموو سەرۆکەکاندا لە پاریس، ویڵسن سوور بوو لەسەر ئەوەی کە وڵاتەکەی هیچ پەیوەندی بەو بانگەشانەوە نییە بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو ناوچە ئابوورییەی کە هێزەکانی ئەوروپا لەسەری بەشەڕ دەهاتن. دووپاتی کردەوە کە وڵاتەکەی هەمیشە ئامادەیە بۆ جێبەجێ کردنی بنەما نێودەوڵەتییەکان، هەر کاتێکیش ئەو بنەمایانە کاری پێبکرێت ناهێڵێت ئەو ململانێ خوێناوییە دووبارە بێتەوە کە ئەوروپا لە ساڵی (١٩١٤) تێی گەوزا، کەبە خراپترین و وێرانکەرترین کارەساتی سەربازی دادەنرێت کە ئەو کیشوەرە تا ئێستا بەخۆیەوە بینیبێت. سەرەڕای بەرزەفڕی و بەرز خوازییەکەی، ویڵسن وەك مەسیحێکی سیاسی هاتە بەرچاو کە توانی گەلانی ئەوروپا دوور بخاتەوە لە گەشتێکی تر بۆ ناو دۆزەخ کە پێشتر بەرێکەوت دووچاری ببوونەوە.

ویڵسن ژێرکەوت. لەناخی پرۆگرامەکەیدا ئایدییەکی دامەزراندنی ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی هەبوو ئەویش (عصبە الامم) بوو کە مەبەستی بینینی ڕۆڵێکی سەرەکی بوو لە پاراستنی ئاشتی. هەرچەندە (عصبە الامم) دامەزرا، بەڵام ئەمریکا دانی بەدەستوورەکەی نەنا، وڵاتەکەی ویڵسن چووە دەرەوەی ئەو ڕێکخراوە، لە کۆتایدا ڕێکخراوەکە زۆر کاریگەر نەبوو لە



پاراستنی ئاشتی و تەنانەت نەبوو بە ڕێگرێکیش بۆ وەستاندنی جەنگی جیهانی دووەم لە ساڵی (١٩٣٩).

هەشت دەیە دواتر هەنگاوی نا بەرەو قۆناغ نێودەوڵەتی، ودرۆ ویڵسن وەك کەسێك کە گفتوگۆی زۆر لە سەر برکێت مایەوە. سیاسەتەکانی، حوکمەکانی لەسەر مرۆڤ و ئاکارەکانی درەوشاوەتربوو لەچاو هەموو کەسێکی ئەمریکی سیاسی لە مێژوودا. لەم مشتومڕە مێژووییەدا هەردوولا کێشەیەکیان هەبوو، بەڵام بنەماکانی بۆ گرنگی ویڵسن لە سەدەی بیست شتێکە کە مێژوونووسان بە دەگمەن گفتوگۆی دەکەن. ڕەخنە گرانی ویڵسن بە کەسێکی توندی لە قەڵەم دەدەن لە ڕووی سیاسییەوە بەبێ بەهرەو لە ڕووی ستراتیژیشەوە بە گەمژەی ناو دەبەن... پیاوێك بوو سیستەمێکی داهێنا هەرگیز کاری پێ نەدەکرا و بەکەللە ڕەقییەوە هەموو هەڵێکی خستەگەڕ بۆ چاککردنی، بە کەسێك ناوزەدیان کرد کە لە مەڕ جێبەجێکردنی بەرپرسیارێتییەکانی سەرنەکەوت و ئەو ئازارەی لەسەر شەری سیاسی لە پێناو بە ئەندام بوونی ئەمریکا لە (عصبە الامم) تواناو بەهرەکانی لاواز کرد، بەپێچەوانەشەوە، پشتیوانانی ویڵسن بە کەسێکی نموونەییان دادەنا، بەچاکخوازێکی مەزنی جیهانی سیاسەتیان دادەنا کە شەهید کرا لەلایەن دوژمنە بیرتەسك و کەللە پوچەکانی.

ویڵسن بۆ ئەمانە نێردراوێك بوو ئەگەر پرۆگرامەکەی جێبەجێ کرابوایە ئەوا ڕەنگە هەموو جیهانی دوور دەخستەوە لەو کارەساتەی کە ڕوویدا تەنها لەسەر ڕەتکردنەوەی ئایدیاکانی، ئەو هەل و مەرجەی دژی ویڵسن زۆر بەهێزبوو ئەوەبوو کە بەڕاستی کابرایەکی لاسار و خۆراستبین بوو. ڕێبەری ویڵسن بۆ پەسندکردنی دەستووری (عصبە الامم) شاکارێك بوو لە بێتوانایی سیاسیدا. ئەو پرسیارانەشی کە بە گومانەکان بەرزیان دەکرەوە لەجێی خۆیان بوون لەمەڕ چۆنیەتی کارکردنی (عصبە الامم) و مانای بە ئەندام بوونی ویلایەتە یەکگرتووەکان تیایدا، گەر ئەو پرسیارانەیان بەرزنەکردبایەوە ئەوا ئەرکەکانی خۆیان پشتگوێ دەخست بۆ ئەندامانی ئەنجوومەنی پیران.

پرسیاریان کرد چۆن (عصبە الامم) دەتوانێت جەنگ نەهێڵێت ؟ لە کاتێکدا هەموو ئەندامانی لە ماددەی (X) ی دەستوورەکەدا پابەند بوون نەك تەنها بە ڕێزگرتنی، بەڵکو پاراستنی وجودی سەربەخۆیی سیاسی خۆیان و دژی دوژمنکاری دەرەوە و یەکپارچەیی هەرێمی بوەستنەوە! گەر ئەنجوومەنی (عصبە الامم) بەوەی زانی کە وڵاتێك دەیەوێ شەڕ بکات

لەهەمانکاتیشدا کێشەکە بەناوبژیکەرانیش چارەسەر نەبوو، ئایا ئەندامانی ئەنجوومەنەکە بە ویلایەتە یەکگرتووەکانیشەوە چەك هەڵدەگرن دژی شەڕکەرەکە؟ گەروابێت، چۆن ئەم بارودۆخە لەگەڵ دەستووری ئەمریکا هەڵدەکات، کە پەیوەستە بە کۆنگرێسی ویلایەتە یەکگرتووەکان، ئەویش مافی ڕاگەیاندنی جەنگی هەیە ؟ لەلایەکی ترەوە، ئەگەر ماددەی (X) لە دەستوورەکەدا داوای هێزێکی دەستبەجێی سەربازی نەکرد بۆ وەڵامدانەوەی سەرپێچیکەرانی یاسای نێودەوڵەتی، ئایا ڕێکخراوەکە (عصبە الامم) ڕێکخراوێکی بێ کەڵك و بەتاڵ و ناکاریگەر نییە لە قەدەغەکردنی جەنگەکانی داهاتوو ؟ بۆ هەموو ئەو پرسیارانە، ویڵسن هیچ وەڵامێکی پێ نەبوو.

یەکەم جار هەوڵی دا خۆی بەدوور بگرێت لە پرسیارەکان. هەوڵیدا هەردڵسۆز بێت بۆ دەستوورەکە کەچی لە هەمانکاتیشدا بەتوندی لە پشتی ڕێکخراوەکە دەوەستایەوە وەك کلیلێك بۆ ئاشتی سەرتاسەری جیهان، هەروەها دوپاتیشی کردەوە کە ئەو بڕیارانە لەلایەن ئەنجوومەنی ڕێکخراوەکە دەردەچێت دەبێ لە ڕووی ئاکاریشەوە پابەند بن بە یاساکان. بڕیارگەلێك نەوەڵامی پرسیارەکانی دایەوە و نە ڕەوڕەوەکەشی ڕاست کردەوە. جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە هێزی ئاکاری لەبڕی هێزی سەربازی بەکاردەبرێت، بەڵام زۆر بەئاسانی بارودۆخەکانت دەهاتە بەرچاوان و هەل و مەرجەکەش وانەبوو.

مێژوو پڕە لە نموونەی شەڕخوازەکان کە هەرگیز هێورنەکراونەتەوە بەهۆی سەرزەنشت کردن و بەکارهاوردەی هێزی ئاکاری. پاشان چیٚ ڕوودەدات ؟ ویڵسن نەیووت چی ڕوودەدات ! ئێستاشی لەگەڵدا بێت بەرگریلێکەرانی ویڵسن قسەیەکیان هەیە بیکەن. لەیەك ڕووی گرنگەوە ویڵسن بێ هیچ گومانێك ڕاست بوو ئەوروپا پێویستی بەجۆرە ئاشتییەك بوو ئەڵمانیای پێ ئاشت بکاتەوە ئەویش (ئاشتی بەبێ سەرکەوتن) بوو ئەم دەستەواژەیە بەکارهێنرا لەلایەن ویڵسن و نیازیشی وابوو جێ بە جێی بکات، بەڵام نەیدەتوانی ئەم جۆرە ئاشتییە بەرهەم بهێنێت، چونکە ڕای گشتی لە نێو هێزە سەرکەوتووەکانی وەك بەریتانیا و فەڕەنسا جەنگی پەسند کردبوو داوای پەناگەیەك یان سیستەمێکی دەکرد کە قوربانیەکانیان بە سەرکەوتن هەژماربکرێن. ڕاگشتییەکان سووربوون لەسەر ئەوەی کە ئەڵمانیا دەبێ قەرەبوو بداتەوە، بەڵام ئەمە لەلای ئەڵمانەکان هاوکێشەیەکی توندوتیژی و نایەکسان و بەتەواوی پەسند نەکراو بوو هاوکێشەیەك تۆوی ململانێی داهاتووی دەدرویەوە.



سەرەڕای ئەمە، هەندێ سیاسەت و بڕیار کە ویڵسن پابەند بوو پێیانەوە لە کۆنفرانسی ئاشتی پاریس دەبەنگانە بوون ئەمەش چەند ساڵێك دواتر بە ڕوونی بەدەر دەکەوێت تەنها گەر تا ئەو کاتە یەکێکی تر کارێکی باشتر بکات. گەر ویڵسن هەر هیواو پێشبینییەکی لە (عصبە الامم) بەدی کردبێت لەبەرئەوەبووە کە ئەو ویستوویەتی ڕێگەچارەیەك پێشکەش بکات کاتێ پاریس ڕێگە چارەیەکە بۆ کێشەی جەنگ. ویڵسن باوەڕی وابوو گەر دەسەڵاتێکی جیهانی بەردەوام چاودێری دەوڵەتە سەروەرییەکان بکات ئەوا هەرگیز دووچاری ئەو ترس و تۆقینە نابنەوە کە دزەی کردبوو بۆ نێویان لە نێوان ساڵانی (١٩١٤ — ١٩١٨)، ئەو تاکە کەس نەبوو لەدوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە باوەڕی بە ڕێکخراوێکی لەم چەشنەی بە پێویست و لۆژیکی و هۆشیارکەرەوە ناوزەند دەکرد.

هەموو ئەمانە ڕەنگە جێبەجێ کرابن، بەڵام ڕێکخراوێکی ئاوا پەسند نەبوو، بەڵکو ئەزموونی (عصبە الامم) دەرسێکی فێری وڵاتان کرد کەبەرێگەی راستدا بڕۆن. فێری ئەوە کردن کە وڵاتانی خاوەن سەروەری و جیهان یان ئەوەتا ئامادەبن بۆ هەر ڕەنگدانەوەیەك یاخود خۆبەخشانە مافە سەروەرییەکانیان دانوێنن، بۆیە ئامادەن بۆ هەر نرخێك کە گلیان بداتەوە و بیانپارێزێت. ئەو ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەی کە لە پاش جەنگی جیهانی دووەم هاتەکایەوە ئەو دەرسەی بەرجەستە کرد، ئەویش نەتەوە یەکگرتووەکان بوو (UN) خۆگرترو بەتەمەنتربوو لە (عصبە الامم)، بەڵام ئەویش دەزگایەکی زۆر بەهێز نەبوو نەیتوانی ئاشتییەکی سەرتاسەری بەرجەستە بکات، ئەو پرسیارانەی کە ویڵسن خۆشی پێ نەدەهات و نەشیتوانی وەڵامیان بداتەوە دوای ماوەیەکی درێژ وەڵامیان بۆ پەیدا بوو.

(UN) دەست درێژی نەکردە سەرمافەکانی ئەو وڵاتانەی لێی ئەندام بوون، بەڵکو حکوومەتی ئەو وڵاتانە ناچاردەکران ملکەچی دەسەڵاتێکی سەرووی خۆیان بن. بەم شێوەیە (UN) لەکاتێکدا زۆر کاریگەرانە کاری خۆی کرد، تەنها گەر بهاتایە، ئەندامە زلهێزەکانی یان ئەو ئەندامانەی کە (UN) یان وەك گالیسکەیەکی خۆیانیان هەڵبژاردبوو ڕازی بووان لەسەر کارەکە. هیچ دەسەڵاتێکی ئەوەی نەبوو کە بە ویلایەتە یەکگرتووەکان بڵێت بڕۆ بۆ جەنگ، یاخود هەرکارێکی تری پێ بسپێردرێ.

ویڵسن و ئاشتی پارێزانی تر لە پاریس بەتوندی ڕەخنەیان لێ گیرا لە مەڕ دەبەنگییەکەیان کە وێڵ بوون بەدوای جێبەجێکردنی بنەمای مافی چارەی خۆنووسینی نەتەوەکان بۆ هەرێمە

فرە ڕەگەزەکانی ناوەڕاست و باشوری ئەوروپا کە پێش بەرپابوونی جەنگی جیهانی یەکەم ئیمپراتۆری ئوسترۆ هەنگاری حوکمی دەکرد، بەڵام لەم ڕووەوە ئەوان دەبەنگ نەبوون. هەرچەندە بەو ڕاستیەیان زانیبوو کە هەردوو بەشی ڕۆژهەڵات و باشووری کیشوەرەکە نەدەکرا ببن بە پاشکۆی بەشە هاوڕەگەزەکان، نەیاندەتوانی ئەو هەرێمانە دابەش نەکەن، وەك ئیمپراتۆری (Habsburg) کە پێش ئەوەی کۆنفرانسەکە دەست پێ بکات ڕووخا – بێگومان ئەو بەشانە نەدەبوونەوە یەك هەرچەندە ویڵسن ژیرانە هەوڵی پاراستنی پێوەری یەکپارچەیی و یەکڕێزی ئابووری دا لە نێو موڵکدارەکانی هابسبێرگی پێشوو. کاتێ ئاشتی دروستکەران بەوەیان زانی کە وڵاتە براوەکان زۆر بەدەگمەن نەتەوە و ڕەگەزە کەمینەکان لە سنووری خۆیان لەباوەش دەگرن، هەوڵیاندا دامەزراوێکی خەیری دابنێن بۆ پاراستنیان. کاتێکیش سنوورەکان کێشران ململانێیەکی زۆری لەسەر کراو زۆربەی ئەو ململانێیانەش زیندوو مانەوە لە سەدەی بیستەم، بەڵام ئەو بەیاننامەیەی ودرۆ ویڵسن ڕایگەیاند باشترین کاری کرد لە هەل و مەرجێکی ئاوا خراپدا. ویڵسن نێردراوێکە نەك سیاسەتمەدار کەبانگەشەی ڕێزگرتنی جیهانی کرد یان بەلانی کەم قسەیەکی هەیە لەسەر بەردەوام بوونی بەرژەوەندییەکانی جیهان، ڕوانگەکەی بۆ ماوەی دوای جەنگ کە هەوڵێك بوو بۆ دووبارە نەبوونەوەی ئازاری (١٩١٤ – ١٩١٨) درێژەی کێشا بۆ دوای دامەزراندنی (عصبە الامم) ڕوانگەی ویڵسن سێ توخمی تری هەبوو کە سەرۆکی ئەمریکا باوەڕی وابوو زیاتر جیهان بەرەو ئاشتی دەبات ! هەڵوێست لەسەرچەك و حکوومەتی گەل و هەبوونی بازرگانی بەلێشاو بێ تەگەرە تێخستن لە پەڕینەوەی سنووری نەتەوەکان. کۆڵەگەکانی تری پرۆگرامەکەی (سێینەی ویڵسن) شایەنی بەدواداچوونە بەدرێژی، چونکە هەموو ئایدیاکانی پێکەوە پێکهاتەی جیهانێکی دوای جەنگی ساردە.

## *ڕوانگەی لیبراڵ*

لە وتارێکی لەژێر ناونیشانی (چواردە خاڵ) کە لە ٨ / ١ / ١٩١٨ پێشکەشی کرد، ویڵسن لە شیکردنەوەی هەر چواردە خاڵدا مەرامەکانی ئەمریکای لە دەستێوەردانی جەنگی ئەوروپا ورووژاند، لە وتارە دیپلۆماسییەکانی تری لەسەر جەنگ لە پاریس، ودرۆ ویڵسن ڕای خۆی بۆ ڕێکخستنەوەی نێودەوڵەتی لە دوای جەنگ خستە ڕوو. ڕوانگەکە پرۆگرامێك بوو بۆ چاکسازی نێودەوڵەتی کە چەکداماڵین و دیموکراسی و بازرگانی ئازاد سێ توخمی سەرەکی پرۆگرامەکە بوون.



لە (٨ / ١) دا ویڵسن بانگەشەی کەمکردنەوەی چەکە نەتەوەییەکانی کرد بۆ نزمترین ئاست لە پێناو سەلامەتی نەتەوەییدا. پێی وابوو کە فراوانبوونی هێزە سەربازییەکانی ئەوروپا کەڵەکە بوونی چەك بەسەر یەکەوە لەلایەن زلهێزەکانی کیشوەرەکە لە پێش ساڵی (١٩١٤) وای کرد ململانێکە دەست پێ بکات، باوەڕی وابوو کە چەك خۆی لەخۆیدا هۆکارێکی بەرپابوونی جەنگە.

حکوومەت بۆ خزمەتی گەل بەشێکی گرنگی بۆچوونەکەی ویڵسن بوو ئەمریکا چووە نێو جەنگەوە بەپێی دروشمە هاوچەرخەکانی تاوەکو زەمینەیەك لە جیهان بۆ دیموکراسی خۆش بکات. بۆیە دیموکراسی مەرجێکی پێویست بوو بۆ ئاشتی. دڵی دیموکراسی حوکمی زاتییە و گەورەترین بەربەستیش بۆ حوکمی زاتی لە ئەوروپا لەدەیەی دووەمی سەدەی بیستەمدا فەرمانڕوایی ئیمپراتۆریەت بوو. بۆیە وتارە چواردە خاڵیەکەی ویڵسن بانگەشەیەك بوو بۆ کۆتایی پێهاوردەی فەرمانڕەوایی ئیمپراتۆری. ئەمەش پێویستی بە جێبەجێکردن بوو لەو هەرێمانەی کە ئیمپراتۆر فەرمانڕەوا بوو، هەروەها جێ بە جێ کردنی بنەمای مافی چارەی خۆنووسین، بنەمایەك کە ویڵسن بە پێویستی دەزانی بۆ ئەو جۆرە دیموکراسییەی کە خۆی باوەڕی پێ بوو. هەر لە هەمان وتاردا، ویڵسن بانگەشەی لابردنی ئەو بەربەستانەی کرد کە دێنە پێش بازرگانی نێودەوڵەتی و دانانی مەرجی بازرگانی بە شێوەیەکی یەکسان بۆ هەموو وڵاتێك لە هەر کوێیەك بن، بازرگانی ئازاد لەگەڵ چەکداماڵین و دیموکراسی بناغەی جیهانی پڕ لە ئاشتی بوون. لە (پاریس) یش ویڵسن باسی لە شکاندن و هەڵوەشاندنەوەی ئەو بەربەستانە دەکرد کە ڕێگربون لەبەردەم بازرگانی بازاڕی ئازاد بەنێو سنوورە نێودەوڵەتییەکاندا.

ئایدیاکانی ویڵسن ئاشکراو ڕوون جارێکی تر سەریان هەڵدایەوە لە لێدوانەکانی سەرۆکی ئەمریکا – فرانکلین دی ڕوزفێڵن (Franklin D. Rooseveln) لەسەر مەرامەکانی ئەمریکا لە جەنگی داهاتوودا، کە لە ڕاگەیاندنی پەیمانی ئەتڵەسی لەگەڵ سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا (وینستن چێرچڵ) لە ئابی (١٩٤١) دا چوار مانگ پێش ئەوەی ئەمریکا بچێتە نێوجەنگەوە پێشکەشی کردن، پاشان خۆیان خستە چاڵێکەوە لە بەلاغی سیاسی دیموکراسی ڕۆژئاوا کە کەرەستەی خاوی وتاری سەرکردە ڕۆژئاوایی و ئەمریکییەکان بوون لەسەر سیاسەتەکانی جیهان و دەرەوە. ئایدیاکانی ویڵسن دیاربوون، بوون بە ڕوانگەی سیاسی (موزاك) هەموو کاتێك بۆ جەماوەریان بە بەردەوامی دووبارە دەکردنەوە، هەمان ئەو ئایدیانەن

کە هەموو سەرکردە سیاسییەکانی ڕۆژئاوا دەیانەوێت بیڵێن و هەمان ئەو سیاسەتانەش کە دەیانەوی مەبەستەکانیان پێ بەرجەستە بکەن.

هەرسێ ئایدیاکەی ویڵسن بوون بە کلێشە لە سەدەی بیستەمدا، چونکە ئایدیاکانی بە ناوەندی ستاندارد ناوزەد دەکرێن بۆ ئاشتی و سەربەخۆیی و پێشکەوتن بەوشێوەیەی کە جیهان شایەنییەتی و حەزی پێ دەکات. ئەمانەن پێشینەی ژیانی گشتی خەڵك و کەسیش لە سەدەی بیست و یەکدا گومانی لێیان نییە، بەڵام ئەمە هەروا بەئاسانی نەهاتە کایەوە ئەوکاتانەی پاش ئەوەی ویڵسن ئایدیاکانی خۆی بۆ ڕێکخستنەوەی نێودەوڵەتی خستەڕوو، بە درێژایی مێژوودا، زۆر بەتوندی بەرەنگاری کرانەوە، ئەو ئایدیایانەی ئەو باسی دەکرد (هەموو جیهان پەسەندی نەکرد) هەموو شتێك بوون، بەڵام تەنها بیریان لێ نەدەکرایەوە.

سەدەیەك پێش ئەو ساتەی ویڵسن و هەموو سەدەکانی پێش ئەوکاتە جیهانێك کە هەموو کەسی تیادا دەژیا جیهانێکی تەقلیدی بوو، ژیان بە شێوەیەکی مەحەلی بەڕێوە دەچوو زۆربەی چالاکییە ئابوورییەکان لە کشتوکاڵەوە سەرچاوەی گرتبوو دەسەڵاتی سیاسی و هەرەمەکی لەسەر بنچینەی میرات بوو، کاتێ گۆڕان لە ژیانی ڕۆژانەی دادگا و شارۆچکە و لادێکان ڕوویدەدا بە لێکترازان و شتێکی سەیر ناویان دەبرد نەك پێشکەوتن. گۆڕان تەنها لە جێگرتنەوەی دەسەڵات و دووبەرەکی ئایینی و کەش و هەوادا بووو ئەو سێ ئامانجە نێودەوڵەتییەی ویڵسن بانگەشەی بۆ دەکرد شتێکی زەق و دیاربوو لە سەدەی بیستەمدا بۆ ئەونەی کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدە و زووتریش دەژیان کە بە لایانەوە نامۆ و سەیر و پەسەند نەکراوبوون. ئاشتی بەئامانجێکی سەیر دادەنرا، چونکە جەنگ خاسیەتێکی سروشتی پەیوەندی نێوان وڵاتە سەروەرییەکان بوو. بێ گومان جەنگ هەمیشە خوازراو نەبوو، هەروەها پەیکەرێکی مەزهەب گەری چەند سەدەیەك درێژەی کێشا، بەڵام پووچەڵکردنەوەی جەنگ هەمیشە ئاوات یان مەبەستێکی جدی مرۆڤ بووە.

گەر ئاشتی خەیاڵێك بووبێت لە جیهانە تەقلیدییەکە، ئەوا سەربەخۆی بۆ هەموان هەڕەشەیەکی گەورە بوو، هەروەها دیموکراسیش بەگەمارۆی یاسا دادەنرا و جودابوونەوەیەك بوو لە مەزهەب و بیروباوەڕی گونجاوی ئاسایی شتەکان. ڕووناکبیران لە مێژووی جیهانی کۆندا فێری ئەوە بوونە کە مافی حوکمکردنی خەڵك بەرەو کارەسات و مەرگەسات دەچوو. سەبارەت بەسێینەی ویڵسن کە پێشکەوتنە ئەوا لەسەر بنچینەی پێشبینی کردنەوە بوو، لە هەمانکاتدا



ئەو هەقیقەتە ڕاست بوو کە ئاڵوگۆڕکردن بەشێکی ئاسایی چالاکی ئابووری بوو، هەروەها دۆزینەوەی کەرەستەی خاوی کانزاکان، کردنەوەی دەروازەی نوێی بازرگانی و پتربوونی ئامێری تەکنیکی و زیادبوونی بەرهەم و دروستکردنی ئامێری دەستی، گۆڕانی لەناکاوی کەش و هەوا کە دەبووە هۆی بەرزونزمی چالاکییە ئابوورییەکان و پاشەکەوتی خۆراك، گەشەسەندنی ئابووری کە خاسیەتی سەدەی نۆزدەهەم و بیستەم بوو، هەموو ئەمانە شتی نادیار و نەزانراو بوون لە کۆمەڵگا تەقلیدییەکاندا. ئەوانەی کە لە ساڵی (١٨١٥)دا لە ڤیەننا (Vienna) کۆبوونەوە بۆ ئاوەدانکردنەوەی ئەوروپا دوای کارەساتی جەنگێك کە دوو دەیەی خایاند، وێڵ بوون بەدوای گێڕانەوەی ئەو جیهانە سیاسییەی کە جەنگەکانی ناپلیۆن لەسەر بناغەکانی ئەو جیهانە هاتنە لەرزین. جێگرەوەکانی ئەوان لەکۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم هیچی دیکە بیریان لەوە نەکردەوە کە کارێکی لەو جۆرە دووبارە بکەنەوە یان بە شیاوی بزانن.

شۆڕشی پیشەسازی و شۆڕشی فەڕەنسا کە سیاسەتمەدارەکان لە ڤیەننا ئاماژەیان پێدا، هێز و ئاکامەکانی ئەو دوو شۆڕشە جیهانە تەقلیدییەکەی ڕامالی بێ ئەوەی هەستی پێ بکەن. گرنگی هەردوو شۆڕشی (پیشەسازی و فەڕەنسا) دەکرێ زۆریان لەسەر بوترێ. شۆڕشی پیشەسازی کە لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەم لە بەریتانیا دەستی پێ کرد، شتە نازیندووەکانی گۆڕی بۆ سەرچاوە زیندووەکانی هێز، داهێنانی ئامێر و مەکینە بۆ مرۆڤی کرێکار، بەکارهاوردەی کەرەستەی زیاتر و نوێتر، بەتایبەتی کەل و پەل و کەرەستەی دەستکرد لەوەتەی خۆمالیکردنی کشتوکاڵ لەدوا قۆناغی چاخی بەردیندا، شۆڕشی پیشەسازی گەورەترین گۆڕانی لە بوونی مرۆڤدا هێنایە کایەوە. ئەوەی دووەم شۆڕشی فەڕەنسا گرینگترین ڕووداو بوو لە ئەوروپا لەوەتەی ڕووخانی ئیمپراتۆری ڕۆمییەوە کە ئیرادەی گەلی بەرەو کەلەپورێکی جێگیر بردو کردی بە بنەمای شەرعییەتی سیاسی. هەردوو شۆڕش ناوەڕۆکێکیان بۆ ئەوانەی پاش خۆیان دارشت و ئەو ڕێگایەیان گۆڕی کە کاروباری گشتی و ژیانی تاکی لەسەر بەڕێوە دەچوو، ئەو گۆڕانەش یەکەم جار لە ئەوروپا دواتر لە سەرانسەری جیهان بەدیهات.

هەردووکیان بەخێرایی ژیانی مرۆڤیان لەسەر زەوی گۆڕی. کارگەرییان ئەوەندە بەهێز بوو کەس نەیتوانی ڕێگەیان لێ بگرێت ئەو پێشبینیانەشی کە لە پاریس لە ساڵی (١٩١٩) خرانە ڕوو لەمەڕ بوونی جیهان و چۆنیەتی بەڕێوەبردنی بەڵگە نەویست بوون کە (١٥٠) ساڵ پێشتر ڕوویاندا، ترس و بیمەکانی جەنگی جیهانی یەکەم کە لە ئاکامی بەکارهاوردەی تەکنیکەکانی

پیشەسازی لە جەنگ دروست بوو. شێوازی کۆنی هەڵوەشاندنەوەی ململانێ چەکدارییەکانی گۆڕی بۆ پێویستییەکی کردەیی سەدەی نۆزدەم، هەروەها کاری بەردەوامی شۆڕشی فەڕەنسا جڵەوی دەسەڵاتی نەگۆڕی، بەڵکو ئەوروپایان لاوازکرد و پاشانیش جەنگی جیهانی یەکەمیان کۆتایی پێهێنا. هەروەها شەپۆلی چالاکییە ئابوورییەکان کە سەرچاوەی نوێی دەسەڵاتی هێنایە کایەوە بەرهەمی نوێی پەسند کردو داوای ڕێگای نوێی کرد بۆ بەرهەمی زیاتر، ئەو شەپۆلە ژیانی نیشتەجێی کشتوکاڵی لەسەر ئەم هەسارەیەدا زیاتر لێك ترازاند. لە سەدەی نۆزدەوە تا ئەمرۆش لە چاو تەواوی مێژووی مرۆڤدا شۆڕشی پیشەسازی لەگەڵ سامانە قەبەکەی و خەوش و پیسی پاشماوەکانی بەهێزترین دەسەڵات بووە. تەنانەت پێش جەنگی جیهانی یەکەمیش خاوەند و پادشاکانی ڕابردوو بێ دەسەڵات بوون بگرە پێش هاتنە کایەی خەڵکی بازرگان و مەکینە و کەل و پەلی ئەو سەردەمەش.

ویلسن ئامانجەکانی جیهانی مۆدێرنی پەسند کرد، بەڵام ڕوانگەکانی لەمەڕ ئەو ئامانجانە لە دوو ڕێگای زۆر گرنگەوە زۆر چاك بوون. یەکەم - کۆمەڵە مانایەکی تایبەتی بۆ ئەو ئامانجانە دانا. ویلسنیزم زنجیرە هاوکێشەیەکی تایبەتی داڕشت بۆ دەستەبەر کردنی ئاشتی، حوکمی گەل و پێشکەوتن. دووەم - دووپاتی کردەوە کە ئامانجەکانی سەربەخۆیی و پێشکەوتن کۆڵەکەی (ئاشتی)ن. یەکەم مەبەست لە هەر سێ مەبەستە مەزنەکەی جیهانی مۆدێرن کە یەکەمیان جەنگی جیهانی یەکەمە وای کرد بەفەرمان دەستەبەر بکرێت. لە کاتی ڕوانگەی ویلسنەوە بۆ ماوەی دوای جەنگی جیهانی یەکەم بەرهەمی دوو مەبەستەکەی ترە. هەرچەند ودرۆ ویلسن ئەو ئایدیانەی ناساند بە جیهان وەك دەرمانێك بۆ چارەسەرکردنی جەنگ، بەڵام ئەسڵیان بە ویلسن نابەسترێتەوە ئەوەی وایکرد ویلسینزم بەدیاربکەوێت بەرهەمی کەش و هەوایەکی ڕۆشنبیری و سیاسی بوو کە لە ئەزموونی تایبەتی مێژووییەوە لە کۆتایی سەدەی هەژدە و نۆزدەدا لە بەریتانیا و ویلایەتە یەکگرتوەکان سەریان هەڵدا. ڕووناکبیری سیاسی ئینگلیزی کە کاریگەری زۆر بوو لە سەدەی نۆزدەدا جێریمی بێنتام (Jeremy Bentham) داماڵینی چەکی وەك دەروازەیەك بۆ ئاشتی پێشنیار کرد، کۆمەڵگا ئاشتوەرەکانی ئینگلیزی کە لە نیوەی یەکەمی ئەو سەدەیەدا پەیدا بوون ئەو پێشنیارەیان جێبەجێ کرد. شۆڕشگێرە ئەمریکییەکان بەتایبەتی ئەوەی لە هەموویان رادیکاڵتربوو تۆماس پەین (Thomas Paine) بوو لە کۆتایی سەدەی هەژدەدا باوەڕی وابوو کە ڕووخاندنی حوکمە پادشاتیە بەدخووەکانی



ئەوڕوپا جیهانی خۆپەرستی و ئەو جەنگە بێ کەڵکانەی کە ئەو پادشایانە خوویان پێوە گرتبوو هێوردەکاتەوە.

سەبارەت بە بواری بازرگانیشەوە هەبوونی بازرگانی ئازاد کێشەیەکی سەرەکی سیاسەتی بەریتانیا بوو لەسەەی نۆزدەدا، هەروەها هەندێ لەلایەنگرانی ئەو ئایدیایە دووپاتیان کردەوە کە بازرگانی ئازاد لەپاڵ ئەوەی وڵاتەکەی دەوڵەمەندتر دەکات، زیاتر بەرەو ئاشتیان دەبات. ویلایەتە یەکگرتووەکان وەك بەریتانیا زۆر بەچاکی پابەند نەبوون بە بازرگانی ئازادەوە، بەڵام سوود و قازانجی بازرگانی و ئاواتی بەرەو پێشبردنی مەسەلەی گرنگ بوون لە ژیانی سیاسی ئەمریکا لەلای کۆمارییەکان. پەیوەندی تۆکمەی نێوان دیموکراسی و بازرگانی ئازاد لەلایەك و نێوان دیموکراسی و ئاشتی لەلایەکی ترەوە، خاڵی سەرەکی نەبوو لە ڕەوشی سیاسی ویلایەتە یەکگرتووەکان و شانشینی یەکگرتوو لە پێش جەنگی جیهانی یەکەم، بەڵام ئەمە لەبەر ئەوە بوو کە ئەوروپای گەورەو جەنگی جیهانی سەنتەری بایەخی هیچ کامیان نەبوو. لە کۆتایی ساڵی (١٩١٨) دا بووە مەسەلەیەکی سەرەکی و هەریەکەیان وێڵ بوون بەدوای ڕێگا چارەیەکی زۆر بەپەلە لە کاتێکدا ویلسن ئەو ئایدیا بەریتانی و ئەمریکیانەی بەیەکەوە گرێداو پێشکەشی کرد وەك ڕێگا چارەیەك کە جیهانی بەدوایدا دەگەڕا و گەرەکی جێبەجێکردنی ئەو بنەمایانە بوو کە لە بەریتانیاو ویلایەتە یەکگرتووەکان هەڵقوڵابوون و پراکتیز کرابوون. ئەو زاراوەیەی کە ئاسایی بەکاردەهێنرێ بۆ پێناسەکردنی فۆرمەکانی فکرە سیاسییەکان، لەزمانی ئینگلیزیدا لە چاخی مۆدێرندا پراکتیس دەکرێت زاراوەی (لیبراڵیزم – Liberalism)ە ئەمەش پێچەوانەی داب و نەریتە داسەپاوەکانی سیاسی و ئابووریە. ویلسینزم رۆحی لیبراڵیزمە بۆ پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان جێبەجێکرا لە کاتێکدا، لە سەدەی نۆزدەدا بەشە سیاسیە سەرەکییەکان لە ئەوروپا لە ناو وڵاتە ئەوروپییەکاندا بوو، لە نێوان هێزی لیبراڵیزم و تەقلیدی دژی یەکتر وەستانەوە. ئەو زاراوەشی کە بەکاربرا بۆ دوژمنەکانی لیبراڵیزم لە جەنگی جیهانی دووەم و جەنگی ساردا (تۆتالیتاریەن – Totalitarian) بوو واتە ستەمکاری، لەجەنگی ساردا کەرتی لیبراڵ بە جیهانی ئازادی ناسرا. ڕەوایە بەدوژمنەکانی لیبراڵیزم لە سەدەی نۆزدەدا بووترێت پارێزکار (Conservatism)، چونکە ڕێگا کۆنەکانیان دەپاراست و بەرەنگاری ئەو گۆڕانکاریانە دەبوونەوە کە لیبراڵیزم دەیهێنا کایەوە (وشەی کۆنەپەرستیش بەکاردەهێنرا، واتە هێزە تەقلیدییەکانە کە نێگەتیڤانە گۆڕانکارییەکانی لیبراڵیان ڕەتکردەوە) دوژمنە

جیهانییەکانی لیبرالّیزمی سەدەی بیستەم کە فاشیزم و کۆمۆنیزم بوون بەهیچ شێوەیەك پارێزکار نەبوون، بەڵام رادیکالّ بوون لەڕووی کارنامەی ئایدیۆلۆژییەکانەوە.

زاراوەی پارێزکار لەدوا نیوەی سەدەی بیستەمدا بەفراوانی بەکارهات، بەڵام پەیوەست بەململانێ سەرەکییەکەی وڵاتە لیبرالّەکان. ئەو ململانێیە ململانێیەکی بەردەوام ئاشتیانە بوو قەتیش تەواو نەبوو ململانێکەش لەسەر چۆنیەتی دابینکردنی گوزەرانی بەساڵاچووان و بڕینەوەی خانەنشینی بۆیان لەلایەن حکوومەتەوە، هەروەها لەسەر کێشەی بێکاری و هۆشیاری تەندروستی بوو هەرچەندە زۆر بەتوندی دژی یەکبوون لەمەڕ ئەو مەسەلانە، بەڵام ئەو حیزبانەی ململانێیان دەکرد هەموویان سیاسەتی دیموکراسی و رەوشی ئابووریی بازاڕیان پەسند کردو دژی سیاسەت و کردارەکانی ڕژێمە نالیبرالّەکانی جیهان وەستانەوە، ئەمەش مشتومڕێك بوو لەنێوان خێزانێکی لیبرالّدا لە جیهانی بەریتانی و ئەمریکییەکاندا. ئەوانەی کە رۆلّێکی مەزنتریان دەگێرا بۆ حوکمەت بە لیبرالّ ناسرابوون لە کاتێکدا ئەوانەشی کە کەمتر حەزیان بەو کارە دەکرد پێیان دەوترا پارێزکار هەرچەندە پێگەی پارێزکارەکان نزیکتربوو بۆ ئەو شتەی کە لیبرالّەکانی سەدەی نۆزدە باوەڕیان پێی هەبوو (لە کیشوەری ئەوروپادا، کە تیایدا داب و نەریتی لیبرالّ زۆر بەهێز نەبوو لەچاو داب و نەریتی جیهانی بەریتانی و ئەمریکییەکان، ئەو زاراوانەی کە بۆ ئەوانەی مشتومڕیان بوو لەسەر ئەوەی کەم حەزیان بە حکوومەت بوو (نیۆلیبرالّەکان – Neoliberals) کە ئەمەش لە ڕووی مێژووییەوە وردترە) سێینەی ویلّسن بەمانای بنەڕەتی و تووندڕەوەکەیەوە لیبرالّ بوو. هەریەك لەبەشەکانی دیموکراسی و بازرگانی ئازاد و زالّ بوون بەسەر چەکدامالّین پێ دادەگرێت لەسەر مومارەسەکردنی دەسەڵات لەلایەن حکوومەتەکانەوە و ئەم بنەمایەش لەوە دەچێت ببێتە کرۆکی لیبرالّیزمی سیاسی.

ئەمەش چەند شورەیەك بەدەوری بازنەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا بەرزدەکاتەوە کە تیایدا حکوومەت حەرامە خۆێ تێ هەلّقوتێنێ بەمەش شوێنێك دروست دەبێت بۆ لیبرالّی تاکەکەسی، بەهەمان شێوەش، وڵاتە سەروەرییەکان دەتوانن سنوور لەسە چەك بۆ یەکتری دابنێن و هاریکاری یەکتر بکەن. مێژوونووس (ئادەم سمیس – Adam Smith) کە یەکێك بوو لە هەرە کاریگەرترین و کۆنترین مێژوونووسی ئابووریی بازاڕ، ناوی لە ئابووریی بازاڕ نا (سیستەمی سروشتی لیبرالّ) کە ئەمە بەتەواوی لیبرالّ بوو، چونکە بەپێی ئەم دەستەواژەیە دەبێ تاکە کەس خاوەندارێتی ئەو بازاڕانە بکات نەك حکوومەت بڕیارە ئابوورییەکان لەمەڕ



ئەوەی چی بەرهەم بێت و چۆن بەرهەم بێت، کەی و لە کوێ بەرهەم بێت بۆ کێی بەرهەم دێنێ و بەچەند دەیفرۆشێ، لەلایەن تاکەوە بڕیاردراون بەگوێرەی پێوەرەکانی قازانج کردن نەك ئەو بڕیارانە لەلایەن بەرپرسیارانی حکوومەتەوە بدرێن بەگوێرەی کارنامەکانیان هەندێ شت بەرهەم دێنێت، هەندێ نرخ جێگیردەکات، هەروەها باج لەسەر موڵکی خەڵکی تایبەت دادەنێن، بەڵام چی سنووردار دەکرێت. لەگەڵ دیموکراسی و بەرهەڵستەکان لەمەر چەکدامالّین، ئابووریی بازاڕ زەمینە خۆش دەکات بۆ سنووردارکردنی مومارەسەی دەسەڵاتی حکوومەت .

هەر سێ بەشی ویلّسینزم لیبرالّن، چونکە یاسای جیهانی و گشتی و ڕوون و ئاشکرا دادەنێت بۆ حوکم کردنی سیاسەت و ئابووری و ئاسایش. کڕۆکی حکوومەتی لیبرالّ دلّسۆزییە بۆ ئاشکرا کردن و ڕوونکردنەوەی ڕێنماییەکان کە بەهۆیەوە خەڵك حکوومەت هەلّدەبژێرێت و ئەو حکوومەتەش حوکمی ئەو خەڵکە دەکات. ڕێنمایی زۆر گرنگ و تایبەتی ئەوانەن کە دادەنرێن بۆ چالاککردن و بەرێوەبردنی یاسا لە فۆرمی حکوومەتی لیبرالّدا، هەرچی ئاکامێك لە پابەندبوون بە ڕێنماییە نیشانکراوەکان بکەوێتەوە بە ڕاست و یەکسان دەژمێردرێت. یاسای بنچینەیی کە ئەو ڕێنماییانە دیاری دەکات بە وردی لە دەستووردا دادەنرێن و سنووریش لەسەرچەك دادەنێن ئەوانیش ئەو یاسایانەن کە وڵاتە سەروەرییەکان هەلّدەبژێردرێن و پەیڕەوی دەکەن. ئەو سنوورانەی بەشێکن لە پەیوەندییەکانی نێو وڵاتە سەروەرییەکان، بەشێکی ئەو یاسایانەن کە حوکمی کاروباری گشتی دەکات و بەشێکیشن لە سیستەمی لیبرالّی سیاسیدا، چونکە کاریان بەسەر ئەوە نییە کە وڵاتەکان چۆن مامەڵە لەگەڵ سوپاکان دەکەن کە ڕێگەیان پێدراوە مافی ئەو مامەڵەیان هەبێت، هەروەها ئابووری بازاڕەکانیش بەیاسا کاردەکەن و بەرهەم هێنەران هەولّی قازانج دەدەن، ئەو قازانجەش بەدەست دێنێت گەر داواکاری کڕیارەکانیان جێبەجێ کردو وەڵامداوە، بەم شێوەیە ئادەم سمیس ئاماژەی پێدا کە موعجیزەی بازاڕ ئەو کاتە ڕوودەدات گەر : بەدواداچوونی هەر تاکێك لەسەر باشی جۆری شتەکانی ئەوا جۆرە ڕازیبوونێکی شیاو بۆ هەموان دروست دەبێت، بەڵام ئەمەش تەنها لە کاتێکدا ڕوودەدات گەر هەموو بەباشی لەیاساکان گەیشتبن. لە کۆتایدا، هەر سێ بەشەکەی سێینەی ویلّسن لیبرالّن لە خزمەتی بەرژەوەندییەکانی تاکدا.

لیبرالّیزمی سیاسی تاك دەپارێزێت لەدژی دەولّەت و دەسەڵاتی پێ دەبەخشێت لە ڕێگەی دەنگدانەوە تاوەکو ئەوانەی لەسەر دەسەڵاتن و هەمیشە هەلّبژێردرێن، لایانبەرێت. ئامانجی

هەرە باڵای ئابووریی بازاڕ ڕازیکردنی ئارەزووەکانی موشتەرییە. دیموکراسی سیستەمێکی سەروەری گەلە، ئابووریی بازاڕیش یەکێکە لە سەروەرییەکانی کڕیار. سەبارەت بە بەشی سێیەمی سێینەکە، ئەوە حکوومەتەکانن جەنگ بەرپا دەکەن و هەر جەنگیشە دەسەڵاتیان پێ دەبەخشێت، بەڵام ئاشتی هاوسەنگی دەسەڵات ڕادەگرێت و بەلای تاکدا دەیگەڕێنێتەوە و ژیانی ئەو تاکانەش دەپارێزێت کە لە جەنگدا بەفیڕۆ دەدرێن. کارەکتەری لیبراڵی سێینەی لیبراڵ دژی ئەو بنەمایانە دەوەستێتەوە کە پێش سەردەمی مۆدێرن زاڵبوون لەنێو گۆڕەپانەکەدا. هەندێ کات وڵاتانی خاوەن سەروەری سەرنجی یاساکانی جەنگ دەدەن، بەڵام لە سەرەنجامدا هەرگیز رازی نابن بەکەم کردنەوەو سنووردارکردنی چەکەکانیان. ئەو ئاشتییەی کە ویلسن باوەڕی پێ هەبوو گەر داوای چەك داماڵین نەکات ئەوا داوای کەمکردنەوەی چەك هەرمسۆگەرە، ئەوچەکانەی کە لە نێو دەوڵەتەکان پەرەی پێدەدرێت و ئەو هێزەی پێ بەخێودەکەن کە باوەڕیان پێی هەیە. دەسەڵاتە سیاسییەکان کە زاڵ بوون بەسەر پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان تۆمارکراون لە مێژوودا و ویلسنیش بەئاواتی بەرهەم هاوردەی ئاشتی بوو نەك لە ڕێگای ڕێکەوتنە دەستوورییەکان بۆ حوکمی سەربازی بەڵکو لە ڕێگای هاوسەنگ کردنی دەسەڵاتەوە. بەهەمان شێوە شتێکی ئاسایی بوو بۆ حکوومەتەکانی پێش سەردەمی مۆدێرن حوکمەکەیان لەرێگای داب و نەریت و عورفی داسەپاوی جوگرافی و تەکنەلۆژی سنووردارکرێت نەك بە شێوازی لیبراڵ لە ڕێگای یاسا جیهانی و گشتییەکانەوە.

لیبراڵیزمی دەستووری زیاترلە شتێکی شازی ئەکرد نەك یاسایەك بووبێت. هەوەسی حکوومەتە کۆمۆنیستەکانی سەدەی بیستەم بۆ کۆنترۆڵ کردنی هەموو چالاکییە ئابوورییەکان لە ڕووی مێژووییەوە کارێکی نائاسایی بوو، هەروەها لە مێژوودا تۆمارکراوە کە حوکمی رەوا لەو سەدەیەو ئەوەی پێش خۆی فەرمانڕەوایی سنوورداری ئابووریی بازاڕەکان بوو. لە بواری ئابووری فراوانی کشوتەکاڵییەوە کە ژیانی هەموو مرۆڤی لە سەر بەند بوو لە پێش چاخی مۆدێرن حکوومەتەکان زۆر بەدەگمەن بە جووتیارەکانیان دەوت چی بچێنین، بەڵام مافی شیاوی ئەوەشیان هەبوو کە بەشیان لە بەرهەمەکان هەبێت هەرکاتێك نیازیان هەبووبێت و بەکەیفی خۆیان هەڵیاندەبژارد. بە ڕای ودرۆ ویلسن مومارەسەی هەرەمەکی و بەدخووی دەسەڵاتی حکوومەت نموونەی ئۆتۆکراتییەت و حوکمە ئیمپراتۆرییەکان بوو کە ویلسن بەرپابوونی جەنگی جیهانی یەکەمی خستە ئەستۆی ئەوان و پووچەڵ کردنەوەیان و



لەناوبردنیانی بە پێویست دانا بۆ دەسکەوتی ئاشتییەکی هەمیشەیی. کۆتایی پێهاوردەی ئیمپراتۆری کیشوەرەکان زۆر پێویست بوو، چونکە خاسیەتە نالیبراڵەکانی پراکتیس کردن و کەڵەکەبوونی سوپایەکی زۆر بەسەریەکەوە، مومارەسەی هەرەمەکی دەسەڵاتی سیاسی و دەستێوەردانی چالاکە ئابوورییەکان بۆ بەرژەوەندی خود، هەموو ئەمانە پاڵنەرێك بوون بۆ جەنگ لە نێو ئیمپڕاتۆرەکان. هەرچەندە ویلسن باسی ئەوانەشی نەکرد کە ئەو هێزە سیاسیانەی بوونەتە هۆی بەرپابوونی جەنگ هەر ئەمان بوون کەوایان لە پاریسییەکان کرد بەندیخانەی باستیل بڕوخێنن و هەرئەوانیش لایەنی هێرشبەر بوون! جەنگی جیهانی یەکەم کە بەرپابوو بەهۆی بەردەوامی هەمان ڕژێمە کۆنەکە بوو. گەر هەرسێ بەشەکەی ڕوانگەی ویلسن — سنوورێك بۆ چەك حکوومەت بۆ خزمەتی گەل و لابردنی بەربەستەکانی بەردەم بازرگانی هاتبوانە کایەوە، ئەوا کەم و کورییەکانی خاڵی چوارەمی کە (عصبە الامم) بوو رەنگە زۆر نەبوایە، چونکە گەر سێ خاڵەکەی تر خۆیان ململانێیەکی چون جەنگی جیهانی یەکەمیان بەرپاکردبوایە ئەوا جارێکی تر ململانێیەکی ئاوا ڕووی نەدەدایەوە، بەڵام سێینەکەی ویلسن نەهاتنە کایەوە و جێبەجێ نەکران.

بە هەقیقەت لە جیهانی بەریتانی و ئەمریکییەکانیش بەتەواوی نەهاتنە کایەوە کە سەرچاوەی ئەو سێینە بوون. بەریتانیا حەزی بە حوکمی زاتی نەدەکرد لەبەر موڵکدارێتی ئیمپراتۆرییەکەی هەروەها زۆر بە پەرۆشیش نەبوو بۆ سنووردانان لەسەر هێزی دەریایی. هەروەها ویلایەتە یەکگرتووەکانیش بەدڵ خۆی تەرخان نەکردبوو بۆ بازاڕی ئازاد، بەڵام تۆقێنەرترین ئاستەنگ لەبەردەم کارکردنی سێینەی ویلسن ڕکابەرە نوێیەکانی لیبراڵیزم بوون، کە ئاکامی جەنگی جیهانی یەکەم و هاتنە ئاراوەی فاشیزم و کۆمەنیزم دوو ئامانجی سەردەمی مۆدێرنیزمیان پەسند کرد ئەوانیش گەشەپێدانی ئابووری و سەروەری گەل، بەڵام ڕێگای نالیبراڵ و ڕادیکاڵیان بۆ دەستەبەرکردنیان بەکار دەهێنا. دووبەرەکی نێوان هەردووکیان و لیبراڵیزم بۆ سەرکەوتن بەسەر جیهان زاڵ دەبوون بەسەر سەدەی بیستەمدا. دووبەرەکی نێوان لیبراڵیزمی نێودەوڵەتی و تۆتالیتاریانزمی فاشست و کۆمۆنیست لەسەر ئەوەبوو کە ئایا ئیرادەی گەل بە ئاشکرایی لە ڕێگا دەزگای و ڕێنماییەکانی دیموکراسی لیبراڵەوە دەردەبرێت یان لەڕێگای نوخبەیەك لەو حزبانەی کە خۆیان هەڵبژارد و دەسەڵاتی باڵایان لە وڵاتدا هەبوو. هەروەها لەسەر ئەوەش بوو کە ئایا ئەو سامانەی لە شۆڕشی پیشەسازیەوە بەدەست هێنرا لە

ڕێگای بازاڕی ئازادی جیهانی بەریتانی و ئەمریکییەکان باشتر بەدەست دەهێنرێت یان، بەڕای فاشیزم و کۆمۆنیستەکان، لە ڕێگای کۆنترۆڵی حکوومەت بەسەر ئەرکە بنچینەییەکانی ئابووریدا وەك خستنەگەڕی پارە (وەگەڕخستن) و بەرهەم هاوردە و دابەشکردن.

سەبارەت بە ئاسایشی نێودەوڵەتیش کەبەراستی پێویست بوو بە ڕێگایەکی نالیبراڵی و پەنا بردنە بەر جەنگەوە دەستەبەر دەکرا. لە ڕووی ئەو ڕوانگەوە دەسەڵاتە لیبراڵییەکان ڕەنگە باوەڕیان وابێت کە جەنگ کارێکی ناسروشتی و نەویستراوە، بەڵام زۆر ئاستەم دەیانتوانی کاربکەن وەك بڵێی مەحاڵ بێت تادوا قۆناغی سەدەی بیستیش ئاشتی ڕاستەقینە کە تاکە شت بوو کۆنترۆڵی سنووری چەکی کردبوو ئەگەرێکی واقیع بینانە بێت. ودرۆ ویڵسن باوەڕی وابوو کە دیموکراسی و بازاڕی ئازاد و سنووری چەك دەبێ لەسەرانسەری جیهان پراکتیز بکرێن، زۆربەی ئەوانەی دوای جەنگی جیهانی یەکەم لە سەدەی بیستەمدا دوور بوون لە جیهانی ئەو ئایدیایەی کە دەشێ پێوەرە لیبراڵییەکان دەست بەسەر جیهاندا بگرن. بۆ ئەو سەرکردە ڕۆژئاواییانەی کە بەدوای ویڵسن کەوتبوون گەر ئایدیەیەکی سەرنجڕاکێش جێبەجێ بکرێت سوودێکی زۆری دەبێت، بەڵام هیچ ئەگەرێکی کردنی ئەو کارە لە ئارادا نەبوو تا کۆتایی جەنگی سارد کاتێ ئایدیا لیبراڵییەکان هاتنەکایەوە وەك پێناسێکی ژیانی نێودەوڵەتی.

### *دەسەڵاتی ڕەهای لیبراڵ*

دووبارەبوونەوەی ئەزموونی ڕابردوو، بەڕای فرۆید، ڕوودەدات کاتێ یەکێك شتێك لە ژیانی ڕاستەقینەدا دەکات ئەو شتە پێشتر لەخەونێکدا دەرکەوتووە. بەپێی ئەم پێناسەیە، جیهانی دوای جەنگی سارد پێکهاتەی هەموو کتێبەکەیە. ئەوەی ویڵسن بەکۆتایی هاتنی سەدەی بیست خەونی پێوە دەبینێ بۆ هەموو ئەوانەی دوای ویڵسن هاتە دی، ویڵسن پێشبینی و خەیاڵی ئەو وێنە جیۆپۆلیتیکە نوێیەی دەکرد، ئەو ململانێیەی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا کە زاڵ بوو بەسەر جیهان بوو بەیەك ململانێ ئەویش ئەوە بوو کە بنەما لیبراڵەکان بەرەنگاری نەدەکرانەوە.





کۆنترۆڵی چەك و هێزی دەریایی ئایدیایەکی سەدەی نۆزدەم بوو، بەڵام لە سەدەی بیستەمدا بوو بە داهێنان، لەسەردەمی ویڵسن هیچ حوکمێکی پابەند بە موڵکداریێتی جەنگ نەبوو، بەڵام لە جەنگی ساردا حوکمگەلێك لە ئارادا بوو زۆربەیان پەیوەست بوون بە هەرێمێکی تایبەت یان جۆرە چەکێکی تایبەت هەرێمەکەش ئەورووپا بوو. کاتێ یەکێتیی سۆڤیەت ڕووخا، کیشوەری ئەورووپا سەرگەرمی بەهێزکردنی هێزی سەربازی بوو لە کاتێکدا ئەمریکا مژوڵی زانستی بیناسازی بوو لە شارەکاندا. ڕژێمە چەکدارەکانی ئەورووپا، کە زۆربەیان دامرکێنرانەوە لە ساڵەکانی جەنگی سارد و ماوەی دوای جەنگی سارد کۆمەڵێ یاسای هەرێمی سەربازی بوون. یاساکانیش وا دانرابوون تا هاوسەنگییەکی جێگیر بەرهەم بێت بۆ هێزەکان، هەروەها یاسای هەرێمەکان بۆ دروستکردنی شوێنی بەرز دانرابوون کە لە ڕووی بازرگانییەوە زۆر بە پەرۆشەوە پێشوازیان لێ دەکرا، کە کوشندەترین و قورسترین چەك ناسراوو بوو بە چەکی (کۆمەڵ کوژ). ئەو پۆلینە چەکی ناوکی و بایۆلۆژی و کیمیایشی گرتەوە.

سەبارەت بە دیموکراسیش، زۆر دەگمەن بوو لە سەردەمی ویڵسندا لە نێو هاوپەیمانی وڵاتانی ویلایەتە یەکگرتووەکان و بەریتانیا و فەرەنسا و هەروەها کۆمۆنیستە بەریتانییەکانی کەنەدا و ئوستڕالیا و نیوزلەندا، ئەمانە جەنگی جیهانی یەکەمیان بردەوە کە سەرەنجام وڵاتە دیموکراسییەکانی جیهانیان ماندووکرد بەوەی کە حکوومەتەکان بە ئازادی هەڵدەبژێردران و یاساکانیش بەدوای ئەو جۆرە حکوومەتانەوە کەوتبوون، بەڵام لە کۆتایی جەنگی سارددا دوای هەشتا ساڵ ئەو ئامانجەی کە ئەمریکا لە جەنگی جیهانی یەکەم بۆی دەجەنگا بە ئاشکرا دەستەبەرکرا ئەویش زۆربەی جیهان بوون بە دیموکراسی. لە ڕاپۆرتی ساڵی (١٩٩٩ — ٢٠٠٠) دا ی ڕێکخراوی (کۆشکی ئازادی ئەمریکی — Freedom House) (ڕێکخراوێکە بۆ گەشەپێدانی سەربەخۆیی سیاسی لە جیهان) دەرکەوتووە کە هەشتا و پێنج وڵات لە کۆی (١٩٢) وڵاتی جیهان (ئازاد) بوون و زیاتر لە شەست وڵاتیش (نیمچە ئازاد بوون) هەرچەندە ژمارەی وڵاتە سەربەخۆکان وەلانرابوون، بەڵام ڕێژەی ئەو ڕاپۆرتە زۆر زیاتر بوو لەچاو ڕاپۆرتەکەی سەردەمی ویڵسندا. هەروەها زیاتریش بوو لە ڕاپۆرتێکی هەمان ڕێکخراو کە دە تا بیست ساڵ بەر لەوکاتەی ئەنجامی دابوو.

سێیەم ئایدیای ویڵسن کە بازرگانی نێودەوڵەتی بوو خاسیەتێکی سەرنجڕاکێشی جیهانی دوای جەنگی سارد بوو، لە نێوان ساڵانی (١٩٥٠ — ١٩٩٦) هێنەرەکانی جیهان شەست قات

زیادی کرد (سەرەنجامی نێردراوە ئابوورییەکان شەست ئەوەندە زیادی کرد) لە زۆربەی وڵاتاندا هێنەرانی کەل و پەلی بازرگانی بە گوێرەی ڕێژەی سەرجەمی داهاتی بەرهەمی ناوخۆیی لە جەنگی ساردا زیاتر بوون لەوەی کە لە سەردەمی جەنگی جیهانی یەکەمدا هەبوو.

گەلێ لەو وڵاتانەی کە سەربەخۆییان لەپاش جەنگی جیهانی دووەمەوە بە دەست هێنا دەستیان کرد بە ژیانێکی پڕ لە سەروەری و سنووریکیان دانا بو ئەو بەرهەمانەی کە بەلێشاو لە هەموو شوێنێکەوە وەبەردەهاتن، بەڵام لەنەوەدەکان زۆربەی ئەو بەربەستانەی کە دایاننابوو هەڵیان وەشاندەوە. ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی لە ساڵی (١٩٩٧) دامەزرا بۆ زیاتر کردنی بنەماکانی بازرگانی ئازاد (١٣٢) ئەندامی هەبوو لەگەڵ (٣٠) وڵاتی تر کە نیازی پەیوەندی کردنیان هەبوو، هەروەها لێشاوی سەرمایە لە نێوان سنوورەکان لە نێو بازرگانیدا زیادی کرد.

لە هەمانکاتدا، ژمارەیەکی زۆری وڵاتان بنەما لیبراڵەکانیان خستەکار بۆ ڕێکخستنەوەی چالاکییە ئابوورییەکان و سنوورەکانیان. ڕۆڵی حکوومەت لە بەرێوەبردنی ئابووریدا لە کورتیدا و، بەڵام لە بنەماکانی بازاڕ و بڕیار لە بارەی بەرهەم هاوردە و دابەشکردن زیادی کرد و فراوان بوو، ئایدیای ئابووری لیبراڵ زیادی کرد، تەنانەت لەو بەشانەی جیهانیش کە لە جەنگی ساردا دژیان دەوەستانەوە. (وانگ زۆنگیۆ – Wang Zhongyu) وەزیری ئابووری و بازرگانی کۆماری چین (کە ناونیشانەکەی خۆی لە خۆیدا باجێکی ڕەسمی نالیبراڵیزمی ئابووری بوو) لە ساڵی (١٩٩٧) دا وتی (**ئێمە دەبێ سیستەمێکمان هەبێت کە تیایدا بەهێز بمێنینەوە و بێهێزیش تیایدا لەناو بچێت، پەندی ئابووریی بازاڕ ئاوهایە**) ئەم وتەیە لەدەمی گەورە بەرپرسێکی وڵاتێکەوە هاتە دەرەوە کە تیایدا گەر هەرکەسێك گومانی ئەوەی لێ کرابا بە ڕێگای سەرمایەداریدا دەڕوات ڕەنگە بەند یان گوللە باران کرابوایە. زاراوەیەك لە جەنگی ساردا پەرەی سەند کە جۆرە بەهێزییەکی ئایدیا و پراکتیزی ئابووری لیبراڵی بەخۆوە بینی ئەویش جیهانگیری بوو (Globalization) لە هەمانکاتدا واتاگەلێکی هەمەجۆری هەبوو، بەڵام مانای تەواوی زاراوەکە بڵاوبوونەوەی بازاڕی ئازادە لە هەموو شوێنێکدا.

نیشانەیەکی تری سەرکەوتنی لیبراڵیزمی ئابووری، دەسەڵات و ڕەوشی دوو دەزگای سەرەکی دارایی نێودەوڵەتی بوو ئەوانیش : (بانقی جیهانی – World Bak) و گەنجینەی پارەی نێودەوڵەتی (I M F) مەڵبەندی سەرەکیان لە واشنتۆن بوو (پایتەختی ویلایەتە یەکگرتووەکانە) کە تا ڕادەیەکی زۆر هاوکاری بازاڕی ئازادی دەکرد، هەردووکیشیان پابەند



بوون بەزۆر کردنی ئەو بنەمایانەی گەنجینە کە لە بانق گرنگترە. ئەمەش ئامێرێکی زۆر گرنگی هەیە بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە ئەویش پارەیە.گەنجینەی پارەی نێودەوڵەتی ئابوورییەکانی بازاڕی فاتیکان بوو، بەڵام بەدەسەڵاتر بوو لە مەترانی ڕۆم. پرسیارە گاڵتەجاڕیە بەلاغییەکەی ستالین دەربارەی دەسەڵاتی کەنیسە (ئایا پاپا چەند خزمەتی هەیە) بەتەواوی نەشیاو بوو بۆ قەڵای ئۆرتۆدۆکسی ئابووری لیبراڵ لە دواییەکانی سەدەی بیستەمدا. ئەمەش لەبەرئەوەی (I M F) بێ ئەوەی کۆشکێکی هەبێت بۆ پاسەوانان بەهۆی جەنگی ساردەوە داوای دەسەڵاتی دەکرد بۆ هاندانی حکوومەتەکان تاوەکو سیاسەتی کاریگەر بگرنەبەر لەگەڵ کاریگەری جدی ئابووری، چونکە زۆر جار ئەمە زۆر بێسوود دەبوو بۆ گەلی ئەوان. لەبارەی ئاڵوگۆڕ کردن بۆ قەرزپێدان بە حکوومەتەکان (I M F) بە جدی سوور بوو لەمەڕ پابەند بوون بە یاسای سنوورداری بازاڕی ئازاد. سنووردارکردنی ئەو یاسایە زەحمەت بوو وەك ڕجیمێکی زۆر زەحمەت وابوو کە ڕەوشی ئابووری وشك دەکردەوە کە هەندێ جار ماوەیەکی زۆری دەخایاند. ڕەنگە (I M F) لەهەندێ وڵاتاندا شتێکی باو نەبووبێت، بەڵام بەهۆی جەنگی ساردەوە نزیکەی لە هەموو شوێنێك لە ئارادابوو. هیچ وڵاتێك بەرگەی یاسا ڕێکخراوەییەکانی نەدەگرت لە کاتی تەنگانەی ئابووریدا یان بڵێین وەك دیموکراسی پیشەسازی سامانێکی دەوڵەمەند نەبوو. لە ساڵی (٢٠٠٠) دا هەشتا و سێ وڵات پابەند بوون بە (I M F) و پرۆگرامی قەرزدانیان بەهەر جۆرێك بێت داناوە، هەروەها هەموو ئەو وڵاتانەشی گرتەوە کە لە یاسای کۆمۆنیستدا لە ئەوروپا بوو بە هێمایەك بۆ کارکردن بە جدی، بەڵام بە مەرجێك کارکردنەکە تەنها بۆ سەروەری بێت.. گەر هەر وڵاتێك پرۆگرامێکی لەم چەشنەی هەبوایە ئەوا وڵاتێکی جدی پڕ لە سەروەری بوو.

کاتێ ئینترناشنالیزمی لیبراڵ کە ودرۆ ویڵسن هاوردەی بۆ پاریس دوابەدوای جەنگی سارد داواکاری لە سەر زیاتر بوو لەچاو پێشتر، زیاتر کاری پێدەکرا بە بەراورد لەگەڵ پێشتر. بنەماو بۆچوونەکانی هێشتا لە هیچ شوێنێك وجودی نەبوو، لە دەستووری جوگرافیدا کە سنوور لەسەر چەك دادەنرێت تەنها لە ئەوروپا پەرەی سەند هەندێ لەو سنوورانەش زۆر ناسك بوون. ئەو پەیمانانەی کە ئەوانی ڕیز دەکرد لەسەر ڕێکەوتنی ئارەزومەندانە وەستابوو ئەو یاسایانەی کە چەکی بەکۆمەڵ کوژیان بەڕێوەدەبرد لە ڕوێکەوە جیهانی نەبوون، هەروەها ڕێکەوتنێکی جیهانیشیان نەبوو، ئەو گرێبەستانەشیان بۆ نەدەکرا کە بۆ جۆرە چەکەکانی تر دەکرا. بە

هەقیقەت کاتێ سنوور دانان بۆ چەك گرنگ دەبوو گەر ئایدیای ئاشتی بە شێوەیەکی جیهانی پەسندکرابوایە.

سیاسەت و ئابووری لیبراڵ نەك هەر تەنها بە کردە، بەڵکو بە تیۆریش باشتر لە کۆنترۆڵکردنی چەك بونیاتنرابوو لەپاڵ سیاسەتەکانی گەل و دەستوور، هەروەها داب و نەریتێکی دەوڵەمەندی مەعریفی و مشتومڕێك لە ئارادا بوو کە بەلانی کەم دەگەڕێتەوە سەردەمی فەیلەسووفانی ئینگلیزی لە سەدەی حەڤدەدا وەك (تۆماس هۆبز – Thomas Hobbes) و (جۆن لۆك – John Loclce) داب و نەریتێکی هاوشێوەی ئەمە لە ئابووریی بازاڕدا زۆر باونەبوو، بەڵام ڕەگ و ڕیشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی هەژدەم و ڕووناکبیری بلیمەتی (ئادەم سمیس – Adam Smith)، هیچ داب و نەریتێکی سەرنجراکێش لەپاڵ ئایدیای کەم کردنەوەی چەك لە ئارادانەبوو کە کلیلێك بوو بۆ ئاشتی نێودەوڵەتی.

کاتێ ئەو شێوازی حوکمەی کە ویڵسن پێی وابوو گرنگ بە قووڵی و فراوانی دامەزرا بۆ ئاشتی جیهانی لە سەر ئاستی گەدوونییەوە نەهاتە کایەوە. لە سەرەتای دەیەکانی دوای جەنگی سارد، دیموکراسی بوو بە بنێشتە خۆشەی سەر زاران بە تایبەتی لەلایەن ئەو فەرمانڕەوایانەی کە تەنها بە ڕووکەش کەیفیان پێ دەهات نەك بەدڵ. گەلێ وڵات هاوشێوەی پەرلەمانی بەریتانیا یاخود سیستەمی فیدراڵی ئەمریکیان هەبوو، بەڵام تەنها بەقسە نەك بەکردار. لە سەدەی هەژدەدا (گریگۆری پۆتمکین – Grigori Potnekin) وەزیری ئیمپراتۆری کاترینای مەزنی روسیا ڕێگایەکی بونیاتنا تەنها بۆ گەشتەکانی خۆی، ئەو ڕێگایە زۆر سەرنج ڕاکێش بوو، بەڵام لەنزیکەوە زۆر بەدخوو بوو، بەڵام وایان دروستکردبوو کە قەناعەتیان بەوەزیرهێنا زۆر بە پتەوی دروست کراوە، لە مێژوودا ناسراوە بە گوندەکانی (پۆتمکین). بەهەمان شێوە گەلێ دیموکراسی پۆتمکین لە نێو هەموو شتەکانی تر هاتنەکایەوە بۆ هەڵخەڵەتاندنی سیستەمی بەهێزی نێودەوڵەتی، ئەمەش دەچێتە خانەی بەرژەوەندی ئابووری و لەسەر ئەو رژێمانەش حساب دەکرێت کە بەدیموکراسی ناسرابوون. لەسەر نەخشەی جیهاندا ڕەنگی سوور بۆ دیموکراسی لە وڵاتی یەکێتیی سۆڤیەت و وڵاتە عەرەبیەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەفریقیا دانراوە کەچی دەشێ ئەو وڵاتانە بە 'کاڵترین پەمەیی' وەسفیان بکرێت (واتە بە هیچ شێوەیەك دیموکراسی نین). حکوومەتی کۆماری گەلی چین کە زۆرترین



دانیشتوانی هەیە لە جیهاندا چەوساندنەوەی سەربەخۆیی سیاسی کردۆتە پیشەیەکی زۆر چڕوپڕی رۆژانەو زۆریش تینوون بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە.

بازرگانی و بازاڕی ئازاد بە شێوەیەکی گشتی پەسندتر و کردەیی تر بوو لەچاو هەردوو بەشەکەی تری سێینەی ویڵسن. حکوومەتی چین بەتەواوی دژی سیاسەتی لیبراڵ بوو، بەڵام لە ڕووی حەزەوە بەلانی کەم لە رووی بەلاغییەوە کەیفی بە ئابووری لیبراڵ دەهات. لەگەڵ ئەوەشدا، بەربەستەکان لەبەردەم بەردەوام بوونی بازرگانی لە سیستەمی نێودەوڵەتی لەسەردەمی ویڵسندا بچووکترو کەمتر و ئاشکراترو خورتتربوون.

هەروەها جیهانیش تەواو لیبراڵ نەبوو بەو شێوەی کە ویڵسن شەڕی لەسەر بوو، بەڵکو جیهانێك بوو جگە لە ئاشتی هیچی تری تیانەبوو لە دواهەمین دەیەی سەدەی بیستەمدا، هەرەشەی ململانێی گەورە وەکو ئەو سێ ململانێیەی کە زاڵ بوو بەسەر سەدەی بیستەم زۆر کەم ببۆوە، بەڵام جەنگە بچووکەکان بێ شوومار بوون.

لە دەرەنجامی جەنگی ساردا ئینتەرناشنالیزمی لیبراڵ شتێکی جیهانی نەبوو، بەڵکو هیجیمۆنی بوو (Hegemonic) واتا دەسەڵاتی ڕەها. چەمکی هیجیمۆنی لە ئەسڵدا لە یونانی کۆندا هاتووە ئەو کاتە بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە یەك دەسەڵاتی رەهای سەرکردەیەك لە شارێکدا یان لە وڵاتێکدا حوکمی دەکرد، ئەو شارە لەگەڵ کۆنفیدراڵی وڵاتی یونان‌دا بوو. هیجیمۆنی زاڵ بوو بەسەر ئەوانی تردا. بەهەمان شێوە لیبراڵیزمی نێودەوڵەتی تاوەرێك بوو لە جیهانی دوای جەنگی ساردا کۆمەڵێ دەزگا و بنەمای سیاسی و ئابووری هێنا ناومەیدانەوە. لەلایەن زۆربەی ئەو ئەندامە بەهێزانەی سیستەمی نێودەوڵەتی مومارەسەکرا و بەرەو پێشەوە برا کە ئۆرتۆدۆکسی جیهان بوون، ئەو کاتەش هیچ ڕکابەرێکی جدی نەبوو کە کۆمەڵە بنەمایەکیان هەبێت بۆ ڕێکخستنی پەیوەندییە سەربازی و ئابووری و سیاسییەکان. هەموو وڵاتانی خاوەن سەروەری هەرسێ خاسیەتەکەی لیبراڵیزمی نێودەوڵەتیان پەسند نەکردو نەشیانتوانی مومارەسەی بکەن، بەڵام هیچ بنەمایەکی ئاڵتەرناتیف نەبوو. پرسیاریان لە بیناسازێکی فەڕەنسی کرد کە ئایا چ شوێنێك بەلای ئەو خۆشترین شوێنە لێی بژیت؟ لە

وەڵامدا : تاوەری ئیڤڵی هەڵبژارد و وتی ئەمە تاکە شوێنە لە شارەکە من هەر پێویست ناکات سەیریشی بکەم ! لیبراڵیزم تاوەری ئیڤڵە لە سەدەی بیست و یەکدا(*).

هەروەك تاوەری ئیڤڵ، جیهانی لیبراڵ لە سەدەی بیست و یەك هەموو کەسێکی دڵخۆش نەکرد، بەڵکو ڕکابەرەکانی بەهەرا و هۆسە هەندێ جاریش توند و تیژ بوون. ئەوەی لە ئاست ئەو ڕکابەرانەشدا بوو تیرۆرستانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوو کە هێرشی / ١١ / ی سێپتەمبەری / ٢٠٠١ / یان ئەنجامدا، هەروەها ئەو هەزاران ڕۆژئاواییەشی گرتەوە کە خۆپیشاندانیان سازکرد دژی سیاسەتی ئابووری نێودەوڵەتی بەتایبەتی وڵاتە دەوڵەمەندەکان، لە کۆبوونەوەی ڕێکخراوی بازرگانی جیهان لە سیاتڵ لە مانگی دوانزەی / ١٩٩٩ / ئەنجامدراو هەروەها لە کۆبوونەوەی گروپە هەشت ئەندامییەکە (وڵاتە دیموکراسییەکان لە ڕووی سامان و پیشەسازی لەگەڵ ڕوسیا) کە لە ساڵی / ٢٠٠١ / لە گیۆنا سازدرا.

هەردوو گروپ ڕقیان لە دەزگا و مومارەسەکردنی لیبراڵ دەبۆوە کە جیهانی سەدەی بیست و یەك داگیری کردبوو، هەردووکیان دەگەڕان بەدوای تێك و پێك شکاندنی، بەڵام هەردوو گروپ نەهیوای ئەوەیان بەخۆ بوو کە سەربکەون نەهیچ پلانێکیشیان پێشکەش دەکرد بۆ ئەو شتەی کە ڕکابەرێتیان دەکرد.

---

* ئەم رایە دوو سەدەی لەمەوبەری نەریتەکانی لە مەڕ تێگەیشتنی مێژوویمان لە بەریتانیا و ویلایەتە یەکگرتووەکان دەخاتەوە یاد کە ناسراوە بە (شرۆڤەی وای – Whig Interpretation) کە رۆشنایی سەربەخۆی خستەڕوو وەك جەرگەی ئەزموونی نەتەوەیی هەر دوو سەدەکە، لەبەر ترسی سەدەی بیستەم ئەو ڕۆشناییە لە هەردوو وڵاتدا لەبەرچاوان کەوت، بۆ زیاتر زانیاری لە سەر ئەم خاڵە سەیری (شێوەی مێژووی ئەوروپا) ی ویلیەم ماکنەل بکەن لاپەرە سێ لە ساڵی / ١٩٧٤ / لە نیۆرك چاپکراوە. دراسەی ئەسڵی ئەم تەوەرە بۆ تێگەیشتنی مێژوویی لەلایەن مێژوونووسی ئینگلیزی هێربەرت بەتەقلید بەناوی مێژووی لێکدانەوەی وای بڵاوکراوە لە ساڵی (١٩٣١) باسی ئەوە دەکات کە لێکدانەوەکان بۆ پێناسەی پرۆتێتانیزم و چاکسازی و مارتن لۆسەر و سەرهەڵدانی سەربەخۆیی زۆر ورد نین !! ئەو بەشەی لێرە باس کراوە مێژووی (وای) یە لەگەڵ تۆڵە، چونکە تەنها سەدەی نۆزدەم ناگرێتەوە هەروەك دەقە ئینگلیزییە ئەسڵییەکە وای کردووە، بەڵام سەدەی بیستەمیش دەگرێتەوە لە کتێبی (کۆتایی مێژوو و دواهەمین پیاو) لە ساڵی (١٩٩٣) لە نیۆرك چاپ کراوە کۆتایی جەنگی سارد مانای کۆتایی مێژووە تەنها لەیەك ڕووی زۆر گرنگەوە نەبێت کە فۆکۆیاما مەبەستییتی ئەویش : سەرکەوتن و هیجیمۆنی فۆرمەلییەکان.



لە دەرەنجامی هێرشەکانی / ١١ / ی سێپتەمەر ئەوروپا ڕێپێوانێکی دژی کردە سەربازییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان سازداو ئەو دروشمەیان بەرزکردەوە (شارستانیەت واتە جینۆساید) ئەم دروشمە لەگەڵ دوژمنانی سێینەی ویلسن یەکی گرتەوە دروشمێکی ناڕێك و دەمارگیرانە بوو کەواتە سیستەمی نێودەوڵەتی وەکو نرخە جێگرەکانی لیستی خواردن بوو کە ئایا جۆری خواردنەکان قبوڵ دەکەین یان ڕەتی دەکەینەوە کە هەموو کەس دەیتوانی بەسەریدا بازبدات و هەڵیبژێرێت یانیش هەرنەیخوات و برسی بێت.

لەدەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا، بێرما، کوبا، عێراق و باشووری کۆریا لیبراڵیزمی نێودەوڵەتیان ڕەتکردەوە، جا بەهەقیقەت ئەو وڵاتانە بەرەو برسێتی چوون، بەڵام هیچ لیستێکی دیکەی خواردن نەبوو، هیچ ڕیزە مقبلاتێکی سیاسی و ئابووری نەبوو داوای بکەن، بەڵکو کەش و هەوای ئابووری سیاسی جیابوو لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر بەهۆی جەنگی ساردەوە کەش و هەوای جیهانی بێ هەڵە لیبراڵ بوو هەموو دنیا ڕەخنەی لە لیبراڵیزمی نێودەوڵەتی دەگرت، بەڵام کەس ئەڵتەرناتیڤێکی پێشکەش نەدەکرد. دیموکراسیە پۆتمینەکان و ئابووریی بازاڕەکان بە حکوومەت ە قۆرخکەرەکان و بۆرسەی دژوارەکەیانەوە، سەرەڕای هەموو ژێرکەوتنێکیان لە بەرابەر پێوەرە لیبراڵییەکان بەڵگەنامەیەکی باش بوون بۆ (هیجیمۆنی) لیبراڵ ئەوانە پرۆژەی دوو ڕوویی و تەڵەکەبازی بوون، بەڵام هەروەك (لارۆچفکۆکەل – Larochefoucauld) دەڵێ : دووڕوویی باجێکە خراپ دەیدات بە چاك. لەسەرەتای سەدەی بیست و یەکدا لیبراڵیزم بە کرۆکی چاکە دادەنرا. هەروەها زۆربەی وڵاتەکان بە شێوەیەکی ڕەمزی باجیان دەدا بە لیبراڵیزمی نێودەوڵەتی، زۆربەیان هەوڵیان دا بەلانی کەم هەندێ لە خاسیەتەکانی بەکارببەن، کۆششیان بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەش زاڵبوونە بەسەر کارنامەی جیهانی لەسەرەتای سەدەی بیست و یەکدا.

### ***کارنامەی (ئەجێندە) ی دوای جەنگی سارد***

کۆتایی دەیەی یەکەمی دوای جەنگی سارد بەرامبەری مێژووی جیهانی مۆدێرن بوو کە یەك لە چیا سەرسەختەکان بوو ئەویش بەسەرچوو. لە سەدەی نۆزدەدا، لە باشووری ئەمریکا ڕابەرو پێشەنگەکان بەسەریدا تێپەر بوون کە خاڵێکی گرنگ بوو بۆ داپۆشینی شێوەی لووتکەی مێژوویی بە جۆرێکی زۆر ڕەوانتر کە لێیەوە دەرەنجامەکان ژیرانەتر لەچاو پێشتر دەخرانە ڕوو. ڕابردوو بەواتای

مێژووی سەردەمی مۆدێرن لە نێو جەنگی ساردا بەسەر دوو بەش دابەش دەبێت. ململانێی نێوان سەدەکانی جیهان، مومارەسە کۆنەکانی ئابووری و سیاسی، دەزگاکان، گریمانەکان و ئەو هێزانەی کە جیهانی مۆدێرنیان دروستکرد زاڵبوو بەسەر سەدەی نۆزدە. لە شۆڕشی فەڕەنسییەوە تا جەنگی جیهانی یەکەم ئەم ململانێیە بووە کایەی بازاڕی ئازاد و هەڵبژاردنی ئازاد و خۆ ئامادەکردن بۆ ئاشتی نێودەوڵەتی دژی ئەوانەی دەستیان داگرتبوو بەسەر چالاکییە ئابوورییەکان، حوکمی مەلەکی و پەسندکردنی جەنگ وەك ئامێرێکی یاسایی وڵاتەکان.

لە کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەمدا، ڕژێمە کۆنەکە ڕووخاو داینەمۆ بەهێزەکەی شۆڕشی پیشەسازی هەموو ئاواتەکانی ژیانی ئابووری لادێ و کشتوەکاڵی لەناوبرد. شۆڕشی فەڕەنسا ئەو ئایدیایەی بەرهەم هێنا کە خەڵك دەبێ حوکم بکات نەك سەردار و پاشاکان، پاش سەدەیەکی دورودرێژ پاشاکان چۆکیان دادا و دواهەمین قەڵایان لە جەنگی جیهانی یەکەم تەخت کرا. هەروەها ئەو ململانێ مەزنەی کە لە ئەوروپا کۆتایی بە حوکمی هەمیشەیی هێنا بێ بەشکرا لە شەرعییەتی جەنگ. کوشتار و سەربڕین و خواردنی یەکتر لە خەندەقەکان بێشکەی بەریتانی و ئەمریکییەکانی بەرەو ئەو بۆچوونە برد کە جەنگ دەبێ پووچەڵ بکرێتەوە.

لە سەدەی بیستەمدا، لە جەنگی جیهانی یەکەمەوە تا کۆتایی جەنگی سارد دوو ڕووی مۆدێرن دەستیان کرد بەڕکابەرێتی لەبڕی دەزگا و مومارەسەی لیبراڵییەکان، لایەنی نالیبراڵ ویستی کۆنترۆڵی چالاکی ئابووری و داپڵۆسینی سیاسەتەکانی سەربەخۆیی و پەرەسەندنی کەل و پەلی جەنگ بکات. لە جەنگی جیهانی دووەمدا جیهانی لیبراڵ بەرژەوەندی بونیاتنا لەگەڵ یەك لقی نالیبراڵیزم ئەویش کۆمۆنیستی سۆڤیەت بوو دژی دووەکەی تر ئەوانیش نازی و ئەڵمانیا و ئیمپراتۆری ژاپۆن بوون. جەنگی سارد هەردوو سەرکەوتوانی جەنگی جیهانی دووەمی بەیەکتر بەستایەوە. لیبراڵیزم هاتە کایەوەو سەرکەوت بێ ئەوەی ئەو بەرەنگارییەی بکرێتەوە کە دووچاری بوو لە هەردوو سەدەی نۆزدەم و بیستەمدا.

هەروەها تێڕوانینی سەردەمی دوای جەنگی ساردیش جەخت لەسەر کارە چاکەکەی ودرۆ ویلسن لە مێژووی مۆدێرندا دەکاتەوە. شوێن پەنجەی ویلسن لە نێو سەرکردە ڕۆژئاواییەکان لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا دیارەو تاکە، هەروەك(دەیڤد لیۆد جۆرج و جورجیس کلێمنس و وینتسن چرچڵ و فرانکلین ڕۆزڤێلت) سەرپەرشتی کارەکانی یەکێکە لەو وڵاتانەی سەر بەهاوپەیمانی سەرکەوتوو لە هەردوو جەنگە گەورەکەی سەدەکەدا کرد، بەڵام ویلسن کەسێکی



سیاسی جودا بوو لەو سەرکردانە. ویلسن کەم و کوڕی لە خاسیەتی کەسی و سیاسیدا هەبوو، کەچی سەرکردەکانی تر بەو خاسیەتانە لە جەنگدا سەرکەوتن بۆ نموونە : ڕاشکاوی لیۆد و سووربوونە پۆڵاییینەکەی کلێمنس و چرچڵ وای لێیان کرد سەربکەون. ویلسن نەشێر بوو نە ڕێویش هەروەها ئاوا وەك ئەوان گرنگ نەبوو لە سەرکەوتن. ئەمریکا زۆر درەنگ چووە نێو جەنگی جیهانی یەکەم کەچی بەشدارییەکی زۆر گونجاوی کرد لە دەرەنجامەکانی. لەیەك لە ڕێگا گرنگەکان لەگەڵ لینین و هیتلەر یەکدەگرێتەوە هەرسێکیان لەسەر سەکۆی جیهاندا هەڵگری سیستەمێك بوون. هەر سیستەمێك لەسەر بناغەی خاسیەتێکی تایبەتی ژیانی کۆمەڵایەتی بوو بۆ نموونە : سەربەخۆیی لەسیستەمی ویلسن، چین و ڕەچەڵەکیش لە دووەکەی تر هەریەك لەو خاسیەتانە بناغەی ڕیزبەندی سیاسی و کۆمەڵایەتی دەسەڵاتێکی گەورەیە کە حکوومەتەکەی هەمیشە هەوڵی بڵاوبوونەوەی ئەو سیستەمانەی داوە، بەڵام خاڵە جیاوازەکانی نێوان ویلسن و دامەزرێنەرانی نالیبراڵیزمی سەدەی بیستەم سەرنجڕاکێشترە لە خاڵە یەکچووەکانی لینین و هیتلەر کە سەنتەری دامەزراندنی کۆمۆنیزم و فاشیزم بوون زۆر ئاستەمە بێ ئەوان ئایدیاکانیان لە وڵاتەکانی خۆیان سەربکەون، ویلسن وەك ئەمانە نەبوو، بەڵکو ئایدیاکانی کۆکردەوە بە شێوەیەکی نوێ تر پێشکەشی کرد کە چەند دەیەك لە پێشدا بە کلۆجێکی تر هەبوون.

ودرۆ ویلسن هێزی فۆرمی لیبراڵیزمی نێودەوڵەتی بوو لە ڕووی وەرگرتنی ئەو شتانەی کە پێشتر داهێنرابوون و پێشکەشکردنی بە جیهان. لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە ناوەڕۆکی سێنەی ویلسن دژی ئایدیاکانی لینین و هیتلەر بوو کە سەپاندبوویان بەسەر جیهاندا. جیاوازی نێوان سەرۆکی ئەمریکا و دیکتاتۆرەکانی ئەوروپا جیاوازی نێوان زۆرداری و سەربەخۆیی بوو، نێوان پێشکەوتن و دواکەوتن بوو، جیاوازی نێوان شەڕ و ئاشتی بوو. بێگومان ئایدیاکانی ویلسن سەرکەوت لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا، ئایدیۆلۆژیاکانی لینین و هیتلەری ڕیسواکرا، ئەو دەزگایانەی ئەوان دروستیان کردبوو قەدەغەکرا، ئەو وڵاتە سەروەریانەی ئەوان بەڕێوەیان دەبرد کە ناسرا بوون بەوەی لە ناوەوەی سنووری خۆیاندا مومارەسەی دەسەڵات بکەن وجودیان نەما. بەپێچەوانەوە، هەرچەندە کاتێ ویلسن ئایدیاکانی لە پاریس خستەڕوو، ئەو کاتە وەك یوتۆپیا وابوون، بەڵام هەشت دەیە دواتر پیادەکران.

له دەیەی یەکەمی جەنگی ساردا، داهاتوو لەچاو ڕابردوو کەمتر ڕوون و ئاشکرابوو، بەڵام دەڤەری جیۆپۆلەتیك دوای جەنگی سارد وەك جیهانی نێوجەنگی سارد بێ گرفت و ململانێ و دڵەڕاوکێ نەبوو، بەڵکو ماوەیەك بەر لەوکاتە هەموو ئەمانە ڕەگیان داکوتابوو لە ململانێ مەزنە جیهانییەکەی نێوان لیبراڵیزم و کۆمۆنیستی نالیبراڵیزم، دواتر زۆربەیان ئەسڵیان لە کۆتایی ئەو ململانێ مەزنەی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بوو کە بەرگری و بەردەوامی و فراوان کردنی هەر سێ بەشی سێینەی ویلسن بوون، هەروەها ڕوانگەکانی دوای جەنگی ساردیش بەدەر نەبوون لەو رەوشە سەرقاڵ و گەرم و گورەکەی جیهان. ئەمە بابەتی سەرەکی مێژووی دوای جەنگی سارد بوو. له دەیەی یەکەمدا ئەوانەی کە ئەو مێژووەیان دروستکرد تێی گەیشتن و کردیان بە ئەزموون وڵاتە زلهێزەکانی سیستەمی نێودەوڵەتی وێڵ بوون بەدوای زۆرکردنی لیبراڵیزم، تەنانەت ئەو کاتانەش خولیای ئەنجامدانی ئەو کارانەیان نەبوو. ئەوان موژدە بەخش و موگناتیس بوون بۆ وڵاتەکانی تر، بەتایبەتی ئەوانەی بەتەواوی لیبراڵ نەبوون لە زۆربەی ڕووداوەکاندا بە لیبراڵیزم سەرسام و کاریگەر و دڵتەنگ و ناحەز بوون. بەرپرسییارێتی خۆیان له خاڵی وەرچەرخانەوە گرتە ئەستۆ لە بواری سیاسەت و ئابووری، هەروەها سیاسەتەکانی دەرەوەیان وەك وەڵامێك بۆ دەسەڵاتی ڕەهای لیبراڵ وەرگرت، تەنانەت ئەو کاتانەش کە وێڵ بوون بەدوای داگیرکردنی.

ئەو دەزگاو مومارەسەکردنەی کە ودرۆ ویلسن بۆ یەکەم جار هێنایە نێو سەنتەری بایەخی جیهان، لە جەرگەی مێژووی نێودەوڵەتی ماوەی دوای جەنگی ساردا زۆر جۆری لێکەوتەوە. سیستەمی نێودەوڵەتی سنووردانان لەسەر چەك لە وڵاتێکی زیاتر تێوەگلاند، بەو پێیەی کە پەیوەندی لەگەڵ ئەوانی تر پێدادەگرێتە سەر ئاسایشی ئەندامی تایبەتی سیستەمی نێودەوڵەتی. بە پێچەوانەوە دیموکراسی شتێکی ئەهلییە. بۆ نموونە : گەر وڵاتێك دیموکراسی بێت هیچ پەیوەندی بەوە نییە کە چەند وڵاتی دیموکراتی تر وەك ئەو هەبن، هەرچەندە جەماوەری نێودەوڵەتی پێوەرە دیموکراسییەکان کار لەڕوانگەی وڵاتانی تر دەکەن.

بیناکردن و بەگەڕ خستنی دیموکراسی وەك دروستکردن و دانانی تۆڕێکە کە هەموو کۆمبیوتەرەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە، دانان و پاراستنی ئابووری لیبراڵیش پێویستی بەهەردوکیانە. وڵاتە سەروەرییەکان ئابووری نەتەوەیی جودایان هەیە، بەڵام ئەمانەش بەشێکن لە تۆڕێکی نێودەوڵەتی ئەو ڕێنماییانەی کە لیبراڵیزمی مەحەلی و نێودەوڵەتی پێ دەستەبەر



دەکرێن جیاوازن. یەکەمیان پێویستی بە دانووسانێکی نێودەوڵەتی نییە. هەماهەنگی حکوومەتەکان لەگەڵ یەکتری لە بارەی کردەی سیاسی سنوورێك بۆ سوپاکان دروست دەکات. ئەمە هێشتا دیموکراسی و ئابووریی بازاڕ نییە، بەڵام ڕوانگەیەکی نێودەوڵەتیان هەیە ئالێرەدا وڵاتە سەروەرییەکانیش کار لەیەکتر دەکەن هەرچەندە کارلێکردنەکە کەمە. وەك تاکەکان، کۆمەڵ دەتوانێت بەهۆی سەرنجدان و فێربوونەوە بگۆڕێت. کۆنترۆڵکردنی چەك بەهۆی کردە و هاوکاری چالاك بڵاودەبێتەوە، بەڵام دیموکراسی و ئابووریی بازاڕ بەهۆی چاولێکەری بڵاودەبنەوە. ئەوەی یەکەم چاو لە وڵاتە سەروەرییەکان دەکەن کە چی دەکەن، دووەمیش چاو لە ڕووداوی نێوکۆمەڵگاکان دەکەن. یەکەم پیشەی حکوومەتەکانە، دووەمیان ئەنجامی هێزە کۆمەڵایەتیەکانە کە نادیار و بێ شومار و کۆنترۆڵیش ناکرێن. هێشتا هەردووکیان زۆر لە یەکتر نزیکن، وڵاتانی خاوەن سەروەری لە سەروی سنوورەکانیانەوە حەز دەکەن لەگەڵ پێوەرە لیبراڵییەکان هەڵ بکەن تا ئەو ڕادەیەی کە دەزگا و مومارەسەو بەها لیبراڵییەکان لەگەڵ ئەواندا دەستەبەر بکرێن. بۆیە بۆ ڕوانگەی سێینەی ویلسن لە جیهانی دوای جەنگی ساردا، هێزە کۆمەڵایەتییەکان زۆر گرنگترن لە حکوومەت . بەهەقیقەت، بەو ڕێگایەی کە ململانێ کۆتایی پێ هات، هێزە کۆمەڵایەتییەکان کە چاو لێکدەکەن لە سیستەمی نێودەوڵەتیدا یەکلایی کەرەوە بوو. هەڵسەنگاندنێکی جیهانی سەدەی بیست و یەك تێگەیشتنی دەوێت لەسەر ململانێی نێوان لیبراڵیزم و کۆمۆنیزم کە دەستی بەسەر نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا گرتبوو، ململانێیەك بەسەرێك لە شێوەی بەسەرێکیش بەتەواوی جودا لەو سێ ململانێ مەزنە جیهانییەی چاخی مۆدێرن کە پێش هات، ڕووداوێك لە جەنگ دەچوو بەڵام جەنگیش نەبوو.

## چاپتەری -٢-

## جەنگی سارد: تێڕامانێکی دی

لـە خانـەی گروپـی جەنگـە مەزنـەکانی سـەردەمی مۆدێرنـدا، جـەنگی سـارد شـایەنی پرکردنەوەی کەلێنێکە. هەڵگری هەمان تایبەتمەندی جەنگـەکانی نـاپلیۆن و جـەنگی جیهـانی یەکەم و دووەمە. لەگەڵێ ڕووی گرنگەوە جەنگی سارد وەك جەنگەکانی تر نەبوو، گـەر لەگـەڵ ئەو جەنگانە حسابی بکەی ئەوا وەك سەگێکە لە وێنەی خێزانێکدا، سـەگەکە ڕەنـگ و نـرخ و بەهای خۆی هەبێت و ئاشناش بێت بە ئەندامانی خێزانەکە، بەڵام بێ تەفسیرکردن و جیـاوازی لە دەرەوە دەوەستێت. بە هەقیقەت ئەمە جیاوازییەکانە نەك خاڵە چـوون یەکـەکان لـە نێـوان جەنگی سارد و ململانێ مەزنـەکانی تـر کـە لـە سـەردەمی دوای جـەنگی سـارد گـرنگترین بایەخیان هەیە ئەوانیش زاڵ بوونی لیبراڵ بەسەر جیهاندا و مومارەسە و دەزگاکانی ویڵسنە لـە ڕەگ و ریشەی جیاوازییەکانی نێوان ململانێی گەورەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لە نیوەی دووەمـی سەدەی بیستەمدا. ئەو ڕاستییە وا دەردەخات کە چەمکی (جەنگی سارد) تەنها ناگەڕێتەوە بۆ ململانێیەك، بەڵکو بۆ سەردەمێکی مێژوویی. ئەو سەردەمەش یـەك بـەش بـوو لـە مێـژووی بەردەوامی چاخی مۆدێرندا کە لەگـەڵ شۆڕشـی فەرەنـسا و پیـشەسازی لـە کۆتـایی سـەدەی هەژدەمدا دەستی پێ کرد. بەهەمان شێوە جەنگی ساردیش کات و شوێنی مومارەسەکردنی لە ژێر دەسەڵاتی مرۆڤدابوو وردە وردە بڵاوبۆوە، دەرەنجام زۆر بەهێزتربوو لـە جـەنگ و کوشـتار، ئەو مومارەسەیەش گۆڕانی کەلتوور بوو کە جیهانی سەدەی بیست و یەك دروستی کرد.





وەك ململانێ گـەورەکانی تـری سـەردەمی مـۆدێرن، لـە جـەنگی سـاردا هەردوولایـەنی جەنگەکە وەك جەنگەکانی تر سوپای گەورە و چەکی بەهێزیان بـەکارهێنا بـۆ دەسـتەبەرکردنی ئامانجەکانیان، دوو هاوپەیمانی بەهێز ڕووبەڕووی یـەك بوونـەوە. وەك جەنگـەکانی تـر مـەودا جوگرافییەکەی مەودایەکی فراوان بوو. بە هەقیقەت جەنگی سارد فراوانترین جەنگ بوو لە نێو هەموو جەنگە بەرپاکراوەکانی پێشتر وەك بڵێـی ڕۆچـوو بـوو بـەنێو هـەموو جیهـان تەنانـەت ئەوەندە فراوان بوو شوێنی دەرەوەی جیهانیشی دەگرتەوە. هـەروەك جەنگـە گـەورەکانی پـێش خۆی، حکوومەتە ڕکابەرەکان لـە جـەنگی سـاردا ئـەم کۆمەڵگایانـەیان ورووژانـد کـە خۆیـان حکوومیان دەکردن، هاوڵاتییەکانی خۆیانیان کرد بـە سـەرباز بـۆ ڕێـژی هێـزە سـەربازەکانیان بەشێکی باش لەسامانی نەتەوەیی ئەوانیان لەگەڵ بەرزبوونەوەی باج و قەرزکردن بـۆ ململانـێ تـەرخان کـرد، وەك هـەردوو جەنگـە جیهانییەکـە جـەنگی سـارد لێکۆڵینـەوەی زانـستی جێبەجێکردنی تەکنەلۆژیای پیشەسازیان بۆ کارگەکانی چەك دروسـتکردن بـەخۆوە بینـی. لـە هەرسێ حاڵەتدا بووە پێشبڕکێی چەك و تەقەمەنی لە نێوان هەردوو هاوپەیمانی ڕکابەرەکـەدا. هەروەها جەنگی سارد لە دەرەنجامەکانیشدا بـە سـێ جەنگەکـەی تـر دەچـوو. ئـەو ململانـێ گەورانە هەمان کاریگـەریان لەسـەر سیـستەمی نێودەوڵـەتی هـەبوو کـە شۆڕشـەکان لەسـەر وڵاتەکان هەیانبوو.

هەموو شتێکیان گۆڕی دەسەڵاتی هەرەمـەکی جیهـان، شـوێنی سـنوورەکان، کارەکتـەری ڕژێمەکان و پاش هەرچوار جەنگە گەورەکە حکوومـەتی دەسـەڵاتدار لـە ناوچـوو، یـەکێك لـە براوەکان شوێنەکەی گرتەوە، تەنانەت یاساکان بۆ پەیوەندی نێـوان وڵاتـانی خـاوەن سـەرەوەری گۆڕانی بەسەردا هـات. لەلایـەکی تریـشەوە جـەنگی سـارد لـە دوو ڕووی زۆر گرینگـەوە لـە جەنگەکای تر جیاوازە، ئەوانیش دەرەنجامەکانی و ئەو شێوەیەی کە کۆتایی پێ هێنرا. یەك لە دەرەنجامە بەرچاوەکانی سەرکەوتنی لیبراڵیزمـی نێودەوڵەتییـە. ڕوانگـە لیبراڵـەکان بـێ هـیچ شتێك لە سەردەمی جەنگەکانی ناپلیۆن پێناس کران و ناپلیۆنیش بە شێوەیەك خستییەڕوو کـە بە پێی پێوەرەکانی سەدەی بیستەم زۆر ناتەواو بوو. ناپلیۆن و بنەماکانی بەهـەر حاڵێـك بێـت لەبەر شکست ناڵاندی لە جەنگی جیهانی یەکەمدا. دەسەڵاتە لیبراڵییەکان براوە بـوون و هێـزە

تەقلیدییەکانیش لەناو چوون، بەڵام ئەو جەنگە دوو جۆرە نالیبراڵیزمی دروستکرد ئەوانیش فاشیزم و کۆمۆنیزم بوون، کە لە حەوت دەیەی دواتر ڕکابەری ئەو بنەمایانەیان کرد کە ودرۆ ویڵسن بە جیهانی ناساند. جەنگی جیهانی دووەم کۆتایی هات بە ژێرکەوتنی نالیبراڵیزم و فاشیزم، بەڵام سەرکەوتنی کۆمۆنیزم یەکێتیی سۆڤیەت باڵێکی سەرەکی هاوپەیمانە سەرکەوتووەکە بوو و سوپاو ئایدیاکانی لەو ململانێوە لەگەڵ دەسەڵاتێکی بەهێزتری پێش جەنگ هاتە کایەوە، تەنها لەدوای جەنگی ساردا ئەو بنەمایانەی کە ودرۆ ویڵسن دەنگی بۆ دان بەبێ بەرەنگاری بوونەوە دەستەبەرکران.

### *سەرکەوتنی لیبراڵ*

تاکە هۆی کاراکتەری سەرکەوتنی لیبراڵ ئەوەیە کە هەرچەندە دەسەڵاتەکان بنەمای جیاوازی شەرعییەتی سیاسیان هێنایە کایەوە و هەندێ جاریش ڕێکخستنی هەمەجۆری ئابووری هەرسێ جەنگە گەورەکەی بەرپا کرد، جەنگی سارد بە ئاشکرا بەربەرەکانی سیستەمەکان بوو زیاتر لە جەنگەکانی پێش خۆی و هەردوو لاش هەمان شتیان وت. سەرۆکی ئەمریکی، هاری ترۆمان Hary Truman لە ساڵی (١٩٤٧) دا لە سەرەتای ململانێکە دووپاتی کردەوە (.. لەم ساتە وەختەدا، لە مێژووی جیهاندا هەموو نەتەوەیەك دەبێ ڕێگای ئەلتەرناتیڤ بۆ ژیان هەڵبژێرێت..) لەو وتارەی کە ئەم چەند وشەیەی دووپات کردەوە، دواتر ناسرابە ((مەزهەبی ترۆمان)) کاتێ وتی : دەبێ سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان پشتگیری لە گەلە ئازادەکان بکات و هەروەها پاڵپشتی ئەوانەش بکات کە بەرگریان لەخۆیان کرد بەهۆی ئەو سوپاکەمانەی کە هەیانبوو و زاڵبوون بەسەر فشارەکانی دەرەوە. مەزهەبی ترۆمان بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان ڕاگەیاندنێك بوو بۆ جەنگ، لە ڕۆژئاوا، سەرکردەکانی یەکێتیی سۆڤیەت زیاتر بایەخیان بە کارەکتەری سیستەماتیکی ململانێکەدا و زیاتر جەختیان کردەوە لەسەر بوارە ناسەربازییەکانی چەمکی (کۆ پەیوەندی هێزەکان) بۆ گەیاندنی ئەو ئایدیایەی کە هاوسەنگی نێوان دەسەڵاتی هەردوو ڕکابەرەکە بوو و سەرەڕای دەسەڵاتی هێزە سەربازییەکانیان دەبێ بە پێوەری سیاسی و ئابووری و ئایدیۆلۆژی حساب بکرێت.



سۆڤیەت دامەزرا بەمەبەستی دژایەتی کردن و جێگرتنەوەی دیموکراسییە کاپیتالیستەکانی ڕۆژئاوا. بۆلشێڤییەکان لە جەنگی جیهانی یەکەمدا لە ڕووخساردا پێی وابوو کە شۆڕشی سۆشیالیست لەهەموو ئەوروپا بڵاودەبێتەوە، بەڵام ژێرکەوتنی ڕووداوەکان ئەوانی سەرسام کرد. هەموو شتێك لەوەدا بەدی دەکرا کە ململانێی نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکان و کۆماری سۆشیالیستی یەکێتیی سۆڤیەت ململانێ بوو لەسەر ئایدیا سیاسییەکان، چونکە ئەو دوو وڵاتە لەسەر ئایدیای سیاسی دامەزراون. هەروەها ڕای سیاسی تایەفەگەرییان و کۆمەڵگای فەرهەنگیان لەو وڵاتانەدا لەسەر هەمان شێوە دانران. هەر وڵاتێك کە دادەمەزرا بۆ مومارەسەکردنی کۆمەڵە بنەمایەکی تایبەتی بوو. لە هەردوو حاڵەتدا، کاتێ وڵاتەکە تازە دەبمەزرێت بە ڕای هەردوو وڵاتە دامەزراوەکان ئەو بنەمایانە کردەیی بوون، نوێ و هەوڵنەدراو بوون. ناسنامەی هەریەك لەم وڵاتانە بەڵگەیەکە بۆ وجودیان، مەبەستیشیان لە وجودیان لە جیهان ئەوەیە کە لەسەر بنچینەی بنەما سیاسییەکان هاتبوونە کایەوە.

خاسیەتێکی تری جەنگی سارد ململانێیەکی ئاشکرای سیستەمەکان بوو لە ساڵەکانی دواتری جەنگی جیهانی دووەمدا، ژمارەیەك لەو وڵاتانەی کە یەکگرتوو بوون دابەشکران لە نێوان هەردوو ڕژێمی لیبراڵ و کۆمۆنیستدا بۆیە چین و ئەڵمانیا و کۆریا بوون بە بەرامبەری سیاسی ئەزموونی زانستی بۆ تاقیکردنەوەی دەرەنجامەکانیان لە یەکێك لە هەردوو سیستەمەکەدا. مێژووی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی ئەو وڵاتە دابەشکراونە وەك توێژینەوەکانی ئەو دوانە لێکچووەیە کە لەکاتی لە دایکبووندا لێك جیادەکرێنەوە، چونکە جینەکانی دووانەکە لە یەکدەچن، جیاوازی نێوانیان پەیدا دەبێت بەهۆی کاریگەرییەکانی ژینگە.

دەرەنجامی ململانێی سیستەمەکان زۆر گرینگ بوو نەك هەر تەنها لەبەرئەوەی بە بەشێك لە سەرکەوتن ناوزەد کرا، بەڵکو لەبەرئەوەی تاچ ڕادەیەك سیستەمی لیبراڵ شتی باشتری بەدەستهێنا لە کۆمۆنیزم هەروەها لەبەر پانتایی جوگرافییەکەشی لە ڕووی ئابوورییەوە، کۆمۆنیزم لە هەموو شوێنێك هەرەسی هێنا : لە ئەوروپا — ئاسیا — ئەمریکای لاتین هەروەها لە ئەفریقیاش فەشەلەکەی بەڵگە نەویست و سەلمێنراو بوو. لە مانگی شەشی (١٩٩١) بۆریس یەڵتسین Boris Yeltsin بەسەر شکستی کۆمۆنیزم داهات و لە ڕووسیا وتی : ئەزموونی یەکێتیی سۆڤیەت لەگەڵ مارکسیزم و لینین ئەوەی سەلماندووە کە هیچ جێگایەك نییە بۆ ئەم ئایدیایە، لیبراڵیزم لە جەنگی ساردەوە سەری هەڵدا و گەیشتە لووتکە، جەنگی سارد بە

ئاشكرا ململانێیەك بوو لە نێوان بنەما لیبراڵ و نالیبراڵەكان لەو ململانێیەش لیبراڵیزم سەركەوتنێكی گرنگی تۆماركرد. لەبەر هۆیەكی تری لیبراڵیزم سەركەوتنێكی گرنگی تۆمار كرد ئەویش ئەو هاوپەیمانەی كە گەمەكەی بردەوە هاوپەیمانێكی یەكگرتوو بوو لە پێناو بنەما لیبراڵییەكان. ئەمە لە ڕابردوودا وانەبوو براوەكان لە ساڵی (١٨١٥) بەهیچ شێوەیەك لیبراڵ نەبوون، ڕژێمە كۆنەكە بوو، هێزە تەقلیدییەكان بوون سەركەوتن لە مەیدانی جەنگدا هاوپەیمانی براوەی جەنگی جیهانی یەكەم نەنالیبراڵ و نە لیبراڵێكی یەكگرتووش بوو. لە سەرەنجامی جەنگەكەدا فەرەنسا چاوی لە سزادانی ئەڵمانیا بڕیبوو و هەرێمی ئەڵمانەكانیش بەخۆیەوە بلكێنێت. ویلایەتە یەكگرتووەكان بەشداری ئەو ئامانجەشی نەكرد، نە بەریتانیاو نەویلایەتە یەكگرتووەكانیش تەواو بەشدار نەبوون لە ڕوانگەی بێ هێزی بازرگانی جیهان، بەڵكو بەریتانییەكان ویڵ بوون بەدوای فراوانكردنی بواری بازرگانی دەریایی زیاتر لە سەرۆكی ئەمریكا كە لەوان هەستیار تریش بوو،

هەروەها سەركەوتووەكانی تریش بە تەواوی ئامادە نەبوون بۆ مومارەسەكردنی بنەما سیاسیە لیبراڵییەكان كە بەسەر ئەوانی تریاندا سەپاندبوون — بەریتانیا و فەڕەنسا پشتگیری (مافی چارەی خۆنووسین) یان كرد لە ئیمپراتۆرەكانی ئەوروپا كە بەسەریاندا زاڵ بوون، بەڵام ئەمەشیان پێشكەش نەكرد بەو غەیرە ئەوروپیانەی كە ئیمپراتۆرەكانی خۆیان سەرپەرشتیان دەكردن.

هەندێ لەو جیاوازیانەی كە ونبوون لە دوای جەنگی جیهانی یەكەمدا لە كاتی جەنگە گەورەكەی داهاتوو سەریان هەڵدایەوە. سەرۆكی ئەمریكی فرانكلین ڕۆزڤێڵت دژی حوكمی ئیمپراتۆری وەستایەوە. هاوشانی ڕۆزڤێڵت و شەریكی لە كاتی جەنگدا وینستن چێرچڵ بوو كە سوور بوو لەسەر درێژە پێدانی ئیمپراتۆری بەریتانی نە فەڕەنسییەكان و نەئەویش سەركەوتوو نەبوون لە ئەنجامدانی ئەم كارە، بەڵام گرنگترین و قوڵترین جیاوازی لەگەڵ هاوپەیمانی براوە لە ساڵی / ١٩٤٥ / دا یەكێتیی سۆڤیەتی لە ڕۆژئاوا جیا كردەوەو سەلماندی كە سۆڤیەت لەگەڵ ئەواندا یەكناگرێتەوە. بە پێچەوانەوە لە دەرەنجامی جەنگی ساردا، هیچ یەكێك لە براوەكان گومانیان لە بارەی سێینەی ویڵسن نەبوو جگە لە ڕۆژئاوای ئەڵمانیا ئەوانی تر هیچ یەكێكیان ویڵ نەبوون بەدوای نرخە ئاساییەكەی سەركەوتنی سەربازی بۆ ماوەی چەند سەدەیەك ئەویش سەركەوتنی هەرێمی بوو. تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت دەسەڵاتی بنەما





گشتیەكانیان بۆ داپۆشینی دوای جەنگ پشت دەبەستێت بە فراوانی پابەنبوونە گشتییەكان كە بەراستی دەسەڵاتێكی زلە.

جەنگی سارد جیاوازە لە ململانێ گەورەكانی پێش خۆی لە سەردەمی مۆدێرندا، لە سەردەمی دووەمیدا، كە شێوەی كۆتایی پێهاتنەكەیەتی، كە كاریگەری زۆرترە لەوەی یەكەم. جەنگی سادر كۆتایی هات بێ ئەوەی هیچ دەسەڵاتێكی سەربازی بیباتەوە. بە هەقیقەت جەنگی سارد بە بەراورد لەگەڵ هەر سێ ململانێ كەی تر لە ئەوروپا دوو شتی كەم بوو ئەوانیش زۆری و مەیدانی جەنگە. ڕاستە لە كیشوەری ئەوروپا لە چلەكانەوە تا نەوەتەكان دوو هێزی چەكداری گەورە دژی یەك پەیدا بوون، ئەو دوو هێزە بەهەموو شێوەیەك خۆیان ئامادە دەكرد بۆ جەنگ، بەڵام بە درێژایی ئەو چەند ساڵە گوللەیەك نەتەقێنرا، لە جەنگەكانی پێشوودا سەركەوتنی سەربازی دەبوونە هۆی گۆڕانی سیاسی و دۆڕاوەكان بە هەموو شێوەیەك لە بەرژەوەندی براوەكان هەنگاویان دەنا، بەڵام لە جەنگی ساردا وا نەبوو، ئەمەش واقعێكە پرسیارێكی زۆر گەورە قوت دەكاتەوە ئەویش : بۆچی ئەو ململانێیە كۆتایی هات ؟ لایەنی دۆڕاو كە كەرتی كۆمۆنیزم بوو لە مەیدانی جەنگدا شكستی نەهێنا. لە هەر سێ جەنگی پێشوودا لێشاوێك گۆڕانكاری سیاسی ڕوویدا، چونكە دۆڕاوەكان لەو ئاستەدا نەبوون ڕەتیان كەنەوە، بەڵام لە جەنگی ساردا تا كۆتاییەكەشی دەسەڵاتی كۆمۆنیزم لەو ئاستەدا بوون ڕەتی ئەو گۆڕانكارییانە بكەنەوە. لە ڕووی سەربازییەوە ململانێ گەورەكەی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات لە نیوەی دوەمی سەدەی بیستەمدا هەردوو لا نەگەیشتنە هیچ ڕێكەوتنێك(*) هیچ هۆیەكی سەربازی نەبوو كە بۆچی ئەو ململانێیە كۆتایی هات بۆیەش كەس چاوەڕێی نەدەكرد ئەوە ڕوویدات.

* لە ڕووی سەربازییەوە لایەنی كۆمۆنیست دەستێكی باڵای هەبوو و هێزە سەربازییەكانی كۆتایی بەجەنگی جیهانی دووەم هێنا بە كۆنتڕۆڵكردنی ئەوروپا تا ناوەڕاستی ڕۆژئاوای ئەڵمانیاش. لە كۆتایی چلەكاندا كۆمۆنیستەكان زاڵبوون بەسەر چین لە شەستەكاندا كۆنتڕۆڵی (كوبا) یان كرد كە نزیكەی نەوەد پشت لە دوژمنە گەورەكەیانەوە دوورە كە ئەویش ویلایەتە یەكگرتووەكانە. لە هەفتاكاندا هێزی كۆمۆنیست دەستی گرت بەسەر هیندۆ چینیە فەرەنسییەكانی پێشوو. لیبراڵیزمی نێودەوڵەتی هیچ دەسكەوتێكی سەربازی لەو جۆرەی بەدەست نەهێنا.

تێگەیشتن لە دەرەنجامەکانی جەنگی سارد، بۆچی کۆتایی هات، چۆن کۆتایی هات، ئەو ڕێگایەش کۆتایی پێ هات چۆن سەردەمی دوای جەنگی ساردی پێك هێنا، دەبێ ئەوە لەبەر چاو بگرین بە بەراورد لەگەڵ هەرسێ ململانێ گەورەکەی تر جەنگی سارد جەنگ نەبوو ئا لێرەدا بەراوردکردنەکان یارمەتی دەرن. دەکرێ جەنگی سارد بەراورد بکرێت لەگەڵ هەر سێ تەوەرە جیاوازەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی کە هەرسێکیان چەند خاسیەتێکی گرنگی هاوبەشیان هەیە ئەوانیش (پرۆسەی گەشەسەندن لە سروشت — ململانێی نێوان ڕکابەرەکان لە بازاڕدا — گۆڕانی ئایین)ن.

### *بەراوردکردن*

چۆن جەنگی سارد و پرۆسەی گەشەسەندن کە بەهۆیەوە ژیان بەهەموو شێوەکانییەوە گەشەی سەند کارێکی درێژخایەن بوو سەنگی کاتی گەشەسەندن زۆر درێژترە بگرە بە سەدان ملیۆن ساڵە، بەڵام ململانێی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا درێژتر بوو بە بەراورد لەگەڵ جەنگەکانی تر، هەروەك حاڵەتی گەشەسەندن، کات تێپەڕی بێ ئەوەی گۆڕانی بەرچاو ڕووبدات. گەشەسەندن بە شێوەیەکی ئاسایی ململانێی ڕاستەوخۆ لە نێوان فۆرمە جیاجیاکانی ژیان ناهێنێتە ئاراوە، هەروەك جەنگی سارد پێکدادانی کەم بوو لە نێوان هەردوو کەرتەکە، بەڵام بەهۆی پرۆسەی گەشەسەندنەوە هەندێ جۆر دەژین و هەندێکی تر دەمرن و ون دەبن. بەهەمان شێوە لە دەرەنجامی جەنگی ساردا جۆرێکی سیاسی بە تەواوی لەناوچوو و دامرکایەوە ئەویش کۆمۆنیزمی ئەوروپا بوو بەهۆی ئەو میکانیزمەی کە گەشەسەندن بەردەوام دەبێت، خاسیەتێکی تری جەنگی سارد دەخاتە ڕوو، کە سێ پرۆسەی تێکهەڵکێش دەخاتە ڕوو — لەبەرگرتنەوە Replication — پرۆسەی گۆڕانی جینات Mutation — گونجان Adoptation. گۆران لە پێکهاتەی بنەچەکان خۆیان دروست دەکەن، هەروەك چۆن خۆیان لەهەمان جۆر بەرهەم دێننەوە نەسڵ لە دوای نەسڵ ئەدگارەکان (Traits) بەرهەم دەهێنرێنەوە گەر شیاو بن بۆ مانەوە. بەم پێیەش گەر ئەو مەخلوقاتانەی هەڵگری ئەو ئەدگارانەن ئەوا بەرهەمیان دێننەوە بە شێوەیەکی سەرکەوتووتر لەوانەی کە نیانە کەواتە ئەو ئەدگارانەی کە دەمێننەوە ئەوا زیاتر دەگونجێن. بەهەمان شێوە سیستەمی لیبراڵ مایەوە لە جەنگی سارد



(سەرکەوت) نەك لەبەرئەوەی زاڵبوون بەسەر سیستەمی نالیبراڵ بەڵکو لەبەرئەوەی خاسیەتەکانی ئەوەیان سەلماند کە باشتر دەگۆڕێت و دەگونجێت لەگەڵ ژینگەی گشتی. بەراوردێکی دیکەی خاڵەکانی گەشەسەندن لەگەڵ خاسیەتێکی تری جەنگی سارد ئەوەیە هەرشتێك کە لە بارودۆخێکدا گونجاوە لەبارودۆخێکی تردا ناگونجێ بۆ نموونە : داینەسۆرەکان مردن و لە ناوچوون، چونکە ئەو بارودۆخەی کە تیایدا دەژیان گۆڕا، بەڵام بۆ ماوەیەك گەشەیان کرد بەهەمان شێوە کۆمۆنیزمیش لەبەر فراوانی و گەورەیی خۆیەوە لەسەرانسەری جیهان بۆ ماوەیەك گەشەی سەند دواتر ئەو ژینگەیەی کە گۆڕانکاری بەسەر لیبراڵیزم و کۆمۆنیزم دا هات بە زیانێکی زۆر گەورە بە کۆمۆنیزم دامرکایەوە.

جەنگی سارد جیایە لە پرۆسەی گەشەسەندن بەهۆی هەڵبژاردنی سروشتییەوە لە دوو ڕێگای گرنگەوە، هەروەها جیاوازییەکانیش وەك خاڵە لە یەکچووەکانیان گرنگ بوون. یەکەم — بنەچە جیاجیاکان نەك هەر تەنها بەشەڕ نایەن و ڕاستەوخۆ ڕکابەری یەکتر ناکەن، بەڵکو بەرنامەکراون تا هەوڵ بدەن خۆیان بەرهەم بهێننەوە، بەڵام نەك قەدەغەی بەرهەمی ئەوانی تر بکەنەوە کەواتە گەشەسەندن کۆمەڵێك پرۆسەی هاوتەریبە. بە پێچەوانەوە جەنگی سارد جەنگێکی کارلێك کەر بوو لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا. سیستەمی لیبراڵ و نالیبراڵ بەهەموو شێوەیەك ڕکابەری یەکتریان دەکرد تەنها پێکدادانی ڕاستەوخۆ نەبێت لە ئەوروپا. لەگەڵ ئەوەش هەردوو لا بەئەنقەست جەنگی ساردیان بەرپاکرد، گەشەسەندن بەهۆی هەڵبژاردنی سروشتییەوە پرۆسەیەکی بەئەنقەست نییە. بنەچەکان ئەو ستراتیژیانە بەکارناهێنن بۆ مانەوە و گونجان، بەڵام هەردوو لا لەجەنگی ساردا بەکاریان هێنا. ئالێرەدا جەنگی سارد دەکرێ بەراورد بکرێت لەگەڵ دوو کەرتی ڕکابەر کە هەوڵ دەدەن هەمان بەرهەم بفرۆشن هەروەك هەردوو هێزە سەربازییە سیاسییەکەی جەنگی سارد. ئەوکەرتانە نا ئاسایی زۆر بە توندی ڕکابەری یەکتر دەکەن. سەرکەوتنێك لە بازاڕی یەکێك زەرەرێکە لە بازاڕی ئەوی تر(ئەمە هەمیشە وانیە قەبارەی بازاڕ فراوانە زیاتر لە چەند لایەکەوە قازانج و زەرەری تیایە) کەرتە لیبراڵییەکان ئەو ستراتیژیانە بەکاردەهێنن، هەروەك سەرکردەکانی لیبراڵ و نالیبراڵ لەکاتی جەنگی ساردا بەکاریان هێنا کات و کۆشش و سەرچاوەیان خستەگەڕ بۆ دروستکردنی بەرهەمێکی نوێ. نزمترین و گونجاوترین نرخی بۆ دانێن تاوەکو قەناعەت بە کڕیارەکانیان بهێنن بیکڕن.

دوا سەرکردەی یەکێتیی سۆڤیەت (میخائیل گۆرباتشۆڤ) کە چەند گۆرانکارییەکی کرد بەتەواوی بەرەو لێك ترازانی سیستەمەکە چوو، دەکرێ بەراورد بکرێت بە جێبەجێکارێك کە بەرپرسە لەفەشەل هاوردەی کەرتەکەی. ستراتیژییەکی ڕادیکاڵی جێبەجێ دەکات بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی لەگەڵ ڕکابەرەکانی هەیەتی کە هەموو شتێك دەکات لە پێناو بەکارهاوردەی ئەو ستراتیژییە کەچی لە کۆتایدا هەموو شتەکان خراپتر دەکا و بەرەو هەرەس هاوردە و ئیفلاسی کەرتەکەی دەبات. توخمی ئامانج پەیوەستە بە ڕکابەری بازرگانی لە دوو ئاستدا هەروەك بۆ جەنگی ساردیش وابوو.. بازاڕ بڕیاردەدات لەسەر ستراتیژییەك بۆ فرۆشتنی بەرهەمەکەی، هەروەها سەرکەوتن یاخود ژێرکەوتنی ئەو ستراتیژیە دەوەستێتە سەر ئەوەی چەند کڕیار بڕیاردەدات و ئەو بەرهەمە بەردەوام بکڕێت بەپێی ئەم بەراوردە کۆمۆنیستی نالیبرالێزمی سەدەی بیستەم لەلایەن کڕیارەکانەوە ڕەتکرایەوە. یەکێتیی سۆڤیەت و کڕیارەکانی و هاوپەیمانەکانی پاڵپشتی خۆیان لە دەستداو دووچاری ئیفلاسی سیاسی بوونەوە و بەراوردەکەش فراوانتر دەبێتەوە. بازاڕی ڕووخاو زۆرجار لەلایەن ڕکابەرەکەیەوە دەستی بەسەردا دەگیرێت ئەمە لە ڕووێکەوە تەواو ئەوەیە کە کاتێ جەنگی سارد کۆتایی هات چی ڕوویدا. جیهانی کۆمۆنیست چووە ژێربالی بەڕێوەبردنێکی نوێ کەبەلانی کەم پابەند بوو پێی ئەویش بەگەڕ خستنی بنەماکانی ڕکابەرەکەی پێشووی بوو. وڵاتانی خاوەن سەروەری بە شێوەیەکی گشتی ئیفلاس ناکەن لە فرۆشتن و کڕینی کەل و پەلەکانیان، بەڵام وڵاتە کۆمۆنیستەکان دوچاری خەمۆکییەکی ئابووری بوونەوە و زۆریش قەرزدار بوونەوە لە ڕووی ئابوورییەوە دواتریش هەرەسیان هێنا.

ڕژێمە کۆمۆنیستەکان وەفای سیاسیانی ئەو ناوچانەیان لە دەستدا کە حکوومیان دەکردن. ئەو چەمکەی کە حکوومەت لە ڕووی سیاسییەوە پێی دەمێنێتەوە متمانەیە کە ڕژێمە کۆمۆنیستەکان ئەو متمانەیان نەبوو، هەمان ئەو متمانەیەش زۆر پێویستە بۆ بازرگانی. هەردوو وشەکە لە هەمان ڕەگەوە هاتوون کە وشەیەکی لاتینییە Cre Clere واتە باوەڕکردن. کۆمۆنیزم کۆتایی هات کاتێ بەرابەری سیاسی کڕیارەکانیان و بەردەوامی بەرهەم و خەڵکەکەی باوەڕیان پێی نەما، بەڵام لە هەر شوێنێك مەسەلەی باوەڕ بایەخی پێ بدرێت و بەراوردی نێوان جەنگی سارد و ململانێی بازرگانی دەسخەڕۆ و دەستەمۆ دەکرێن لە هەردوو حاڵەتدا گۆڕانەکانی باوەڕ کاریگەری بەهێزیان هەیە، بەڵام چڕی بواری باوەڕ لە هەر مەسەلەیەکدا



زۆرترە لەوەی جەنگی سارد. بە هەقیقەت چەمکە ئابوورییەکان وشەی باوەڕ بەکارناهێنن کڕیارەکان وشەی پەسندکردن بەکاردەبەن زۆربەیان بەکەمی ئەمە دەکەن، بەڵام کڕیارەکان زۆر جار دەیگۆڕن، گۆڕان لە دڵسۆزی لە سیستەمێکی سیاسی و ئابووری بۆ یەکێکی تر گرنگییەکی زۆری هەیە، بەڵام کەمتر دیاردەکەون ئەو دڵسۆزییە پەسندکردن نییە، بەڵکو پابەند بوونە لەگەڵ کتێبێکی گەورەتر کە ئەو چەمکە دەگەیەنێت جەنگی سارد کۆتایی هات بە گۆڕانی هزر، بەڵام سۆز و پاڵپشتی، وەك گۆڕان و لادان لە ئاییندا، بوون.

گۆڕان لە وەفایەکەوە بۆ یەکێکی تر بەپێی مێژوو گۆڕان دروست دەکات نەك هەر تەنها لە باوەڕ، بەڵکو لە ناسنامەی کەسی و ڕۆتینی ڕۆژانە. ئەمە ڕاستە گۆڕان لە کۆمۆنیزمەوە بۆ لیبرالێزم بەهۆی جەنگی ساردەوە بوو هەروەك گۆڕان لە ڕوانگەیەکی عەلمانی بۆ پابەند بوونێکی ئایینی، جەنگی سارد و دەرەنجامەکەی سەرەڕای قۆناغە هەمە جۆرەکانی دوو ڕووی هەیە : لە دەستدانی دڵسۆزی لە ڕوانگەکانی سیستەمە کۆنەکەوە و لە ئامێزگرتنی سیستەمە نوێ کان. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم پرۆسە دوو هەنگاویە لە دوو ڕووەوە ڕوودەدات، هەرچەندە دیسانیش پەیوەستە بەئاستەکانی لە نێوان ئەوانەی کە حوکم دەکرێن. هەروەها لەسەر ئاستی حوکم کەرەکانیش بۆ هەردوو گروپ لە دەستدانی دڵسۆزی بێشك وردەوردە زیادی کرد و گومان بوو بە نارەزایی دەربارەی ئۆرتۆدۆکسی، هەروەها ئەو کاتە ئان و ساتی بۆنەیەکی مەسیحییەکانیش بوو. پرۆسەی ڕوونکردنەوە و ڕوانگە لە ئارادا بوو وەك ئەو ئەزموونەی کە (ساول — Saul) لەسەر ڕێگای بۆ دیمەشق بەدەستی هێنا.

بۆچوونەکان بەهێزن، بەڵام واقیعە کۆمەڵایەتییەکان ئاستەنگن. واقیعەکان زۆر ئاستەمن لە پێوەرکردندا باشترین ناوەند بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەش لە سەدەی بیستەمدا ئەنجامدانی توێژینەوە بوو بەپشتبەستن بە چاوپێکەوتن. ئەم ڕێگایەش لەبەر هۆی سیاسی مەحاڵە لە جیهانی کۆمۆنیزمدا جێبەجێ بکرێت. وێڕای ئەمە هیچ گومانی تیا نییە کە باوەڕ لە سیستەمی حوکمکردنی جیهانی کۆمۆنیست کاتێکی زۆری ویست لە بەرزترین ئاستی دوای کارەساتەکەی جەنگی جیهانی دووەم. بەهەمان شێوەش گومانی تێدا نییە کە ئەمە زۆر گرنگ بوو بۆ کۆتایی جەنگی سارد بە دڵنیاییەوە بێ هێزی باوەڕ ژمارەیەك هۆکاری هەیە لە هەندێ شوێندا. سیستەمەکە هەرگیز بە دڵسۆزییەکی قوڵەوە کاری خۆی نەکردووە لە ناوەڕاست و ڕۆژهەڵاتی ئەوروپادا بە تایبەتی لە پۆڵەندا، هەر لەسەرەتاوە پێشوازی لێ نەکراو بە شتێکی

نامۆ سەیریان کرد هەرچەندە سوپای سوور — Red Army بەهۆی داگیرکارییەوە باوەڕی داسەپاند، بەڵام گرنگترین هۆی لە ناوچوونی باوەڕ هەرەس هاوردەی ئابووری بوو کە بە شێوەیەکی فراوان ئاماژەی پێ درابوو و پەیوەستیش بوو بە سیاسەتی ئەو حکوومەتانەی دوای جەنگی سارد کە شوێنی کۆمۆنیستەکانیان گرتەوە. لە ململانێ لەگەڵ لیبراڵیزم بۆ ناچارکردنی هێزەکانی شۆڕشی پیشەسازی تا سامان بەرهەم بێنن سیستەمی کۆمۆنیست بە پلەی دووەم هات، بەڵام خاسیەتێکی تری هەمەجۆری نالیبراڵیزم ڕۆڵێکی بەرچاوی گێڕا لە بەردەوام بوونی لە لەدەستدانی دڵسۆزی لە سیستەمەکە.

شایانی باسە، کۆمۆنیزم تەنها ئەو میتۆدە نەبوو بۆ کاولکردنی دەسەڵاتی سیاسی و ئەو کۆمەڵە بنەمایەش نەبوو بۆ ڕێکخستنی چالاکییە ئابوورییەکان بەڵکو سیستەمێك بوو بۆ کوشتنی بە کۆمەڵ. توندوتیژی — دڵڕەقی — چەوساندنەوە و کوشتنی خەڵکی بێ تاوان بە شێوەیەکی بەرچاو خاسیەتی نموونەیی ئەو سیستەمە بوون. ڕژێمی سۆڤیەت و چین بە شێوەیەکی بەرچاو کاری تیرۆریان دەکرد کە هەرگیز پێشتر لە جیهان کاری وا نەکرابوو، هەروەها هەر ئەو دوو ڕژێمەش بوون کە بوونە هۆی پەیدابوونی خراپترین قات و قڕی و برسێتی سەدەی بیستەم. بە پێی ژمارەی ئەو کەسانەی کە مردوون خراپترین ڕژێمن لە مێژووی مرۆڤدا. بەپێی مەزندەکان، قوربانیانی ژێردەسەڵاتی ستالین (٣٠ تا ٤٠) ملیۆن کەس، هی ماو — Mao یش (٣٥) ملیۆن کەسن، گەر ڕێژەی کوشتنی هاوڵاتی مەدەنی لەلایەن ڕژێمێکەوە پێوەرێك بێت بۆ حوکمدان لەسەر حکوومەتێکی شەڕانگێز و چەپەڵ ئەوا (خمێر رۆژ — Khmer Rouge)ی کۆمۆنیست کە سەرۆکی کەمبۆدیا بوو لە نێوان ساڵانی (١٩٧٥ تا ١٩٧٩) شایەنی یەکەم خەڵاتە، چونکە لە کۆی حەوت ملیۆن کە ڕێژەی دانیشتوانەکەی بوو، دوو ملیۆن لە ژێردەسەڵاتی ئەودا کوژران.

کۆمۆنیزم ڕووخا، چونکە هەرەسی هێنا لە پێشکەشکردنی ژیانێکی ستاندارددا. ئەمە وەك زیندانی کردنی یەکێك لە تاوانبارەکانی ئەمریکایە کە ناوی ئەلکاپۆن بوو، بەرپرس بوو لە کوشتنی چەندین کەس لەبەر ئەوەی هەرەسی هێنا بوو و باجی داهاتەکەی بۆ نەدەدرا. ئەو تاوانەی کە ئەنجامی دابوو و لەسەری سزادرا خراپترین تاوان بوو، بەڵام ڕووخانی کۆمۆنیزم لە ئەورووپا تەواو گرێدرابوو بە خراپترین خاسیەتەکانی. کاتێ ڕژێمی کۆمۆنیست دەسەڵاتی گرتەدەست هەموو ڕەهەندە گشتییەکانی چەوساندەوە. تەنها خۆی قسەی لەسەر کوشتنی



ملیۆنان کەس دەکرد، بەڵام لەگەڵ نەبوونی گفتوگۆیەکی گشتی و دروستکردنی مۆنیۆمێنت بۆ قوربانیان تەنانەت دەستنیشانکردنی گۆڕەکانیش و هەموو ئەو شتانەی ئەنجامی دا هەموو کەس پێی زانی. ترس و تۆقینی هەڵمەتەکانی زوڵم و زۆرداری و ئاوارەکردن و کوشتن و برین لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا بووە هۆی سەقامگیری سیاسی لە نێوان ئەو ڕژێمانەی کە پیادەیان دەکرد. یەکێتیی سۆڤیەت لە ژێر چەپۆکی ستالین و خرۆشۆف و برێژنێف چێژیان لە ئاشتی ناوخۆ وەرگرت، بەڵام ئەو ئاشتییەی ئەوان پیادەیان دەکرد ئاشتی گۆڕستان بوو. هەروەها ئاشکرابوون و زانیاری ڕووداوەکان هەموو شتێکیان خوارد، وەك چۆن مشەخۆرەکان بناغەی خانوویێك تێك بشکێنن وابوو. بە هەر شێوەیەکی چالاك بوو بێت کۆمۆنیزم چێژی لە بەدەستهاوردەی هاوکاری گشتی وەردەگرت. لە هەردوو ئاستی کۆمەڵگادا، دڵسۆزی لە سیستەمەکەدا وردە وردە ونبوو، بەڵام بە هەر حاڵ نوخبەیەك لە ئەندامانی سودمەندبوون لەو سیستەمە لەبەر ئەوەی دەسەڵات و سامانی پێ بەخشین لە کاتێکدا ئەوانی تر هەڵی بەدەستهاوردەیان نەبوو، بەڵام هەرچەندە کۆمۆنیزم سیستەمی ئەوان بوو. لە کۆتاییدا دژی وەستانەوە و ڕەتکردنەوەیان بووە هۆی لە ناوبردنی سیستەمەکە.

بڵاوبوونەوەی ئایینە دیارەکان زۆر جار لە سەرەوە بۆ خوارەوە بوو، سەرکردە دڵسۆز و وەفا نوێیەکەی لە ئامێز دەگرت و بوارەکانی تر خۆیان یەك بەدوای یەکدا دەهاتن، لێکترازانی کۆمۆنیزم بەدوای ئەو شیکردنەوەیە داهات کە جیابوونەوە لە ئۆرتۆدۆکسی (دینگ خیاپینگ — Dengxiaoping) لە چین و میخائیل گۆرباتشوف لە یەکێتیی سۆڤیەت ڕێگایەکی کردەوە بۆ دەستهەڵگرتن لە خاسیەتەکانی ئابووری، ئەمە لە حاڵەتی یەکەمدا بە شێوەیەکی گشتیش لە هی دووەم. ئەم دوو حاڵەتە بۆ لیبراڵیزمی نێودەوڵەتی بوون، ئەو ئیمپراتۆرەی ڕۆمان کە باوەڕی مەسیحی لە ئامێزگرت لە ساڵی (٣١٣) لە پێناو مەسیحییەت بوو لە ئەورووپا. لەبەرئەوەی ئەو ئیمپراتۆرە زۆرجار خوازیاری گۆڕان بوو، گۆڕان لە سەرەوە بۆ خوارەوەی دروست دەکرد، ئەمە بەلانی کەم سوودبەخشە بۆ تێگەیشتنی ڕووخانی کۆمۆنیزم لەوکاتەی چەمکی گۆڕان واتای شۆڕش دەبەخشێت.

شۆڕش هاتە ئاراوە وای لە خەڵك کرد هەڵسنەوەو ڕژێمە نایەکسانەکان لەناو ببەن، خۆیان دەسەڵات بگرنەدەست. ئەم وێنەیە خزمەتێکی زۆری گەیاند بە هونەری وێنە کێشان لە سەدەی نۆزدە و بووە هۆی دروستبوونی ملیۆنان پۆستەر لە سەدەی بیستەمدا کە هەموویان گێڕانەوەن

لە وێنەکێشانی نەوتی (دیلاکرۆیکس Delacroix) کە باسی نیشتمان دەکات لە ڕاپەڕینەکەی پاریس لە ساڵی (١٨٣٠) لە ژێرناونیشانی ***"سەربەخۆیی ڕێبەری گەل دەکات"*** کە تیایدا وەسفی ماریان دەکات، ئەو ئافرەتە گەنجەی کە هێمای فەڕەنسایە و ئاڵای فەڕەنسی بەدەستەوەیە و کۆمەڵێك هاوڵاتی مەدەنی چەکدار بەرەو پێشەوە دەبات، بەنێو لاشەی یاوەرەکانیاندا تێپەڕ دەبن، بەنێو چڕە دوکەڵی شەڕو پێکدادانەدا لە کاتێکدا هەموو باڵەخانەکانی پایتەخت تەخت کراون. دیلاکرۆکیس خاڵێکی زۆر گرنگی لە درامای شۆڕشگێری بەرجەستە کردووە ئەو ساتەی کاتێ خەڵك کێشەکان دەخەنە ژێر دەستی خۆیان، گێژاوەی (باستیل – Bastille) دەخەنە گەڕ هەروەك لە پاریس لە ساڵی (١٧٨٩) دا یان کۆشکی زستان – Winter  Palau دەخەنە گەڕ هەروەك لە پیتەرس بێرك لە ساڵی ١٩١٧ دا ئەم حاڵەتانە ڕوویاندا. هەمیشە لە جەنگدا خەڵکەکە سەربازن و سەرکەوتنیش دەوەستێتە سەر ئازایەتیان. ئەوەش تەواو وێنەی ڕووخانی کۆمۆنیزم نییە. ئەو پێکهاتەی کە سیستەمی کۆمۆنیست دەنوێنێ یان گێژاوەی باستیل یان کۆشکی زستان، ئەمە دیواری بەرلین بوو کاتێ شارەکەی کرد بە دوو لەتەوە. جەنگی سارد کۆتایی پێهات، بەڵام دیواری بەرلین لەلایەن ئاپۆرەیەکی بەهێزی خەڵکەوە نەڕووخا.

دوو ساڵ پێشتر لە ساڵی (١٩٨٧) دا ڕۆناڵد ڕیگن سەرۆکی ئەمریکا لەلای ڕۆژئاواوە وەستا، لە ڕۆژئاوای بەرلین، وتارێکی بڵاوکردەوە و بەسەرکردەی سۆڤیەتی ڕاگەیاند (بەڕێز / گۆرباتشۆڤ ئەم دیوارە بڕوخێنە) ئەم وتەیە بەدوو ڕێگا وترا : ئەوەی ئاشکرابوو خستیە ڕوو، بەڵام ئەوەی نەووت کە دەبێ یەکێتیی سۆڤیەت دوو بڕیاربدات لەسەر چۆنیەتی ئەوەی ئایا ئەڵمانیا دابەش ببێت یان نا، هەروەها (ڕێگن) پەلەی نەکرد لە ڕووخانی دیوارەکە، وەك ئەو پەلە پەلەی لە سەدە و نیوێکی پاش شۆڕشی فەڕەنسا کرا. ڕێگن هەرگیز زۆری لە خەڵکی ڕۆژهەڵاتی بەرلین نەکرد تا هەڵسن و دیوارەکە بڕووخێنن، چونکە قسەکردن بەم شێوەیە ترسناك بوو.

ئەو پاسەوانانەی کە دیوارەکەیان دەپاراست ڕێگەیان بە خەڵکەکەدا بە ئازادی خۆیان بەسەریدا تێپەڕ بن بە هەردوو ئاراستەدا. هەر دەروازە پارێزەکان بوون دەروازەکەیان کردەوە. کردنەوەی دیوارەکە بە شێوەیەکی ئاشتی بوو و بووە هۆی ئاشتیش. پارچەکانی وەك کۆنکرێت و بەربەستەکان کۆکرانەوە و فرۆشران بە هەمان شێوە کڵاو باج و تەنانەت کلاشنکۆفەکانی سوپای سۆڤیەت لە سەرانسەری بازاڕی ئەوروپادا بڵاوبۆوە و فرۆشران. گواستنەوەی دیواری



بەرلین و هێماکانی تری چەوساندنەوەی کۆمۆنیست بۆ نێو کەل و پەلی بازرگانی ئاشکرایە وەك دەربڕینی سەرکەوتنی بنەما ئابوورییەکانی لیبراڵ کە هەرچی دژی سەرمایەداری راست بۆوە، بە بەرهەم هاتنی سەرمایەداری خۆی کۆتایی هات، ئەمەش وەك قۆناغێك بۆ قارەمانێتی و مەرگەساتی گەل خزمەتی کرد، هەوڵی ڕاکردنیش لە کۆمۆنیزم بوو بە زنجیرەیەك لە یادگاری.

بە دڵنیایەوە، خەڵك لە کۆتایی پێهاوردەی کۆمۆنیزم تەواو بێ دەنگ نەبوون، خەڵکانێك کۆبوونەوە لە هاوینی (١٩٨٩) بۆ دەربڕینی هەستی دژایەتی بەرانبەر ڕژێمی کۆمۆنیست لە زۆربەی شارەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەڵمانیا و لە پراگی پایتەختی چیۆکۆسلۆفاکیا، هەروەها پاش هەوڵی کودەتایەك دژی (میخائیل گۆرباتشۆف) لە مانگی ئابی (١٩٩٩) بۆریس یەڵتسن ڕێپێوانێکی بە لایەنگران سازکرد لەناو جەرگەی مۆسکۆ. ئەو ساتانە زۆر گرنگ بوون بۆ چارەنووسی کۆمۆنیزم، بەڵام ئەوەی چارەنووسی کۆمۆنیزمی بڕیاردا دەسەڵاتی بەرگەنەگیراوی خەڵك نەبوو، بەڵکو بڕیاری دەسەڵاتی کۆمۆنیزم بوو کە تەقەی لە بەشداربووانی ئەو ڕێبوارانە نەکەن لەبەر ئەوەی دەسەڵات دەیتوانی بەئاسانی و بەزەبری هێز ڕێپێوانەکە تێکبدات. وەك ئەوەی ڕژێمی چین وای کرد لە مانگی حوزەیرانی (١٩٨٩) لە گۆرەپانی (تیانەمان) لە بێجینگ. ئایا ئەوان وایان کرد مێژووی ئەوروپا لە کۆرسی جیاجیا توێژینەوەی لە سەر بکرێت. بەهۆی تەقەکردنەوە ڕژێمەکان دەیانتوانی زیاتر بژین وەك ڕژێمی کۆمۆنیست لە چین ڕێگەی توندتیژی بۆ مانەوەی خۆی گرتە بەر. ئەو ڕژێمانە دەیانتوانی کات بکڕن بە خوێن. لە (لێپزیگ – Leipzig) و بەرلین و پراگ و مۆسکۆدا، دەسەڵاتی کۆمۆنیست ئەو کارەیان نەکرد و ئەو ڕێگایەشیان نەگرتە بەر. بڕیاری تەقە نەکردن بەتەواوی هی خودی ئەو ڕژێمانە خۆیان نەبوو، بەڵکو لەسەر هەر مەسەلەیەکی لەم جۆرە سەرکردایەتی ناوخۆیی کۆمۆنیست پاش هەموو شتێك پشتی دەبەست بە مۆسکۆ ئەویش سەرکردایەتی سۆڤیەت بوو، لە سەرووی ئەوەشەوە گۆرباتشۆف بوو کە بەتەواوی بەرپرسیار بوون لەو ئەو ئایدیەی کە مومارەسەیان دەکرد. هەروەها بڕیارێکیش نەبوو لەلایەن نوخبەی کۆمۆنیست وەك کارێکی خۆبەخشانەو قوربانیدان بۆ ڕێگەپێدانی ڕووخانی سیستەمەکەیان، بۆ نموونە، گەلێ گەورە بەرپرسانی کۆمۆنیست لە یەکێتیی سۆڤیەت لە مەنسەبی زۆرباش دانرابوون تاوەکو تەنها خۆیان دەوڵەمەند بکەن لەسەر حیسابی گەنجینەی ئابووری کۆمۆنیست.

هەروەها لە هەندێ شوێندا ڕووخانی کۆمۆنیزم بە هەقیقەت بووە بەهێزکردنی دەسەڵات، نوخبەکان لە ئاسیای ناوەڕاستدا وەك سەرکردەی ناوخۆی کۆمۆنیستەکان، کڵاو چەکوش و داسێکیان بەخشی بە کرێکارەکانیان تا لەبەرەی پێشەوە کار بکەن، ئەوانیش کڵاویان لەسەر کرد و ئاڵای نوێی نەتەوەییان بەرزکردەوە، هەروەها ئەو سەرکردە نوخبانە بەردەوام بوون لەسەر حوکم کردنی ئەوەی کە دواتر بوو بە وڵاتێکی سەربەخۆ، بەڵام بێ ئەوەی پێویست بکات وەڵامی مۆسکۆ بدەنەوە، بەڵام بە دڵنیاییەوە یەکێك لەو هۆیانەی کە بڕیاری تەقەنەکردنی لێکەوتەوە لە دەستدانی باوەڕ بوو بە سیستەمەکە، لە بڕی تەقاندنی گوللەکان هەروەك ئەلیکسەندەر سۆلژێنتیس دەڵێ : (خەیاڵ و هێزی ڕۆحانی کارەکتەرە شەڕانگێزەکانی شکسبیر زۆر کورتیان هێنا و زۆر بەرهەمیان لێ نەکەوتەوە، چونکە هیچ ئایدیۆلۆژیایەکیان نەبوو.... سوپاس بۆ ئایدیۆلۆژیای چارەنووسی سەدەی بیستەم کە پڕبوو لە ئەزموونی کاری شەڕانگێزی و چەپەڵی کە بەملیۆن هەژماردەکرێن). باوەڕ بە مارکسیزم و لینینیزم زۆر بێ هێز بوو بە چەشنێك کە نەیتوانی مردنی ئەو هەموو خەڵکە لەبەر چاو بگرێ کە بوونە هۆی هەواداچوون و نەمانی موعەرەزانی ئایدیۆلۆژیاکانیان.

دەرەنجامی جەنگی سارد وەك وێنەیەکی گۆڕانی مۆدێرنی ئایینی هەزم کرابوو، کە لە دەستدانی باوەڕ بە کۆمۆنیزم و بازدان لەسەر ئەو باوەڕە، لە ئامێزگرتنی بنەما ئابووری و سیاسییە لیبراڵەکانی لە خۆ گرتبوو لە کاتێکدا هەردووکیان زۆر پەیوەستن بەیەکتر ئەوەی دووەم مەرج نییە بەدوای یەکەمدا بێت. پاش هەموو شتێك تەڵاق زۆر بەکەمی مارەکردنەوەی لەدوایە نەمانی باوەڕ بە کۆمۆنیزم دڵسۆزی بۆ لیبراڵیزم دەستەبەرنەکرد و کۆششێکی ئەوتۆش نەخراگەڕ بۆ داڕشتنەوەی ڕەوشی سیاسی و ئابووری بە گوێرەی بنەما لیبراڵەکان، تەنانەت دوای ڕووخانی کۆمۆنیزمیش هەڵبژاردنی ئازاد و بازاڕی ئازاد دەسەڵاتی گەلی بەخۆوە ئەبینی لەو بەشانەی ئەوروپا کە کۆمۆنیزم تێیدا دەسەڵاتدار بوو، چونکە ڕێگەیان پێنەدرابوو وڵاتی خۆیان جێبهێڵن، شتێکی ئاساییە گەر خەڵکی جیهانی کۆمۆنیستی دیبایە لەکاتی جەنگی ساردا وەك ڕۆژگارەکانی ئۆدیسیس بوان، چونکە بەتەواوی ئەوەیان لە مێشك چەسپابوو کەنابێ زەنگی لیبراڵیزم لە ئامێز بگرن و گوێ بیستی بن، شتێك لەوەدا هەیە، بەڵام وێنەیەکی تر لە ئەدەبی شوێنەواردا یەکسانە بە کارەساتی ڕاستەوخۆی ڕووخانی کۆمۆنیزم، ئەشکەوتی



ئەفلاتوون ئەو ئەشکەوتەی کە خەڵك بە تاریکی تیایدا پارێزراو بوو پاش بەڕەڵابوونیان وێڵ بوون بە دوای شتی پڕو پووچ و ئاژاوە.

لینین لە ساڵی (١٩١٧) دا وتی : دەسەڵات لە ڕووسیا لە شەقامەکاندا پاڵ کەوتووە) لینین و بۆلشڤیکس ئەو دەسەڵاتەیان گرتەدەست و لە شەڕی ناوخۆدا بەکاریان هێنا، هەروەها بەکاریانهێنا بۆ مومارەسەکردنی بنەما نالیبراڵەکانیان لە ئیمپراتۆری قەیسەرییەکانی پێشوودا. جێگرەوەکانی لینین ئەو بنەمایانەیان زیندووکردەوە لەسەر چەقۆی کلاشنکۆفەکانی (سوپای سوور)یان خست بۆ نێو جەرگەی ئەوروپا، دوای ڕووخانی کۆمۆنیزم جارێکی دیکە دەسەڵات کەوتەوە سەر شەقامەکان بۆچی ئەوانەی ئەو دەسەڵاتە دەگرنە دەست یاخود دەیکەن بە میراتی خۆیان بڕیار دەدەن بەکاری بێنن (یان بەلانی کەم بە زۆری دەڵێن بەکاری دەهێنین) تاوەکو لەسەر ڕێچکەی لیبراڵ دەست پێ بکەنەوە؟

بۆ یەکەم جار لە چاخی مۆدێرندا هیچ ئیختیارێکی تر نەبوو تادوا دەیەی سەدەکەش نە فاشیزم و کۆمۆنیزم نە هیچ سیستەمێکی ئەلتەرناتیفی دیکە لە مەیداندا ئامادە نەبوون و سەرنجڕاکێش نەبوون. بە پێچەوانەشەوە لیبراڵیزم نەك هەر تەنها ئامادەبوو، بەڵکو هەرزۆریش سەرکەوتوو بوو. بەراوردی خاڵەکانی گۆڕانی ئایینی یەکێکە لە خاڵە سەرکەوتووەکانی باوەڕێکی ئێجگار قوڵ کە لە ئارادا بوو بۆ جێبەجێکردنی بنەماکانی لە کاتێکدا گەلێکی تریش لە پێشدا بەکاریان هێنابوو، چەندە مەسیحی لە ئەوروپادا زیاتر باوەڕیان دەهێنا پێی ئەوەندەش غەیرە مەسیحی نزیك دەبوونەوە لە باوەڕهاوردە، ئەم باوەڕەش هاتە ئاراوە لەگەڵ سەرهەڵدانی لیبراڵیزمی نێودەوڵەتی و کۆتایی جەنگی ساردا.

ئەوانەی کە بەرپرسیارێتیان گرتە ئەستۆی خۆیان بۆ ڕێبەریکردنی چارەنووسی ئەو وڵاتانەی کە لە کۆمۆنیزم داماڵرابوون باش ئاگاداربوون لەوەی کە دوژمنەکانی پێشوویان خۆیان تەرخان کردبوو بۆ بەشداربوون لە هەڵبژاردن و بازاڕی ئازاد، هەروەها دەشیانزانی کە مومارەسەکردنی لیبراڵ دەروازەیەکی بەرچاوی بۆ دوو دەیەی پێشتر کردەوە کە ململانێکەی بە چەشنی ئەوروپا بەهێز نەبوو هەروەها لیبراڵیزمیش تەواو نەهاتبووە ئاراوە کاتێ جەنگی سار دەستی پێ کرد.

پێشکەوتنی دیموکراسی لە دەرەوەی جیهانی کۆمۆنیست زیاتر دەبوو لە هەفتاکاندا، وڵاتە دەسەڵاتدارەکانی باکووری ئەوروپا وەك (ئیسپانیا و پورتوگال و یۆنان) دیموکراسیان لە

ئامێزگرت لە دەیەی دواتر. وڵاتەکانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا وەك تایوان و کوریای باکوور و فلپینییەکانیش بەدوایدا کەوتن. لەسەرەتای هەفتاکاندا لیبراڵیزمی سیاسی لە هەندێ لە وڵاتەکانی ئەمریکای لاتین چەسپا لە کۆتایی هەشتاکانیش تاکە وڵات لە مەیدانەکەدا مابووەوە و لیبراڵ نەبوو، کوبا بوو.

گۆڕانێکی لەم چەشنە لە بواری ئابووریشدا ڕوویدا لە پەنجاکاندا لە سەرانسەری جیهانی غەیرە کۆمۆنیست ئەویش حکوومەتەکان هاوسەنگییەکیان لە ڕووی کاروباری ئابوورییەوە دروستکرد لە نێوان بەڕێوەبردنی وڵات و بازاڕی تایبەتدا. چوار دەیە دواتر لە زۆربەی وڵاتانی باکووری ئەمریکا و ڕۆژئاوای ئەوروپا و ئەمریکای لاتین و باشووری ئاسیا و ڕۆژهەڵات و هەر شوێنێکی تر ئەو هاوسەنگییە چەسپاو ڕستەوخۆ چووە نێو بازاڕەوە. گۆڕانی هیچ یەکێك لەو وڵاتانە گرنگ و کاریگەر نەبوو بەقەد وڵاتە کۆمۆنیستەکانی پێشتری ئەوروپا کە هەوڵیاندا ئەو هاوسەنگییە بچەسپێت. دوای ڕووخانی کۆمۆنیزم جگە لەیەك وڵات نەبێت کە باوترین وڵاتی جیهان بوو لە نێوان ساڵانی / ١٩٤٩ و ١٩٧٦ / لە ژێر فەرمانڕوایی ماوتسی دۆنگدا، ئابووری چین وەکو یەکێتیی سۆڤیەت شیاو بوو بۆ پلانی دەوڵەت و کۆنتڕۆڵی ناوەندی. ئەوەی جێگەشی گرتەوە دینگ خیاپینگ بوو کە بە شێوەیەکی گشتی دەستی لە ئابووری کۆمۆنیست هەڵگرت و بازاڕی لە ئامێز گرت.

لەدوا دەیەی سەدەی بیستەمدا خولیایەکی قوڵ و فراوان لیبراڵیزمی ئابووری و سیاسی جیهانی کۆمۆنیستی وەك وێنەیەکی ئایدیۆلۆژی دوورگەکانی گالاپاگۆسی لێ کرد. شوێنێك بوو کە تیایدا دەزگا و مومارەسە نالیبراڵەکان وەك فۆرمێکی نەگۆر پارێزراو بوون، چونکە فەرمانڕەوایەکانی دەیانپاراست لەو کاریگەرییە سیاسی و کۆمەڵایەتیانەی کە لە هەموو شوێنێکی تر بەهێزتر بوون. لەم ڕووەوە ڕووخانی کۆمۆنیزم ڕەنگە بە هێزترین و فراوانترین و بەتەمەنترین پرۆسە بێتە پێش چاوو هەروەها ڕەچاوگرتنی جەنگی سارد بۆ ئەم سەرنجە بەراوردکردن نییە، بەڵکو وەسفکردنە، چونکە ململانێی سیستەمی لیبراڵ و نالیبراڵ و ڕێگای کۆتایی هاتنیان بە بەتەمەنترین و بنەڕەتی ترین پرۆسەی مێژووی دەم زەند دەکرێت ئەویش پرۆسەی بڵاوبوونەوەی کەلتوورە.



*بڵاوبوونەوەی کەلتوور*

کەلتوور بە پێناسەی مرۆڤناسەکان بریتییە لە خۆراك ئامێرەکان و بینا و باوەڕ و ئایدیە و دەزگاو و مومارەسەکان کە شارستانیەتی مرۆڤ پێکدێنن. مێژووی شارستانیەت مێژووی ئەفڕاندن و بڵاوبوونەوەی کەلتوورە، کەلتوور بەهۆی پەیوەندی نێوان کۆمەڵگاکان بڵاودەبێتەوە. لە چاخی بەردینەوە تا سەدەی بیست و یەك شتە مەعنەوی و بەرجەستەکان کە پێناسەی شارستانیەتی مرۆڤ دەکەن لە کەسێکەوە بۆ یەکێکی تر لە گروپێکەوە بۆ گروپێکی تر گوازراوەتەوە و گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە. پاشان دووبارە بە پێی تێپەڕبوونی کات گوازراوەتەوە. هەروەها ئەم پرۆسەیە شێوازی تری بەدواداهاتووە.

هەروەك کانزاکان لە جەرگەی زەویدا و توانای یاریکردنی شەترەنج، توانای داهێنانیش لە نێو کۆمەڵگا مرۆڤییەکانی جیهاندا بڵاوبۆوەو داهێنانی کەلتوور ڕوویدا، کەرەستەی نوێتر دروست دەکرێن و داهێنان لە کرۆکی شارستانیەتەوە دێتە ئاراوە. پاشان ئەو داهێنانە زیاتر لە شێوە ئەسڵیەکانی خۆی بڵاودەبێتەوە بۆ دراوسێکان و دواتریش بۆ ناوچە دوورەکان. بڵاوبوونەوەی کەلتوور وەك چۆن شتێك لە سەر خاکێکی لێژەوە سەر بەرەو خوار شۆڕ بێتەوە ئاوا لە وڵاتانی ناوەوەی جیهانەوە شۆڕ بۆتەوە نێو وڵاتانی دەرەوەی جیهان، هەر بۆ دڵنیا بوون، توخمەکانی کەلتووری مرۆڤ بە دوو ئاڕاستەی نێوان گروپەکانی مرۆڤدا تێپەڕ دەبن، بەڵام زلهێزەکە هەمیشە نێرەرەکەیە (بەخەشەر) و بێ هێزیش هێنەرە (وەرگرە). کاتێ هیند ستان لە ژێر چەتری بەریتانیادا بوو هەندێ وشەی نوێ و چەند جۆرە خۆراکێکی نوێی چنگ کەوت، لە بەرامبەریشدا، بەریتانیا زمانی ئینگلیزی و حکوومەتی مۆدێرن و هێڵی شەمەندەفەری بۆ ئاسیا فەراهەم هێناوە.

ویلیام ماکنێڵ کە یەکێکە لە باشترین ڕاهێنەرکان لە بواری مێژووی شارستانیەتی مرۆڤدا، ئەم پرۆسە مێژوویییە بنەڕەتیە و بە تەمەنەی بەم شێوەی خوارەوە کورت کردۆتەوە:

***بەپێی بەشی هەرەزۆری مێژووی تۆمارکراودا، هەنگاوی سەرەکی گۆڕانی مێژوویی پەیوەندی کردنە لە نێوان غەریبەکان، تووش کردنی مرۆڤ لەسەر هەردوو لا غەریبەکەدا بۆ ئەوەیە تا ڕەچاوی ئەو هاوتاییە بکات و لە هەندێ حاڵەتدا وەك بورکانێك لە کاتی داماڵینـدا ڕێگای ناسراوی هەڵس و کەوتی خۆیان بگۆڕن لەگەڵ ئەم جۆرە شارستانیەتە. سەنتەری چالاکی***

*زۆر گەورەی داهێنان هاتۆتە کایەوە پەیدابوونی ئەم جۆرە سەنتەرانەش ڕوانگەی کەلتووری دروست کراو زیاتر دەکەن. لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر ئەو سەنتەرە گەورانە شوێنیان گۆڕاوە یاخود سەنتەرێکی تەواو نوێتر خۆی دوپات کردۆتەوە، لەگەڵ ئەو گۆڕانانەش بە ئاراستەیەکی زۆر خێرای لێشاوی کەلتوور گۆڕانی تر هاتۆتە کایەوە، واتە گۆڕان لە ڕوانگەی دوورە پەرێزی کەلتوورەوە هاتۆتە کایەوە. ئەو جۆرە گۆڕانانەش ڕەنگە وەك پێناسەیەکی سەرەکی ماوەی سەردەمەکانی مێژوودا ڕەچاوبکرێت.*

کەلتوور بەهۆی ناوەندی ئارەزوومەندانەوە بڵاودەبێتەوە وەك ئاڵوگۆڕکردن و نموونە و لاسایی کردنەوە هەروەها بەزۆرداریش بەهۆی داگیرکردن و چەوساندنەوە بڵاودەبێتەوە. داگیرکردن و داسەپاندنیش لە یەك کاتدا ڕوو دەدەن، بەریتانییەکان مومارەسەی ڕۆژئاوایان لەمەڕ یاساوە داسەپاندە سەر هیندستان، بەڵام هیندییەکان کاتێ بەریتانییەکان ڕۆیشتن خویان پێوەگرت و پاراستیان.

چۆن و بۆچی کەلتووری داهێنان هاتۆتە ئاراوە، بۆچی شوێنی زلهێزەکانی جیهان لەماوەی چەند سەدەیەکەوە گۆڕاوە، ئەمانە ئەو پرسیارانەن کە لێکۆڵینەوەی هاوچەرخی کۆمەڵایەتی و ئابووری و مێژووی و کەلتووری بایەخێکی بەرچاوی پێدەدات. ئاشکرایە جوگرافیاش وەك هەلومەرجی کەش و هەواو بایۆلۆژیا ڕێسای خۆی هەیە. ئەو ڕێسایانە ئەوە شی دەکەنەوە کە بۆچی ئەفراندن زۆر بەدەگمەن لە هێڵی کارژۆڵەوە ڕوودەدات و بۆچی ئەورووپا شەپۆلی پێش (٥٠٠) ساڵ لەمەوبەری هەموو جیهان بووە. هەروەها داب و نەریتە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکانیش گرنگ بوون، ئەوەتا لە دوو گەشەسەندنی مێژوویی زۆر دیراسە کراودا دیارە، چین ژێر کەوت لە بواری سەرمایەدا دەربارەی سوودەکانی و جیهانیشی بەرەو چاخی مۆدێرن برد و بەریتانیاش بەلانی کەم، لە ڕووی ئابوورییەوە تەنها بە توانای خۆی توانی ئەو کارە بکات.

بۆ ماوەی چەند سەدەیەك لە نیوەی یەکەمی دوا هەزارەدا شوێنی شارستانیەتی زلهێزەکانی جیهان گۆڕاوە بۆ نموونە : گەلێ کۆمەڵگای دواکەوتووی ئەورووپی لە ڕووی سیاسییەوە نزیکەی ١٠٠٠ تا ١٥٠٠ کۆمەڵگا کۆبوونەوە لە نزیك کەناری ڕۆژئاوای زەریای ئەتڵەسی وەك کۆمەڵگا چالاکەکانی ئەم گەردوونە، کۆمەڵگا ئیسلامییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و



لەسەروو هەمووشیانەوە ئیمپراتۆری چینی بوو. ئەورووپا خواردن و سامان و تەکنەلۆژیای لەوان وەرگرت ئەوانیش لە بەرابەردا زۆرکەمیان لە ئەورووپا وەرگرت، بەڵام لە سەرەتای سەدەی شانزەدا ئەو ئەورووپایەی کە بە کولتوورێکی هەژار و ئاڵۆز و دینی مەسیح ناسرابوو دەستپێشخەری کرد بۆ گۆڕان. سەرهەڵدانی ڕۆژئاوا لەدوا پێنج ساڵی مێژوودا لە دایك بوو.

بە تێپەڕبوونی چەند سەدەیەك شوێنی بەهێزی ئەورووپا گۆڕا بۆ نموونە، سەنتەرە سەرەکییەکانی سامان و دەسەڵات و کەلتوور لە ئیتالیاوە چووە ئیسپانیا و دواتر بۆ فەرەنسا و بەریتانیا و دواتریش هۆڵەندا. لە سەدەی بیستەمدا لە ڕۆژئاوا وە بەرەو زەریای ئەتڵەسی چوون بەو واتایەی کە سەرکەوتنی ئەورووپاشی گرێدا بە باشی کۆڵەگەی سەربازی. ئەورووپا چاخی دۆزینەوەی خۆی دروستکرد بە گەیشتن بە شارستانیەتە دوورەکان و داگیرکردنی بێ هێزەکانیان بەتایبەتی شارستانیەتە ئەمریکییەکان ئەمەش بەهۆی ئارەزووی بۆ جەنگ تەکنەلۆژیای دەریایی و بەرگرییەکی زۆر بۆ نەخۆشی.

لە سەدەی نۆزدەدا ڕۆژئاوا ڕەوشی باشی بەرە و پێش برد پتر لە بەشەکانی تری جیهان. چەمکی بازرگانی کەلتوور پێشتر زیاتر ڕەخنەی لێ دەگیرا. داهێنانی کەلتوور لە ئەورووپا بە هەموو ئاراستەیەکەوە بە خێرایی پێشکەوت، چونکە ئا لەو کاتەدا ئەو دوو داهێنانە واتە شۆڕشی فەرەنساو پیشەسازی کە جیهانی پێناس کرد لە جیهانی مۆدێرندا بەدیارکەوتن. هەردوو شۆڕش، سەراپای ئەورووپایان گرتەوە، ئەورووپاش بۆ بەشەکانی تری جیهانی گواستەوە کە بووە هۆی دروستبوونی یەکەم شارستانیەتی گلۆبەلی ڕاستەقینە. هەردوو شۆڕش جیهانی مۆدێرنیان لە ڕۆژئاوا دروستکرد، بە هەمان شێوە لە سەدەی نۆزدە و بیستەمدا ڕۆژئاوایان کرد بە بەهێزترین و کاریگەرترین کەلتوور لە مێژووی شارستانیەتی مرۆڤدا.

سەرەڕای ئەمەش، شۆڕشی فەرەنسا و پیشەسازی بوونە هۆی درێژبوونەوەی سەدەی بیستەم (١٧٨٩-١٩١٤) کاتێ هێزە تەقلیدییەکان و لیبراڵی مۆدێرن کەوتنە ڕکابەرێتی یەکتری لە نێو وڵاتە سەرورەرییەکان، و دواتریش بوونە هۆی کورتبوونەوەی سەدەی بیستەم (١٩١٤-١٩٩١)، کاتێ حکوومەت و بەها تەقلیدییەکان و هێزەکانی لیبراڵیزم جەنگان دژی هێزەکانی نالیبراڵیزم.

بڵاوبوونەوەی بەرهەمی هەردوو شرۆش لە وڵاتە زلهێزەکانەوە بۆ وڵاتە بێهێزەکان ڕێچکەی جیای لەوەی زلهێزەکان بە دوادا هات. بە شێوەیەکی کرنۆلۆژی باشترە چاخی مۆدێرن دابەش

کەیت لە نێو وڵاتە بێ هێزەکان بەسەر دوو بەشدا: بەشێکیان سەد ساڵە لە نیوەی سەدەی نۆزدەمەوە تاوەکو سەدەی بیستەم، ئەوەکەی تریش پەنجا ساڵە واتە لە نیوەی سەدەی بیستەمەوە تا کۆتاییەکەی. ماوەی پێش ئەو دوو ماوەیەش چاخی ئیمپراتۆرییەت بوو واتە چاخی ئیمپراتۆری یان چاخی دوای کۆلۆنیال.

لە وڵاتە بێ هێزەکاندا وەك زلهێزەکان ململانێیەك لە نێوان هێزی تەقلید و مۆدێرندا هەبوو، بەڵام وەك ڕێچکەی زالهێزەکان نەبوو، ململانێیەکی ناوخۆ نەبوو. مۆدێرنیزم وەك هێرشێك لە لایەن زلهێزەکانەوە چووە نێو کۆمەڵگا تەقلیدییەکانی بێ هێزەکان. لە ماوەی دووەم و کورتتری چاخی کۆلۆنیالدا کە هاوتەریبە لەگەڵ جەنگی ساردا، کاتێ ململانێی سەرەکی لیبراڵیزمی نالیبراڵیزم، ئەو ململانێیە لە هەموو شوێنێکدا وەك ململانێیەکی ناوخۆ بوو لە نێو وڵاتەکان. حکوومەتی ئەو وڵاتانەی کە بە جیهانی وڵاتانی سێیەم ناسراون داب و نەریتە لیبراڵی و نالیبراڵییەکانیان مومارەسە دەکرد، بەڵام لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی جیاواز بوو.

لە سەدەی شانزەوە بۆ ناوەڕاستی نۆزدەهەم، ئەوروپییەکان ئەمریکییەکانیان داگیر کردو ئاڵای خۆیان لە سەر سەری ئیمپراتۆری ژاپۆنی و چین و هیندستان چەقاند لە هەمانکاتدا دژی سیستەمی پاشایەتی تەقلیدی ئیسلامی دەوەستانەوە لە ناوچەی نیمچە دوورگەکانی بەلکان و لە ناوەڕاستی ئاسیا، بەڵام دەسەڵاتە سیاسییە تەقلیدییە غەیرە ڕۆژئاواییەکان هەڵەی وایان کرد لەگەڵ دەسەڵاتی ڕۆژئاوا هەڵبکەن لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم و بەولاوە، شۆڕشی پیشەسازی هێزی ئەوروپای فراوانتر و بەهێزترکرد یەکەی سەربازی ئەوروپای بە شێوەیەك فراوانترکرد کە ئەوروپیەکان توانیان هێرش بکەنە سەر زۆربەی شوێنەکانی سەر ئەم زەمینەو و داگیری بکەن و حوکمی بکەن.

بێهێزبوونی کۆمەڵگا تەقلیدییەکان لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا سەری هەڵدا لەدەیەی (١٨٥٠) حوکمی ئیمپراتۆری چین پێشتر لەلایەن ئەوروپییەکانەوە لە جەنگی (ئۆپیەم Opium) لە ساڵی / ١٨٣٩ – ١٩٤٢ / تێکشکێنرابوو، هەروەها کەوتبوە ژێر فشاری هەرە گەورەی ڕاپەڕینی ناوەخۆی، لە هەموو مێژوویدا، یاخیگەرانی (تەیپینگ Taiping) کە بزووتنەوەیەکی ئایینی بوون بە سەرکردایەتی (هۆنگ خیکوین Hong Xiuquian) کە سەرکردەیەکی لێهاتوو بوو بە شێوەیەکی چڕوپڕ ئایدیا و تەکنیکە سەربازییەکانی ڕۆژئاوای





بەکاردەهێنا، بۆیە سەرنجی چەند ملیۆن کەسی بۆ خۆی ڕاکێشا و لە ساڵی / ١٨٥٣ – ١٨٦٤ / زۆربەی چینی کۆنترۆڵ کرد. کاتێ جەنگی (کریمین Crimeam War) لە ساڵی / ١٨٥٤ – ١٨٥٦ / ڕوویدا بەریتانییەکان و فەرەنسییەکان ئیمپراتۆری ڕوسیان تێك و پێك شکاند و زاڵ بوون بەسەریدا. هەروەها هەرچەند ئیمپراتۆری عوسمانی لەلای براوە بوو، دەرەنجامی جەنگەکە کاریگەری لە کەم بوونەوەی دەسەڵاتی نەدەکرد. لە ساڵی / ١٨٥٤ / دا ویلایەتە یەکگرتووەکان زۆری لە ئیمپراتۆری ژاپۆن کرد تاپاش دوو سەدە لە دوورە پەرێزی بکرێتەوە بۆ بازرگانی رۆژئاوا، هێزی رەتکردنەوەی هندستانیش لە ساڵی / ١٨٥٧ – ١٨٥٨ / ڕەتی فەرمانڕوایی بەریتانییەکانی کردەوە کە راستەوخۆ زۆربەی ئاسیای حوکم دەبرد. ئەو ڕووداوە هەمەجۆرانە بابەتی سەرەکی دەخاتە ڕوو، وایان خستە ڕوو کە ڕێگا تەقلیدییەکانی ڕێکخستنی ئابووری و سیاسی کە بۆ ماوەی چەند سەدەیەك لە دەرەوەی ڕۆژئاوا مومارەسەکرا نەتوانن بەرگەی دەسەڵاتی رۆژئاوا بگرن. دەسەڵاتە تەقلیدییە بێهێزەکانی جیهانی بە ڕێگایەکی تایبەتی وەڵامی دایەوەو هەوڵیاندا سەرچاوەی هێزی ڕۆژئاوا لەگەڵ داب و نەریتە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانیان وەرگرن و وێڵ بەدوای ئەوەی کرۆکی دەسەڵاتی رۆژئاوا بەکاربهێنێت بۆ پێکهاتە تەقلیدییە سیاسییەکەیان.

لە سەدەی نۆزدەدا، قەیسەرەکانی ڕووسیا وەك نموونەی پێش خۆیان لە سەدەی حەڤدەدا بۆ نموونە پیتەری گەورە وێڵ بوون بە دوای هاوردەی تەکنەلۆژیا و هێڵی شەمەندەفەر بە مەبەستی بە هێزکردنی فەرمانڕەوای ئۆتۆکراتی ئیمپراتۆرەکەیان.

بە هەمان شێوە، لە چین حوکمی پاشایەتی تەنگ چای (Tung-chih) لە ساڵانی ١٨٦٠-١٨٧٠ هەوڵی لیست کردنی میتۆدە ئیدارییەکان و تەکنیکە سەربازییەکانی رۆژئاوای دا بە مەبەستی بەهێزکردنی رژێمە تەقلیدییەکە. سوڵتانەکانی تورکیا هەوڵی بەهێزکردنی سوپایەکانیاندا لەکاتی پاراستنی تەختی پاشایەتیان.

لە وڵاتانی دەرەوەی جیهاندا، هەروەك وڵاتانی ناوەوەی جیهان، رژێمە کۆنەکان سەرنەکەوتن لە هەوڵی پاراستنی خۆیان. لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا وڵاتی مۆدێرن و ئابووری پیشەسازی و داهێنانی رۆژئاوا هەردووکیان لە سەرانسەری جیهان بڵاوبوونەوە. جگە لە

رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی عەرەبی(*) حوکمی پاشایەتیە تەقلیدییەکان لە هەموو شتێك زیاتر ون بوون و نەمان. ئەوانەی کە جێگای ئەمانەیان گرتەوە گەر بە ڕازیبوونی خەڵکەکەش نەبووبێت ئەوا هەر بە ناوی ئەوانەوە حوکمیان کرد. فەرمانڕەوا نوێیەکان بە هەموو جۆرە پلەیەکی سەرکەوتنەوە هەوڵیاندا گەشەی پیشەسازی و ئابووری بکەن بە بەشێك لە ژیانی کۆمەڵگاکانی خۆیان. هەوڵی دامەزراندنی حکوومەتی بیرۆکراسی بەهێزو، سوپای کاریگەر و سیستەمی خوێندن و مەنهەجی پەسەنکراو لە لایەن حکوومەتەوە درا. کاتێ لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا مۆدێرنی سیاسی و ئابووری هاتە کایەوە لە رۆژئاوا، بە شێوەیەکی بەرچاو لە هەموو شوێنێك سەرکەوت.

تەنانەت ئەوانەشی کە شیاوبوونە بۆ ئەو ڕێچکەیە جەختیان لە سەر کردەوە. بزووتنەوەی گەل بۆ سەربەخۆیی هیندستان بە سەرکردایەتی موهانداکەی غاندی پشتی بەست بە هێمای تەقلیدی بۆ ورژاندنی جەماوەرەکەی دژی فەرمانڕەوایەتی بەریتانیا. بە خواردن و پارەیەکی زۆر کەم وەك پیاوێکی پیرۆزی هیندی ژیانی بەسەر برد. بە گالیسکەیەکی ئاسایی سەردانی هەموو شوێنێکی دەکرد بە جلوبەرگێکی زۆر ئاسایی. جلێکی تەقلیدی کە پێکهاتبوو لە قوماشێکی ئاسایی و شاڵێك.

هەرچەندە جلەکەی غاندی لەگەڵ کەشی وێست مینیستەرو کاپیتۆل هۆڵ نەدەگونجا، بەڵام لە هەموو ڕووێکەوە کەسێکی مۆدێرن بوو. بە شەمەندەفەر سەفەری دەکرد. لە پەخشی ڕادیۆدا پەیامەکانی بڵاودەکردەوە. غاندی خۆی کەسێکی دەمارگیر نەبوو، پارێزەرێك بوو لە بەریتانیا ڕاهێنرابوو و لە باشووری ئەفریقیاش ئەزموونی هەبوو، زۆریش کاریگەر بوو بە

* حوکمە پاشایەتییەکان ڕووخێنران لە میسر و عێراق و لیبیا، بەڵام لە ئوردن و مەغریب و وڵاتانی کەنداوی خاوەن نەوت هەر مایەوە کە گەورەترینیان عەرەبستانی سعودیە بوو. سیستەمی پاشایەتی کەنداو ئەو قازانجەی کە لە نەوت و سنووریان وەردەگرت بە پێوری دەرەوە لە دانیشتوانی خۆیانیان بەو پەڕی خۆشییەوە سەرف دەکرد. سووخۆری وشەیەکی دروست نییە بۆ ستراتیژییەتی حوکمکردنیان، بەڵام سامانی نەوتیان وای لەوان کرد بەرهەمهێنەر بن و یارمەتی ئەوانی دا بۆ سەقامگیری سیاسی. وێڕای ئەمە، ئەو فەرمانڕەوایانە زۆر چێژیان لەو شێوازی بەڕێوەبردنە وەردەگرتو ئەمەش لە بەر هۆگەلێك، لە بەر ویلایەتە یەکگرتووەکان، هەروەها پاشایەتی ئوردنی هاوکارییەکی باشی لەو ماوەیەدا لە ئیسرائیل وەردەگرت کە دراوسێیەکی بوو لە لای رۆژئاوا، بەڵام لە هەمان کاتیشدا دوژمنێکیشی بوو.



نووسینی رۆژئاواییەکان بە تایبەتی نووسینەکانی هێنری دەڤید تۆریۆ. بە هەقیقەت، ئایدیای بزووتنەوەی سیاسیی گەل ئەوەیە کە هەموو باوەڕە جیاوەزەکان پێکەوە بژین بە ئاشتی و حکوومەتێکی دیموکراسی هەبێت لەگەڵ وڵاتێکی سەربەخۆ، لە ڕاستیدا ئایدیای هیندستانی ئەو کاتە هەمووی مۆدێرن و رۆژئاوایی بوو.

پیشەی غاندی هێمای دەسکەوتێکی گەورەی کۆمەڵگا بێهێزەکانی سەدەی بیستەمە. بە هۆی کاریگەری بزووتنەوەکەی، هیندستان سەربەخۆیی خۆی لە بەریتانیا وەرگرت. لە کاتێکدا، دەسەڵاتە تەقلیدییەکان نەیانتوانی دەسەڵاتی خۆیان بپارێزن یان ئەو ڕێگایەی کە ژیانیان لەسەری بەند بوو، ئەو کۆمەڵگایانەی کە ئەوان حکومیان دەکرد بە کاریگەری هەردوو شۆڕشی فەڕەنسا و پیشەسازی دەستیانکرد بە وەدەرنانی فەرمانڕەوا بێگانەکان. تەکنیکی سەربازی رۆژئاوایان بەکارهێنا و سوودیان لەو چەکانە وەرگرت کە شۆڕشی پیشەسازی و فەڕەنسا دروستیان کردبوو. لەمەش گرینگتر، بە تایبەتی لە مەسەلەی هیندستان، ئایدیای نەتەوایەتیان بەکارهێنا کە کاتی خۆی شۆڕشی فەڕەنسا هێنایە کایەوە بۆ ورژاندنی جەماوەر دژی فەرمانڕەوا ئیمپراتۆرییەکان. ئەمەو لەگەڵ بێهێزبوونی دەسەڵاتی ئیمپراتۆرە گەورەکانی وەك بەریتانیاو فەڕەنسا و ژاپۆن، سەرەنجامی جەنگی جیهانی دووەم لە لایەك و گەشەسەندنی ئەو باوەڕەی لە لایەن زلهێزەکان بۆ حکومکردنی گەل دژی ئیرادەیان و بە شێوەیەکی پەسەند نەکراو پێورە سیاسییە لیبراڵییەکان پێشێل دەکات لە لایەکی دیکەوە کۆتاییان بە ئیمپراتۆری ئەورووپا هێنا. لە ڕوانگەی دوا ساتەکانی مێژوودا، ئیمریالیزم وەك میتۆدێك سەیر دەکرێ بۆ سەپاندنی حوکمی بێگانە و بڵاوکردنەوەی تەکنیکەکانی مۆدێرن بەسەر وڵاتە بێهێزەکاندا. بۆیە لەگەڵ خۆیدا تۆوی ڕووخاندنی خۆی هەڵگرت.

لەگەڵ هاتنە کایەی سەربەخۆییەکی فەرمی، مافی هەڵبژاردن لە نێوان بنەما لیبراڵی و نالیبراڵییەکانی ڕێکخستنی ئابووری و سیاسی هاتە ئاراوە. گەلێ لە وڵاتانی دەرەوەی جیهان بە شێوەی جیا جیا هەڵیانبژارد، بەڵام ئیختیارەکانیان لە ناوەڕاستی سەدەدا لە بەرژەوەندی دەزگاو داب و نەریتەکانی کەرتی کۆمۆنیست بوو کە سەرنجی گەلێ وڵاتی ڕاکێشا. لە ڕووی سیاسیەوە، هاوکێشەیەکی نوێیان پێشکەش بە سەرۆکی ئەو وڵاتانە کرد بۆ ئەوەی لە دەسەڵاتدا بمێننەوە.

لە ڕووی ئابووریشەوە، پێدەچوو کورتترین ڕێگا بگرنەبەر بۆ ئەوەی بگەن بە سامان و هێزی ئابووری. لە ڕووی مێژووییەوە، فەرمانڕەوا نوێیەکان هەستان بە ڕەتکردنەوەی سیستەمی ئابووری و سیاسیی سەرۆکەکانی پێش خۆیان کە ئەو زلهێزانەش نەبوون مومارەسەی لیبراڵیزمیان کرد لە وڵاتی خۆیان، بەڵام لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا وڵاتانی دەرەوەی جیهان بەرەو لیبراڵیزم چوون کە ودرۆ ویڵسن لە پاریس پەردەی لە سەر لادا، هەر لە بەر هەمان هۆ بوو ئەو وڵاتانەی کە سەردەمێك لە لایەن کۆمۆنیستەکانەوە بەڕێوەدەبران سەرکەوتوو بوون لەم ڕێگایەوە.

کۆتایی هاتنی سیستەمی ئیمپراتۆر خۆی لە خۆیدا هۆیەکی تر بوو کە وڵاتانی دەرەوەی جیهان پابەند بوون بە داب و نەریتە لیبراڵییەکان. کاریگەری لیبراڵبوونی وڵاتانی ناوەوەی جیهان زیادی کرد پاش ئەوەی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە ڕووی سەربازی و سیاسییەوە و کۆنترۆلی وڵاتانی دەرەوەی جیهانیان کرد. کاتێ وڵاتانی دەرەوەی جیهان خەمیان لە خۆیان خوارد و دەستیان کرد بە بەرگریکردن دژی باڵادەستە ڕۆژئاواییەکان، ئازادبوون لە بەکارهاوردەی سیستەمی سیاسی و ئابووری، هەروەها هەندێ جاریش، سیاسەتی ئاسایش بۆ مەبەستی زیاتر لە بەرگری لەخۆکردن. هەروەکو پرۆسەی گەشەسەندن بەکاردەهێنرا، بارودۆخ گۆڕاو خاسیەتە لیبراڵییەکان زیاتر و هی نالیبراڵییەکانیش کەمتر لە بەر چاو دەگیران. کۆتایی کۆنترۆلی ڕاستەوخۆی ڕۆژئاوا بنەما لیبراڵییەکانی سەرنج ڕاکێشتر کرد، چونکە هیچی تر بەشێك نەبوون لە هێرشی کتوپڕ بۆ سەر جیهان. بەڵکو بوون بە ڕێگەچارەی بەردەست بۆ کێشەکان.

ڕەنگە سەردەمی جەنگی سارد بە بەشێك لە پرۆسەی چاخی کۆنی گواستنەوەی کەلتوور و بەکاربردنی دەست نیشان بکرێت، بە تایبەتی وەك بابەتێکی ئەو پرۆسەیە لە ماوەی پێنج سەد ساڵی ڕابردوودا. بڵاوبوونەوەی ئایدیای بەرجەستە و مەعنەوی کەلتوورو گۆڕان و فراوانکردن و بەهێزبوونی وڵاتانی ناوەوەی جیهان کەوتنە کەنارەکانی زەریای ئەتڵەسی بۆ سەرانسەری جیهان. دەرەنجامەکەش شارستانیەتێکی گلۆبالی ڕاستەقینە بوو، یەك لەوانە سیاسەتی دیموکراسی و ئابووریی بازاڕو دەستەبەرکردنی وڵاتی تایبەت و دەسەڵاتی ڕەها بوو.

لە زۆربەی کاتەکانی مێژووی مرۆڤایەتیدا دیارە لە دوا نیوەی سەدەی بیستەمدا ئایدیاکان شان بە شانی بەرهەمەکان لە وڵاتانی ناوەوە بەرەو وڵاتانی دەرەوەی جیهان چوون، بەڵام بە



پێچەوانەی سەردەمی ئیمپراتۆری، لە کاتی جەنگی ساردا میتۆدی سەرەکی گۆڕان ئارەزوومەندانە پەسەند دەکرا نەك بە زۆرداری. هەروەرها بە پێچەوانەی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمیشدا دەزگا سیاسی و ئابوورییەکان کە لە ڕۆژئاوا سەرچاوەی گرتبوو باوەشی بۆ هەموو جیهان کردبۆوە و تەنها مۆدێرن نەبوو، بەڵکو لیبراڵیش بوون. کەواتە کۆتایی جەنگی سارد بەشێکی تایبەتی لە مێژووی جیهاندا تەواو کرد. دوا قۆناغیش بەرگریکردن لە نالیبراڵیزم کە لەکاتی جەنگی ساردا هەبوو لە دوا جاردا ملکەچ بوو. ملکەچ نەبوو بۆ هێزیکی سەربازی، بەڵکو بۆ هێزی مێژوو، مێژوویێك لە تەواوی جیهانی سەدەی بیست و یەکدا باوە.

## هەردوو ڕووەکەی مێژوو

مێژوو لە دوو ڕوودا تۆمار دەکرێت. ڕووی ڕووداوەکان کە مێژوونووسی کۆمەڵایەتی فەرەنسی فێرناند برۆدل ئەم ناوەی لێ ناوە، هەروەها ڕووی ماوەکان (کات) کە ئەمەش لە لایەن برۆدلەوە بەکارهێنراوە. پێوانەکانی کات جیاوازن. ڕووی یەکەم هەواڵەکان دەگرێتەوە و لە هەواڵ دروست دەبێت، ڕووی دووەمیش ساڵ و دەیەو سەدە دەگرێتەوە.

دوو کەرتی جیاوازی کۆمەڵگا چاودێری و تۆماری هەردوو ڕووەکەی مێژوو دەکەن و شیان دەکەنەوە. مێژوونووسە سیاسی و دیپلۆماسی و سەربازییەکان دیراسەی ڕووی یەکەم دەکەن، مێژوونووسە ئابووری و کۆمەڵایەتیەکانیش ڕووی دووەم. لە ڕاستیشدا بابەتەکانیان جیاوازە. مێژوونووسە سیاسییەکان دیراسەی سەرکەوتن و ژێرکەوتنی پاشاو وەزیرەکان دەکەن، دیراسەی جەنگ و ئاشتی و پێکدادان و پەیمان بەستن، کودەتاو هەڵبژاردنەکان، یاسادانان و دەستوورەکان دەکەن. مێژوونووسە کۆمەڵایەتییەکانیش دیراسەی دەزگا کۆمەڵایەتییەکان و داب و نەریت و ئامێرو تەکنەلۆژیاو ڕێوڕەسمەکان و باوەڕ دەکەن. گۆڕان زیاتر لە ڕووی یەکەمی مێژوو ڕوودەدات تا دووەم، بۆیەشە کاتێ مێژوونووسە سیاسییەکان بایەخ بە خۆیان و گۆڕان دەدەن، مێژوونووسە کۆمەڵایەتییەکان زیاتر بایەخ بە بەردەوامی دەدەن.

جیاوازی گرینگتر هەیە لە نێوان هەردوو ڕووی مێژوو بە مەبەستی تێگەیشتن لە دەرەنجامەکانی جەنگی سارد. ڕووداوە مێژووییەکان، کرۆکی هەواڵەکانی مرۆڤن. تۆماری

ڕووداوەکانی کۆمەڵگاو حکوومەتەکان و تاکەکان. چیرۆکی ئافرەت و پیاوە گەورەکانە. باسی کارە چاکەکان و ژماردن و نەژماردنە، باسی ئەو نەخشانەیە کە سەرکەوتن و ژێرکەوتنی بە دواوە بووە. تۆمارکەری ڕووداوەکان کاتێ باسی ڕووداوێك دەکەن دەست پێ دەکەن بە فرمانی دیاری وەك: خەڵك شەڕ دەکەن، بەرگری دەکەن، دەبەنەوە، دەدۆڕێنن، لادەچن، بڕیار دەدەن، بەدەست دەهێنن و ژێر دەکەون. بە پێچەوانەوە، ڕووی ماوەکان کرۆکی هێزە ناشەخسییەکانە، کرۆکی ئەو پرۆسە کۆمەڵایەتیانەیە کە بە ئاسانی ناتوانرێـت لە لایەن حکوومەتەوە قۆرخ و کۆنترۆڵ بکرێت. ئا لێرەدا مێژوو ڕوودەدات. ڕووی دووەم ڕووی یەکەم دروست دەکات. مارکس دەنووسێت " مرۆڤەکان مێژووی خۆیان دروست دەکەن"، "، بەڵام بە هەوەسی خۆیان دروستی ناکەن، لە ژێر ئەو بارودۆخانە دروستی ناکەن کە خۆیان بۆ خۆیانیان هەڵبژاردووە، بەڵکو لە ژێر ئەو بارودۆخانەی کە لە ڕابردوودا سەرچاوەیان گرتووە و دەگوازرێنەوە. مێژووی ڕووداوەکان ئەو مێژووەیە کە پیاو و ئافرەت دروستی دەکەن، مێژوونووسانی ڕووی ماوەکان دیراسەی ئەو هێزانە دەکەن کە بەشداری لە ئیختیارەکەیان دەکەن.

جەنگی سارد لە هەردوو ڕوودا پێش هات، بەڵام ڕووی یەکەم جەختی لە سەر باس کردن و شیکردنەوەی کرد. لەم ڕووەوە، نەخشەی ململانێی ڕۆژئاواو و ڕۆژهەڵات وەك جەنگێك گفتوگۆیەکی ئەوتۆی بۆ مێژوونووسان نایەوە. جەنگ چالاکییەکی نایابە لە مێژووی ڕووداوەکاندا. مێژوونووسی ڕووداوەکان مەیدانی کارەکانی مرۆڤە و مەیدانی مەبەست و ڕێکخستن و بەهرەو ئیرادەیە. دەرەنجامی جەنگ دەوەستێتە سەر ئەو کارانەی کە پیا و و ئافرەت دەیکەن چ تاك چ کۆ، هەروەها چۆنی ئەنجام دەدەن. لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا جەنگ بووە خوازەیەك (Metaphor) بۆ ئاژانسی بە ئەرك و ڕێك و پێکی مرۆڤ، بۆ هێرشە کتوپڕەکان بۆ سەر سوپای بەرامبەر نا، بەڵکو بۆ سەر گرفتە کۆمەڵایەتییەکان. بۆیە حکوومەتی ئەمریکی جەنگی لە سەر هەژاری و تاوان و ماددەی بێهۆشکەری نایاسایی و نەخۆشی شێرپەنجە ڕاگەیاند.

بەکارهاوردەی چەمکی "جەنگ" بۆ سیفەتی مێژووی نێو دەوڵەتی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم گونجاو بوو. هەروەك تێبینی کراوە جەنگی سارد بە پێوەری ڕێگا بنەڕەتییەکاندا جەنگ بوو. لە کۆتاییدا هەڕەشەی بەردەوامی هێزەکان بە هۆی بەکارهاوردەی بەڕاستی زۆر کاری لە دەرەنجامەکان کرد، بەڵام گەڕانەوە بۆ نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم وەك ماوەی جەنگی سارد



تەواو نییە. دەرەنجامەکەی دەبێ وەك بەرهەمی هێزە ناشەخسییەکانی خولیای جیهان سەیر بکرێت وەك گواستنەوەی کەلتووری دونیای بەرجەستە بە تایبەتیش دونیای مەعنەوی. ئەوە هێزەکان بوون بۆ ماوەیەکی درێژ کاری خۆیان ئەنجام دا، تۆپخانەی ڕووی ماوەکان بوو قەڵاکانی نالیبراڵیزمی کۆمۆنیستی شکاند سەرەنجامەکەشی جیهانێکی لە سەر ڕێڕەوێك دروستکردو پێیدا تێپەڕی.

بە بۆچوونی برۆدل، ڕووی ماوەکان بە هەقیقەت زۆر درێژ بوو. مێژووەکەی کە باسی کاپیتالیزم و ژیانی ماددی دەکرد چوار سەدەی خایاند لە ١٤٠٠ تا ١٨٠٠. جەنگی سارد تەنها چوار دەیەی خایاند، بەڵام ناشکرێ وا دابنێین کە جۆری ئەو هێزانەی کە برۆدل دەینووسی و گرینگ بوون بۆ بەرهەمهاوردەی دەرەنجامی جەنگی سارد، چونکە دە قات خێراتر بوون لە ماوەی پێش مۆدێرن لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا. پاش هەموو شتێك، گەر دروشمی ڕووی دووەمی مێژوو وەك ئەوەی ماکنەیل دەڵێ پەیوەندی بێت لە نێو نامۆکان، ئەوا دەنگی پەیوەندییەکان بە لانی کەم دە قات بەرزتر بوون لەساڵی ١٩٩٠ هەروەك لە ساڵانی ١٤٩٠ یان ١٧٩٠.

کەناڵەکانی گواستنەوەی کەلتوور فراوانترو زۆرتر بوون. بۆ زۆربەی مێژووە تۆمارکراوەکان، ئەو کەناڵانە بە هەندێ ڕێگا بڵاوبوونەوە لە کاتێکدا بازرگانی بە کەل و پەل و ئایدیا دەکرا. لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا، داهێنراوە پیشەسازییەکان لە هاتووچۆ، لە سەرووی هەموویانەوە توانای ڕێگای دەریایی و هێڵی شەمەندەفەر زیاتر بوو و بۆ گواستنەوە و گەیاندنی نامۆکان بە یەکتری لە جیهان. لە سەدەی بیستەمدا، بە تایبەتی لە نیوەی دووەمیدا، داهێنانی پەسەند لە ڕووی کانەڵەکانی گواستنەوەو گەیاندن بوو، ئەمەش سەدەی تەلەفۆن و تەلەفیزیۆن و لە کۆتاییەکەشیدا ئینتەرنێت بوو. شۆڕشەکان لە سەر گەیاندن لە نیوەی دووەمی سەدەکەدا بڵاوکردنەوەی لیبراڵیزمی نێودەوڵەتی خێراتر کرد، چونکە ئەوەی لە سەرانسەری جیهان بڵاوبۆوە تەنها کەل و پەل و بەرهەم نەبوو، بەڵکو ئایدیاش بوو. گەیاندنیش سەرچاوەی گواستنەوەی ئایدیاکانە.

پێش چاخی مۆدێرن، دەنگی کەناڵەکانی گەیاندن فراوان بوو نەك لە بەر زۆربوونی کەناڵەکان بەڵکو لە بەر گەشەسەندن و زۆربوونی ژمارەی وەرگرەکان. ڕادیۆ و تەلەفیزیۆن زۆر

گرینگ بوون بۆ پێشخستن و گواستنەوەی لیبرالّیزم، لەولاشەوە ئینتەرنێت وەك ئامێرێکی خێراتر لیبرالّیزمی دەیگواستەوە.

تێگەیشتن لە جەنگی سارد وەك بەرهەمی ئارەزووەکانی ڕووی دووەمی مێژوو وەك ڕووداوەکانی ڕووی یەکەم ئەوە شی دەکاتەوە کە چی نادیارە، چۆن ڕۆژئاوا دەیتوانی ئامانجە سیاسییەکانی بەدەست بێنێت بە نەبوونی شتێك هاوشێوەی سەرکەوتنی سەربازی بێت. هەروەها پێشنیاری ئەوەش دەکات کە دابەشبوونی کرێکار هەیە لە نێوان هەردوو ڕووەکەی مێژوو کە گرێدراوە بە جیهانی دوای جەنگی سارد.

مێژوو لە ڕووی ڕووداوەکاندا دەتوانێت قەدەغەی ڕوودانی شتە خراپەکان بکات. دەتوانێت نەریت و دەزگا لیبرالّییەکان بپارێزێت، بەلاّم ناتوانێـت دروستیان بکات. دروستکردن لە ڕووی دووەمدا دەبێت، کە ڕووێکی درێژتر و هێواشتر و ناشەخسییە. جەنگ لە تێکدان بترازێت هیچ شتێك بەرهەم ناهێنێت. هەروەك دەڵێن ڕۆم بە ڕۆژێك و دووان دروست نەبووە کەچی ئاگربارانی نیرۆ (Nero) تەنها بە بیست و چوار سەعات زۆربەی وڵاتی ڕۆمەکانی ڕووخاند و تێکدا. هەرچەندە جەنگی جیهانی یەکەم بۆ بونیاتنانی جیهانێکی سەلامەت و دیموکراسی بوو، بەلاّم نە ئەو جەنگە و نە هیچ جەنگێکی تر دەتوانن جیهانێکی دیموکراسی دروست بکەن.

ئەوەی ڕۆژئاوا کردی لە کاتی جەنگی ساردا بۆ پاراستنی جیهـانی لیـبرالّ بـوو دژی هێـزە نالیبرالّییەکان، ئەو ئامانجەی کە ڕایگەیاند بوو بۆ ڕووخانی ئەو هێزانە بوو، ئەوەی لەم نـاوەدا ڕوویدا ئایدیا لیبرالّییەکان و دەزگاکان لەو شوێنانەی کە چێنران ڕەگیان داکوتـا و لـە هـەموو شوێنێك بلاّووبوونەوە تەنها کاری ڕۆژئاوا بەس نەبوو بۆ بلاّووبوونەوەی لیبرالّیزم بەڵکو لیبرالّیزم خۆی گرنگ بوو سەرکەوتنی لە جەنگی ساردا زیاتر سەرکەوتنی هێزی نموونەیی بوو لـە هێـزی سوپاکان. گرنگی درێژی ماوەو خولیا ناشەخسییەکان تەنها یارمەتی شـیکردنەوەی ماوەکـە و دەرەنجامی جەنگی سارد نادات، بەڵکو پێویستە بۆ تێگەیشتن لە جیهـانی جـەنگی سـارد. لـە هەریەکێك لە ململانێ ئەوروپیە سەرەکییەکان یەکێك لە خاسـیەتەکانی جـەنگ کـە بـۆ دوای جەنگ زۆر گرنگ بوو. لـە شـەڕەکانی شۆڕشـی فەڕەنـسادا بەرنامـەی هاوبـەش لەسـەر ئـەو بنچینەیەی کە هەر چوار هاوپەیمانێتییە سەرکەوتووەکە دژی ناپلیۆن بەردی بناغەی سیستەمی پەیوەندی نێودەوڵەتی دابنێن، ناسرا بە کۆنسێرتی ئەوروپاو یارمەتی پاراسـتنی ئاشـتی دا لـە ئەوروپا بۆ ماوەی یەك سەدە. لە جەنگی جیهانی یەکەمـدا نرخـی بـەرز بـۆ مـردن و ڕووخـان



لەلایەن دەسەلاّتە سەرکەوتووەکان دانـرا کـە بـووە هـۆی دامەزرانـدنی ئاشـتی و بـە زاراوەی فەڕەنسیەکان زۆر نەرم بوو بۆ چاودێرییکردن. هاوپەیمانەکان چەند قسەیەکیان لەسەر ئـەڵمانیا سـەپاند بـەوەی ئەڵمانـەکان نایەکـسانن و حکوومەتـە ئـەڵمانیاکانی تـر وێـڵ بـوون بـەدوای ئاوەژووکردنەوەی ئەو قسەیە، بەلاّم ئەو قسەیە ئەوەنـدە ڕەق نـەبوو کـە ئەڵمانـەکان نـەتوانن عەکسی بکەنەوە سەرەنجام هیتلەر عەکسی کـردەوە تـەنها بـە شـێوەیەکی کـاتی، بـەلاّم بـە نرخێکی گەورە بۆ ئەوروپا و جیهان. سەبارەت بە جەنگی جیهانی دووەمیش ئەو دەسـەلاّتانەی کە لەجەنگدا بردیانەوە ململانێیان لە نێوان خۆیاندا دروستکرد کە لە پاشی(١٩٤٥) خێرا ئـەو ململانێیانە دەستی پێکرد.

خاسـیەتێکی تـری گرنگـی جـەنگی سـارد گرنگـی هێـزە مێژووییـە ناشەخـسییەکانی بلاّوبوونەوەی ئایدیاکانە، هێزی نموونەی ڕۆژئاوایە، چونکە خولیا و هێزو گەشەسـەندنەکان کـە سووربوون لەسەر چۆنیەتی کۆتا هاتنی جەنگی سارد پەڕییەوە بۆ ماوەی دوای جـەنگی سـارد. ئەمانەو هەرشتێکی تر بووبێت زۆر بەهێزتربوون لە دوای ڕووخانی کۆمۆنیزم تا پێشی، چـونکە ڕکابەریان نەبوو.

بـەلاّم مانـای ئـەوە نییـە بلّێیـت تـاك، حکوومـەت، سیاسـەت، سیاسـەتمەداران هـیچ پەیوەندییەکیان لەسەر چۆنیەتی بلاّوبوونەوە و بەهێزبوونی سێ بەشەکەی سێینەی وێڵـسن چـی بەسەر دێت لە داهاتوودا نییە. سیاسەتی نێودەوڵەتیش هیچی زیاتر نییـە لـە هـەر چـاخێکی مێژووییدا بۆ ئەوەی ببێتە جۆرێك لە جەماوەری وەرزشی کـە تیایـدا هێـزی لیبرالّیـزم فـراوان دەبێت و بەگوێرەی مەنتق و ناشەخسی نابێت. ڕەنگە مێژوو بە دوو ڕوودا بچێتە پـێش، بـەلاّم ئەو دوو ڕووەش کار لەیەکتر دەکەن.

دەرەنجامی ڕووداوی جـەنگ زۆرجـار دەوەسـتێتە سـەر گەشـەی درێژخایـەن، لـە جەنگـە ئەوروپییەکانی پێنج سەدەی ڕابردوو هەمیـشە سـەرکەوتن بـۆ ئـەو لایەنـە دەبـوو کـە زۆرتـر دەمایەوە واتا توانای سەرچاوەی پێویستی هەبوو بۆ درێژەدان بە جەنگ بۆ ماوەیـەکی درێـژتر دژی بەرامبەر(دوژمن)..سەرچاوەی بەریتانیا بۆ سەر دوژمنەکانی بە شێوەیەکی گشتی دارایـی بوو سەرچاوەکەش بەهێز بوو و نەوە دوای نەوە گەشەی کرد.

لە هەمانکاتدا ڕووداوەکان کارلە خولیاکان دەکـەن، دەرەنجـامی پێکـدادان بڕیـاری ئـەوە دەدات پرۆسە مێژووییەکە لێشاوەکەی لە کوێوەیە. هێڵی ئاگربەستی ساڵی(١٩٤٥) ی ئەوروپا

بەرهەمی بڕیاردانی مرۆڤ بوو و ئەوەی دووپاتکردەوە کە لیبراڵیزمی ڕۆژئاوا و نالیبراڵیزمی کۆمۆنیست دەوەستن کە لە بەرامبەردا کاریگەرییەکی قوڵی لەسەر وڵاتان و گەل کرد، پێش جەنگ فلەندا و ئیستۆنیا وەك نەمسا و چیکۆسلۆفاکیا لە ڕووی ئابوورییەوە وەك یەك بوون. پەنجا ساڵ دواتر، فلەندا و نەمسا دەوڵەمەند بون، بەڵام ئیستۆنیا و چیك بەپێی پێوەرە ئەورووپییەکان هەژار بوون ئەو جیاوازییە ئابوورییە چواردەیە دەیەی خایاند، بەڵام هۆی ئەوەی کە وایان بەسەر هات ئەو بڕیارانە بوون کە لە ساڵی (١٩٤٥)دا درابوون.

ڕۆڵەکانی سیاسەت و ستراتیژییەت و ئاژانس زۆر ئاشکرا و کاریگەر ئەوتۆنین لە جیهان کە تیایدا پێوەر و دابونەریتە لیبراڵەکان وەك لەسەردەمی جەنگی ساردا لە ژێر هەڕەشەیەکی ڕاستەوخۆ نین، بەڵام هەر هەبوون. لەسەردەمی دوای جەنگی ساردا وەك جەنگی سارد هێشتا پشتیان دەبەست بەوەی حکوومەتەکان چ کارێك دەکەن بۆ بەهێزکردنیان و چیش ڕوو دەدات. لیبراڵیزمی نێودەوڵەتی کە ودرۆ ویڵسن لە پاریس خستییەڕوو لە پاش جەنگی جیهانی یەکەم بوو بەمەسەلەیەکی زاڵی مێژوو لەبەر دەرەنجامی جەنگی سارد، بەڵام ڕەوشە سیاسی و ئابوورییەکانی بەنداو وکەناڵ دانرابوون، کەنار و لێوار دانان پێویست بوون لە هەموو جیهان بۆ هەرسێ بەشەکەی ویڵسن کە دەبوایە پێشتر دروست کراو بووان.

دەستەی دروستکەران وڵاتە سەروەرییەکان بوون، بریکار و ئەکتەر و ستراتیژە ناسەکان و سیاسەتمەدارەکان کە مێژوویان دروستکرد وڵاتەکان بوون، کەواتە جیهانی دوای جەنگی سارد وەك جیهانی نێو جەنگی سارد، جیهانی وڵاتە سەروەرییەکان بوون پاش کۆتایی جەنگی سارد، وەك پێشتر هەندێ لە هەندێکی تر گرنگتربوون پاش ڕووخانی کۆمۆنیزم، وەك پێشتر بەتایبەتی لە نێوان ئەندامە گرنگەکانی سیستەمی نێودەوڵەتی، ڕۆڵەکان هەمەجۆر بوون، هەروەها لەسەردەمی دوای جەنگی ساردیشدا ئەو ڕۆڵانە جیاواز بوون لەوانەی کە دەسەڵاتە سەرەکییەکان گێرایان لە کاتی ململانێی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا.



## چاپتەری -٣-

## جیهانی وڵاتانی خاوەن سەروەری

لە یەکێك لە کاتە هەستیارەکانیدا، لینین پێشبینی ئەوەی کرد کە لەگەڵ سەرکەوتنی کۆمۆنیزم، وڵات بەرەو وشك بوون دەچێت. لەبڕی ئەمە (بولشفیك Bolshevik) دەسەڵاتی گرتە دەستو یەکەم جۆری حکوومەتی بەرزە فڕو جاڕسکەری دامەزراند. بە حەقیقەت ئەو حکوومەتەی ئەو دایمەزراند کۆتایی سیستەمی کۆمۆنیستە و هەروەها سەرەتای ئەو جیهانی وڵاتانی خاوەن سەروەریش لەلایەن هێزگەلێك دروست بوو و ئەو سیستەمەی تێکشکاند کە خەریك بوو پێشبینییەکەی لینین بهێنیتە جێ.

هێزە نوێیەکانی جیهان و بڵاوبوونەوەی کەلتوور جەرگەی سەروەری و پیرۆزی سنوورەکان پێشێل دەکەن. وڵاتانی دوای جەنگی سارد توانیان سوپا بێگانەکان وەدەرنێن، بەڵام زۆربەی شتەکانی تر وەك ئایدیا و بەرهەم و تەکنەلۆژیاکان دەستیان کرد بەبڕینی سنوورەکانیان.

وێڕای ئەمە، لیبراڵیزم بە هەموو سیفاتەکانییەوە پێش کەوت لە دژی دەسەڵاتی وڵات. لیبراڵی سیاسی مانای ئازادیە لە دەسەڵات. چەمکە فەڕەنسییەکە (بە تەنها بکەویتە ڕێ) ڕێچکەی لیبراڵ بۆ ئابووری دەردەبڕێت کە پشتی بەستا بەو ئایدیایەی بەوەی حکوومەت دەبێ شوێنێك بۆ ئابووری لە ناوەندەکانی خۆیدا جێ بهێڵێت. کرۆکی روانگەی لیبراڵ بۆ سیاسەتی ئاسایش دژی جەنگە، جەنگیش بۆ چەند سەدەیەك چالاکی سەرەکی وڵات بوو.

بەڵام سەرەرای ئەو پێشکەوتنانە، سەرکەوتنی جیهانی لیبراڵیزم نەبووە ئالییەتی بزربوونی دەوڵەت. ویست و ئەرکی دەوڵەت گۆرا، بەڵام لە سەدەی بیست و یەك هەروەك لە رابردوودا حکوومەتەکان لەگەڵ ئالا و سوپاکانیان، نووسینگە و بیرۆکراتەکانیان و باج و خەرجیان لە

سەنتەری کاروبارە نێودەوڵەتییەکان مایەوە. حەقیقەتێکی سەرەکی وڵاتانی خاوەن سەروەری لە ڕەوشی نێودەوڵەتیدا و لە سەدەکانی پێش خۆیدا پەڕییەوە سەدەی بیست و یەك لە کاتێکدا هەندێ دەوڵەت لە هەندێکی تر گرنگتر بوون.

### *مانەوەی دەوڵەت بە بەردەوامی*

وڵاتی خاوەن سەروەری هەرێمێکی ناشەخسییە و لە سنووری خۆیدا هیچ دەسەڵاتێکی لەو بەهێز تر نییە، لە پەیمانی (وێستفالییەوە – Westpahalia) لە ساڵی (١٦٤٨) دەرکەوت و دروست بوو بەهۆی سەرکەوتنی پاشایەتی بەسەر خانەوادە و گەورە پیاوەکاندا کە دەسەڵات لەو کاتەدا لە نێو ئەوروپای ناوەڕاستدا دابەشکرابوو. هەندێ لە فەرمانڕەوای ئەوروپای سەدەی حەڤدەم وەك لویسی (XLU) فەرەنسا و پیتەری مەزنی رووسیا، دەسەڵاتێکی مەزنیان گەڵاڵە کرد بوو بەراورد لەگەڵ ئەوانەی پێشخۆیان کە پێیان دەوترا پاشایەتی ڕەها.

لە چاخی مۆدێرندا، وڵاتانی خاوەن سەروەری بە دوو ڕووی جیاوازدا هاتن ئەوانیش دابەشکردنی دەسەڵات لە نێو سنوورەکانیان و توانای بەڕێوەبردن و هەبوونی حکوومەتی خۆیان. وڵاتی مۆدێرن لەگەڵ ئامێر و ڕێگا کۆمەڵایەتییەکان بۆ کۆنترۆڵکردن، دەتوانێت بە قوڵی دزە بکات بۆ نێو ئەو کۆمەڵگایەی کە حوکمی دەکات تەنانەت بەهێزترین دەسەڵاتە ڕەهاکانی شاش بێت دەتوانێت ئەوە بکات، بەڵام پاشا تەقلیدییەکان ناتواننن ئەم کارە ئەنجام بدەن. جیاوازی حکوومەتی مۆدێرن لەگەڵ حکوومەتی تەقلیدی ئەوەیە کە کاروباری هەمەجۆری مۆدێرن هەمان چالاکییەکانی حکوومەتی تەقایدییە، بەڵام لە مەجالێکی چڕوپڕ ترو دەرەنجامی گەورەتر.

لە سەدەی نۆزدەدا لە وڵاتانی خاوەنی سەروەریدا، وڵاتی مۆدێرن لە قاڵبی تەقلیدی چووە دەرەوە، قۆناغێکی پێك هێنا بۆ ململانێی سەدەی بیستەم لە نێوان وڵاتە لیبراڵی و نالیبراڵییەکان. حکوومەتی تۆتالیتاری و نالیبراڵی فاشیزم و کۆمۆنیزم لەڕووی توانا و خولیاوە جیابوو لە ڕەهایەتی جیهانە تەقلیدییەکە. وڵاتی ڕەها لێڤیاسان بوو (Leviathan) کە چەمکێکە لە کۆکەرەوەی ئینەوەی کۆن لە چیرۆکی جۆنا و حوتەکە لەلایەن تۆماس هۆبس بەکارهێنراوە. وڵاتی تۆتالیتاریان بە پێچەوانەوە تەسکتربۆوە. یونس لەناو نەهەنگەکە ژیا،



بەڵام نالیبراڵیزمی مۆدێرن خولیای ئەوە بوو نەك هەر تەنها کۆمەڵگا قوت بدەن، بەڵکو لەت و پەت و هەپرون بە هەپرونی بکەن و بەشەکانی باش هەزم بکەن.

وڵاتی لیبراڵ کە سەرکەوت بەسەر فاشیست و دواتریش بەسەر نالیبراڵیزمی کۆمۆنیست بەوە ناسراوە کە سنووری لەسەر وڵات بە پێی دەسەڵات داناوە، بەڵام هەبوونی وڵاتێکی لیبراڵ بە گشتی وڵاتێکی هەوەنتە و هەروا نییە، بەڵکو ئەرك و خولیای وڵاتی لیبراڵ سنووردارە، بەڵام زۆر گرنگ شایەنی ئەوە نییە هیچ کۆمەڵگایەك قوت بدەن، ئەمە مانای ئەوەش ناگەیەنێت کە وڵاتێکی لیبراڵ بەپێی تێڕوانینی ئەو چەمکە کاریگەر و بەهێز نەبێت.

لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا هەموو کەسێك لەسەر ئەم هەسارەیە لە نێو چوارچێوەکانی وڵاتانی خاوەن سەروەری بە پێی هۆگەلێکی باشەوە ژیانی بردە سەر. وڵات باشترین میکانیزم پێشکەش دەکات بۆ جێبەجێکردنی زنجیرە کارێکی بەیەکەوە بەستراو کە هەمیشە گرنگ بوون و لە سەردەمی مۆدێرنیشدا گرنگتربوون. ئەو چەمکەی کە وڵات دابینی دەکات لە نێو وشەی سیاسیدا بەهۆی ڕێبەری ئابووری بە گشتی و کەل و پەل ناسراوە. شتێکی گشتی، ئەو شتەیە کە هیچ کریارێك لە سوودەکانی بێ بەش نابێت ئەو شتانەش زەحمەت دابین دەکرێن، چونکە لەبەر زەحمەتییەکەی هیچ موشتەرییەك ئامادەنییە پارەی بۆ بدات. بە حەقیقەت زۆر زەحمەتە نرخەکەی بدرێت.

یەکەم گرنگترین شتی گشتی سەلامەتی گشتییە. بە بۆچوونی هۆبس یەکەم وڵاتی زلهێز دامەزرا بۆ دابینکردنی ئەو سەلامەتە گشتیە دامەزار، چونکە بەبێ دەسەڵاتێکی باڵا بۆ پاراستنی یاسا بەهۆی سزادانی ئەو کەسانەی سەرپێچی دەکەن کەس بەرگەی ژیانی کۆمەڵایەتی ناگرێت. ماقوڵ نییە گەر بەبێ مسۆگەرکردنی کارکردنی ئەوانی تر بە ئاشتی، تۆ لە نێو ئەواندا هێمن بێت، بەڵام گەر لە کاتێکدا کەسی ئاشتیخواز نەبوو ئەوا ئەنجامەکەی هەروەك هۆبز دەڵێ وای لێ دێت : (جەنگێك بۆ بەرژەوەندی هەمووان و دژی هەمووان). دامەزراندنی حکوومەت بە پێی ئاشتی مەدەنی جێگای ئەم شێوازە دەگرێتەوە.

وجودی وڵات بۆ پاراستنی هاوڵاتیانە لە هەرەشەکانی دەرەوەی سنوورەکانی. پێناسی نێودەوڵەتی بۆ تاوان جەنگە هەروەها بۆ هێزی پۆلیسیش سوپایە، بەڵام سوپا بەهەوەنتە پێك ناهێنرێت. حکوومەتەکان دەبێ کۆیان بکەنەوە. بەرگری نەتەوەیی شتێکی تری گشتییە،

هەروەها یەکێك لە داواکارییەکانی تری ماوەی دوای جەنگی ساردا غەریزەی گونجاوی مانەوەی جەنگە لە جیهاندا.

هەرچەند یاسای مەدەنی و بەرگری نەتەوەیی کۆنترین و بنەڕەتی ترین شتی گشتین، بەڵام هەرتەنها ئەوانیش نین، بۆ نموونە: هەوای پاك نموونەیەکی مۆدێرنە خاوەنی ئۆتۆمبیلێك بەتەنیا ناتوانێ نیگەرانی هەوای پیس بۆ هیچ کەس کەم بکاتەوە، بەڵام گەر هەمموو خاوەن ئۆتۆمبیلەکان هەوا پاککەرەوە بۆ ئۆتۆمبیلەکانیان ببەستن لەکاتێکدا یەك خاوەن سەیارە هەوا پاك کەرەوە نەکرێت بۆ سەیارەکەی ئەوا کار لە پیس بوونی هەوا ناکات. هەر گەر یەك ئۆتۆمبیل پابەندبێت بە پاك و خاوێنی ئەوا هیچ جیاوازییەك لەو هەوایە دروست ناکات کە هەمموو کەس دەبێ هەناسەی پێ بدات. جا ئەگەر هەمموو خاوەن ئۆتۆمبیلەکان بەم شێوەیە بیربکەنەوە کە بەتەنیا ناتوانن هیچ بکەن ئەوا کەس هەوا پاککەرەوە بۆ سەیارەکەی نابەستێت. بەم پێیەش ئەو هەوایەی کە هەمموان هەڵیدەمژن پیس دەبێت، تەنانەت گەر نرخی ناوەندێکی وا بۆ هەمموو کەس زۆر بێت کە گەر هەبێت دەبێتە هۆی هەڵمژینی هەوای پاك ئەوا ئەو نرخە زۆرە دژی جەرگەی گرفتی شتە گشتییەکانە.

ئەوەی پێویستە بکرێت هەبوونی میکانیزمێکە بۆ جەخت کردنەوە لەسەر ئەوەی هەمموو شوفێرێك دەبێ سیستەمی هەوا پاککەرەوە ببەستێت. بەهۆی قۆرخ کردنی دەسەڵاتی یاسادانان، وڵاتی خاوەن سەروەری دەتوانێت جەخت لە کرینێکی گەردوونی بکات بەهەمان شێوەش دەتوانێت جەخت لە سەر یاسای مەدەنی و ئاسایشی نێودەوڵەتی بکات. وڵات ئەوە دابین دەکات کە هەمموو کەس دەبێ لەم پێویستییە بگات و بیزانێت ئەو تێگەیشتنەش دروست نابێت گەر دەسەڵاتی باڵا جەختی لەسەر نەکاتەوە. گەر هیچ سەکنێك نەبێت پارە لەناو پاس کۆکاتەوە، ئەوا هەمموو کەس بەبەلاش سوار دەبێت، بەڵام لەو حاڵەتەشدا هیچ شتێك خەرج ناکرێت بۆ خزمەتگوزاری پاس و ئەو کاتەش کەس ناتوانێت سواری پاس بێت.

ئابووری ناسەکان لەمەڕ دابینکردنی شتی گشتی ئەم حاڵەتە ناو دەنێن (گرفتی سواربوونی بەلاش) هەرسێ خاڵەکەی روانگەی ودرۆ ویلسن (دیموکراسی و ئاشتی و بازاڕی ئازاد) ڕەنگە وەك شتی گشتی سەیر بکرێن لەو وڵاتەی کە پێویستە هەریەکەیان دەستەبەر بکات. لیبراڵی سیاسی داوای ئەوە دەکات کە حکوومەتەکان دەبێ چالاکانە مافەکانی هاوڵاتی بپارێزن و پێشێل نەکرێن. ئابووری بازاڕیش چوارچێوەیەکی حکومی گەرەکە کە تەنها وڵات دەتوانێ



دابینی بکات. هەروەك چۆن وڵاتی لیبراڵ پێویستە بۆ کارێك کە بووەتە ناوەندێك بۆ کۆمەڵگا لیبراڵییەکان لە سەدەی بیستەمدا، هەرچەندە وا نەبوو لە سەدەی نۆزدەدا، ئەویش دووبارە دابەشکردنەوەی سامانە بۆ مەبەستی پاراستنی ڕەوشی کۆمەڵایەتی، هەروەها وڵاتێکی زلهێز و خاوەن سەروەریش زۆر پێویستە بۆ جێبەجێکردنی ڕوانگەی لیبراڵ بۆ دابینکردنی ئاسایش کە بەرە و پێشبرا لە کۆتایی جەنگی ساردا. ئەو رشوانگەیەش جەخت دەکاتەوە لەمەر جۆرەکانی سنوور لەسەر چەك کە وودرۆ ویلسن پالپشتی کرد، وەك یاسا ئابوورییە نێودەوڵەتییەکان حکوومەتەکان دەبوایە دانووستان بکەن.

بەکورتی، وڵاتی خاوەن سەروەری و زلهێز سەراپای جیهانی داگیرکرد لە سەدەی بیست و یەك، چونکە پێویست بوو و مقابیلی سیستەمی کارکردنیش بوو وەك کۆمپیوتەرێکی شەخسی کە بێ ئەو هیچ پرۆگرامێکی لەو جۆرە جێبەجێ نەدەکرا. لەسەرەتای سەدەی بیست و یەکدا زۆربەی وڵاتانی خاوەن سەروەری کە نزیکەی (٢٠٠) وڵاتن وەك هەمموو ئەو وڵاتانەی ساڵی (١٦٤٨) لە ڕووی یاساییەوە یەکسان بوون، بەلانی کەم لە ڕووی نەتەوەییەوە. هەریەکەیان لە چوارچێوەی سنووری خۆی باڵادەستە هەریەکەیان حکوومەت و ئاڵای خۆیان هەبوو کورسیشیان لە ئەنجوومەنی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان هەبوو، بەڵام بێگومان کۆمەڵگا سیاسییە زلهێزەکان یەکسان نەبوون لە قەبارە و شێوە و جوگرافیا و دیموگرافیا و جیۆلۆجیا و دەسەڵات و سامان هەرگیزیش یەکسان نابن. ئەو جیاوازیانەی کە لە هەر سەردەمێکی مێژوودا گرنگ بوون ئەوانە بوون کە پەیوەست بوون بە گرنگترین هێزە کۆمەڵایەتییەکان و کێشە سیاسییەکانی سەردەم.

لە سەدەی حەڤدەدا کوتلەی بەرچاو لە ئەوروپا کوتلەی ئایینی بوو. وڵاتەکان یان پرۆتێستانت یانیش کاسۆلیك بوون. لە سەدەی هەژدەدا گرنگترین لا پشتی بە هێزی سەربازی بەستابوو کە زلهێزەکانی لە بێ هێزەکان جیاکردەوە. زلهێزەکان مافی تایبەتیان هەبوو، هەر دامەزراوێکی دبلۆماسی دەبوایە ڕەچاوی بەرژەوەندی و ئارەزووەکانی زلهێزەکانی کردبایە. لە کاتی جەنگی ساردا کاتێ ململانێ گەورەکەی سیستەمەکان زاڵ بوو بەسەر کاروباری نێودەوڵەتی، شتێکی ئاسایی بوو سیستەمی نێودەوڵەتی بەسەر سێ بەشدا دابەشکرد کە جیاوازی نێوان هەریەکەیان زۆر زۆر بوو، هەریەکە و بۆ خۆی جیهانێك بوو. بەشی یەکەم، زلهێزەکانی ڕۆژئاوا، دووەم وڵاتە کۆمۆنیستەکان، جیهانی سێیەمیش زۆر وڵاتی تێوەگلاند،

بەڵام لەگەڵ هیچ شتێكدا لە رووەكەی تر نەبوون. لە سەردەمی دوای جەنگی ساردا جیهانی سێیەم نەماو كۆنترین جیاوازی زۆر گرنگ بوو ئەویش جیاوازی نێوان ناوەوە و دەرەوەو نێوان داهێنەران و هێنەرانی بلۆكی بیناكردنی شارستانییەتی جیهانی لەلایەك و لاسایی كەران و نێرەوەكانیش لەلایەكی ترەوە.

شكسبیر لەسەر زاری یەكێك لە كارەكتەرەكانی لە شانۆگەری (بەئارەزووی خۆت ( As You Likeit) دەڵێ : "یهان هەمووی یەك قۆناغە " گەر مێژووی دوای جەنگی سارد درامایەك بێت، ئەوا پلۆتەكەی بڵاوبوونەوەی لیبراڵیزمی نێودەوڵەتییە. ئەكتەرەكانیش وڵاتە زلهێزەكانی جیهانن لەسەر تەختەی شانۆ دابەش دەبن بەسەر دوو گروپدا. وڵاتە زلهێزەكان لە رووی ئابووری و سیاسیەوە بنەڕەتین، كە هەڵگران و چاودێران و بەها لیبراڵەكان و داب و نەریت و دەزگا حكوومییەكان دەگرێتەوە.. وڵاتانی دەرەوەی جیهاننن كەمتر پابەندن بە دیموكراسی و ئاشتی و بازاری ئازاد، كەواتا زلهێز ئەو پانتاییە كە لیبراڵیزم تیایدا لە پرۆسەی بڵاوبونەوە دایە و دزەدەكات بۆ نێو پانتایی، وڵاتانی ناوەوە و دەرەوەی جیهان.

درامایەك رێبەری ئەكتەرەكانەو پاڵپشتیان دەكات، لە نێو وڵاتانی ناوەوەی جیهاندا ئەڵمانیا و ژاپۆن لە نێو شانۆكەدا گرنگترین دوو رۆڵیمان گێرا كاتێ ویلاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا رێبەرەكە بوو. لە دەرەوەی شانۆكە گەلێ لە وڵاتەكان لەو دیو سنووری خۆیان كاریگەرییەكی ئەوتۆیان نەبوو لەسەر جیهان. ئەو وڵاتانە هەمان ئەو ئەكتەرانەن كە لە فلیمدا تەنها قەرەباڵغی دروست دەكەن و هیچ رۆڵیان نییە پێیان دەوترێت (زیادەكان — Extras) دوو لەو وڵاتانەی كە لە دەرەوەی شانۆكەن (ڕووسیا و چین)ن.

### *ئەوانەی بەم دواییە هاتن*

بەریتانیا و فەڕەنسا جیهانی (مۆدێرن) یان داهێنا. هێزی گەل و بنەمای یاسایی سیاسی لە فەڕەنساوە هات. ئەو ئایدیایەی كە گەل دەبێ حوكم بكات نەك پاشا لە شۆڕشی فەڕەنسا لە دایك بوو، هەر ئەو ئایدیایەش سەروەری گەل و ناشنالیزمی هێناكایەوە. زۆربەی زۆری شتەكانی تر لە بەریتانیاوە هاتن. لە چوارچێوەی سنوورەكەیدا ئەو ئایدیایە سەری هەڵدا كە دەبێ سنوور لەسەر دەسەڵاتی حكوومەت بەپێی یاسا دابنرێت كە ئەمەش شان بەشانی



سەروەری گەل كرۆكی لیبراڵیزمی سیاسییە. بۆیەكەم جار لە دورگەكانی بەریتانیا ئابووری بازاڕ پەرەی پێدرا و بایەخی پێدراو و پشتگیری لێ كرا. بەریتانیا یەكەم وڵاتە باوەشی بۆ جێبەجێكردنی روانگەی لیبراڵ لە رێگەی بازرگانییەوە كردەوە بۆ ئابووری ناسان لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی. هەرلەوێش ئەو قەناعەتە دروست بوو كە جەنگ دیاردەیەكی ناسروشتییەو دەبێ بنبڕبكرێت.(*)

بۆ بەریتانیا و فەڕەنسا ئاسایی بوو لە چاخی مۆدێرندا رێبەری جیهان بكەن، چونكە لەماوەی پێشتردا دوو زلهێزترین وڵاتی جیهان بوون. فەڕەنسا بەهێزترین پێگەی سەربازی لە ئەوروپا دامەزراند لە سەدەی حەڤدەهەمەوە بۆ نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم، لەوكاتەدا بەریتانیا پاش لە دەستدانی كۆلۆنیە ئەمریكییەكان پێگەی خۆی دامەزراند، بەڵام لە سەدەی بیستەمدا دوو وڵاتی تر لە سەرەتای چاخی مۆدێرندا رۆڵی گرنگیان گێرا ئەوانیش ئەڵمانیا و ژاپۆن بوون.

لە سەدەی نۆزدەدا ئەڵمانیا و ژاپۆن ئەو شتانەیان دەستەبەركرد كە هەموو وڵاتانی تر هەوڵیان بۆ دەدا. لە ڕووی سەربازی و ئابوورییەوە زاڵ بوون بەسەر بەریتانیا و فەڕەنسا و سەركردەكانی جیهان لە نیوەی یەكەمی سەدەی بیستەمدا، هەردوو وڵات دەست پێشخەریان كرد لە بەرەنگاربوونەوەی نالیبراڵیزم لە بەرژەوەندی لیبراڵیزمی بەریتانی و ئەمریكییەكان كە وێرانكەرترین جەنگ بوو لە هەموو مێژووی مرۆڤدا دەبوایە نالیبراڵیزم تیایدا شكست بخوات. پاش چەشتنی ئازاری شكست، ئەڵمانیا و ژاپۆن هەوڵێكی ئاگرینی تریاندا كە هەموو وڵاتانی تر رێك بەدوای ئەم كارەوە بوون. هەردوو وڵات سەركەوتووانە وەرچەرخان بۆ بەها و نەریت و دەزگا لیبراڵییەكان. بەئەنجامدانی ئەم كارەش بەشداربوون لە هێزی وڵاتانی ناوەوەی رۆژئاوا.

---

* میراتی بەریتانیا و فەڕەنسا بەرێگای تریش لە سەدەی بیست و یەكدا وجودی هەبوو. ئینگلیزەكان ناوەندی پەیوەندی و گەیاندنی جیهان بوون، چونكە زمانی گەورەترین دەسەڵاتی بازرگانی و سەربازی چاخی مۆدێرن بوون كە لە سەدەی نۆزدەدا، بەریتانییەكان و لە بیستەمیش ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بوو. هەنووكە جیهانی مۆدێرن بەهی ئینگلیزەكان دەچێت، بەڵام فەرەنسییەكان ستایلی زۆر نایابیان لە هونەرەكانی گرافیك و بیناسازی و شێوەكاری و جل و بەرگ و نەخشەی پیشەسازی و كەل و پەلی ناوماڵ هێنا كایەوە كە كولتووری جیهانی پێك دەهێنێت. داهێنەرانی وڵاتانی تر قەرزداری ئەو هونەرمەند و نەخشەساز و پیشەگەڕانەن كە لە فەڕەنسا كاریان كردووە لە سەدەی نۆزدەم و بیستەمدا.

بەرابەری ئەمەش بەرپرس بوون لەدەرئەنجامەکانی جەنگی سارد، ئەو دەرەنجامانەش سەرکەوتن بوو بۆ رۆژئاوا. ئەڵمانیا و ژاپۆن بەهۆی ئەو گۆڕانکاریانەی لە نێوخۆیاندا کردیان بەهێزترین نموونە بوون لە نێو هەموو وڵاتاندا.

لە سەرەتای چاخی مۆدێرندا هیچ وڵاتێك وجودی سەرەکی نەبوو لە سیستەمی نێودەوڵەتیدا. ئەڵمانەکان لە نێو زنجیرەی پاشایەتییە قەبارە بچووك و مام ناوەندەکانی ناوەڕاستی ئەوروپا بەلاوە نرا، ژاپۆن خرایە پەراوێزەوە، کە لە ساڵی (١٦٣٠) دا فەرمانڕەواکانی ژاپۆن ڕێبەر بازرگانە ئەوروپییەکانی دەرکرد و بە توونديش کۆنترۆڵی پەیوەندی لەگەڵ وڵاتانی تر گرتبووە دەست، بەڵام لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا وەك دەسەڵاتێکی باڵا حوکمڕانەکانی ژاپۆن سەریان هەڵدایەوە لەبەرئەوەی ئەرکی ژاپۆن زەحمەترو دەسکەوتەکانیشی سەرسام تر بوون. ئەو ئەرکەش، وەك لە حاڵەتی ئەڵمانیادا، بۆ ئەوە نەبوو دەسەڵاتی گەورەی پێشووتری کۆکاتەوە بەڵکو بۆ دروستکردنی وڵاتێکی انسحابی بوو. پرۆسەی گەڕانەوەی حوکمی پاشایەتی (مێجی — Meiji) لە ساڵی (١٨٦٨) دا دەستی پێکرد و ئیمپراتۆری گەڕاندەوە سەر دەسەڵاتی باڵا. بە حەقیقەت ئەمە شۆڕشێك بوو هەڵسا بە گۆڕانی کۆمەڵگای تەقلیدی و ئەو پەیوەندیە ئابووری و کۆمەڵایەتییەی کە بەهی ئاغاکانی ئەوروپای پێش سەدەی پانزەهەم دەچوو بۆ وڵاتێکی مۆدێرن و ئابووری تاك و سوپای دەریایی بە هێز و بیروکراتییەکی نەتەوەیی کاریگەر، هەموو ئەو گۆڕانکاریانەش بەخێرایی لە چەند دەیەکی کەمدا ئەنجامدران. ئەمە گەورەترین دەستکەوتە کە هەر نەتەوەیەك لە مێژووی مۆدێرندا بەدەستی هێنابێت، چونکە بۆ یەکەم جارە وڵاتێکی غەیرە رۆژئاوایی ئاشنا بێت بە تەکنیکەکانی مۆدێرن و ببێتە نموونەی گەلێ لە کۆمەڵگای غەیرە رۆژئاواییەکانی دەرەوەی شانۆکە، هەروەها کاریگەرترین دەسکەوتی نەتەوەیی مۆدێرنە. بە دڵنیاییەوە ئەم دەسکەوتەی ژاپۆن دەگاتە ئاستی سەرهەڵدانی ئەمریکا وەك بەهێزترین وڵاتی جیهان شان بە شانی هەردوو شۆڕشی فەرەنسا و پیشەسازی کە گرنگترین رووداون لە مێژووی مۆدێرندا.

لە دەرەنجامی ڕووبەڕووبوونەوەی پرسەکانیان، دەسەڵاتی هەردوو وڵات (ژاپۆن و ئاڵمانیا) بوون بە دەسەڵاتی مۆدێرن. شۆڕشی فەرەنسا و دەرەنجامەکانی کتوپڕ ناشنالیزمی ئەڵمانی هێناکایەوە. گەلی ئەڵمانیا کە لە چەند ویلایەتێکی پەرتەوازەی بەهێزدا دەژین خۆیان بە داگیرکراوی بینیەوە لە لایەن وڵاتێکی سیاسی کە لەوان کەمترن بە ژمارە، ئەویش فەرەنسایە.



شۆڕشی فەرەنسا دەرەنجامەکانی ولی لە ژاپۆن کرد مافی رۆژئاوا بەکاربهێنێت، ئەم پرۆسەیەش دەستی پێکرد لەگەڵ گەیشتنی کەشتییەکی ئەمریکی بۆ تۆکیۆ بەسەرکردایەتی (کۆمۆدۆر ماتیو پێری) لە ساڵی(١٨٥٤) و لەوێ پێری و هاوەڵانی داوای مافی بازرگانیان کرد، بەیەك دەیە ژاپۆن ناچارکرا بۆ واژووکردنی زنجیرەیەك پەیمان کە تیایدا چەند ئیمتیازێکی تایبەتی بەخشی بە دەسەڵاتی دەرەوە. ژاپۆن دەستی کرد بە بەرنامەکەی لەسەر بە مۆدێرن بوونی بە مەبەستی بەرگریکردن لەخۆی لە فەرمانە رۆژئاواییەکان. ژاپۆنییەکان زانیان هیچی تر ناتوانن بێگانەکان پشتگوێ بخەن، بۆیە خۆیان بەهێزکرد تا مامەڵە لەگەڵ ئەوروپییەکان و ئەمریکای باکوور بەیەکسانی بکەن، هەر بەم شێوەیەش سەرکەوتن.

ئەڵمانیا و ژاپۆن بە چەشنێکی هەرەمەکی خۆیان خستە نێو ئاستی نێودەوڵەتی، لەوێش وایان خستە ڕوو کە ئەو وڵاتانەی بەم دواییە هاتوونەتە نێو شۆڕشی ئابووری و سیاسی پێناسی جیهانی مۆدێرن دەکەن و دەشتوانن ڕووبەڕووی ڕێبەرانی ئابووریی سیاسی ببنەوە و زاڵێشبن بەسەریاندا. سەرکەوتنی ئەڵمانیا بەسەر فەرەنسا لە (سیدان) لە ساڵی (١٨٧١) بەهێزترین دەسەڵاتی سەربازی بەخشی بە ئەڵمانیا لە کیشوەری ئەوروپا، هەروەها لە ساڵی (١٨٨٠) خۆی کۆکردەوە بۆ ڕەچاوکردنی پێکهاوردەی ئیمپراتۆریەتێك. ژاپۆنیش هێزی سەربازی بەکارهێنا و داوای خاکی کرد، ئەوەبوو لە ساڵانی(١٩٠٤ — ١٩٠٥) ژاپۆنییەکان سەرکەوتنێکی مەزنیان لەسەر ڕووسیا بەدەست هێنا. کە ئەمەش بۆ یەکەم جارە لە چاخی مۆدێرندا هێزێکی غەیرە ئەوروپی زاڵ بێت بەسەر هێزێکی ئەوروپی.

لە سەدەی بیستەمدا هەردووکیان (ژاپۆن و ئەڵمانیا) بە نیازی داگیرکردنی هەرێمی زیاتریان هەبوو. بۆیە هەردوو جەنگی جیهانی لەسەر دەستی ئەڵمانییەکان و ژاپۆنییەکان بەرپا بوو، چونکە دەیانویست پێگەی ئیمپراتۆری خۆیان لە بازنەیەکی جوگرافی و سروشتی و مافداردا بەهێز بکەن. ئەڵمانیا دوو هەڵمەتی کرد بۆ داگیرکردنی ناوەڕاست و رۆژهەڵاتی ئەوروپا. هەڵمەتی دووەم لەگەڵ هەوڵی ژاپۆنییەکان یەکی گرتەوە بۆ دامەزراندنی بازنەیەکی ئیمپراتۆری لە چین و هیندۆ چین (لەلایەن فەرەنسییەکان حوکم دەکران) لە مالایا (بەریتانیاکان حوکمیان دەکرد) لە ئەندەنوسیا (هۆڵەندییەکان حوکمیان دەکرد). لە فلبین (ئەمریکییەکان حوکمیان دەکرد) هەردوو هەوڵ زۆر نزیك بوون لە سەرکەوتن. ئەوەبوو لەسەرەتای (١٩٤٢) دا

نازی ئەڵمانیا سەرۆکی ئەوروپا بوو لە زەریای ئەتڵەسییەوە تا بالتیك و دەریای رەش، لە هەمانکاتدا ژاپۆنیش زۆربەی چین و باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیای داگیرکردبوو.

بەرەنگاری و جەربەزەیی سەربازی هەردوو وڵات تەنها هەوڵێك نەبوو بۆ هەرێم و سامان و هێز بەڵکو ڕووبەڕووبوونەوەیەك بوو بۆ سیستەمە سیاسی و ئابوورییەکانی رۆژئاوای ئەوروپا و ویلایەتە یەکگرتووەکان. ئەڵمانیا و ژاپۆن فۆرمێکی جیای نالیبراڵیزمیان دەستەبەر کرد کە زۆر بەهێزتربوو لەو فۆرمە جیاجیایانی کۆمۆنیست کە هێزە لیبراڵەکان لە ڕووی سیاسییەوە لە کاتی جەنگی ساردا ڕکابەریان دەکرد.

نازی ئەڵمانیا و ئیمپراتۆری ژاپۆن جەختیان لەسەر نەتەوە دەکردەوە، بەڵام لیبراڵیزم لەسەر تاکەکەس. بۆیە هەردووکیان گفتوگۆو دەمەتەقێیان بە ترسناك و هەرەشە سەیر دەکرد لەکاتێکدا ئاسایی بوون لە سیاسەتی دیموکراسیدا. هەر ئەم هۆیەش بوو وای کرد هەریەکەیان دەست بکەن بە چەوساندنەوە سەرکووتکردنی ئەو دەمەتەقێ گفتوگۆیانە. هەڵسان بە قەدەغەکردنی هێزی سیاسی وتوندکردنی سیستەمی کۆنترۆڵیان هەروەها دەستیان کرد بە سزادانی ڕێکخەران و ئەنجامدەرانی چالاکی سیاسی سەربەخۆ. هەر کۆمەڵگاو (کۆمەڵگای ژاپۆن و ئەڵمانیا) سەرکردەیەکی دەستنیشان کرد بۆ دەستەبەرکردنی نەتەوە، لە حاڵەتی ئەڵمانیادا سەرکردەیەکی چەوسێنەر(ئەدۆڵف هیتلەر) و لەژاپۆنیش ئیمپراتۆرێك کە لە کاتی مومارەسەکردنی دەسەڵات و حوکمکردنی وڵاتەکانیان دوو کەسی سیمبوڵی بوون، بەڵام لەژێر سایەی کۆمۆنیزمدا سامانی تایبەت لە هەردوو وڵاتدا رێگەیەکی پێدرابوو، لە کاتێکدا هەردووکیان کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر بوو کاتێ ڕەچاوی سستیە مەزنەکەی بازاڕیان دەکرد کە لە ساڵانی / ١٩٣٠ / یەکان ڕوویدا. بۆیە حەزیان بەو سەربەخۆییە بوو کە لیبراڵیزمی ئابووری نێودەوڵەتی باسی لێوە دەکرد، لە کاتێکدا هیچ یەکێك لەو رژێمانە (ئەڵمانیا و ژاپۆن) لە نێو سیستەمی نێودەوڵەتی ئابووریدا شوێنێکیان نەبوو بۆ بازرگانی ئازاد.

لە هەردوو وڵاتدا دەسەڵات کرێکارانی لە ڕێکخراو و مانگرتن قەدەغەکردبوو. زۆر بەچڕی تەداخولی چالاکی ئابووریان دەکرد بۆ بەرژەوەندی و مەرامەکانی خۆیان نەك بۆ مەبەست و مەرامی لیبراڵی ڕۆژئاوا. لەماوەی جەنگی جیهانی دووەمدا هەر وڵاتەو هەرێمێکی بێگانەی هەڵقۆزییەوە و بە هەمان شێوازی داگیرکردن، هەڵسان بە دەست بەسەرداگرتنی کەرەستەی خاو، خەڵکیان ناچارکرد کاربکەن بۆ بەرژەوەندی ئەوان هەروەها ئەو رێکخستنە سیاسیانەی لە



ناوەوە و ئابوورییەکانیش لە دەرەوە کاریان دەکرد بۆ ئامانجی باڵای هەردوو رژێمی نازی و ئەڵمانیا و ئیمپراتۆری ژاپۆن بوون، ئامانجەکەش داگیرکردنی سەربازی بوو، ئامانجێك کە لە ڕوانگەیەکی جیای تالیبراڵەوە کاری بۆ دەکرا. ئەڵمانیا و ژاپۆن سیاسەتی نێودەوڵەتیان بە خەباتێك بۆ مانەوە سەیر دەکرد لە کاتێکدا مەرجی ئەو سیاسەتە لای ئەوان کوشتن و بڕین و داپڵۆسین و توندوتیژی و دەرەبەگایەتی و چەوساندنەوە بوو، هەروەها شەڕ بوو دژی ئەوانەی کە دژی کرۆکی نالیبراڵیزمی ئەڵمانیا و ژاپۆن دەجووڵانەوە لە نێوان ساڵانی(١٩٣٠ — ١٩٤٠). بۆیە ئەڵمانیا و ژاپۆن بوونە هۆی بەرپابوونی جەنگی جیهان دووەم، جەنگێك بە خوێناویترین و فراوانترین و توندترین جەنگ دادەنرێت کە جیهان لەوەو پێش هەرگیز بەخۆیەوە نەبینیوە.(*)

گەلی ژاپۆن و ئەڵمانیا بەرەو کۆتاییەکی تاڵ جەنگان. لە جەنگی جیهانی یەکەمدا، ئیمپراتۆریەتەکانی هابسبێرگ و رۆمانۆڤس لەژێر فشاری سەربازی هەڵوەشانەوە. لە جەنگی ساردا کۆمۆنیزم رووخا بێ ئەوەی تەقەیەکیش بکرێت. لە جەنگی جیهانی دووەمدا یەکێك لە هێزە گەورەکانی لیبراڵ کە فەڕەنسا بوو لە مەیدانی جەنگ دۆڕاو چۆکی داداو حکوومەتێکی ئەڵمانیش بەشەش هەفتە دامەزرا. بەپێچەوانەی پێشبینییەکانی نازی ئەڵمانی و ئیمپراتۆری ژاپۆن، هێرشی توند کرایە سەر هەردووکیان، سەرەنجام داگیرکردنی پایتەختی ئەڵمانیا و

---

* ئەڵمانیا و ژاپۆن وەك داگیرکەرە گەورەکەی سەردەمی مۆدێرن (ناپلیۆن) لە جەنگەکانیان بەجیا دۆڕان، چونکە هێزەکانیان زیاد لە پێویست فراوانکرد و بڵاوکردەوە. هەریەکە و خۆی لە زۆربەی خاکی دراوسێکەی کە داگیری کردبوو بینییەوە. ئەڵمانیا لە بەرامبەر یەکێتیی سۆڤیەت و ژاپۆنیش بەرامبەر چین دۆڕا، چونکە زۆربەی کات پشتیان بە هاوپەیمانێتی بەستبوو کە هەمیشە کتوپڕ و سەرکەوتنی خێرایان بەدەست دەهێنا. بۆیە هەریەکە و هەر بە ڕەی جاران هێرشیان بەناوی سەرکەوتن ئەنجامدا، بەڵام بە پێچەوانەی پێشبینی ئەڵمانەکان، بەریتانیا دڵنیا بوو لە ئاشتی لە ساڵی (١٩٤٠) و یەکێتیی سۆڤیەتیش وەدەرنەبوو لە جەنگی (١٩٤١). هەروەرها بەپێچەوانەی هیوای ژاپۆنییەکان ویلایەتە یەکگرتووەکان وێڵ نەبوون بەدوای (بەندەری پێرل – Pearl Harbor) بەهۆی مامەڵە دڕندانەکەیان.

ئەڵمانیا و ژاپۆن کەسی تریان وەرنەدەگرت و کەسیش پەیوەندی پێوەنەدەکردن. دڕندایەتیان بەرامبەر جیهان لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو کە وایان دەزانی نەتەوەکانی تر بەردەستی ئەوانن، بەڵام ئەوەی نالیبراڵیزمی ژاپۆن و ئەڵمانەکان چاوەڕێیان دەکرد لە جاڕسکردن و کوشتن و بڕین و فاشیزمیان هیچی نەهاتە جێ تەنها بەرەو شکست نەبێت.

ڕووخاندنی دووشاری گەورەی ژاپۆن بەهۆی بۆمبی ئەتۆمی لێ کەوتەوە و ناچارکران چۆك دابدەن.

لە کۆتاییدا، هەردوو وڵات تێکشکێندران و داگیرکران و ناچارکران ببنە دوو وڵاتی ئاشتی خواز. شکستی ئەوان بە تەواوی گرنگ بوو بۆ جەنگی سارد. لەماوەی دوای جەنگی ساردا، ئەمە شکستەی ئەوان ڕێگای خۆشکرد بۆ گۆڕان بەرەو لیبراڵی سیاسی و ئابووری. ئەڵمانیا و ژاپۆن بوون بە ڕابەری سەرەکی ناوەوەی لیبراڵ، بەزەبری گۆڕان بەرەو لیبراڵیزم، هەردوو وڵات لە شوێنی هێزە نالیبراڵییە شکاوەکان سیستەمێکی سیاسی دیموکراسیان دامەزراند کە تیایدا دەسەڵات لە ڕێگەی هەڵبژاردنی پەرلەمانیەوە مومارەسە دەکرا، دوور لە چەوساندنەوە، هەریەکەیان ئەرك بەرژەوەندی خۆیان باش ڕەچاو دەکرد و هەریەکەیان لەلایەن هاوپەیمانێکی فراوان و ڕێك و هۆشیار حوکم دەکران.

کاتێ نالیبراڵیزمی سیاسی و ئابووری جەختیان لەسەر هەڵقۆزینەوە و بەرگریکردن کردەوە، ژاپۆن و ئەڵمانیای دوای جەنگ زۆر بە توندی پشتیان بەست بە پەیڕەوکردنی سیاسەتی. ژاپۆن بە تایبەتی جۆرە سیاسەتێکی نوێی وەك وڵاتێکی بازرگانی دروستکردو ئەو سیاسەتەش لەلایەن ڕوانگەی بازرگانی نێودەوڵەتی و کاروباری سەربازی بەخود بەخێوکردن پێناس دەکرێت کە هەرگیز هیچ وڵاتێکی زلهێز وەك ئەوان بەهێز نەبوون لەم ڕووەوە. ستراتیژی نەتەوەیی نوێیان بەکاربرد، وێڵ بوون بەدوای ئاسایش و تایبەتمەندی و کاریگەری هاوکاری ئابووری، هەروەها سیاسەتی نوێ و هێمنی سەربازی و نەهێشتنی چەوساندنەوەی گەل وای کرد ئەو دوو وڵاتە ببن بە وڵاتی دەستووری و دژی بەرپابوونی جەنگ بوەستنەوە.

هەردووکیان لە سەرەتای ساڵەکانی دوای جەنگدا بە دڵسۆزی بریارێکی سیاسیاندا بۆ بەستنی هاوپەیمانێتییەك لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکان. ئەوەی بەقەد ئەمانەش گرنگ بوون دەستپێشخەری سیاسەتی ئابووری بوو، هەروەها سەقامگیری لودویگ ئێرهارد پێوەرێکە لە ئەڵمانیا لە ساڵانی (١٩٤٠) داو بڕیاری حکوومەتی ژاپۆن لە سەرەتای / ١٩٥٠ / یەکان بۆ بونیاتی پیشەسازیەتێکی ئەوتۆ، بە تایبەتی بڕیارەکانی وەزیری بازرگانی و پیشەسازی وڵاتیان بەرەو گۆڕان برد.

لە هەردوو حاڵەتدا (ئەڵمانیا و ژاپۆن) گۆڕانەکە بە ئارەزووی خۆیان نەبوو، هەردوو وڵات داگیرکران لەلایەن ئەو زلهێزانەی کە ئەوانیان تووشی شکست کرد: بۆ نموونە: ئەڵمانیا لەلایەن



هێزە لیبراڵەکانی ڕۆژئاوا و یەکێتیی سۆڤیەت داگیرکرا. لەو کەرتەی کە سەربازانی سۆڤیەت نەمان گۆڕانی ئەڵمانیا فۆرمێکی نالیبراڵی دروستکرد بە ئاستێکە کەمتر لە گۆڕانی ئایینی، ئەویش فۆرمی بوژانەوەی تاوان بوو لە ژێر چاودێری زلهێزەکان کە وەك مێتافۆرێکە بۆ ژاپۆن و ئەڵمانیای دوای جەنگ، بەڵام بوژانەوەکە سەرکەوتوو نەبوو.

سەرەڕای ئەمانەش هەردووکیان سوودمەند بوون لە جەنگی سارد. داگیرکەرە ڕۆژئاواییەکانیان پێویستیان بەوان بوو بۆ هاوپەیمانێتی و چەند سیاسەتێکیان گرتە بەر بۆ بەهێزکردنیان تاوەکو پشتگیریان دووپات بکەنەوە بۆ سەرکەوتنی ئابووری. ویلایەتە یەکگرتووەکان هاوکاری ئابووری لە ئەوروپا بەدەستهێنا لە شێوەی پلانێکی مارشاڵ کە تیایدا داگیرکردنی ناوچەکانی ئەڵمانیا دابەشکران ئەمە لە کاتێکدا پلانێك نەبوو بۆ ژاپۆن. دەستپێکردنەوەی جەنگ لە کۆریا لە ساڵی / ١٩٥٠ / بووە هۆی وەڵامێکی توند بۆ ئەمریکا و ئابووری ژاپۆنییەکانیشی بەهێزکرد.

بەهۆی تێکەڵ کردنی ناچارکردن و قەناعەت پێهاورده. سێینەی وێڵسن ڕەگی لە هەردوو وڵاتدا داکوتا و ئەو ئایدیە و ڕێسایانەی کەبە ژاپۆن و ئەڵمانیای دەووت جەنگ هەرەشە و بەدخوو و ناپاسایییە لە سەریان سەپێنرا، بەپێی تێپەربوونی کات ئەو ئایدیانە بۆ ئەڵمانییەکان و ژاپۆنییەکان ئاسایی و دڵخۆشکەرو دواتریش پێویست بوو بۆ ژیانی نەتەوەییان. لیبراڵیزمی دوای جەنگی ئەڵمانیا و ژاپۆن وەك زەواجێکی بەزۆری بوو و دوایی گۆرا بۆ خۆشەویستی.

مێژووی نەتەوەیی ئەڵمانیا و ژاپۆن لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا شیانی ئەو کارانەی کە هەموو کۆمەڵگاکانی چاخی مۆدێرن هەوڵیاندا ئەنجامی بدەن خستەڕوو. هەردوو وڵات لەگەڵ سەرکردەی نێودەوڵەتی هەڵیانکرد و بەرەو سیستەمی نێودەوڵەتیش چوون. مێژووی هاوتەریبی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم شیانی ئەنجامدانی ئەو کارانەی خستەڕوو کە زۆربەی وڵاتان پابەند بوون بە ئەنجامدانی لە سەدەی بیست و یەکدا کارەکانیش تەبەنی کردنی ئابووری و سیاسەتە لیبراڵییەکان و سیاسەتی ئاسایش بوون، هەروەها ئەزموون و سوودی گۆڕنەکانیان خستەڕوو. لەپاش جەنگی جیهانی دووەمدا، ئەڵمانیا و ژاپۆن لە ڕووی سیاسییەوە سەقامگیرترو لە ڕووی ئابوورییەوە کاریگەرترو لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیش ئاسایشتر بوون. کاتێ هەوڵی ئەڵمانەکان بۆ داگیرکردنی ڕۆژهەڵات بووە هۆی پارچە پارچە بوون و شکست، سیاسەتی تێکەڵ بوونەوە لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا ڕێزو ڕەفاهییەتی ناوەخۆی هێنا ئاراوە.

بەهەمان شێوەش ئەم شتانە لە ژاپۆنیش روویدا هەوەسی بۆ بازنەی ئابووری ئیمپراتۆری لە ئاسیا بووە هۆی خراپترین کارەسات لە مێژوودا، بەڵام لە سەرەنجامی ئەو کارەساتە هەل بۆ بازرگانی وەگەڕخستن بۆ لای باشوورو و رۆژهەڵات بە شێوەیەکی فراوان رەخسا کە هەرگیز پێشتر بەم شێوەیە نەڕەخسا بوو. لە نێوان ساڵانی (١٩٥٠ — ١٩٨٠) ئەو هەلانە ئابووری ژاپۆنیان زۆر بەهێز کرد تا گەیشتە ئەو رادەیەی ناسرا بە موعجیزەی ئابووری ژاپۆنییەکان.

ئەڵمانیا و ژاپۆن لکێندران بە ناوەوەی رۆژئاوا، ئەندامێتیان لەچاو پێشتر بەهێزتر و سەرنجراکێشتری کردن لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا هەرچەندە هەموو بەشەکانی جیهان لە پەیوەندی بەردەوامدا بوون لەگەڵ یەکتر، بەڵام شوێن هێشتا هەر گرنگ بوو. بڵاوبوونەوەی لیبراڵیزمی نێودەوڵەتی بە بۆچوونی پسپۆران بە چەشنی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی وابوو لە جیهان. وڵاتانی رۆژئاوای ئەوروپا کاریگەرییەکی بەهێزیان هەبوو لەسەر باشووری بەشی رۆژهەڵاتی کیشوەری ئەوروپا — رێژەی کەلتووری هەروەك سەرەتای چاخی مۆدێرن لە ئەوروپاوە بۆ باکووری رۆژئاوا و دواتریش بۆ باشووری رۆژهەڵاتی بڵاوبۆوە. دەزگا و ئایدیا لیبراڵییەکان لە باکوور بۆ باشووری ئەمریکا گوازرانەوە. ئەمریکای لاتین کاریگەرییەکی زۆری لەلایەن ویلایەتە یەکگرتووەکا و کەنەدا لەسەر بوو.

لەئاسیا جوگرافیا کەمتر حسابی بۆ کرا، هەرچەندە ئەمریکا کەوتۆتە لایەنی دووری گەورەترین زەریای جیهان، بەڵام کاریگەرییەکی بەهێزی هەبوو بەهۆی چالاکی ئامادەکی سەربازی هەروەها بڵاوبوونەوەی ئایدیا مەعنەوی و شتە بەرجەستەییەکانی رۆژئاوا بوعدێکی جوگرافی هەبوو لە ئاسیا. ژاپۆن بەهۆی لەیەکچوونی کەلتوورەوە وەك نموونەیەك خزمەتی کرد لە بەرژەوەندی خۆی و باشوور و رۆژئاوی ئاسیا.

ئەڵمانیا و ژاپۆن هێزی ناوەوەیان بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش زیاترکرد بەهۆی بەشداری کردن لە سیستەمی فرەیی ئابووری لە کاپیتالیزمی بازاڕی ئازادی ئەمریکادا، رۆڵی حکومەت مۆدێرنتر بوو لەدابەشکردنەوەی زانیاری لەچاو ڕۆژئاوای ئەوروپا، واتە سیستەمەکانی (بازاڕی کۆمەڵایەتی) سنووردارتر بوون بوو لە بەرێوەبردنی وەگەڕخستن لەچاو سیستەمی (کۆنفۆسیان)ی ژاپۆن وەك (بزوێنەری ماتۆرەکان)، ناوەوەی لیبراڵ مۆدێلی هەمەجۆری سیاسی و ئابووری پێشکەش کرد و بۆیەش داوای لە کۆمەڵگاکان دەکرد بۆ پێشکەشکردنی چێژی جیاواز، پێداویستی جیاواز، شوێن و باکگراوندی جیاواز.



ئەڵمانیا بەشێکی گرنگ بوو لەو سەقامگیرییە لیبراڵییەی کە لە کۆتایی جەنگی ساردا لە ئەوروپا دامەزرا. رۆڵی ژاپۆن لە کاروباری ئاسایشی رۆژهەڵاتی ئاسیا وەك رۆڵی ئەڵمانیا بوو لە ئەوروپا، هەروەها دەبێ رێکخستنی ئاسایش کە سەردەمێك لە ئاسیا دروست بووە و ژاپۆن سەنتەرییەتی بە رێکخستنەکانی ئاسایشی ئەوروپا بچێت ٠ هەروەها سەبارەت بە سیستەمە لیبراڵییەکانی دارایی نێودەوڵەتی و بازرگانی، ئەڵمانیا و ژاپۆن پاش ئەمریکا گرنگترین بەشداربوون لەو سیستەمانە.

هەردووکیان لە دەرەوەو ناوەوە کۆڵەگەی لیبراڵی دوای جەنگی سادر بوون، بناغەی ئەو دەزگایە بوون کە لیبراڵیزمی نێودەوڵەتی لەسەری وەستاوە. بۆیە روانگەکانی سێیەنەی ویلسن لە سەدەی بیست و یەکدا بەزۆری پشتی بەرۆڵ گێرانی ئەڵمانیا و ژاپۆن بەست، هەروەها بە پەیڕەوکردنی ئەو سیاسەتەی کە بەکاریان برد لە نیوەی دووەمی سەدەی بیست، هەرچەندە ئەڵمانیا و ژاپۆن زۆر گرنگ بوون بۆ سەدەی دوای جەنگی سارد، بەڵام ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش سەنتەری ئەو دوو کۆڵەگەیە بوو لەمەڕ تێروانینی لیبراڵ.

### *سەرکردە*

ئەمریکا لە سەدەی نۆزەدا بەهەمان رێگای ئەڵمانیا و ژاپۆندا چوو. وەك ژاپۆن، لە نیوەی سەکەمی سەدەی نۆزدەدا بە هۆی هۆکاری سیاسی و جوگرافییەوە لە دەمەتەقێی نێو زلهێزەکاندا بەدەر بوو. وەك ئەڵمانیا، لە جەنگێکی یەکگرتنەوەیی لە (١٨٦٠)ن وەك وڵاتێکی نەتەوەیی بەهێز سەری هەڵدایەوە. وەك هەردووکیان (ژاپۆن و ئەڵمانیا)، بەخێرایی ئابووری پیشەسازی خۆی بونیاتنا، هەر لەبەر ئەمەش، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا گەورەترین وڵاتی ئابووری جیهان بوو.

لەماوەی هەمان ئەو سەدەیەدا هەر سیانزە ویلایەتە بنەرەتییەکە شان بەشانی فراوان بوونی وڵاتانی سەر زەریای ئەتڵەسی بوون و لە ساڵی (١٨٥٠) دا ئەمریکا لە زەریای ئەتڵەسی درێژ بۆوە تا زەریای هێمن. لە شەڕی ناوخۆی ئەمریکادا (١٨٦١ — ١٨٦٥) داکە ویلایەتەکانی باکوور بەرامبەر باشوور وەستانەوە و سووربوون لەسەر پێکهاوردەی وڵاتێکی جیاواز، بەڵام لە نێوان کەنەدا و مەکسیکۆدا هەر یەك دەسەڵاتی سەروەر هەبوو.

دەرەنجامی شەڕی ناوخۆ ئەوەشی دووپاتکردەوە کە ئەمریکا وڵاتێکە پابەند دەبێت بە لیبراڵی سیاسی و ئابووری، ئەو پابەند بوونەشی بۆ مێژووی سەدەی بیستەم زۆر گرنگ بوو. لە سەرەتای سەدەی نۆزدەمدا، ئەمریکا بە تەواوی چ لە سیاسەتی دەرەوە چ لە ناوەوە لیبراڵ نەبوو. دەزگای کۆیلایەتی لە باشووری ئەمریکا مانای ئەوە بوو کە گەلی نەژادی ئەفریقیا بە سامان سەیر دەکران و حیسابی هاوڵاتیان بۆ نەدەکرا، خەڵکی سادەی باکووری ئەمریکا وەك ڕێگر و دوژمن مامەڵەیان لەگەڵ دەکرا، بەڵام لە تەواوی سەدەی نۆزەدا ئەمریکا وەك وڵاتە ڕۆژئاواییەکانی تر بەتەواوی بوو بە وڵاتێکی لیبراڵ، مافی هاوڵاتی بوونی بە تەواوی بەخشی، هەرچی لە سەرەتای سەدەکەدا ئەنجامی دابوو دووبارەی نەکردەوە و وازی هێنا. هەروەها ئەمریکا هێزێکی ئیمپراتۆریش بوو، هەر بەو هێز ئیمپراتۆرییە سەرکەوت بەسەر ئیسپانیاو کۆنترۆڵێکی کاریگەری هەبوو بەسەر کوبا هەروەها سامانی فلیپینییەکانیشی بۆ خۆی قۆرخ کرد، بەڵام ئیمپراتیۆری ئەمریکاش لە سەدەی بیستەمدا دەستی هەڵگرت و وازی لە سیستەمی ئیمپراتۆری هێنا.

لە تەواوی مێژووی ئەمریکادا ئەو بنەما لیبراڵیانەی لە دورگەکانی بەریتانیاوە بۆ باکووری ئەمریکا گوازرانەوە بووە هۆی دروستبوونی کەلتوورو سیستەمی سیاسی و نەریتی ئابووری ئەمریکا. داگیرکراوەکان سەیری یاخیبوونی سەرکەوتووی خۆیان دژی حوکمی بەریتانیا کرد بەهۆی چەمکە لیبراڵییەکانەوە دووپاتی مافەکانی (پیاوانی ئینگلیزیان) دەکردەوە.

سەرەڕای ئەو کاریگەرییە گەورەیەی وڵاتە کۆنەکە، لە زۆربەی سەدەی نۆزدەدا پەیوەندییەکان لە نێوان ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا و بەریتانیا زۆر جۆرە پەیوەندیەکی قورس و ئالۆز بوو. ئەمرکییەکان وەك هەڕەشەیەکی گەورە سەیری بەریتانییەکان یان دەکرد بۆ سەر ئاسایشیان، تێڕوانینێك کە هێشتا بە تەواوی نەچەسپا بوو. لە ساڵی ١٨١٤ سەربازە بەریتانییەکان پایتەختی ئەمریکایان سوتاند. لە کاتی جەنگی ساردا، یەکێتیی سۆڤیەت گومانی لە بەریتانییەکان هەبوو نەبادا پیرەوی سیستەمی کۆنفیدرالی بکات، بەڵام لە ساڵە بەراییەکانی سەدەی بیستەمدا هەردووکیان گەیشتنە ڕێکەوتنێك ئەویش هەستان بە دروستکردنی ئەندامێتی ساختەی بەریتانی و ئەمریکییەکان کە ئامێرێك بوو بۆ بردنەوەی هەردوو جەنگی جیهان و گرینگیش بوو بۆ بونیاتنانی وڵاتانی ناوەوەی ڕۆژئاوا لە جەنگی ساردا.



ئەمریکا بۆ هاوسەنگی ئەورووپا وەك بەریتانیا بوو. دوو جاران هێزی سەربازی ڕەوانەی ئەورووپا کرد تاوەکو نەهێڵێت ئەڵمانیا لەوێ دەسەڵاتێکی باڵا دەبەزرێنێت. هەروەك بەریتانیا، ئەمریکاش دەستی لە کیشوەری ئەورووپا وەردا لە سەدەی هەژدەو نۆزدەدا پەی بە هێزی فەرەنسا ببات لەو ناوچەیە. لە خەباتی دژی یەکێتیی سۆڤیەتدا، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە پەیوەندیکردن بەهێزە مەعارەزەکانی کۆمۆنیست و گرێدانی هاوپەیمانێتی لەگەڵیان دوانەکەوت، چونکە هەمان ئەو هەڵەیەی لە هەردوو جەنگی جیهانیدا دووبارە نەکردەوە بەوەی کە زۆر درەنگ پەیوەندی بەو هێزە موعارەزانەوە کرد، بەڵکو سیستەمی سەربازی و ئابووری ڕۆژئاوای ڕێکخست و پشتگیریی کرد و نەخشەی بۆ دانا بۆ بەردەوامبوونی ململانێ لەگەڵ نالیبراڵیزمی کۆمۆنیست.

ئەمریکییەکان چەمکێکیان هەبوو بۆ ڕۆڵگێڕانی وڵاتەکەیان لە جەنگی ساردا بەکاریان دەهێنا، هەروەها چاوەڕێی ئەوە بوون لە ماوەی دوای جەنگی ساردیش بەکاریبهێننەوە ئەویش " سەرکردایەتی " بوو (Leadership). سەرکردایەتی یەکێکە لە وشانەی کە لە ناو زەرفێکەو بە هەموو جیهاندا بلاوبۆوە. خەڵکی ژیرو بوێرو لێهاتوو دەبوون بە سەرکردە تاوەکو بتوانێت قەناعەت بەوانی تر بهێنێت. بە هەقیقەت، مەرامی ئەمریکا لە سەرکردایەتی زیاتر جیهانی بوو و تا شکۆمەندی، هەر بەم شێوەیەش لە ماوەی دوای جەنگی ساردا پەرەی پێدرا، هەروەها سەرکردایەتی لە نێو گەلی ئەمریکی زیاتر جەماوەری بوو، بەڵام تەنها لە تیۆر نەك لە کردەدا. سەرکردایەتی ئەمریکی بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە ئەمریکییەکان زیاتر لە سنوور و بەشی خۆیان کۆشش سەرف دەکەن بۆ ئەو شتانەی کە حکوومەت دابینیان دەکات ئەویش پێداویستییەکانی گەل بوو.

بەدەستهاوردەی پێداویستی نێودەوڵەتی زەحمەتترە لەوانەی ناوخۆ، چونکە ڕێگەچارە بۆ کێشەی ئەو کەسەی (بەلاش سوار دەبێت) لە لای زلهێزکاندا نییە، هیچ حکوومەتێکی جیهانی نییە بتوانێت پێداویستی گشتی نێودەوڵەتی دابین بکات. هەرچەندە وڵاتێکی زلهێز لە جیهاندا نەبوو، بەڵام، پێداویستی گشتی نێودەوڵەتی لە کاتی جەنگی ساردا زامن کرا. هەموو قوربانیانی شەڕانگێزی سۆڤیەت سوودیان لە سیاسەتی ڕۆژئاوا وەرگرت، بە بێ ویستی خۆیان پابەن بوون بەو سیاسەتە. سیاسەتەکان پێویست بوون پشتگیری یاسای ئابووری لیبراڵی نێودەوڵەتی بکەن هەروەها پێداویستی گشتیش دابین بکەن، چونکە ئەو سیاسەتانە لە

داگیرکاری عێراق بۆ کوێت بەم هەمان ئەو شێوەیە پەیڕەو کران. سوودەکانی جەنگی کەنداو لە نێو هەموو دراوسێکانی عێراق دابەشکران لە سەرووی هەموویشیانەوە عەرەبستانی سعودیە بوو کە ڕەنگە ببوایە قوربانی عێراق دوای کوێت، گەر سەدام حوسێن چنگی لە کوێت گیر کردبا و دوایش سعودیە ئەو کاتە دەسەلاتێکی دیکتاتۆری بۆ نرخی نەوتی نێودەوڵەتی دادەنا، ئەوا ئەو ولاتانەی کە کڕیار نەوت بوون نەوتیان بە نرخێکی زۆر گران دەکڕی بۆ پێداویستی وزەی خۆیان.

شیانی ئەمە چۆن بوو؟ چۆن کێشەی ئەوەی (بەلاش سوار دەبێت) چارەسەر کرا؟ پێداویستی گشتی دابین دەکرا بێ ئەوەی دەسەلاتێکی بالا هەبێت بتوانێت سوودمەندەکان ناچار بکات پارە بدەن، ئەمەش لە حاڵەتێك یان سێ یان زیاتر دێتە ئاراوە: حاڵەتی یەکەم، کاتێ ژمارەی ئەندامەکانی پەیوەست بەو گروپە کەم دەبن، هاوکاری ئارەزوومەندانە بۆ دابەش کردن و نرخ دانان زۆر ئاسان دەبێت، چونکە ئەندامەکان دەتوانن چاودێری ڕێکەوتنی یەکتر بکەن. دووەم، کاتێ هێزو سامان بە ناڕێکی دابەش دەکرێت لە نێو ئەو گروپە، کاتێکیش ئەندامێك زاڵ دەبێت بەسەر ئەوانی تردا ئەوا هەردوو باردا، هێزدار و خاوەن سامانەکان دەبێ خۆیان نرخی هەموو شتەکان بدەن. دابینکردنی پێداویستی گشتی زیاتر لە حاڵەتی سێیەمدا ڕوودەدات، کاتێ ئیمانێکی پتەو دروست بوو بۆ دابینکردنی پێداویستی خەڵکی گشتی و وەك پێوستییەکی گرینگ دەرك بەو پێداویستیانە بکرێت.

هەرسێ حالەت لە کاتی جەنگی ساردا ڕوویدا. ژمارەی ولاتانی ناوەوەی جیهان کەمتر بوون لە ٢٠٠ ولات، هەروەها ئەو گروپەی کە پەیوەست بوون بە دابینکردنی پێداویستی گشتی نێودەوڵەتی لیبراڵ بچووکتر بوون. هێزو سامان بە ناڕێکی دابەشکرا. بە تایبەتی لە کۆتایی جەنگی جیهانی دووەم کاتێ یاساکانی ئابووری و ئاسایش ڕێکخرا بوون. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا جیا لە ولاتە زلهێزەکانی پێش جەنگ زۆر ئازاریان نەچەشت لە زیانی جەنگ بۆیە لە سەرووی هەمووانەوە بوون لە ڕووی سەربازی و سامانەوە. لەوەش گرینگتر، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هۆیەکی بە پەلەیان هەبوو بۆ دانی نرخی دامەزراندن و پاراستنی ئەو سیستەمانە لە چوارچێوەی کارێکی باشدا، ئەویش جەنگی سارد خۆی بوو.

ئەمریکییەکان پاڵپشتکردنی هاوپەیمانی سەربازی لە ئەوروپاو ڕۆژهەلاتی ئاسیای بە پێویست دانا بۆ ئاسایشی خۆیان لە سەر بنچینەی ئەوەی کە ئابووری نێودەوڵەتی و هاوپەیمانی





سەربازی بەهێزترن بۆ پشت پێ بەستان، چونکە لە سەرچاوەکانی تر ڕەفاهی تر بوون. بە تێڕوانینی ئەمریکا، جەنگی جیهانی دووەم لە فەشەلەوە سەرچاوەی گرتبوو بۆ دژی شەڕانگێزی لە ڕێگای دروست بوونی هاوپەیمانی بەهێز و نەهێشتنی سستییە مەزنەکەی ئابووریی بازاڕ لە ڕێگای لیبرالیزمی ئابووری و سیاسییەوە. جیا لە یەکێتیی سۆڤیەت کە کاندیدی یەکەم بوو بە دوای شوێن پێیەکانی نازی ئەڵمانا بکەوێت، ئیپراتۆری ژاپۆن و ئەمریکییەکان باوەڕیان وابوو کە جەنگێکی تر کولفەی زیاتری دەوێت. بۆیە هەر چەند باج بدەی بۆ نەهێشتنی جەنگی جیهانی سێیەم هەر کەمە، تەنانەت گەر هیچ کەسیش لە باج و سەرف کردنەکەدا بەشداری نەکات. ئەوەبوو ئەمریکییەکان گەیشتنە ئەو قەناعەتەی کە دەبێ بە خۆیان ئەو باجە بدەن گەر بە تەنیاش بێت. وایان دانا کە باجدان بۆ دابینکردنی پێداویستی گشتی نێودەوڵەتی ڕێگایەکی زۆر ژیارنەیە بۆ بەرگریکردن لە خۆیان.

لە زۆربەی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا، سیستەمی سیاسی ئەمریکی تەرخان کرابوو بۆ ئەنجامدانی ئەو کارانەی کە سەرکردایەتی نێودەوڵەتی دەیویست، چونکە بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەو کاتە کاتی جەنگ بوو نەك ماوەی دوای جەنگ. پێشبینی و ڕێنماییی و دەزگاکان بۆ جێبەجێکردنی سیاسەتی دەرەوە لە جەنگی سارد بە شێوەیەکی فراوان لە جەنگی جیهانی دووەمەوە سەرچاوەی گرتبوو.

پێداویستی گشتی نێودەوڵەتی لە کاتی جەنگی ساردا دابینکرا، بەلام بە پێی تێپەڕ بوونی کات لە ماوەی دوای جەنگی ساردا بوو بە پێویستییەکی بەردەوام. کاتێ ئەمریکا سەرکردایەتی ئابووری نێودەوڵەتی کرد هەموو ولاتانی ناوەوەی جیهان ویڵبوون بەدوای بەشداری کردنی. ئەو هاوپەیمانێتیانەی کە ئەمریکا دروستی کردن و پاڵپشتی کردن زۆر گرینگ بوون بۆ یاسای ئاسایشی لیبراڵ و تێڕامانی ماوەی دوای جەنگی ساردیش بوون، بەلام هەرسێ حالەت بۆ دابینکردنی پێداویستی گشتی نێودەوڵەتی هەمووانی بێ هێز کرد.

ژمارەی ولاتانی ناوەوەی جیهان زیادی کرد، دەسەلاتیش زۆر لە ناویان بلاوبۆوە. ویلایەتە یەکگرتووەکان لە هەموویان بەهێزتر مایەوە، بەلام لە ڕووی ئابوورییەوە دابەزی کە لە دەرەنجامی جەنگی جیهانی یەکەمدا گەیشتووە لووتکە. لەوەش گرینگتر جەنگی سارد کۆتایی هات و باج دان بۆ بەردەوام هەڵسوڕاندنی ئاسایش و یاساکانی ئابووری لیبراڵی نێودەوڵەتی خێرا خۆی لەدەست دا. سەرکردایەتی کردنی جیهان هیچی تر قارەمانێتی نەبوو. سەرکردایەتی

زۆر پەیوەست نەبوو بەوەی کە شکۆمەندی و لە پێشەوەی هەمووواندا ڕێبکەیت و باج بۆ هەمووان بدەیت و پاشماوەی هەمووان پاك بکەیتەوە، چونکە جیهان پاش جەنگی سارد هەر ئەو جەنگەڵەی جاران نەما، هێزی سەرکردایەتی کردن کەمتر پاشای حەشاماتەکە بوو تا بەرپرسیارێتی حەشاماتەکە. سەرکردایەتی کردن جیهان مانای سەرکردەی جیهان نییە، بەڵکو خزمەتکردنییەتی.

ئایا تا چ ڕادەیەك ئەو سەرکردایەتیە نێودەوڵەتییەی کە ئەمریکا پێشکەشی دەکات پشت بە بارودۆخەکان دەبەستێت، ئەمەش لە بۆنەیەکەوە بۆ بۆنەیەکی تر جیاوازە، بەڵام پاش دەیەی یەکەمی دوای جەنگی سارد دەرك کردن بە هێزە تیکۆشەرەکان شتێکی ئاسایی بوو کە سوور بوون لە سەر ئەوەی تا چەند وڵات دەتوانێت بەردەوام بێت لە سەر هەمان ئەو ڕۆڵەی لە جەنگی ساردا بینی.

بەردەوام بوون هەقیقەتی کەمبوونەوەی نرخی ڕۆڵگێڕان بوو. هیچی تر پێویست نەبوو ململانێی جیهانی دژی دوژمنێکی بەهێز بکەیت. بەرگریکردن لە بنەمای دەزگا و نەریتە لیبراڵییەکان ئاسانتر بوو، چونکە دژایەتیان بە شێوەیەکی کاریگەر پرۆسەیەکی بێهێز بوو. هێرشەکانی یانزەی سێپتێمبەر لە ٢٠٠١ هیچی لەم هاوکێشەیە نەگۆڕی. وێڕای ئەمە، ئەو هێرشانە بنکەی جەنگی ساردیان لە دەرەوە بۆ کردە سەربازییەکانی ئەمریکا دروستکردەوە.

لە ساڵانی دوای جەنگی جیهانی دووەمدا، ئەمریکییەکان قەناعەتیان بەوە هاتبوو کە هەرەسی پشکنینی ئەدۆڵف هیتلەر لە پێشدا زەمینەی بۆ جەنگێکی تراژیدی خۆش کرد. دواتر دووبارە نەکردنەوەی هەڵە گەورەکەی ساڵانی ١٩٣٠، شەڕکردن لەگەڵ کۆمۆنیزم لە هەر شوێنێکدا هەڕەشەیەك بوو بۆ زاڵ بوون بەسەر ئەوەی ڕێگە نەدرێت بە یەکێتیی سۆڤیەت و هاوپەیمانەکانی لە ڕێگای سەرکەوتنی سەربازییەوە بەهێز بن، بوو بە بنەمایەکی بنچینەیی لە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا لە کاتی جەنگی ساردا. ئەمە مەسەلەیە زۆر هەستیار بوو بۆ ئەمریکا کاتێ دەستی لە کۆریا وەردا لە ساڵی ١٩٥٠ و لە ئەندەنووسیا لە ساڵی (١٩٦٠)ەکان.

هێرشەکانی سەر نیۆیۆرك و واشنتۆن بووە هەمان مەسەلەی هەستیار بۆ هێرشی دژی تیرۆریستان. پاشان، مشتومڕێك هاتە ئاراوە لە سەر ئەنجامدانی کردەی سەربازی بۆ نەهێشتنی دووبارەبوونەوەی ئەو جۆرە ڕووداوانە، ئەو کردە سەربازیانە بە هێزێکی گەورە نەخشەی بۆ



دانرا، ئەمە لە کاتێکدا فەرماندە ئەمریکییەکان توانیان پشتگیری گشتی بەدەست بێنن بۆ ئەو کردانە.

هەروەها بەرژەوەندی بەردەوام بوون لە نێوان جەنگی سارد و ماوەی دوای جەنگی ساردا لە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا جێگیر بوو لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا. ئەمریکییەکان لێڕاهاتن لە ئەرك و کارەکانیان شان بەشانی بەرپرسیارێتیان لە سەرکردایەتی نێودەوڵەتی. گەر هەموو ئەمرکییەکانیش نەبێت هەندێ ئەمریکی ڕاهاتبوون بەو کارانە، چونکە نەریتەکان جەختیان لەسەر یەك پارچەیی کۆمەڵگای ئەمریکی دەکردەوە.

لەسەرەتای سەدەی نوێدا ویلایەتە یەکگرتووەکان، هەروەك لە وڵاتانی تردا، سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا تەنها یەك بەشی بچووکی دانیشتوان بوو، بەڵام بۆ جێبەجێکردنی هەر سیاسەتێکی دەرەوە لە سیستەمی سیاسی دیموکراتی ئەمریکادا پشتگیری گشتی زۆرتری دەویست، لە کاتێکدا پێداویستی نوخبەی سیاسەتی دەرەوە بۆ سەرکردایەتی ئەمریکا لە جیهان مەسەلەی قەناعەتێکی پتەو بوو لە نێو خەڵکی گشتیدا. پابەند بوون بەسەرکردایەتی جیهانی بێ هێزی بوو لە تێڕامانی کاریگەرییەکانی خۆی لەسەر بەشەکانی تری جیهان و دەرەنجامەکانی، نەبوونی هۆیەکیش بۆ ئەو مەسەلانە لە بەر ئەو ڕوانگانە بوون کە زۆربەی وڵاتانی تر زانیارییەکی ئەوتۆیان لە سەر ئەو ڕونگانەدا نەبوو و حەزیشیان نەدەکرد زانیاری لە سەریانن کۆبکەنەوە.

سیاسەتەکانی دەرەوەی ئەمریکا بە دەستەیەك دەچوو کە تیایدا نوخبەی هەڵسوڕاندنی سیاسەتی دەرەوە دەبێ قەناعەت بە شەریکەکان و خەڵکی گشتییەوە بێنن کە دەسەڵاتیان بەسەر خەرجییەکاندا هەبێت. ئەمە ڕاست بوو لەکاتی جەنگی ساردا، بەڵام لەسەرەنجامی ئەو جەنگەدا خولیای داواکردنی ئەوەی دەسەڵاتی هەبێت بەسەر خەرجییەکاندا لەناو چوو یا لە چاو ڕابردوودا زۆر کەمبوونەوە، هەروەها ئەگەر چەند هەوڵێك پێشبینی بکرێت بۆ دەستەبەرکردنی پشتگیری گشتی پێویست بۆ سەرکردایەتی جیهانی ئەمریکا ئەوا ئەو هەوڵانە دەرەنجامەکانی دوای جەنگی سارد بوون لەم ڕووەوە بە ئاراستەی تردا دەرۆیشتن.

چەمکی (دوورەپەرێزی) زۆر جار بەکاردەبرێت بۆ ویستی گەل بۆ پشتگیری نەتەوەیی بەلای هەندێکەوە ئەمە بیروبۆچونێکە ئەمریکییەکان پێشتر کاریان بۆی کردووە. لەگەڵ ئەوەشدا، پشتگیری ئەو خەڵکانە بوون جگە لە ئەفریقییە ئەمریکییەکان و ئەمریکییە ئەسڵییەکان

پەناهەندە بوون ڕایان دەکرد لەو شوێنانەی کەلێوەی لەدایك بوونە (هەروەها وڵاتەکانی تریش) لەگەڵ نوخبەی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا. دوورە پەرێزی ئەمریکی بە ڤایرۆسێکی ترسناك دانرا، وەك نەخۆشییەکی مات وابوو، بەڵام هەرکاتێك بێویستبایە چالاك، دەبووایە هەمیشە ئاگاداری نیشانەکانی بیت.

بەهەقیقەت، ڕاشکاوانە قسە بکەین، لە مێژووی ئەمریکادا هیچ گرفتێکی وەك دوورە پەرێزی ئەمریکا لە ئارادانەبووە. هیچ ناودارێك لە مێژووی ئەمریکا ڕۆژێك بیری لەوە نەکردۆتەوە یا حەزی بەوە نەبووە کە ئەمریکا بەتەواوی خۆی لە بەشەکانی تری جیهان دووربخاتەوە. بە پێچەوانەوە هەر لە سەرەتای دامەزراندنییەوە ئەمریکییەکان خولیای ئەوە بوون بەهاو دەزگاکانی خۆیان لە سەرانسەری جیهان بڵاوبکەنەوە. مژدەی کتوپڕ لە مێژووی ئەمریکا ناوبانگی هەیە، کاتێ لە سەدەی هەژدەمەوە تا سەدەی بیست ئەمریکا لە سەدساڵی یەکەمی مێژوویدا بێ هێز بووە، هیوای بڵاوبوونەوەی شێوازی لیبراڵی ئەمریکی پشتی بەست بوو بەو میکانیزمەی لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا بۆ هەر چوارگۆشەی زەوی گوازرایەوە کە هێزێکی نموونەیی بوو.

شێوازی هەڵەی ڕەفتارکردن لە ئاستی نێودەوڵەتیدا بوو بووە هۆی دوورەپەرێزی لە ماوەی دوای جەنگی سارد، ئەمەش وای لە ئەمریکا کرد بێ گوێدانە هیچ کەسێك و لایەنێك کارو مەرامەکانی خۆی ئەنجام بدات. ئەمە نەریتی گەڕان بەدوای ئەوپەری شیانی مانۆڤەرێکی ئازادی بێ وێنەو ئاستەم بوو بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان. وێڕای ئەمانە، سەربەخۆی کرۆکی سەروەرییە، بەڵام لە ڕووی مێژووییەوە لە وڵاتانی تر ئازاد تر بوو بۆ مومارەسەکردنی ئەوەی گوێ بەکەس نەدات لە سەدەی نۆزدەدا ئەمە لەبەر ئەوەی لە سەدەی نۆزدەدا دوور بوو لە سیستەمی نێودەوڵەتی سەنتەری ئەوروپا، لە سەدەی بیست و یەکیش لەبەر هێزە فراوانەکەی بوو.

ڕێگر لەبەردەم ڕۆڵی نێودەوڵەتی ئەمریکا وەك فراوانی بیرێکی زۆر پێویستی نوخبەی وڵات سەرچاوەی لەوە نەگرتبوو کە شتێکی ڕێگای گرتن شتێکی سەیرە بۆ ئەمریکا یا لە بەر هەڵکەوتنی شوێنی جوگرافی یان مێژووەکەی، بەڵکو سەرچاوەی گرتبوو لەوەی کە ئەمریکاش دەبێت وەك وڵاتەکانی تر بتوانرێت ڕێگەی لێ بگیرێت. ئەمریکا لە سەرووی وڵاتانی ترەوە حەزی دەکرد ببێتە ئەو کەسەی کە 'بەلاش سواردەبێت'، لە بارودۆخی نیوەی دووەمی سەدەی



بیستەمدا هەوەسێکی دیپلۆمای ئاوا دیاردەیەکی شاز، تارادەیەك ئەمریکییەکان خۆشحاڵ بوون بەوەی بایەخ بدەن بە دابینکردنی کەل و پەلی گشتی نێودەوڵەتی، چونکە لە هیچ گەلێکی جیا نەدەکردەوە.

هەوەسی باجدان بۆ کولفەکانی سەرکردایەتی نێودەوڵەتی لە کرۆکی لیبراڵیزمەوە سەرچاوەی گرتووە بە تایبەتی لەو شوێنانەی کە بەهای تاك بەرزترە لە خولیای کۆ، ئامانجەکانیش لەسەر ئاستی ناوەخۆن نەك مەرامێکی نێودەوڵەتی. پاش هەموو ئەو موسولانە، حکوومەتی دیموکراسی بۆ گەل دانرا، زۆربەی کاتیش بەرژەوەندی خود پێویستی بە قوربانی خودە. خۆش گوزەرانی هاوڵاتی تاکی ئەمریکا ئامانجی سەرەکی ژیانی گشتی ئەمریکییەکانە. ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی، دۆکیۆمینتێك لەلایەنی کۆماری ئەمریکاوە دۆزرایەوە، دووپاتی مافی ژیان و سەربەخۆیی و دڵخۆشی دەکاتەوە، دڵخۆشی تاك نەك ماف بۆ شکۆمەندی سەربازی و دابینکردنی بەرژەوەندی دەرەوە و سەقامگیری نێودەوڵەتی، بەڵام ئەمریکییەکان بەهیوای بڵاوبوونەوەی بەهاو تێروانینە کانی ویڵسن بوون و هەرگیز وا ئاسانیش نەبوو باج بۆ ئەمە بدەن. لەکاتی جەنگدا هەموو فەرماندەیەکی ئەمریکی تەواوی کۆششی خۆی خستەگەر بۆ وەدەستهاوردەی پشتگیری ناوخۆ بۆ هەڵمەتی سەربازی، بەڵام ئەم ئەرکە هەمیشە دژوار و نیگەران بوو. ئەو بۆچوونانە لە کاتی ئاشتیدا کاری بۆ کرا بۆ بۆ فراوانکردنی 'خوێنی ئەمریکی' یان گەنجینەیان، لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا شتێکی ئاشکرا بوو گەلی ئەمریکا دەگەیشتە ئەوپەری نیگەرانی گەر هەر قوربانییەك لە دەرەوەی ئەمریکا هەبێت بەهۆی کردەی سەربازی جگە لە هێرشەکانی یانزەی سێپتەمبەری (٢٠٠١)، نیگەرانی لە باج دان دژی کەمکردنەوەی بەربەستەکانی بازرگانی و بەکارهاوردەی پارەی ئەمریکا بۆ رزگارکردنی باری خراپی دارایی وڵاتانی تر خرا ڕوو تەنانەت بۆ دراوسێ هەرە نزیکەکەی ئەمریکا واتە مەکسیك ئەو نیگەرانییە خرا ڕوو.

ڕۆڵـی نێودەوڵــەتی ئــەمریکا لــە دوای جــەنگی ســارد لــە دەوری دوو خــاڵی دژیەکــدا دەخولایەوە: یەکەمیان ئەوە بوو پێشکەوتنی بەردوام و بۆ هەمیــشە لــە نرخــی ســەرکردایەتی نێودەوڵەتی ئەمریکی کەم دەکردەوە واتە کۆتای جەنگی سارد وای لە خەڵکی ئــەمریکی کــرد کەمتر ئارەزووی باجدانی هەبێت. ئەوەی تریش ئەوە بوو کە ئەو خاسیــەتانەی، کــە وایــان لــە لیبراڵیزم کرد سەرنج راکێش بێت لە سەرانسەری جیهان لەسەرووی هەموویانەوە ئەو خاسیەتەی

کە زیاتر جەختی لە سەر ئارەزووی تاك دەکردەوە نەك لە مەرامی گشتی، ئاستەنگی دروستکرد لە پاڵپشتی کردنی دەزگا نێودەوڵەتییەکان کە هەموو ئەو خاسیەتانەی بەدەست هێنابوو. ئەو دەزگاو نەریتانەی لەسەر دەستی وڵاتانی ناوەوەی رۆژئاواوە پێشکەوتن بووە یانەیەك وڵاتگەلێکی زۆرتر ویستی پەیوەندی بەو یانەیە بکات، بەڵام لە کاتێکدا ئەو یانەیە شەعبیتەی کەمتر بوو ئەندامانی نیگەرانتر بوون بە باجدان بۆ پاراستنی ئەو ئەندامانەی کە پێشتر لەو یانەیەدا بوون.

(والتەر لیپمان Walter Lippman) ی ستوون نووس جارێکیان سەنتەری گرفتی سیاسەتی دەرەوەی بە (نەبوونی قەرز) پێناس کرد، چونکە ئەمریکا لە سەرەنجامی جەنگی ساردا گرفتی ئەوەی هەبوو کە شتی بە قەرز هێنابوو بە مەبەستی ئاڵوگۆڕکردن لە کاتێکا وڵاتەکە سەرچاوەی خۆی هەبوو نەدەبوایە هیچ شتێك بکات، لەهەمانکاتیشدا بۆی هەبوو هەموو شتێك بکات. ئەوەی جێی سورنج بوو، ئەوەبوو نەسەرچاوەی ئابووری نە هی سەربازی نەیانتوانی ئەو کارە بکەن، بەڵکو ئەوە ئیرادەی سیاسی ئەمریکا بوو ئەو شتانەی کرد کە نەدەبوایە بیکات.

لە چوارچێوەی پشتگیری ناوخۆدا، هێرشەکانی / ١١ / ٩ /٢٠٠١ مەودای پشتگیری سەربازی بۆ کردەی سەربازی دژی تیرۆریزم فراوانتر کرد، بەڵام ئەوە تەنها یەك بەش بوو، نەك فراوانترین بەشی مەسەلەکە بێت. ئەرکی نێودەوڵەتی دوای جەنگی سارد هاوکاری و فراوان بوونی دەزگا و نەریتەکانی رۆژئاوا بوو، هەرچەند سەرکردایەتی سیاسی ئەمریکا پشتگیریی خەڵکی زیاتر بە دەست بێنێت، لە پاڵ شتەکانی تر، ئەوەندە دەوەستێتە سەر خەرجی ئەنجامدانی ئەم کارە. ئەو خەرجیانەش لە وڵاتانی دەرەوەی جیهاندا هەڵقوڵاوە.

### *وڵاتانی دەرەوەی جیهان*

لە کۆی نزیکەی دووسەد وڵاتی ناوەوەی سیستەمی نێودەوڵەتی بەلانی کەم سێ چارەگی دەتوانرێت پۆلێنی سەر وڵاتانی دەرەوەی جیهان بکرێن. لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا. ئەو وڵاتانە کڕیار بوون نەك بەرهەمهێنەر، هێنەر بوون نەك نێرەر. لەبارەی ئایدیاو بەرهەم و نەریتەکانیشەوە لاسایی کەر بوون نەك داهێنەر. قوتابی چینی چوونە ویلایەتە یەکگرتووەکانی



ئەمریکا بۆ خوێندنی ئەندازیاری و پرۆگرامی کۆمپیوتەر و پزیشکی، قوتابی ئەمریکیش چوونە چین بۆ خوێندنی چینی. هەرچەندە ئەو زلهێزانە فرە بوون، بەڵام هەموویان یەك خاڵی هاوبەشیان هەبوو ئەویش پابەندبوون بە دووپاتکردنەوەی ژیاندنی پێوەرە سیاسی و ئابوورییەکان و لیبراڵیزمی نێودەوڵەتی. دڵسۆزی و قوڵایی ئەو پابەندبوونە بە شێوەیەکی بەرچاو تەشەنەی کرد. لە زۆر حالەتدا بە تەواوی بەلاغی بوو. تەنانەت بە ئیرادەی ئەنجامدانی ئەم کارەش، توانای بەکارهاوردەی دەزگاو نەریتە لیبراڵییەکان هەمەجۆر بوو. زۆر گۆڕانی جوگرافی بەرچاو لە هەردووا باردا ڕوویدا. گەر وڵاتە زلهێزەکان لە کۆتایی دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا بۆ پێوانی لیبراڵیزمی سیاسی و ئابووری مژول بووان ئەوا بە گوێرەی هەرێم کۆدەبوونەوە، لە ڕووی ئابوورییەوە، ئاسیای رۆژهەڵات هەنگاوی یەکەمی نا، بە ڕادەیەکی کەمتر لە ڕووی سیاسییەوە ئەمریکای لاتین لە پاڵ هەردوو باردا بوو، هیندستان (، بەڵام نەك باشووری ئاسیا) لە پاش ئەواندا هات، دواتر رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئاسیای ناوەڕاست دوای هەموانیش ئەفریقیا.

بابەتی سەرەکی مێژووی وڵاتانی دەرەوەی جیهان لە ماوەی دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا، لە کۆتایی ململانێی رۆژهەڵات و رۆژئاوادا، هەوڵێك بوو بۆ تەبەنی کردنی لیبراڵیزمی ئابووری و سیاسی. ئەم پرۆسەیە لە هەندێ وڵاتدا ئاسایی بوو، بۆ هەندێکیشیان دووچاری گەلێ تووندوتیژی بوونەوە، بەڵام لە هەمانکاتدا، دادگاییەکانی وڵاتە زلهێزەکانی دوای جەنگی سارد زۆرجار تراژیدیای مەحەلی و گرفتی هەرێمی بوون، بۆیە لە ڕاستیدا کێشەی نێو دەوڵەتی نەبوون. وڵاتانی دەرەوەی جیهان کێشە بوون بۆ ناوەوە، بەڵام وڵاتانی ناوەوەی جیهان بە هیچ جۆرێك کێشە نەبوون بۆ دەرەوە. لە ڕووی چەمکی ئابوورییەوە ئەمە هەمیشە وابووە. هەروەها گرینگی ئابووری وڵاتانی دەرەوەی جیهان بۆ ناوەوە تاڕادەیەك زیادی کرد لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا، بەڵام لە ڕووی ئاسایشەوە پێچەوانەی ئەمەی سەرەوە ڕاست بوو. لەگەڵ کۆتایی جەنگی ساردا، گرینگی وڵاتانی دەرەوەی جیهان هەمان ئەو گرینگییەی پێشوی نەبوو بۆ وڵاتانی ناوەوەی جیهان.

لە کاتی جەنگی ساردا، هەردوو هاوپەیمانێتیە دژیەکەکە جیهانیان وەك داشاڵی شەترەنج سەیرکرد، هەموو بەشەکانی پەیوەست بوون بە سەنتەری ململانێکە. سەربازەکانی جیهان ڤێتنام و کۆریاو ئەفغانستان بوون، بە توندی ململانێی یەکتریان دەکرد، چونکە چارەنووسیان

بەسترا بوو بە ئاسایشی پادشاکانیان کە ئەمریکاو یەکێتیی سۆڤیەت بوون. هەر زلهێزێك باوەڕی وابوو گەر یەکێك لەو سەربازانە لە دەست بدات ئەوا مەوقیعی بێ هێز دەبێت. پادشاکان ترسان لە لەدەستدانی سەربازەکانیان، لەدەستدانی سەربازێك و دووان دەببوە هۆی هەڕەشە بۆ سەر نیشتمانەکەیان.

سەربازەکانی جیهان (ڤێتنام و کۆریاو ئەفغانستان) پێش جەنگی سارد گرینگییەکی زۆریان هەبوو. زلهێزەکان بە شێوەیەکی تەقلیدی نیگەران بوون لەوەی کە هەر دۆڕانێك لە سەر وڵاتێکی بێهێز زنجیرە بەرپرچدانەوەیەکی دوژمنکارانە دەست پێ دەکات کە لە کۆتاییدا دەگاتە زلهێزەکان خۆیان. ئەسینایییەکان (کۆرسیرا)یان داگیر کرد لە سەدەی پێنجەمی پێش زایین (بە پێی حیساباتی سوسیددیدس) بۆ ئەوەی نەهێتە ژێر کۆنترۆڵی ڕکابەرەکانیان کە سپارتانییەکان بوون. ڕۆمانە کۆنەکان گورزی ئیمپراتۆری خۆیان فراوانکرد بۆ دروستکردنی دژایەتی لە نێوان هەرێمەکانیان و ڕکابەرەکانیان. ئیمپراتۆری بەریتانی بەم شێوەیە لە ئەفریقیا گەشەی کرد. بەریتانییەکان  دەستیان بەسەر هەرێمە هاوسێکاندا گرت بۆ پاراستنی کەناڵی سوێس و هیڵی هیندستان، دواتر هەرێمە هاوسێکانی بە گژ یەك وەنا تاوەکو نکۆڵی لە یەکتر بکەن و یەکتری ڕەت بکەنەوە. تاکە هۆیەك لە دروستبوونی ئیمپراتۆری ئەمریکا لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا دەگەڕێتەوە بۆ تموحی زلهێزەکان. ئەم تەوژمە بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زۆر بەهێز بوو. ناسرا بە تیۆری " دۆمینە"، بە پێی ئەم تیۆرەش، ئاسایشی ئەمریکا لە سەر نەهێشتنی دۆڕانی سیاسی و سەربازی وەستابوو کە دەبووە هۆی زنجیرەیەك بەرپەرچدانەوە، وەك کەوتنی ڕیزی دۆمینە بە دوای یەکدا، ئەم بەرپەرچدانەوانەش لە کۆتاییدا دەگەیشتە ئەمریکا.

بەڵام لە کۆتایی جەنگی ساردا، زلهێزە ڕکابەرەکان گەر هەموو کاتێك دامرکاو نەبووبن ئەوا بەلانی کەم لەکار کەوتبوون. سەردەمێك کە وڵاتانی ناوەوە و دەرەوەی جیهان بە یەکەوە بەسترا بوون، لێك جوداکرانەوە. لە ڕووی ئاسایشەوە، بە پێچەوانەی ئابوورییەوە، جیهان بەرەو جودابوونەوە نەك گرێدان چوو. ئیتر هیچی تر قەرەباڵغی لە سەر یەك داشماڵی شەترەنج نەما. لە سەرەنجامی جەنگی ساردا، وڵاتانی ناوەوە و دەرەوەی جیهان بوون بە هاوسێی جیا جیا یەکتر لە یەك شاری گەورەی وەك ئەمریکا کە تیایدا قات و قڕی و هەژاری هەندێ جار ئازاری دەدات، ئەمە لە کاتێکدا ناوچە ئارام و کاریگەرەکان بەرگەی ئەو قات و قڕی و هەژارییەیان،



بەڵام سەبارەت بەو یاسایە گشتییەی کە وڵاتانی دەرەوە گرفت نین بۆ وڵاتانی ناوەوەی جیهان سێ شتی جیاوازی زۆر سەرەکی هەن.

ئەو سێ شتەش کانزا و نەوت و جۆرێك لە چەکی ناوکی و کاری ئاشنای تیرۆریزمە. هەرسێکیان لەگەڵ مۆدێرن تێکەڵ کران. زەوی کۆن داماڵرا خەڵوز شوێنی گرتەوە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم کاتێ سەرچاوەی سەرەکی ووزە ئابووری پیشەسازی بەهێز کرد و بوو بە پێویستییەك بۆ کۆمەڵگای وڵاتانی ناوەوەی جیهان هەروەك چۆن ئاو و ئۆکسجین بۆ ژیانی مرۆڤ پێویستییەکە. لە سەرەنجامی ئیکتشافەکانی زانستی مۆدێرن چەکی ناوکی سەریهەڵدا و کۆشندایەتی چەکی بۆ جەنگ زیاتر کرد. تیرۆریزم، کە هێرش دەکاتە سەر مەدەنی بۆ مەبەستی سیاسی، دەگەڕێتەوە بۆ کوشتن و بڕینی میزۆپۆتامیا لە سەدەی یانزە، بوو بە خاسیەتێکی ناسراوی سیاسەتی ئەوروپا لە سەدەی نۆزدەو بیستەمدا. هێرشبەرانی یانزەی سێپتێمبەر پەیوەندیان بە یەکەوە دەکرد لە ڕێگای تەلەفۆن و ئینتەرنێت کە وەك چەك بە کاریان هێناو ئەو چەکانەش جیا بوون لەو خەنجەرانەی کە بکوژەکان خەڵکیان پێ دەکوشت لە سەردەمی میزۆپۆتامیا، بەڵام ئەوان هێزی ئاسمانی مۆدێرنیان بەکارهێنا.

هەرسێ شت کاریگەریان لە سەر وڵاتانی ناوەوەی جیهاندا هەبوو، بە چەشنێك وای لێهات هیچ بەشێکی وڵاتانی ناوەوە نەیدەتوانی بێ نەوت هەڵبکات و لە مردن ڕابکات لە بەر هێرشی ناوکی، هەروەرها هیچ وڵاتێکیش بێ بەش نەبوو لە هێرشی تیرۆریستی. لە هەر شوێنێك مەسەلەی نەوت و چەکی ناوکی و تیرۆریزم هەبوایە وڵاتانی ناوەوەو دەرەوەی جیهان بە یەکەوە گرێ دەدران. کۆششی وڵاتانی ناوەوەی جیهان بۆ دڵنیابوون لە هەبوونی نەوت و قەدەغەکردنی بڵاوبوونەوەی چەکی ناوکی لە سیستەمی نێودەوڵەتی بەرامبەری پێوەری تەندروستی گشتی بوو کە لێناگەڕێت نەخۆشی تەشەنە بکات. هەروەها لە سەرەنجامی جەنگی ساردا ئەو کۆششانە جەختیان لە سەر یەك هەرێم کردەوە ئەویش ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوو.

وەك بەشەکانی تری وڵاتانی دەرەوە، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست داهێنانە کەلتوورییەکانی بەکارهێنا تا وەك وڵاتانی دەرەوە بەرهەمی هەبێت، لەکاتێکدا لە مێژووی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەمیشە ڕۆژئاوا والبووە بەسەر ئەو هەرێمەدا. لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا تا کۆتایی سەدەی بیستەم کۆمەڵگا مەحەلییەکان بەدوای هەمان ئەنجامدا هاتوون. پشت گوێخستنی وڵاتانی ناوەوەی ڕۆژئاوا و بەرگری کردن و دواتریش وەك وڵاتانی دەرەوە ڕایان کرد

لە تەوجیهاتی رەسمی وڵاتانی ناوەوەی ڕۆژئاوا و لە دەمەتەقێی سنوور و ئاستەنگەکان لەمڕ دروستکردنی وڵاتی مۆدێرن، بۆیە لەم ڕووەوە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئازاری چەشت.

رۆژهەڵاتی ناوەڕاست جیابوو لە وڵاتانی دەرەوەی جیهان. ئەمە نیشتمان بوو ئامادەبوو بۆ جێهێشتنی سووتەمەنی لەسەر ئەم هەسارەیە لەکاتێکدا، وڵاتانی ناوەوە کەم و کورپیان لە سووتەمەنی هەبوو، بەڵام خۆزگەی داواکردنیان دەخواست. چەکی ناوکی و ئەو مەسەلەیە پاڵپشتییەکی لۆجستی و دارایی و پەناگەیەکی سەلامەتی بۆ ڕێکخراوەکانی تیرۆرستیان رەخساند کە ئەندامەکانیان لە دانیشتوانی ئەو ناوچەیە (ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست) بەدەستهێناوە. نەوت و چەکی ناوکی بەشێك بوون لەو جەنگەی کە وڵاتانی ناوەوەی جیهان لە دەیەمی یەکەمی دوای جەنگی سارد تیایدا جەنگان. مەبەستی جەنگی کەنداوی ساڵی (١٩٩١) کە بەسەرکەوتوویی ئەنجامدرا بۆ وەدەرنانی هێزەکانی عێراق بوو لە کوێت کە ناوچەیەکی بچووکی دەوڵەمەندە لە نەوت کە عێراقییەکان لە مانگی هەشتی (١٩٩٠) داگیریان کردبوو. جەنگی کەنداو خاسیەتی سەرەکی پەیوەندییەکانی دوای جەنگی ساردی دانا لە نێوان وڵاتانی دەرەوەی جیهان. بە ئاشکرا بنەمایەکی بنەڕەتی لە یاسای نێودەوڵەتی هەڵقولا بۆ دووپاتکردنەوە لە پیرۆزی سنوورەکانی وڵاتەکان کە داگیرکاری عێراق پێشێلی کردبوو، بەڵام وڵاتانی ناوەوە هەستان بەکردەی سەربازی لە ترسی ئەوەی گەر دیکتاتۆری عێراق سەدام حوسێن کوێتی داگیرکردبا ئەوا دەستی بەسەر سعودیەش دادەگرت کە گەورەترین ناوچەی نەوتە لە جیهان، لەو باوەڕشدا بوون کە سەدام حوسێن بەرنامەی چەکی ناوکی لەبەردەستدایە.

ویلایەتە یەکگرتووەکان سەرکردایەتی هەڵمەتێکی کرد بۆ وەدەرنانی عێراق لە کوێت و هاوپەیمانێتییەکی فراوانی نێودەوڵەتی کۆکردەوە بۆ وەستان لە دژی سەدام حوسێن، لە کاتێکدا سوپای ئەمریکی زۆربەی شەڕەکەی کرد. بەسەرێکی تر، جەنگی کەنداو، سەدەی پەیوەندییەکانی نێوان وڵاتانی ناوەوەو دەرەوەی جیهان لە دوای جەنگی سارد بوو، تاکە ململانێیەك بوو لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی سارد. زۆر جەنگی تر هەبوون، بەڵام لە هیچ یەکێکیان رەوشی سیاسی و ئابووری لە بەرژەوەندی ویلایەتە یەکگرتووەکاندا نەبوو یان بۆ هەر زلهێزێکی تر بۆ ئەنجامدانی کردەی سەربازی لەکاتێکدا خۆی خستە ئەو هەموو قوربانیە.

جەنگەکە ئەو کێشانەی یەکلایی نەکردەوە کە لە سەری دەجەنگا. سەرەڕای دۆرانی سەربازی سوپای عێراقی کە بە سەد سەعات لەکوێت دەکرا، هەروەها سەرەڕای تێکدانی



پرۆگرامی چەکی ناوکی عێراق بەهۆی بۆردومانی ئەمریکا لە هەفتە سەرەتاییەکانی هێرشەکاندا، دەرەنجامی جەنگەکە ئەوەی دووپات نەکردەوە کە رۆژئاوا پەیوەستە بە نەوتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەروەها هیچ لایەنێکی تری قەدەغە نەکرد لەوەی چەکی ناوکی بگات بە دەست سەرکردەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و دژی ڕۆژئاوا بەکای ببەن.

دەیەك دوای جەنگی کەنداو، هێرشێك بۆ سەر نیۆیۆرك و واشنتۆن لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە هات، کە پەیوەندی بەهەر دوو سەرچاوەکەی تری بەرژەوەندی وڵاتانی ناوەوەی جیهان لە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەبوو. ئەوە پارە و دەریای نەوتی ناوچەکە بوو ئەو هێرشانەی دروستکرد.. لە سعودیە کە دەوڵەمەنترین وڵاتە لە نەوتدا سەرکردەی گروپی تیرۆرست (ئوسامە بن لادن) پەیدا بوو. زۆربەی ئەوانەی فرۆکەکانیان فڕاند بۆ سەر سەنتەری بازرگانی جیهانی و پنتاگۆن ئوسامە پارە و دەدانێ و پاڵپشتی دەکردن کە سەرچاوەکەی لە ئەفغانستان و خانەی لە وڵاتانی تریشدا هەیە. گەورەترین مەترسی لە سەدەی بیست و یەکدا ئەوەیە گروپە تیرۆرستییەکان چەکی بە کۆمەڵ کوژ بەکاربێنن، بەڵام ئەوەی گرنگ بێت ئەوەبوو رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەشێك نەبوو لە وڵاتانی دەرەوەی جیهان، بەڵکو توانایەکی زۆری هەبوو وڵاتانی ناوەوەی جیهان تووشی هەرەس هاوردە بکات. ئەو جیاوازییە دەگەڕێتەوە بۆ هەردوو وڵاتە گەورەکەی ئۆرتۆدۆکسی کۆمۆنیست کە دوژمنی گەورەی لیبراڵیزم بوون لەکاتی جەنگی ساردا ئەوانیش ڕوسیا و چین بوون.

### دووره پەرێزەکان

ئەڵمانیا و ژاپۆن و روسیا و چین ئەزموونی مێژووی هاوشێوەیان هەیە لە چاخی مۆدێرن و رۆڵێکی بەرچاویان لە جیهانی دوای جەنگی سارد گێرا. پێش چاخی مۆدێرن ئۆتۆکراسی تەقلیدی بوون، بە گشتی دوای چاخەکە مۆدێرنی سەرکەوتوو بوون. لە کاتی پێتەری گەورەوە لە کۆتایی سەدەی حەڤدەهەمدا، ڕووسیا یەکێك لە هەرە زلهێزەکانی ئەوروپا هەژمار دەکرا. لە تەواوی دوو سەدەی دوای حەڤدەهەمدا، ڕژێمی قەیسەر تەشەنەی کرد لە باشوور و رۆژهەڵات زیاتر لەوەی لە کاتی شەڕدا هەبوو و دیپلۆماسیشی لە رۆژئاواوە فراوان بوو. چین مێژوویێکی درێژترو شکۆمەندتری هەبوو پیش چاخی مۆدێرن لە کاتێکدا کۆنترین کۆمەڵگای سیاسی بەردەوامە لە جیهان کە ڕەچەڵەکی دەگەڕێتەوە بۆ هەزارەی سێیەمی پێش زایین. بە هەموو

پێوەرێکەوە چین سەرکردەی هەموو جیهـان بـوو لـەو کاتـەدا، گـەورترین و زۆرتـرین ژمـارەی دانیشتوان و دەوڵەمەندترین وڵات بوو. لە ڕووی هونەر و تەکنـەلۆژیاوە پێـشکەوتووترین وڵات بوو هەروەها بەهێزترین هێزی سەربازی هـەبوو. لـە سـەدەی یانزەهەمـەوە بـۆ پانزەهـەم چـین زلهێزترین وڵات بوو لە ئەوروپا، سەرچاوەی داهێنان بوو، سەرچاوەی کـەلتوور و کـەل و پـەل و شتەکانی تر بوو بە ئەوروپییەکانیشەوە.

وەڵامدانەوەی ئەو بەرەنگارییەی کە شۆڕشی فەرەنسی و پیشەسازی بۆ هەموو کۆمەڵگا تەقلیدییەکان خستیانە ڕوو، ڕووسیا و چین بە دوای هەمان کۆرسی هاوشێوە کەوتن. هەردوو ئۆتۆکراس لە هەوڵی مۆدێرنکردنی خۆیاندا بوون تاوەکو بەرگریی لە خۆیان بکەن و خۆیان بپارێزن. هەردووك فەشەلیان هێنا، هەرچەندە شێوازی فەشەلییەکەیان جیا بوو لە یەکتر. ڕژێمی تەقلیدی چینی جوودابۆوە لە بەشی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا، کاتێ ئەوروپییەکان پێگەی خۆیان دامەزراند لە سەر کەرتەکانی خۆیان بۆ بازرگانی کردن لەگەڵ ناوەوەی جیهان بە هاوکاری هێزی کۆمۆنیست لە ساڵی ١٩٤٩. کۆتایی ڕەسمی دوا ئیپراتۆری بنەماڵەی چینییەکان کە کینگ بوو لە ساڵی ١٩١١ زۆر ئازاری بە چینییەکان گەیاند. بە پێچەوانەوە، ئۆتۆکراسی ڕووسیا کتوپڕ ڕووخا لە کاتێکدا لە دۆڕانی مەیدانی جەنگی ساڵی ١٩١٧دا تێکشکان.

لە هەردوو حاڵەتدا، نالیبراڵیزمی کۆمۆنیست ئەو بۆشاییە سیاسیەی پڕکردەوە کە بەهۆی ئۆتۆکراسییەتەوە دروست ببوو. هێزەکانی کۆمۆنیست لە نووکەوە، بە نهێنی پارچە پارچە دەستی پێکرد، بە سەرکردایەتی دوو سەرکردەی بە تاکتیك و خەیاڵی و نەگۆڕ و کەللە ڕەق ئەونیش لینین و ماو (Mao) بوون، مژوڵی بردنەوەی شەڕی ناوەخۆ بوون بۆ دەستەبەرکردنی دەسەڵات. هەر کە دەسەڵاتیشیان وەرگرت، هەر ڕژێمە و هەستا بە جێبەجێکردنی بەرنامەی سۆشیاڵ ڕادیکاڵ و گۆڕانی ئابووری.

بە پێی هەندێ پێوەر، بۆ ماوەیەك کۆمۆنیزم لە ڕووسیا و چین سەرکەوتنی بە دەستهێنا و حیزبە کۆمۆنیستییەکان دەسەڵاتیان گرتە دەست. لەگەڵ گرتنە دەستی ئەو دەسەڵاتە هەموو پاشماوەی کۆنیان تێك و پێك شکاند. بەهۆی چەوساندنەوەو لە سێ دارەداندا، ڕکابەرە بەهێزەکانیان شکاند و دووریانیان خستنەوە.



ناخی پرۆگرامی ئابووری کۆمۆنیستیان جێبەجێکرد، سامانی تایبەتیان هەڵوەشاندەوە. ئەوەی مەبەستیان بوو بونیاتیان نا کە کرۆکی ئابووری مۆدێرن و بەهێزکردنی بازووی سەربازیان بوو، ئابوورییەك جەختی لە سەر پیشەسازییەکی چڕ دەکردەوە.

هەموو ئەمانە بە نرخێکی زۆر گران بۆ کۆمەڵگای چینی و ڕووسیا پێش هات. نرخەکە زۆر بەرز بوو بە تایبەتی بۆ کەرتە لادێییەکان. لە هەر وڵاتێك کە ڕژێمی کۆمۆنیست جەنگی لە دژیان بەرپا کرد بە مەبەستی سەرکوتکردنی خاوەن زەوی و زارەکان هەروەها بڕینی ئەو هاوکارییەی کە بۆ بەهێزکردنی بەرنامە پیشەسازییەکانیان بەکاریان دەبرد. سەرەڕای نرخەکانیان، ئەو بەرنامانە ئامانجی گشتی خۆیان بە دەست هێنا. لەو شوێنانەی کە ئیپراتۆرەکانی پێشوویان هەرەسی هێنا بوو حکوومەتی کۆمۆنیستیان بەهێز کرد تا سەربکەون و هەرێمەکانیان بپارێزن دژی ئەو دراوسێیانەی کە لە ڕووی ئابوورییەوە پێشکەوتوو بوون. کاتێ ماو زیدۆنگ (Mao Zedong) دەروازەی ئاشتی دروستکرد لە سەنتەری بێجێنگ، لە مانگی ١٠ ی ساڵی ١٩٤٩ بە گەلی کۆماری چینی وڵات " چین کەوتەوە سەرپێ".

سەرکەوتنی سۆڤیەت گرینگترو کاریگەرتر بوو. وڵاتەکە لەگەڵ لێشاوی داگیرکاری ئەڵمانیا لە جەنگی جیهانی دووەم، بەرزترین باجی دا بە خوێن بۆ گەلێ لە ئەندامانی هاوپەیمانی دژی نازییەکان. لە کۆتایی جەنگدا، سوپای سوور (The Red Army) بە درێژایی ڕۆژئاوا بەرەو جەرگەی ئەڵمانیا چوو.

لە هەردوو حاڵەتدا، سەرکەوتنی سەربازی ڕژێمەکان خۆی دەپاراست، دواتر بە لانی کەم ئەو پێورە ئابووریانەی کە بەرهەمی پیشەسازی و پێشکەوتنی تەکنەلۆژیان بەرهەم هێنا، بەرهەمی چەکی ناوکی لێکەوتەوە کە نمایشی سەربازی پشتی پێ بەستا. هەر ئەو شەرعییەتەی کە ڕژێمەکان لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا بەکاریان هێنا لە هیچ بەشێکی بچووکی ناوچەی خۆیان نەبوو، بەڵکو بۆ بەرگریکردن لە سنوورەکانیان بوو، بەڵام بۆ ماوەیەکی درێژ، هەوڵی کۆمۆنیست بۆ هەڵسوڕاندنی ئابووری هەرەسی هێنا. لەگەڵ زلهێزی لیبراڵ لە چەك یەکی دەگرتەوە نەك لە کەرە. ئەو فەشەلەش، تیکەڵ بوو لەگەڵ ناکاریگەری نالیبراڵیزمی کۆمۆنیست کە بووە هۆی داماڵینی دەزگا کۆمۆنیستەکانی هەردوو وڵات. کۆمیۆنیزمی ئۆرتۆدۆکسی وەك ئۆتۆکراسی تەقلیدی بە هەمان چارەنووس گەیشت، بە هەمان شێوەش، لە چین وردە وردە لێکترازان. لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا، ئابووری

کۆمۆنیست بە شێوەیەکی فراوان بەلاوەنرا و ئایدیۆلۆژیەتی کۆمۆنیست نامەیەکی مردوو بوو، بەڵام حیزبی کۆمۆنیست وەك دەسەڵاتێکی سیاسی قۆرخکەر لە وڵاتەکەدا مایەوە. بە پێچەوانەوە، یەکێتیی سۆڤیەت لە ناکاو ڕووخاو بە تەواوی لە ساڵی ١٩٩١دا سیستەمی سیاسی و ئابووری و وڵاتەکە خۆی ون بوو.

لە سەرەنجامی جەنگی ساردا، ئاسانتر بوو کە بڵێی بۆچی ئەو دوو وڵاتە وەك پێشتر نین. هەردووکیان، لە ڕووسیا لینینیزم و مارکسیسزمی ئۆرتۆدۆکسیی بەلاوەنا و لە چینیش لینینیزم و مارکسیسزمی ماویزمی بەلاوەنا، بەڵام لەگەڵ ئەوەش هیچ یەکێکیان نە لیبراڵ نە مۆدێرن نە دیموکراسی پیشەسازی بوون. ڕووسیاش وەك هەندێ زلهێزەکانی جیهان لە هەموو ڕوویێکەوە نەگەڕایەوە سەر بێ هێزی. لە ڕووی سیاسییەوە ڕێو شوێنی خۆیان وەردەگرت وەك لە جەنگی ساردا کردیان. لە ڕووی بازرگانی و وەگەڕخستنیشەوە ڕووسیا جێی پەنجەی دیار نەبوو، هەرچەندە کاریگەری چین لە سەر ئابووری جیهان بە ڕێژەیەکی سەرنجڕاکێش گەشەی سەند.

کاتێ ئەو ڕژێمانە وێڵ نەبوون بەدوای گەڕاندنەوەی یاسای دوای جەنگی سارد، بە تەواویش پابەن نەبوون بە سیاسەتی لیبراڵ و ئابووریی بازاڕو لە سەرووی هەمووویشیانەوە سیاسەتی ئاسایشی لیبراڵ. هەروەها تا ئەو ڕادەیەی پابەندبوونیان، گومان لە توانایاندا هەبوو بۆ دامەزراندنی دەزگای لیبراڵ و جێبەجێکردنی نەریتە لیبراڵییەکان. ئەوەی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بە بەریتانیای وت لە کۆتایی جەنگی جیهانی دووەم ئەوە بوو کە بەریتانیا ئیپراتۆری لەدەستدا و دەبوایە ڕۆڵێك بۆ خۆی بگێڕێ، ڕاست دەرچوو لە سەر ڕووسیا و چینی دوای جەنگی سارد. سیستەمە ئابووری و سیاسییەکانیان، سیاسەتی دەرەوەیان، شوێنیان لە ڕێزبەندی نێودەوڵەتیدا، بەکورتی هەموو هۆکارەکانی ئەو خەزانە لە لایەك خاسیەتی سەرەکی وڵاتی زلهێز لە لایەکی ترەوە، هەمیشە لە گۆڕاندا بوو.

لە ڕوانگەی لیبراڵیزمی نێودەوڵەتیدا، ڕیزبەندی ئارەزوومەندانەی دوای جەنگی سارد بۆ ڕووسیا و چین لە ژێر دەستی ئەڵمانیا و ژاپۆندا بوو لە کاتی جەنگی جیهانی دووەم. ئەوەی بەرەنگاری دەکرد کۆڵەگەی گۆڕان بوو. گەر ئەرکی سەرەکی زلهێزە لیبراڵییەکان لە کاتی جەنگی ساردا ڕێگەگرتنی نالیبراڵیزمی کۆمۆنیست بوویێت، ئەوا گەورەترین ئامانج لە دوای جەنگی سارد گواستنەوەی دەزگاکانی ڕکابەری پێشوویان بوو هەروەك دوای جەنگی جیهانی دووەم، بەڵام بارودۆخەکان جیا بوون، شیاوتریش بوو لە کۆتایی جەنگی سارد لەچاو پێشتر لە



ساڵی ١٩٤٥، چونکە ڕووسیا و چین ئەزموونی کەمتریان هەبوو لە پێشدا لەگەڵ سیاسەتە دیموکراسیەکان و ئەزموونی کەمتریشیان هەبوو لە ئابووریی بازاڕ لە چاو ئەڵمانیا و ژاپۆن.

وێڕای ئەمە، ڕێچکەی ژاپۆن و ئەڵمانیا بۆ ئەندامێتی زلهێز ساف بوو، لە کاتێکدا چەوت و نانێودەوڵەتی بوو، ئەمەش بەهۆی دۆڕانە وێرانکەرەکانی لە جەنگی جیهانی دووەم و سەرەتای جەنگی سارد. لە ١٩٤٥ داگیرو پارچە پارچە کران، بۆیە هیچیان نەبوو بەرگری ئارەزووەکانی داگیرکەرەکان بکەن. ڕووسیا و چین لێکترازان بەهۆی بۆگەن بوونی کۆمیونیزم، بەڵام کارگەکانیان تێك نەشکێنران بە هۆی بۆردومانەکان لە کاتی جەنگی سارد و دەزگاکانیشیان لە دوای جەنگی سارد لە ژێر چاودێری ڕۆژئاوا سەرنەدەکەوت. لەگەڵ ئەوەش، لە دەرەنجامی جەنگی جیهانی دووەمدا، ویلایەتە یەکگرتوەکان یەکەم کاری دەستپێکردنی گەشەی ئابووری لە ئەڵمانیا و ژاپۆن، باشتر ڕووبەڕووی یەکێتیی سۆڤیەت بوونەوە. لە هەمانکاتدا، هاوپەیمانەکانیان لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکان پێداویستیان دابینکرد بۆ ئەڵمانیا و ژاپۆن تا بەخێرابی بە دوای سیاسەتەکانی ئاسایشی نێودەوڵەتی بکەن. لە بەرامبەر ئەوەدا، زەمینەیەکی باشتر بۆ سیاسەت و ئابووری لیبراڵ لە حالەتەکە ڕەخسا، سیستەمی لیبراڵیان بەلاوەنا و هەردوو وڵات سیاسەتی ئاسایشیان بە ئەرێ بەکاربرد. لە سەرەنجامی جەنگی سارد، ڕووسیا و چین یارمەتی ئابووری و پاراستنی سەربازی پێ نەگەشیت، هەروەها لە هیچ کامیان لیبراڵیزم شوێنێکی نەبوو بۆ پەیڕەوکردن.

یەکێك لە خاسیەتە تایبەتییەکان چەوساندنەوەی دەروونی بوو کە ئۆرتۆدۆکسی کۆمۆنیست لە دوای خۆی بەجێی هێشت. هەر یەکە دووجار دووچاری ئەمە بۆوە، قوربانییە هەمەجۆرەکانی هەردووکیان بەهۆی نالیبراڵیزمی سەدەی بیست بوو. دڵی هەردوو فاشیزم و کۆمیۆنیزم جەنگ بوو. ململانێی سەرەکی بۆ ئەڵمانیا و ژاپۆن دژی ئەوانی ترو ئەو گەلەکەمینانە بوون کە ئەوانیان دەدی. ئەو ململانێیان بەرپا کرد لەگەڵ دڕندەی تایبەت دژی گەورەترین دراوسێیان ئەوانیش ڕووسیا و چین بوون. بۆ نالیبراڵیزمی کۆمۆنیستیش دوژمن نەتەوە جیاوازەکان نەبوون بەڵکو ئەو ئەندامانە بوون کە حیزبی کۆمۆنیست وەك گرووپی کۆمەڵایەتی ناوخۆ بە هەڵە نەخشەی بۆ کێشا بوو، ئەو خەڵکانە بوون کە موعارز بوون، یان ئەوانەی نیازی دژایەتی یاسای کۆمۆنیستیان هەبوو. پۆلێنکردنە بە گومانەکە هەموو کەسێکی گرتە خۆ. کۆمیۆنیزم لە دەسەڵاتی ڕووسیا و چین وەك داگیرکاری ژاپۆن و ئەڵمانیا بۆ

ولاتانی تر، کرۆکی ئەو جەنگە بوو دژی گەلی ڕووسیا و چین. کەواتە لە سەدەی بیستدا نەك هەر تەنها لە نیوەی یەکەمی، چارەنووسێکی نیگەران بوو گەر لە هەر یەك لەو ولاتانەدا لەدایك بووبای. زیانەکە بە ناچاری هەولەکانی چین و رووسیای شێواند و پەرتەوازەکرد بۆ بەکارهاوردەی پێوەرە لیبرالەکان وەك وجودی نەتەوەیی ئاسایی، هەروەك پێشێل کردنی منالان و ئازاردانی زیندانیان و بەئاستەم ژیانی کۆمەلایەتی ئاسایی بەردەوام کرد.

وەك ولاتانی تری دەرەوەی جیهان مێژووی دەیەی یەکەمی دوای جەنگی سارد لە رووسیا و چین خرایە روو بەهۆی هەلێك بۆ دامەزراندنی سیستەمی ئابووری و لەگەل قەناعەتێکی کەمتری سیستەمێکی سیاسی لیبرال (لە هیچ بەشێکی حکوومەتی چین) وەك ئەوانی تر، رووسیا و چین زۆر حەزیان دەکرد بەشداری یاسای ئابووری نێودەولەتی لیبرال بکەن، بەلام لەو شوێنەی کە ئاسایش مەسەلە بوو، ئەو دوو ولاتە بارودۆخێکی بێ وێنەیان هەبوو.

لە سەرەنجامی جەنگی ساردا سیستەمی ئاسایشی لیبرال لە روانگەی ودرۆ وێلسنەوە ماوەتەوە، سنوور بۆ چەك لە شوێنی خۆی بوو، بەلام تەنها لە ئەوروپا لەبەرئەوەی ڕوانگەیەکی نوێ و ناسك بوو، لە هەموو شوێنێك دەبخوارد بەمەبەستی وجودی ئاسایشی لیبرال لە ئەوروپا، هەروەها بۆ ڕێکخستنەکانی بەشەکانی تری ولاتانی ناتووی جیهان و رووسیا و چین زەرووری بوون. بە حەقیقەت لە ڕووی ئاسایشی نێودەولەتییەوە ئەو دوو ولاتە زلهێزبوون نەك بێ هێز، لە کاتێکدا بازرگانی نێودەولەتی و سیستەمی چاودێری دەتوانرا بێ ئەوان سەرکەوتوو بێت. بۆ دامەزراندن و پاراستنی ئاسایشی لیبرال لە هەموو هەرێمێکدا کە تیایاندا ئەو جەنگە بەرپا بوو لە سەدەی بیستەم، لە سەدەی بیست و یەکیش دەکرێ رووبداتەوە. ئەوروپا و ئاسایی رۆژهەلات و رووسیا و چین بەشدارییان پێویست بووە. روانگەکان بۆ ئاشتی لە سەدەی بیست و یەك پشت بەو ولاتانەوە دەبەستێت.

# بەشی دووەم

# داهێنانی ئاشتی

ئێمە باوەڕمان بەکەمکردنەوەی چەك هەیە تا ئاستێکی ماقوڵ ئەویش ئەو ئاستە پێویستەیە کە تەنها بۆ بەرگری کردن بێت. ئێستا کاتی ئەوە هاتووە ئەو دوو هاوپەیمانە سەربازییە کە بیرۆکەی ستراتیژی خۆیان چاك کردەوە زیاتر بەرەو مەبەستی بەرگریکردن بچن. هەر باڵەخانەیەك لە ئەوروپا مافی پاراستنی خۆی هەیە دژی دزیکەران، با خۆی بپارێزێت، بەڵام بێ ئەوەی شت لە دراوسێکەت تێکبدەی.

میخائیل گۆرباتشۆف (١٩٨٧)

# چاپتەری -٤-

## (چارەسەرێك بۆ شێرپەنجە)

لەگەڵ داهێنانی دینامێت، بازرگانی سویدی ئەلفرێد نۆبڵ دەزگایەکی بۆ سەرفکردنی خەرجی بۆ خەڵاتی ساڵانە دانا بۆ دەسکەوتی گەورە لە ڕووی فیزیا و کیمیا و پزیشکی و ئەدەب و ئاشتییەوە. یەکەم خەڵاتی نۆبڵ لە ساڵی ١٩٠١ پێشکەش کرا، دواتر بوو بە نەریتێکی تایبەتی گونجاو لە سەدەی بیستەم، بۆ هەر خاسیەتێکی کاری ئەدەبی کە لە ماوەی ئەو سەد ساڵە بەدیارکەوتبا. بێگومان سەردەمێکی مەزنی پێشکەوتنی زانستی بوو. هەروەها لەبەر ئەوەی دەسکەوتی زانستی زۆر هاوکاری بەخشی بە هێزە چەکدارەکانی جیهان لە دروستکردنی کەل و پەلی وێرانکەری جەنگ، گەڕان بەدوای ئاشتی زۆر پێویستر بوو لەچاو ئەوەی لە سەدەکانی ڕابردوو هەوڵی بۆ دەدرا.

خەڵات بۆ زانست و ئاشتی گەلێ جۆر دەسکەوتی لێکەوتەوە. زانست ئەو شتانەی کە وجودیان هەیە دەدۆزێتەوە، بەڵام دروستکردنی ئاشتی شتێکە کە پێشتر وجودی نەبووە. ئەوەی زانستناسەکان دەیدۆزنەوە ڕێسا و یاساکانی فیزیای گەردوونە. ئەو زانستناسانەی کە خەڵاتی نۆبل وەردەگرن، کە کار لە سەر هاوکێشە و شوێنەکان دەکەن، دۆزینەوەکانیان برەوێکە بۆ تێگەیشتن و گۆڕانی جیهان. دروستکەرانی ئاشتی تا کۆتایی سەدەی بیستەم تاکە هەوڵێکیان نەدا بۆ بونیتنانی ئاشتی. بەهۆی نزیکبوونەوەی ئەو جەنگەی لەو سەدەیەدا، بەهۆی پرۆسەی دادگاو هەڵەوە، بە هۆی پاڵنەری تێکەڵ و ئاڵۆز، دەبێ شتێك هەبێت بە کاری زانستی بچێت. هاوکێشەیەك بۆ لابردنی ململانێی سەربازی هەبێت. ئەورووپا کە شوێنی لە دایکبوونی ئەو ئایدیاو دەزگایانەیە کە جیهانی مۆدێرنیان دروستکرد، هەر ئەورووپاش بوو ئاشتی داهێنا. داهێنانێك گرینگییەکەی بە قەد دۆزینەوەکان بوو.





ئەورووپا بە سیستەمێکی ئاسایشی گشتی پێی نایە نێو سەدەی بیست و یەك. حیزبەکان لە ئەورووپا، هەمان سیاسەتی هەماهەنگی خۆبەرگریکردنیان جێبەجێکرد، لە سەر بنەمای تێگەیشتنی ئەوەی کە ئاسایش گرفتێکە لە ڕێگای هەوڵە گشتییەکانەوە چارەسەر دەکرێت. یاسای ئاسایشی گشتی خۆی لەخۆیدا زنجیرەیەك گفتوگۆی لە سەر سنووری چەك لە خۆگرتبوو. لەکۆتایی جەنگی ساردا، هەموو زنجیرەکە بەلایەك مامەڵەکردن و سنووردانان لە سەر چەکی ناوکی بەلایەك. گەلێ پەیمان گرێدران بۆ ئەم مەبەستە: پەیمانی مووشەکی دژە بالیستیك (ABM) ساڵی ١٩٧٢، پەیمانی هێزەکانی بایەلۆژی مەودا-ناوەند (INF)ساڵی ١٩٨٧. پەیمانی ستارت وەن(START I) لە ساڵی ١٩٩١، پەیمانی ستارت دوو (START II) لە ساڵی ١٩٩٣، (سنوورە ئالوگۆڕکراوەکان لە سەر کەمکردنەوەی چەکی بایەلۆژی مەودا کورت)ی یەکێتیی سۆڤیەت و ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٩١، پەیمانی گشتگیری لە سنووری هێزە نابایەلۆژییەکان، پەیمانی هێزە چاکسازییەکان لە ئەورووپا (CFE) ساڵی ١٩٩٠. هەموو ئەو ڕێکەوتنانە بە یەکەوە هێزە چەکدارەکانی لایەنە موعاریزەکانی کاتی جەنگی ساردیان دارشتەوە، ئەویش بە پێی دوو بنەما کە پێکەوە پێناسەی ئاسایشی گشتی دەکەن. بنەمای یەکەم: بوونی بەرگرییەکی زاڵە (Dominance Defense) بە پێی ئەم بنەمایە هێزە چەکدارەکان ئامادە دەکرێن و دەنێردرێن تا بەرگری لە ناوچەیەك بکەن، نەك بۆ هێرشکردن و دەست بەسەرداتگرتنی ناوچەکە. بنەمای دووەم: ڕوونبینییە (شەفافیەت) (transparency)، واتە هەموو وڵاتەکان دەتوانن بۆ خۆیان بزانن هێزە چەکدارەکانی تر چیان هەیە و چۆن و بۆ کوێ دەنێردرێن.

یاسای ئاسایشی گشتی بۆ جەنگ و ئاشتییە هەروەك چۆن دیموکراسی بۆ سیاسەت و بازاڕی ئازادیش بۆ ئابوورییە: هاوکێشەیەکە بۆ بەدەستهاوردەی ئامانجێکی جیهانی خوازراو. ڕوانگەی لیبراڵ سەبارەت بە سیاسەت و ئابووری گالیسکەیەکە بۆ ئازادی ڕەفاهییەت (prosperity)، ئاسایشی گشتیش میکانیزمێکە بۆ ئاشتییەکی بە ئاسایش. هەروەك دیموکراسی و بازاڕی ئازاد سیستەمێکن بۆ کۆمەڵەی ئارەزوومەندانە، بە شێوەیەکی فەرمی بۆ وڵاتانی ناوەوەی

جیهان هێنرانەکایەوە نەك بۆ تاك. وەك دیموکراسی و بازاڕی ئازاد، ئاسایشی گشتی سنوور لە سەر هێزی وڵاتان دادەنێت لە ڕێگای یاسا ناشەخسییەکانەوە. وەك دیموکراسی و بازاڕی ئازاد، ئاسایشی گشتیش بنەڕەتەکەی لە نێو بەریتانی و ئەمریکییەکانە و دروستکراوی مۆدێرنن، لە پێش سەدەی نۆزدەدا کەس خەیاڵی بۆیان نەدەچوو، هەروەها پێش کۆتایی جەنگی سارد واتە لە نێو جەنگەکە مەحاڵ بوون.

ئاسایشی گشتی وەك دیموکراسی و بازاڕی ئازاد ناسرا و بڵاو بۆوە، بەڵام بە شێوەیەکی بەرفراوان دانی پیانەنرا وەك ڕوانگەی لیبراڵ بۆ کێشەی ئاسایشی نێودەوڵەتی. هیچ وتەیەکی کلاسیك نەبوو لە سەر ئەو بنەما نەریتیانە، وەك وتەی هۆبس لە سەر وڵات، لۆك لە سەر ماف، ئادەم سمیس لە سەر بازاڕ. بە جۆرێك لە جۆرەکان نەکردنی قسە لە سەر ئاسایشی گشتی شتێکی سەرسام نەبوو. کاتێ هۆبس و لۆك و سمیس لە بارەی وڵات و ماف و بازاڕ نووسیویانە، ئەو سێ شتە زۆر بە پتەوی دامەزرابوون. لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا، یاسای ئاسایشی گشتی تازە لە ئەورووپا هاتبووە کایەوە. بە هەقیقەت، ئەو کێشەیەی کە ئاسایشی گشتی بۆی هاتە کایەوە وەك ڕێگە چارەیەکی لیبراڵ کێشەیەکی زۆر نوێ بوو. لە کاتێکدا، جەنگ مومارەسەیەکی کۆنە، ئەو ئایدیەی کە جەنگ شتێکە دەبێ هەڵبوەشێتەوە لە سەردەمی مۆدێرندا بەرەو پێشەوە چوو.

تا ئەو کاتەش، ڕادەی نوێیەتی ئاسایشی گشتی وەك ئایدیایەك هۆکاری لێڵبوونی ئەو ئایدیایە نیە. شێرپەنجە نەخۆشییەکی نوێ بوو، لە چاخی مۆدێرندا بڵاوتر بوو لەوەی لە پێش چاخەکەدا لە بەر گۆڕانی شێوازی چیان و ئاستەم بوونی، بەڵام دۆزینەوەی دەرمانێك بۆ شێرپەنجە سەرنجی هەموو جاهان ڕادەکێشێ. بە هەقیقەت، بەراوردێك لە نێوان کۆششی پزیشکی بۆ نەهێشتنی شێرپەنجە و کۆششی سیاسی بۆ نەهێشتنی جەنگ ئاماژە بە هەندێ هۆ دەکات کە سەرەتای ئاسایشی گشتی دوای کۆتایی جەنگی سارد نەچووە نێو خەیاڵی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی.

جەنگ دژی نەخۆشی شێرپەنجە هەنگاو بە هەنگاو کرا نەك بە یەك هەنگاوی گەورە. توێژینەوە چارەسەری نوێ بەرهەم دێنێت لە ڕێگەی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو شتەی کە لەبەردەستدایە ئەویش ئاسایشی گشتی بوو. پەیمانەکان چەند ساڵێکی خایاند تا مۆرکران، یەکەم پەیمان نەبوون مۆر کرابن، گرینگییەکانی ئەو پەیمانانەش هەمان ئەو گرینگی ئەوانەیان





هەبوو کە پێشتر لە شوێنی خۆیان بوون. لەگەڵ ئەوەش پێشکەوتنی چارەسەری شێرپەنجە شێوازی چارەسەرکردنی گەلێ لە نەخۆشییەکانی تری چاکتر کرد، بەڵام هیچ ڕێگە چارەیەکیان هەڵنەوەشاندەوە، بەڵکو وازیان لێهاوردە. بەهەمان شێوەش، مامەڵەکردن لەگەڵ ئاسایشی گشتی تەنها لە ئەورووپا هاتە کایەوە، لەکاتێکدا لەوێش ناسك و تازە بوو.

کەمکردنەوەی حاڵەتی شێرپەنجە لە دانیشتوانێك تەنها پێوستی بە ئامێری پزیشکی تەکنەلۆژی نییە، بەڵکو بە گۆڕانێکی گشتی هەڵسوکەوتی کۆمەڵگاش هەیە. جگەرەکێشانی کەمتر، ڕجیمی تەندروستر، نەهێشتنی کەش و هەوای پیس. یەکەم هەنگاو کاری سەردێرو مانشێتەکانی ڕۆژنامەکانە، بەڵام دووەم کە ئاسایشی گشتیە زیاتر لەوەی یەکەمی دەوێت. بە هەمان شێوە، هەردووی ڕووی مێژوو تێکەڵ بوون بۆ دروستکردنی ئاسایشی گشتی، کە بەرهەمی حاڵەتێکی تیابەت بوو، ئەو دانووسانانەی کە پەیمانەکانی بەرهەم هێنا بەیەکەوە بە ئاڕاستەیەکی تایەبەت کاریان کرد لە سەر برەودان بە بۆچوونی دژی جەنگ لە نێو کۆمەڵگاکانی وڵاتانی ناوەوەی جیهان. ڕووداوەکان کاریگەرییەکی زۆریان هەیە، بەڵام ئەو ئاڕاستەیەی کە کاری لە سەر دەکەیت کاریگەرییەکی ئەوتۆی نییە دواهەمین پرس سەرهەڵدانی یاسای ئاسایشی گشتییە لە ئەورووپا کەچی زۆر کەم سەرنجی پێدرا، پرسەکە بە پێشهاتی زۆر کاریگەر داپۆشراو بوو وەك ڕووخانی کۆمۆنیزم و کۆششی بونیاتنانی ئابووری و سیاسەتی لیبراڵ لە بری ڕووخانەکەی لە ساڵی (١٩٩٠) دا هەروەها سەرنجی جیهان لەسەر یەکگرتنەوەی هەردوو ئیدارەی ئەڵمانیا، ئەمانە هەمپەر بوو لە بەردەم ئاسایشی گشتی نەك هەڵسوڕاندنی ئاڵۆز و درێژخایەنی هێزی غەیرە ناوکی لە ئەورووپا. گواستنەوەی سیاسەت و ئابووری سیستەمی کۆمۆنیستی پێشووی ئەورووپا سەرنج ڕاکێش بوو لەکاتکدا گۆڕانە گەورەکان لە هەڵسوڕاندنی ئاسایش بەو چەشنە سەرنج ڕاکێش نەبوو. سەرهەڵدانی دیموکراسی و بازاڕی ئازاد لە سەرەنجامی جەنگی ساردا جیا بوو لە سەرهەڵدانی ئاسایشی گشتی بەرێگایەکی جیا لە جەنگی سارد. سیاسەت و ئابووری لیبراڵ شوێنی حکوومەتی تۆتالیتاریان گرتەوە و ئابووری پلانی دارێژراو و سەرکەوتنی ئاسایشی گشتی لەلایەکی تر بە پێی ڕوانگەی نالیبراڵ بۆ خزمەتی ئاسایش نەبوو، بەڵکو بە پێی ڕامانە تەقلیدییەکە بوو کە ئۆرتۆدۆکسی نێودەوڵەتی لە چاخی مۆدێرندا تیایدا مایەوە.

شێوازی نالیبراڵی پەیوەست بە شێوازە نێودەوڵەتییەکان کە فاشیزم و کۆمۆنیستەکان لە ئامێزیان گرتبوو جەنگی کردە مەرامێکی باڵای نەتەوەیی لە تێروانینی نێودەوڵەتییەوە، هەموو کەس خوازیاری جەنگ نییە، جەنگ کارێکی جدی نییە، بەڵکو گەمەیەکی نێو سیستەمی نێودەوڵەتییە. بەبێ بوونی هێزێکی گشتی قەدەغەیان کرد لە کاتێکدا جەنگ هەمیشە شیانی ڕوودانی هەیە. وڵاتان هەمیشە وەك مریشکێك وان لە جیهانی ڕێوییەکان گەمە دەکەن، بۆیە هەمیشە خۆیان ئامادە دەکەن بۆ جەنگ. گێرە شێوێنی وەك کێش کردنی زەوی سەراپاگیرە. هەڵسوکەوتی وڵاتانی ناوەوە دیاردەکات و لە ڕووی تەکنیکییەوە کاریگەرییەکەی هەر دەناسنەوە. کاتێ گلاسێك بەردەبێتەوە سەر ئەرزو دەشێکت، بۆ لێکدانەوەی ئەم گلاسە شکاوە دوو هۆ هەیە: هۆی خۆویست: کاتێ یەکێك بە ئەرزی دەکێشی و دە شکێت، هۆی خۆنەویستیش کێش کردنی زەوییە. بەهەمان شێوە: کاتێ هەر جەنگێك ڕوودەدات دوو هۆی هەیە: (ئاستی وڵات)، ئەم هۆیە بەشێکی زۆر گەورە و خولیا و ئایدیۆلۆژی وڵاتانی ناوەوەی جیهانە لە کاتێکدا هەمیشە جەنگ ڕووێکە بەرەو نەمان. هۆی دووەم گێرە شێوێنی سیستەمی نێودەوڵەتیە واتە (ئاستی سیستەم)، تا ئێستا بە دەگمەن سەرنجی ئەم هۆیە دراوە. کاتێ وڵاتانی ناوەوەی جیهان دەجەنگن لە پێناو مەرامەکانیان، کە لە مێژووی نێودەوڵەتی هەمیشە ئەوە ڕوودەدات، ئەوا ئازادن بۆ جەنگ، چونکە لەبەر گێرە شێوێنی سیستەمی نێودەوڵەتییە کە هیچ شتێك نییە بیان وەستێنێت. هۆیەکانی ئاستی وڵات بێزارکەرن بۆ جەنگ، دەوەستێتە سەر ئەوەی وڵاتانی ناوەوە چیان دەوێت. هۆی ئاستی سیستەمیش بەرگریکەرە وەستاوە لەسەر ئەوەی وڵاتانی ناوەوە لەچی دەترسێن، چونکە لە جیهانێکی پڕ لە شەڕانگێزیدا پاڵ کەوتوون، وڵاتە وڵاتانی ناوەوە لەسەر ئەو جیهانە دەژین، یان زۆر نزیکن لەو جیهانە واتە لەسەر لێواری جەنگن، چاوەڕێی یەکێك لە هۆیەکانی ئاستی وڵاتن بۆیان پێش بێت کە هەمیشە مێژووی مرۆڤ پاڵی پێوەناون بۆ ململانێ، بەڵام بەزەییشی تێدا هەبووە.

ژەنەڕاڵ (سوسیدیس)ی یۆنانی لە جەنگکێدا لە نێوان پایتەختەکەی کە ئەسینا بوو لەگەڵ ڕکابەرەکەی کە سپارتا بوو لە سەدەی پێنجەمی پێش زایین، بۆ یەکەم جار سەرنجی دا سیستەمی پێکهاتەی گێرەشێوێنی وڵاتە زلهێزەکان و کاریگەری هێزەکانیان لەسەر هەڵسەکەوتی ئەوان. گێرەشێوێنی خۆراکی ناسەقامگیریە، لە نێو دراوسێکانیدا نووسی ((ڕکابەرێتی هەمیشە مەرجێکی سەربەخۆییە)) دانی بەوە نا کە ئەو دەمەتەقێ سیاسیانەی



کە جەنگی پێلۆسیسەنی بەرپاکرد (Peloponnesian) هەمیشە هۆیەکی ئاستی سیستەمی ململانێ بوو. ئەوەی جەنگی دروستکرد گەشەی هێزی ئەسینا بوو کە سپارتا لێی دەترسا.

(سوسیدیس) دیراسەی جەنگ و ئاشتی دەکرد هەروەك چۆن ئادەم سمیسی ئابووری ناس تۆمارکەری مەرجە ئەساسییەکان بوو کە لە سەردەمی خۆیدا یەکەم کەس بوو پەیوەندییە ڕاستەقینەکانی نێوان وڵاتە زلهێزەکان تۆمار بکات، هەروەها قوتابخانەی شیکاری کە لەو ماوەتەوەو ئێستا ناسراوە بە (ریالیزم).

هەوڵی واقعی پێشبینی ئەوە ناکات کە ململانێی چەکداری خاسیەتێکی بەردەوامی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانە. مێژووی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان مێژووی جەنگ نییە، بەڵکو مێژوویێکی بێ کۆتاییە. بە هۆی هاوسەنگی هێزەوە جەنگ قەدەغە کرا، گەر هاوسەنگی هێز چالاکانە کاری خۆی بکات ئەوا هەڵوێستی هێزە سەربازی لە نێوان وڵاتانی ناوەوەدا ئەوەیە کە کەس هێرش نەکاتە سەر ئەوەی تر، چونکە کەس باوەڕ ناکات بتوانێت سەربکەوێت یان بەلانی کەم کولفەکەی قبوڵ بکات. جۆرە هاوسەنگییەکی ئاوا لە کاتی جەنگی ساردا هەبوو، دوو هێزی گەورەی هاوپەیمانی چەکدا ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوە هەریەکە بەردەوام ئامادەبوون بۆ شەڕ، هەریەکە جۆرێك لە تۆڵە سیاسییەکانی کە وڵاتانی رابردوو لەسەری بەشەڕ دەهاتن لە ئامێز گرتبوو، بەڵام هیچ جەنگێك ڕووینەدا. لە ئەوروپا هەردووکیان وەستان لە شەڕکردن ئاشتییەکی وا بەرچاو هاتە ئاراوە وەك ئاگربەستێکی چەکداری کە جەنگی سارد هێنایە کایەوە وابوو. بە هەقیقەت پەیوەندییەکان لە نێوان هەردوو کەرتە سەربازی و ئایدیۆلۆژییەکان هەرگیز ئاشتیانە نەبوو، بەڵام لەبەرئەوەی بەساقامگیر باس دەکران بە ئاشتی دەخوێندرانەوە.

گەر هاوسەنگی هێز بتوانێ جەنگ دەست بەجێ نەهێڵێت ئەوا وڵاتانی ناوەوەی جیهان دەخاتە سەر لێواری جەنگەوە. کەواتە، مێژووی پەیوەندییە جیهانییەکان مێژوویێکی گونجاوی بێ کۆتاییەو دەرەنجامەکانیشی دیپلۆماسی و ململانێی چەکدارییە. هەروەها لە ڕووی مێژووییەوە، وڵاتەکان لە سەر لێواری جەنگ نامێننەوە. زوو یان درەنگ، هۆی ئاستی وڵات دەیانگۆڕێت. تەنها هۆیەکانی ئاستی وڵات نییە وڵاتەکان بەرەو جەنگ دەبات. قوتابیانی پەیوەندیە نێودەوڵەتییەکان پێی دەڵێن "دڵەڕاوکێی ئاسایش" هەروەها رۆڵی بەشێك لە بەرپابوونی جەنگ دەبینێت. ئەو واقیعەی سەرچاوەی گرتووە لە جەنگ و ئەو هەڕەشە و

ئامادەباشیانەی بەوان دەگات بە ڕێگایەکی پەیوەست و نەبەربینبارە. بۆ نموونە، وڵاتی (أ) ڕەنگە خۆی ئامادە بکات بۆ ئەوەی بەرگریی لە خۆی بکات، بەڵام وڵاتی (ب) بە هێرش تێدەگات و وەڵامی دەداتەوە. زنجیرەی ڕووداوەکان نەویستانە هەردووکیان نزیك دەکاتەوە لە جەنگ. دڵەڕاوکێی ئاسایش ماناوی ئەوەیە کە وڵاتە زلهێزەکان دەتوانن وەك ئۆتێللۆی شکسپیر هەڵسوکەوت بکەن، کە بەرەو کارێکی تراژیدی بەدخوو دەچێت بەهۆی گومانلێکراوە شاراوەکان. لەبەرئەوەی هۆیەکانی (ئاستی وڵات) بۆ جەنگ هەمیشە قەدەغەکراون، هەروەها لەبەر ئەوەی کە دڵەڕاوکێی ئاسایش خاسیەتێکی بەردەوامی پەیوەندی نێوان وڵاتە زلهێزەکانە، لەو ڕوانگە واقیعییەوە جەنگ وەك زستانێکە لە کەش و هەوای باکووردا. ڕەنگە درەنگ بێت، ڕەنگە زستانێکی مامناوەند بێت، درەنگ یان زوو بە هەر شێوەیەك بێت هەر دێت.

دەسکەوتی هەرە گەورەی سیستەمی ئاسایشی گشتی لە ئەوروپا تەعدیلکردنی واقیعە بنەڕەتییەکانی پەیوندییە نیودەوڵەتییەکانە، کە وا لە وڵاتە زلهێزەکان بکات پاشەکشێی زیاتر لە چاو پێشتر لە سەر لێواری ململانێی چەکداری.

ئەو دەزگایەی کە ئاسایشی گشتی لە سەری وەستاوە زۆر فراوانە و لە ڕووی مێژوویشەوە شتی وا نەبووە. هۆیەکانی ئاستی وڵات زوو ئاشنا بوو بە وڵاتان و خێراش دیار نەما، یان بەلانی کەم پەرتەوازە بوو. لە هیچ سەردەمێکدا ئەم ئاستە ڕاست نەبووە. لە پێش کۆتایی سەدەی بیستدا، لە زۆربەی مێژووی تۆمارکراودا، ئەوروپا بەرهەمێکی بەرچاوی هۆیەکانی ئاستی وڵاتی جەنگ بوو. زێڕ و خاك و شکۆمەندی هەمیشە ئامادە بووە لە تێکەڵ کردنی ویستەکان بۆ جەنگ. لە سەرەنجامی جەنگی ساردا بەردەوام بوون تاوەکو ئامادە بن لە زۆربەی شوێنەکانی دەرەوەی ئەوروپا، بەڵام لە وڵاتانی ناوەوەی ڕۆژئاوادا، کۆتایی جەنگ تێکەڵ کرا لەگەڵ کۆمەڵێ گۆڕانی کۆمەڵایەتی فراوان کە لە ماوەی سەدەی بیستدا پێش هات بۆ وەرگێڕانی هۆیەکانی جەنگی ئاستی وڵات کە کەمتر زەق ببووەوە لە چاو پێشتر. لە بەرامبەری ئەمەشدا، ئەو گۆڕانکاریانە پەیوەندی نێوان سوپاو جەنگی گۆڕی.

ودرۆ ویڵسن جەختی لە سەر سنووری چەك دەکردەوە، چونکە باوەڕی وابوو بەرپابوونی جەنگ بەهۆی هەبوونی چەکی زۆرە. کاتێ هۆیەکانی ئاستی وڵات هەبێت، سنووری چەکی خۆیان بزانن هەرگیز جەنگ ڕوو نادات. بۆیە وتە کۆنەکەی ویڵسن ڕاستە کە دەڵێت" وڵاتەکان چەکی یەکسانیان هەبێت نابن بە دوژمنی یەکتر، بەڵام کاتێ یەکێك چەکی زیاتری هەبووی لە



چاو ئەوەکەی تر ئەوا هەستی دوژمنکارانەی لا دروست دەبێت". چەك و سوپا ئامێرن بۆ بەدەستهاوردەی ئامانجی سیاسی کە خاوەنەکانیان بۆی دەجەنگن، بەڵام کاتێ هۆیەکانی ئاستی وڵات سست دەبن، گێرەشێوێنی بۆ ناسەقامگیری دەمێنێتەوە وەك هۆکارێك بۆ جەنگ، کەواتە ڕاستە هۆکاری هەبوونی چەك دەبێتە هۆی تێکدانی ئاسایش. لە سیستەمی ئاسیشی گشتی ئەوروپا لە کۆتایی جەنگی ساردا گێرەشێوینی و تێکدانی ئاسایش کەمبوونەوە لە ڕێگەی دانووسان لە سەر ڕێکەوتن لە سەر چەك، ئەو ڕێکەوتنانەی کە دوو خاسیەتی گرینگی هەیە.

یەکەم، ئەو ناوچانەی کە هێزە چەکدارەکانی لە ئەوروپا ڕێکخستەوە تاوەکو ئامادەیان بکات بۆ بەرگریکردنی ناوچەکان، بەڵام نەك بۆ هێرشیان بکاتە سەرو داگیریان بکات. وڵاتەزلهێزەکانی ئەوروپا بۆیان هەیە بە ئارەزووی خۆایان ستراتیژی خۆیان ڕێك بخەن و خۆیان بپارێزن، بەڵام ئەوانی تر هەراسان نەکەن. بەرگریی زاڵیان دامەزراند وەك بنەمای بەڕێوەبردنی هێزە چەکدارەکان.

بێگومان، هەمیشە کارێکی وا ئاسان نییە بتوانی هێرش و بەرگریکردنی چەکداران لێك جودا بکەیتەوە. هەندێ حار جیاوازییەکان ڕاستەڕێن، لە ماوەی پێش مۆدێرندا، دروستکردنی شوورە بەرگریکردن بوو، بەڵام دانانی تۆپ لە لێوارەکانی واتای هێرشکردن بوو، بەڵام لە چاخی مۆدێرندا، چەك زۆرجار خزمەتی هەردوو مەبەستی دەکرد، بەڵام لە دوا قۆناغەکانی جەنگی ساردا، چەکی ناوکی هێڵێکی جیاکراوەی لە نێوان هێرش و بەرگریکردن دانا. چەکە ناوکییەکانی هەردوو لا زۆر بەهێز بوون، کە هەریەکەیان دەیانتوانی ئەوەی تر سزا بدات و وێرانی بکات، گەر هەر لایەك بەرگەی بەهێزترین هێرش بگرێت ئەوا دروست بێت. بۆیە هیچ لایەك نەویرا هێرش بکات، کە ئەمەش بە تەواوی بووە بەرهەم هاوردەی بەرگریی زاڵ.

حکوومەتەکانی ئەوروپاو باکووری ئەمریکا بە ڕێگایەتی ڕاستەوخۆتر بنەماکانی بەرگری زاڵیان جێبەجێکرد بۆ هێزی غەیرە ناوکی، بە دانانی سنوور لە سەر ئالییەتی سەربازی بەسوود بۆ هێرشکردن وەك دەبابە، تەیارە، سەرباز و عیتاد، هەروەها بە هۆی یەکسان کردنی هەردوولا لە ڕووی هەبوونی چەکەوە.

یەکسانی لایەنی بەرگری پەسەند دەکات، چونکە لە جەنگدا، هەڵمەتی هێرشێکی سەرکەوتوو ئاسایی پێویستی بە ئەولەویاتی باش هەیە، بۆ ئەوەی بەسەر هێرشبەراندا زاڵ بی دەبێ بڕیار لە سەر هەستەکان و زۆرینەی ئالییەتە بەسوودەکان بدەیت.

ڕێکخستنەوەی هێزە چەکدارییەکان لە ئەوروپا بۆ گەیشتن بە بەرگری زاڵ بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بووە هۆی پاراستنی شێرەکە و هێرش نەکردن لە لایەن بەرخەکەوە!. وای لە ئەوروپا کرد ئاسایشێکی تەواو بەرقەراری هەبێت و ببێتە شێرێکی گۆشت نەخۆر.

بۆ پەیڕەوی بەرگریی زاڵ، لە پێناو سەقامگیرکردنی باری کۆمەڵگا نێودەوڵەتییەکان، هەر وڵاتەو دەبێ قەناعەتی بەخۆی بێنێ کە ئەوەی بەرامبەری هەڕەشەیەك نییە بۆ سەر ئەو. ئەمە بنەمای خاسیەتی دووەمی سیستەمی ئاسایشی گشتییە ئەویش: شەفافیەتە. بە پێی ئەم بنەمایە دەکرێ بزانرێت وڵاتان چەند چەکیان هەیەو کەی و بۆچی بەکاری دەهێنن.. داهێنانێکی زۆر گرینگی تەکنیکی لە نیوەی یەکەمی جەنگی ساردا هاتە کایەوە ئەویش: بەکارخستنی سەتەلایت، هەناردنی کامیرا بۆ شوێنی دەرەوەی زەوی بە ئامێری زۆر پێشکەوتوو کە دەتوانێت هەموو شتێك لە ژێرەوە بگرێت. لە سەرەنجامی کامیرەکانیش، دەکرێ چەك بە وردی بژمێری و دەشتوانی هەر لەو ڕێگایەوە بزانی چەند زیادی کردیە.

سەتەلایتەکان سنووریان بۆ چەك دانا کە لەڕووی سیاسیشەوە گونجا بوو. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نیگەران بوو لەوەی نەوەك یەکێتیی سۆڤیەت پابەند نەبێت بەو ڕێکەوتنانەی کە واژۆی کردبوو. پاش هەموو شتێك، کۆمەڵگایەکی داخراو بوو کە تیایدا بێ تاوانترین مەسەلەی گشتی بە تەواوی ڕەتکرایەوە و چەکی ناوکیش شتێکی بێتاوان و ئاسایی بوو لایان. کەواتە، ویلایەتە یەکگرتووەکان، هیچ ڕێکەوتنێك پەسەند ناکات تاوەکو بە سەربەخۆیی لە دڵسۆزی سۆڤیەت دڵنیا نەبێت. سەتەلایتەکان، سەلماندنەکانیان شیاند هەروەها ڕێسایەك بۆ کۆنترۆلی چەك دامەزرێنرا. هەر چەکێك بتوانرێت بە وردی بگیرێ و بژمێردرێ لە ڕێگەی سەتەلایتەکانەوە دەخرێتە ناو ڕێکەوتنەکان. بە پێچەوانەوە، ئەو چەکانەی کە زۆر بچووکن و دەکرێ ڕەت بکرێنەوە بە هۆی چاودێریکردنەوە، ئەمە هەمووی لەکاتی جەنگی ساردا کرا، بەڵام چەکە ناوکییەکان نە بە سەتەلایتەکانەوە نە بە چاودێریکردنیش ناتوانرێ لە پەیماندا سنووردار بکرێت. لە ساڵەکانی کۆتایی جەنگی ساردا، حکوومەتی سۆڤیەت بڕیاریدا بۆ ڕێگەدان بەو شتانەی کە پێشتر قەدەغەکرابوون، واتە ڕێگەدان بە پشکنەرانی ڕۆژئاوا بێنە ناو ناوچەکەی بۆ یارمەتی دانی سەلماندنی دڵسۆزی سۆڤیەت لەسەر ئەو ڕێکەوتنانەی لە سەر چەك مۆری کردبوو. ئەمە بە شێوەیەکی بەرچاو مەودای چەکی فراوان کرد کە بە پەسەندکراوی خرایە نێو ڕێکەوتنەکان و بۆیەش زەمینەی بۆ سیستەمی ئاسایشی ئەوروپی خۆش کرد.



وەك بەرگری زاڵ، بنەمای شەفافییەت لە نێو پەیمانە ڕەسمییەکان نووسراو کاروباری سەربازی ئەوروپی بەڕێوەبرد. ئەمە کێشێك دەدات بە هەردوو بنەما لە کاتێکدا گەر بەشێك بوان لە ڕێکەوتنە نارەسمییەکان ئەوا ئەو کێشەیان نەدەبوو. ئەو دوو بنەمایە بوون بە مەسەلەی یاسای نێودەوڵەتی. بەهۆی واژۆکردنی پەیمانەکان، وڵاتەکان دانیان بەو پێویستیە دانا بۆ هەنگاو گرتنە بەر بۆ کەمکردنەوەی نائاسایشی ئەوانی تر.

گەر کاریگەرییەکانی گێرە شێوێنی لەسەر پەیوەندی نێودەوڵەتی لە هێزی کێش کردنی زەوی بچێت ئەوا سیستەمی ئاسایشی گشتی دەتوانرێ لەگەڵ تەکنیکییەکانی فرینی دەستکردی مرۆڤ بەراورد بکرێت. دۆزینەوەی بنەماکانی هەوای بزۆك و دانانی مەکینەی بەهێز بۆ بەرزکردنەوەی ئەو ئامێرانە لە زەوی بۆ نێو بۆشایی هەوا ئەوا هێزی کێش کردنی هەڵناوەشێتەوە، بەڵام دەیگونجێ بۆ مرۆڤ تاوەکو زاڵ بن بەسەر کاریگەرییەکانی لە ژێر باری چەند هەلومەرجێك. بەهەمان شێوەش بۆ ئاسایش و گێرە شێوێنی.

وەك ڕێگایەك بۆ قەدەغەکردنی جەنگ، بنەماکانی ئاسایشی گشتی چاککردنێکی نواند لەسەر هاوسەنگی هێز هەرچەندە کاریگەرییەکی هاوبەشی هەبوو، ستراتیژی ئاشتی لە ڕێگای تەوافوقی سەربازی لە رووی ئابووری و دەروونناسییەوە لە ڕێگای ئامادەباشی بەردەوام بۆ جەنگ گەیشتە لووتکە. لەبەر نەبوونی ئاسایش و گومانلێکردنەوە، جیهان پێویستی بە هۆشیاری و گەڕانی بەردەوام هەیە لە نێو تەکنەلۆژیای نوێی سەرازی بە تایبەتی تەکنەلۆچیای فڕین کە زۆر سوودی لێ وەردەگیرێت. ئاسایشی گشتی باری هەردوو لای سووك کرد کە بۆ مەترسی دۆرانی جەنگ و ئارەزوی بردنەوە بوو. سیستەمی ئاسایشی گشتی توانی زیاتر وڵاتە زلهێزەکانی ئەوروپا لە لێواری جەنگ بخاتەوە تا هاوسەنگی هێز.

بەو شێوەیەشی دوورنەخستنەوە کە هیچی تر جەنگ نەبێت. ئاسایشی گشتی ناوەندێکی بۆ سیاسەتگێرانی ئەوروپا دابین نەکرد، چونکە پردێکی ئاگرین بۆ کوژانەوەی ئەو توندوتیژیەی لەسەرانسەری کیشوەرەکە لە ئارادایە هەڵبەت ئەو سەرژمێریانەی کە ئەنجام دران لەم بارەیەوە نەرێ بوون، وڵاتەکان ڕازی بوون لەسەر ئەوەی هیچی تر لەگەڵ یەکتر نەجەنگن.

سیستەمی ئاسایشی گشتی هەمان خاسیەتی مامەڵەکردنی لە ئابووریی بازاڕدا هەیە. هەردووکیان ئارەزوومەندانە و ساکاربوون و پشتیان بە دەرك کردنی شێوازی ئەو هەڵوسوڕاندنەی کە هەردوو لا پێی سوودمەند دەبن. مەنتقی ئاسایشی گشتی هەمان مەنتقی ئابووری بازاڕە (لە

رووی مەسەلەی مەنتقی پێداویستی گشتی) هەرەوەزی دەتوانێت هەموو هێزەکان باشتر بکات، بەڵام لە کاتێکدا مەنتقی بنەمای شەفافییەتی سیستەمی ئاسایشی گشتی بە مەنتقێك دانەنرا. شێوازی ئەنقەست بوو وەك بینایەك لە هەزری بیناسازێکدا بێت. هەڵبەت دەزگای ئارەزووی بەرهەم هاوردەی زنجیرەی ئاراستەی تەکنیکی و هەڵبژاردن سیاسیانە نەبوو کە ڕەگیان هەبوو لە داهێنانی سەرەکی ئالییەتی سەربازی سەدەی بیستەم کە چەکی ناوکییە.

### *دروست بوونی ئاسایشی گشتی*

کاتێ سەردەمی ناوکی لە مانگی ئابی (١٩٤٥)دا دەستی پێکرد لەگەڵ هێرشەکانی ئەمریکا بۆ سەر هەردوو شاری ژاپۆن هێرۆشیما و ناگاساکی، ئاشکرابوو کە چەکی نوێ واتە چەکی کاریگەرێکی زۆر قوڵی لە سەر سیستەمی نێودەوڵەتی هەیە. کاتێ ئەم شتە دەستکردە کە بە وێرانکەرترین هێزە دادەنرێت هاتە ئاراوە، دوو شت گەشەی کرد یەکێکیان سەربازی ئەوەکەی تر دیبلۆماسی بە یەکگرتنی هەردوکیشیان سیستەمی ئاسایشی گشتی دروست بوو.

سەرهەڵدان و پێشکەوتنی پێگەی سەربازی وەك بنەمایەکی سەرەکی ستراتیجیەتی چەکی ناوکی ڕێگرێك بوو لە بەردەم هێرشکردن(واتە قەدەغەکردنی هێرشێك لە ڕێگەی هەڕەشەی بەرگریکردنێکی کاریگەرەوە بە واتایەکی تر لە ڕێگەی تۆڵەوە). ویلایەتە یەکگرتووەکان گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە چەکی ناوکی تەنها ئەو کاتە بەکاربهێنێت گەر هێرشی بە هەمان چەك کرا سەر. لە زۆربەی کاتەکانی سەردەمی چەکی ناوکیدا، یەکێتیی سۆڤیەت کەمتر قەناعەتی بەم مەسەلەیە هات، بەڵام گەر تەنها لەبەر ڕکابەرەکەی واتە ئەمریکا قەناعەتی بێت، ئەوا یەکەم داواکاری لە حکوومەتی سۆڤیەت ئەوەیە دەبێ کار بکات بۆ دووپاتکردنەوەی ئەوەی کە چەکە ناوکییەکانی وەك ڕێگرێکی کاریگەر دێنە کایەوە.

کاتێ دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی چەکی ناوکی بۆ ڕێگە گرتن لەیەکتری واتە هیچ لایەك هێرش نەکا سەر لایەکەی تر، ویلایەتە یەکگرتووەکان و یەکێتیی سۆڤیەت دەستیان بەدانووستان کرد بۆ دانانی سنوور لەسەر چەکەکانیان. هەردوو لا ناچار بوون شتێك بکەن دەربارەی ئەو مەترسییەی کە هەردووکیان لەسەرەتای ساڵەکانی سەردەمی چەکی ناوکیدا خستیانە ڕوو.. هەردووکیان پلانیان دانا بۆ چەك دامالینی گشتی — بە تەواوی —





هەڵوەشاندنەوەی چەکی ناوکی دواتریش هەموو جۆرە چەکێك، بەڵام هیچ یەکێکیان پێشبینی لەوەی تر نەدەکرد ئەم پلانانەی قبوڵ بێت. کارنامەکان بەشێك بوون لە هەوڵی حکوومەتەکانی هەردوو لا بۆ ڕازیکردنی جیهان کە تەرخانکراوە بۆ کەمکردنەوەی مەترسی چەکی ناوکی.

لە ساڵی (١٩٦٣) دا ڕووسیا و ئەمریکا گەیشتنە ڕێکەوتنێك لەسەر چەکی ناوکی و پەیمانی (قەدەغەکردنی تاقیکردنەوەی تەقاندنەوەی چەکی ناوکی لەژێر ئاو، لە کەش هەوای سەر زەوی و لەدەرەوەی فەزا) یان مۆرکرد (هەرچەندە لە ژێر زەوی تاقیکردنەوەی چەکی ناوکی بەردەوام بوو) کاریگەرییەکی زۆری هەبوو وەك پێوەرێك بۆ پاراستنی ژینگە. ئەم پەیمان و ڕێکەوتنە کاریگەری نەبوو لە سەر لەئاستی هێز هەردوولا.

هەروەها لە ساڵی (١٩٧٢)دا هەردوولا گەیشتنە ڕێکەوتنێك بە هیچ شێوەیەك کاری لەو چەکانە نەکرد کە ئەوان بەدیان دەکرد. ستراتیژییەت و دیبلۆماسیەتی چەکی ناوکی سەری هەڵدا لە پەیمانی (ABM)، بەشێوەیەکی کاریگەر ڕووسیا و ئەمریکای قەدەغەکرد لە دروستکردنی بنکەی بەرگری دژی چەکی هێرشبەری ئەوەکەی تر (لەهەمانکاتدا ڕێکەوتنێکیان مۆرکرد، کلاوێکیان لەسەر هەندێ لەو چەکە هێرش بەرانە دانا). پەیمانی (ABM) بە شێوەیەکی ڕەسمی بۆ یەکەم جار ویلایەتە یەکگرتووەکان و یەکێتیی سۆڤیەتی پابەند کرد بە بنەمای زاڵبوونی بەرگری.

پەیمانەکە بەرهەمێکی نەویستراوی ڕکابەرێتی چەك بوو لە نێوان هەردوولا بە چارەگی یەکەمی سەردەمی چەکی ناوکیدا. چەکی ناوکی زۆر بەهێزو وێرانکەرە، ئەو بنکەی بەرگرییەی بۆی دادەنرێت دەبێ تەواو پووچەڵی بکاتەوە، چونکە گەر هەر لایەك (١٠٠) دانە مووشەکی ناوکی بۆ سەر لایەکەی تر بنێرێت لە کاتێکدا لایەکەی تر (٩٩) بنکەی بەرگری هەیە دەتوانێت تەنها ٩٩ مووشك پووچەڵ بکاتەوە ئەوا هێشتا یەك مووشەکی ناوکی دەمێنێتەوە توانای نانەوەی کارەسەتێکی مەزنی هەیەو هەروەها دەتوانێت شارێکی گەورە وێران بکات و بەملیۆن خەڵك بکوژێت. لە ساڵی (١٩٧٢) هەرلایەو بەهەزاران تەقەمەنی هەبوو کە دەکرا لە خولەکێکدا چەندین لەو جۆرە تەقەمەنیانە بنێرێت بۆسەر لایەکانی تری جیهان لەڕێگای مووشەکی پاستیکی نێو کیشوەری، چونکە هیچ ئامێرێکی سەربازی تر پێشبینی ناکرێت بۆ پێکاندن کاتێ بۆ یەکەم جار بەکاردێت، بەڵام هێرشێکی ناوکی جا هەر قەبارەیەك بێت بەئاسانی سیستەمی بەرگری دەشکێنێت و ئامانجی خۆی دەپێکێت.

بۆیە دروستکردنی بنکەیەکی بەرگری کاریگەر دژی هێرشی ناوکی بێ هودە بوو، لەوەش خراپتر هەردوولا گەیشتنە ئەو قەناعەتەی کە ئەگەر بنکەی بەرگریان نەبێت ئەوا بەرەو هەژاری و نەبوونی ئاسایش دەچن، بۆیە هەردوولا لە ترسی سەرکەوتنی لاکەی تر هەوڵی دروستکردنی بنکەی بەرگریان دا.. بەهۆی نەبوونی ڕێکەوتننامەیەکی هاوبەش لە نێوان هەردوولا بۆ ئەنجام نەدانی ئەم کارە. زاڵبوونی بەرگری لەڕێگای وێرانکردنی هاوبەشەوە کە کورتکراوەکەی دەبێتە (MAD) سەری هەڵدا. وەك واقیعێکی گرنگی ژیان لە سەردەمی ناوکیدا پەیمانی (ABM) دەست لەکارکێشانەوەی ئەو واقیعەی خستەڕوو.

رۆناڵد ڕێگانی سەرۆکی ئەمریکا لە ساڵی (١٩٨١ – ١٩٨٩) بەتەواوی نیگەران بوو بە پەیمانی (ABM)، پێی وابوو لە ڕووی ئەخلاقییەوە شتێکی پەسەند نەکراوە، چونکە ئاسایشی ویلایەتە یەکگرتووەکانی خستە ژێر هەڕەشەی کوشتنی ملیۆن خەڵك کە ئەمەش کارێکی نائەخلاقییە و نابێت ئەنجام بدرێت، هەروەها پەیمانەکەی لە ڕووی تەکنیکییەوە بە ناتەواوی وەسفکرد، چونکە پشتی بە مەزندەو توانای زانست و نەزانینی تەکنیکی ئەمریکی بەستابوو. بۆ دروستکردنی بنکەیەکی بەرگری کاریگەر لە ساڵی (١٩٨٣)دا، ڕێگان دەستپێشخەری ستراتیژیەتی بنکەی بەرگری ڕاگەیاند هەرچەند لەماوەی سەرکردایەتی ڕێگاندا ئەم مەرامەی نەهاتە دی بۆ پێشخستن و دروستکردنی سیستەمێکی بەرگری کە ڕێگە لە پەیمانی (ABM) بگرێت. هەر ڕێگان بوو شان بەشانی هاوشانەکەی سۆڤیەت میخائیل گۆرباتشۆف ئەو پەیمانەیان دانا بۆ دروستکردنی سیستەمی ئاسایشی گشتی کە بە پێی ئەم پەیمانە ئەوروپا چووە نێو جەنگی سارد.

ڕێگان و گۆرباتشۆف نەوای سەر بوون و کۆنترۆڵی هێزەکانی چەکی ناوکیان کرد بە چەشنێك کە هەردووکیانی خستە ژێر کاریگەری پاسەوانی کردنی هاوبەشی ئامێرێك کە دەتوانێت ڕۆژی دوایی پێش بێنێت و هەردوولا تێك بشکێنێت و جیهانیش وێران بکات. وەك جمکانەیەك زۆر لەگەڵ یەکتر دەهاتنەوە، چونکە ئامانجی هەردووکیان تەواوکەری یەکتر بوون. هەردووکیان لە ژێر مەترسی چەکی ناوکیدا یەك بەرژەوەندی هاوبەشیان هەبوو ئەویش مانەوە بوو. پەیوەندی نێوانیان بە پلۆتی فیلمێکی سینەما دەچوو کە تیایدا دوو کەس هیچ بەرژەوەندییەکی هاوبەشیان لەگەڵ یەکتر نییە و هیچ کەیفیشیان بە یەکتر نایەت، لە هەمانکاتیشدا بەیەکەوە فرێدراونەتە نێو بارودۆخێکەوە دەبێ هاوکاری یەکتربکەن. شەراکەتی



سۆڤیەت و ئەمریکا بە پێچەوانەوە بە خەم کۆتایی پێهات. فرانکلین رۆزڤێلت لە ژێر کاریگەری باوەڕێکی هەڵەوە کاری دەکرد، لەکاتێکدا دەیتوانی لەکاتی جەنگدا سەرنجی جۆزێف ستالین بۆ گرێدانی هاوپەیمانێتی کێش بکات بۆ نێو سیاسەتێکی گونجاوتر لە ئەوروپا. جۆن کەنەدی لە ساڵی (١٩٦١) دا یەك کۆبوونەوەی ڕاستەوخۆی لەگەڵ نیکیتا خرۆشۆف لە ڤیەننا سازبکات، کە لە ئەنجامدا یەکتریان تۆمەتبارکرد و ساڵێك دوای ئەو کۆبوونەوەیە هەردوو وڵات زۆری نەما لەگەڵ یەکتر بجەنگن. لەسەر نەهێشتنی هەناردنی مووشەکی ناوکی مۆسکۆ بۆ کوبا (ڕیچارد نیکسۆن و لیۆند برێژنێڤ) ویستیان پەیوەندییەکی نوێی ساختە دابنێن لە ساڵی (١٩٧٠) کە پێیان دەووت گلێدانەوە، بەڵام ئەو پەیوەندیەش بە تۆمەتبارکردنی یەکتر تێکچوو.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، شەراکەتی ریگان و گۆرباتشۆف کۆتاییەکی دڵخۆشی هەبوو، چونکە هەردووکیان بەیەکەوە سیستەمی ئاسایشی گشتیان لە ئەوروپا هێناکایەوە، لەکاتێکدا بەدیهاوردەی ئەو سیستەمە مەبەست و نیازی هیچ لایەکیان نەبوو.

پاش ئەوەی ڕێگان لە کارچوو بە قارەمانی ململانێی لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەت ناوزەد کرا، ناسرا بەو پیاوەی جەنگی ساردی بردەوە بێ ئەوەی یەك تەقەش بکات. کۆششەکانی سنووری پێشبینییەکانی بەزاند. بە هەقیقەت ریگان زیاتر بە کەسێکی دوای جەنگ سەیر دەکرا، هاری ترۆمان تا فرانکلین رۆزڤێلت یارمەتی بونیاتنان و هەڵسوراندنی ئاسایشی گشتیاندا کە ئەوڕوپای بەرەو سەردەمی دوای جەنگی سارد برد. جەرگەی ئەو هەڵسوڕاندنانە دانووسان بوو لە سەر سنووری چەك.

ڕیگان لەکاتی سەرۆکایەتیدا قەناعەتی بەوە هات کە ئەو ڕێکەوتنانەی پێش ئەو لە نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکێتیی سۆڤیەتدا مۆرکرابوو ڕێکەوتنگەلێکی زۆر بێ کەڵك و پڕ زەرەر بوون.. وەك سەرۆکێك سوور بوو لەسەر هەڵوێستەکانی ئەمریکا لە دانووسانی لە سەر چەك، ئەو پاشەکشەی ئەمریکا بە باشە ڕەنگی دایەوە لە سەر بەدەستهاوردەی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا هەرچەند زۆر خۆشی بە ئەنجامدانی ئەو کارە نەدەهات. هەڵوێستە نوێیەکان پەیمانی هەردوو جۆرە چەکی ناوکی و غەیرە ناوکی لێ کەوتەوە کە ئەمەش جەرگەی سیستەمی ئاسایشی گشتی دروستکرد، بەڵام مەرامی سەرەکی ڕێگان بۆ نیشاندانی ئەو هەڵوێستانە بۆ دامەزراندنی زاڵبوونی بەرگری نەبوو وەك بنەمایەك

بەڕێوەبردنی سیستەمی ئاسایشی گشتی، بەڵکو بۆ کەمکردنەوەی سوودە سەربازیە ترسناکەکانی سۆڤیەت بوو کە بەرپرسانی ئەمریکا بە هێزیان دەزانی.

بنکەی مووشەکەکانی سۆڤیەت فراوانتر بوو لە هی ئەمریکییەکان و دەیتوانی زیاتر لە جەنگ بێتە پێشەوە. بە پێی لێکدانەوەکان ڕەنگە بیانتوانیبا هەموو مووشەکە دوورهاوێژەکانی ئەمریکا لە هێرشێکی کتوپڕدا تێکبشکێنن. ستراتیژزانانی ئەمریکی لەو توانایەی سۆڤیەت ترسان نەوەك هەمان حەپەسانە مەزنەکەی جەنگی جیهانی دووەم لە سەر ئەواندا دووبار بێتەوە کاتێك ژاپۆنییەکان هێرشێکی کتوپڕیان کردە سەر بەندەری پێرل بە مەبەستی چەکە لۆژیکییە نایابەکان. کارنامەی ڕێگان نەخشە کێشان بوو بۆ ڕێگەگرتنی دووبارە بوونەوەی بۆردوومانە سەرکەوتووەکەی ئەڵمانەکان دژی فەرەنسا لە ساڵی (١٩٤٠). هەل و مەرجی پێویست بۆ ئەم جۆرە هێرشە بە سوودێکی گەورە دانرا لە ڕووی هێرکردن دەبابە و سەرباز و تەیارە.

سوپا کاریگەر و زاڵەکانی وارشۆی سۆڤیەت لە هێزەکانی ناتۆ ANATO دا زۆرتر بوو. کارنامەی ئەمریکییەکان بانگەشەی یەکسانی کرد لە پۆلێن کردنی چەك بە ئاستێکی نزمتر کە لای کۆمۆنیست پێشتر خرابووە ڕوو.

لەبەرئەوەی ئەو کارنامە داوای ئەوەی دەکرد یەکێتیی سۆڤیەت دەست هەڵگرێت لەچەك زیاتر لە ویلایەتە یەککگرتووەکان و هاوپەیمانەکانی واپێ نەدەچوو قبوڵ بکرێت کاتێك خرایە ڕوو. بەدڵنیاییەوە هیچ یەکێك لە شەش سەرکردەی یەکەمی یەکێتیی سۆڤیەت قبوڵیان نەکرد، بەڵام لە ساڵی (١٩٨٥)دا سەرکردەی حەوتەم هاتە سەردەسەڵات و گەیشتنە ئەنجام دەربارەی ئاسایشی نێودەوڵەتی کە زۆر جیاواز بوو لەوانەی پێش خۆی.

میخائیل گۆرباتشۆف یەکێکە لەناودارە گەورەکانی مێژوی سەدەی بیست. لەهەموو تاکێکی تر بەرپرسارتر بوو بۆ کتوپڕترین و دڵخۆشترین ڕووداو و (موعجیزەیەك کە زۆر بەهێز نییە) لەدوای جەنگی سارد کە سەردەمێکی کتوپڕو نیگەران بوو کۆتایی ئیمپراتیۆری سۆڤیەت و خودی یەکێتیی سۆڤیەت بوو. ئەمەش دەگەڕێتەوە سەر دوا سەرکردەی (USSP) کە ئاشتی لە بەرژەوەندی ئەودا بوو کە بەرژەوەندییەکی تایبەتی بوو. پرسیارێك قووتدەبێتەوە: چۆن لە ژێر سایەی کەسێکی زۆر پابەند بە زۆرداری و چەوساندنەوە گۆڕان لە سیستەمی سیاسی خنکاویدا سەرهەڵدەدا. پرسیاری بەرژەوەندی یەکسانیش ئەو ڕێگایە کە تیایدا سیفەتی کەسی





ئاوا لە دەرەنجامی مێژوودا دەرکەوت. لووت بەرزییەکەی لەوەدابوو کە پێی وابوو هەر ئەو زانیویەتی چۆن کۆمۆنیزم چاك بکات. لەکاتێکدا زۆر گوێی بە بەڕێوەبردنی ئیمپراتۆریەتی دەوڵەت نەدەدا، سیاسەتەکانی لێکترازاو داخراو بوون بۆیە بەرهەمی لێ نەکەوتەوە. دووبارەکردنەوە لە بەکارهاوردەی هێز بوو ڕاگرتنی دەرەنجامی ئەو سیاسەتانەی کە ئەوانی پێش خۆی دایانخست، بەڵام کۆتایی هاوردەی سەردەمی کۆمۆنیست لە مێژووی ئەوروپادا زۆر دوور بوو لەوەی گۆرباتشۆڤ خەریك بوو بیکات.

مەبەست لە ڕای چاکسازی بۆ یەکێتیی سۆڤیەت کۆنترۆڵی چەك بوو وەك ڕێگایەکی سەرنج ڕاکێش بۆ بەرقەرارکردنی ئاسایش. هەندێ شوێن لە ڕووی ڕکابەریکردنی سەربازی لەگەڵ ڕۆژئاوادا باشترە لە ڕووی بەکاربردنی سەرچاوەکانی وڵات بۆ ئاوەدانکردنەوەی ناوخۆ، کە ئەمەش پرۆژەیەك بوو ناوی لێنرا خۆئاوەدانکردنەوە. کاتێ گۆرباتشۆڤ جڵەوی دەسەڵاتی گرتە دەست، لۆجیکی ئاسایشی گشتی لەئامێز گرت. بنەماکانی ئاسایشی گشتی باشتر لە هەر سەرکردەیەکە جیهان بەرفراوانترو و ڕوونتر بەرهەم هێنا. گۆرباتشۆڤ دووپاتی کردەوە کە ئاسایش دەبێ بەگشتی و بەهاوبەشی دەستەبەر بکرێت نەك بە جیا جیاو وتی (دەکرێ هەموو لایەك تەنها هاوبەش بێت لە بەرقەرارکردنی ئاسایش) ئەمە جگە لە گەیاندنی مانای بەرژەوەندییەکانی تر، لایەنی نەرێی سەردەمەکەی خستەڕوو کە (دوژمنەکان دەبێ شەریك بن و بە هاوبەشی بەدوای ڕێگایەکدا بگەڕێن بۆ بەدەست هاوردەی ئاسایشی گەردوونی). ئەمە وای لە مەزهەبە سیاسییەکان کرد ببن بە مەزهەبی بەرگری، هەروەها ئەو بۆچوونە نوێیەش دەگەیەنێت کە با چەك هەبێت، بەڵام بەشێوەیەکی ماقوڵ تەنها بۆ بەرگری بەکاربێت و نەبێتە سەرچاوەی دوژمنکاری و نایەکسانی لە نێوان فرە هێزە چەکدارییە هەمەجۆرەکان. بە بۆچوونی گۆرباتشۆڤ ئەمە گۆڕان لە هێزی سەربازی ئەوروپا دروست دەکات و هێزەکانی کۆمۆنیستیش دەگرێتەوە. ناهاوسەنگی و هەرەمەکی لەهەندێ جۆری چەك و نێوان هێزە چەکدارەکان هەیە لە هەردوو لای ئەوروپا، ئێمە هەوڵ دەدەین بۆ لابردنی نایەکسانی لە هەندێ ئەو ناوچانەی کە لە پشتەوە خۆیان مەڵاسداوە بەهەمان ڕێگای ئەوانەی کە لەپێشەوەدان.

هەموو ئەوانەی دروست کران وتەیەکی پڕ لە تەوس بوون دژی ڕوانگەی لیبراڵ بۆ ئاسایشی نێودەوڵەتی، لەکاتێکدا لە سەرکردەیەکی جیهانەوە دەسەڵاتی نالیبراڵ پەیڕەو دەکرا، هەروەها داهێنانی سیاسی کە چاکسازی کۆمۆنیستە بەشێك نییە لە مارکسیزم و لینینیزم، بەڵکو لەو

ئایدیۆلۆژیایەی کە دژی لیبرالّیزمی ویلّسن و بەریتانی و ئەمریکییەکانە. گۆرباتشۆڤ خەلاّتی نۆبلّی لەسەر ئاشتی وەرگرت کە لە مێژووی خەلاّت بەخشیندا شایەنترین کەس بوو بۆ ئەو خەلاّتە، چونکە ڕوانگەی لیبرالّی پەیڕەوکرد، هەروەها بە پێچەوانەی سەرکردەکانی پێشووی سۆڤیەت ویلّ نەبوو بەدوای بلاّوکردنەوەی کۆمۆنیزم بەزۆرداری. ئایدیەی بەکارهاوردەی هێز جگە لە بەرگری لە خۆکردن، ئایدیایەکی ڕەوا نییەو لەگەلّ ئاسایشی گشتی یەك ناگرێتەوە وەك ئایدیاو مومارەسەکانی تر کە پێناسەی جیهانی مۆێرن دەکەن، ئەو ئایدیایانە لە رۆژئاواوە سەرچاوەی گرتووە.

### *بێ جەنگی*

رۆمانەکان قسەیەکیان هەیە دەلّێ (یاسا بەبێ بوونی ئەخلاق بێ هودەیە) ئەم قسەیە لەسەر ئاسایشی گشتی جێبەجێ دەبێت. بیروبۆچوونەکان لە دەزگاکان تۆزیان لە سەر نیشتووە، کاریش ژۆکی داداوە لە نێو ئەو پەیمانانەی کە بنەماکانی بەرگری زالّ و شەفافییەتی دەستەبەر کردو لەکاتێکا وەستا لەسەر شتێکی کەم بەها، بەلاّم لە سەرەنجامی ئەمانەشدا لە ناخی ولاّتانی ناوەوەی ڕۆژئاوادا حەزێکی ئاوا قوول نییە پالّیان پێو بێت بۆ جەنگ.

گەشەی بێ جەنگی لە ڕۆژئاوا بەرهەمی سەدەی بیستەم بوو. چوون بۆ جەنگ لەلای فەرمانڕەوا تەقلیدییەکان هەمیشە ئیختیارێك بوو لە نێوان لێکدانەوەی کولفە و سوودەکانی ئەو جەنگە بۆ ولاّتانی ناوەوەی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم. ئەم لێکدانەوەیە ئاڕاستەیەکی ئەرێی لێ کەوتەوە، چونکە کولفەکان ئێجگار زۆر بەرزبوونەوە. لە هەمانکاتیشدا ئەو سوودانەی کە ولاّتانی ناوەوە لە سەری دەجەنگان لە هەزارەی نوێدا کەمبوونەوە.

بەرگری لە خۆکردن لە سەر ئاستی جیهانی بۆ شەڕ پەسەندکرا، بەلاّم لەگەلّ ڕووخانی کۆمۆنیزم ولاّتەکانی تر هیچی تر دووچاری هەڕەشەیەکی مەترسیدار نەبوونەوە. لە هەمانکاتدا مەبەستەکانی تری جەنگ شتێکی ئەوتۆیان بەدەست نەدەهێنا و ئەوەی گرنگ بوو لە نێوانیان بەهیوای بەدەستهاوردەی هەندێ کەل و پەل بوون. پادشا تەقلیدییەکان بە نیازی فراوانترکردنی هەرێمەکەیان بوون، لە لایەك، بۆ زیادکردنی سامانیان لەڕێگای باج و سەرانەوە، لە لایەکی ترەوە بۆ بەهێزکردنی دەسەلاّتیان لە ڕێگای بەکارهاوردەی سامانێکی نوێ بۆ دەستەبەرکردنی



سوپایەکی فراوانتر. رژێمە نالیبرالّەکان فراوانبوونی هەرێمیان بە مەرجی مانەوەی خۆیان دەزانی. ئەلّمانیا و ژاپۆن داگیرکاری خۆیان وەك سەرچاوەی کەرەستەی خاو و کرێکارانی هەرزان تەنانەت هەندێ جاریش وەك کۆیلە بەکارهێنا.

بەپێچەوانەوە ولاّتە لیبرالّییەکان لە سەدەی بیستەمدا ڕازی بوون بەو قسەیەی ئادەم سمیس لە سەدەی هەژدەدا ئاماژەی پێدا کە ئایدیای سیتەمی ئیپۆاتۆری دژی جەنگی حکوومەتەکەی وەستایەوە لە کۆنترۆلّکردنی کۆلۆنییە ئەمریکییەکان لەسەر بنچینەی ئەوەی بەریتانیا باشتر خزمەت دەکرێت گەر ئەمریکا سەربەخۆبێت. دواتر بەریتانیا سوودەکانی دەدروێتەوە لە بازرگانی کاتێ ئەو هەموو پارەیە سەرف ناکات لە بەڕێوەبردنە کۆلۆنییە ئەمریکییەکان.

شۆرشی پیشەسازی بەهای جەنگی کەم کردەوە بە ڕەتکردنەوەی ئەوەی کە مولّك سەرچاوەیەکی سەرەکی سامان و هێزە. پێش پیشەسازی، سامان لە بەرووبوومی کشتوکالّییەوە لەسەر خاك و کانزای بە نرخی ژێر زەوییەوە سەرچاوەی گرتبوو. گەر پاشایەك هەرچەند کۆنترۆلّی ناوچەی زیاتر بکردبا ئەوەندە بەهێزترو دەولّەمەندتر دەبوو. لەگەلّ هەلّگیرسانی شۆڕشی پیشەسازی سەرچاوەی تری سامان و هێزی سەربازی هاتە کایەوەو ئەوەندە پەیوەست نەبوو بە مولّك، بەلاّم لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا ئامۆژگاری بۆ ولاّتان بۆ بەدەستهاوردەی سامان لە ڕێگە بازرگانی و وەگەڕخستنکردنەوە باشتر بوو. لە سەدەی بیست و یەکدا، پایتەختی بچووکی سەنغافورا و سەرەڕای هەژاری و قەرەبالّغی ژاپۆنییەکان سامانی باشیان بەدەستهێنا لە ریّگای وەگەڕخستنو بازرگانییەوە، سامانێك زۆر زیاتر لە ناوچە گەورەکانی وەك ڕووسیا و چین.

زۆرجار جەنگ بە بێ مەبەستی کەل و پەلیش بەرپا دەبوو. پادشاکان بەشەڕ دەهاتن بۆ تایبەتمەندی و بەرەوپێش بردنی باوەڕی ئایینیان. ولاّتە نالیبرالّییەکان جەنگیان بەرپاکرد بەناوی ڕوانگەی عەلمانیی باوەڕە ئایینییەکەیان کە ئایدیۆلۆژی بوون و پابەند بوون بە بنەما لیبرالّییەکان و بۆ ماوەیەك ئەوانی تریان داگیردەکردو بەڕێوەدەبرد بەمەبەستی بلاّوکردنەوەی ئەو بنەمایانە. لە سەدەی نۆزدەدا ئیمبریالّیزمی لیبرالّ هێرشی نەکردە سەر ئەمریکییەکان و بەریتانییەکان یاخود فەرەنسیەکان بەلّکو بە پێچەوانەوە بەچاکیان زانی بۆ هاوردەی مەسیحییەت بۆ بێباوەڕان و خزمەتگوزاری هێلّی شەمەندەفەر بۆ ئەوانەی کە بە پێ یان گالیسکەی ئاژەلاّن سەفەریان دەکرد، یاسا بۆ ئەوانەی گۆڕانی لەناکاو هەڕەمەکی دەکەن و

دەسەلاتی تەقلیدیان هەیە، بەلام لە سەدەی بیستەمدا کۆمەلگا لیبرالییەکان وازیان لەو باوەڕە هێنا کە لە بەرایی سروشتی ولاتانی ناوەوەدا پەسەندیان بوو، وازیان لەو باوەڕە هێنا کە مافی تەواو بدەن بە خۆیان بۆ بەڕێوەبردنی گەلانی بێ هێز، بەلکو ڕوویان کردە ئاشتی و هۆیەکانی بەرپابوونی جەنگە مانای نەما. ولاتە زلهێزەکان هیچ مەبەستی جەنگیان نەبوو جگە لە ئاشتی، بەپێچەوانەی مەبەستی جەنگی رابردوو، واتە ئاشتی بە بێ شەڕ بەرقەرار بوو.

بەرزبوونەوەی کولفەی جەنگ بووە هۆی کەمبوونەوەی پەرۆشی بەرپاکردنی. کولفە بەرز بۆوە، چونکە بۆشای نێوان هێزی سەربازی ولاتانی ناوەوەو دەرەوەی جیهان تەسك بۆوە. لە سەدەی نۆزدەدا، ڕۆژئاوا چەکی پیشەسازی وەك چەکی کەشتی، ڕەشاش بۆ خۆی قۆرخکردبوو، هەروەها سەرگەرمی پێکدادان بوو لە نێوان ولاتانی ناوەوەو دەرەوە و گۆڕلێدان بۆ قەسابخانەکانیان. لە سەدەی بیستەمدا کۆمەلگاکانی ولاتانی دەرەوەی جیهان داوای چەکی مۆدێرنیان دەکرد و فێری بەکارهاوردەی بوون، بلاوبوونەوەی ڕێگە ڕۆژئاواییەکان بۆ جەنگ بەتەواوی هاوسەنگی هێزی ئاوەژوو نەکردەوە، کۆمۆنیستی ڤێتنام نەیتوانی ویلایەتە یەکگرتووەکان داگیربکات، بەلام ڤێتنامییەکان توانیان زیانێکی زۆر بە هێزەکانی ئەمریکا بگەیەنن و قەناعەت بە گەلی ئەمریکا بکەن کە سەرکەوتنی ئەمریکا لە هیندۆ چین کولفەی زۆر زیاترە لەوەی کە شایەنییەتی.

بۆ ولاتانی ناوەوەی جیهانیش، جەنگ پارەیەکی زۆری تێدەچوو، جێبەجێکردنی شۆڕشی پیشەسازی لە سەدەی بیستەمدا بۆ ئەرکی ئابووری بەرهەمێکی زۆری هێنایە کایەوە، وەك جل و بەرگ و نیشتەجێ بوون و هەرزانبوون و زۆربوونی ناوەندەکانی گواستنەوە و گەیاندن کە بە شێوەیەکی بەرفراوان لەچاو پێشتر بەردەستتر بوون. لە لایەکی ترەوە جێبەجێکردنی شۆڕشی پیشەسازی بۆ کەل و پەلی جەنگ بووە هۆی مردنی بە کۆمەڵ و جەنگی جیهانی یەکەمی زۆر قێزەوەن کرد.

بۆ جاری یەکەم، لە جەنگێکی ئاوادا لەبەر نەخۆشی و کەمی چارەسەری پزیشکی بۆ بریندارەکان ژمارەی قوربانیان ئێجگار زۆربوو. بۆ جاری یەکەم هەموو کۆمەلگاکان بەدوای کەرەستەی جەنگەوە بوون، پیاوان بانگکران بۆ نێو هێزی سوپاو ئەوانەی کە جلی سەربازییان لەبەرنەبوو شان بەشانی منالّ و ئافرەتی مەدەنی معەرەزبوون بۆردومان بکرێن بە تەیارە. شەڕوشۆڕ و دەنگی ڕەشاش و زۆری چەك بووە هۆی ئەوەی خەلّك بە تەواوی نیگەران بێت و لە



ڕووی دەروونییەوە سەغلّەت بێت. جەنگی جیهانی یەکەم جەنگێکی نوێ و نەخۆشی و ترسی دەروونی و سەرسامی بۆردومان کردن بوو.

جەنگی جیهانی یەکەم بووە هۆی بەها شکاندنی شتە چاکەکان لەسەرووی هەموو هاندان پالّنەرەکانی تاکەوە. چوار سالّی خوێناوی کەم و کوڕی لە پالّەوانێتی نەبوو، بەلام زۆر ئاستەمە باوەڕ بکەیت تاکێك هەرچەندە شکۆمەند و پایەدار بێت بتوانێت ئەنجامی ئەو ململانێیە بۆ بەرژەوەندی خۆی یەکلایی بکاتەوە. جەنگ ئەوەی خستەڕوو کە قسەکەی ناپلیۆن ڕاستە بوو کاتێ دەیووت "خودا هەمیشە لای بەتالیۆنە گەورەکانە".

دوای سالّی (١٩١٨) کۆمەلّگا لیبرالّییەکان هیچی تر نەیانتوانی جەنگ بەسەرکەشییەکی شکۆدار و مەزن بزانن. دیموکراسییە لیبرالّییەکان نیازیان نەبوو شەڕ بەم جۆرە بکەن، بۆیە هەولّێکی دووریان دا بۆ نەهێشتنی جەنگ. بەداخەوە هێزە نالیبرالّەکان لەم مەسەلەیە بیروبۆچەنێکی جیایان هەبوو. هەروەها حکوومەتە لیبرالّەکان لە سالانی / ١٩٣٠ / دا لە سەر دووبارەنەبوونەوەی ترس و تۆقینی جەنگی جیهانی یەکەم(١٩١٤ — ١٩١٨) سووربوون، کەچی جەنگی داهاتوو (جەنگی جیهانی دووەم) کولفەکەی زیاتر بوو!

کوشتارو وێرانکردنی جەنگی جیهانی دووەم زۆرتر بوو بە بەراورد لەگەلّ یەکەم بەتایبەتی بۆ ئەوانەی کە شەڕیان نەکرد! کولفەی جەنگی جیهانی دووەم رەنگە بەتەنها بەس بێت بۆ پاراستنی هێزە سەرەکییەکانی سیستەمی نێودەولّەتی و هەولّی دووبارەنەبوونەوەی جەنگ لەگەلّ یەکتر، بەلام داهێنانی سەربازی شۆڕشگێری کە لە کۆتایی ململانێکە پەیدابوو کە بۆمبی ئەتۆمی بوو نەبوونی ئارەزوو بۆ جەنگ زیاتر کرد، بەلام دروستکردنی ئەو بۆمبە لە ڕۆژئاوا زیاتر بوو!

گەر جێبەجێکردنی تەکنیکەکانی شۆڕشی پیشەسازی بۆ کەرەستەی جەنگ کولفەی جەنگی بەرزکردبێتەوە، ئەوا سەرەتای چەکی ناوکی زۆر زیاتر تەکلیف دەکات. تەقاندنەوەی موشەکێکی ناوکی لە ژێر ئاودا بە غەواسەیەك دەتوانێ زیانی زیاتر بگەیەنێت بە دوژمن لە هەموو ئەو زیان و وێرانکارییەی کە ئەو ولاتە لەکاتی جەنگی جیهانی دووەم بینیویەتی گەورەتر دەبێت، بە تایبەتی لە حالّەتی ئەلّمانیا و ژاپۆن و یەکێتیی سۆڤیەت بەڕاستی زیانێکی گەورەبوو.

ئالۆگۆڕکردنی چەکی ناوکی لە نێوان هەردوو زلهێزە ناوکییەکانی جەنگی سارد هەرگیز شەڕ نەبوو، لەو ڕووەوەیەکی نەدەگرتەوە لەگەڵ کۆتاییەکانی یان ناوەندەکانی جەنگ کاتێ بەچەند سەدە گەشەی کردبوو. لە سەدەی نۆزدەدا ئەفسەری سەربازی بەناوی (کارل فۆن کلۆسوتیز) جەنگی پێناس کرد بەبەردەوامی سیاسەتەکان لە ڕێگەی بەکاربردنی ناوەندی توند و تیژتر، جەنگێکی ناوکی لەنێوان ویلایەتە یەکگرتووەکان و یەکێتیی سۆڤیەت هیچ ئامانجێکی سیاسی بۆ هیچ لایەکیان دەستەبەر نەدەکرد و هیچ کامیشیان نەیاندەتوانی لە سەرەنجامی چەند هێرشێکی ناوکی بە گورلێدان رابگەن، بۆیە هیچ یەکێکیان پێشبینی بردنەوەیان نەدەکرد لە جەنگێکی ناوکیدا.

سەبارەت بەناوەندەکانی جەنگ لەکاتی یۆنانە کۆنەکان تا جەنگی جیهانی دووەمیش ناو جەرگەی شارەکان بوو بۆ پێکدادان. پیاوی چەکدار ڕاستەوخۆ لەگەڵ یەکتر بەشەڕ دەهاتن بۆ کۆنترۆڵکردنی پارچەیەك زەوی، شەڕیان دەکرد تا لایەکیان هەڵدەهات یا ملکەچ یا دەدۆڕا. پێکدادان بەگشتی بڕیاری جەنگی دەدا، ململانێیەکی ناوکی سۆڤیەت و ئەمریکا دەبووە جۆرە پێکدادانێکی ناشەخسی، بەدرێژایی کات هەردولا شەڕیان دەکرد و هەردوو لاشیان ئیبادە دەبوون.

پاش ساڵی (١٩٤٥) هەروەك پێشتر جەنگ بەرپابوو بێ گفتوگۆی چەکی ناوکی، جەنگەکانیش بەتەواوی لە وڵاتانی ناوەوەی ڕۆژئاوادا پەسەند نەبوون، نەك لەبەرئەوەی کولفەی ئەو جەنگانە زۆربوو، بەڵکو لەبەرئەوەی پەسەندی دانی هیچ کولفەیەکیان نەدەکرد. نرخی جەنگ بەلەدەستدانی ژیانی تاك دادەنرا، کۆمەڵگا لیبراڵەکانیش هەرگیز خۆشحاڵ نەدەبوون بەلە دەستدانی ژیانی تەنها یەك کەس. زۆر لایەنی جیا جیا بەشداری ئەو بۆچوونەیان کرد کە لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا سەری هەڵدا. کەمبوونەوەی باوەڕی ئایینی، خێزانەکانی بێ بەشکرد لە سەرەخۆشی کردن کاتێ جەنگاوەرێکیان لێ دەمرد. کەمبوونەوەی هەستی ڕێزگرتنی کۆمەڵایەتی ئەوامری زیادکرد بۆ جێبەجێکردن کە بەهۆیەوە خەڵك بە موجازەفە دەمردن. کەمبوونەوەی ڕێژەی بەپیتی خاك وای لە خێزانەکان کرد بچوکتربوونەوە و نرخی هەر منالێك کە دەیان بوو زۆرتر بوو، لەهەمانکاتیشدا بەرزبوونەوەی فشار لەسەر مافەکانی مرۆڤ وای لە هەر تاکێك کرد بەهی خۆی بزانێت. بەرزبوونەوەی سامان و پرسەکانی ژیان لەنێو



وڵاتانی ناوەوەی جیهاندا مانای ئەوە بوو کە سەرباز زیاتر بە گەنجی دەمرد بە بەراورد لەگەڵ پێشتر.

بەشارستانی بوون و فراوانی کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکان لە سەدەی بیستەمدا دەریایەك گۆڕانی بەسەر بیرو بۆچوونی جەنگدا هێنا، زۆر زەحمەتە بۆ دۆکیۆمینت کردنی ئەو گۆڕانانە بە وردی، مێژوونووسی کۆمەڵایەتی فەرەنسی ناوی لەو گۆڕانکاریانە لە ڕووی ئەقڵەوە نا (ئەقلانییەت) کە پێشبینی و باوەڕی بەرفراوانی هێنایە کایەوە و بەقوڵی لەنێو کۆمەڵگا چەسپا. هەرچەندە بەدەگمەن دەخرانە ڕوو، بەڵام کاریگەرییەکی بەهێزی لەسەر ئاراستەی ڕووداوەکان هەبوو وەك کاریگەری شەپۆلی زەریا سەرکەشتییەکان کە مەزندە کردنی چەند ئاستەمە، هیچ گومان نییە لەوەی کە لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا بەشارستانی بوون واقعێکی کۆمەڵایەتیە لەنێو وڵاتە زلهێزەکانی ڕۆژئاوا. ئەوەی بەسەر هەل و مەرج و شەرعییەتی جەنگدا هات لە کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکان وەك چارەنووسی باوەڕی ئایینی و پەسەندکردنی نایەکسانی سیاسی و کۆمەڵایەتییە. ئەمانە کۆڵەگەی کۆمەڵگای تەقلیدی بوون هێشتا بەهێزو شیاوبوون لەسەرەتای سەدەی بیست و لە کۆتایی سەدەکەشدا هەموویان زۆر کاریگەر دامالران.

کاریگەرترین گۆڕان لەهەل و مەرجی جەنگدا لە ژاپۆن و ئەڵمانیا ڕوویدا. لەسەردەمی تەقلیدیدا بواری سەربازی شوێنێکی بەڕێزو ناوەندێکی باشی لە هەردوو کۆمەڵگادا داگیرکردبوو، کە تا ماوەی نالیبراڵییەکانی خایاند، لە کاتێکا هێزە چەکدارییەکان بە ئامێری چارەنووسی نەتەوەیی دادەنران. ئەوەی کە پێش (١٩٤٥) پیای هەڵدەدرا ڕق بوو، بەڵام دوای ئەو کاتە مەرام بوو. هەرچەندە هەردوو وڵات هێزی چەکداریان هەبوو و هەموو دەزگایەکیان لەبار بوو، بەڵام قەدەغەی بەکارهاوردەیان کرد، بەم پێیە بیربۆچوونی ئەڵمانی و ژاپۆنییەکان بەرەو ئارامی چوو.

لە وڵاتە هەرە لیبراڵییەکاندا، بە تایبەتی لە ئەمریکا و بەریتانیا گۆڕانی بیروبۆچوون کەمتر ڕاگەیانرا. جەنگ و هێزی چەکداری بۆ ژیانی هیچ نەتەوەیەکی تر ئەوەندە گرنگ نەبوو ئەوەندە بۆ ژاپۆن و ئەڵمانیا گرنگ بوو، هیچ کامیان ناچار نەبوون بەڕاگەیاندنی گۆڕینی بیروبۆچوونیان لەمەڕ جەنگ، هەروەك هێزە دۆراوەکانی پاش (١٩٤٥) ڕایانگەیاند، بەڵام بەنزیکبوونەوەی سەدەی بیستەم، بەشارستانی بوون سەرە ڕێگای بۆ هەریەکەیان کردەوە لەو شوێنەی کە جەنگ وەك ئامێرێکی ئاسایی وڵات بوو، ئێستا گومانی لەسەرە و بەباشترین

شێوه خزمەتگوزاری سەربازی بۆ هاوڵاتیانە، بەڵام لەکۆتایی سەدەکەدا، لە هەندێ لایەنەوە ئەو بۆچوونە تەسکترو تایبەترکرایەوە بەوەی کە هێزە چەکدارییەکان جودا کراوە لە هێڵی کۆمەڵگا گەورەکانی ئەوروپا کە لە پێشدا وەك سوپایەکی بەهێز و زاڵ بەسەر کۆمەڵگادا وابوون.

خەڵکی گشتی ئەمریکاو بەریتانیا هەروەك هاوشانە ژاپۆنی و ئەڵمانییەکان بە گومان بوون لە ململانێی چەکداری. کاتێ بەریتانیا چووە شەڕ لە باشووری ئەفریقیا لە ساڵی ١٨٩٩، پرۆفیسۆرێك لە زانکۆی لەندەن وتی: "جەنگ شاکارە لە ژیانی ئەو وڵاتە و دافعێکە بە زۆر پێت ئەکا، ئایدیاڵێکە بەدوای کەوتوون، کە مەزنی یاخود بێ هوودەیی ئەو کارە دووپات دەکاتەوە.... جەنگ لە باشووری ئەفریقیا یەکەم دەربڕینی ئاشکراو سەرنجڕاکێشی ئەو ئایدیاڵەیە لە جیهانی کاردا، کاری پاڵەوانانەیە، کە ئێستا وەك هەمیشە ئازاری قارەمانانە بەدی دەکات". لە ساڵی ١٩٩٨، ئافرەتێکی گەنجی ئینگلیز، لە پاش دەستپێکردنی جەنگی بۆوەر (Boer) لەدایك بووە و تەمەنی حەفتا ساڵە، ڕایەکی لە مەڕ ململانێی چەکداری دەربڕی، کە گۆڕانێکە نامۆیی لە بیربۆچووندا بەرجەستەکرد: " بێگومان کارەکتەری نەتەوەییمان بە قوڵی گۆڕاوە، بەڵام تۆزقاڵێك ڕامان لە مەڕ جەنگ نەگۆڕاوە. لە ڕووی کەلتوورەوە، بیری قوربانی بۆ شا گەلێ زۆرە، بەڵام زۆربەی نەوەی من ڕقیان لە وڵات دەبێتەوە. وڵاتی چین و توێژەکانە، دژوارە، گومرگی دراماو شیعرە. باوەڕ ناکەم هیچ یەکێك لە هاوڕێ پیاوەکانم ئەو جۆرە ئەرکە قبوڵ بکەن کە باو و باپیرانمان ڕۆژێك بە بێ ناڕەزایی دەربڕین قبوڵیان کردووە"

گۆڕانی چوون ئەمە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانیش خرا ڕوو. خرا ڕوو بە هۆی دژیەکی نێوان ئەرکی جێبەجێکاری وڵات لە سەرەتاو کۆتایی هەمان سەدە. لە سەرەتادا، سەرۆك تیۆدۆر ڕۆزڤێڵت بوو، ئیمپریالیستێکی بە سەبر بوو، پۆستەکەی پێشووی خۆی جێهێشت کە یاریدەدەری سکرتێری دەریاوانی بۆ بەڕێوەبردنی فیرقەیەك لە کوبا لە جەنگی ئیسپانیا و ئەمریکا بوو، ئارەزووی لە کاتی بێکاریدا ڕاوکردن و تەقەکردن و ئاخنینی ئاژەڵی کێوی و دڕندە بوو. هەرکە سەدەکە کۆتایی هات، بین کلینتۆن لە شوێنی ڕۆزڤێڵت بوو، پارێزەری مرۆیی بوو لەکاتێکدا، خزمەتگوزاری سەربازی قەدەغە کرد لە کاتی جەنگی ڤێتنامدا، بەڵام یەکێك لە هۆیەکانی بوون بە سەرۆکی سیاسی کۆنترۆلکردنی چەکی ئاگرین بوو. هەریەك



لەمانە نوێنەری سەردەمی خۆی بوو، هەروەك ئەوانەی ئێستا ڕەنگە پشت ببەستن بەسەر ڕازیبوونی خەڵکی گشتی.

ئەو ڕێگایەی کە بە ڕەسمی یاد دەکرایەوە تەرخانکرا بۆ گۆڕانی بیربۆچوونی ئەمریکییەکان. ستایلی یادکردنەوەی جەنگ لە سەدەی نۆزدەدا لە ساڵی ١٩٤٥ بوو بە ستایلێکی پاڵەوانانە: پەیکەری فەرماندەکان لە سەر پشتی ئەسپان دادەنا یان، لە حاڵەتی ئەو جۆرە پەیکەرە، نزیك کاپیتاڵی نەتەوەیی، شەڕکردنی پیاوان بە کارێکی پاڵەوانانەو ڕەمزی و بەهێز دادەنرا، یا چنینی ئاڵای ئەمریکی لە سەر دوورگەی هێمن ئایۆ جیما. بە پێچەوانەوە، یادی ڤێتنام، میلێك کەمتر دەکەوێتە لای پەیکەری ئایۆ جیما، پێکهاتبوو لە زنجیرەیەك شتایگەری پتەو و مەڕمەڕی ڕەش، ناوی هەموو ئەمریکییە مردووەکانی لە سەر نەخشێنرا بوو. ڕەمزی سەربازی نەبوو وەك قارەمانێك، بەڵکو بێتاوان و قوربانی بێ دەم و چاو بوو.

بڵاوبوونەوەی ڕق و بێز لە جەنگ لە نێو وڵاتە زلهێزەکانی ڕۆژئاوا دەزگای ئاسایشی گشتی پێك هێنا. کە ڕۆحی بێ جەنگی دەربڕی. بێگومان، سەرهەڵدانی ئاسایشی گشتی لە ئەوروپا جەنگی هەڵنەوەشاندەوە لە بەشەکانی تری جیهان هەروەها هەڵوەشاندنەوەی جەنگی بە بەردەوامی مسۆگەر نەکرد لە کیشوەری ئەوروپا، بەڵام نە بەرهەمێکی جێگۆڕی تێکەڵەیەکی سەیری بارودۆخەکانی دوای جەنگی سارد لە ئەوروپا بوو نە هەوڵێکیش بوو بۆ گرفتی جەنگ و ئاشتی بە پێویست چارەنووسی دەبێ گەمارۆی کورتکردنەوەی ئەو هەرێمە بێت. سیستەمی ئاسایشی گشتی ئەوروپا پێشینەی مێژوویی هەبوو، هەروەها خاسیەتە سەرەکییەکانی دەستی بەدەرکەوتن کرد لە بەشەکانی تری جیهان.

## *پێشینەکانی ئاسایشی گشتی*

ڕێکخستنەکانی ئاسایش لە ئەوروپا لە بەرەبەیانی سەدەی بیست و یەکدا، خاسیەتەکانی تێکەڵەی سێ ماوەی جیاجیای چاخی مۆدێرنە: سەدەی نۆزدە، ماوەی نێوجەنگ، جەنگی سارد.

کۆتایی جەنگی سارد یەکەم جار نەبوو لە مێژووی ئەوروپا کە زلهێزەکان بە نیازی ڕێگە چارەیەك نەبووبن بۆ کێشەی ئاسایش. ئەم هەوڵەدرا لە ساڵی ١٨١٥ لە سەرەنجامی جەنگەکانی ناپلیۆن. پاشان کۆمەڵە ڕێنماییەك دامەزرا لە سەر بنچینەی ئەوەی کە زلهێزەکان

کۆك بوون لە سەر دانانی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ یەکتر لە زۆربەی کاتەکانی سەدەی نۆزدەدا کە کۆمەڵەیەك بوون ناسرا بوون بە کۆنسێرتی ئەوروپا. یاسای سەرەکی کۆنسێرتەکە ئەوەبوو ئەو مشتومڕانەی بۆ وروژاندنی ململانێی زلهێزەکان بەهێز بێت دەبێ دامرکێـتەوە بە ڕاپرسی و ڕێگە چارەی مامناوەند. لەم ڕووەوە، زنجیرە کۆنفرانسێك سازدرا لە ساڵەکانی دواتری دۆڕانی ناپلیۆن بۆ چارەسەرکردنی کێشە سیاسیەکان. بۆ هەموو جیاوازییەکانی نێوانیان، خاڵی لێکچووی گرینگ هەبوون لە نێوان سیستەمی ئاسایشی سەرەتای سەدەی نۆزدە و بیستەمدا.

یەکەم و گرینگترین لێکچوو ئەو دانپیانانەیە کە کێشەی ئاسایش سیستەماتیکییە. لە هەر حالەتێکدا، زلهێزەکان گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە دەتوانن ڕەوشی ئاسایش چاك بکەن تەنیا بۆ پاراستنی خۆیان ئەوا دەتوانن بیکەن. ئاسایش بوو بە پێداویستییەکی کاریگەری گشتی، کە تەنها بە هەرەووزی دابین دەکرێت. دووەم، هەرەووزی لە هەردوو حاڵەتدا مەبەستی خۆی هەیە کە قەدەغەکردنی بەرپابوونی جەنگێکی سەرەکی و گشتییە. هیچ سیستەمێك ئارەزووی دامرکانەوەی هەموو دەمەتەقێ سیاسییەکانی نەبوو لە هەموو شوێنێك یان هەموو دەمەتەقێکان تەنها لە ئەوروپا. سێیەم، هەروەك لە حالەتی ئاسایشی گشتیدا، دەزگا بۆ کۆنسێرتی ئەوروپا دانرا بوو لە کاتی ئەو جەنگەی کە پێشتر ڕوویدا. لە هەردوو حاڵەتدا، دانانی یاسا بۆ جیهانی دوای جەنگ کۆتایی جەنگی کردە شتێکی شیاو. کۆتاییش (چوارەم) وەك سیستەمی ئاسایشی گشتی کۆنسێرتی ئەوروپا لە ڕێکخراوێك یان دۆکیومێنتێکی تاك باسی لێوە نەکرا. هەریەکە و کورتەی ئایدیا و دەزگاو دابو نەریتگەلێك بوون. هەریەکە و بە جیا ڕێکخستنێکی ناڕەسمی بوو.

گەر سیستەمی ئاسایشی گشتی یەکەم بۆنە نەبووبێت کە لە سەری هێزە ئەورووپییەکان هەولّی هەرەووزیان بەکاربرد بۆ ئاسایش، ئەوا هیچ پەیمانێکی چەك لە دڵی ئەو سیستەمەدا یەکەم شت نەبووە بە ئەنجام گەیشت بێت تەنانەت یەکەم نەخشە بۆ چێوەکردنی هێزە سەربازییەکانی بۆ ئاسانکردنی ئاسایشیش نەبووە. ڕێکەوتنەکان لە سەرەنجامی جەنگی سارد بە پەیمانی دەریایی واشنتۆن لە ساڵی ١٩٢٢ دەچوو. بە پێی چەمکەکانی، چوار هێزی دەریایی — ویلایەتە یەکگرتووەکان، بەریتانیا، ژاپۆن، فەڕەنسا- ڕێکەوتن لە سەر دانانی سنوورێك بۆ کەشتییە دەریاییەکانیان. وەك ڕێکەوتنەکانیان لە سەر چەکی ناوکی، پەیمانی واشنتۆن سنووری دانا، بەڵام پۆلێنی سەوزی چەکی هەڵنەوەشاندەوە. هەروەك لە ڕێکەوتنەکانی جەنگی



ساردیشدا، بۆ کۆنترۆڵی چەك داماڵین، ویلایەتە یەکگرتووەکان پەیمانی واشنتۆنی لەبەراوگرت و پاڵپشتی کرد. لە هەمووی گرینگتر، وەك پێوەرە دواییینەکانی سنووری چەکی جەنگی سارد، پەیمانی واشنتۆن یەکێك لە هەردوو بنەماکانی ئاسایشی گشتی دەستەبەر کرد ئەویش زاڵبوونی بەرگری بوو. وا نەخشە کێشرا بوو بۆ چێوەکردنەوەی هێزە دەریاییەکان لە زەریای هێمن تاوەکو گونجاویان بکەن بۆ بەردەوام بوون، بەڵام نەك بۆ جارِس کردنی لایەنی سیاسی. وەزیری دەرەوەی ئەمریکا، سەرۆکی چاودێر، وتی " بە قبوڵکردنی ئەم پلانە، ئامادەباشی بۆ هێرشی دەریایی بۆ بەرپاکردنی جەنگ ئێستا دەوەستێت".

سێیەم خاسیەتی ناسراوی سیستەمی ئاسایشی گشتی ڕۆڵی ئەمریکایە. هاوسەنگی سەربازی لە ئەوروپا بەهۆی زاڵبوونی بەگریەوە خرایە ڕوو. شەفافییەت داوای ئامادەبوونی ئەمریکای نەکرد. دەکرێ ئەو دوو بنەمایە لە نێو هەر کۆمەڵە وڵاتێکدا دامەزرێت، بەڵام ئامادەیی ئەمریکا ناسراوو سەلامەت بوو بۆ ئەوروپا، بەگشتی بۆ مەبەستێك خزمەتی کرد کە سەنتەری ڕێکخستنەکانی سەربازی بوو لەنێو زلهێزە ڕۆژئاواییەکان لەکاتی جەنگی ساردا.

ئەو ڕێکخراوەی کە بووە ناتۆ (NATO) دەستی پێکرد وەك کۆمەڵەیەکی ئەوروپی لە ڕۆژئاوای ئەمریکادا بۆ پاسەوانی دژی نوێ بوونەوەی دوژمنکاری ئەڵمانیا تەنانەت کاتێ پێشبینی ئەنجامدانی ئەو ئەرکەی کرا کە هاوسەنگ کردنی هێزی سەربازی کۆمۆنیست لە ئەوروپا بوو، ناتۆ ئەو کاتە ئامێرێکی دوو سەرە بوو بۆ پاراستنی یەکێتیی سۆڤیەت لەدەست درێژکردن و ئەڵمانیاش لە ئامێزی کۆنترۆڵکردندا و مەبەست بۆ قەدەغەکردنی هەریەکێکیان بوو ئەنجامدانی گۆڕانکاری زیالە کیشورەکە. بە قسەی یەکەم سکرتێری گشتی ناتۆ (ئیسمەی / ISMAY) هاوپەیمانەکە سێ ئامانجی هەبوو، ئەوانیش: (پاراستنی ئەمریکا و وەدەرنانی ڕووسییەکان ودەمکوتکردنی ئەڵمانەکان)

لەسەرەتادا ئەڵمانیای ڕۆژئاوا هیچ ئیختیارێکی نەبوو و داگیرکرابوو لەلایەن سەربازانی هاوپەیمانە نوێیەکەی، بەڵام ئەڵمانەکان ڕێکخستنەکانیان بەرز نرخاند و قبوڵیان کرد. باری خۆیان سووك کرد لەبەرگریکردن لەخۆیان، لە هەمانکاتیشدا ئەو گومانەیان بێهێز کرد کە ڕەنگە بیانخاتە نێو چاڵەوە بۆیە لەگەڵ هاوپەیمانی ئەتڵەسی ویلایەتە یەکگرتووەکان وەزیفەی وەك پاسەوانی بوو لەنێو حزبەکان لەگەڵ دروستکردنی ململانێ، بەڵام هۆی مێژوویی بۆ بێ

متمانەیی ئەمریکا بۆ هەریەکەیان دووپات کردەوە کە ئەوانی تر هیچ نیازێکی دوژمنکارانەیان نییە کە بە تەواوی مەبەستی بنەمای زاڵبوونی بەرگرییە لە نێو مەسەلە سەربازییەکاندا.

لەگەڵ کۆتایی جەنگی ساردا، ئامادەیی ئەمریکا لەسەر کیشوەری ئەوروپا ئەم رۆڵەی گێرا، هەموو ئەوروپییەکان لە ڕۆژهەڵات بەقەد رۆژئاوا ئەڵمانیای دووپاتکردەوە کە بەتەنیا جێناهێڵرێت. ڕووبەڕووی هەڕەشەیەکی گەورە بێتەوە لە هەمانکاتیشدا وڵاتانی تری دڵنیاکردەوە کە ئەگەر ڕووسیا نیازی هەڕەشەی سیاسەتی دەرەوەی هەبوو ویلایەتە یەکگرتووەکان یارمەتیان دەدا لە پشکنین و چاودێری، هەروەك لە جەنگی ساردا وای کرد، ڕووسیاشی دڵنیاکردەوە کە ئەزموونیان لەگەڵ سوپا ئەڵمانییەکان لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا دووبارە نابێتەوە. ئەمە دەسەڵاتەکانی سۆڤیەت ڕێگەی بەیەکگرتنەوەی ئەڵمانیادا لە بەر یەك هۆ بوو ئەویش تاوەکو لە هاوپەیمانی رۆژئاوادا بمێنێتەوە.

لەکاتی جەنگی ساردا کاتێ مەبەستی سەرەکی ئامادەیی ئەمریکا لە ئەوروپا بۆ چالاك نەکردنی یەکێتیی سۆڤیەت بوو، مەبەستی دواتری دڵنیا کردنەوەی هاوپەیمانەکانی بوو سەبارەت بە ئەڵمانیا لەماوەی دوای جەنگی ساردا مەبەستی دڵنیاکردنەوەی هەموو کەس بوو. گۆڕان لە چالاك نەکردنی هاوسەنگی هێز بۆ ئاسایشی گشتی ئەوروپا لەپشت بەستن بەو ترسەی کە گۆڕان لە بارودۆخی ئێستادا خراپتر دەبێت، بۆ هەموو کەسێك کە پشت ببەستێت بەو متمانەیەی کە بارودۆخەکە ناگۆڕێت، چونکە کەس نایەوێت بیگۆڕێت گەر زەمانەت مەبەستێکی ئاسایشی گشتی بێت ئەوا متمانە بەرهەمی زەمانەتە.

ژمارەیەك ڕێکەوتن نامە گەیشت لە ساڵانی / ١٩٨٠ / بەمەبەستی بەرەو پێش بردنی شەفافییەتی سەربازی لە ئەوروپا کە ناسرابە (بونیاتنانەوەی پێوەرەکانی متمانە) زانیارییان بەدەست هێنا بەگوێرەی ئەوەی سەتەلایت کۆی دەکاتەوە، دانانی سنووری سەپاند بەسەر هێزەکانی بزووتنەوە، سەرنجی زۆری مناوەرەی سەربازی پێویست بوو و دووپاتکردنەوەی پشکێنەرە بێگانەکان دانی پیا بنرێت بۆ ناوچەکان.

سیتەمی ئاسایشی گشتی بە گشتی بونیاتنانی پێوەری متمانە بوو. مەبەستی ئەو جۆرە متمانەیە ترسناك نییە تەنها لەسەر بنەماکانی زاڵبوونی بەرگری و شەفافییەت بیناناکرێت بەڵکو لەسەر شتێکی تر ئەویش کاتە. کات بەدوو ڕێگا متمانە بەهێز دەکات، یەکەم: دوژمنکارێکی ئەوروپی کاتی پێویستە بۆ زاڵ بوون و تەسکردنی لەسەر هێزی پێویست بۆ ئەو



هێرشەی بەسەریدا دەسەپێت لە ڕێگەی یاساکانی ئاسایشی گشتی. هەرکە پاڵپشتکردنەکان بە یەك دەنگ پەسەند کران، ئەوا وڵات دان بە گۆڕانی بارودۆخی ئەوروپی دەنێت، لە کاتێکدا هیوایەك نەبوو بۆ هێرشێکی سەرکەوتوو بەبێ ئامادەبوونێکی چڕوپڕ، چونکە دەست بەجێ دەپشکێنرێت و بەتەواوی پێشێلی هەموو پەیمانەکان دەکات کە واژو کرابوون بۆیە ئاسایشی گشتی کاتی ئاگادارکردنەوەی بۆ هێرشێك لە ئەوروپا لەچەند دەقەیەکەوە درێژ کردەوە هەروەك لەجەنگی سارد بۆ چەند ساڵێك کە لە سەردەمی دوای جەنگی سارد داواکراوە بۆ ڕێکخستنی کاریگەر.

دووەم هەر کە ڕێکخستنەکانی ئاسایشی گشتی بەزۆری کات بەردەوام بوون، ئەوا زیاتر ناسران و پشتیان پێ بەستراو باوەڕیان پێکراو. کە لە بەرابەریشدا متمانە لەو کاتەوە دروست دەبێت، ئەو واقیعەی کە سنوور لە ڕابردوودا تەسك دەکاتەوە دەبێتە بەڵگەیەك لە داهاتووش وادەبێت وەك سومعەیەکی کەسی یان متمانەی جیایا دەچێتەوە سەر کاری ڕابردوو. چەند کار باشتربێت، ڕابردوو درێژتر و متمانە گەورە تر دەبێت، هاوکاری و هەبوونی کاریگەری کات خاسیەتێکە کە لە ڕێگەیەوە ئاسایشی گشتی خاڵێکی هاوبەشە لەگەڵ دیموکراسی و بازاڕی ئازاد، بەڵام لەبەرەبەیانی سەدەی بیست و یەکدا، دیموکراسی و بازاڕی ئازاد دووسەد ساڵی پێچوو تا دامەزران، بەڵام ئاسایشی گشتی ئەو کاتە زۆرەی نەبوو بۆ دامەزراندنی.

کاتێ ئاسایشی گشتی لە هیچ شوێنێکی دەرەوەی ئەوروپا بنەماکانی خۆی بەتەواوی نەچەسپاندبوو، هەر تەنها بیرۆکەی دامەزراندنی لە ئەوروپا لەبەردەستدابوو، بەڵام توخمەکانی ئاسایشی گشتی دەستی بە سەرهەڵدان کردبوو لە بەشەکانی تری جیهان.

یەك خاڵی هاوبەشی نێوان پەیوەندی ڕوسیا و چین ئەوەبوو هەردوو وڵات دوژمنی تاك بوون. سوپای گەورە لەسەر سنوورە هاوبەشەکەیان تێکچوو لە نیوەی دووەمی جەنگی ساردا لە ساڵی (٢٠٠٠) لە کاتێکدا سنوور بەرێوەبرا لەلایەن ڕێکەوتنەکان لەگەڵ بنەماکانی ئاسایشی گشتی یەکیان گرتەوە. هێزە سەربازییەکانیان دانرابوون بۆ بەرگری، سنوورەکان جێگیر کرابوون بۆ ڕازیکردنی هەردوو وڵات. لە ساڵی (١٩٩٦) ڕێککەوتن لەسەر خالی بوونی یەك هەزار کیلۆمەتر (٦٠٠ میل) کە هێزی سەربازی هیچ لایەکی تیانەبێت و ناوچەیەکی ئازاد بێت هەروەها ڕێککەوتن لەسەر پێشخستنی شەفافییەت.

نموونەی یا خاڵی دووەم لەدەرەوەی ئەوروپا بوو لە پەیمانی ئاشتی ١٩٧٩ لە نێوان ئیسرائیل و میسر کە هاوپەیمانێتییەك بوو لە سەر شەفافییەت. هەرلایەك زانیاری پێدەگەیشت لەسەر قەبارە و بزووتنەوەی هێزە سەربازییەکانی تر. ناوەڕۆکی بەرگری لەخۆکردنی لە هەردوولادا ئاسان کرد دژی هێرشی لاکەی تر. دوورخستنەوەی کردەی سەربازی لە بیابانی سینای / SINAI / لە نێوانیان مانای ئەوە بوو کە هەریەکەیان کاتی ئەوەیان دەبێت بۆ خۆئامادەکردن دژی هەر هێرشێکی لاکەی تر. لە دانوسانەکانیدا لەگەڵ دراوسێ (سووریا) لە لای باکوور لەکاتی ساڵانی / ١٩٩٠ / ئیسرائیل وێڵ بوو بەدوای هاوپەیمانی هاوشێوەی ئەو جۆرەو سووربوو لەسەر چاودێری کردنی چالاکی سەربازی سووریا و ویستی هێزی سەربازی سووریا زۆر زۆر بە زەحمەتی هێرشی بکاتە سەر.

لەلای باشوور بەرەو ئاسیا، باشووریش کە هیندستان و پاکستانە، چەکی ناوکی خۆیان تاقی کردەوە لە ساڵی / ١٩٩٨ /. بەرنامەکان داڕێژرابوون بۆ کەمکردنەوەی ترسی ئەوەی کە هیچ لایەك هێرشی کتوپڕ بۆ سەر لاکەی تر نەنێرێت. لە ڕووی ئاسایشی گشتییەوە ئەو کارنامانە ئاڕاستەکران بە پێی ئاستی سیستەمی جەنگدا، ئەو نائاسایشییەی گێرە شێوێنی دەستەبەری کردبوو.

لە کاتێکدا لە هەر ڕێکەوتنێکی پێشنیارکراو و یان ڕاستدا ئەو پێوەرانەی دەگرتە خۆ بۆ پەرەپێدانی شەفافییەت و زاڵبوونی بەرگری، لە هیچ حالێەتێکدا مەرجی پێویست بۆ سیستەمێکی بەرگەگرتنی ئاسایشی گشتی و بێ جەنگی بە توندی دانەمەزرا. لە هیچ کام لەو حالەتانەدا هەردوو لا بانگەشەکانی خۆیان لە سەر ئەوی تر واز نەهێنا، یان ڕاگەیاندنی بەکارهاوردەی هێز بۆ سەلماندنی بانگەشەکان کە بە زەقی مایەوە. ڕووسیا و چین و دەوڵەتە نوێیەکانی ئاسیای ناوەڕاست، سەرەڕای ئەو ڕێکەوتنانەی واژۆیان کردبوو، بە نیگەرانی لێك دوور مانەوە. هەتا لە ئەوروپاش، سیستەمی ئاسایشی گشتی بە شێوەیەکی ئەوتۆ توند نەکرابوو بەردەوامبوونی مسۆگەربکرێت.





ڕۆڵی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە دوای جەنگی ساردا لە کاروباری ئاسایشی ئەوروپادا، درێژەپێدانی وجودێکی سەربازی بوو تاوەکو ئەوروپییەکان و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دڵنیا بکاتەوە کە ئەوروپییەکان نموونەیەکی سەرکردایەتی نێودەوڵەتین. شتێکی پێویست بوو بۆ سیستەمی ئاسایشی گشتی هەروەها گرینگیش بوو بۆ ئاشتی کیشورەکە کە تیایدا ویلایەتە یەکگرتووەکان لەمەوبەر بەشداری دوو جەنگی جیهانی و جەنگی ساردی کردبوو، بەڵام ئەمە کارو ئەرکێکی بە پەلە نەبوو، هەروەها ئەوەندەش پێویست نەبوو بۆ پاراستنی ئەمریکای باکوور، بەقەد لەناوبردنی یەکێتیی سۆڤیەت لە کاتی جەنگی ساردا.

هەروەها لە جێبەجێکردنی ئەو ئەرکەدا، ویلایەتە یەکگرتووەکان پابەند بوو بە هەڵەیەکی سیاسەتی دەرەوە لە ڕێگەی پەرەپێدانی فراوانبوونی ڕێکخراوی پەیمانی باکووری ئەتڵەسی کە پۆڵەنداو هەنگاریاو کۆماری چیکی گرتە خۆ. ئەم پێوەرە جێ پەنجەی دیاربوو هەرچەندە وا کوشندە نەبوو لە سیستەمی ئاسایشی گشتیدا. لە ئەنجامدانی ئەمەش، یەکێك لە بەربەستەکانی خستەڕوو بۆ ڕۆڵی سەرکەوتووی ئەمریکا وەك سەرکردەی جیهان، واتە، سەرکردەی پاسەوانی سیستەمی لیبراڵی نێودەوڵەتی سەدەی بیست و یەك.

فراوانبوونی ناتۆ، کە لە ساڵی ١٩٩٤ پێشنیار کراو لە ساڵی ١٩٩٨ پەسەند کرا، ڕۆحی ئاسایشی گشتی پێشێل کرد، چونکە تێڕامانێکی گشتی تیا نەبوو. یەکەم گۆڕان بوو لە ڕێکخستنەکانی ئاسایشی ئەوروپا لەوەتەی جێگرتنەوەی دەسەڵاتی میخائیل گۆرباشۆڤ، کە بە هۆشیاری لەگەڵ مۆسکۆ لەم بارەیەوە دانووسان نەکرا، موعارزبوونی ڕووسیا مانای ئەوەی گەیاند کە ئەو فراوانبوونە شتێکی پەسەند نەبوو و هەروەها لە لایەن هەموو وڵاتانی ئەوروپاش شتێکی پەسەند کراو نەبوو. فراوانبوونی ناتۆ تێگەیشتنی ڕووسیای لە مەڕ زاراوەکان پێشێل کرد کە لەم ڕێگەیەوە جەنگی جیهان کۆتایی هاتبوو. لە بەرامبەردا، بۆ ڕێگە پێدان بە ئەڵمانیای یەکگرتوو تا پەیوەندی بکات بە ناتۆ، گۆرباشۆڤ پێی وابوو کە زەمانەتی ئەوەی وەرگرتووە هاوپەیمانی ڕۆژئاوا زیاتر بۆ لای ڕۆژهەڵات تەشەنە ناکات. لە کۆتاییدا، فراوانبوونی ناتۆ دەرسێکی پێشێل کرد کە وا دەزانرا لە جەنگە گەورەکانی سەردەمی مۆدێرنەوە هاتووە، کە هەل بەهێز دەکات بۆ دامرکاندنەوەو هێورکردنەوەی ڕەوشی دوای جەنگ لە ڕێگەی تەواوی لکاندنی حیزبە ونبووەکان

بۆ یەك سیستەمی نوێ، هەروەك ئەم سەین و بەینە ڕوویدا پاش جەنگەکانی ناپلیۆن و جەنگی جیهانی دووەم، بەڵام لە پاش جەنگی جیهانی یەکەمەوە ڕووینەدا. سەبارەت بە بەهاوڵاتیش، فراوانبوونی ناتۆ ڕووسیای کردە هاوڵاتی پلە دووی ئەوروپا، ئەمەش لەبەر دوو گریمانەی فراوانبوونەکە، گریمانەی یەکەم دیارەو دووەمیش نادیار، ئەوەبوو کە ناتۆ دەبێتە یەکەم ڕێکخراوی گرینگی ئاسایشی ئەوروپی لە ماوەی دوای جەنگی سارد و ڕووسیاش هیچ هەلی پەیوەندیکردنی نییە بە ناتۆ. لەبەر ئەم هۆیانەش جۆرج کێنان، دیپلۆماتی نێوداری ئەمریکی و مێژوونووسی دیپلۆمات بە فراوانبوونی ناتۆی وت " چارەنووسترین هەڵەی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکایە لە تەواوی سەردەمی دوای جەنگی ساردا".

ئەم فراوانبوونە کاریگەری لە سەر ڕووسیا هەبوو بەوەی کردی بە وڵاتێکی دوورەپەرێز. بەهۆی جەنگی ناتۆوە، سەرکردایەتی ئەمریکا دژی یۆغسلافیا لە ساڵی ١٩٩٩ بیربۆچوونێکی تورەو ڕقهەڵگرو تۆڵەی لای ڕووسییەکان دروستکرد بەرامبەر بە ویلایەتە یەکگرتووەکان و وای لە سەرکردەکانی ئەو وڵاتە کرد ڕەنگدانەوەیەکی زۆر ڕقهەڵگر دژی دەستپێشخەری نێودەوڵەتی ئەمریکا بوەستننەوە. لە خراپترین باردا، فراونبوونی ناتۆ توانای گۆڕینی ئەرکی سەربازی هاوپەیمانی ئەتڵەسی بگێڕێتەوە بۆ ڕێگەگرتن لە جەنگی سارد، وێرانکردنی ڕێکەوتنەکانی سنووری چەك کە ناوەڕۆکی سیستەمی ئاسایشی گشتی پێکهێنا، فیرقەی سەربازی ئەوروپای دروستکردەوە- سەرەڕای ئەم فیرقانەی کە پێشتر ڕۆژئاوا لێی بووە لە ساڵانی ١٩٤٥ تا ١٩٨٩. بە باشترین شێوە ئەرکێکی خەڵەتێنی بەسەر ویلایەتە یەکگرتووەکاندا سەپاند بۆ ئاشتکردنەوەی ناتۆی فراوان لەگەڵ ئەوەی کە بەڕاستی گرینگ بوو بۆ ئاسایشی ئەوروپی بەوەی ڕووسیای پابەند کرد بە پێوەرەکان و نەریتەکان و دەزگاکانی ئاسایشی گشتی.

فراوانبوونی ناتۆ نموونەیەکی سەرکەوتنی ماوەی دوای جەنگی سارد بوو، لە ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ڕووی ڕەوشی ناوخۆ و تێڕامانە نێودەوڵەتییەکان. سەرۆك بیل کلینتۆن ئەو سیاسەتەی بەکاربرد بۆ دڵخۆشکردنی هاوڵاتیانی ئەمریکی لەگەڵ پەیوەندییە نەژادییەکان بۆ ئەندامی نوێی ویلایەتەکان، لەگەڵ چاودێریکردنی بردنەوەی دەنگەکانیان لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی ١٩٩٦. ئەمە ئاسایی بوو لە سیستەمی سیاسی ئەمریکا، کاتێ گروپی بەرژەوەندییەکان بە شێوەیەکی ڕووتین و بیرتەسکانە جەختیان لە سەر بانگەشەکان دەکردەوە. هەرچەندە ئەو ڕاڕەوەی بۆ فراوانبوونی ناتۆ زۆر بەهێز نەبوو، بەڵام بە هەر حاڵێك بێت



سەرکەوتوو بوو، چونکە بەرهەڵستکارکەی ڕووبەڕووی دەبۆوە لە ڕووی سیاسییەوە بێ هێزتر دەبوو. لە کاتی جەنگی ساردا، ئەو پێورەی پێشدەخرا زۆر بە جدی مامەڵەی لەگەڵ دەکرا. پیاچوونەوەیەکی چڕ و وردی بۆ کرا و بووە بابەتی مشتومڕێکی گەرم، چونکە وەك جێهێشتن لە سیاسەتی ئاسایشی ئەمریکا، ئەو ستوونانەی تێوەگلا بوون زۆر بەرز بوون، بەڵام لەگەڵ کۆتایی جەنگی ساردا، پێشبینییەکانی ناوخۆ زیاتر بوون و گفتووگۆی لە بەرژەوەندی فراواتردا کرد. کاتێ کاتی دەنگدان پێویستی بە فراوانبوون بوو، بەلای کۆنگرێسەوە واپێدەچوو داوایەکی ئاسان بێت بۆ جێبەجێکردن، چونکە هیچ کولفەیەکی ڕاستەوخۆی نەسەپاند بەسەر ویلایەتە یەکگرتووەکان و بەرژەوەندی ڕێکخراوەکانی تر. ئەندامانی ئەوروپی هاوپەیمانەکە ڕازیبوون پێی، چونکە دەیانویست ئەمریکییەکان نیشتەجێ بکەن و، چونکە وایان دانا کە ویلایەتە یەکگرتووەکان هەر کولفەیەك هەبێت دەیدات.

فراوانبوونی ناتۆ هەڵەیەك بوو لە جێی خۆی نەبوو بۆ پەیوەندی ئەمریکییەکان لەگەڵ تەواوی جیهان، وەك هەڵەیەکی نێو تێنس بوو کە کاتێ تۆپەکە دەڕوات ئیتر ناگەڕێتەوە، بەڵام مانای ئەوەش نەبوو کە ڕقی وڵاتانی ناوەوەی ڕۆژئاوا هیچی تر ڕقیان لە جەنگ نەبێتەوە. بێ جەنگی، پابەندنەبوونی یەك لەدوای یەکی ئاسایشی گشتی، دەکرێ حیساب بکرێت لە سەر مانەوەی زۆری باکووری ئەمریکا و ڕۆژئاوای ئەوروپا و ژاپۆن. ئەمە بە متمانەوە یەکناگرێتەوە لەگەڵ ڕووسیای دوای جەنگی سارد.

لە لای ڕووسەکان پابەندبوونی بەرایی بۆ ئاسایشی گشتی و دەربڕینی بەهاکان بە فراوانی هاوبەش نەکرا یان لەڕەگدا چووبێتە خوار بۆیە فراوانبوونی ناتۆ هێزی وێرانکردنی ئەو پابەندنەبوونەی هەبوو. ئاسایشی گشتی ئەوەی خستەڕوو تەنها یەك پیاو حەزی پێی هەبوو ئەویش میخائیل گۆرباشۆڤ بوو. هەرکە گەیشتە ڕێکەوتن یەك بەدوای یەکەکان لە سەر چەك، ڕێگەی دا بەو وڵاتانەی کە کۆمۆنیست تییاندا فەرمانڕەوا بوو لە ئەوروپای ڕۆژهەڵات سەربەخۆیی سیاسی خۆیان دووپاتکەنەوە، لایەنی سەربازی سۆڤیەت ڕقی لەم کارەبوو و دژی دەوەستانەوە. هاوڵاتی یەکێتیی سۆڤیەت ڕاوێژکاریان پێ نەدەکرا. لەگەڵ دیارنەمانی یەکێتیی سۆڤیەت، پابەندترین کەس گۆرباتشۆف) بە هەوڵی لیبراڵ بۆ ئاسایش لە دەسەڵات کەوت. لەگەڵ ئەوەش، کۆتایی سەردەمی کۆمۆنیست بە هاوسەنگی پێشکەوتنێکی بەرچاو بوو بۆ ڕوانگە

مەودا درێژەکان بۆ سیستەمی ئاسایشی گشتی، چونکە ئایدیۆلۆژیای بەڕێوەبردنی یەکێتیی سۆڤیەت لەگەڵ ئەو سیستەمە یەکی نەدەگرتەوە.

گۆرباشۆڤ خۆی کۆمۆنیستێکی ئۆرتۆدۆکسی نەبوو. لە مەسەلەی ئاسایشدا، لە کۆتایی خاوەنداریێتیدا، هەرگیز کۆمۆنیستانە نەبوو. هەروەها تەنها لە سیستەمێکی سیاسیدا بە قەد ئەوەی خۆی سەرکردایەتی دەکرد کە سیستەمێکی مەرکەزی بوو، یەك کەس دەیتوانی کاریگەری ڕادیکاڵی لە گۆڕانی پەیوەندی وڵاتەکەی بکات لەگەڵ تەواوی جیهاندا. ڕووسیای نوێ ئازاد بوو لە بنەمای پابەندبووی ململانێی نێودەوڵەتی کە پێناسی یەکێتیی سۆڤیەتی کردبوو، بەڵام هێزە کۆمەڵایەتییەکان بۆ بەرەو پێشبردنی شارستانی بوونیان دەکرد بێ هێزتر بوو لەوەی ڕۆژئاوا. گەلێکیان چەوسێنرانەوە و بەلاوەنرانن لە ماوەی دەیەی درێژی حوکمی سۆڤیەتدا.

سیاسەتی نوێی دەرەوەی ڕووسیا جەختی کردەوە لە سەر بەردەوامبوونی ڕووسیا لە گرینگی ئەورووپا و جیهان، مافیشی بۆ سەرکەوتن بەسەر هەرێمی پێشووی یەکێتیی سۆڤیەت دووپاتکردەوە. لە واقیعدا، ڕووسیا وەك وڵاتەکانی تری دوای جەنگی سارد سەرقاڵی کاروباری ناوخۆ بوو بۆ وەدەرنانی زۆربەی ئەو شتانەی کە لە دەرەوەی سنووری خۆیدا ڕوویاندەدا. هەروەها پەیوەندییەکانی لەگەڵ وڵاتانی تری جیهان کۆنترۆڵ کران لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی سارد بە هۆی تاکە هۆکارێکی چڕو پڕ، ئەویش بێ هێزیەکەی بوو. ڕووسیا دەیتوانی هێزێکی کەمتر بهێنێت بۆ بەرگەگرتنی سەردەمی نێودەوڵەتی، لە هەر کاتێکی تر لەوەتای سەرەتای سەدەی هەژدەم، بۆیە حکوومەتی ڕووسیا جگە لە موعارزبوونەکەی و نارەزایی دەربڕین لە مەڕ فراوانبوونی ناتۆ هیچی کارێکی تری نەکرد. ئازایەتی ئابووری ڕووسیا بێ هوودە بوو. لە کۆتایی دەیەی یەکەمی ماوەی دوای جەنگی سارد، بەرهەمی ڕووسیا زۆر نزیك بوو لەوەی هۆڵەندا، وڵاتێك بوو دە یەکی دانیشتوانەکەی و ٢,٠ ڕێژەی سەدی قەبارەی جوگرافییەکەی ڕووسیا بوو.

لە ماوەی سۆڤیەت و هەروەها لە سەردەمی قەیسەرەکانیش شوێنی ڕووسیا لە جیهان پشتی بەستاوە بە هێزی سەربازی تا هێزی ئابووری. لێرە کەمبوونەوەی هێز کاریگەری خۆی هەیە. ئامێری گەورەی سەربازی کۆمیونیزم بونیاتی نا زۆر بەهێز بوو، شەڕی ناوخۆی بردەوە، سوپاکانی هیتلەری شکست پێ هێناو ئەورووپای داگیر کرد تا ناوەڕاستی ئەڵمانیاش چوو، هەروەها گەیشتە هاوپەیمانی ڕۆژئاوا وەك دەوڵەمەنترین وڵاتی دیموکراسی پیشەسازی مووشەك بۆ مووشەك و دەبابە بۆ دەبابە کاتێ هاوکاری کڕیارەکانی لە سەرانسەری جیهان کەمبوونەوە. سێ چارەگی





ژمارەی پیاوەکان لە هێزە چەکدارییەکاندا بەهەدەرچوون. هەوڵەکان بۆ ڕزگارکردنی چەکەکان بێ هوودە بوو، نە پارێزران و نە شوێنێکیشیان گرتەوە. گەلێ لەو کارگانەی کە ئەو چەکانەیان دروست دەکرد لە وڵاتانی دەرەوە بوون پاش ڕووخانی سۆڤیەت لە کار خران. وڵاتی نوێی ڕوسیا بە دەر بوو لە بونیات نانەوەی هێزێکی گەورە. ناشکرێت باج کۆیکاتەوە بۆ هاوکاری دەزگایەکی سەربازی. ناشتوانێت نە گەنجی ڕووسی قایل بکات یانیش ناچاریان بکات کە پەیوەندی بە سوپاوە بکەن. لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا سەربازی ڕووسیا تەنها سێبەری دە ساڵ پێش خۆی بوو. ڕووسیای نوێ لەو ئاستەدا نەبوو سوپا بنێرێت بۆ ئەرکی داگیرکردن لە لای ڕۆژئاوا و ئەوەندەش هەژار بوو بۆی نەدەگرا خۆی بخاتە نێو موجازەفەی ململانێی سوپای دوژمنەکانی.

بۆیە هەرکە سەدەی بیست کۆتایی هات، بەشداری ڕووسیا لە سیستەمی ئاسایشی گشتی کەمتر وەستا لە سەر قەناعەت تا بێ هێزی. تا ماوەیەکی درێژ ئەمە بنچینەیەکی باش نەبوو بۆ بەردەوامی دڵسۆزی ڕووسیا بۆ بنەماکان و پێگەکانی ئاسایشی گشتی، چونکە داوای ئەوەی کرد کە ڕووسیا دەبێ بێ هێز بێت، بەڵام ئاسایی بوو کە ڕووسیا بەردەوام بوو لەگەڵ پەیامەکەو لەگەڵ ڕۆحی سیستەمی ئاسایشی ئەورووپی لە دوای جەنگی سارد، تەنانەت هەڵوێست و دڵسۆزیشی بەرامبەر ئەو سیستەمە گۆڕا. ئەڵمانیای ڕۆژئاوا یەکەم کەس بوو ڕێکخستنە سەربازی و سیاسییەکانی دوای ساڵی ١٩٤٥ ی قبوڵ کرد، چونکە هیچ ئیختیارێکی تری نەبوو، پاشان بە پێی تێپەڕبوونی کات بینی ئەو قبوڵکردنە خزمەتی بەرژەوەندییەکانی ئەڵمانیا دەکات. ڕەنگە بۆ ڕووسیا و ئاسایشی گشتیش ئاوا بێت. ئاڕاستە تازەکانی کۆمەڵایەتی و ڕقبوونەوە لە جەنگ لە ڕۆژئاوا زیاتر بوو تا ڕووسیا، بەڵام لە ڕووسیا ئەو ئاڕاستانە بێهێز بوون و تازە دەسپێك بوون لەوێ.

تەنانەت خولیای ڕووسیا بۆ بە شارستانی بوون، بە تەواوی بێ باوەڕی ڕووسیا بۆ ڕۆح و پەیامی ئاسایشی گشتی لەگەڵ ئەوەی ڕۆژئاوا گۆڕانی بەسەرداهات. لە هەموو بوارێکەوە جگە لە بێ هێزی دوای حەنگی سارد، بارودۆخی ڕووسیا جیا بوو لەوانەی ئەندامانی وڵاتانی ناوەوەی ڕۆژئاوا. سنوورەکانی ڕۆژئاوا بە توندی و بە باشی هێوربۆوە. ڕووسیا وا نەبوو، سنووری هۆسە هەراو توندوتیژی لە ماوەی دوای جەنگی ساردا هەبوو. بە تایبەتی، گۆڕانی سنوورەکان کە چەند گروپێکی پێکهێنا، کتوپڕو و بێ ئارەزوو کەمینەکان لە وڵاتە نوێیەکاندا زەق بوونەوە، ئەوانەی بەشێك بوون لە زۆرینە لەو شوێنانەی کە لێی ژیا بوون لە چەن دەیەك، یا سەدەیەك کۆششی

سوپا بەدی هات و سوپا دروست بوو بۆ گۆڕینی ئەو سنوورانە. ئەمە بووە هۆی بەرپابوونی جەنگەکانی باڵکان (Balkan Wars) لە ساڵانی (نەوەدەکان) ١٩٩٠، کە بەرپابوو لە لایەن و بەناوی سربییەکان کە بەشێك بوون لە گەورەترین گروپی نەتەوەیی لە یۆغسلافیا، بەڵام خۆیان لە نێو وڵاتە نوێیە سەروەرییەکەی کرواتیا و بۆسنیادا دۆزییەوە هەروەها لە هەڵوێستێکی ناهەمواردا بوون لە پارێزگای یۆگسلافیا و کۆسۆڤۆدا کاتێ فیدراسیۆنی یۆگسلاف پارچە پارچە بوو بە دژی ئاواتی ئەوان.

کۆتایی یەکێتیی سۆڤیەت چەند ملیۆن ڕووسی لەو هەڵوێستە بەجێهێشت. کەمینەی دانیشتوانی ڕووسی لە ئۆکرانیا دروستکرد، هەروەها لە هەر سێ وڵاتی باڵتیك (ئیستۆنیاو لاتڤیاو لیسوانیا) هەروەها لە کازاخستانیش. هەموو ئەمانە، ئەوانەی ئاخیری کەمتر تاقەتی شەڕیان هەبوو لەوانەی یەکەم.

پەیوەندی ڕووسیا لەگەڵ وڵاتانی باڵتیك بە تەواوی ئازاد بوو لە تێکەوڵاوبوون لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا. حکوومەتی ڕووسیا دڵخۆش نەبوو بە بۆچوونی ئەوەی ئەو وڵاتانە ببن بە ئەندام لە ناتۆ و نارەزایی دەربڕی لەبارەی مامەڵەکردنی ڕەگەزی ڕووسی کە لە وڵاتانی خۆیان دەژین، هەموویان مافی تەواوی هاوڵاتیبوونیان نەبوو، بەڵام ڕووسییەکان بە گشتی سەربەخۆیی باڵتیکیان پەسەند کرد و شتێکی ڕەوایە و ناتوانرێت وازی لێبهێنرێت. ئیستۆنیاو لاتڤیاو لیسوانیا وەك بەشێك لە ئەورووپا سەیر دەکران نەك ڕووسیا. سەبارەت بە کازاخستانیش، زۆربەی ڕووسییەکان دابەشکردنی سنووریان لە ڕووسیای نوێی دوای کۆمینیزم دەستکرد و هەڕەمەکی بوو، هەروەها هەوڵی ڕووسیا بۆ لکاندنەوەی بەشی باکووری کازاخستان بە ڕووسیا وەك پرسێك بە تەواوی بە دەر نەبوو لە پرسیار، بەڵام کازاخستان دەکەوێتە دووری ئەورووپا، هەروەها هەر ململانێیەك کە ببێتە هۆی بەرزی ورژاندنی هەست تەنها کاریگەری گونجاویان لە سەر هێزە رۆژئاواییەکاندا هەبوو.

ئۆکرانیای نوێی سەربەخۆ، بە پێچەوانەوە، کەوتبووە نێوان ڕووسیا و رۆژئاوا. دراوسێی لە لای رۆژئاوا پۆڵەندا بوو کە ئەندامێکی ناتۆیە. هەروەها سنووری نێوان ڕووسیا و ئۆکرانیا، کە ١٨ ملیۆن ڕەگەزی ڕووسی تیادا دەژی، جەختیان لە سەر بەشی رۆژهەڵاتی ئۆکرانیا کردەوە، ئەمە بەلای زۆربەی ڕووسییەکان کارێکی هەڕەمەکی بوو لە سەرەنجامی جەنگی ساردا وەك ئەوەی ڕووسیا لە کازاخستان جیا کردەوە.



لە هەموو کێشەکانی ڕووسیاو ئۆکرانیادا، باروودۆخی نیمچە دوورگەی کریمین (Crimean) بەهێزترین هەستی هەبوو. ڕووسییەکان هەستیان بە هاوپێچەکی تایبەت کرد بۆ کریا- کاترینی مەزن کە داگیری کردبوو دژی تورکەکان لە سەدەی هەژدەهەم و ڕووسییەکان دواتر لێی نیشتەجێبوون، بەڵام سەرکردەی سۆڤیەت نیکیتا خرۆشکێڤ دای بە ئۆکرانیا لە ساڵی ١٩٥٤، لەکاتێکدا گواستنەوەی دەسەڵات لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر لە نێو ڕووسییەکان هێمایەکی بێ مانا بوو. تیژترین هەستی خاوەندارێتی ڕووسییەکان جەختی کردەوە لە سەر شاری سیڤاستۆپۆڵی کریمین، ماڵی بەندەری پاپۆڕە دەریاییە ڕەشەکانی ڕووسیا بوو. مەلحەمەیەك و بە کولفەترین شار بوو لە ڕووی بەرگرییەوە لە جەنگی جیهانی دووەم، وەك ئەوانەی لکێنراون بە لینینگراد و ستالینگراد هەستا بە وەگەڕخستنکردنی ئەو وڵاتە.

لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا، حکوومەتی ڕووسی و ئۆکرانی پەیوەندییەکانیان بە چەند تاکتیکێك هەڵسوراند. زۆر سووربوون لە سەر ئەو هەستەی بۆ بەهێزکردنی پێگەی پەیوەندییەکانیان بە هۆی دروستکردنی دوژمنایەتی یەکێکی تر. هەرچەندە، پەیوەندەکانیان زۆر وا ئاسان نەبوو، ڕێکەوتن لە سەر گواستنەوەی چەکی ناوکی سۆڤیەت لە ئۆکرانیا و ڕووسیا لە ساڵی، ١٩٩٤ هەروەها بەپێی پەیمانێك کە لە ساڵی ١٩٩٨ مۆرکرا بنکەی دەریایی لە سیڤاستۆپۆڵ بۆ ڕووسیا بێت بۆ ماوەی بیست ساڵ.

بەپێچەوانەی ئەڵمانەکان کە بە بێ وسیتی خۆیان لە پۆڵەندا و چیکۆسلۆفاکیا دەژیان لە پاش جەنگی جیهانی یەکەم، ڕووسەکان لە ئۆکرانیا هەستی نەتەواتیان زۆر بێهێز بوو و لە هەموو حاڵەتێکیشدا جیاوازی لە نێوان ڕووسییەکان و ئۆکرانییەکان تیژ نەبوو وەك ئەوەی لە نێوان ئەڵمانییەکان و پۆڵەندییەکاندا هەبوو. ڕووسییەکان لە ئۆکرانیا هەستیان بە دڵسۆزییەك کرد بۆ ئەو شوێنانەی کە لێی ژیا بوون و هەروەها بۆ نەتەوەی ڕووس، بەڵام نەك بۆ وڵاتە تازە دروستکراوەکەی ڕووسیا. خۆیان ڕێکنەخست بۆ دەنگهەڵبڕینی سکاڵا دژی یان بەدوای قەرەبوو نەکەوتنەوە لە حکوومەتی مەرکەزی ئۆکرانیا لە کیف. هەستیان بە دڵساردییەکی زۆر نەکرد. حکوومەتی ئۆکرانیا بە چاودێرییەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکردن، بە گشتی قەدەغە دەکران، دەشەوسێنرانەوە بۆ نموونە لە سەر بەکارهاوردەی زمانی ئۆکرانی.

هێشتا، شیانی ململانێی دوای ستایلی یۆگسلافیا لە ئۆکرانیا مایەوە. سیاسەتی داپلۆسێنەری ڕووسەکان لە لایەن حکمەتی ئۆکرانییەوە، یان هەل و مەرجی ڕادیکاڵی ئابووری لە

سەر سنووری لای ڕووسیا هێزی ئەوەی هەبوو بۆ بەرهەمهاوردەی هەستێکی ئینسیحابی. گەر ململانێ لە نێوان ڕووسیا ئۆکرانیا دەستی پێکردبا، کاریگەرە پەرش و بڵاوەکانی ئەو ململانێیە لەئەوروپاوە بۆ باکووری ئەمریکا دەچوو، ئەو ڕێکەوتنانەی کە ئاسایشی گشتی لە سەری وەستاوە دەخستە مەترسییەوە. سنووری ئۆکرانیا و ڕووسیا قۆناغێکی هەرە گرینگی جیهانی دوای جەنگی سارد بوو.

بارودۆخەکانی ڕووسیا جیا بوو لەوانەی وڵاتە زلهێزەکان بە ڕێگایەکی تر کە لە سەر سیاسەتی ئاسایشی ڕووسیا لە دایك بوو. لە سەرروی هەموویانەوە، سیستەمی ئاسایشی گشتی کە دەبێ گشتی بێت. کێشەی پێداویستی گشتی ئەمە دەخات ڕوو: هەموو وڵاتە پەیوەستەکان دەبێ بەشداری لە فیکرەکە و بنەماکانی بکەن. لە هەمانکاتیشدا دراوسێی نێودەوڵەتی کە وڵاتە ڕۆژئاواییەکانی لێ بوو ئارام و ئاشتوەر بوو، ڕووسیا زۆر بە سامان نەبوو.

مۆسکۆ ڕووبەڕووی هۆسەی سیاسی شانبەشانی سنووری باشووری خۆی بۆوە لەگەڵ کۆماری سۆڤیەتی پێشووی هەرێمی کۆکۆکەس و ئاسیای ناوەڕاست. بە بەراورد لەگەڵ وڵاتە زلهێزە ڕۆژئاواییەکان، ڕووسیا زۆر بەهێزتر بوو لەمەی نوێی، خەباتی دەکرد لە ڕووی سیاسییەوە بە نارێکی لەگەڵ وڵاتە بێ هێزەکان. هەروەها ڕووسیا سەربازی نارد بۆ نێو سنوورەکانی تر، وەك بۆ لەو شوێنانەی پێشتر بەرێوەی دەبرد و لە هەندێ حاڵەتیشدا هەرگیز بەجێی نەهێشت.

پاڵنەر گەلێك هێزەکانی ڕووسیای ناردە ئەوێ یانی لەوێ پاراستی: داواکارییەکان لە حکوومەتە مەحەلییەکانەوە لە مەڕ ترسی ئەوەی کە هۆسە لەلای باکوور بڵاو دەبێتەوە بۆ نێو ڕووسیا، ئارەزوو بۆ کاریگەری سیاسی کە سوودی ئابووری هەبوو لە سەر حیسەی دەخلی نەوت حیساب دەکرا. لە کاتێکدا ڕووسییەکان هەستی نۆستالژیایان جوڵا و قسەیان لە سەر یەکگرتنەوەی بەشەکانی یەکێتیی سۆڤیەت بوو لە هەندێ باردا، بەڵام حکوومەتەکانیان نە بەکاریان برد نە کارێکی جیدیشیان کرد بۆ بەدەستهاوردەی ئەمە. هەروەها ئەوەی ڕووسیا کردی لە کۆکۆکەس و ئاسیای ناوەڕاست قبوڵی ڕاستەوخۆی سیستەمی ئاسایشی جەنگی سارد لە ئەورووپا نەکرد.

لە دەیەی یەکەمی ماوەی دوای جەنگی ساردا، ڕووسیا دوو شەڕی باشووری کرد، هەردوو لە پارێزگای چیچان لە نێو سنووری ڕووسیا خۆی، یەکەم جار لە ساڵی ١٩٩٤ دەستی پێ کرد، دووەم جار لە ساڵی ١٩٩٩. یەکەم شەڕ دووبارەبوونەوەی جەنگە دڕندەکانی داگیرکردن بوو بەرپا



بوو لە سەر هەمان ناوچە و دژی هەمان گەل لە لایەن سوپای قەیسەرییەکان لە سەدەی نۆزدە و کۆمۆنیستەکان لە سەدەی بیستەم.

بێگومان دڕندانە بوون، بەڵام بەهەقیقەت جەنگەکانی چیچان هێمایەك بوو بۆ بەهێزبوونەوەی ئیمپراتۆری پێشوو. نەیتوانی هاوکاری ئەندامێتی بکات وەك هەڵوێستێکی باش لەو سیستەمە ئاسایشییەی کە ڕێگان و گۆرباشۆڤ دروستیان کرد. یەك هۆ هەبوو، خاسیەتی ڕووسیای ماوەی دوای جەنگی سارد بە خستنەڕووی لە سەر چیچان بەربەستێکی بەهێزی خستەڕوو بۆ بوژاندنەوەی ئیپراتۆر ئەویش بێ هێزی وڵاتەکە بوو. لە شەڕی یەکەمدا هێزەکانی چەکداری ڕووسیا، بە خراپی مەشق پێکران، بە خراپی ڕابەری کران، دۆڕان لە لایەن باندێکی بچووکتری چیچانییەکان کە بەهرەدار بوون لە کەل و پەلی گۆریلاو لە سەروی هەموو ئەوانەشەوە زۆر سووربوون لە سەر سەرکەوتن لە چاو ڕووسییەکان. وێڕای ئەمە، لە ڕووی یاسایییەوە هیچ ململانێیەك و هیچ شەڕێکی داگیرکاری ئیمپراتیۆری لە کۆمەڵگای نێودەوڵەتیدا دانی بە چیچان نەنا وەك بەشێك لە ڕووسیا. چیچانییەکان وێڵ بوون بەدوای سەربەخۆیی لە کاتێکدا ڕووسیا پێوەری نێودەوڵەتی پێشێل دەکرد. لە جەنگی دووەمدا (گەر لەیەکەمدا نەبێت) ڕووسیا هۆی شەرعی هەبوو بۆ ئەنجامدانی هەندێ جۆری کردەی سەربازی ( هەرچەند ئەو جۆرە کردە سەربازیانەی کە ئەنجامیدا بۆردوومانێکی زۆر بوو بۆ سەر مەدەنی)، هۆی هەراوهۆسەی پارێزگاکە پاڵی بە سوپای چەکداری ڕووسەکان وەنا جەنگی یەکەم بەرپا بکەن، ئەوەبوو سوپای ڕووسیا سەرەڕۆیانە بۆ لای باکوور چوو و هێرشێکی پڕ لە تاوانی کردە سەر ئەوان. لە مانگی تەموزی (١٩٩٩) دا جەنگی دووەم بە هێرشێك لەلایەن ئیسلامە ڕادیکاڵییەکان، پێگەی چیچان، دەستی پێکرد دژی پارێزگای فرەڕەگەزی داغستان لە ڕووسیا بەرەو ڕۆژهەڵات.

دڕندەیی هێرشی ڕووسیا لە دواجاردا ڕەگی لە بەشێکی ناوچەکەدا داکوتا، بەمەش ڕووسیا بەشداری بەشێکی خاسیەتە سەرەکییەکانی بێ جەنگی ڕۆژئاوا کرد ئەویش ڕقی لە کوشتار لە سەرکەشی سەربازییەکانی بوو. کەچی فەرماندە ڕوسییەکان لە دوورەوە پێگە چیچانییەکانیان بۆردومان کرد و بەهەزاران مەدەنیان کوشت. لە پرۆسەکەدا ڕووسییەکان دوودڵ بوون لە جەنگی نێو شاردا پاش هێرشێکی بە کولفە بۆ سەر گرۆزنی پایتەختی چیچان. لەشەڕی یەکەمدا هێزەکانی ڕووسیا شارەکەیان وێران کرد بە چەك و بۆردومانی ئاسمانی، کە ئەمەش بە شێوەیەکی ئاشکرا هێمایەکی ناشارستانی بوو. لە کاتی جەنگی جیهانی دووەمدا سەربازەکانی ڕووسیا

قارەمانانە جەنگان، کوشتارێکی زۆریاندا تاوەکو دووبارە شارەکان لە ستالینگرادەوە تا بەرلین بگرنەوە. پەنجا ساڵ زیاتر جێگرەوەکانیان بێزیان نەهات کە لە مەجالێکی بچووکتریشدا دوای ئەوان بکەون. حکوومەت تاکتیکی سەربازی خۆی بەکارهێنا بۆ وەڵامی حەساسیەتی خەڵکی گشتی و زیانەکانی ژیان. ڕووسییەکان بە هەقیقەت هەستی دژە شەڕیان لەگەڵ چیچانیەکان لە ساڵی / ١٩٩٦ / هەمان جۆری هەستی دژی شەڕی لیبراڵی ڕۆژئاوا بوو لەدوا دەیەکانی سەدەی بیستەم.

سیستەمی ئاسایشی گشتی ئەوروپا دووچاری ڕووبەڕووبوونەوەی دوا جەنگی دوای جەنگی سارد بۆوە کە موعەرەز بوو بۆ لێك ترازان لەگەڵ هەرێمەکانی تر. هۆکاری هەرە سەرەکی و بەهێزی ئەمەش زیاد بوونی کتوپڕی چەکی ناوکی بوو.

وڵاتەکانی دەرەوەی ئەوروپا کە هیچ بەرپرس نین لە سیستەمی ئاسایشی گشتی دەتوانن چەکی ناوکی دروست بکەن و هۆکارێك بێت بۆ هێرش کردنە سەر ئەوروپا یان ئەمریکای باکوور. لە وەڵامی ئەم مەترسییەدا لە جەنگی دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا حکوومەتی ئەمریکی چالاکانە گەرا بەدوای دانانی سیستەمێکی بەرگری دژی هێرشەکانی موشەکی بالیستیك کە لە دەرەوەی سنوورەکانی سیستەمی ئاسایشی گشتی دەنێردرێن. لە کانوونی یەکەمی (٢٠٠١)دا ئیدارەی بۆش ڕایگەیاند کە ویلایەتە یەکگرتووەکان سەحبی دەکاتەوە لە پەیمانی (ABM) ی ساڵی (١٩٧٢) تاکو بەرگری مووشەك دابنێ و گەشەی پێ بدات، ئیدارەی بۆش سوور بوو کە ئەمە بنەمای زاڵبوونی بەرگری تێك نادات کە پەیوەندییە سەربازییەکان لەگەڵ ڕووسیا بە پێی ئەو بنەمایە بایەخی پێدراوە، چونکە ویلایەتە یەکگرتووەکان هەوڵ نادات بۆ ئاوەژووکردنەوەی توانای ڕووسیا و بە تەواوی وێرانی بکات.

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە نیازی نەخشەکردنی سیستەمێکی بەرگری مووشەکی بالیستیکی زۆر چڕوپڕ بوو بۆ وەستاندی هێرشی مەودا بچووك لە لایەن وڵاتانی دەرەوەی جیهان، بەڵام بۆ هێرشکردن و تۆڵەی دژی هێرشی ناوکی بۆ سەر ڕووسیا والە ڕووسیا دەکات موشەکی زیاتر دەستەبەر بکات و پابەند نەبێت بە پەیمانەکانی تر، بەمەش سیستەمی ئاسایشی گشتی



تێك دەچێت. مەبەستەکە قەدەغەکردنی زیادبوونی چەکی ناوکی بوو کە نابێت بەشدار بێت لە بنەماکانی ئاسایشی گشتی لە کاتێکدا خۆی ئەمەی دووپاتکردەوە.(*)

تاکە مەترسی هەڕەشەی هێرشی ناوکی لێ دەکرا ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئاسیای ڕۆژهەڵات بوو کە ئەو ناوچەیەش گرنگ بوون بۆ ئاسایشی ئەوروپا. هێزەکانی ئاسیا و ڕووسیا بە هۆی جیا جیاوە دوو گرینگترین هێز بوون لە لە سیستەمی ئاسایشی گشتی ئەوروپا، ئەمە ڕووسیا لە بەر چاکی جوگرافی و پابەندبوونی سیاسەتەکەی بەرامبەر بە ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ پەیمانەکان و تەکنەلۆژیا ٠

ئاسیای ڕۆژهەڵات بەشێکی گرنگی جیهان بوو جگە لە پەیوەندییەکەی بە ئەوروپا شان بەشانی ئەوروپا و ئەمریکای باکوور یەکێك بوو لە سێ سەنتەرە چاپووکانەکەی بەرهەمی ئابووری. هەردوو گەورەترین جەنگی ماوەی جەنگی سارد لە کۆریا و هیندۆ چینەکان بوو، بەڵام وڵاتی گەورەی ئابووری ژاپۆن و گەورەترین سوپا و سێیەم گەورەترین وڵات لەچەکی ناوکی (چین) بوو، هەردووکیان دەکەوتنە هەرێمەکە کەواتە بۆ هەردووکیان ئاسایش و ئابووری ئاسیای ڕۆژهەڵات وەك یەکێك لە سامانە گەورەکەی تەواوی هەسارەکە بوون لە سەدەی بیست و یەکدا.

---

* بۆ ئەوەی کاریگەرتر بێت، سیستەمی ئەمریکا بۆ بەرگری مووشەکی بالیستیك دەبوایە بەدوو تاقی کردنەوەدا تێپەربێت یەکێکیان تەکنیکی بوو دەبوایە توانای بەرگری کردنی بەسەرکەوتوویی هەبوایە دژی هێرشی مەودا کورت کە ڕەنگە یەکێك لەوڵاتە زلهێزەکانی دەرەوە بنرێت. تەنانەت ئەوە تەکنەلۆژیایەکی بەهێزبوو لەسەرەتای وڵاتی نوێدا سەرەرای توێژینەوە و گەشەپێدان بۆ ماوەی چەند دەیەك و سەرف کردنی بەدەیان بلیۆن دۆلار، وەزارەتی بەرگری ئەمریکا سیستەمێکی بەرهەم نەهێنا بوو کە متمانەی هەبێت. تاقی کردنەوەی دووەم سیاسی بوو دانانی قەڵغانێکی موشەك دەبوایە وەڵامەکان بداتەوە لەلایەن وڵاتانی تر کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی لە مەوقعێکی بەهێزتر جێ دەهێڵێت، یەکێك لەو وەڵامانەی ئەوەبوو، بریارێك دەبوو لەلایەن رووسیا یان چین یانیش هەردووکیان بۆ بەهێزکردنی توانا سەربازییەکان لە ڕێگای فرۆشتنی بۆمب و مووشەك هی ئەو وڵاتانەی کە دژیان ئەو سیستەمە دانراوە بدرێت. بۆیە تاوەکو بەسوود بێت بەرگری مووشەکی بالیستیك سیستەمی ئەمریکا داوای بەلانی کەم رازیبوون و هاوکاری وڵاتانی تر دەکات.

رووسیا سنووری لەگەڵ چین و کۆریا و لەوانیش گرنگتر ژاپۆن هەبوو. ویلایەتە یەکگرتووەکانیش خۆی هێزێکی زەریای هێمن بوو. هێزە دەریایی و ئاسمانییەکان سەنتەر بوون بۆ ئاسایشی ئاسیای رۆژهەڵات، ئابوورییەکەی پەیوەست بوو بە بازرگانی و ئیستمارکردنی لەو ناوچەوە هەروەها لەگەڵ پەیمانێکی ئاسایش لەگەڵ ژاپۆن.

## چاپتەری -٥-

## ترسناکترین شوێن لە سەر ڕووی زەوی

پلۆتی سەرنجڕاکێش لە دراما و ئەدەب بەدەگمەنن، بۆیە باشترینیان کاری بەردەوام لەسەرکراوەتەوە. ڕۆمیۆجۆلێتی شکسبیر نموونەیەکە، ئەم چیرۆکەی سەدەی شانزە باسی توڕەبوون و دوژمنداری دوو خێزان دەکات لەسەر خۆشەویستی گەنجێك و دواتریش دەبێتە مەرگەسات / ٣٥٠ / ساڵ پاشتر لەلایەن جیرۆم ڕۆبیستن (لیۆناردو بێرنستن) ئارسەر لۆرنتێس و (ستیڤان سۆن هیچم) ی ئەمریکی دووبارە وەریگێرایەوە و کات و شوێنەکەی لە ڕێنسانسی ئیتاڵی بۆ شاری نیۆیرکی مۆدێرن گوێزرایەوە ئاغایەتی مۆتناگۆسی و کاپۆلێتی شکسیر گۆڕا بۆ دەستەکانی ململانێی شەقامی مانهاتان، مۆسیقا و هونەری سەماکردن زیاد بوو. ئەمانە درامایەکیان کرد سەرکەوتوو وەك ڕۆمیۆ جۆلێت بە ناو چیرۆکی لای ڕۆژئاو.

لەمەسەلەی ئاسایشدا ئەوروپا و ئاسیای ڕۆژهەڵات دوو نووسراوی هەمان پلۆتن، مێژووی سەدەی بیستەمیان هاوتەریبە لەگەڵ یەك. هەروەها لەسەرەتای سەدەی بیست و یەکدا دوورەپەرێزی هێزە ڕابەرەکان لە هەردوو هەرێمدا بەیەك دەچوو لە هەر یەکەیاندا ویلایەتە یەکگرتووەکان لەگەڵ وڵاتێك هاوپەیمان بوو کە دوژمنی بوو لەجەنگی جیهانی دووەم و دواتر هاوڕێ لەکاتی جەنگی سارد، ئەڵمانیا لە ئەوروپا و ژاپۆنیش لە ئاسیای ڕۆژهەڵات. هەر هەرێمێکیش وڵاتێکی گەورەی گرتبووە خۆ کە پابەند نەبوو بە ئایدیاکانی کۆمۆنیزمی ئۆرتۆدۆکس، بەپابەندبوونی بنەماکانی جەنگیشەوە، بەڵام بەتەواوی هیچ یەکێك لە سێ بەشەکەی سێینەی وێڵسنیان لە ئامێز نەگرتبوو، لەئەوروپا ئەو بنەمایانە لەلایەن ڕووسیا لە ئاسیای ڕۆژهەڵاتیش چین یاری پێکرا.

هاوتەریب لە نێوان دراما و جیۆپۆلەتیك دەکرێ هەنگاوی ئەولاتر بهاوێژرێت، دراما کۆمیدییەکان بە خۆشی بە زەواج کۆتایی دێت هەروەها تراژیدیاکانیش بە مردن کۆتایی دێن.



لە مەسەلەکانی ئاسایشی نێودەوڵەتیدا سەرەنجامی هەر جەنگێك ئاشت بوونەوەیە. ئالێرەدا هەردوو هەرێمی زلهێزی دەرەوەی جیهان جیان لە کاتێکدا وڵاتانی ئەوروپا هەنگاوی بەرچاویان گرتۆتەبەر بەرەو دامەزراندنی ئاسایشی گشتی، ئەوەبوو جیۆپۆلیتیکی تراژیدیا لە ئاسیای ڕۆژهەڵاتدا زیاتر مایەوە.

### ئەوروپا و ئاسیا

لە سەدەی نۆزدەدا، ئەوروپا زلهێزی ناوەوەی جیهان بوو و ئاسیاش هەژار و بێ هێز و تەقلیدی و بەشێك لەدەرەوەی جیهان بوو. ئەم هاوکێشەیە لە سەدەی بیستەمدا گۆڕا، ئەو شۆڕشە سیاسی و ئابووریانەی کە پێگەی ڕۆژئاوایان لە سەنتەری شارستانیەتی جیهانیان بەهێزکرد درەنگ هاتنە ئاسیا، بەڵام لە ئەنجامدا هاتن هەروەك دیموکراسی و بازاڕی ئازاد لەوێ ڕەگیان داکوتا، لە کاتێکدا سەنتەرێکی داهێنانی کەلتووری نەبوو شان بەشانی ڕۆژئاوا بەشەکانی ئاسیا جەختیان لە سەر بەرهەم هاوردەی هێز و سامانیان نەکردەوە بە بەراورد لەگەڵ ئەوروپا و ئەمریکای باکوور.

وشەی (ئەوروپا و ئاسیا) ئاشنان بە یەکتر، بەڵام ڕوونکردنەوەی زیاتریان پێویستە لە ڕووی جوگرافییەوە، ئەم دوو هەرێمە سەربەخۆو جیاکراوە نین، بەڵکو خاکێکی بەرفراوانەو لە باکووری هێڵی یەکسانی (نیئوان جەمسەری باکوور باشوور) درێژ دەبێتەوە لە زەریای ئەتڵەسییەوە بۆ هێمن لەگەڵ دوورگەکانی بەریتانیا بە لێواری ڕۆژئاوا نووساوە و زنجیرە دورگەی ژاپۆنیش دەکەوێتە لای ڕۆژهەڵاتی، ئەم دوو هەرێمە / ٥,٦٠٠ / میلە، کە لە سەدا / ٣٦ / ی خاکی سەر ڕووی زەوی دەگرێتەوە و لەسەدا / ٧٣ / دانیشتوانی جیهان پێك دێنن. (یۆراسیا EURASIA) لەسەردەمی مۆدێرندا دابەشکرا بەسەر شەش هەرێمی تر، دووانیان جگە لە چوارەکەی تر بەشی وڵاتانی ناوەوەی جیهان بوون. دابەشکردنەکان نەك تەنها لەسەر ئەساسی جوگرافی، بەڵکو لەسەر ئەساسی سیاسی و کەلتووری مێژوویی ئەنجام دراون. هەموو ئایدیا و بیرۆکەی سیاسی و مۆدێرن لە ڕۆژئاوا بنەڕەتین، بەڵام تەنها لەلایەن گەلانی ئەو هەرێمەخۆیان قبوڵ کران. چاخی مۆدێرن لەدایك بوو لە کۆمەڵگا سیاسییەکانی بەدرێژایی کەناری ڕۆژئاوای

باكوور. خاكی كۆمەڵ (یۆراسیا) ناسراوە بە ئەوروپا. لە ڕووی مێژووییەوە ئەوروپا فراوان بوو بەلای ڕۆژهەڵاتدا بۆ چیاكانی (ئۆراڵ URAL) كە سنووری ڕووسیای ئەرووپایە، گەلانی ئەوروپا ناسراون بە هەبوونی كەلەپورێكی كەلتووری گریكو رۆمان (GRECO ROMAN) و جودۆ مەسیحی لەگەڵ مێژوویێكی پەیوەندی بەردەوامی سیاسی و ئابووری لەگەڵ یەكتر.

بەشەكەی تری یۆراسیا دەگەڕێتەوە بۆ وڵاتانی ناوەوەی جیهان لە سەرەتای سەدەی بیست و یەكدا سەر بە وڵاتانی كەناری ڕۆژهەڵات بوون كە سنووری سەر زەریای هێمنە. ئاسیای ڕۆژهەڵات یان ورد تر ڕۆژهەڵاتی باكووری ئاسیا چین و كۆریا و ژاپۆن دەگرێتەوە، هەروەك لە ئەوروپا گەلەكانیان لە ڕووی ڕەگەزیەوە بەیەك دەچن و بۆ ماوەی چەند سەدەیەك تێكەڵاویان هەبووە[*]. ئاسیای ڕۆژهەڵات ئەو شوێنەی كە مۆدێرنیتە گەیشتە ئەوێ و جگە لە ژاپۆن كە

---

* چوار هەرێمەكەی تری یۆراسیا ئاسیای باشوور بە ئاشكرا لە ڕووی جوگرافییەوە جیاكرایەوە كیشوەری فەرعی ئاسیا دەگات بە بەرزترین زنجیرەی چیای جیهان "هیمالایا" لەلای باكوور هەروەها بۆ ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و باشوور بەلای زەریاكان. لەسەدەو نیوی یەكەمی سەردەمی مۆدێرن لە ڕووی سیاسییەوە ئەو ناوچانە جیاكراوە بوون و لەلایەن بەریتانیاوە داگیركرابوون.

باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، كە هیندۆچین و تایلاند لەسەر خاكی سەرەكی ئاسیا دەگرێتەوە زنجیرە دووورگەكانی ئیندۆنیسیا و فلیپین و نیمچە دورگەكانی مالیزیا ناوی خۆی بەدەستهێنا لە مەوقعەكە لە نێوان دوو شوێن كە گرنگترین شوێن بوون بۆ ئەوروپا : ئەوانیش ناوچەی باشووری چین و ڕۆژهەڵاتی هیندستان بوون. نەخشەی سەرەتای ڕۆژهەڵاتی باشووری ئاسیا وەك هەرێمێكی جیا هەڕەمەكی بوو، وڵاتەكان لە ڕووی جوگرافیەوە زۆرشتی كەمیان بە هاوبەشی هەبوو و زۆریش لێك نزیك نەبوون (ڤیێلتیێن پایتەختی لاوس — ١,٧٠٠ میلە جاكارتای پایتەختی ئەندەنووسیا كە ئەویش — ١٧٠٠ میلە بۆ مانیلای پایتەختی فلیپین)، بەڵام لەنیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا پێكەوە لكانێكی گونجاویان دانا. گروپە ناوەكییەكان كە كۆمەڵەی نەتەوەكانی ڕۆژهەڵاتی باشووری ئاسیایان دامەزراند (asean) شەۆعییەتێك و پلەیەكی باشی بەخۆوە گرت. بەهەمان شێوە ناوچەی شارستانیەتە گەورەكانی ئیسلامی عەرەب و فارس و تورك ناسران بەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست، چونكە دەكەوێتە نێوان ئەوروپا و ئاسیای ڕۆژهەڵات هەروەها ناسراون بە ڕۆژهەڵاتی نزیك، چونكە لە ئەوروپا نزیك تربوون تا چین و ژاپۆن (بێگومان دوورتربوون لە كالیفۆرنیا و كۆلۆمبی بەریتانی).

ناوەوەی كۆمەڵە خاكی یۆراسیا و ناوەوەی ئاسیا لە هەرێمێكی ناوەوە و دەرەوەی خۆیەتی پێك هاتووە كە لە ڕۆژئاوای بەشەكانی (هان HAN)وە تا (چین) ی ئێستا خینجیانگ و تێبێت —ئەفغانستان هەروەها وڵاتە



ئەو دیو ئەسڵی ئەوروپییەكانە، كۆمەڵگایەكە بێ پەیوەندی مێژوویی لەگەڵ ئەوروپا خۆی خۆی دروستكرد، لەچەند دەیەیەكدا. وڵاتێكی مۆدێرنی بەهێز لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا ئاسیای ڕۆژهەڵات بوو كە بوو بە سەنتەرێكی جیهانی دروستكردنی سامان بەسەركردایەتی ژاپۆن، كە دووەم گەورەترین ئابوورییە لە جیهاندا و لەسەدا حەفتا تەواوی ئەو هەرێمە لەو سەدەیەدا حیساب دەكرێت، بەڵام لەبەشی دوایی سەدەی نۆزدەدا ژاپۆن گەیشتە ئاستی ڕۆژئاوا، پاشان لە بەشی دوایی سەدەی بیستەمدا وڵاتانی تری ئاسیا دەستیان كرد بەوەی بگەنە ئاستی ژاپۆن.

دەست بەكاربوونی لە بواری ئابووریدا لە شەستەكان لە هەر چوار پارچەی ئاسیادا، باشووری كۆریا و تایوان و هۆن كۆنگ و سەنغافورە، تۆمارێكی گەشەی ڕێژەیی سەرسام بوو بۆ بەدەستهاوردەی ناونیشانێكی نارەسمی كە پێیان وترا (پڵنگەكانی) ئاسیا. هەروەها لەكاتی هەمان دەیە چین گەورەترین وڵاتی ئابووری لە ڕووی دانیشتوانەوە بوو، دوو دەیە دەستیكرد بەگەشەی ئابووری دوو ئەوەندەی سەرەتای سەدەی بیست و یەك. سێیەم گەورەترین ئابووری بوو لە جیهان لە دەیەی سێیەمی سەدەی نوێدا، بە پێی هەندێ خەملاندننەوە بە بەرهەمهێنەری نیوەی كەل و پەل و خزمەتگوزاری جیهان بوو و لە شاستی شەشەمدا بوو لە نێو هەشت دەوڵەمەندەكانی جیهان لە ڕووی ئابوورییەوە.

پێش ئەوەی ببێتە خاوەن ئابووری خۆی، ئاسیای ڕۆژهەڵات لەڕووی سیاسی و سەربازی گرنگ بوو كەماڵی ئیمپراتۆرە گەورەكان و هێزە دەریاییەكانە ئەو ماڵەی كە ژاپۆن خۆی دروستی كرد لەكۆتایی سەدەی نۆزدەدا. جەنگی جیهانی دووەم تەنها شەڕێكی بەكۆمەڵی

---

ناوەوەی ئاسیای ناوەڕاست كە لە زۆربەی كاتەكانی سەدەی بیستەمدا پارێزگاكانی یەكێتیی سۆڤیەت بوون. ئاسایی وڵاتانی ناوەوە رۆڵێكی گرنگیان بینی لە كاروباری نێودەوڵەتی لەكاتی ئەو ماوەیەی كە ناسرابە چاخی ئەوروپا و ناوەڕاست. بەو ڕێگایەوە ڕێگایەكی بازرگانی نێوان چین و ئەوروپادا كرایەوە ناسرا بە ڕێگای (سیلك SILKROUD) كە بنكەی ماڵی مەغۆلەكان بوو كە گەورەترین داگیركاری ئەوناوچانە بوو، بەڵام لەسەردەمی مۆدێرندا ناوچەیەكی دوورەپەرێز بوو بۆ لە زۆربەی ماوەكە، پەیوەندی نەبوو بە ئەوروپا كە بە دەریا دەگەیشتەوە زۆربەی وڵاتانی جیهان. بۆ ئەوروپا هیچ سوودێكی ئابووری نەبوو دەوریشی نەبوو لە ململانێی سەدەی نۆزدەم لە هەرێمەكەدا لە نێوان ڕووسیا و بەریتانیا كە بە گەمە گەورەكە ناسراو بوو بە بەهای ستراتیژییەكی زۆر كەم.

خاکی ئەوروپا کە تاڵترین شەڕو گەورەترین کولفە ئەڵمانیا و رووسیا نەبوو، بەڵکو گەورەترین کاتی ململانێکان بوو. شەڕی دەریایی و هێرشی لەناکاو و شەڕێك لەنێوان ئیمپراتیۆری ژاپۆن و ویلایەتە یەکگرتووەکان کە درێژ بۆوە بۆ نیوەی زەریای هێمن لە دوورگەکانی هاوایانەوە تا زنجیرە دورگەکانی ژاپۆن. هەردوو ململانێی خوێناوی جەنگی سارد لە ئاسیا بوو لەسەر نیمچە دوورگەی کۆریا لە پەنجاکان وە لە ئەندەنووسیاش لە شەستەکان و حەفتاکان.

لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا چین بوو بەزنجیرەی هێزی سەربازی نەك یاریەك بۆ هەردوو زلهێزە ناوکییەکان. گەلانی کۆماری چین خۆیان دامەزراند لە دووەم پلەی هەرەمەکی سەربازی جیهانی و گەورەترین سوپاو زۆرترین چەکی ناوکی، هەرچەندە وەك پلەی سێیەم دوور بوو لە چاو ویلایەتە یەکگرتووەکان و یەکێتیی سۆڤیەت دواتریش ڕووسیا، بەڵام هەر هێزێکی بەهێزبوو.

هەروەها لەبەرئەوەی ئاسیای رۆژهەڵات جەنگی سەرەکی لەخۆگرت لەماوەی دوای جەنگی ساردا، ڕێکخستنەکانی ئاسایش لە هەرێمەکەدا وەك ئەوانەی ئەوروپا بوون، بەڵام لێرە زیاتر ناسکتربوون. بە هەقیقەت ئاسیای ڕۆژهەڵات ئەزموونی ململانێی لەگەڵ سوپای گەورەو ترسناکی زیاتر هەبوو ئەزموونەکانی ئەوروپا. کردە سەربازییەکان لەناو ئاودا کە بەدوورگەی تایوان دەوردراوە لە مانگی سێی / ١٩٩٦ /دا لەلایەن هەردوو هێزە چەکدارییە ناوکییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان و چین بەئاشکرا جەنگێکی سەرەکی بەهێزی خستە ڕوو لەسەرەتای سەدەی بیست و یەکدا. کەناڵی تایوان تاکە ترسناکترین شوێن بوو لەسەر ڕووی زەویدا هەروەها لە مانگی شەشەمی (١٩٩٤) لەسەر نیمچە دوورگەی کۆریا، ویلایەتە یەکگرتووەکان و باکووری کۆریا کەمتر لێك نزیکبوونەوە، بەڵام هێشتا ڕووبەڕووی توندو ترسناك لە نێوانیاندا هەر بوو.

پێویستی ڕێچکەی لیبراڵ بۆ جەنگ و ئاسایشی گشتی گەر هەرشتێك بێت تیژتربووە لە ئاسایی رۆژهەڵات زیاتر لە ئەوروپا، بەڵام هەرێمەکە خاسیەتی بیناو رەسمی ئاسایشی گشتی کەم بوو ئەویش دانووسانی سنوور لەسەر چەکداماڵین و دەستەبەرکردنی بنەماکانی زاڵبوونی بەرگری و شەفافییەت بوو. بە هەقیقەت یاسای کەمتر بۆ حکوم کردنی هێزە سەربازییەکان هەبوون لە هەرێمی هێمنی ئاسیا لەوەی کە لە بیستەکان هەبوو هەروەها رقی لەجەنگیش



نەبوو بە پێی ئەو ڕێکخستنەی کە بە ئەوروپای بەستۆتەوە کە بەقوڵی ڕەگی داکوتاوە لە ئاسیای رۆژهەڵات.

هێشتا هەرێمەکە بەتەواوی نەقصی توخمەکانی ئاسایشی گشتی نەبوو و پێشینەی هەبوو بۆ بەکاربردنی سیاسەتەکانی ئاسایشی لیبراڵ لەوێ لە سەرەتای سەدەی بیستەم بەتایبەتی لەنیوەی دووەمیدا هەندێ لە وڵاتەکانی ئاسیای ڕۆژهەڵات نەریت و دەزگاکانی ئابووری و سیاسی لیبراڵیان ئیستراد کرد، هەروەها مێژووی سەدەی بیستەمی ئەوروپا و ئاسیای رۆژهەڵات لە ڕووی هێرشکردنەوە هاوتەریبە، هێڵی لەیەکچوویان زیاتر بەرەو پێشەوە برد وەك کات و شوێنی دراما لە شوێنی جیاجیا، بەڵام لەگەڵ هەمان نەخشەی بنەڕەتیدا.

### *ویلایەتە یەکگرتووەکان و ژاپۆن*

لە ئاسیای رۆژهەڵات و ئەوروپادا، مێژووی سەدەی بیستەم بەهەمان چوارچێوە خرایە ڕوو. پەرشبوونەوەی تەکنیکی مۆدێرن بووە هۆی دەرەنجامەکانی توندوتیژی پێشکەوتنێکی نارێك و هەردوو جەنگی جیهانی پاراست لە هەردوو هەرێمدا. وڵاتێکی فراوان و تەقلیدیی فرەنەتەوە لەگەڵ مێژووی یاسای نێودەوڵەتی پێشکەوتوو بەهاوکاری دەزگا نەریتەکانی شۆڕشی پیشەسازی فەرەنسا و (رووسیا و چین) بە دەست هێرشێکەوە ناڵاندیان لە لایەن وڵاتێکی نەتەوەیی (ئەڵمانیا و ژاپۆن) کە ئەو داهێنانەی سەرکەوتووتر بەکاربرد. ئەڵمانیا و ژاپۆن ئەو هێرشەیان کرد وەك بەشێك لە گەڕانیان بەدوای بونیاتنانی ئیمپراتۆر لەسەر هەرێمەکەیان لەو کاتەی کە دراوسێی پێشکەوتوویان کەمترە، هەروەك چۆن ئەڵمانیا لە هەردوو جەنگی جیهانیدا هێرشی کردە سەر ڕووسیا لە کۆتاییەکەی تری یۆراسیا، ژاپۆن دووجاران هێرشی کردە سەر چین و شکستی پێ هێنا، لە هەردوو بۆنەدا کۆنترۆڵی ئەو هەرێمەی کرد کە کۆنترۆڵ کرابوو لە (بیجینگ Beijing) لەجەنگی سینۆ ژاپۆنییەکان. لە ساڵی / ١٨٩٥ / دا ژاپۆنییەکان کۆنترۆڵی تایوانیان گرتە دەست و لە ساڵی / ١٩٣١ /دا درێژیان کردەوە بۆ مانچوور، لە ساڵی / ١٩٣٧ /دا هێرشیان بۆ سەر باکووری چین کردو سەرەتای جەنگی جیهانی دووەمی لە ئاسیا نیشاندا.

هاوكات سەرەڕای هەردوو جەنگ جیهانییەكە ئاڕاستەیەكی سیاسی تری سەدەی بیستەم لە ئارادا بوو ئەویش پێش بینی ڕۆڵی جیهانی ویلایەتە یەكگرتووەكان بوو. سیاسەتی ئەمریكا لە ئەوروپا و ئاسیای ڕۆژهەڵات ڕێچكەیەكی تەقلیدی بەدوا داهات و ویلایەتە یەكگرتووەكان خۆی لەو هەلومەرجەدا دوورخستەوە، دواتر هێزی هاوسەنگی مەنتقی بەدواداهات، یەكەم جار لەگەڵ لایەنێك دووەم لەگەڵ ئەوی تر لەسەر ئەوە هەرەشەیەكی گەورەتر بۆ بەرژەوەندی ئەمریكا لە ئارادا بوو.

لە ئەوروپا، ویلایەتە یەكگرتووەكان لای ڕووسیا (وەك هاوپەیمانێكی بەریتانیا و فەرەنسا) دژی ئەڵمانیا لەجەنگی جیهانی یەكەم بوو، دواتر هەڵگەراوە دژی رژێمی كۆمۆنیست كە قەیسەری چاند. لە ساڵی / ١٩١٧ /دا واشنتۆنیش پەیوەندی دیبلۆماسی دانەنا لەگەڵ یەكێتیی سۆڤیەت تاوەكو / ١٩٣٣ /، ئەمریكا هاوپەیمانێكی ساختەی دانا لەگەڵ مۆسكۆ دژی نازی ئەڵمانی لە ساڵی / ١٩٤١ تا ١٩٤٥ /. دواتر ئەمریكا ئاڕاستەی خۆی جارێكی تر گۆڕی بۆ دانانی هاوپەیمانێكی دژی سۆڤیەت لەگەڵ ئەڵمانیای ڕۆژئاوا و وڵاتە ئەوروپییەكانی تری ڕۆژئاوا لەكاتی جەنگی ساردا.

ویلایەتە یەكگرتووەكان هەمان شێوازی گرتەبەر لە ئاسیای ڕۆژهەڵات. لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا، مەرامەكانی ئەمریكا چاوی بڕیە ژاپۆنییەكان ویلایەتە یەكگرتووەكان چاوی بڕیە ژاپۆن لەبەر سەركەوتنی جەنگەكانی دژی چین لە ساڵی / ١٨٩١ / و دژی رووسیا لە ساڵی / ١٩٠٥ /. سیاسەتی دەرگا كراوەی ئەمریكا لە ساڵانی / ١٨٩٠ / هەشتاكاندا كان وێڵ بوون بەدوای بەدەستهاوردەی پلەی باش لە چین بۆ بەرژەوەندی ویلایەتە یەكگرتووەكان و ژاپۆن بە یەكسانی هەروەها بۆ ئەوانەشی پێشتر پەیوەندییان بەهێزە ئەوروپییەكانەوە كردبوو، بەڵام هەركە هێزی ژاپۆنی زیادی كرد نیگەرانی ویلایەتە یەكگرتووەكان زیادی كردو واشنتۆن دژی نەخشەی ئیمپراتۆری ژاپۆنی وەستایەوە، مانای ئەوەش هاوكاری كردنی نەخشەكانی تری چین بوو لە ململانێ لەگەڵ ژاپۆندا. لە كۆتاییدا بووە هۆی شەڕی بەندەری پێرل و جەنگی جیهانی دووەم. لەكاتی ئەو ململانێیەدا ویلایەتە یەكگرتووەكان هەوڵی دا یارمەتی فەرمانڕەوای چین بدات بە ناوی چیامگ كای شێك.



لە خەباتەكەی لەگەڵ ژاپۆندا، سوپا و یارمەتی تری دەنارد لەگەڵ دابینكردنی ئامۆژگاری سەربازی. دوای جەنگی جیهانی دووەم بەتایبەتیش دوای سەركەوتنی كۆمۆنیست لەشەڕی مەدەنی چینییەكان. ویلایەتە یەكگرتووەكان دووبارە هەڵوێستی خۆی گۆڕی و پەیوەندی گشتی لەگەڵ ژاپۆن دروستكرد دژی كۆمۆنیزم لە ئاسیای.

ئاسیای ڕۆژهەڵات جیابوو لە ئەوروپا لە زۆربەی ماوەی مۆدێرندا بەوەی دووەم هێزی دەرەوە بەشداریكرد لە كاروبارە سیاسی و سەربازییەكانی ڕووسیای قەیسەرو جارجار هاوكاری چینی دەكرد، بەڵام زۆرجار هەڵی دەقۆستەوە، لە سەدەی نۆزدەدا هەرێمی چینییەكانی زیاتر بەدەست هێنا لە چاو هێزە بێگانەكانی تر. لە زۆربەی كاتەكانی سەدەی بیستەمدا ڕووسیا و دواتریش دوژمنی سەرەكی یەكێتیی سۆڤیەت لە ئاسیای ڕۆژهەڵاتدا ژاپۆن بوو. ڕووسیا شەرێكی دۆڕاوی لەگەڵ ژاپۆن كرد لە ساڵی / ١٩٥٠ / و سەربازەكانی سۆڤیەت شەڕە تەقەیان لەگەڵ هێزەكانی ژاپۆن دەكرد لە سنووری نێوان سیبیریا و مانجوریا لە ساڵی / ١٩٣٩ /دا. مۆسكۆ داواكارییەكانی ڕۆژئاوای پشتگوێ خست لە سەر راگەیاندنی شەڕ گەڵ ژاپۆن، بەڵام تا دوارۆژەكانی جەنگی جیهانی دووەم كاتێ هێزەكانی سۆڤیەت چوونە نێو مانجوریا و كۆریا گەلێ لە دوورگەكانی لە زنجیرەی (كورایل Kurile)دا گرتبوو.

لە سەرەتای جەنگی ساردا سیاسەتەكانی ئاسایش لە هەرێمەكەدا ئاسانكرا لە لایەن سەركەوتنی كۆمۆنیست لە جەنگی مەدەنی چینییەكان و پەیمانی هاورێیەتی (سینۆ سۆڤیەت – Sino Soviet) لە ساڵی / ١٩٥٠ / ئەم هاوپەیمانییێتییەی دروستكرد بۆ هەردوو گەورەترین وڵاتی كۆمۆنیست، لە وەڵامی ئەو هاوپەیمانەشدا واشنتۆن هاوپەیمانیەكی یەكسان و كاریگەری جیای دانا.

هەروەك لە ئەوروپا ویلایەتە یەكگرتووەكان هێزێكی سەربازی بەهێزی دانا لە ناوچەی ئاسیای زەریای هێمن بۆ نەهێشتنی دوژمنكاری كۆمۆنیست. ئامادەیی سەربازی ئەمریكی لە ئەوروپا شێوەی فیرقەیەكی گەورەی هێزی چەكداری لە ئەڵمانیا وەرگرت. لە ئاسیای رۆژهەڵاتدا ویلایەتە یەكگرتووەكان ڕاستەوخۆ هێزی دەریایی گەورەی نارد، زنجیرەیەك بنكەی لە ناوچەی زەریای هێمن دامەزراند، جۆرە زنجیرەیەكی لكێنراو لە دەرەوەی شوورەی كەناری رۆژهەڵاتی یۆراسیا كە سنوورەكانی كاتی دەریای رۆژهەڵاتی یەكێتیی سۆڤیەت و چین دەگرێتەوە.

بە پێچەوانەی ئەوروپا، پابەندی سەربازی ئەمریکی لە ئاسیا نەوەستا بوو لەسەر یەك هاوپەیمانی سەربازی فرەنەتەوەیی یان ناتۆی ئاسیایی نەبوو. لەبری ئەوە زنجیرەیەك ڕێکەوتنی سەربازی دوانەیی هەبوو لەنێوان ویلایەتە یەکگرتووەکان و گەلێ وڵاتانی ناکۆمۆنیست لە ناوچەکەدا کە لە هەمووی گرنگتر پەیمانی ئاسایشی ئەمریکی ژاپۆنی ساڵی / ١٩٥١ / بوو.

ئەم جۆرە پابەندبوونەی ئەمریکا لە ئاسیای ڕۆژهەڵات هەیبوو جیابوو لەوەی بۆ نەهێشتنی هێرشی کتوپڕی سەربازی لەلایەن کەرتی کۆمۆنیستەوە، بەڵام هەردوو هەرێم جیابوون لە ڕووی یەك خاڵی گرینگەوە. هەروەها بەشێك لە ستراتیژی کۆنترۆڵی هێزی ولایەتە یەکگرتووەکان، دوو شەڕی کرد لە ئاسیایەکیان لە کۆریا ئەوی تر لە ڤێتنام لە هەردوو حاڵەتدا، لەلایەن چین ڕاستەوخۆ دژایەتی کرا بە تایبەتی لە شەڕی یەکەمدا، کاتێ ماو فەرمانی بە سەربازە چینییەکان کرد بەنێو ڕووباری یالۆ کە چین لە کۆریا جیادەکاتەوە، لە شەڕی دووەمدا بەناراستەخۆ لەگەڵ بێجینگ سوپای نارد بۆ ڤێتنامی باکوور سەربازەکانی لە سەر ناوچەکە جێگیر کرد.

ئامادەیی ئەمریکا لە هەردوو ناوچەدا ئەو هێزە نالیبراڵەی لە ئامێزدا گرت کە لە جەنگی جیهانی دووەمدا دۆڕابوو. هێزەکانی ئەمریکا لە ئاسیا زەمانەتی پێدرا، چونکە دژی دەست پێکردنەوەی سیاسەتە کارەسات ئامێزەکانی ژاپۆن لە سییەکان وەستایەوە، ئەو هێزانە وەك ناتۆ میکانیزمێك بوون بۆ قەدەغەکردنی دووبارەبوونەوەی سیاسەتەکانی ئەڵمانیا کە جەنگە ئەوروپییەکانی بەرپا کرد لە ساڵانی (١٨٧٠ – ١٩١٤ – ١٩٣٩) هەروەها وەك وڵاتە ناکۆمۆنیستەکانی ئەوروپا کاتێ ئەڵمانیایان پەسندکرد کە سیاسەتی ئاسایشی سەربەخۆ بەتەواوی جێبەجێ ناکات، هەروەها وڵاتە غەیرە کۆمۆنیستەکان خۆشحاڵ بوون بە بینینی داگیرکەرە هاوشێوەکانیان لە ژێر باڵێکی پارێزراوی وڵاتێکی زلهێزتر. ئامادەیی ئەمریکا زەمانەتی پێدرا تاوەکو دژی دووبارەبوونەوەی کارە ترسناکەکانی ڕابردوو بوەستێتەوە هەروەها ناوچەکە بپارێزێت لە هەڕەشەی ئەمرۆی هێزە کۆمۆنیستەکان کە پێیان وترا (دەسەڵاتی دەبڵ).

ژاپۆن وەك ئەڵمانیا بوو بۆ سیاسەتی سەربەخۆی دەرەوە، چەکی ناوکی دەستەبەرنەکرد. ژاپۆن زۆر بە ڕەسمی لە ڕێگای ماددەی / ٩ / ی ئەو دەستوورەی کە دەستەبەری کرد لە ژێر چاودێری ئەمریکا لە ساڵی / ١٩٤٦ / لە ژاپۆن جەنگی ڕاگەیاند، وەك ئەڵمانیا لە جەنگ دۆڕان و سەدمەی داگیرکردن هەستێکی قوڵی پڕ لە ڕقی بۆ بەرپا بوونی جەنگ دروستکرد لای





ژاپۆنییەکان، بۆیە ئەڵمانیا و ژاپۆن هەردووکیان هەستی بێ جەنگیان لەلا دروست بوو، دواتریش زیاتر شارستانی بوون لە هەر وڵاتێکی تر. بێگومان، ژاپۆن خۆی بە سوپا و دەریا پڕ چەك کرد کە ناسرابوون بە (هێزەکانی بەرگری لە خۆکردن)، بەڵام لە زۆربەی کاتەکانی جەنگی ساردا، تەقەلا و کۆشش بۆ ئەو هێزانە سەدایەکە لە نێو سنووری خۆیدا تێپەڕ ناکات، بەڵام سەدای دووەمی ئەوەیە گەورەترین وڵاتی ئابووری جیهان ئامێری سەربازی سەرنجڕاکێش وەبەردەهێنێت، بەڵام ژاپۆنییەکان حەزیان نەکرد بەکاری بێنن تەنانەت لە ئەڵمانیاش زیاتر لەکاتی جەنگی سارد ژاپۆن بەدوای سیاسەتی دەرەوەی کەوت کە سیاسەتێکی گونجاو بوو لە ڕێگای پاراستنی ئەمریکا.

سیاسەتی 'دەسەڵاتی دەبڵ' هەمان سەرنجی سیاسی و ئابووری هەبوو لە ئەوروپا و ئاسیای ڕۆژهەڵات، کەفالەتی پەیوەندییەکی سیاسی ئاسایی لە نێوان ئەڵمانیا و ژاپۆن کرد لەلایەن دوژمنە پێشووەکانیان کە لە بەرامبەردا یەکخستنەوەی ئابووری ئەڵمانیا بۆ نێو ئەوروپاو ژاپۆنیشی بۆ ئاسیای ڕۆژهەڵات شیاو کرد، ئەمەش ئابووری هەردوو ناوچەی پێش خست، سەرەنجامەکەی یەکلایی بوونەوەی جەنگی سارد بوو. دەسەڵاتی دەبڵ، کە لە هەردوو ناوچەدا بەدیهێنرا، تێکستێکی دانپیانان بۆ ئەڵمانیا و ژاپۆن بوو بۆ نێو کۆمەڵگای ئابووری ڕۆژئاوا و بەربەستێك بۆ هێرشی کتوپڕی کۆمۆنیست دژی هەردوو کۆمەڵگا بوو، چوارچێوەیەکی دروستکرد تیایدا ئابووری زۆر گەشەی سەند لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا.

لە سەرەنجامی جەنگی ساردا، ڕووسیا پاراستنی ئەڵمانیای لە ناتۆ خستە بەرچاو، وەك ئەوروپییە ڕۆژئاواییەکان هەستیان بەو دڵنیاییە کرد کاتێ لە ململانێی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتدا هاوپەیمانی ئەمریکا و ژاپۆن دڵنیاکرانەوە، هەروەها هێزی سەرەکی کۆمۆنیستی لابرد واتە لە کۆماری گەلی چین، بەڵام جەنگی سارد هەر مابوو، چونکە لە ساڵی / ١٩٧٢ / چین خۆی لە ویلایەتە یەکگرتووەکان دوورخستەوە لە دژی یەکێتیی سۆڤیەت و بۆیە تەنانەت نەبووە پاشکۆی بەشێکیش لە سیستەمی ئەمریکی هاوپەیمانی دوانەی ئاسیای ڕۆژهەڵات.

کاتێ جەنگی سارد کۆتایی هات هەرچی ئامادەییەکی هێزی سەربازی سۆڤیەت کە لە هەموو کاتێکدا هەبوو لەناوچوو، زۆربەی سوپا گەورەکەی سۆڤیەت لەسەر سنووری چینییەکان پاشەکشەیان کردو پاپۆڕی سۆڤیەت لەزەریای هێمندا لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی سارد لێك ترازا. کەواتە، لە ئاسیای ڕۆژهەڵات و ئەوڕوپا ئامادەیی سەربازی ئەمریکا زەمانەتی

پێبەخشرا لە ئاسیای ڕۆژهەڵات، پەیمانی ئاسایشی ئەمریکا و ژاپۆن و دامەزراندنی ئەو ئامادەییە وڵاتەکانی تری ئاسیای دڵنیاکرد کە ژاپۆن پەیڕەوی سیاسەتی ئاسایشی سەربەخۆ ناکات هاوکاتیش ژاپۆنییەکانی دڵنیاکرد کە پێویست ناکات کارێکی وا بکەن.

هەناردنی هێزی ئەمریکی لە لای ڕۆژئاوای زەریای هێمندا، وەك هێزێك لە نێو هەموو وڵاتانەوە خۆی قووت کردەوە، گەر واش نەبوایە ئەوا گومان لە هێزەکانی ئەمریکا دروست دەبوو. بەرپرسانی ئەمریکا بەئاشکرا ووتیان:

**(کاتێ ململانێکانی جەنگی سارد فرەلایەن بوو، گەلێ نەتەوەی ئاسیا ترس و نیگەرانی نزیکترین دراوسێکانیان حەشارداو پاراست. پاشەکشەی ئەمریکا لەو ناوچانە ئەو مەسەلانە گەورە دەکات بۆیە دەبێ ئەمریکا بمێنێتەوە)**

بە جۆرێك لە جۆرەکان، ئەوروپا پێویستی بە ئامادەیی هێزێکی سەربازی هاوشێوەی ئەمریکا بوو بۆ ئەوەی بیپارێزێت وەك ئەوەی لە ئاسیای ڕۆژهەڵاتدا ئەو هێزە پێشتر دابینکراوە، زەریای هێمن شڵەیەکە لە نێوان زنجیرە دورگەکانی ژاپۆن و وڵاتانی تری ناوچەکە توند دەپارێزرێت. کردە سەربازییەکان بە تایبەتی گرتنی ناوچەیەك زۆر زەحمەترە بەنێو ئاودا تا بەنێو زەویدا، لە نێوئاودا تێپەڕبوون سەقامگیری کەمترە، هاتووچۆ هێواشترە و هیچ شوێنێك نییە بۆ حەشاردان.

بەڵام بەسەرێکی تر بەرگی ئاسایشی ئەمریکا کە لە کاتی جەنگی ساردا ژاپۆنی حەشاردا و پاراستی، ئەو پاراستنە بە بەهاتر بوو لە ماوەی دوای جەنگی ساردا بە بەراورد لەگەڵ هەمان پاراستنی ئەڵمانیا، ژاپۆن پەیوەست نەبوو بە ڕێکخراوێکی فراوان و ڕەسمی وەك ناتۆ یان یەکێتیی ئەوروپا. سومعەی ئەڵمانیا لە لایەن دراوسێکانی بەرزتر بوو لە ئەوروپا لەچاو سومعەی ژاپۆن لە ئاسیا : ژاپۆن ڕاگەیاندنی کەمتر و بێ هێزتری دەرکرد لەسەر پەشیمانبوونەوەی لە هێرشەکانی کاتی جەنگ بۆ سەر دراوسێکانی.

لە سەدەی بیست و یەکدا حاڵەتی دژی پاراستنی هێزە سەربازییەکانی ئەمریکا لە زەریای هێمن هەمان حاڵەت بوو دژی پاراستنیان لە ئەوروپا. ژاپۆنییەکان وەك ئەوروپییەکان 'بە بەلاش سواردەبوون' و کاتی ئەوەش هاتبوو بەرپرسیاریێتی بۆ ئاسایشی خۆیان بە کولفەکانیشەوە بگرنە بەرچاو. گەر هەڕەشەکان لە ئاسیای ڕۆژهەڵات لەگەڵ ڕووخانی یەکێتیی سۆڤیەت و کۆتایی جەنگی ساردا بەردەوام بووان ئەوا هەڕەشەگەلێکی مردوو دەبوون بۆ سەر



ویلایەتە یەکگرتووەکان، وجودی ئەو جۆرە هەڕەشانە بەردەوامی هەناردنی هێزی سەربازی ناسەلمێنێت کە سیاسەتی دەسەڵات وەرگرتن بەندە لە سەری تا ئەو ڕادەیەی کە هاوپەیمانی ئەمریکییەکان خۆیان هەڕەشەیەك بوون دەیانتوانی بەرگری لە خۆیان بکەن. بەم پێیە، بەبێ سوپاو هێزی ئاسمانی و دەریاییەکانی ئەمریکا ئامادەیی ئەمریکا لە ماوەی دوای جەنگی سارد بۆ پاراستن بە بێ پارە بوو بۆ ئەوانەی کە تەواو هەراش بوو بوون.

مەسەلەکە لە بەرژەوەندی بەردەوامی ئامادەیی سەربازی ئەمریکا ئاسانتر بوو بۆ ئاسیای ڕۆژهەڵات تا بۆ ئەوروپا، چونکە ئامادەییەکی دەریایی بوو ئەمریکییەکانیش خۆیان حەز بەدەریا دەکەن بۆ سوپاکانیان، چونکە دەریا جموجۆڵی تیایە و سوودێکی زۆریشی هەیە لە سەرانسەری جیهان و تەکنەلۆژیای پێشکەوتووی گەرەکە. هێزێکی نەتەوەیی تایبەتی ئەمریکا دەتوانن دوور بن لە زیان بۆیە کەمتر کوشتار و قوربانی دەدەن هەروەها پەیوەستن بەسوودەکانی ئابووری بازرگانی، بەڵام گەر تەکنەلۆژیا ئامادەیی سەربازی ئەمریکای دروستکردبێت لە ئاسیای ڕۆژهەڵات و خەڵکەکەشی ناچارکردبێت لە کۆتایدا باجەکەی بدەن ئەوا سیاسەت و ئابووری و مێژوو ئەو ئامادەییە کەمتر دەکەن.

لە هیچ دەیەکی دوای کۆتایی جەنگی ساردا ویلایەتە یەکگرتووەکان ناکۆك نەبوون لەگەڵ ژاپۆن لەسەر بازرگانی لە نێوان هەردوو سنووردا، تەنها ژاپۆن بازرگانی بەپارەیەکی زۆر نەدەکرد لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکان، بەڵام ئاستی وەگەڕخستنکردنی ڕاستەوخۆی دەرەوەی ژاپۆن کەمتر بوو لە هەر وڵاتێکی دیموکراسی و پیشەسازی تر. ئەو واقیعە ئابوورییە وێنەیەکی بەژاپۆن وەك زەبەلاحێکی ئابووری بەخشی، بیروبۆچونێك ژمارەیەکی زۆر ئەمریکییەکانی لە هەشتاکان حەپەساند.

گوایا هەوڵی ژایرانە و بێ هێزی ژاپۆن بۆ مەسەلەی ئابووری نێودەوڵەتی بابەتی (ڕۆژهەڵاتن) بوو، ڕۆژهەڵاتن ڕۆمانێکی مایکل کریچتۆن بوو زۆرترین نوسخەی لێ فرۆشرا و بەرزرتین شوهرەی ئەدەبی بەدەستهێنا کاتێ بوو بە فلیمێك لە هۆلیوود، پەیامەکەی لە قسەیەکی ژاپۆنیدا دەربڕا ئەویش (بازرگانی واتە جەنگ). هێرشی کتوپڕی بازرگانی لەلایەن ژاپۆنییەکان بۆ سەر ویلایەتە یەکگرتووەکان شەڕێك بوو کە خوێنەرانی کتێبەکە و بینەرانی فلیمەکە هیچ گومانیان نەبوو کە ئەمریکا دۆڕاندی تا ئەو ڕادەیەی کە ئەو ئایدیانە دزەی کردە نێو ڕای گشتی (هەروەها کتێبەکانیش باشترین ڕەواجیان دەبێت، چونکە ڕەنگدانەوەی ڕای

گشتین) کارەکتەری گشتی ئەمریکا هەرزان فرۆش دەکەن بۆ تەرخانکردنی خوێن و سامان بۆ بەرگری ژاپۆن.

تۆڵەی ژاپۆن لە ویلایەتە یەکگرتووەکان یەکسان و کاریگەری جیای هەبوو بەهۆی ئەو قەناعەتەی کە مەترسییەکانی جەنگی سارد هاوکای سیاسی گەرەك بوو لە نێوان هەردوو وڵاتدا، هەرچەندە ئەمریکا سکاڵای ئابووری هەبوو، بەڵام هەرکە جەنگی سارد بەسەرچوو، ژاپۆن کاندید بوو شوێنی ونبووی یەکێتیی سۆڤیەت بگرێتەوە وەك هەڕەشەیەکی گەورە (بەڵام هەڕەشەیەکی سەربازی نا) کەبە دڵنیاییەوە پەیمانی ئاسایشی دەخستە مەترسییەوە.

لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا، ئەمە ڕووی نەدا. بەپێچەوانەوە لە نەوەتەکان / ١٩٩٠ / هەردوو ئابووریەکە کۆڕسێکی پێچەوانە بوو کاتێ ئابووری ئەمریکا بەرز بۆوە، ئابووری ژاپۆن دابەزی. بۆ ماوەی دەیەیەك ژاپۆن نەیتوانی تۆڵەی لە ئەمریکا بکاتەوە، هێشتا لە ناوەڕاستی دەیەکە کۆڵەگە سیاسییەکانی هاوپەیمانەکە لێڵ دەهاتە بەرچاو سەبارەت بە داواکاری هاوکاری لە ڕێگەی گۆڕینی هاوسەنگی بەرپرسیارێتی سەربازی لە نێوان ژاپۆن ویلایەتە یەکگرتووەکاندا. بەم پێ یە، ژاپۆن ڕازی بوو لە سەر هاوکاریکردنی هێزەکانی ئەمریکا لە زەریای هێمن بە شێوەیەکی فراوانتر لەچاو هاوکارییەکەی کاتی جەنگی سارد.(*)

هەڕەشەیەکی گەورەتر بۆ هاوپەیمانەکە ناکۆکی بوو لەگەڵ ژاپۆن لە ڕووی بینینی ڕۆڵێکی کەمبایەخ و حەزی هەناردنی هێزێکی سەربازی گەورەتریش بۆ ناوچەکە. ئەم جۆرە هەستە

---

(*) ئایا ئەمریکا هاوکارییەکی گشتی ژاپۆن دەکات وەك یەکێك لە هاوپەیمانەکانی بۆ نموونە، لە شەڕی نیمچە دوورگەی کۆریا لە کاتێکدا سەربازانی ئەمریکا جەنگەکەیان کرد نەك هی ژاپۆنییەکان؟ ئەمە پرسیارێکی کراوەیە و شت هەڵدەگرێت. بڕیاری ژاپۆن لە ساڵی / ١٩٩١ / بۆ هەناردنی پارە (نەك سەرباز) وەك هاوکاری بۆ هێزەکانی ئەمریکا لە شەڕی کەنداوی فارسیدا بۆ نەتەوەی ژاپۆن گرینگ بوو نەك بۆ ئابووری ئەمریکا، بۆیەش ئەو هاوکارییە مادییە لە لایەن ئەمریکاوە بە باشی پێشوازی لێ نەکرا، بەڵام ئەمە کۆتایی بە شەراکەتی نێوان هەردوو وڵات نەهێنا. هەمان پرسیار بۆ هاوپەیمانی ئەمریکا لە ئەورووپاوە لە شەڕی کۆسۆڤۆ لە ساڵی / ١٩٩٩ / دا تاقیکرایەوە، ئایا ناتۆ شەڕێکی کرد لە وشکانی بۆ کشاندنەوەی سەربازانی یۆگسلافیا لە کۆسۆڤۆ. زۆربەی شەڕەکە ئەمریکییەکان دەیانکرد لەکاتێکدا بەهێزترین و دەوڵەمەندترین ئەندامی ئەورووپای (ئەڵمانیا) هیچی نەکرد.



هەبوو لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا، هەروەها کاتێکیش لە سەر چیچانیش بەقسە نەهاتن لەکاتێکدا زۆربەیان دەیانتوانی ئەو کارە بکەن، ، بەڵام هەڕەشەی گەورە بۆ ئاشتی دوای جەنگی سارد لە ئاسیای ڕۆژهەڵات لە ژاپۆنەوە سەرچاوەی نەگرت بەڵکو لە چینەوە هات.

## چین

هێزە سەربازییەکانی نێو کیشوەری ئەوروپا دوو خاسیەتی هەبوو کە ڕێگەیان بەخۆدا بۆ نێو سیستەمی ئاسایشی گشتی کە هێزەکانی ئاسیای ڕۆژهەڵات ئەو خاسیەتانەیان نەبوو ئەوانیش یەکسانی و یەکچوون بوون. کەرتەکانی سەربازی ئەمریکا و سۆڤیەت خۆیان بەهەمان جۆر چەك پڕکرد، بەڵام لە ژمارەی چەکەکاندا یەکسان نەبوون، چەند سنوورێك لەسەر هێزە سەربازییەکان دانرا بۆ ئەوەی بە یەکسان بەسەر هەردوولادا جێبەجێ بکەن، ئەو سنوورانە زەحمەت نەبوو لای کۆمۆنیست، بەڵکو دەبوایە زۆر لە ڕۆژئاوا جێبەجێبکرێت، بەڵام دواجار هەموو هەوڵێك بۆ یەکسانی بوو، ئەو بارودۆخە باشتر بوو لەوەی لایەکیان هست بە کەمی بکەن.

لە کاروبارەکانی ئاسایشی ئاسیای ڕۆژهەڵاتدا، چین ڕۆڵی ڕووسیای لە ئەوروپا دانابوو ! هێزە سەرەکییەکانی وڵاتانی ناوەوە و دەرەوەی جیهان زۆر بە کەم پابەندن بە بە پێوەرە لیبراڵییەکان لە کاتێکدا خۆشی وەستاوە لە سەر بەکارهاوردەی بنەما دانپیانراوەکانی ڕوانگەی سیستەمی ئاسایشی گشتی، بەڵام هێزە سەربازییەکانی چین و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو هێزە دەریاییەکانی تری ناوچەکە نە یەکچوو و نە یەکسانیش بوون. چین گەورەترین هێزی وشکانی و دەریایی و کەش و هەوایەکی لەباری هەبوو، لەکاتێکدا ویلایەتە یەکگرتووەکان گەورەترین هێزی ئاسمانی و دەریایی، لە مێژووی جیهاندا، هەبوو، هەروەها هێزە سەربازییەکی ئەمریکا پێشکەوتوو ترو و توانایەکی سیاسی باشتریان هەبوو بۆ مامەڵە لەگەڵ هێزێکی تر لە ئاسیا، بنکەی هێزە چەکدارییەکانی هەردوو وڵات بەیەك دەچوون، بەڵام یەکسان نەبوون، هەردووکیان چەکی ناوکیان هەبوو، بەڵام جبەخانەی ناوکی ئەمریکا گەورەترین جبەخانە بوو لەسەر ڕووی زەوی، دانانی تەواوی بنکەکانی مووشەك و تەیارە و غەواصەکانی ئەمریکا دەتوانێت هەموو ئامانجێك لە هەر کوێیەکی جیهانبێت بپێکێت،

بەڵام هی چین بچووکترو کەمتر هەمە جۆرترو تەنها لە ڕێگای چەند وڵاتێکی کەمەوە دەتوانێت بگات بە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

هێزە سەربازییەکانی ئەمریکا و چین لە ڕووی ماڵ و شوێنەوە دوو دروستکراوی جیا بوون. چین فیلێکی هێواش و لەسەرخۆ بوو، بەڵام لە ڕووی هێزەوە ناگاتە هێزە ئاسمانی و دەریاییەکانی ئەمریکا لە هەر دووریەك بێت دەتوانن ئامانج بپێکن، ویلایەتە یەکگرتووەکان لەئاسیای ڕۆژهەڵاتدا نەهەنگ و هەڵۆیەکی خێرا بوو، لەسەر ئاستی دەریا و ئاسماندا بە هێزبوو، بەڵام بێ هێز بوو لەسەر وشکانییەوە. ئەو جیاوازییانە پێوەرێکی سەقامگیری دانا بۆ نێو پەیوەندی سەربازی سینۆ ئەمریکا. جوگرافیا وەك هۆکارێکی پارێزەر خزمەتی کرد لە نێوانیاندا، سروشت کەمتر بە بەراورد لەگەڵ دیبلۆماسییەت بەرگری سەپان بەسەر هەردووکاندا، هیچ کامیان هەڕەشەیەکی گەورە نەبوو لەسەر ئەوی تر.

بەدرێژایی مێژوو دوانەکانی تری وڵاتانی زلهێز هێزی لەیەکچوویان نەبوو، بەڵام ڕێگای تریان دۆزیەوە بۆ شەڕکردن لەگەڵ یەك بۆ نموونە : ئەسینایییەکان لە دەریا و سپارتا لە زەوی لە یۆنانی کۆندا، بەریتانیا بە دەریا و فەڕەنسا لە ڕێگای زەوی کیشورەی، لە سەدەی هەژدە و نۆزدەدا بە هەقیقەت ململانێکانی جەنگی سارد لە نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکان و یەکێتیی سۆڤیەت زاڵ بوون بەسەر بەربەستی جوگرافی بۆ بەرپاکردنی ململانێیەکی جیۆپۆلەتیکی چڕ. لە بەرەبەیانی سەدەی بیست و یەکدا جوگرافیا تەنها مسۆگەری ئەو دەستپێشخەریە هێرشە سەربازیانە ناکات لە لایەن چین یان ویلایەتە یەکگرتووەکان دژی یەکتر، هەرچەند هێرشی هیچ کامیان سەرنەدەکەوت، بەڵام خاسیەتەکانی تری مێژووی سیاسەتەکانی هەردوو سەدەکە لەڕووی جوگرافیاوە بەهێزبوون لەسەر بنچینەی ڕێکخستن بۆ نەهێشتنی ململانێی چەکداری.

کەم و کوڕی کەل و پەلی چارەسەرنەکراو ویلایەتە یەکگرتووەکان و ژاپۆنی ناچارنەکرد بۆ گرتنەبەری ستراتیژی بەرگری سەربازی. لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا هەردوو وڵات دەیانتوانی هێزە سەربازییەکانیان کۆبکەنەوە و هێرشێك بۆ سەر چین ببەن و داگیری بکەن و شکستی پێبێنن، بۆ ئەم کارەش بێگومان پێشینەیەکی مێژوویی هەبوو. هێزە گەورەکانی ئەوروپا و ویلایەتە یەکگرتووەکان و ژاپۆن بەشێکیان داگیرکردبوو لە چین لەدەیە سەرەتاییەکانی سەدەی نۆزدەوە تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم.



بەڵام زۆر دوور نەبوو نیازی دووبارەکردنەوەی ئەزموونەکەی دەیەی یەکەمی سەدەی بیست و یەکیان هەبێت. ئیمپراتۆریەت باوی نەمابوو، ڕق لە جەنگ ڕەگی قووڵی لە ژاپۆن وەك ویلایەتە یەکگرتووەکان بەهێز داموتابوو، کە لەوێ جەنگی داگیرکردن لەبەرچاو دەگیرا. ئەو ئەزموونە سەربازییەی سەدەی بیست بۆ هەر وڵاتێك بەرامبەر چین یان لەبەشەکانی تری ئاسیا بۆ ئەو مەسەلەیە جارێك خەڵات کرا. لە چلەکاندا ژاپۆن لە باکووری چیندا لە قوڕدا ڕۆچوو بوو، ژاپۆن خۆی زۆر بەفراوانی دەزانی لەو ناوچەیە کەچی گرفتێکی زۆری بۆ دروست بوو لەلایەن گۆریلا چینییەکان، نەشی دەتوانی سەرباز ڕەوان بکات بۆ شەڕ لە جەنگی زەریای هێمندا دژی ویلایەتە یەکگرتووەکان. هیچ کام لەم دوو جەنگە زیادەیەی بەم دواییە کە ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ئاسیای بەرپاکرد ئەنجامێکی تەواو بەقەناعەتی نەبوو، کۆریا لە نێوان بردنەوە و دۆڕان و ڤێتنامیش شکست بوو. دووبارەبوونەوەی هەرکامیان ئیمپریالیزمی ژاپۆنییەکان لە سالآنی(١٩٣٠ — ١٩٤٠) یان جەنگەکانی ئەمریکا دژی کۆمۆنیست لە سالآنی(١٩٥٠ — ١٩٦٠) سەرنجی هیچ کام وڵاتی ڕانەدەکێشا، چونکە ویلایەتە یەکگرتووەکان و ژاپۆن دەیانزانی ستراتیژی هێرشێکی سەربازی دژی چین بەگشتی جەنگێکی سەرەکی لێدەکەوێتەوە، لە ژێرکاریگەری ئاڕاستە کۆمەڵایەتییەکان کە زەمانەتی بێ جەنگی بەزۆری بەخشی، هیچ لایەکیان دانوویان بەیەکەوە نەدەکولا، بەڵام بیریشیان لە جەنگ نەدەکردەوە.

گەر ویلایەتە یەکگرتووەکان و ژاپۆن جەنگی داگیرکردن نەکەن لە سەدەی بیست و یەکدا چین بەگشتی شەڕێکی گرینگی پێناکرێت. ویلایەتە یەکگرتووەکان و ژاپۆن لە ڕێگەی ڕقی کۆمەڵگاکانیان لە جەنگ ڕێگەیان لێ گیرابوو بۆ شەڕ چینیش بەهۆی کەمی تواناوە نەیدەتوانی شەڕ بکات. شۆڕشی پیشەسازی زۆر درەنگ هاتە چین و هیچ حکوومەتێکی چین لە کاتی سەدەی بیستدا نەیتوانی بەواقیعی هێزێکی سەربازی هەبێت کە بتوانێت ڕووبەڕووی بەهێزترین هێزەکانی ڕۆژئاوا ببێتەوە وەك ویلایەتە یەکگرتووەکان لەودیوی کەناری کیشوەری یۆراسیا. قەیسەر و ڕژێمەکانی سۆڤیەت بەپێی گەلێ پێوەر پاشەکشەترین زلهێزبوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەش هەرزلهێزبوون هەریەکەو دەبوایە خەبات بکات بۆ پاراستنی سەربازیەکەی لەگەڵ ڕکابەر و دراوسێ پێشکەوتووەکانیان، بەڵام لە کۆتایدا ژێرکەوتن، بەڵام هیوای پاراستن هیوایەکی بێ هودە نەبوو بۆ ماوەی چەند دەیەك هەریەکەیان توانیان ڕکابەرییەکی بەردەوام بۆ سەربازی بکەن.

چین لەژێر فەرمانڕەوای ماودا هەرگیز ئەو هیوایەی نەهاتە جێ و دوای ستراتیژییەکی سەربازی بێ هێز کەوت نەك ستراتیژییەتێکی یەکسانی. ئەمە ستراتیژییەتێکی داڕێژراو بوو بۆ قەرەبوو کردنەوەی پێشکەوتنی تەکنیکی دوژمنە بەهێزەکانی چین بەو ڕێگایانەی کە وڵات دەتوانێت دژیان بوەستێتەوە بۆیە ستراتیژییەتێکی بەرگریکەر بوو، هەردووك لەبەرئەوەی چین هەستی کرد بە تەواوی هەڕەشەی لێکراوە و لەبەرئەوەی ستراتیژییەتێکی هێرشبەر گرنگ نییە لەڕووی ئایدیۆلۆژیاوە، هەرچەند سەرنج ڕاکێش بێت هەر شیاو نییە.

ماو پابەندبوونی چینی ڕاگەیاند بۆ مەزهەبی (جەنگی گەل) کە بانگی گۆریلاکانی کرد بەرگری بکەن دژی داگیرکاری لەلایەن چەکدارێکی بێ هێز، چونکە جەنگاوەری چینی زۆر پەرۆش بوون لەژێر حوکمی ماودا، چین چەکی ناوکی وەبەرە هێنا، هەرچەند چەکی ناوکی کەم بوو، بەڵام سەرکردەی چین هێمایەکی بەخشی بە دوژمنە بەهێزەکانی بۆ ئەوەی بوەستن لە داگیرکردنی چین.

بێگومان، سیاسەتی دەرەوەی چین لەکاتی سێ دەیەی یەکەمی کۆماری گەلی چیندا بەرگریکەر نەبوو، لەوکاتەدا چین زۆر لەشەڕدا بوو لە کاتێك یان کاتێکی تردا شەڕی لەگەڵ گەورەترین دراوسێکانی کرد، ویلایەتە یەکگرتووەکان دراوسێی پاپۆڕی لە زەریای هێمنەوە، لە کۆریا لە ساڵی(١٩٥٠) لەگەڵ هیندستان ساڵی / ١٩٦٢ / و یەکێتیی سۆڤیەت / ١٩٦٩ / ڤێتنام لە ساڵی / ١٩٧٩ /، گوایا لە هەموو ئەو حاڵەتانەدا چین دەستپێشخەری جەنگی کردووە.

بەپێچەوانەوە، لە ڕواڵەتدا مەبەستی چین لە هەر حاڵەتێکدا بەرگری کردن بوو. کردە سەربازییەکانی چین بەتایبەتی ئەو سێ حاڵەتەی ئەخیری، بۆ نەهێشتنی ئەو شتەی سەرکردایەتی بێجینگ باوەڕەی پێ بوو حیساب کرا، نەخشە دوژمنکارییەکانی هێزەکانی تر گەیشتنە ئەو قەناعەتەی کە هێرشێکی ڕاستەوخۆ بۆ سەر چین زۆر تەکلیف دەکات، لە کۆریا ماو لەوە ترسا نەوەك ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەڵمەتە سەربازییەکانی بەنێو ڕووباری یالۆ بەرەو چین ببات و هەوڵی عەکس کردنی سەرکەوتنی کۆمۆنیست بدات لە شەڕی ناوخۆی بەم دواییەیدا. واقیعێکی لەم جۆرە بووە هۆی شەڕە تەقە لەگەڵ هیندستان لە ساڵی (١٩٦٢)دا سەرەڕای ململانێکانی لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەت لەساڵەکانی دواتردا. چینییەکان گومانیان لەسەرکردایەتی سۆڤیەت هەبوو لەوەی چاویان بڕیبووە درێژکردنەوەی مەودایان بۆ نێو وڵاتەکەیان، کاتێ مەزهەبی برێژنێڤ ئەمەی ڕاگەیاند کە مافی سەپاندنی ئیرادەی لەسەر





وڵاتە کۆمۆنیستە لە مۆسکۆ ئیستغلال کردبوو بۆ کۆنترۆڵکردنی ئەو وڵاتانە کۆمۆنیستانە و هاوکات ڕاهاتبوو بۆ سەلماندنی داگیرکاری سۆڤیەت بۆ چیۆکۆسلۆفاکیا لە مانگی ئابی (١٩٦٨)دا. وێرای ئەمە لە هەردوو حاڵەتدا لەپاڵ ئاگادارکردنەوەی دژی هێرشی چین، شەڕەکان لەسەر سنوورەکان بوون چین هەوڵی گرتنی هەرێمی نەدا، بەلانی کەم لەسەر هەرێم هیچ قسەیەکی نەبوو. هەڵمەتی ڤێتنام داڕێژرا بۆ سزادانی دراوسێی باشوری چین، چونکە بێجینگ بەکارێکی دوژمنکاری دانا. سەربازەکانی چین بۆ ماوەیەکی کورت داگیریان کرد پاشان پاشەکشەیان کرد لە بەشی باکووری وڵات.

لەسەردەمی ماودا و لەژێر حوکمی دێنگ خیاپینگ، فراوانبوونی هێزی سەربازی چینی یەکەم کاری ڕژێمەکە نەبوو لە (هەرچوار ڕوانگەی مۆدێرندا) کە دینگ چینی پابەنکردبوو پێی لە کۆتایی (١٩٧٠) مۆدێرنیتەی سەربازی چوارەم پێگە بوو دوای پیشەسازی زانست و تەکنەلۆژیا و کشتوکاڵ. پاش مردنی ماو لە ساڵی (١٩٧٦)دا چین هێزی چەکداری بەرزترکرد و ستراتیژییەکەی گۆڕی لە جەنگی گەلەوە بۆ بەرگری وڵات لە سنوورەکانی، بەڵام بەجدی بەدوای ئەوە نەبوو بۆ بەدەستهاوردەی هێز لە پاڵیاندا. لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی سارد چین هێزی سەربازی لە ئاستی سەرەتای جەنگەکە نەبوو.

ئەو واقیعە بێهێزەی چین بەقەدەر ڕووسیا تێی کەوتبوو قەناعەتی بێ جەنگی بوو، لەگەڵ ئەوەش، چین بێ هێز نەمایەوە لەکۆتای سەدەی بیستەمدا بەڵکو وڵات (چین) زۆر بەهێزتربوو بە بەراورد لەگەڵ سەرەتای ئەو سەدەیەدا، چین زۆر ئاگاداری بێهێزی خۆی بوو و جەختیشی لە سەر ئەو ئامانجە کردەوە لە سەدەی بیستدا لە ڕێگەی جەنگ و شۆڕشەوە زاڵبوون بوو بەسەریدا لە چارەگی سێیەمی سەدەکەدا، لەژێر حوکمی ماودا وڵات لەڕووی سەربازییەوە هێوربۆوە و لەڕووی سیاسیشەوە یەکی گرتەوە، لە چارەکی کۆتایی سەدەکەدا. ئاڵۆزییەکەی ڕەوشی وڵاتی چین لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا وای لە چین کرد هێزێکی بەرزی هەبێت.

لەڕووی مێژووییەوە ناوەندەکان لە وڵاتە زلهێزەکان زۆر جار کۆتاییەکانیان دەردەخات کاتێ بەدوای بەرزەفڕی خۆیان دەکەوتن : تموح ئارەزوویەك بوو گەشەی دەکرد لەگەڵ هێزدا، ئەمە لە ئەڵمانیا لە بەشی کۆتایی سەدەی نۆزدەمدا گەشەی کرد کاتێ یەکگرتنەوەی سیاسی و پیشەسازی خێرا جێبەجێکرا و بوو بە بەهێزترین هێز لە کیشوەری ئەوروپا. سەرەتای سەدەی بیست و یەکی چین بەسەرەتای سەدەی بیستی ئەڵمانیا دەچوو لە هەردوو ڕووی پێشکەوتنی

ئابووری، ڕاگەیاندنی ناڕازیبوونی بە شوێنەکەی لە سیستەمی نێودەوڵەتیدا کە لە لایەن وڵاتانی تردا دانرابوو و کۆنترۆڵ کرابوو. هاوتەریبی مێژوویی مەنتیقێکی نیگەرانی هەبوو کە خولیای ئەڵمانیا و تۆڵەکەی بەرەو جەنگی جیهانی یەکەمی برد.

جیاوازییەکان لە نێوان ئەڵمانیای پێش جەنگی جیهانی یەکەم و چینی دوای ماو زۆرتربوو لە لەیەکچووەکانیان. ئەڵمانیا پێشتر زیادەڕۆی کرد لە دراوسێ و ڕکابەرییەکانی لە هێزی سەربازی لەسەرەتای سەدەی بیستەم و سەرکەوتنێکی مەزنی لەسەر فەرەنسادا بەدەستهێنا کە زلهێزترین هێزی ئەوروپا بوو لە ساڵی (١٨٧١)، بەهێزترین سوپای لە ئەوروپا دانا، هیچ کام لەم کارانەی چین ڕاست نەبوون لە پەیوەندی لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ئاسیای ڕۆژهەڵات لەسەرەتای سەدەی بیست و یەکدا.

لە سەرەتای سەدەی بیستدا هێمای هێزی نێودەوڵەتی هەبوونی ئیمپراتیۆر بوو کە لە ڕێگەی داگیرکاری سەربازی دەستەبەردەکرا. لەسەرەتای سەدەی بیست و یەکدا تەمەنی ئیمپراتۆریەت کۆتایی هات و هیچی تر لەڕووی ئابوورییەوە بەسوود نەبوو هەڵمەتێك بکەی بۆ داگیرکردنی و بەڕێوەبردنی گەلانی تر. لە کۆتاییدا کاتێ ئەڵمانیا دەستی پێکرد لەسەر جەنگی جیهانی یەکەم سەرکردەکانی چاوەڕێی ململانێیەکی بەتەکلیف و زەحمەت کرد، بەڵام هەر لەو باوەڕە دابوون کە دەیبەنەوە. لە سەردەمی چەکی ناوکیدا سەرکردایەتی چین دەستپێشخەری ململانێی لەم چەشنەیان کرد، بەڵام هیچ تەوەقوعێکیان لەم جۆرەی ئەڵمانیا نەبوو.

بە گەشەی ئابوورییەوە خەریك بوون، بەمۆدێرن کردنی سەربازی نایەکسانی نێودەوڵەتی هەموو خاسیەتەکانی سیاسەتی دەرەوەی چین بوون لەدەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا، بەڵام تەنانەت لەنەبوونی پێوەری ڕەسمی بۆ ئاسایشی گشتی بەتەنیا یان پێکەوە چینیان نەکردە هەڕەشەیەکی جدی بۆ وێڵ بوون بەدوای لابردنی ڕێکخستنە سیاسییەکان لەو هەرێمەدا هەروەك ناپلیۆنی فەرەنسا و ویلهیلمینی ئەڵمانیا و نازی ئەڵمانیا و ئیمپراتیۆری ژاپۆن وایان کردبوو.

گەر چینی سەدەی بیست و یەك دەربارەی دووبارەکردنەوەی ئەزموونی ئەڵمانیای پێش جەنگی جیهانی یەکەم نەبێت ئەوا بەدوای ئەو نموونەیەی ئەڵمانیای لیبراڵی دوای جەنگی جیهانی دووەم ناکەوێت. وەك ڕووسیا بەپێچەوانەی وڵاتانی زلهێزی ڕۆژئاوا چین پڕنەبوو بوو بەڕۆحی بێ جەنگی، ئاڕاستە کۆمەڵایەتییەکانیش کە وڵاتەکانی شارستانی و نوێ کرد بێ



هێزتربوو لەوێ بەڕێوەدەبران لەلایەن ئۆتۆکراسییە تەقلیدییەکان و لەماوەی کۆمۆنیستدا ئایدیا و نەریتە لیبراڵییەکان چالاکانە بەلاوەنران.

بە هەمان چەشنی ڕووسیا، چین دراوسێیەتییەکی زەحمەت و مەترسیداری کرد لەگەڵ دیموکراسییەکانی ئەوروپا و باکووری ئەمریکا، هێڵی سنووری لەگەڵ چوارده وڵاتی جیاجیا هەبوو سنورە دەریاییەکانیش لەگەڵ زیاتر لە شەش وڵاتدا هەبوو، سەرچاوەی ململانێی لەگەڵ هەموویاندا هەبوو.

بەڵام ئەو شتەی چینی لە ڕووسیا جیاکردەوە ئەوەبوو کە پابەندمایەوە بە شەڕ، خەریك بوون بە گەشەی بێ جەنگی لە ڕۆژئاوا. بێجینگ بەردەوام بوو لە حوکم کردنی گەلانی چین، نەهامەتییەکانیان دژی ئیرادەیان وەك بوزییەکان و موسڵمانانی ئاسیای ناوەڕاست لە هەرێمە ڕۆژئاوایەکانی گەلانی کۆماری چیندا فرە ئیمپراتیۆر بوو، بۆیە گومان لەحەسانەوەی هەبوو کە بووە هۆی بەکارهاوردەی هێز کە لێیەوە یاسای چینەکان تۆڵەی لێکرایەوە.

وێڕای ئەمە، چینی دوای جەنگی سارد هێشتا لەلایەن کۆمۆنیستەکان حوکم دەکرا کە ئۆرتۆدۆکسی لینین و مارکسی لە کاروباری ئابووریدا بەلا وەنابوو، بەڵام بەکاری هێنا لەمەسەلە سیاسییەکان بۆ ئەوان کرۆکی سیاسەت و دانوسان و ڕێگەچارە نەبوو، بەڵکو ململانێیەکی دڕندانەبوو گەر ڕوخسارێان لەسەر جیهاندا هاوشانێکی ڕۆژئاوایی هەبوایەو تەقلیدی بوا، ئەوا سەرکردەکانی چین واقیعی دەبوون نەك لیبراڵی.

چین وەك ڕووسیا لە هێرشەکانی لە لایەن دراوسێکانیدا، ڕووسیا باجی زنجیرەیەك شکستیدا لە سەدەی نۆزدە و بیستەمدا وەك لە کریما لەسەر دەستی بەریتانیا و فەرەنسا لە (١٨٥٤ – ١٨٥٦)، لەلایەن ژاپۆن لە ساڵی(١٩٠٥) لەلایەن ئەڵمانیا لە جەنگی جیهانی یەکەم لەلایەن نازی ئەڵمانیا لە(١٩٤١ – ١٩٤٢)، بەڵام قەیسەر دواتریش ڕووسیای کۆمۆنیست هەمیشە لە سیستەمی کورتدا ئەو شتەی کە پێیەوە ناڵاندویەتی عەکسی دەکردەوە.

چینییەکان لە نێوان جەنگی (١٨٣٩ – ١٨٤٢) و داگیرکاری کۆمۆنیست (١٩٤٩) ئەزموونی یازدە دەیەیان کرد کەچی پاشەکشەی نەکرد و ئیبادە نەکران، ئالێرەدا چین بەکۆمەڵگا بێ هێزەکانی چوو کە داگیرکران و لێك ترازان و هەراسانکران لەلایەن ڕۆژئاواوە. لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا، زۆربەی هەرە زۆری زنجیرە هێرشەکانی ڕۆژئاوا نەمان. داگیرکردنی بێگانە ماوەیەك لەمەوبەر کۆتایی هاتبوو، بەڵام ئەمە بۆ چین وانەبوو.

لە دەیەی یەکەمی سەدەی بیست و یەکدا، بە چاوی چینییەکان یەك عەیب مابۆوە. لە بەرچاوگرتنی هۆیە کۆمەڵایەتی و مێژوویی و جوگرافی سیاسەتەکانی ئاسایشی گشتی لە ڕژێمی کۆمۆنیست خۆیان نەکردە ساحێب لە چین هەرچەند لە ئەوروپا مومارەسە دەکران ئەوە بە زۆری کۆك نەبوو لەگەڵ سیستەمی ئاسایشی گشتی. مەسەلەیەکی سیاسی هەبوو کە چین لە سەری شەڕی کرد تاوەکو دانووسان یان ڕێگە بۆ بارودۆخی تایوان ببەخشێت.

## ***تایوان***

تایوان لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی سارد بۆ ئاسیای ڕۆژهەڵات وەك ئۆکرانیا وابوو بۆ ئەو ئەوروپا، ئەو شوێنەی کە مشتومڕەکان لە سەر سەروەری و سنوورەکان بۆ هاندانی شەڕێك بوو، تێوەگلانی یەکێك لە کۆمۆنیستە ئۆرتۆدۆکسییەکەی پێشووی زەبەلاحی یۆراسیا بوو. هەردووك تایوان و ئۆکرانیا سەربەخۆ بوون بە ئاڵا و سوپاو دراوی نەتەوەیی و حکوومەتی هەڵبژێردراو. لە هەردووکیاندا، بانگەشەی تایوان بۆ سەربەخۆیی لە زۆربەی ڕێگاکانەوە بەهێزتر بوو. مێژوویێکی درێژتری کاریگەری سەربەخۆیی هەبوو. لە کاتێکدا، ئۆکرانیا لە مۆسکۆ یان پیتەرسبێرگ حوکم دەکرا بە نەپچڕاوی لە ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەهەم تا ١٩٩١، تایوان وەك پارێزگایەك لە چین ڕاگەیاندرا نزیکەی درەنگ بوو لە مێژووی چین لە ساڵی ١٨٨٥. لە هیچ کاتێك لە کاتی سەدەی بیستەمدا، حوکم نەکرا لە بێجینگ. ژاپۆن فەرمانڕەوایی ئەو دوورگەیەی کرد لە ساڵی ١٨٩٥ تا ١٩٤٥. لە ساڵی ١٩٤٩ لای دۆڕاو لە شەڕی ناوخۆی چین چیانگ کای شێك کومینتانگ بوو، بە نهێنی کتوپڕ تایوانی جێهێشت و کۆنترۆڵی دوورگەکەی گرتە دەست. ڕاگەیاندنی خودی چین لە سەر تایوان سەپاندنی ئامادەیی نێودەوڵەتی بوو زیاتر لە ئۆکرانیای سەربەخۆ. هەژدەهەمین گەورەترین GNP جیهانی هەبوو، سێزدەهەم بەرزترین قەبارەی بازرگانی دەرەوە، هەروەها یەکێك لە بەرزترین کۆی گشتی پارە بۆ داهاتوو بوو.

بەڵام، جیاوازی سەرەکی لە نێوان هەردووکیان گرینگ بوو: ڕووسیا کە دراوسێی زەبەلاح و سەرۆکی پێششوی ئۆکرانیا مەبدەئییەن سەربەخۆیی ئۆکرانیای پەسەند کرد لەگەڵ سنوورەکەی کە پێی دەووترا کۆماری سۆڤیەتی ئۆکرانیا. بە پێچەوانەوە، بێجینگ بە زۆری ئەوەی



ڕەتکردەوە کە تایوان مافی ئەوەی هەبێت بۆ خستنە ڕووی واقیعی سەروەری بۆ یاسا، بە پێی یاسا کە خۆی وا ڕاگەیاند خۆشحاڵە، بە هەقیقەت سوور بوو لە سەر چوونە شەڕ بۆ نەهێشتنی ئەمە.

ئۆکرانیا و تایوان شتێکی تریان هاوبەش هەبوو. یەکێك لە واقیعەکانی سەردەمی دوای جەنگی ساردیان خستە ڕوو، بە تایبەتی ئەوە لە کاتی کۆتایی جەنگی سارد ڕەنگە ڕەحمەتێك بووبێت، ڕەحمەتێکی تێکەڵ بوو. هەروەك هەمیشە لە مێژوودا وابووە ئازار دەسکەوتی بەدواوەیە. لە ڕوانگەی بەها گەورەکانی لیبراڵ، جیهان بووە شوێنێکی باشتر، ئازادتر، ڕەفاهی تر، سەقامگیر تر، بەڵام ئەو حاڵەتە لە هەموو شوێنێکدا وا نەبوو. لە هەندێ شوێندا شتەکان خراپتر بوو. هەندێ بەشی سەر ڕووی زەوی کەمتر ڕێك بوو و ترسناکتریش بوو پاش ڕووخانی کۆمیۆنیزمی ئەوروپا. کۆتایی جەنگی سارد زۆربەی کێشە ترسناکەکانی ئەواخیری سەدەی بیستەمی چارەسەر کرد، ململانێی جیهانی و ئەوروپا لە نێوان لیبراڵیزمی ڕۆژئاوا و نالیبراڵیزمی کۆمۆنیست کە بەتین بوو بۆ دەستپێکردنی جەنگێکی ناوکی وێرانکەر، بەڵام کێشەی تری دروستکرد. پێش ساڵی ١٩٩١ بچووکترین دەرفەتیش نەبوو کە کێشەکانی ڕووسیا و ئۆکرانیا تێوەگلاون دواتر بەشێکی هەمان وڵات دەچێت بەرەو ململانێی چەکداری. هەروەها ململانێی گەورەی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات کێشە هەنووکەییەکانی خراپتر کرد، وەك پەیوەندی نێوان چین و تایوان.

لە دوو دەیەی یەکەمی جەنگی ساردا، تایوان پارێزراو بوو لە بەر دوژمنداری لە نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکان و کۆماری گەلی چین. خۆیی لە خۆیدا جیابوونەوەی ململانێیەکی گەورەتری نێوان لیبراڵیزم و نالیبرالیزمی کۆمۆنیست بوو. لە پێگەی دوورگەکەیدا، سەد میل لەولاوەی خاکی چین، (چیانگ کای شێك) ڕژێمەکەی خۆی ڕاگەیاند وەك حکوومەتێکی شەرعی چین و بەڵێنیدا داگیری بکاتەوە. حکوومەتی ئەمریکا هاوکاری بانگەشەکەی کرد. کەناڵی تایوان هێڵی شەڕێکی تر بوو لە جەنگی سارد بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان، وەك ئەوەی کە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتی لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا جودا کردەوە. تایوان وەك بەرلینی ڕۆژئاوا وێستگەیەك بوو لە جیهانی ئازاد، بەرگری لێ دەکرێت لە هەر کوچەیەك بێت.

ڕژێمی (ماو) سووربوونی خۆی لە کۆنترۆڵکردن لە سەر پارێزگا خیانەتبارەکە دووپاتکردەوە. لە پەنجاکان، تایوان و چین شەڕە تەقەیان کرد لە سەر کۆنترۆڵی ژمارەیەك

دوورگەی بچووك کە کەناڵی تایوان دەکەوێتە نێوانیان. بێجینگ بۆردومانێکی هەندێ ناوچەی کرد کە تایوان کۆنترۆڵی کردبوو. ویلایەتە یەکگرتووەکان هەڕەشەیەکی پۆشراوی ناوکی خستەڕوو بە مەبەستی هێورکردنەوەی لای کۆمۆنیست لە هێرش بردنێك بە نێو کەناڵەکە و سەرەڕای زمانە شەڕانگێزییەکەی و بۆردوومانی ناوە ناوە، بێجینگ هەرگیز بە جدی هەوڵی ئەوەی نەداوە دوورگەکە بگرێت (یان بەقسەی خۆیان دووبارە داگیری بکاتەوە).

لە ساڵی ١٩٧٢ دا، بە پێچەوانەوە، پەیوەندی هاوڕێیانەی سینۆ ئەمریکی تایوانی پاراست لە جەنگی ساردا. ویلایەتە یەکگرتووەکان و کۆماری گەلی چین هەردووکیان پێکەوە دژی یەکێتیی سۆڤیەت وەستانەوە، کە هەردووکیان بە هەڕەشەیەك بۆ سەر سۆڤیەت دادەنران. لە بەر ئەم هۆیە هاوبەشە، ئەو مەسەلانەیان بەلا وەنا کە ئەوانی دابەش دەکرد، بە بارودۆخی تایوانیشەوە. لە بەیاننامەی شەنگهای ساڵی ١٩٧٢، دەستووری شەراکەتی سینۆ ئەمریکی جەنگی سارد، ویلایەتە یەکگرتووەکان وازی لە هاوکارییە ڕوونەکەی خۆی هێنا بۆ بانگەشەی چیانگ بۆ حوکمکردنی هەموو چین بە بێ هاوکاری بانگەشەی ڕکابەری حکوومەتی کۆمۆنیست لە بێجینگ. واشنتۆن سەربەخۆیی تایوانی ڕەتکردەوە، کە دواتر حکوومەتی تایوان وێل نەبوو بە دوای ئەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەوە بسەلمێنێت کە هەموو چینینەکان لە هەر لایەکی کەناڵی تایوان بن بەردەوام دەبن، بەڵکو چین یەك وڵاتەو تایوانیش بەشێکە لە چین. حکوومەتی ویلایەتە یەکگرتوەکان ڕووبەڕووی ئەو هەڵوێستە نابێتەوە.

حکوومەتی کۆماری گەلی چین بەهایەکی بەرزتری وەرگرت، لە ساڵانی ١٩٧٠ تا ١٩٨٠، بەردەوام بوو لە یەکگرتن لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکان دژی یەکێتیی سۆڤیەت تا کۆنترۆڵ کردنی تایوان، بەڵام هاوپەیمانی سینۆ ئەمریکی بە هەمان چارەنووس گەیشت وەك شەراکەتی کاتەکانی تری جەنگ. لەگەڵ کۆتایی هاتنی جەنگ و شکستی دوژمنی گشتی جیاوازییە دژوارەکان لە کاتی ململانێ تەنها لە ڕووخساردا بوو وەك ئەوەی ڕوویدا لە نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکان و یەکێتیی سۆڤیەت لە پاش جەنگی جیهانی دووەمدا. واقیعی کۆتایی جەنگی سارد، هەروەها ئەو هێزانەی کە جموجۆڵیان کرد لە کۆتایی جەنگی سارد، هاوکاری هەر یەکێك لە تایوان و چین و ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ دووەکەی تر لە ململانێکەدا قورس کرد.

چین هۆی سەربازی بەرجەستەی هەبوو بۆ کۆنترۆلی تایوان. لە دەستێکی ناوهاوڕێیانەدا دوورگەکە هەڕەشەیەکی ئاشکرای خستەڕوو بۆ پاراستن. تایوان لە پەنجاکان وەك " پیشەی نقوم



نەبووی تەیارە" بەکاربرا بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان کە لێیەوە سزادانی هێرشە ئاسمانییەکانیدا تەنانەت لەو کاتە چین دەیتوانی تایوان داگیرکاتەوە. گەر تایوان کێشەیەکی سەربازی بۆ چین خستبا ڕوو، ئەوا سنوور دانان لە سەر چەکدامالێن ڕێگەی پێدەدرا لە سەر دوورگەکە و لە سیستەمی ئاسایشی گشتیدا چارەسەر دەکرا. قایلنەبوونی چین بۆ سەربەخۆیی تایوان هۆیەکی سەربازی نەبوو، بەڵکو سیاسی بوو و ڕەگی قوولیشی داکوتابوو.

پرسی تایوان بۆ بێجینگ سەروەری نەتەوەیی و یەکسانی مێژوویە. بردنەوەی کۆنترۆلی دورگەکە دوا هەنگاو دەبێت لە بەدەستهاوردەی سەروەری کە چەکی کەشتی و سوپاکان پێشێلی کردبوو. تایوان پارچە پیشەیەکی ناتەواو بوو لە سەدەی نۆزدەدا، دواهەمین پۆستی دەرەوەی کۆنترۆل بوو لە چین. لەگەڵ ئەوەش، جیاکرابوەوە لە چین لە لایەن هێزی سەربازی دەرەوە، یەکەم هێزەکانی ژاپۆن، دواتریش ئەمریکا. پاش گەڕانەوەی هۆنگ کۆنگ لە بەریتانیاو ماکاو لە پورتوگالیاو، تایوان دواهەمین پاشماوەی دوژمنکاری دەرەوە و ئیبادەی چین بوو.

ئەم دوژمنکاری و ئیبادەکردنە بەردەوام بوو لە جاڕسکردن و هەندێ جار تووڕەکردنی چینییەکان، تەنانەت لە سەدەی بیست و یەکیشدا. ئەمە بەهێزترین و، بێ دڵەڕاوکێ، شڵەژاوترین حاڵەتی ڕای سیاسی چین بوو. هەردوو ڕاپەڕینە شەعبییە ناسراوەکەی چین لە سەرەتای سەدەی هەژدەدا، بۆکسەری یاخی بوو لە ساڵانی ١٨٩٨ تا ١٩٠٠ و (بزووتنەوەی چوارەم) لە ساڵی ١٩١٩، هەردووکیان لە لایەن ڕژێمی کۆمۆنیستەوە ستایش کران وەك دەربڕین دژی نیشتمانێتی ئیمپراتۆری، هەردوو شۆڕش بە هۆی تورەیی لە پێشێلی دەرەوەی سەر هەرێمی چین هەڵگیرسا. هەرچەندە پشتگیرییە سەرەکییەکەی بۆ بنەما ئینتەرناشنالیستەکانی مارکسیزم-لینیزم بوون، هەروەك بەکاربرا بۆ بارودۆخەکانی چین لە لایەن ماو و یاوەرانی، ڕژێمی کۆمۆنیست پەلەی کرد و بە نیازی قازانج کردن بوو لە ڕووی سیاسییەوە لە دەسەڵاتی بەهێزی هەستی نەتەوەیی چین. کۆتایی جەنگی سارد مەسەلەکانی خراپتر کرد. قووڵبوونەوە لەم هەستە بوو بە هەرە گرینگترین مەسەلە بۆ حکوومەتی چین.

سەرەڕای ئەوەی حکوومەتی چین بە ئاشکرا وڵاتێکی نادیموکراسی بوو، بەدوای پەسەندی ڕای گشتی دەگەڕا، هەروەها نەتەوایەتی باشترین سەرچاوەی بوو، بانگەشەی کۆمۆنیست بۆ حکوم لە چین دوو ناوەڕۆکی هەبوو. حیزبەکە بەڵێنی بە هەردووکیان دا بۆ گواستنەوەی کۆمەڵگاو بەرگریکردن لە نەتەوە. لە کۆتایی جەنگی ساردا، بۆچوونی کۆمۆنیست بۆ

گواستنەوە بە قەد ئەوەی لە هەموو شوێنێکی تر وابوو لە چینیش بە قوڵی لە سومعەی دەدا. هاوکێشەکانی ئابووری ماو هەرەسی هێنا بۆ دروستکردنی وڵاتێك و کۆمەڵگایەکی پیشەسازی مۆدێرن. ڕوانگە سیاسییەکانی کارەساتی نایەوە ئەویش: قات و قڕی لەکاتی بازدانی گەورەی چوونە پێشەوە (Great Leap Forward) ی پەنجاکان، گێرە شێوێنی لەکاتی شۆڕشی کەلتووری ساڵی / ١٩٦٠/ کوشتنی بەکۆمەڵ لەکاتی هەڵمەتەکانی دژی ئەوانەی دوژمنایەتی شۆڕشیان دەکرد لە سییەکان. کاتێ ماو لە ساڵی(١٩٧٦) دا مرد بانگەشەی ڕژێمەکەی جێ هێشت بۆ ئەوەی ببێتە بەرگری کەری هەرێمی نەتەوەیی چین شان بە شانی سەرکەوتن لە پێشخستنی گەشەی ئابووری وەك بنەما بۆ شەرعییەتەکەی، هەروەها پابەندبوون بۆ بەدەستهاوردەی تایوان پەیوەست بوو بەو بانگەشەیە ئەو پابەند بوونە دەرکەوت بۆ پەیوەندی کردن بەهاوکارییەکی زۆر لەگەلی چین تەنانەت لە نێو خەڵك بە پەرۆش نەبوو لەبارەی خاسیەتەکانی حوکمی کۆمۆنیست بۆ سووك کردنی. هاندانی گەلی تایوان بۆ مافی حوکم کردنی خۆیان بۆچوونە سەرەکییە پەنجا ساڵییەکەی حوکمی کۆمۆنیست ئاوەژووکردەوە. بەهەقیقەت ئەو ئاوەژوکردنەوە گەورەو کت و پڕە یەکەم کۆمۆنیستی نیوەی سەدەکەی بەندکرد بەوەی ماو شکا لەگەڵ شەرێکی گەورەی کۆمۆنیستی چین ئەویش یەکێتیی سۆڤیەت بوو. ئیمپریالیستی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە لای دێنگ بەنێو هەولی کۆمۆنیست بۆ ڕێکخستنی بەرژەوەندی ئابووری تەنها پێی دەوترێت کاپیتالیزم، بەڵام هەروەك میخائیل گۆرباتشۆف ئامێزی بۆ ئاسایشی گشتی گرتەوە، ماو و دێنگ دەکرا بگۆڕدرێن، چونکە دەسەڵاتی هەرە گەورەیان دەسەڵاتێکی ئەوتۆ نەبوو و هیچ کام لە جێگرەوەکانیان تەوەقوعی ئەوەیان لێ نەدەکرا دەسەڵاتێکی وایان هەبێت هەروەها جێگرەوەی ڕاستەوخۆی دێنگ، جیانگ لایمین بوو کە کەم و کوڕیەکی زۆری هەبوو. بەدڵنیاییەوە سەرکردەکانی چین لە سەدەی بیست و یەك خەریك بوو بێ هێزتربن، چونکە زۆر تەسك ببوونەوە لە ڕێگەی خۆزگە و بۆچوونی گروپ و بەرپرسەکانی تر کە تەعدیلی بانگەشەی چین لەسەر تایوان زەحمەتر کرد. تەعدیلکردنی ئەو بانگەشەیە بە تەنها وازی لێهێنرا زەحمەتتربوو، چونکە تایوان تەنها بەش نەبوو لە چین کە تیایدا بانگەشەی بێجینگ بۆ حوکمکردن ململانێی لە سەر کرا. پارێزگا گەورەکانی ڕۆژئاوا کۆماری گەلی کەتیبت و خینچیان بوون کە نزیکەی لە / ٤٠٪ هەرێمی وڵاتی پێکهێنابوو، دانیشتوانی گەلی چین نەبوون کە حوکمی چینیان کردە حوکمێکی ناشەرعی، گرتنەخۆی ناچاری



کۆماری گەل بۆ ئەوان بەندەکانی پەیمانی ڕۆژئاوا بوو. زاڵبوونی ئیمپریالی فورمێکی بەزۆر سەپێنراو بوو بۆ چین لە سەدەی نۆزدەهەمدا. سەبارەت بەسووربوونی سەرکردەکانی چین لەسەر ئەوەی کە تایوان بەشێکە لەچین لەبەرئەوە بوو ئەو سەرکردانە نیگەران بوون بەوەی کە پاشەکشە لەم شوێنە ڕەنگە هەستی یاخیگەران هانبدات لە بەشی ڕۆژئاوایی ئەو ناوچەیەی کە تیایدا زاڵن.

گەر کۆتایی جەنگی سارد چاکردنەوەی تایوانی زەحمەتر کرد بۆ بێجینگ، ئەوا وای لە تایوان کرد کەمتر بە پەرۆش بێت بۆ تەوەقوعی حوکمکردنی لە چین و زیاتر لە سەر بەرنگاربوونەوەی چین سوور بوو. لە سەرەتای سەدەی نوێدا، دوورگەکە سەربەخۆییەکی کاریگەری وەرگرت بۆ ماوەی پەنجا ساڵ. بۆ ماوەی چەند سەدەیەك ناسنامەی تایوانی جیاکراوە لە نێو گەلەکەی پەیدابوو. وا هەستیان بە خۆیان نەدەکرد کە سەر بە چینن، بە هەقیقەتیش، تایوان جۆرە شوێنێکی زۆر جیا بوو لە چین، لە ماوەی دوو دەیەی ڕابردووی سەدەی بیستەمدا گەشەیەکی ئابووری بەرچاوی بەخۆوە بینی، چینیش هەژارو لادێی مایەوە. تایوان نە هەژار و نە لادێیش. بە پێی پێوەری جیهانی دەوڵەمەند بوو، داهاتی هەر کەسێك ١٦ هەزار دۆلار بوو بە بەراورد لەگەڵ داهاتێکی هەر کەسێك لە چین ٣٨٠٠ دۆلار بوو.

جیاوازییە سیسایەکان وەك جیاوازییە ئابوورییەکان کاریگەرو بەرچاو بوون. لە چارەگی یەکەمی سەدەکەدا، پاش شەڕی چیانگ لەگەڵ تایوان لە ساڵی ١٩٤٩، حوکمی لە دوورگەکە گێڕا بە شێوەیەکی ئۆتۆکراتی و جۆرێك لە دڕندایەتی. حیزبەکەی کومیتانگ (KMT)، داگیرکرابوو لە لایەن ئاوارەك و دەربەدەربووەکانی وڵات، هێزی سیاسی قۆرخ کرد بۆ وەدەرنانی تایوانە مەحەلییەکان، بەڵام بێجینگ لە ساڵی هەشتاکان، کۆڕی چیانگ و جێگرەوەی چیانگ چی کوو، گورزی KMT هێور کردەوە. سیستەمی سیاسی زۆر کراوەو لیبراڵ بوو. لە ناوەڕاستی نەوەدەکاندا، تایوان وڵاتێکی دیموکراسی زۆر پێشکەوتوو بوو، گەلەکەی ملکەچی حوکمی ڕژێمێك نەدەبوو سەرکوتی کردن لە خۆپیشاندانێك لە گۆڕەپانی تیانانمێن لە ساڵی ١٩٨٩، کە بە هیچ شێوەیەك ئازادی سیاسی نەدا بەو گەلە. ململانێی سەرەکی جەنگی سارد، لە نێوان سەربەخۆیی و ستەمکردن هێشتا زیندوو بوو لای تایوانییەکان.

پرۆسەی دیموکراتیزەکردنی تایوان پەیوەندی لەگەڵ چین خراپتر کرد. وەك بە شێك لەو پرۆسەیە، دەسەڵاتەکانی تایوان وازیان لەو بانگەشەیە هێنا کە بن بە حکوومەتێکی شەرعی

هەموو چین. بەڵگەی بەیاننامەی شانگهای ساڵی ١٩٧٢ هەڵوەشایەوە. هیچی تر چینییەکان لە هەردوو لای کەناڵی تایوان باسی ئەوەیان نەکرد کە چین تەنها یەك پارچەیە. ڕەتی تایوان بۆ بانگەشەکەی بۆ چین ئەوەی خستەڕوو کە حکوومەتی چین هیچ بانگەشەیەکی شەرعی نییە لە سەر دوورگەکە، بانگەشەیەك کە بێجینگ ڕەتیکردەوە بۆ ملکەچ بوون. لەبەر ئەوەی تایوان ئەوەی ڕادەگەیاند کە شەڕی ناوخۆی چین کۆتایی هاتبوو و کۆمینیزمیش بردبیەوە، ئەمە بێگومان یەکێك لە نموونە هەرە دەگمەنەکانە لە مێژوودا کە بەرهەمی شکست لە لایەن لایەنی دۆڕاو لە ململانێکە بە خراپییەکی جدی لە لایەن سەرکەوتووەوە وەرگیرا.

وێڕای ئەمە، لە هەڵبژاردنە ئازادەکانی تایواندا، کاندیدەکان ئازاریان چەشت لە خستنە ڕووی ئەو شتەی کە زۆربەی گەلی تایوان دەیەوێت. پاراستنی واقیعی سەربەخۆی دوورگەکە و دەستەبەرکردنی سەروەری ڕەسمی شیاو. سەرۆك لی تێنگ هو، یەکەم سەرۆکی بە ڕەگەز تایوان و لە ساڵی ١٩٩٦ یەکەم کەس بوو بە ئازادی هەڵبژێردرا، بێجینگی توڕەو نگەران کرد بە سەردانێکی ڕەسمی بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ وەرگرتنی پلەی شکۆمەندی لە شوێنی پەروەردەکردنی زانکۆی کۆرنێل لە ساڵی ١٩٩٥ هەروەها بە هۆی وەسفکردنی بارودۆخی نێودەوڵەتی بە زمانی تایوانی بەوەی کە تایوان وڵاتێکی سەروەرییە. یەکێك لە دافعەکانی پاراستنی بەرژەوەندییە سیاسییەکانی حیزبەکەی بوو، چاکسازییە KMT، دژی ڕکابەرەکەی حیزبی پێشکەوتنی دیموکراتی (DPP) کە هەڕەشەی هێرشێکی کرد بۆ سەر دوژمن بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بۆ سەر گرووپی حوکم کردن کە پەرۆش بوون بۆ سەربەخۆیی، بەڵام لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتیدا، لە ساڵی ٢٠٠٠، کاندیدی DPP چێن شو بیان بردبیەوە.

ئاسیای ڕۆژهەڵات بە گشتی و تایوان بە تایبەتی یارمەتی نادات، بەڵام کاریگەر دەبێت لە کۆتایی جەنگی سارد. ڕووخانی یەکێتیی سۆڤیەت و یۆگسلافیا، ئیپراتۆرە فرە نەتەوەییەکانی کۆمۆنیستی ئەوروپا، هەروەها بەدەستهاوردەی سەروەری تەواو لە لایەن جەماوەری پارێزگاکانیان بە بەردەوامی بە بێ سەرنج دەچوو بەڕێوە لە لایەن خەڵکی ئیمپراتۆرە فرە نەتەوەییەکانی کۆمۆنیست لە ئاسیا و چین. سەربەخۆیی لە نەوەدەکان لە ئاسماندا بوو و هیچ گەلێکی ئەوروپا کە سەربەخۆیی وەردەگرت مێژوویێکی کاریگەری خۆبەڕێوەبردنی نەبوو یان تۆمارێکی بە دیموکراتیزەکردن یان لیستێکی دەسکەوتە ئابوورییەکان کە تایوان بتوانێت شانازی پێوە بکات. گەر سەروەری لە سەر بنەمای باشەو مەنتق خەڵات کرابوا ئەوا بە



دڵنیایەوە تایوان لە سەرووی هەموویانەوە دەبێت بۆ وەرگرتنی ئەو خەڵاتە. گەر لە ڕوانگەی مافی چارەی خۆنووسنی ویلسنی، لە سەر بنەمای ئەوەی خەڵك لە زمنی دەسەڵاتێکی تایبەتدا چی دەوێت خەڵات کرابوا، بانگەشەی تایوان هەر بەهێز دەبوو.

لە وەرچەرخانی سەدەی بیست یەکدا ململانێ لە نێوان تایوان و چین تەمەنی پەنجا ساڵ بوو. ڕێگاچارەیەکی بەرهەمهێنەری بەدەستنەهێنا، چونکە جیاوازییەکانی نێوانیان زۆر بوو کە بگەن بە ڕێگە چارەیەکی گونجاو. تایوان هەرگیز پەسەندی بارودۆخێکی نەدەکرد کە گونجاو بوا بۆ حکوومەتی کۆمۆنیست لە چین. هەروەها ململانێکە موعەرز نەبوو بۆ هێوربوونەوە بە هۆی پێوەری سەربەخۆ، هۆی ئەمەش جوگرافیا بوو. لەبەر ئەوەی تایوان ١٠٠ میل دوور بوو چین، چینیش توانای ئەوەی نەبوو داگیرکارییەکی سەرکەوتوو بکات.

لە دەیە زووەکانی جەنگی ساردا، هێزی سەربازی ئەمریکا ئەمەی قەدەغە کرد، قۆناغە دواییەکانی تایوان تەواو بەهێز بوو بۆ بەرگریکردن لە خۆی. ئایا تایوان بلکێنرابوا بە چین چارەنووسی وەك ئەوەی گۆوا (Goa) دەوره گیراوی پورتوگال لە سەر کەناری ڕژئاوای هیندستان دەبوو، کە سوپای هیندستان بە ئاسانی داگیری کرد لە ساڵی ١٩٦٠، یان ئەوەی هۆنگ کۆنگ لە ساڵی ١٩٩٧ گەڕاوە سەر چین کە لە لایەن بەریتانیا دانووسانی لە سەر کرا. لە لایەکی ترەوە، گەر دوورگەکە کەوتبا ئەوێ، بۆ نموونە ٢٥٠ میل لە کەناری چین، ئەوا بە تەواوی دەلکێنرا بە کاروبارەکانی چین، هەروەك ئەوەی چاودێرانی فەڕەنسی و بەریتانی و وایان کرد کاتێك ئیمپراتۆری ئەوروپی کۆتایی هات، بەڵام سەد میل دوورییەکی وا نەبوو بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە. تایوانی باش هەڵکرد لەگەڵ زنجیرەی تەیارەو مووشەکی بالیستیکی چین.

کاتێ سیاسەت و جوگرافیا کێشەی تایوانیان کردە هەموو شتێك بەس چارەسەر نەکرد، ئەمریکا تێوەگلاو کێشەکەی کردە ترسناکترین مشتومڕی سیاسی دوای جەنگی سارد. ویلایەتە یەکگرتووەکان بوو بە مامانی ئۆتۆنۆمی تایوان. کاتێ جەنگی کۆریا دەستی پێکرد لە مانگی شەشی ١٩٥٠، سەرۆك هاری ترۆمان فەرمانیدا بە پاپۆڕی حەوتەم بۆ نێو کەناڵی تایوان. گەر ئەو فەرمانەی نەدابا، کۆمۆنیستە چینییەکان ڕەنگە پلانی خۆیان باش جێبەجێ کردبا بۆ گرتنی دوورگەکە، کە لەو حاڵەتەدا کێشەی سەربەخۆیی تایوان هەرگیز بەرز نەدەکراوەیەوە. بۆیە، هێزی سەربازی ئەمریکا تایوانی پاراست لە چین. لە ساڵی ١٩٧٩ دا، لەگەڵ دامەزراندنی پەیوەندی دیپلۆماتی ڕەسمی لەگەڵ بێجێنگ، واشنتۆن پەیمانی ئاسایشی

هەڵوەشاندەوە کە لەگەڵ تایوان ئیمزاکرابوو لە ساڵی ١٩٥٤ و شوێنی گرتەوە بە کاری پەیوەندی کەمتری تایوان. بەیاننامەی شەنگهای ڕێکەوتنێکی تاکتیکی خستەڕوو لە نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکان و چین بۆ بەلاوەنانی کێشەی تایوان بە بەردەوامی.

کۆتایی جەنگی سارد پەیوەندییەکانی نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکان و کۆماری گەلی چین و ئەو ڕێگایەی گۆڕی کە ئەمریکییەکان حکوومەتی چینیان بینی. بێجینگ وەك سەربازێك لە پێشەوەی سەنگەری دژی هەڕەشەی گشتی دەبینرا، بەڵام لە سەرەنجامی تیانامێن ڕکابەرێکی لێنەبوراوی دیموکراسی و پێشیلکەری مافەکانی مرۆڤ لە سەر پێوەری کۆمەڵ ئەوە بەدیی دەکرا. لەکاتی جەنگی ساردا بە هەقیقەت هەردووکیان وا بوون، بەڵام لەگەڵ کۆتایی ململانێکە وەستا لە بەر دوو هۆی گرینگ، یەکێکیان لە بەر بەرژەوەندی ئەمریکاو ئەوەکەی تر لە بەر چەند خەوشێك لە هەردوولادا

گۆڕانی وێنەی ئەمریکا لە سەر ڕژێمی بێجینگ بوعدێکی ئەخلاقی بەخشی بە ململانێی نێوان تایوان و چین کە شتێکی گشتی بوو لە کاتی جەنگی ساردا، بەڵام زۆر کەمتر بوو لە سەرەنجامەکەی. گەلێکی ئازاد بەرەنگاری کودەتای کۆمۆنیستی دەکرد. لە ژێر ئەم جۆرە بارودۆخەدا، خەڵکی گشتی ئەمریکا هەستیان بە ئەرکێکی ئەخلاقی کرد گەر پێویست بێت بۆ مسۆگەرکردنی دیموکراسی تایوان ئەوا بە دڵنیایی دوایی دەبێ بەشداری کۆتاییەکەی بکات. لە باری خۆی حکوومەتی ئەمریکا دانی بە بەرژەوەندییەکی ستراتیژی دانا لە بەردەوامی واقیعی سەربەخۆیی تایوان، یان بەلانی کەم قەدەغەکردنی ئەوەی ئەو سەربەخۆییە بە زۆری ڕەت بکرێتەوە، متمانەی گشتی پابەندی ئەمریکا گرینگ بوو لە ئاسیای ڕۆژهەڵات بۆ یەکگرتووی هاوپەیمانێتی لەگەڵ ژاپۆن و کاریگەرێتی هاوکاری ئەمریکی بۆ نەهێشتنی باکووری کۆریا. هەروەها کاتێ کاری پەیوەندییەکانی تایوان پابەندبوونی ئەمریکای نەگرتەوە بۆ پاراستنی تایوان. شتێك نەبوو کە لێیەوە ویلایەتە یەکگرتوەکان بە ئاسانی بەرەو ئەولاتر چوو.

هێرشێکی چینی بۆ سەر تایوان ڕاستەوخۆ مەترسی هەبوو بۆ سەر ئاسیای ڕۆژهەڵات. گەر هێرشەکە سەرکەوتوو بوا، پابەندبوونی ئەمریکا دەکەوتە ژێر پرسیارەوە، سەرەنجامەکەشی شیاوی باوەڕکردن بوو و دەبووە هۆی بە زنجیرەیەك بەرپەرچی متمانە نەبوون، ڕکابەری چەك و زیادکردنی چەکی ناوکی ململانێی فراوانی ناوچەیی دەهێنا کایەوە و بەرپەرچی دوژمنکارانەی لێ پەیدا دەبوو کە حوکمی سیاسەتەکانی زۆربەی زلهێزەکانی جیهانی کردبوو لە زۆربەی کات



کە ئەویش کارێکی تەشویقی دابوو. بۆ مەسەلەی تایوان ئەم جۆرە بیرکردنەوەی دۆمینەیە بەردەوام بوو و بوو بە بەشێکی مەزەندەی ئاسایشی وڵاتانی ناوچەکە، بە تایبەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان.

ویلایەتە یەکگرتووەکان بەرژەوەندییەکی بەرجەستەی هەبوو لە هاننەدانی هێرشێکی سەربازی لە لایەن بێجینگ بۆ سەر تایوان، سیاسەتی هاننەدانیش ئاسایی هێز بە دەست دێنێت گەر ئەم وتە قسەی لە سەر بکرێت، لە سەرەنجامی جەنگی ساردا، مسۆگەری وازعی پاراستنی ئەمریکا کە تایوان خێری لێ بینی بۆ ماوەی چارەگە سەدەیەك بوو، بەڵام لە دەیەی یەکەمی ماوەی دوای جەنگی ساردا، حکوومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان، ئەم جۆرە شتانەی نەکرد. هیچ ئاواتێکی نەبوو بۆ دەستپێکردنی پەیوەندی دوژمنداری لەگەڵ چین لە ماوەی نێوان جەنگی کۆریاو هەولی نیکسۆن ماو ی ساڵی ١٩٧٢.

وڵاتانی تری ناوچەکە پەیوەندیان بەو جۆرە سیاسەتە دەکرد لە بەر هەر هۆیەکی تر بێت. هەموو بە هیوای ئەوە بوون کە مشتومڕەکان لە سەر بارودۆخی تایوان چارەسەربکرێت بە ئاشتی. هیچ کام شەراکەتێك بە پێویست مسۆگەری ئەوە ناکات خزمەتی هۆی سەقامگیری سەربازی کردبێت لە ئاسیای ڕۆژهەڵاتدا. لێرەدا، دڵەڕاوکێی ئاسایش هەرەوەزی کرا، ئەوەی لە لایەن ویلایەتە یەکگرتووەکان نیازی پێوەری بەرگری خرا موجازەفە لە لایەن چینییەکان وەك خەمۆکی وەرگیرا، بە تایبەتی گەر ئاسایشی ئەمریکا ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی ڕەسمی تایوان مسۆگەر بکات.

کێشەی تایوان بووە ڕێگر لە بەردەم دروستکردنی سیستەمێکی ئاسایشی گشتی بۆ ئاسیای ڕۆژهەڵات وەك ئەوەی کە ڕۆناڵد ڕیگان و میخائیل گۆرباشۆف هێنایانە کایەوە بۆ ئەوروپا لە کۆتایی جەنگی سارد. چینی خستە پەراوێزەوە لە سیاسەتەکانی ئەمریکا کە داڕێژرابوون بۆ دڵنیاکردنی هەموو وڵاتانی تری ناوچەکە. دەسەڵاتی چین تەنانەت لە پاش کۆتایی جەنگی ساردیش بەهای بەردەوامی پەیمانی ئاسایشی ژاپۆن و ئەمریکای بینی، بەڵام ئیعتزازی گرت لە تەعدیلکردنی ڕێبەری بەرگری ژاپۆن کە ئەمریکا پێی وابوو پێویستە بۆ پاڵپشتی هاوکاری گشتی بۆ پەیمانەکە، چونکە واپێدەچوو تایوانی بێنێتە نێو سنووری بەرگری هاوپەیمانێتییەکە. چینییەکان ویستیان هێزە چەکدارییەکانی ئەمریکا بمێنێتەوە لە ناوچەی ئاسیای هێمن بۆ مەبەستگەلێك کە کرکەوتبوون لە سەری، بەڵام نەك بۆ ئەوانەی کە کۆك نین لە سەری.

لەبەر بانگەشەی چین لە سەر تایوان، ئایدیای پێکهاوردەی هێزە سەربازییەکانی خستە بەردەست تاوەکو چین توانای هێرشکردنی کەم بێت، تایوانیش هێرشێکی وای نەبرد بۆ سەر بێجێنگ. هەر لەبە هەمان هۆ، چینییەکان سەرنجیان ڕانەکێشرابوو بۆ ڕێکەوتنە ڕەسمییەکان بۆ سنووردانان لە سەر هێزە چەکدارییەکانیان. کێشەی تایوان بەرەبەستێکی تر بوو بۆ خاسیەتی ئاسایشی گشتی، ئەویش شەفافیەت بوو.

ویلایەتە یەکگرتووەکان جەختێکی زۆری کردەوە لە سەر پەیوەندییەکانی سەربازی لەگەڵ چین، بەڵام چینییەکان دڵسارد و سانسۆریان لە سەر بوو، بێگومان ئەوەیان لە مێشکی دابوو کە ڕەنگە هێزەکانیان بکەونە ململانێ لەگەڵ هێزی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە کەناڵی تایوان.

بە بێ ڕەخسانی دەرفەتێك بۆ پاراستنی ئاشتی لە ئاسایی ڕۆژهەڵاتدا لە ڕێگەی ئاسایشی گشتی، ویلایەتە یەکگرتووەکان لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا ناچارکرا سیاسەتی دوو سەرەی قەدەغەکردن پەیڕەو بکات. لە هێرشکردنە سەر چین مەبەستی پاراستنی تایوان بوو لە هەمانکاتدا پاراستنی تایوان لە ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی خۆی بوو. لە کاتێکدا گەر حکوومەتێکی کۆمۆنیست لە بێجێنگ ڕاگەیاندرابا دەبووە هۆی دەستپێکی هێرشێك.

لە مەسەلەی تایواندا، ویلایەتە یەکگرتووەکان دەبوایە هامشۆ بکات لە نێوان دوو مەترسی لە بێ هێزکردنی پابەنبوونی بۆ مەسەلەی دەست هەڵگرتنی لە تایوان، بۆیە زیاتر هانی تاکتیکە شەڕانگێزییەکەی دەدا لە لایەن چینەوە، هەروەها بەهێزکردنی ئەو پابەندبوونە بۆ ئەو خاڵەی کە تایوان هەست بە متمانەی کرد بۆ ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی، هاندانی چین بۆ هێرشێك، ویلایەتە یەکگرتووەکان دەکەوتە ناو تەڵەوە.

لە دەیەی یەکەمی ماوەی دوای جەنگی ساردا، تێکەڵەی سیاسەتی ئەمریکا و چین و تایوان، سەقامگیرییەکی نیگەرانی بەرهەمهێنا کە هەردوو سەرچاوەکەی گۆڕانی کتوپڕ و سیاسەتی تەکنەلۆژیایەکی تر کەوتە مەترسییەوە.

سیاسەتە ناوخۆیەکانی هەر سێ وڵاتەکە پاڵی بە حکوومەتەکانیان نا شتی زیاتر بکەن کە جەنگی زیاتری لێدەکەوتەوە. بەرپرسە تایوانییەکان چەندجارە وێل بوون بە دوای ئەو ڕێگایانەی بۆ دووپاتکردنی سەربەخۆیی ناوچەکەو بەدەستهاوردەی دانپیانانی نێودەوڵەتی. سەرکردە کۆمۆنیستەکانی چین، شەرعییەتی جەماوەری کەمی هەبوو، دەبوایە وا دابنێت ڕۆلی بەرگریکەرانی ڕێگەچارەی یەکگرتوویی هەرێمی چین نییە، واتە دوورگەی تایوان لەگەڵ چین





نابێتە یەك. هۆی تایوانییەکان کاریگەری هاوپەیمانێتی هەبوو لە ویلایەتە یەکگرتووەکان، بە تایبەتی لە کۆنگرێسی ئەمریکادا. تێکەڵەکە دوو مومارەسەی سەربازی چینی شەڕانگێزی بەرهەمهێنا لە نەوەدەکان کە داڕێژرا بە ئاگادارکردنەوە و کۆنترۆلی تایوان. لە سەر بۆنەی دووەم ویلایەتە یەکگرتووەکان تێوەگلان.

سەردانی ساڵی ١٩٩٥ سەرۆکی تایوان تێنگ هو بۆ زانکۆی کۆرنێل بێجینگی حەپەساند، کە زەمانەتی وەرگرت لە حکوومەتی ئەمریکا وەك دەوڵەتێك دانی پیا بنێت. ئیدارەی کلینتۆن ئەو زەمانەتەی شکاند لە ژێر فشاری کۆنگرێسی ئەمریکادا، کە حیزبی بەرهەڵستکاری کۆماری کۆنترۆلی کردبوو. لە وەڵامدا، مومارەسەی سەربازی ئەنجامدا کە مووشەکە تەقێنەری بالیستیك تێوەگلاند لە چینەوە، کە لە نزیك تایوان دەکەوتە خوارەوە.

ساڵی داهاتوو یەکەم هەڵبژاردنی دیموکراسی سەرۆکایەتی کرا کە لی تێنگ هو بردییەوە. حکوومەتی کۆمۆنیستی چین ئەمەی بە هەنگاوێگی ورژێنەر دانا، هەروەها جارێکی تر چین مومارەسەی سەربازی مووشەکی کرد کە دووبارە لە نزیك تایوان دەکەوتە خوارەوە. لە بەر ئەم هۆیە، ویلایەتە یەکگرتووەکان بە مانۆڤەرێکی سەربازی خۆی وەڵامی دایەوە بە هەناردنی دوو تەیارە بۆ سەر ئاوی دوورگەکە. نە چین و نە ویلایەتە یەکگرتووەکانیش نیازی چوونە شەڕیان نەبوو. هەریەکەو هێمایەکی دەنارد، سەبارەت بە چین، هیچی تر لە جوڵەی تایوان نابوورێت بەرەو سەربەخۆیی، بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانیش وا گەمژە دەستەوسان ناوەستێت گەر چین هەوڵی هەڕەشە لە تایوان بکات لە ڕێگەی سەربازییەوە. ئەم هەل و مەرجە شیانی جەنگ بوو.

لەم جۆرە شەڕەدا، کۆنترۆلی ئاسمانی لە نێوان تایوان و چیندا کلیلی سەرکەوتنە. لە دەیەی یەکەمی ماوەی دوای جەنگی ساردا، ئاسمانی لەوێ دەگەڕاوە بۆ تایوان. گەر چین پاپۆڕی بە نێو کەناڵی تایوان ناردبوا بۆ گرتن تایوان ئەوا تایوان دەیتوانی بە هێزی ئاسمانی سەراونگومیان بکات، بەڵام ئەمە بنکەی سەربازی نەبەخشی بە تایوان بۆ ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی بە تەواوی. لەبەر گەشەی مووشەکی بالیستیکی چین کە دەیتوانی زەرەرێکی زۆر لە تایوان بدات بێ ئەوەی داگیری بکات. بۆیە پەیوەندی سەربازی نێوان هەردووکیان ڕێگەی لە هەردووکیان دەگرت.

سوودی ئاسمانی تایوان هەمیشەیی نەبوو، بەڵام، هەردوو لا نیازیان چاکردنی هێزی ئاسمانی خۆیان بوو، دروستکردنی هاوسەنگی سەربازی لە سەر کەناڵی تایوان بابەتێکی ململانێی چەك بوو، کە یەکێك لە چالاکە سستەکانی ژێر کارەکانی سەدەی بیست و یەك بوو.

بەپێچەوانەی ڕکابەری ناوکی سۆڤیەت و ئەمریکا لە کاتی جەنگی ساردا، کە تیایدا نە ویلایەتە یەکگرتووەکان و نە یەکێتیی سۆڤیەت بەهیوای ئەوە نەبوون سوودی تەواو لە هێزی سەربازی یەکتر وەربگرن، چین و تایوان ڕکابەریان تەنها لە سەر ئەو شتە بوو. تایوان سوودی هەبوو، هەروەها واقیعی سەربەخۆیی بەدەست هێنا. گەر چین ئاسمانی بەدەست هێنابوا، سەربەخۆیی تایوان، دەخرا مەترسییەوە. هەروەها لەبەر ئەوەی تەکنەلۆژیا بەخێرایی پێشکەوت، چین، بە قەبارەی خۆیەوە، دەیتوانی سەرچاوەی سەرووتر تەرخان بکات بۆ تەواو کردنی، بە کاتێکی زۆرتر کێشەی هاوسەنگی ئاسمانی بە تەواوی قایلکەر دەبوو. بۆ گەیشتن بە چین، تایوان دەبوایە پشت بە ناوەندە تەکنەلۆژییەکانی ئەمریکا ببەستێت، وەك کاری باشی تەیارەو ڕاداری هەڵسوڕاندنی جەنگ. ئەمە ئێستا ڕێگایەکی تر بوو کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی لە ململانێی کەناڵی تایواندا ئاڵاندبوو.

تەنانەت بە ئاسمانی باشتر تایوان هەڕەشەی لێکرا لە لایەن مووشەکی بالیستسکی چین، هەروەها کاتێ ئەمانە بە زۆری ورد بوون، نەك هەر تەنها دەیانتوانی دانیشتوانی تایوان هەڕەشە بکەن، بەڵکو بنکەی کۆنترۆلی ئاسمانی تایوانیش. حکوومەتی دوورگەکە خەمێکی هەبوو بۆ بەرگریکردنی خۆی دژی هێرشی مووشەك هەروەها دژی هێرشێکی وشکانی و دەریایی.

لە دەیەی یەکەمی ماوەی دوای جەنگی ساردا، ویلایەتە یەکگرتووەکان وێڵ بوون بە دوای هەردوو ڕێگا بۆ بەرگریکردن لە دانیشتوانی خۆی لە هێرشی مووشەکی دوورهاوێژ و پاراستنی هێزە سەربازییەکانی لە هاتنی مووشەك لە ماوە کورتەکاندا. جۆری دووەم، " بەرگری مووشەکی سەکۆ/شانۆ" شیاو بوو بۆ داواکارییەکانی سەربازی تایوانییەکان. سەرسام نەبوو، حکوومەتی چینی بە توندی نارەزایی لەوە هەبوو کە تایوان بەشدار بێت لە هەر سیستەمێکی بەرگری مووشکی سەکۆ. لە کۆتایی دەیەی یەکەمی ماوەی دوای جەنگی ساردا، ویلایەتە یەکگرتووەکان سیستەمێکی کارای هەر جۆرە بەرگرییەکی مووشەکیان نەبوو، بەڵام کردە بەرگرییەکان ڕوانگەیەکی سەرنجڕاکێشبوون وەك ڕێگایەکی جێبەجێکردنی پابەنبوونی ئەمریکا لە بەشێکی تری ڕۆژهەڵاتی باکووری ئاسیا لەو شوێنەی کە ویلایەتە یەکگرتووەکان نزیکتر بوون لە جەنگ لەوەی لە سەر کەناڵی تایوان لە دەیەی یەکەمی ماوەی دوای جەنگی سارد ئەو شوێنەش نیمچە دوورگەی کۆریایە.



### *کۆریا*

وەك پەیوەندییەکانی نێوان چین و تایوان، بارودۆخی سیاسی دوورگەی پێنینسولا کێشەیەکی ڕەگداکوتاو بوو لە جەنگی سارد کە کۆتایی ئەو ململانێیە خراپتر بوو. کۆریا وڵاتێکی دابەشکراو بوو. دابەشکردنەکەی، تەقریبەن بە ڕێکەوت بوو، کە هۆیەکەی نزیکتر ئاڵان بوو لەگەڵ جەنگ لە ئاسیای ڕۆژهەڵات لە دەیەی یەکەمی ماوەی دوای جەنگی سارد و کردی بە یەکێك لە وڵاتە زەقەکانی جیهانی دوای جەنگی سارد.

لەگەڵ کەلتوورێکی دروستکراو بەهۆی کاریگەری چین و وجودی بەردەوامی وەك کۆمەڵگایەکی سیاسی سەربەخۆیی یەکگرتوو بۆ نزیکەی سیانزە سەدە، مێژووی مۆدێرنی کۆریا دەستێ پێکرد کاتێ هاتە ژێر کۆنترۆلی ژاپۆن لە ساڵی ١٩٠٥. هەبوونی ڕاگەیاندنی شەڕ لە سەر ژاپۆن لە دوا ڕۆژەکانی جەنگی جیهانی دووەم، یەکێتیی سۆڤیەت سەربازی ڕەوانەی مانچوریا کرد هەروەها لە لایەن ژاپۆنییەکانیش کۆنترۆلکرابوو، هەروەها بۆ بەشی باکووری کۆریا. بەبێ ئەوەی زۆر لە مەسەلەکە بیربکاتەوە، حکوومەتی ئەمریکا بڕیاریدا کە ئەویش دەبێ ناوچەیەکی داگیرکراوی هەبێت لە سەر نیمچە دوورگەکە و هەڕەمەکی نەخشەی هاوتەریی سیانزەهەمی دارێشت وەك سنووری باشووری ناوچەکە. ڕژێمێکی کۆمۆنیست بە سەرکردایەتی " کیم سونگ"ی دووەم خۆی دامەزراند لە باکوور لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەت وەك چاودێری. لە لای باشوور، حکوومەتێکی غەیرە کۆمۆنیست پێکهات لە ژێر باڵی "سینگمان ڕیی".

لە ٢٥، ٦، ساڵی ١٩٥٠، بە ڕازیبوونی ستالین، کیم هێرشێکی نارد بۆ سەر لای باشوور بە مەبەستی یەکگرتنەوەی دوورگەکە لە ژێر حوکمی ئەودا. لە ژێر چاودێری نەتەوە یەکگرتووەکان، ویلایەتە یەکگرتووەکان سەربازی نارد بۆ ڕێگە گرتن لە هێرشەکە. لە وەڵامی دژە هێرشێکی ئەمریکی، ڕژێمە کۆمۆنیستە نوێیە چەسپاوەکە، لە چین سوپایەکی نارد کە ژمارەیان ١,٢ ملیۆن بە نێو ڕووباری یالودا، کە چینی لە کۆریا جودا کردەوە، بۆ شەڕکردن لەگەڵ ئەمریکییەکان. جەنگی کۆریا کۆتایی هات بە ڕێکەوتنێکی ئاشتی لە ساڵی ١٩٥٣. دامەزراندنی جۆگەیەکی ناسەربازی دوو میل و نیو پان و هاوتەریبی ژمارە سی و هەشتی دەربڕی وەك هێڵێکی جودابوونەوەی نێوان هەردوو کۆریا.

سەبارەت بە پەیوەندییەکانی نێوان کۆریای باکوور و باشوور هەمان ڕەوشی نێوان پەیوەندی هەردوو ئەڵمانیا بوو. هەر لایەو دەویست ببێتە حکوومەتێکی شەرعی بۆ ئەوی تر. سوپای گەورە گەورە لە لاکەی تر ئامادە دەکرا لە سنووری نێوان هەردووکیاندا. هەر یەکەو بەشێك بوو لە هەردوو کامپە ڕکابەرەکەی جەنگی سارد کە هاوکاریش هەر لەوان وەردەگرت، بەڵام بە پێچەوانەی هەردوو ئەڵمانیاکە لە ساڵی ١٩٧٠، هەردوو کۆریا هیچ ئاشتەوایەکی دیپلۆماسیان نەبوو لە کاتی جەنگی ساردا. نزیکەی هیچ پەیوەندییەکیان نەبوو و هێزێکی ئەوتۆش نەبوو بە تایبەنی لە لای باکووردا.

کۆریای باکوور وڵاتێکی کۆمۆنیست و دوورە پەرێز بوو لە تەواوی جیهان. حکوومەتەکەی بانگەشەی ئەوەی دەکرد بۆ پەیڕەوکردنی ئایدیاکان و ئایدیۆلۆژیای گەشەی ماڵی خۆی کە " جوچێ " بوو "juche" جۆرێك لە پشت بەخۆبەستن کە نیازی سەلماندنی دوورە پەرێزییەکەی خۆی هەبوو. هێزێکی قورسی سەربازی هەبوو و سەرکردەی جیاکراوە شمولی بۆ ناوەخۆ و چالاك بوو. ڕێزی گشتی بۆ کیم سونگی دووەم زۆر چڕ بوو تەنانەت ئەو سەرانەی کە بۆ ستالین و ماو دەدرا لە کاتی ئەواندا، ئەویش هەمان سەرانەی بۆ دەدرا.

وەك هەردوو ئەڵمانیاکە، بە هەقیقەت وەك کامپی ڕۆژئاوایی و کۆمۆنیستی وەك گشت لە کاتی جەنگی ساردا، ململانێی نێوان هەردوو کۆریا بوعدێکی ئابووری هەبوو هەروەها هۆی سیاسی و سەربازی لە پاڵ بوو. لە حاڵەتی کۆریادا، وەك ئەوانی تر، نمایشی سیستەمی لیبراڵ خۆی لە پێشەنگدا سەلماند. لە ساڵی ١٩٦٠ دەیەك پاش دەست پێکردنی جەنگی کۆریا هەردوو وڵات لە ڕووی ئابوورییەوە نزیکەی یەکسان بوون. پاشان ئابووری باشوور بەرز بۆوە. لە چوار دەیەدا داهاتی هەر کەسێك لە ساڵێکدا بەرزبۆوە لە سەد دۆلار بۆ ١٠٠٠٠ دۆلار. ئابووری باکووریش تەواو دابەزی. لە کۆتایی سەدەکە کۆریای باشوور سوودێکی گەورەی هەبوو لە پیشەسازی بەرهەمهاوردە و هەناردن و پێوەری گوزەران. لە خەملاندنێکدا، داهاتی بیست و چوار جار گەورەتر بوو لەوەی باکوور. کەواتە ئەوەی بە دیارکەوت و ڕاگەیەنرا ژێرکەوتنی کۆریای باکوور بوو کە نەیدەتوانی خۆی بەخێو بکات. لە دوا ساڵەکانی سەدەی بیستدا لە ژێر قاتو قڕیدا ڕووخابوو.

هەروەك لە شانۆکانی تری نێو جیهانی ساردا، نمایشی ئابووری، باش و خراپ، سەرەنجامی سیاسی هەبوو. کۆریای باشوور لە ڕووی ئابورییەوە زۆر بەهێز بوو کە هەردوو زەبەلاحی



کۆمۆنیستی پێشووی یۆراسیا، یەکێتیی سۆڤیەت کۆماری گەلی چین، سیاسەتی سەردەمی جەنگی ساردی بەلاوەنا لە بەرژەوەندی دەسکەوتی بازرگانی لەگەڵ باشوور. پەیوەندییە دیبلۆماسییەکان دامەزراندنی پەیوەندی ئابووری بەدواداهات لە هەردوو حاڵەتدا لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٩٠ و لەگەڵ چین لە ساڵی ١٩٩٢. پاشەکشەیەکی سیاسی هەبوو بۆ باکوور و سەدمەی ئابووری بەدواداهات. هەردوو بەردەستەکانی پێشووی بڕیاریاندا بۆ کەمکردنەوەی ئابووری بۆ کۆریای باکوور. لە هەموو بەلاغەی پشتبەخۆبەستندا، حکوومەت لە پایتەختی کۆریای باکوور " پیۆنیانگ" بە چڕی پشتی بەستا بوو لە سەر ئەمانە بەتایبەتی لە زامنکردنی وزە. ئەم پرسە باکووری تا سەر لێواری ڕووخانی ئابووری هێنا. بە خەملاندنێك، لە ساڵی ١٩٩٨ کەرتی پیشەسازی کە تیایدا ڕژێم زۆر وەگەڕخستنی کردبوو سەدا دەی توانای چالاك بوو.

هەموو ئەمانە بووە کێشەی وڵاتێکی جودا و کۆمۆنیست. پێشنیاری تارمایی چارەنووسی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتی کرد کاتێ سنوورەکەی لەگەڵ غەیرە کۆمۆنیست، ئەڵمانیایەکی ئابووری و سەرکەوتوو کۆماری فیدراڵ کرایەوە. ڕووخان و هەرەوەزی بۆ نێو کۆریای باشوور نەپاڕایەوە لە ڕژێمی کۆریای باکوور کە پاش مردنی کیم سونگی دووەم لە ساڵی ١٩٩٤ حوکم کرا لە لایەن کوڕەکەی کیم جۆنگ ئیلێ. بە ئاشکرا، بێ گرفت بوو بە هۆی ئەوەی لە خەمی خەڵکەکەدا بوو، خەمی زۆری ڕژێمەکە بۆ خەڵکەکە بووە هۆی مانەوەی. بە پێچەوانەی ڕژێمی کۆمۆنیستی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات، کۆریای باکوور هەوڵی بەرگەگرتنی دا، بۆ نێو سەدەی بیست و یەك، شەپۆلی مێژوو کە هەڕەشەی لێ کرد بۆ ڕامالینی.

سەرکردایەتی کۆریای باکوور سوورتر بوو بۆ مانەوەی لە سەر دەسەڵات لە سووربوونی حکوومەتی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات. سوورتر بوو، چونکە سەربەخۆتر بوو. وەك دامەزرێنەرانی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات، کیم سونگی دووەم لەو شوێنە دانرابوو پاش جەنگی جیهانی دووەم لە لایەن یەکێتیی سۆڤیەت، بەڵام ڕژێمەکەی بە پێچەوانەی ئەوانی تر پشتی نەبستا بە سەربازانی چینی یان سۆڤیەت بۆ پاراستنیان لە دەسەڵات.

کۆریای باکوور جەنگێکی کرد بە بێ بەشداری ڕاستەوخۆی سۆڤیەت (هەرچەند بە هاوپەیمانێـی هێزەکانی چین بوو) نەك تەنها دژی باشووری غەیرە کۆمۆنیست، بەڵکو دژی ویلایەتە یەکگرتووەکانە بەهێز.

بەرەنگاری حکومەتی کۆمۆنیستی کۆریای باکوور جوگرافیا بوو. لە کۆتایی ١٩٨٩ ئەڵمانیای رۆژهەڵات دەورە درابوو بەو وڵاتانەی کە یان غەیرە کۆمۆنیست و لیبراڵ یانیش لە پێشدا کۆمۆنیست بوون و لە پرۆسەی بەرەو لیبراڵیزم بوون. کۆریای باکوور تەنها یەك سنووری هاوبەشی لەگەڵ وڵاتێکی غەیرە کۆمۆنیست هەبوو، هەروەها بە نێو هێڵی بە سەربازکراوی چڕی دانانی سنوور جوودابوونەوەی لەگەڵ کۆریای باشوور هاتووچۆی دوو سەرە زۆر کەم بوو. دراوسێی لە لای باکوور چین بوو، لەکاتێکدا دوور بوو لە کۆریای باکوور لە مومارەسەی ئابووری و کەمتر سەختی سیاسی، هێشتا لە لایەن کۆمۆنیستەکان حوکم دەکرا کە بەهیوای ئەوە نەبوو بە رووخاوی ببینێت. لە لای رۆژهەڵات و رۆژئاوای کۆریای باکوور ئاوە، دەریای ژاپۆن و دەریای یالو. بەم رێگایە بە کۆمۆنیستەکەی تری دوای جەنگی سارد کە زۆر کەللە رەق بوو. ئاراستەکانی لیبراڵیزمی جیهانی رەتکردەوە دژی دوورگەی کاریبینی کوبا.

هێشتا، روانگەکانی داهاتوو بۆ رژێمی کۆریای باکوور لە کۆتایی دەیەی یەکەمی ماوەی دوای جەنگی ساردا گەشبین نەبوو. بۆ مانەوە پێویستی بە سەرچاوەکان هەبوو کە ناوەخۆی مسۆگەر نەدەکرد، تووشی دڵەڕاوکێ بوو. بۆ بنبڕکردنی رووخانی ئابووری پێویستی بە لەدەستدانی گرتنی بەسەر کۆمەڵگاوە بوو و دەرگاکردنەوەی وڵات بە رووی وەگەڕخستنو بازرگانی دەرەوە، بەڵام ئەو پێوەرانە هەڕەشەی کرد لە کەمکردنەوەی بنەما سیاسییەکانی حوکمی کۆمۆنیست. نوخبەی کۆمۆنیست وەك پیاوێك وابوو لە دوورگەی بیابانێك یان ئەوەتا دەمێنێتەوە لە بیابانەکەو موخاتەرەی لە برسان دەمرێت بکات یانیش گەشتێکی ترسناك بکات بۆ ئەو ئاوەی کە پڕیەتی لە قرش یان ئەوەتا بە زیندوویی دەخوورێت یانیش ئەوەتا دەخنکێت.

لەو بارودۆخانەدا، رژێمی باکوور ستراتیژی وەدەرنانی بەکاربرد هاوکاری خاوە لە رۆژئاوا بە تایبەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان وەرگرت بۆ پاراستنی خۆی و مانەوەی لە سەرەوە. کۆریای باکوور داوای پارەدانی کرد بۆ دەست هەڵگرتن لە دەستەبەرکردنی چەکی ناوکی.

لە مانگی هەشتی ١٩٩٨، رژێمەکە مووشەکێکی بالیستی نارد کە بەسەر زنجیرە دوورگەی ژاپۆندا تێپەڕی، ئەو روانگەی بەرزکردەوە کە سوور بوو بۆ دەستەبەرکردنی ناوەندەکان بۆ هەناردنی مووشەکێکی وێرانکەر بە نێو هەموو ئەو رێگایە بۆ ئەمریکای باکوور. تەنانەت بە بێ بەکارهاوردەی بۆمبێکی ناوکی، وێڕای ئەمە، خاوەندارێتی ناوکی تەواو دەسەڵاتی دەدا بە پیۆنگیانگ نەك تەنها بۆ دووپاتکردنەوەی مانەوەی، بەڵام بۆ وەدەرنانی مافی بەکارهاوردەی





زەوی و زاری تر. ئەو جۆرە، چەکی ناوکی کۆریای باکوور، موعەرەز بۆ کۆمەڵە ناسەقامگیرییەك بەرپەرچدانەوەی دەستەبەری ناوکی لە ئاسیای رۆژهەڵاتدا بوو.

روانگەی داهاتووی بۆمبی کۆریای باکوور ترسناك بوو کە ویلایەتە یەکگرتووەکان ئامادە بوو بچێتە شەڕ بۆ وەستاندنی، هەروەها بۆ نیگەرانی ساتی ساڵی ١٩٩٤، تەنانەت پێش تێستی مووشەکی، خەریك بوو جەنگێك لە سەر نیمچە دوورگەی کۆریا بقەومێ. ئەو مەسەلەی کە قەیرانی ١٩٩٤ خێرا کرد بۆ رووداو بڕیاری کۆریای باکوور بوو بۆ لابردنی بەکارهاوردەی بۆڕی نەوت کە لێیەوە مادەی بۆمبی لێ دێتە دەرێ، بە وجودی وەڵامێکی ناوکی بە بێ ئامادەیی پشکنەرە نێودەوڵەتییەکان. ئەمە لەوانەبوو ببا هۆی گەمارۆی UN کە کۆریای باکوور رایگەیاندبوو و هۆیەکیش بوو بۆ جەنگ. قەیرانەکە هێوربۆوە کاتێ کۆریای باکوور رازی بوو بۆ وەستاندنی چەکی ناوکی بە موقابیلی وەڵامی بەرهەمهاوردەی هێزی ناوکی رۆژئاوا.

بەرپابوونی جەنگێك لەگەڵ کۆریای باکوور زۆر بە کولفەتر دەبوو لەوەی جەنگی کەنداو. سوپایەکی ١,١ ملیۆنی تەنها بۆ لای باکووری هێڵی سی و هەشت گەرەکە، کە تەنها سی و پێنج میل لە سیئۆلی پایتەختی کۆریای باشوور دوورە. بە بەراورد لەگەڵ کۆریای باشوورو هێزەکانی ئەمریکا کە زۆری لێکرد — ژمارەیان ٦٦٠٠٠٠ و ٣٧٠٠٠-، بەڵام سوپای کۆریای باکوور نە بە باشی مەشقی کردبوو نە ئامادەش بوو، هەروەها لە نیوەی دووەمی نەوەدەکان بە پێچەوانەوە دەرخواردران. هیچ هەلێکی بردنەوەی نەبوو لە جەنگی دووەمی کۆریا کە تیایدا بە پێچەوانەوە نەیدەتوانی هاوکاری نە لە چین نە لە رووسیا وەربگرێت. سەربازی ئەمریکا مەزەندەی کرد کە لە جەنگێکدا، ٥٢٠٠٠ ئەمریکی و ٤٩٠٠٠٠ کۆریای باشوور دەکوژرێن یان بریندار دەبن ئەمەش کولفەی زەرەرەکە دەگاتە ٦١ بلیۆن دۆلاری ئەمریکی.

رژێمی کۆمۆنیست پێشبینی ئەوەی نەدەکرد بمێنێتەوە لەو جەنگەدا. دەستپێکردنی هەر جەنگێك دەبێتە هۆی ئینتیحاری سیاسی، بەڵام سەرکردەکانی کۆریای باکوور بە چەند ساڵ سومعەیەکیان بەدەستهێنا بوو وەك ئەو جۆرە خەڵکانەی کە موتەعەسیبن، ناسەقامگیرن، یانیش پچڕاون لە واقیع- یان هەرسێکیان- دەست بکەن بە هەوڵی ئینتیحاری سەربازی. تونێڵی زۆر گەورەیان کرد بە نێو سنووری هەرێمی کۆریای باشوور. پلانیان هەبوو و چاودێری کوشتنی گەلێ ئەندامانی کابینەی کۆریای باشووریان کرد لە کاتی سەردانە رەسمییەکەی کۆریای باشوور بۆ بێرما لە مانگی دەی ١٩٨٣. تەنانەت هەرکە دەگەڕان بەدوای یارمەتی لە

ڕۆژئاوا غەواسەیەکی بووکیان ڕەوانەی کەناری کۆریای باشوور کرد کە یان بە ئەنقەست لەوێ نیشت یانیش دەسووڕایەوە. دەستەکەی لە نێو شلردا خۆیان حەشاردابوو تاوەکو گیران و ڕاوکران لە لایەن دەسەڵاتی کۆریای باشوور بزانن. لە گۆڕانێکی مەنتقی ڕووبەڕووبوونەوەی کاتی جەنگی سارد، کاتێ ویلایەتە یەکگرتووەکان و کۆریای باشوور لەوە ترسان کە کۆریای باکوور هێرش بکات گەر زۆر بەهێز بێت، لە ماوەی دوای جەنگی ساردا بێهێزی کۆریای باکوور میسداقییەتی هەڕەشەیەکی بەهێز کرد بۆ شەڕ. وەك سامسۆنی نێو ئیننەوە کە مەعبەدەکەی ڕووخاند و خۆی کوشت شانبەشانی دوژمنەکانی پاش ئەوەی بێ بەش بوون لە سەرچاوەی هێزی ئەو، ڕژێمی کۆریای باکوور وا دادەنرا سەرچاوەی کەمی هەبێت سەبارەت بە دەستپێکردنی شەڕێك کە کە بەرەو نەمانی ببات گەر لە سەر لێواری لەکارکەوتن بێت بە هەر ڕێگایەك. بەچاوی وڵاتان کە دەبوایە مامەڵەی لەگەڵ بکەن ڕژێمەکە وەك ئاژەڵێکی دڕندە بوو کە لە سەر تەبیعاتی خۆی سوور بووە، بێ بەش بوو لە خۆراك زۆر بێ ئەمەل بوو هێرش بکاتە سەر هیچ شتێك لە سەر ڕێگای خۆی.

چارەسەری پرسی کۆریا پێویستی بە شتێکی وەك کۆنسێرتی ئەوروپا بوو. هەموو هێزە پەیوەندارەکان وەك کۆریای باشوور و ویلایەتە یەکگرتووەکان و ژاپۆن و چین و ڕووسیا دەبێ بەشداری تێدا بکەن. لە دانپیانانی ئەمە، لە ساڵی ۱۹۹۱ حکوومەتی کۆریای باشوور، پاش ڕاوێژکاری لەگەڵ ئەوان، پێشنیاری گفتووگۆی چوار وڵاتی بەهێز بە گرتنە خۆی هەردوو کۆریا و چین و ویلایەتە یەکگرتووەکان کرد بۆ دەستەبەرکردنی ڕێکەوتنێکی هەمیشەیی بۆ ئاشتی لە سەر نیمچە دوورگەکە. لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا هەموو لایەکان تێوەگلان، ئەمەش زۆر سەرنجی کۆریای باکووری ڕاکێشا، کۆك بوون لە سەر چەند خاڵێکی گشتی. هیچ کامیان جەنگیان نەویست لە کۆریا. هیچ کامیان ڕازینەبوون بەوەی چەکی ناوکی لە ژێر دەستی حکوومەتی کۆریا بێت جا چ باشوور چ باکوور. هەروەها هیچ کامیان یەکگرتنەوەی یەکسەری نیمچە دوورگەی کۆریایان پەسەند نەکرد ئەزموونی هەردوو ئەڵمانیایان ڕەچاو کرد. چین و ژاپۆن پەسەندی ئەوەیان کرد کە هەردوو کۆریا هەرگیز نەبنەوە یەك، لەبەر ئەوەی پێیان وابوو کە هەردوو کۆریا بێهێزتر دەبوون و بە ئاسانی بەڕێوەدەبران لە کۆریایەکی یەکگرتوو.

کۆریای باشوور ئەو بۆچوونەی پەسەند نەکرد. بە پێچەوانەوە، چواردە سەدە پێش جەنگی سارد ئەو دوو کۆریایە هەر دابەش کرابوون، ڕێگرێکی بەهێز لە بەردەم یەکگرتنەوەی هەردوو





لادا هەبوو لەکاتێکدا پەیوەندی کۆریای باشوور دانی پیا نا، لە بەر جیاوازی گەورەی نێوان باکوور و باشوور، ساختەی کۆریایەکی یەك، گەر بە ئاشتیش بەدەست بێت، بە بارێکی قورس دەبووە ڕێگر لە بەردەم بارێکی ئابووری کۆمەڵایەتی گەورە. بۆیە کۆریای باشوور نە جەنگی لە بەرژەوەندی دابوو کە بە کولفە دەبوو هەرچەند گەر بشباتەوە، نە ڕووخانی ڕژێمی کۆریای باکووریش کە ئەویش بە کولف دەبوو و بەرپرسیارێتی قورسی خەڵکی هەژاری باکوور دەکەوتە سەر شانی باشوور، بۆیە سیئۆل ئەوەی پەسەند کرد هێدی هێدی بەشی باکوور بە لیبراڵی بکرێت. ئەمە ئەو کۆرسە بوو کە حکوومەتی کۆریای باکوور وێڵ بوو بەدوای، بە هەموو نرخێك، بۆ ڕێگە گرتن. بە مەبەستی ڕوودانی ئەوەش، ویلایەتە یەکگرتووەکان و کۆریای باشوور ستراتیژییەتێکی تایبەتیان گرتە بەر.

دەستیان بە دانووساندن کرد لەگەڵ کۆریای باکوور، بە مەبەستی کردنەوەی دەرگای وڵات لە ڕووی هێزی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان بۆ ئەودیو سنوورەکەی کە ڕژێمەکە بە چڕی پاراستبووی. شکاندنی مۆر لە سەر کۆمەڵایەتی و خستنە ڕووی موقابیلی سیاسی ئۆکسجین و تیشکی خۆر کەهەردوو لاکە بە هیوای داماڵینی پێکهاتە توندەکانی ئابووری و سیاسی کۆمۆنیست بوون هەوڵەکە گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە لە ساڵی یەکەمی هەزارەی نوێدا هەردوو کۆریا چوونە نێو ئەو کۆڕسەی کە هەردوو ئەڵمانیا سێ دەیە پێشتر دەستیان پێ کردبوو.

لە مانگی شەشی ۲۰۰۰، سەرکردەی هەردوو وڵاتی کۆریا کۆبوونەوەیەکی چاوەڕێ نەکراویان لە پیۆنیانگ پایتەختی کۆریای باکوور ئەنجامدا. ئەمە هەوڵە کۆبوونەوەی بەرپرسە پلە نزمەکانی هەردوولای بەدواداهات، کۆریای باکوور دەستیکرد بە بەلاوەنانی سیاسەتی دوورەپەرێزی و پشت بەخۆبەستن، پەیوەندی بە گەلێ ڕێکخراو و دام و دەزگای نێودەوڵەتی کردو یان دەستیکرد بە پەیوەندی دیپلۆماسی لەگەڵ ژمارەیەك وڵات. لە هەمانکاتدا، ئابووری بڕیارنەدراوی باکوور وردە وردە زیاتر پشتی دەبەست بە هاوکاری ئابووری لە دەرەوە. هەموو ئەمانە پێدەچوو دەرفەتی زیاتر بڕەخسێنن بۆ کۆریای باکوور و هەوڵێك لەگەڵ باشوور بۆ ئەوەی مەسەلەکە بە جەنگ کۆتایی بێنێت یان ڕژێمی کۆمۆنیست بە تەواوی بڕوخێت.

جەنگێگی لەم جۆرە، وەك ئەو جەنگەی لە سەر بارودۆخی تایوان، ویلایەتە یەکگرتووەکانی تێوەدەگلاند. بە پێچەوانەی حاڵەتی چین و تایوان، ئەم حاڵەتە مەترسی کەمتر هەبوو، چونکە لە جەنگی کۆریا هەناردنی چەکی ناوکی نەبوو. دەمەتەقێی کۆریا بە گەلێ ململانێی ماوەی

دوای جەنگی سارد دەچوو لە وڵاتانی دەرەوەی جیهاندا. وەك زۆربەیان، مشتومڕێك لە ناوەوە سەر مەوقعی سنوورەکاندا هەبوو. حکوومەتەکانی هەردوو باکوور و باشوور نارەزاییان دەربڕی لە سەر دابەشکردنی نیمچە دوورگەکە، هەرچەند ناکۆکیش بوون لە سەر ئەوەی کێ ڕابەری بکات هەرکە یەکیانگرتەوە.

هەروەك لە گەلێ ململانێی ماوەی دوا جەنگی سارد، لەو دیو وڵاتانی ناوەوەی جیهان، کاریگەری ڕاستەوخۆی کۆتایی جەنگی سارد خراپترکردنی کێشەی کۆریا بوو. بە پێچەوانەی کۆریا، بەڵام، لە زۆربەی ململانێکانی دیکەی ماوەی دوای جەنگی سارد، ویلایەتە یەکگرتووەکان بە ڕاستەوخۆ تێوەنەگلابوو. هەروەها بە پێچەوانەی ململانێی کۆریا لە دەیەی یەکەمی ماوەی دوا جەنگی ساردا، بە هەقیقەت گەلێ لە ململانێکانی تر دەستی پێکرد بۆ نێو جەنگێکی کراوە، ئەمە بەدخووترین و ناسەرنجڕاکیشترین خاسیەتی بەخشی بە ماوەی دوای جەنگی سارد ئەویش ئاژاوەیەکی توندوتیژی پەرت و بڵاو بوو.



## چاپتەری -٦-

## ئاژاوەکانی دوای جەنگی سارد

شەتڕەنج زۆرجار وەك خوازەیەك بەکاردێت بۆ پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان. هەردوو لا چالاکی ستراتیژین، لەوەدا، هەر لایەو یاری دەکات بە گوێرەی وەڵامی ئەوەی بەرامبەری یان بە گوێرەی توەقوعی کاری بەرامبەر. هەردوو لا بەربەرەکانی یەکتر دەکەن، هەروەها دەسکەوتی لایەك دەبێتە دۆڕانی لایەکەی تر، بەڵام هیچ کامیان بە بەردەوامی سەرەنجامێکی تەواو بە دەست ناهێنن. هەروەك یاری شەتڕەنج دەکرێ بە تەعادول کۆتایی پێ بێت، بۆیە جەنگەکان هەمیشە یەکلاکەرەوە نابن، هەروەها وڵاتانی ناوەوەی جیهانیش بە بەردەوام لەگەڵ یەکتر بە شەڕنایەن.

هەریەکەو بونیاتی نایەکسانیان بۆی هەیە. لە شەتڕەنجدا، هەندێ ئالەت بە نرخترن لەوانی تر، مەلیك بەرزترین پلەی هەیە و لەسەرووی هەموویانەوەیە و بەرزترین بەهای هەیە. لە سیاسەتی نێودەوڵەتیدا، وڵاتە زلهێزە گرینگەکان سامان و هێزی زۆرتریان هەیە لەوانەی کە ناگرینگن، بەڵام، لەبەرئەوەی هەر ئالەتێکی شەتڕەنج بەشێك لە گەمەکە، هەروەها دەبزوێنرێن لە سەر هەر شەست و چوار خانەی ساحەکە، هەموویان گرینگن. یاریکەر خەم لە پاراستنی جوندییەکانی دەخوات، کە بە لە دەستدانی جوندی و فیل و ئەسپ دواتریش شاژن و شا دەکەونە مەترسییەوە.

یاریەکە بە هەماکان شێوەیە لە سیاسەتی نێودەوڵەتیدا. زلهێزە گرینگەکان بە ڕێکی دەست لە کاروباری دەرەوە وەردەدەن بۆ نەهێشتنی بەروپێشچوونی بەرهەڵستکار کە ئەگەر وا نەکەن دەترسن لەوەی مەترسی بهێننە نێو ماڵیان. یان بە شێوەیەکی تر، سیاسەتی نێو دەوڵەتی هەروا وابووە لە مێژووی تۆمارکراوەوە تا کۆتایی جەنگی سارد، بەڵام کۆتایی ئەو ململانێیە کارێکی گەورەی کرد بۆ پچڕاندنی چارەنووسی وڵاتە زلهێزەکانی ناوەوەی جیهان لە چارەنووسی وڵاتانی دەرەوە، لەگەڵ سەرەنجامی قوڵی دڵخۆشییەکی کەما بۆ هەژارو بێ دەستەکانی سەر ڕووی زەوی.

### *(وڵاتە ناسکەکان)*

گەر کۆتایی جەنگی سارد بە گشتی خێرێکی تیکەڵ بووبێت، هەندێ بەشی وڵاتانی دەرەوە هەرگیز ئەو خێرانەیان نەبینی. هەرچەند خاڵی بوو لە ئایدیۆلۆژیای زۆم و ستەم، گەلێ لە وڵاتانی دەرەوە تامیان لە خێری سەربەخۆیی نەکرد. نە ڕەفاهییەتیشیان دەستەبەر کرد، کە شۆڕشی پیشەسازی بۆ وڵاتە زلهێزەکانی هێنا کایەوە. هەروەك بۆ ئاشتی کە سێیەم ئامانجی گەورەی لیبراڵی مۆدێرنە، لە سەرەتایی سەدەی بیست و یەکدا نەبوونی ئاشتی زۆر ئاشکراتر بوو لە نەبوونی سەربەخۆیی و ڕەفاهییەت.

پیاوە ناسراوەکە لە مەریخ، هاتە خوارەوە لە کاتی دەیەی یەکەمی ماوەی دوای جەنگی سارد لە زۆربەی وڵاتانی ئەفریقیا، لە باشووری بیابانی ساهارا (Sahara Desert)، یان لە وڵاتانی سەربەخۆی کۆکۆسەس و ئاسیای ناوەڕاست کە پەیدا بوو لە یەکێتیی سۆڤیەت، یان لە ئەندەنووسیا، کەمبۆدیا، هایتی، یان لە باڵکان، دەگەیشتە ئەو ئەنجامەی کە خاسیەتی ناسراوی سەردەمی دوای جەنگی سارد سەرکەوتنی بەها لیبراڵییەکان نەبوو، بەڵکو پەرت و بڵاوی ئاژاوەی توندوتیژ بوو. دانیشتوانی ئەو ناوچانە دەژیان لە ویلایەتی سروشتی هۆبێسی لەوەی لە جیهانی لیبراڵی ویلسنی وڵاتانی ناوەوەی جیهان.

ئاژاوەی هەمەجۆر بە سەددەر سەد دەرهاویشتەی کۆتایی جەنگی سارد نەبوون. مۆدێرنیتە خۆی پەیوەندییەکی زۆری بەوانەوە هەبوو. شۆڕشە سیاسی و ئابوورییەکان کە وای لە سەردەمی مۆدێرن کرد لە ڕێچکە تەقلیدییەکان بترازێت، هەموو دەسەڵاتەکانی داڕووخاند، هەموو ڕێگانی دەردەسەری وردو خاش کرد، هەروەها سەرچاوەی نوێی بۆ سامان و هێز دروستکرد لەگەڵ گروپی نوێ کە بۆ هەردووکان بە چەشنێکی بازنەیی بوون. لە هیچ شوێنێك وا ئاسان نەبوو ڕێگە بدرێت بۆ ئەو پێشکەوتنانە بە ئاشتی. سەردەمی مۆدێرن لە وڵاتانی دەرەوەی جیهان سەردەمی شۆڕش بوو بە قەد وڵاتانی ناوەوە.

هەندێ جار جەنگی سارد توندوتیژییەکەی خراپتر دەکرد کە سەردەمی مۆدێرن بۆ جیهانی دەرەوەی هێنا بوو. ڕکابەرە جیهانیە گەورەکان پاڵپشتی بەرهەڵستکاریان دەکرد لە گفتوگۆ مەحەلییەکان لە کۆریا و ڤێتنام و ئەفغانستان و باشووری ئەفریقیا، مردووتری دەکردن لەوەی کە هەبوون، بەڵام جەنگی سارد کاریگەرییەکی سەقامگیریشی هەبوو. ئەویش سەرچاوەی





بەسەروبەری بوو، هەروەها کۆتاییەکەی یەکێك بوو لەو هۆیانەی توندوتیژی وەك پاشماوەی خۆی بەجێهیشت.

لەکاتی جەنگی ساردا گەلێ لە وڵاتانی دەرەوە لە ڕووی یاسیاییەوە یەکسان بوون لەگەڵ وڵاتانی ناوەوە. هەموو وڵاتی زلهێز بوون، بەڵام لە ڕووی پێکهاتەی کۆمەڵایەتییەوە جیا بوون، هەروەها لەو جیاوازیەیان گەلێ لە کێشەکانی دوای جەنگی سارد سەری هەڵدا. لە سەدەی نۆزدەمدا، پێشبڕکێی نێوان هێزە تەقلیدی و مۆدیرنەکان، لە نێو شتەکانی تردا، پێشبڕکێی نێوان دوو جۆرە وڵات بوو، ئەوانیش: ئیپراتۆریەتی تەقلیدی فرەنەتەوەیی کە زاڵ بوو بەسەر ڕووی زەوی، هەروەها وڵاتی نەتەوەیی مۆدێرن. لە سەدەی بیستەمدا، فۆرمی مۆدیرن سەرکەوت. پاش جەنگی جیهانی یەکەم، ئیپڕاتۆرەکانی عوسمانی تورك، هابسبێرگی نەمساوی، ڕۆمانۆڤی ڕووسیا هەڵوەشایەوە. پاش جەنگی جیهانی دووەم، ئیپراتۆری بەریتانی و فەڕەنسی و ژاپۆنی خاوبوونەوە. ئەو وڵاتە کۆمۆنیستە فرە نەتەوانەی مانەوە، یەکێتیی سۆڤیەت و یۆگسلافیا بوون کە دەستیان لە مافی هەستی نەتەوەیی هەڵگرت. نەتەوە مەحەلییەکان کە ئەوانیش ئەندام بوون لە حیزبە کۆمۆنیستەکان زاڵ بوون بەسەر حکوومەتە ناوخۆییەکان. کرواتیا، سلۆڤینیا و سربیا، بەڕێوەبران لە لایەن کرۆات و سلۆڤین و کۆمۆنیستە سربیەکان، لە بەشەکانی غەیرە ڕووسییەکانی یەکێتیی سۆڤیەتدا، ئەندامانی حیزبی کۆمۆنیستی نەتەوە کەمینەکان لە حکوومەتی ناوخۆدا باڵا دەستن بۆ نموونە: جۆرجییەکان لە جۆرجیا، ئۆزبەکییەکان لە ئۆزباکستان، تا دوایی، هەرچەند دەسەڵاتی باڵا لە مۆسکۆ بوو، بەڵام لە کۆتایی جەنگی ساردا ئیپراتۆرە کۆمۆنیستە فرەنەتەوەییەکان (جگە لە چین) ئەوانیش مردن.

جیا لە سەرکەوتنی بنەما نەتەوەییەکان وەك بە بەرفراوانی بنەمای پەسەنکراو بۆ سەروەر، وڵاتە سەربەخۆکان کە پەیدا بوون لە تێکشکانی ئیپراتۆرە کۆنەکان پێیان دەوترا " نەتەوە نوێیەکان"، پێکهاتبوون لە گروپی نەتەوەیی جیا جیا بە بێ ئارەزوومەندانە لەگەڵ تاکە دەسەڵاتێك دانران. بە پێچەوانەی وڵاتانی ناوەوە دەسەڵاتی حکوومەت لەو نیمچە ئیمپرتۆرانە داڕێژراون لە ڕازیبوونی حوکمکردن. لە بری ئەوە، گروپێك زۆر بەهێز بوو لەوانی تری دەپێچایەوە، بۆیە ئاشتی کاریگەری جۆرێك لە چەوساندنەوە بەرهەم دێنێت.

جەنگی سارد یارمەتی ئەوانی داو کاریگەر بوون. لە سەردەمی ململانێی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتدا، سنوورەکان بە فراوانی بە نەگۆڕی دانرابوو. بە وردی، لەبەر ئەوەی سنوورەکانی

گەلێ لەو وڵاتانە بە هەرەمەکی کێشرابوون، زۆرجار لە لایەن بەڕێوەبەرانی کۆلۆنیاڵەکان، ڕژێمە نوێیەکانی دوا کۆلۆنیال بە پەرۆش بوو بۆ پاراستنی لە ڕووبەڕووبوونەوەکاندا.

ویلایەتە یەکگرتووەکان و یەکێتیی سۆڤیەت هۆی خۆیان هەبوو بۆ هاوبەشی ئەو پەسەنکردنە. گەر سنوورەکان بە چالاکی ململانێ کرابوان، دوو هێزە ناوکییەکە خۆیان ڕەنگە ببان بە لای یەکێك لە دژایەتیکردنە ململانێکە. لە سەردەمی چەکی ناوکیدا، ئەمە ڕوانگەیەکی تایبەت و ترسێنەربوو. لە هەمانکاتدا، هەریەك لە دوو هاوپەیمانە ڕکابەرەکە پارەو چەکیان دابینکرد بۆ ڕژێمەکان لە ناوەوە کە هاوکار بن لە کێشمە کێشی جیهانی.

وڵاتە زلهێزە حوکمدارە هەرەمەکییەکانی جیهانی دەرەوە لەگەڵ سنوورە کێشراوە هەرەمەکییەکانیان زۆر جار لە ڕووی سیاسییەوە ناسەقامگیر بوون. ئەزموونیان لە گۆڕانی بەردەوامی حکومەت دا هەیە، بەڵام ئەو گۆڕانانە بە گشتی خێرا بوون و ئالوگۆڕی بێ خوێنی نوخبەیەك بۆ نوخبەیەکی تر بوون. ڕێگایەکی پەسەنکراو و تەواو کودەتا بوو. هەروەها پرسی ئەوەی کێ حوکم بکات هەمیش کێشە بوو، بەڵام پرسی ئەوەی کێ حوکم بکرێت کێشە نەبوو. سنوورەکان وەك خۆیان مانەوە. کاتێ ناوچەی ڕۆژهەڵاتی نێجیریا نیازی پاشەکشەی هەبوو لەساڵی ١٩٦٧ و بوو بە وڵاتی سەروەری بیافرا، تەنها پێنج وڵات دیپلۆماسیانە ڕێکەوتن و دانیان پیا نا. هیچ هاوکارییەکی نێودەوڵەتی بەدەست نەهێنا و لە ناو چوو. نەخشەی سیاسی جیهان، کە دابەشکردنی سەروەری تۆمارکرد، وەك لەزگەیەك و گرێیەك لە شوێنی خۆی نەدەگۆڕا و نەدەجولا کە هەمووی پەیوەست بوون بە جەنگی ساردەوە. کاتێ ئەو ململانێیە کۆتایی هات، لەزگەی جیۆپۆلەتیك هەڵوەشایەوە و گرێیەك شل بۆوە. هەڵوەشانەوەی یۆگسلافیا و یەکێتیی سۆڤیەت و پەیدابوونی پارێزگاکانی سەر بەوان بە سەربەخۆیی، وڵاتە سەروەرەی دانپێنراوەکانی نێودەوڵەتی بێ توونتیژی ئەو بنەمایانەیان بێهێز کرد واتە سنوورەکان ناتوانرێن بگۆڕدرێن. لە هەمانکاتدا، ئەو سەرچاوانەی کە لە لایەن ڕکابەرە جیهانیە گەورەکان دابین کرابوون کە حکوومەتەکانی دەرەوە پێی ڕاهاتبوون لە پڕێکا دیار نەمان. یەکێتیی سۆڤیەت، کە هیچی تر وجودی نییە، نەیتوانی، بۆیە ویلایەتە یەکگرتووەکان چەك و پارە دابەش ناکات، چونکە گەلێ ڕژێم پشتیان پێ دەبەست. بێبەش بوون لە پشتیوانی سیاسی، زۆربەی ئەوانەی دەرەوە هێور نەمانەوە. خاڵەکە خرا ڕوو لە لایەن ئەو سێ وڵاتەی کە شوڕش دژی ڕژێم لە دەسەڵات لە دوا جاردا ببووە فەرمانێکی جیهانی بۆ



وورووژاندنی دەست تێوەردانی سەربازی ڕۆژئاوا. سەرکردەی هەرسێ وڵات هەڵیسوڕاند، لە کاتی جەنگی ساردا، بۆ کۆکردنەوەی هاوکاری لە هەردوو لادا.

موحەمەد سەیاد بەڕی سۆماليا، سەدام حوسێنی عێراق، هەروەها جۆزێف برۆز تیتۆ و جێگرەوەکەی لە یۆگسلافیا خۆیان کردە کڕیار، لە کاتێك یان کاتێکی تر، هی هەردووك کەرتی ڕۆژئاوا و کۆمۆنیست. کاتێ جەنگی سارد کۆتایی هات، خەلات بەخشین نەماو گرێی ڕژێمەکانیان لە سەر دەسەڵات شلبۆوە. لە زۆربەی وڵاتە گەورەکانی دەرەوەی سیستەمی نێودەوڵەتی ئاژاوەیەکی سیاسی دروستکرد کە بەرەو توندوتیژییەکی مردووی برد.

ئایا ئاژاوەی ماوەی دوای جەنگی سارد خراپتر بوو لە جاڕسکردن و توندوتیژی و ئازارەکانی مرۆڤ لە کاتی جەنگی ساردا ئەمە مەسەلەیەکە مشتو مڕ هەڵدەگرێت. بە پێوەری وێرانکردن هیچیان ناگەنە جەنگەکانی ڤێتنام و ئەفغانستان. بە پێوەری لەدەستدانی ژیان هیچ کامیان یەکسان نین لەگەڵ قات و قڕی چین لە دوای پەنجاکان. ئەوەی بێ شك بێت ئاژاوەکانی ماوەی دوای جەنگی ساردە هۆی جیاوازیان هەبوو. هۆیەکە بێهێزی گەلێ وڵاتانی دەرەوەی جیهان بوو، بێهێزییەك کە دوو فۆرمی وەرگرت.

لە هەندێ شوێندا دەسەڵات ناتوانێ بە ئاسانی یاسا بپارێزێت. ئەو شوێنانە دواتر ناسران بە وڵاتە فاشلەکان حکوومەت ناتوانێ بنچینەترین ئەرکی خۆی واز لێ بێنێت. بەشی گەورەی ئەفریقیا، بەڵام هەروەها چەند بەشێکی یوراسیا- ئەلبانیا و چین- بۆ نموونە- کەوتنە نێو گێرە شێوێنی. لە شوێنەکانی تر حکوومەت ڕووبەڕووی بزووتنەوەی پاشکشەیی بوو لە لایەن ئەو گروپانەی کە نیازیان بە جێهێشتنی وڵات بوو وڵاتی خۆیان دامەزرێنن یان پەیوەندی بە هی ترەوە بکەن. گێرەشێوێنی سەروەری لە وڵات بە کردەیی پشتگوێ خست و ڕووبەڕووی وازهاوردەی بنەما بۆوە. ئەم ڕووبەڕووبوونەوەی دووەم بۆ دەسەڵاتی وڵات مەبەستی زیاتری هەبوو، هەروەها زۆرجار باش ڕێکخرابوو لە سەر هەردوو لادا بۆ خاسیەتی وەك جەنگ.

ئاژاوەکانی وڵاتانی دەرەوەی جیهان تراژیدیای مەحەلی بوون لە نێو تەلەفیزیۆن بۆ بینەری نێودەوڵەتی. بینەر لە وڵاتانی ناوەوە وەڵامیان دانەوە بە یەك یان دوو سۆز کە ئەرستۆ پێی وایە درامای تراژیدی دەبێ هەستی بەزەیی تیا بێت، بەڵام وێنەکانی توندوتیژی و ئازار سۆزی تری بەرهەم نەهێنا کە ئەرستۆ ناوی لێنا بوو ترس. بۆ ئەو حکوومەتانە و گەلی ناوەوە،

ناخۆشی ناوەوە لە دوو جۆری جیاوازدا هات. ترس کە شتی ترسناك ڕوویدا بۆ ئەوانی تر، هەروەها تۆقین کە موعەرەز بوو بۆ ئازاردانیان.

ئەوەی تۆقێنەر بوو مەزبەحەکەی بۆسنیاو ڕواندا بوو، بۆ نموونە، بەزەبی ورژاند، کە وای لە هەولە نێودەوڵەتییەکانی کرد خێر بکەن بەو وڵاتانە. هێزەکانی وڵاتانی ناوەوەی جیهان وەڕس بوون بەوەی کە بینیان و خۆزگەیا دەخواست بۆ کردنی کارێك بۆ وەستاندنی ئەو مەزبەحە، بەڵام ئەرکی زیاتریان نەخستە ئەستۆی خۆی وەك کەسێکی ئاسایی کە هەموو پارەو پولی خۆی دەبەخشێت بە موحتاجەکان. ئەوەی تەرسناك بوو، ڕوانگەی دەستێوەردان لە لێشاوی نەوت لە کەنداوی فارس و بڵاوبوونەوەی چەکی ناوکی بوو، ترسی دروستکرد، کە وڵاتانی بەرەو پابەندێکی جدی تر برد، پابەندبوونێك بۆ بەدەست هاوردەی زەمانەتی بەرابەری جیۆپۆلەتیك.

فشارێکی کەم لە سەر هەردوو لادا، هەبوو ئەو ناوچانەی کە خراپترین ئازاریان هەبوو شوێنێکیان نەبوو لەودیو سنوورەکانیان. تۆقێنەرترین ناوچەکانی سەر ڕووی زەوی دەنگ و تورەییان دروستکرد، تورەبوونی توندوتیژی لە سەر ناوچەکەو دەنگی وڵاتانی دەرەوە ڕەخنەیان لە دوورەوە لێ دەگرت. لەو شوێنانەی خراپترین ئاژاوە هەبوو وڵاتە زلهێزەکان کەمترین هەڵوێستیان هەبوو، بەڵام مانای ئەوەش ناگایەنێت هیچ شتێکیان نەکردووە.

### *کێشەکانی سنوور*

جەرگەی گەلێ لەو ململانێیانەی دەیەی یەکەمی ماوەی دوای جەنگی سارد پرسی دانانی سنوورەکان بوو لە چ شوێنێك. ململانێ بەهێزەکانی ڕووسیا لەگەڵ دراوسێکانی و ململانێ واقیعییەکانی چین لەگەڵ تایوان، دابەشکردنی نیمچە دوورگەی کۆریا، جەنگەکان لە باڵکان، ململانێی عەرەب لەگەڵ ئیسرائیل، داگیرکردنی کوێت لە لایەن عێراق، هەروەها بەربەرەکانێی نێوان هیندستان و پاکیستان لە سەر ویلایەتی هیندستان کە کشمیر بوو بە جۆرێك لە جۆرەکان تر هەموویان ڕکابەری سنوور بوون. تاکە پێورێکی جیهانی بۆ بڕیاردان لە سەر کێشانی سنوور ئاشتی بوو، شتێکی ماقوڵ بوو چاوت لە وڵاتانی دەرەوەی جیهان بێت بۆ دابینکردنی سنوورێك. بە هەر حاڵ، ئاشتی لە ئەوروپاوە هات ئەو پێوەر و ئایدییە سیاسیانەی کە جیهانی مۆدێرنیان پێش خست بە ئایدیای سەروەریشەوە پەیدا بوو.



بە هەقیقەت، وڵاتانی دەرەوە پێشتر پێوەرێکیان دانا بۆ دانانی سنوور بە پێی ئەو بۆچوونانەی کە ودرۆ ویڵسن لە پاریس لەساڵی ١٩١٩ لەسەریان سوور بوو. چارەی خۆنووسینی نەتەوەیی، ئەو بنەمایەی کە هەر نەتەوەیەك ناونیشانەکەی وڵاتی سەروەری خۆیەتی، کە لێیەوە ئەو سەروەرییە لە نێوان وڵاتە نەتەوەییە سەربەخۆکان دابەش دەکرێت، بنەمایەکە بنەمایەکی مۆدێرن بوو. ناشنالیزم بەرهەمی دوو شۆڕشە گەورەکە بوو کە بە پێکەوە سەردەمی مۆدێرنیان دروستکرد. شۆڕشی فەڕەنسی بە ناوی گەلەوە هەڵگیرسا- نەتەوەی فەڕەنسی- ئایدیای شۆڕشگێڕانەیان بەخشی بە جیهان کە هەر گەل مافی حوکمکردنی هەیە نەك مەلیك. شۆڕشی پیشەسازی سەرەنجامی خوێندەوارییەکی بە کۆمەڵ و تەرکیزی شارستانی بەرفراوان بوو، هەل و مەرجەکان بۆ بڵاوبوونەوەی هەستی نەتەوایەتی بوو. ناشنالیزم وەك لە وڵاتی مۆدێرندا، لە ڕۆژئاوا دەستی پێکرد و، لە ماوەی دوو سەدەی سەردەمی مۆدێرندا، لە هەموو سووچێکی سەر زەوی پەرش و بلاو بۆوە.

بنەمای نەتەوەیی بۆ دیاریکردنی سنوورەکان بنەمایەکی لیبراڵی بوو. پێچەوانەی میتۆدی تەقلیدی دەوەستێت، فەرمانڕەواییە تەقلیدییەکان هێڵەکانیان بە هەڕەمەکی کێشا، ناسنامەی ئەو خەڵکانەی کە پێی کاریگەر بوون پشت گوێ خست. بنەمای نەتەوەیی لە زۆربەی حاڵەتەکاندا وەڵامی هیوای میللییەکان دەداتەوە، لەبەر ئەوەی خەڵك ئاسایی حەز دەکەن لەگەڵ هاوڕەگەزی خۆیان دابەش بکرێن. چارەی خۆنووسینی نەتەوەیی ڕەنگە وەك دیموکراسی سەیر بکرێت و جێبەجێ ببێت لە سەر ئەرکی تەرخانکراوی سەروەری.

مێژووی سەدەی بیستەم بەڵگەی وای هەیە بەرایی بنەمای نەتەوەیی دەخاتە ڕوو. لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا، سەرکەوتووترین کۆمەڵگای سیاسی لە سەر ڕووی زەوی، سەقامگیترین و ڕەفاهیترین و بەهێزترین وڵاتی لیبراڵی ناوەوەی ڕۆژئاوا، دەوڵەتە نەتەوەییەکان بوون. لە ویلایەتە یەکگرتووەکان و ئەڵمانیا و ژاپۆن و بەریتانیا و فەڕەنسا لەگەڵ کەمینە بیۆێنەکان هەمووی لە وڵاتی نەتەوەیی بوون. کاری وڵاتیش تەنها ڕێکخستنی کاروبارە نەتەوەییەکان بوو.

بەڵام، بنەمای نەتەوەیی پاشەکشەیەکی جدی هەبوو، کە ویڵسن و ئاشتی پارێزانی تر لە پاریس بە خێرایی دۆزیانەوە. ناتوانرێت ئەو بنەمایە بە بەردەوامی جێبەجێ بکرێت. پێش هەموو شتێك، هیچ پێناسەیەکی ڕوون نییە بۆ نەتەوە، هیچ ڕێگایەکی جیهانی پەسەنکراو

نییە بۆ بڕیاردانی ئەوەی کام گروپ شایەنی وڵاتی خۆیەتی و کامەشیان شایەنی نییە. ژمارەی گروپەکان ب تیۆر دەتوانن بانگەشەی ئەوە بەکەن نەتەوەیەکن و سنووری نیە. دەکرێ بە بەدەگمەن ئەو جۆرە بانگەشانە تەقدیر بکرێن، ئەنجامەکەشی ئاژاوایەکی جیهانی دەبێت، تارماییەکەی گفتوگۆیەکی بەهێزی پێشکەش کرد لە بەرژەوەندی پاراستنی وجودی ئەو سنوورانەی کە تێك نەشکێنراون.

گەر پێناسەی گروپە نەتەوەییەکان مشتومڕهەڵگر نەبوو، ئەوا ناکرێت هێڵێکی ڕوون وەك دابەشکردن لە نێوانیاندا دابەش بکەیت. هەندێ جار نەتەوەکان بە یەکەوە بەستراون. لە بۆسنیا، یەکێك لە هەرە توندوتیژترین دیاردەکانی ماوەی دوای جەنگی سارد، ڕێچکەی نیشتەجێبوون ئەوە نەبوو زەوی بە کاشی ڕێك فەرش بکرێت، بە جوانی و سەرسامی و یەك بە یەك لە یەکتر جودا بکرێنەوە، بەڵکو زیاتر بە زەڵاتەیەکی فڕێدراو دەچوو.

هەوڵدان بۆ جێبەجێکردنی بنەمای چارەنووسی نەتەوەیی، زەڵاتەی فڕێدراوی نەتەوەیی و ڕەگەزی توندوتیژی خراپتر کرد. میتۆدی دیموکراسی بۆ دیاریکردنی سنوورەکان بووە هۆکارێکی جەنگ. لەبەرئەوەی چارەی خۆنووسینی نەتەوەیی بێهێزە لەو شوێنەی کە یەك نەتەوە زاڵە بەسەر ئەو ناچەکەدا، لە یۆگسلافیای پێشوو هەندێ نەتەوە هەستان بە دروستکردنی ئەو هەل و مەرجە بە هۆی وەدەرنانی ئەوانی تر، مومارەسەیەکی پڕ لە ڕق و کینە بووکە دواتر ناسرا بە "پاکتاوکردنی ڕەگەزی" (Ethnic Cleansing).

لە ماوەی دوای جەنگی ساردا، وەك پێشتر، دابەشکردنی جیهان بە ڕێکی نەشیاو بوو بۆ دەوڵەتە نەتەوەییەکان. لە جیهانی دوای جەنگی ساردا، هەندێ هێزی سەروەری، نزیکەی زۆرینە، چارەنووسیان وای دەخواست کە دەبێ زیاتر لە نەتەوەیەك لە نێو سنوورەکەی بژین، بەڵام هیچ کامیان، هاوکێشەی جەنگی سارد نەبوو بۆ دیاریکردنی سنوور، پیرۆزی وجودی سنوورەکان، لە سەر ئاستی جیهان بەدیهات، هەرکە یەکێتیی سۆڤیەت و یۆگسلافیا ڕێگەیان پێدرا، بە هەقیقەت پاڵنەریان هەبوو، بۆ لێك جیابوونەوە لە کاتێکدا سەروەری بەخشرا بوو بەسەر کۆمارەکانی جەماوەری خۆیان. زۆر زەحمەتر بوو ڕەتی ئەو بنەمایە بکەیتەوە بە هەمان دەرفەت بۆ نەتەوەیەکی پێناسەکراو کە بە نیازی ئەو بنەمایە بێت. هەروەها کۆتایی جەنگی سارد نیازی نێودەوڵەتی کەمکردەوە بۆ دەستێوەردان لە نێو کاروباری ئەو نەتەوانە و ڕێگەیان لێبگیرێت.





بۆیە نە بنەمای پیرۆزی وجودی سنوورەکان نە بنەمای چارەی خۆنووسینی نەتەوەیی نەتوانرا بە تەواوی لە ئامێز بگیرێت یان بە تەواوی دەستی لێ هەڵبگیرێت. ئیدارەی کلینتۆن، نموونەیەکی ئاشکرای خستەڕوو لە سەر ئەوەی کە مەحاڵە یەکێك لەو بنەمایانە تەواو لە ئامێز بگریت یان تەواو پشتگوێی بخەیت. ئەو نموونەیەش، دوو پرۆژە دیپلۆماسییەکەی پرۆسەی ئاشتی نێوان عەرەب و ئیسرائیل و بەربەرەکانێیەکەی بۆسنیا بوون، لە جاری یەکەمدا خۆی تەرخانکرد بۆ بەرەو پێش چوون، لە دووەم جاردا بۆ نەهێشتنی تارمایی پارێزگای عوسمانی پێشوو. پاشان دەبوایە چی بکرێت دەربارەی کێشەکانی سنوور؟ هاوکێشەیەك بۆ ڕێگە چارەیەکی مامناوەند لە ئارادابوو کە سانا بوو بۆ پێناس کردنی بە تیۆر، بەڵام زەحمەت بوو جێبەجێکردنی لە کردەدا.

هاوکێشەی ڕێگەچارەی مامناوەند ئەمە بوو: گەر نەشێت سەروەری سەربەخۆیی بدرێت بە گروپە جیاوازەکان بە هۆی پارچەبوونی ناوچەیی، باشترین چارەی دواتر ئەوەیە کە هەندێ لە خاسیەتی سەربەخۆییان پێ بدرێت لە ڕێگەی دابەشکردنی ناوچەکەوە، ڕێگە پێدان بەو گروپانە پێوەرێکی سەربەخۆیی کۆنترۆلی بەسەر مەسەلە سیاسییەکان کە کاریان لێ دەکات بەخشی. گشتیترین و ماقوڵترین ڕێگە چارە ئۆتۆنۆمییە. بە هەقیقەت ئەم ڕێگە چارەیە هەمیشە ئامادە بوو بۆ هەمووان، بەڵام کارنامەیەکی پێشبینیی کراو بۆ چارەکردنی مشتومڕەکان لە سەر سنوور هەر هەبوو.

ئایدیای دابەشکردنی سەروەری ئایدیایەکی نوێ نییە. کاتێ ئاشکرا بوو بۆ ودرۆ ویڵسن و ئاشتی پارێزانی تر لە پاریس، کە نەیاندەتوانی وڵاتی خۆیان بدەن بە هەر نەتەوەیەك کە بانگەشەی دەکات لە ئیمپراتۆری کیشوەری ڕووخاو، ئەو هەندە وڵاتە سەروەریانە، پێشبینی دەکرا زیا لە یەك نەتەوەیان هەبێت، هەروەها ئەو پەیوەندیانە لە نێوان ئەو جیاوازانە و هەندێ جاریش گەلی نیگەرانی هەمان وڵات دەبووە هۆی توندوتیژی، زنجیرەیەك پەیمانیان بەست بۆ مسۆگەرکردنی پێوەری ئۆتۆنۆمی بۆ نەتەوە کەمبەکان. بە گشتی ئەو پەیمانانە جێبەجێ نەکران بۆ هاوپەیمانەکانی ئەو کەمبانە، بەڵکو بووە هۆی ئاستەنگێك بۆ ماوەی دوای جەنگی سارد.

ئۆتۆنۆمی چارەیەکی سەرنجڕاکێش بوو بۆ ململانێی نێوان هەردوو بنەمای کێشانی سنوور، چونکە هەر کۆمەڵە ڕێکخستنێك کە لە سەری گروپی نەتەوەیی جیاواز لەگەڵ یەك وڵاتدا کۆك بن کارێکی شیاوە،  بەڵام ئۆتۆنۆمی سەلمێنراو نەبوو وەك ڕێگاچارەیەك لە ماوەی دوای جەنگی

سارد لەبەرئەوەی لە گەلیَ بەشی دەرەوە گروپە نەتەوەییە جیاوازەکان کۆك نەدەبوون، یان، گەر لە بنەما کۆکیش بوان سەرنجی ڕازیبوونەکەیان نەدەدا لە کردەدا، لە بڕی ئەوە دەبووە هۆی توندوتیژی. وێڕای ئەمە، کە کارەساتی دوای جەنگی ساردی ولاّتە ژێرکەوتوەکان نەبووە هۆی ڕێکخستنی شەڕ لە نێوان هێزە سەربازی و سیاسییەکان، بەڵکو گێرەشێوێنییەکی بە کوشتاری لێکەوتەوە، هەروەها ئۆتۆنۆمیش 'شیفایەکی تیریشی' نەبەخشی بە توندوتیژی. لە هەردوو حاڵەتدا، دەبوایە توندوتیژی لە ولاّتانی تر بوەستێنرێت، کە بووە یەکێك لە کۆنترین کێشە سیاسییە نێودەوڵەتییەکان، ئەویش دەستێوەردان بوو بەزۆری لە نێو کاروباری ناوخۆی ولاّتێکی تر لە لایەن ولاّتێکی بەهێزەوە.

**دەستێوەردان:**

## یاسای نێودەوڵەتی

دەستێوەردان بۆ کۆتایی پێهاوردەی توندوتیژی و ئازار تاکە عەیبێکی جدی هەیوو، ئەویش لە ژێر یاسای نێودەوڵەتیدا کارێکی ڕەوا نەبوو. پەیمانی وێستفالیا ی ساڵی ١٦٤٨، کە لێیەوە بیرۆکەی ولاّتانی ناوەوەی جیهان بە گشتی بەروارکرا، مێرگێکی بەهێزی کردەوە لە سەر بنچینەی بەرژەوەندی مافی حکوومەتەکان بۆ هەڵوەستە کردن لە نێو سنووری خۆیان تا خاڵی بن لە دەستێوەردان لەودیو سنووریانەوە، ئەم ڕێسایە سوودێکی ئاشکرای هەبوو. سیستەمی نێودەوڵەتی مەحاڵ دەبێت گەر ولاّتانی ناوەوە خۆیان بە خاوەن بزانن بۆ ڕێکخستنەوەی کاروباری ناوخۆی هەموو ولاّتانی تر،  بەڵام زیانێکیشی هەبوو. لە فۆرمێکی پاکدا، کۆمەڵگای نێودەوڵەتی ناچارکرد چاوی کوێر بێت و هیچ شتێك نەبینێت، حکوومەت هەرچی بکات لە نێو سنووری خۆی گرینگ نییە گەر تۆقێنەریش بێت. (*)

(*) بنەمایەکە بەدەر نەبوو لە بەرەنگاری بوونەوە. بە ڕاگەیاندنی ئاشکرای نێودەوڵەتی سەدەی بیستەم و دەستووری ویلایەتە یەکگرتووەکان ١٩٤٥، جاری گەردوونی مافەکانی مرۆڤ دەچوو. سێ ساڵ دواتر، بە پێی پێوەری سنوورداری ناوخۆ حکوومەتەکان چاوەڕێی ئەوەیان لیَ دەکرا ڕێز لەو بنەمایە بگرن. ئەو پێوەرانە دواتر





کۆتایی جەنگی سارد ئەو مەزەندەی دژی دەستێوەردانی بێهێز کرد. بەها لیبراڵییە ڕەهاکان قبوڵی بەرفراوانی نێودەوڵەتی کرد لە سەر ئەو فیکرەیەی کە هەموو حکوومەتێك دەبیَ ڕێز لەو بەهایانە بگرێت کە کۆمەڵگای نێودەوڵەتی مافی ئەوەی هەیە داوایان بکات، بەڵکو زیارتریش داوا بکات، دەشبیَ هەموو حکوومەتێك ڕێزی ئەو بەهایانە بگرێت. لە هەمانکاتدا، کۆتایی (یان تەشویقی) ململانێی هێزە گەورەکان بە شێوەیەکی بەرچاو دەرفەتی ئەوەی کەم کردەوە کە دەستێوەردان دەبێتە هۆی ڕووبەڕوونەوە لە نێوان بەهێزترین ئەندامانی سیستەمی نێودەوڵەتی. بۆیە کۆتایی جەنگی سارد، جیهانی سەلامەت کرد، گەر کێشەیەکی دروست نەکردبێت، پاشان بەلانی کەم بۆ تەعدیلکردنی بڕیاری ١٦٤٨ پێویست بوو.

هەر یەك لە سیَ سکرتێرە گشتییەکەی نەتەوە یەکگرتووەکان خزمەتیان کرد لە دوا دەیەی سەدەی بیستەم بۆ بەربەرەکانی کردنی مەزەندەی درێژ خایەنی نێودەوڵەتی لەکاتێکدا دژی گوێڕایەلی نەبوو لە سەر سەروەری. پاش جەنگی ناتۆی ساڵی ١٩٩٩ دژی یۆگسلافیا لە سەر حکوومەتی بەلگراد مامەڵەی لەگەڵ خەڵکی کۆسۆڤۆ، کە ناتۆ وەك پارێزگایەکی یۆگسلافی دانی پیانا و کەواتە لەگەڵ دەسەلاّتی سەروەری بەلگرادا، سەرۆك بین کلینتۆن وتی : " پێم وایە بنەمایەکی گرینگ لێرە هەیە کە هیوادارم ئێستا هاوکار بێت بۆ داهاتوو... ئەویش ئەوەیە کە ڕەنگە کارێکی باش بۆ ململانێی ڕەگەزی و ئاینی ئەنجام بدرێت لە جیهان.... کە لە زەمەنی یان دەرەوەی ولاّتدا، گەر کۆمەڵگای جیهانی هێزی هەبێت بۆ وەستاندنی، ئێمەش دەبیَ جینۆساید و پاکتاوکردنی ڕەگەزی بوەستێنین."

ئەم وتەیەی کلینتۆن لێڵ بوو، مەرجی سەرەکی دەستێوەردان بوو کەچی بە ڕوونی باسی لێوە نەکرد، بەڵکو پەیامێکی گشتی سادە بوو. لە کاتێکدا ئەم وتەیەی هەموو ئەندامانی کۆمەڵگای مەدەنی نەگرتەوە، بە هەقیقەتیش کاتیَ هەندیَ لە دیارترین ئەندامانی وەك ڕووسیا و چین و هیندستان بە توندی ناڕەزاییان لە کارەکانی ناتۆ هەبوو، سەرکردەی بەهێزترین ولاّتی سەر ڕوی

ناسران بە مافەکانی مرۆڤ. وەك داهێنانە سیاسییە مۆدێرنەکانی تر، ئەو پێوەرانە پەیدا بوون لە ناوەوەی سیستەمی نێودەوڵەتی و بە نارێکی لە هەموو شوێنێك بلاّوبوونەوە،  بەڵام چاوەڕیَ کردن لە حوکمەتەکان بۆ مامەڵەکردنی هاولاّتیانیان بە گوێرەی هەندیَ پێوەر یەك شت بوو، ناچاریان بکەن وا بکەن، یان بە گوێرەی حکوومەتەکانی تر مافی ناچارکردن هەبوو تاوەکو ئەو کارە بکەن کە ئەمەش شتێکی تر بوو.

زەوی ئەوەی خستە سەر ئەو سەرنجەی کە لە سەردەمی دوای جەنگی ساردا هەبوو واتە، سەروەری هەروەك سەدەکانی ڕابردوو هەمان شەرعییەتی نابێت.

گۆڕان لە پراکتیزە نێودەوڵەتییەکان چاکسازییەکی بنەمایی درێژی بەدوادا هات. دەستێوەردان لە کاروباری ناوخۆی وڵاتە سەروەرییەکان زۆرجار بەهاوکاری ویلایەتە یەکگرتووەکان بووە شتێکی ڕووتین لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا. کەمبۆدیا، هەرێمی کوردستانی عێراق، سۆمالیا، هایتی، بۆسنیا، کۆسۆڤۆ و تەیموری ڕۆژهەڵات، ئەمانە بەرچاوترین جۆری سەرنجی نێودەوڵەتی بوون لە دەستێوەرداندا کە ماوەی سێ سەدەو نیو دەستێوەردانەکان بەردەوام ناڕەوا بوون و هەندێ جاریش تایبەتی بوون. گەر ڕیپ ڤان وینکلێ لە سەدەی بیستەم خەوێنرا بێت لە ساڵی ١٩٢٠ و بەواگابێت لە ١٩٩٨ ڕەنگە بگات بەو ئەنجامەی کە ڕوانگەی ودرۆ ویڵسن کە هێنایە پاریس پاش جەنگی جیهانی یەکەم جێبەجێ کراوە بۆ ئەو نامەیەی، کە ویڵسن مەدحی عوسبەتول ئومەمی کردووە کە وەك ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی بەهێز گەشەی کردووە لەگەڵ ململانێکان لە سەرانسەر جیهان هەڵدەکات، بەڵام ئەو جۆرە ئینتیباعەی ئەو پیاوە خەوێنراوە هەڵە دەبوو.

لە ژێر چاودێری نەتەوە یەکگرتوەکاندا سێ کردەی جیاواز ڕوویاندا. یەکەم کە کەمترین ئاستەنگی لە بەردەمدا بوو، ناوی لێنرا پاراستنی ئاشتی، کە هێزێکی چەکداری زۆر کەمیان یان هەر بێ چەك دانابوو بۆ پاراستنی ئاشتی لە نێوان دوو لایەنی شەڕکەر کە خۆزگەیان بە ئاگربەست دەخواست، بەڵام متمانەیان بەلاکەی تر نەبوو بە تەنگ ئەو ئاگربەستەوە بێت. وجودی نێودەوڵەتی وەك بێ لایەنێك و پارێزەرێکی نادیار خزمەتی کرد. دووەکەی تر زەحمەتر و ئاستەنگیان لە بەردەمدا زۆرترە. لە ڕووی مێژووییەوە گشتی ترن لە پاراستنی ئاشتی، ویلایەتە یەکگرتووەکان ناوی جیا جیای لێنابوون. یەك لەوانە، ناچارکردنی ئاشتی بوو، یان بە ئینگلیزییە سادەکە واتە: جەنگ. کردەی سەربازی مەودا تەواو، لە ژێر ئاڵای یوئێندا لە کۆریا لە پەنجاکان، هەروەها لە کەنداوی فارس، لە نەوەدەکان ئەنجامدران، ئەم حاڵەتانە نموونەی ئاشتی بووون بە زۆری و بە ناچاری. لە کەمبۆدیا یو ئێن هەوڵی بونیاتنانی ئاشتی دا. ئاشتییەکە پێناس کرا وەك" هاوکاری بۆ گۆڕانی تواناو پێکهاتەی نەتەوەی دلڕەق، بۆ بەهێزکردنی دەزگا دیموکراتییەکان". ئەمە بونیاتنانی وڵاتێك بوو، لەو جۆرە بوو زۆر جار لە وڵاتانی دەرەوەی جیهان ئەنجام دەدران لە لایەن هێزە ئیمپراتۆری و کۆلۆنیالەکان.



جەنگ و حوکمی ئیمپڕاتۆری لە ڕووی مێژووییەوە پارێزگای وڵاتە سەروەرییەکان بوون تا ڕێکخراوی نێودەوڵەتی بن، ئەمەش حاڵەتێك بوو لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا. یوئێن دیار بوو، بەڵام بەهێز نەبوو. کۆمەڵەیەکی بازرگانی وڵاتان بوو کە دەیتوانی بڕیار دەربکات، بەڵام ئەو بڕیارانە جێبەجێبکات، زیاتر لە کۆمەڵەیەکی بازرگانی نەخۆشخانەکان دەچوو کە بتوانێت بڕیاری نەشتەرگەرییەکی دڵ بدات، بەڵام جێبەجێ نەکات.

بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکانی دەبوایە پشتی بە ئەندامەکانی ببەستبا، بەتایبەتی ئەو ئەندامانەی لە هەموویان بەهێزترن وەك وڵاتە دیموکراسییە پیشەسازییەکانی ناوەوەی جیهان. نەتەوە یەکگرتووەکان چاودێری کارەکانی ماوەی دوا جەنگی ساردی کرد کە ئەو کارانەش جۆرێك لە جۆرەکان جیابوون لە جەنگەکان و مێژووی ئیپراتۆڕەکان. ئەو کردانە بە پاڵنەری جیاجیاوە ئەنجام دەدران. لە ڕابردوودا، وڵاتانی ناوەوەی جیهان دەستیان لەو دیو سنوورەکانی خۆیان وەردەدا بۆ هۆی ستراتیژی یان ئابووری یان هەردووکیان، هەندی بەرژەوەندی گەورە هەمیشە لە مەترسیدا دابوو. بە پێچەوانەوە ئەو وڵاتانەی دەستیان لە وڵاتانی تر وەردا لە دوای جەنگی ساردا لە پێناو کەمترین سوود یان پاراستن بوو. ویلایەتە یەکگرتووەکان کەم شتێکی بەدەستهێنا، لە گۆڕانی ڕووداوەکان لە بەلکان و کەم شتێکیش بۆ لەدەستدان بەهۆی بەردەوامیان. هەناردنی هێزی سەربازی، بۆ باشووری ئەورووپا تەواو بۆ سوودی گەلی ناوچەکە بوو.[*] (ئایا سیاسەتە ڕۆژئاواییەکان لە کۆتایی سوودیان لەوان وەرگرت؟ ئەمە پرسێکی جیا بوو). ئەمە کارێکی خۆقوربانیکردن بوو، نموونەیەکی دەستێوەردانی مرۆییانە بوو. گۆڕانی پاڵنەر گرینگ بوو، چونکە کاریگەری لە ڕێگای دەستێوەردانی دوای جەنگی ساردا هەبوو لە ڕووی ئەو ئەنجامانەی کە بەدەستیان هێنا.

---

* ئامانجی سەرەکی لە دەستێوەردانکانی باڵکان، کە بە سەرۆکایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان بوو، ئاشتی نەبوو، بەڵکو تێوەگلانی گروپە نەتەوەییە شەڕخوازەکان بوون، زۆر کەم لە سەر یەکسانی بوو، کە ئەمریکییەکان پێناسیان کرد وەك " گروپە یەکگرتوو و تاکەکان گرفتیان نەبێت لە دەسەڵاتی ڕەگەزی سیاسی و پێکەوە بە ئاشتی بژین". هیچ کام لە گروپەکان لە بۆسنیا و کۆسۆڤۆ بنەمای فرەڕەگەزیان پەسەند نەکرد، بەڵام ئەوەی مانای ئەوە بوو کە دەستێوەردان هەرەسی هێنا بۆ هاوردەی هێوربوونەوەو نیشتەجێیەکی یەکسان هەروەك ئەوەی ویلایەتەی یەکگرتووەکان باسی لێوە دەکرد. ئەو ئاشتیەی کە دەستێوەردان شیاوی کرد لە هەردوو شوێندا بێهێز بوو. لە کۆتایی دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا، حیزبە شەڕخوازەکانی پێشوو لە لایەن گاریسۆنەکانی ناتۆ بەلاوەنران، جێهێشتنی ئەو ناوچانە واپێدەچوو بە دڵنیایی بەرەو نوێکردنەوەی شەڕیان ببات.

**دەستێوەردان:**

## پراکتیزە کردنی ماوەی دوای جەنگی سارد

شێوازی دەستێوەردانی دوا جەنگی سارد، سێ خاسیەتی خستەڕوو. یەکەم جیاکاری ناوچەیی. وڵاتە بەهێزەکان مەبەستی خۆتێوەگلانە نێو کاروبارەکانی ئەو وڵاتانەی کە لێیانەوە نزیك بوون هەبوو. لەکاتێکدا چاودێریکردنی قەدەغەکردن دژی هەناردنی هێزی چەکدار بۆ وڵاتانی تر بەردەوام بوو، ژاپۆن لە سەرەتای نەوەدەکان بەشدارییەکی بەرچاوی ئابووری کرد بۆ کردەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە کەمبۆدیا.

لە کۆتایی ئەو دەیەیەدا، ئوستڕالیا ڕابەری فیرقەی نەتەوە یەکگرتووەکانی کرد لە تەیموری ڕۆژهەڵات، پاش ئەوەی سوپای ئەندەنووسی شێلگرییەکی بەهێزی هەبوو بۆ وەڵامی دەنگی تەیمورییەکان لە بەرژەوەندی سەربەخۆیی. ڕووسیا هەناردنی یان سەربازەکانی پاراست لە کۆمارەکانی پێشووی سۆڤیەت کە بوون بە وڵاتی سەربەخۆ بۆ لای باشووری، بە کۆکسەسە و ئاسیای ناوەڕاستەوە. سەبارەت یە ئەوروپییە ڕۆژئاواییەکانیش، دەستێوەردان لە بەلکان ڕێگایەك بوو بۆ هەوڵدان بۆ ڕەگ داکوتانی لێشاوی پەناهەندە لەو ناوچەیە بۆ وڵاتەکانی تر. هەروەها ئەوە هێزەکانی ئەمریکا بوو لە هایتی نیشتەوە بۆ جێگرتنەوەی حکوومەتێك کە بەشداری کردبوو بۆ مەرجی ئابووری و سیاسی کە بەهەزاران خەڵکە هایتی دوورگەی کاربیان بەجێهیشت بۆ فلۆریدا. حکوومەتی ئەمریکی نیازی وابوو ئەوان لەماڵدا بپارێزێت.

دووەم خاسیەتی دەستێوەردانی دوای جەنگی سارد جۆرێکی تایبەت لە جیاکاری بوو. خراپترین بار ئەوەبوو کە کەس هیچ بایەخێکی پێنەدا. ژمارەی مردووەکان لە هەدوو هێرشی کتوپڕشی ڕووسیا بۆ سەر چیچان گەیشتە ١٠٠٠٠٠ کەس، بەڵام هیچ کام بە گشتی نە ویلایەتە یەکگرتووەکان بە تایبەتی هەوڵی دەستێوەردانی لەوێ نەدا. بەهەمان شێوە، ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان ئارەزووی وانەبوو کارێك بکات بۆ وەستاندنی کوشتارو سەربڕینی ڕەگەزی توتسیسەکان لە لایەن هەتەسکان لە ڕواندا. بایەخنەدان بە سەربڕینی خەڵکێکی بێتاوان گوێزرایەوە بۆ وڵاتەکانی تری ئەفریقیاش.





سێیەم، ئەو دەستێوەردانانەی کە ئەنجامدرا، بە گشتی ئەو گۆڵانەی کە بۆی ڕاگەینرابوون بەدەست نەهێران. ئەو حکوومەتەی کە لە کەمبۆدیا دامەزرا دیموکراتی نەبوو، یان بڵێین بە تایبەتی کاریگەر و چالاك نەبوو. سۆمالیا هێمن و ئارام نەکرایەوە. سەرەڕای بەڵێنەکانی داگیرکەران بە پێچەوانەکردنی بارودۆخەکان کە ئەوان دۆزیانەوە، هایتی هەر بە هەژاری مایەوە، بۆسنیا بە پارچەیی مایەوە، کۆسۆڤۆش فشارێکی هێرشی ڕەگەزی واتە پاکتاوکردنی ڕەگەزی هەر بەردەوام بوو، هەروەها سربی و ئەلبانییەکانیش ڕۆلەکانی قوربانی و چەوسێنەرانیان ئاڵوگۆڕ دەکرد.

ئەم سێ خاسیەتەی دەستێوەردانی دوای جەنگی سارد، هۆیەکی گشتیان هەبوو. لە هەر حالەتێکدا کۆششی دەستێوەردانەکە بۆ بەرژەوەندییەك بوو. کە جوگرافیا ئەو بەرژەوەندییەی دروستکرد، کە هەل و مەرجی ژەهراوی هەڕەشەی کرد بۆ دزەکردنی نێو سنوورەکان، بەهێزی سیستەمی نێودەوڵەتی حەزی بە دەستێوەردان دەکرد. لە هەر شوێنێك بەرژەوەندی نەبوایە دەستێوەردانیش نەدەبوو، بەڵام گەر لە شوێنێك بەرژەوەندی هەبوایە، ئەوا هێزەکانی دەرەوە ئاسایی حەزیان بە دەستێوەردان بوو تەنانەت گەر وەگەڕخستنێکی کەمیش بکەن ئەوا هەر دەستیان تێوەردەدا.

دەستێوەردانەکانی دوای جەنگی سارد، بەگشتی، شایستە بوون، بەڵام بە پەرۆش نەبوون، بە پەرۆش نەبوون لەبەرئەوەی شایستە بوون! گەشەی بێ جەنگی کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکان کاری باشی ئەوبوو خراپەکانی هێواش کردەوە، وای لە وڵاتانی ناوەوە کرد نەك هەر تەنها نیگەران بن بە کوشتن بۆ شتگەلێکی ناشایستە، بەڵکو دوودڵیشی کردن لە مردن بۆ ئەو گۆڵانەی کە زۆر بە بەرزی و گرینگی تێیڕادەمان. لەو شوێنەی خوێن و گەنجینە بە فیڕۆ درابوایە بۆ ئامانجە نێودەوڵەتییەکان ئەوا پیس و بیر تەسك بوون، بەرژەوەندی خودی بیر تەسك کێشی زیاتر بوو لە چاکی خۆ بەختکردنی شکۆداری. قوربانی سەرەکی لەو هەقیقەتەی ژیانی نێودەوڵەتی لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی سارد، گەلانی ئەفریقیا بوون. بێ بەخت بوون لەوەی کە خەمەکەیان نە کاریگەر بوو نە هەڕەشی ئەوەی دەکرد کە کار لە کەس بکات لەو دیو کیشوەرەکەیان، هەر بۆیەش ئەوانەی دەرەوە دڵخۆش نەبوو بۆ چاکردنی ئەو بارودۆخە ناهەموارەی ئەفریقیا.

سنوورەکان بۆ دەستێوەردانی مرۆیی ئاشکرایە لە سیاسەتی وڵاتان کە دیارترین ئەو وڵاتانەی کە ڕۆڵی دەستێوەردانی هەبوو ویلایەتە یەکگرتووەکانە. شتێکی سروشتی بوو کە

ویلایەتە یەکگرتووەکان دەستپێشخەری کردنی دەستێوەردانی دوای جەنگی سارد. خۆی وەك سەرکردەیەکی جیهانی بینییەوە. هێزێکی سەربازی سەربەخۆتری هەبوو لە هەر وڵاتێکی دیکە. لەگەڵ ئەوەشدا ویلایەتە یەکگرتووەکان جەماوەری هەبوو بۆ دەستێوەردان لە پێناو کاری مرۆیی. پاراستنی مافی مرۆڤ، گرینگتر بوو بۆ ئەمریکییەکان (حوکم کردن، بەلانی کەم، لە بەلاغی سیاسیاندا) تا گەلانی تر. هەروەها ئەمریکا نەریتێکی درێژی ڕەخنەگرتنی هەیە لە مومارەسەی نالیبراڵی ئەوانی تردا. لە سەرەتای سەدەی نۆزدەدا، ئەمریکییەکان ئیدانەی ئەورووپییەکانیان کرد لە چەوساننەوەی یەك و دوو. لە سەدەی نۆزدەدا، ویلایەتە یەکگرتووەکان، وا بەهێز نەبوو شتێك بکات دەربارەی پۆخڵەوات و پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ، بەڵام لە سەدەی بیستەمدا ئەو هێزەی هەبوو شتێك بکات یان بە لانی کەم هەوڵی کردنی کارێك بدات بۆ پاراستنی مافی مرۆڤ.

ئەمریکا شان بەشانی ئەوانی تر خرا ڕوو بۆ کارکردن لە پێناو نەهێشتنی پێشێلکاری مافی مرۆڤ و ئاژاوە و خوێن ڕشتن و ئازار لە ڕێگای تەلەفیزیۆنەوە جەماوەر دەنگێکی دروستکرد بۆ ئەوەی کارێك بۆ وەستاندنی ئەو کارانە بکات، بەڵام بە پێی ئەو پێوانەیەی حکوومەتی ئەمریکا باوەڕی پێ هەبوو، ئەو جەماوەرە هەمووی بەهێز نەبوو. بەرپرسە گشتییەکان ناچار نەدەکران بۆ هەناردنی هێزە چەکدارەکان بۆ دەرەوە بۆ مەبەستی مرۆیی بە هۆی ڕای گشتی بەرگەنەگیراو بەردەوام، چونکە هیچ کام لە دەستێوەردانی مرۆیی ئەمریکا لە دوای جەنگی ساردا بە بێ پشتیوانی و پاڵپشتی خەڵکی ویلایەتە یەکگرتووەکاندا نەبوو. بە پێچەوانەوە، شیاو نەبوو بۆ بزواندنی هاوکاری گشتی بۆ هەوڵ تەقەلای پێویست بۆ گەیشتن بەو گۆڵانەی کە هەمان بەرپرس ڕایدەگەیاند بۆ دەستێوەردان کە ئەوان پێی هەڵدەستن، بۆیە نەگەیشتن بە ئامانجەکان.

کارکردن لە گۆڕینی دڵەکان لە ڕێگەی تەلەفیزیۆنەوە لە لایەن خەڵکی گشتی ئەمریکا و نوێنەرە هەڵبژێراوەکانی بوو کە هیچ پەرۆشیان نەخستەڕوو بۆ سەرفکردنی هیچ شتێکی زیاتر لەو بڕە پارە ئاساییەی بۆ ڕزگارکردنی گەلانی هەراسانکراو لە وڵاتانی دەرەوە تەرخانکرابوو، پاش مردنی هەژدە سەربازی ئەمریکی لە سۆماڵ لە ساڵی ١٩٩٣ بووە هۆی کاردانەوەیەك دژی ئەرکی ئەمریکا کە کاری دەکرد لە پێناو نەهێشتنی ئەو ئیبادەکارییەی بەزۆری لەو وڵاتەدا دەکرا، حکوومەتی ئەمریکا هاوکاری پێشکەش کرد بە پێی یاسایەکی نەنووسراو،



بەڵام ڕوون و ئاشکرا وەك یەکێك لە ئەرکە مرۆییەکان لە پێناو نەهێشتنی ڕژانی خوێن بوو. بەرزترین ڕێژەی مردنی سەربازی ئەمریکی لە ڕووی سیاسیەوەی ڕێگەی پێدرابێت سفر بوو.

زمانی گفتوگۆی سیاسەتی دەرەوە لە ویلایەتە یەکگرتوەکان زمانێکی ڕوون بوو. ئەو دەستێوردانانەی لە سەر بنچینەی بەها ئەنجام دەدران دەناسرانەوە لە کردەی سەربازی جەنگی سارد کە سەرباز دەنێردران بەناوی بەرژەوەندی، هەرچی شتێك کاری لە ئەمریکا کردبا ئەوا بەرژەوەندییەکانی دەگرتەوە، بەرژەوەندی گرینگ مەسەلەی مردن و ژیان بوو. بەهاکان کاری لە گەلانی تر کرد. سەرسام نەبوو، ئەمریکییەکان ئامادەبوون کاری زیاتر بکەن و باجی زیاتریش بدەن بۆ سەلامەتی خۆیان زیاتر لە سەلامەتی ئەوانی تر. لە ساڵی ١٩٧٦، چارلس کۆتسوێرس پینکنی، باڵیۆزی ئەمریکا لە فەڕەنسا، فەڕەنسا داوای لێکرد قەرەبووی ئەو پەیمانە بداتەوە کە لەگەڵ بەریتانیا ئیمزایان کردبوو، چونکە فەڕەنسا پێی وابوو ئەو پەیمانە ڕەتکردنەوەی پابەندبوونی دیپلۆماسی ئەمریکایە لە پاریس، ئەو وشانە ئاخانران و دواتر قوتابیانی قوتابخانەکانی ئەمریکا وەك کرۆکی بنەمای ئەمریکی نێودەوڵەتی دەیان وتەوە: " بە ملیۆن بۆ بەرگری، بەڵام نەك یەك سەنت بۆ سەرانە". لە سەر بەڵگەی جەنگی سارد، دواتریش لە دەیەی یەکەی دوای جەنگی سارد، ئەمریکییەکان ئامادەبوون بۆ سەرف کردنی بە بلیۆن بۆ ئاسایش، بەڵام پارەیەکی کەم و بێ خوێن ڕشتنی سەرف دەکرد بۆ کارێکی باش جگە لە ئاسایش.

ئەو پەسەنکردنە گوێڕایەلی ئەوە بوو کە نزیکەی دەبێتە بنەمای جیهانی ئەخلاقی ئابووری، بەپێی ئەو بنەمایە مەودای شادی و کامەرانی کۆمەڵایەتی گرێدراوە بە چەندایەتی خەرجییەك: کام شت لە هەموو شتەکانی تر گەورەتر بێت ئەوا بە پلەی یەکەم کار لە سەر ئەو دەکرێت، ئەوانەی دواتر کە گونجاون بە پلەی دووەم دێن. لە ڕووی مەنتقەوە لە هەموو شوێنێك مرۆڤ زیاتر حەز دەکات بۆ خۆی هەوڵ بات و ئیش کات نەك بۆ ئەوانی تر. زیاتر بۆ خێزانەکانیان تا بۆ کۆمەڵگاکەیان، زیاتر بۆ کۆمەڵگاکانیان تا بۆ وڵاتیان، زیاتر بۆ وڵاتیان تا بۆ وڵاتانی تر.

لەبەرئەوەی سیاسەتی کۆمەڵگا لیبراڵە سیاسەکان ڕەنگدانەوەی پەسەندی هاوڵاتییەکانیانە، ناچیزی ئەمریکا بۆ دەستێوەردان و کاتێکیش دەستی تێوەردا ناچیزی بۆ کارکردن بە زۆری بۆ بەدەستهاوردەی ئەو گۆڵانەی کە حکوومەت بانگەشەی بۆ کردووە لە ئارادایە، دەکرێ وەك ئەنجامێکی ئاسایی لیبراڵیزمی سیاسی هەژماربکرێت. لەکاتی جەنگی ساردا، ویلایەتە یەکگرتووەکان کەمتر نەبوو لە لیبراڵی سیاسی، بەڵام لەگەڵ ئەوەش حەزی بەوە بووە خەرجی

بەرچاو سەرف بکات بۆ دەستێوەردانی سیاسی لە دووری نیشتمانەکەی. دواتر، ئەو شوێنە دوورانەی کە سەربازی ڕەوانە دەکرا پێدەچوو پەیوەست بێت بە نیشتمانی ئەمریکا خۆی، هەروەها دەستێوەردانەکان کاری جدی بوون بۆ بەرگری لە خۆکردن. کۆتایی جەنگی سارد وڵاتانی ناوەی جیهانی لە وڵاتانی دەرەوەی جیهان دابڕاند.

ڕەنگە خاڵەکە شی بکرێتەوە لە ڕێگەی بەراوردکردنی دوو هەڵمەتی داگیرکردنی کاریبین، دە ساڵ بە جیا، کە تیایدا ویلایەتە یەکگرتووەکان، نیازی لابردنی حکوومەتە دۆستەکەی بوو، ڕەوانە کردنی هێز لە ئیدارەی ڕێگان بۆ گرەنادا لە ساڵی ١٩٨٣ و هەوڵەکانی ئیدارەی کلینتۆنیش بۆ دەستێوەردان لە هایتی لە ساڵی ١٩٩٤ ی لێکەوتەوە. بە پێی زۆربەی پێوەرەکان هایتی لە گرەنادا و کاریبین بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان گرینگترە. هایتی فراوانتر، نزیکترو بەپێچەوانەی گرەناداشەوە سەرچاوەیەکی پەناهەندانە و هەروەها وڵاتێکە ویلایەتە یەکگرتووەکان داگیر کردبوو و حوکمی تیاکردبوو لە ١٩١٥ وە تا ١٩٣٤. ئێستاش داگیرکردنی گرەنادا هاوکاری گشتی زیاتر بەدەستهێنا: لە سەقامگیرکردنی ئەو دوورگە بچووکە نۆزدە ئەمریکی مرد. ئیدارەی کلینتۆن کردەی هایتی ئەنجامدا تاوەکو ئەوە دووپات بکاتەوە کە تاکە ئەمریکییەکیش چییەنەکوژراوە.

هۆی ئەو جیاوازییەش ئەوەیە کە داگیرکردنی یەکەم بەشێکە لە جەنگی سارد. حکوومەتی ڕادیکالی گرەنادا بووە هاوپەیمانی کوبا و هاوپەیمانی یەکێتیی سۆڤیەت، بەمەش ویلایەتە یەکگرتووەکان بە ململانێیەکی کوشندە دەورەی درا. سەرەڕای گەلێ هەوڵی لابردنیش، دەکرێ دەستێوەردانی گرەنادا وەك کارێکی بەرگریکری لەخۆکردن وەسف بکرێت،. داگیرکردنی هایتی ناشێ وەك هی گرەنادا پێناس بکرێت. گرەنادا کاری لە بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا کرد. هایتی بەها ئەمریکییەکانی تێکشکاند.

لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا، ئەمریکییەکان حۆشخاڵیان خستەڕوو بۆ خەرج کردنی تێچووەکانی زەمانەت لە ئەوروپا و ئاسیای رۆژهەڵات و بەربەست لە کەناڵی تایوان و لە سەر نیمچەدوورگەی کۆریا، بەڵام پارەیان سەرف نەکرد بۆ هاوردەی ئاسایش و سەقامگیری بۆ ئەفریقیا، دیموکراسی بۆ هایتی، فرە سیاسی بۆ باڵکان، یان بۆ هەر کەسێکی تر.



## لێکترازانێکی گەورە

پەیوەندی نوێی نێوان ناوەوەی جیهان بە دەرەوەی دروست بوو بۆ خاسیەتێکی تەوساوی جیهانی دوای جەنگی سارد. مومارەسەی کۆن و ناشایستەی دەستێوەردان لە کاروبارە ناوخۆییەکانی وڵاتە سەروەرییەکانی تر ئاسان بوو بە تیۆر، بەڵام زەحمەت بوو لە کردەدا. ڕوانگەیەکی فراوان لە یاسای نێودەوڵەتی کرایەوە بۆ زیاتر شەرعی کردنی دەستێوەردان، بەڵام لە هەمانکاتدا وڵاتە بە دەسەڵاتەکان کەم خۆشحاڵ بوون بە جێبەجێکردنی هەڵمەتی دەستێوەردان. لەکاتێکدا داوای دەستێوەردان بەرزبۆوە و دابینکردن هاتەخوار. وەك بڵێی ئاسکێك ڕاوبکەیت لە گەمەیەکدا هەرکە چێشتلێنان هاتە گۆڕێ ڕاوکردنی ئاسکەکە کارێکی ڕەوایە، بە پێچەوانەوەش ڕاوکەرەکان دەبن بە گۆشتنەخۆر و چەك دادەنێن.

هۆی ئەو کێشە هاوسەنگانە لە کردە و تیۆردا وەك یەك بوون هەروەك هۆی ئەو ناسەقامگیرییەی کە پرسی دەستێوەردانی لە کارنامەی نێودەوڵەتیدا لە یەکەم شوێن لە پلەیەکی بەرز دانا: کۆتایی جەنگی سارد بوو. ونبوونی ململانێی ئایدیۆلۆژی جیهانی کە کۆنترۆلی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمی کردبوو پێشێلکاری سەروەری وێستفالیای کرد کە لە سەر ئاستی نێودەوڵەتی مەترسی کەمتر هەبوو، بەڵام کەمتر داوای هەبوو لە سەر ئاستی ناوخۆ. بۆیە کۆتایی جەنگی سارد مامەڵەیەکی دوو ئاڕاستەیی کرد بۆ ناوچە لێکترازاوەکانی دەرەوە. بەشداری هەردووکیانی کرد هەم لە دەستپێکردنی ئاژاوە لەوێ و نانەوەی ناچیزی بۆ وڵاتانی ناوەوە هەمیش لە کۆتایی هاوردەی توونددوتیژی.

لە سەردەمی دوای جەنگی ساردا، کاتێ جیهان زۆر نزیك و بە توندی پەیوەست بوو بە بواری ئابووری لەچاو ڕابردووی، کاتێ داهێنانە کەلتوورییەکان لە ناوەوە — هەردووك بەرهەم و ئایدیا، بەرجەستە و مەعنەوی، دوورترو خێراتر پەرت و بڵاوبوونەوە لە چاو پێشتر، لە مەسەلەکانی ئاسایشی سەر ڕووی زەوی زیاتر لێکترازا لەوەی لەکاتی جەنگی سارد. بەم پێیە جیهانی دوای جەنگی سارد تێڕامانێکی فراوانتری ناوچەی دەریای ناوەڕاست بوو: بەئاشتی، ڕەفاهییەتی ئەوڕوپا بۆ باکوور، هەژاری، ئەفریقیای بە ئاژاوە بۆ باشوور، دەستەیەکی فراوانی گەورەی ئاو لە نێوانیان قەڵغانی سامانی ئەوروپییەکان لە کاریگەرترین ئاژاوەکانی ناوەخۆی ئەفریقیادا.

وێنەی جیهانی بە ئاشتی و ڕەفاهی ناوەوە بە تەواوی دوور بوو بەرژەوەندیشی لەگەڵ دڵسارد و بە ئاژاوەی ناوەوە بە دوو ڕێگای گرینگ خاسیەت دەکرێت: یەکەم، پچڕانی دوای جەنگی سارد مانای ئەوە نەبوو کە ئاژاوەکانی دوای جەنگی سارد لە جیهانی دەرەوە وا چارەنووس بوو لە ژمارە گەشە بکات، یان کە لەو شوێنەی تێکشکابوو بەردەوام دەبن بە بێ دوودڵی. لەکاتێکدا ژمارەی ئەو گروپانەی کە دەتوانن داوای وڵاتی سەروەری تایبەت بەخۆیان بکەن بێ شوومار بوون، لە کردەدا ژمارەی ئەوانەی داوایان دەکرد کەمتر سنووردارتر بوون. ژمارەی ئەو ململانێیانەی لەو جۆرە هەوڵانەوە سەری هەڵدا بە هەقیقەت کەم بۆوە لە نیوەی دووەمی نەوەدەکاندا. یان بەهۆی ماندووبوونەوە، نیازی ڕێگەچارەی ناوەندیان هەبوو، یان پرۆسەی فێربوون لە ئەزموونی ئەوانی ترەوە، یانیش هەرسێکیان ململانێکانیان دامرکانەوە بێ ئەوەی هێزی سەربازی دەرەوە لە مەودایەکی دوورەوە بێت دەستێوەربدات. دووەم، کاتێ ناوەوە سەرنجی خۆی گۆڕی بۆ دەرەوە، ڕای زاڵ ڕاستەوخۆ بەزەیی نەبوو. یەك ناوچە بەردەوام بوو لە دروستکردنی ترس. ئەو ترسە ڕەگی داکوتا لە هەرسێ مەترسییەکان بۆ وڵاتە مکومەکانی ناوەوە، هەریەکەیان ئەو ترسەی لە لا دروست بوو بە هۆی هێرشەکانی یانزەی سێپتێمبەری ساڵی ٢٠٠١ بۆ سەر نیۆیرك و واشنتۆن، ئەو ترسەش: دابڕانێك لە عەمباری نەوتی جیهانی و بڵاوبوونەوەی چەکی ناوکی و هەروەها پراکتیزەکردنی تیرۆریزم بوو. ئەو ناوچەیەی کە ئەو هەڕەشانەی تیادا دەکرێت ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە.



# چاپتەری -٧-

## 'کونی دێوەکان'

هێرشە تۆقێنەرەکانی یانزەی سێپتێمبەری ساڵی ٢٠٠١ یادگارییەکانی دوو هێرشی کتوپڕی وێرانکەری شەست ساڵ لەمەو بەری هێناوە یادمان کە بۆ سەر ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەنجامدرا: هێرشی ژاپۆن بۆ سەر پاپۆڕی ئەمریکی لە بەندەری پێرل و هاوای لە مانگی دوانزەی،٧، ١٩٤١ بوون. قەبارەی کاریگەری مێژوویی هەردوو ڕووداو بە شێوەیەکی دراماتیکی جیا بوون. یەکەم بەشێك بوو لە خوێناویترین و وێرانکەرترین جەنگ لە مێژووی مرۆڤدا، کە سەرەنجامەکەی جیهانی سەر لەنوێ ڕێکخستەوە و شوێنی ئەمریکاشی تیادا گۆڕی. سەرەنجامەکانی هێرشی یا ڕووداوی دووەم گونجاوتربوون، بەڵام لە هەندێ ڕووەوە بەوەی یەکەم دەچوو، خەڵکی گشتی ئەمریکا بە کۆمەڵ هاوکاری جەنگێکی سەر بێگانەیان کرد، ئەویش جەنگی ئەفغانستان بوو.

لێکچوێکی تریش هەیە لەنێوان حەوتی مانگی دوانزەی ١٩٤١ و یانزەی سێپتێمبەری ساڵی ٢٠٠١. هەردوو هێرش ویلایەتە یەکگرتووەکان و هەموو جیهانیان سەرسام کرد، چونکە لەو دوو هێرشەدا ئاگاداری پێش وەختە نەبوو. ویلایەتە یەکگرتووەکان تەواو سەری سوڕما بوو لە ژاپۆن لە پەیڕەوکردنی جۆرە سیاسەتێك لە ئاسیا، هەروەها تۆکیۆ ئەوەی ڕوونکردەوە کاتێ واشنتۆن گەمارۆی نەوتی لە سەر ژاپۆن دانا لە وەڵامی داگیرکاری بەردەوامی ژاپۆن بۆ چین، ژاپۆن کاریگەری خراپتری هەبوو لە سەر ئەمریکا.

بەهەمان شێوە، قاعیدە گروپی تیرۆریستی بەرپرس لە هێرشەکانی یانزەی سێپتێمبەر، بەرپرسیارێتی خۆی ڕاگەیاندبوو بۆ سێ هێرشەکەی پێشووتری بۆ سەر ئەمریکا لە دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتوەکاندا ئەوانیش: دژی سەربازە ئەمریکییەکان لە سۆماڵ لە مانگی ١٠، ١٩٩٣، دژی باڵیۆزخانەکانی ئەمریکا لە کینیاو تانزانیا لە حەوتی مانگی هەشتی ١٩٩٨،

هەروەها دژی پاپۆڕی دەریایی ئەمریکی لە عەدەنی پایتەختی یەمەن لە ١٢ مانگی دەی ٢٠٠٠.

هێرشەکانی یانزەی سێپتێمبەر نەدەبوایە جیهانی سەرسام کردبا، لە کاتێکدا سەرسامی کرد لە ڕێگەیەکی ترەوە. کارمەند و سەرچاوەکان و پاڵنەرەکان بۆ هەموویان لە بەشێکی ئەم جیهانەوە هاتن و دانیان پیانرابوو و سەرچاوەی گەورەترین هەڕەشەی دوای جەنگی سارد بۆ جیهانی ناوەوە: بەشی گەورەی موسڵمانی یۆراسیا لە ڕۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاستەوە تا زەریای هیندی بوو.

لە نەخشە زووەکانی ئەوروپادا، بەشە نەدۆزراوەکانی جیهان بە ترسناك دەدانرا بە هۆی ئاگادارکردنەوەی لاتین دەستنیشانکرا " ئەشکەوت، دێوەکان" — ئاگادار بە لێرە دێو هەنە. لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا، ئەو ناوچەیەی کە شایەنی ئەو قسەیە بوو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوو، بەڵام بە پێچەوانەی جەنگاوەر ئەوروپییەکانی سەدەکانی پێشدا، وڵاتانی ناوەوە بە وردی دەیانزانی چ مەترسییەك ئا لەوێدایە، هەرچەند نەیدەتوانی بە ئاسانی ڕێگە لەو مەترسیانە بکات.

### *نەوت*

هەرکە سەردەمی دوای جەنگی سارد دەستی پێکرد، وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست خاسیەتە ئاشناکانی جیهانی دەرەوەیان نیشاندا. بێهێزتر بوون لە وڵاتانی ناوەوە، کۆمەڵگاکانی ئەوێ دووچاری ئەو گرفتە بوونەوە کە وردە وردە بە لێشاو هەژار دەبوون، دەگووشران لە نێوان ڕێژەی بەرزی لە دایکبوون و نزمی ڕێژەی گەشەی ئابووری. لەماوەی دوای جەنگی ساردا، هەروەك لە سەرانسەری سەردەمی مۆدێرندا، ناوچەکە هێنەری تۆڕێکی داهێنانی سیاسی و ئابووری بوو. سەبارەت بە بەشەکانی ماوەی مۆدێرندا، ناوەوەی ڕۆژئاوا زۆربەی ناوچەکەی کۆنترۆڵ کرد، بەهۆی یاسای ئیمپراتۆری یان ئەو مەندووباتانەی لەوێ دامەزران لە لایەن دەستەی نێودەوڵەتی هەروەك عوسبەتول ئومەم. سنوورەکان زۆر جار بە هەڕەمەکی دەکێشران، دانانی بناغە بۆ ناسەقامگیری ئاشنای جەنگی سارد بوو کە کەمبەکانی قایل نەکرد و ڕێکخستنە سیاسییەکانی هەراسان کرد کە باریانی قورس کردبوو، بەڵام ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست جیابوو لەوانەی دەرەوە بە ڕووێکی فراوانترەوە. ئەوەی ئەو ناچەیەی گرینگ کرد نەوتەکەی بوو.



دوو لە سەر سێی پێترۆڵی تۆمارکراوی هەموو جیهان دەکەونە ئەو وڵاتانەی کە لە سەر سنوورەکانی کەنداوی فارسن. نەوت ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی کردە یەك ناوچە کە گرینگی ناوەوەی گرێدا بە ناسەقامگیری دەرەوە.

لەکاتی جەنگی ساردا، نەوت پێوەرێکی سەربەخۆی بەخشی بە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەهەقیقەت لەو کاریگەرو هێزانەی دژی ویلایەتە یەکگرتووەکان و یەکێتیی سۆڤیەت بوون، سەرەڕای دەستێوەردانی هەردوو زلهێزەکە لە کاروباری سیاسی و سەربازی ناوچەکە. ناوەندێکی بەخشی بە فەرمانڕەواکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بۆ چەوساندنەوەی یان دامرکانەوەی گروپە ناقایلەکان بێ ئەوەی پشت ببەستن بە چەکی هێزەکانی ناوەوە، هەروەها ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی بۆ ناوەوە گرینگتر کرد لە هەر ناوچەیەکی جیهانی دەرەوە. هێزەکانی ناوەوە زۆر بە گرینگی ئامادەکرابوون بۆ چوونە شەڕ بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان لەوێ.

گرینگی نەوت خاسیەتێکی چاخی مۆدێرن بوو. بەهای خۆی قەرزداری شۆڕشی پیشەسازی بوو. لە جەرگەی ئەو گۆڕانە گەورەیە لە ژیانی ئابووری سەر زەوی پێکەوە گرێدانی سەرچاوە نووستووەکانی دەسەڵات. ئەمانەی نەوت لە زۆربەی سەدەی بیستەمدا (بۆ نێو بیست و یەکیش) زۆر بارز بوو. چاخی مۆدێرن چاخی ئامێر بوو و جیهانی ئامێرەکانیش لە سەر نەوت بەڕێوە دەچوون، کە گرینگییەکەی بۆ چالاکی ئابووری لە سەر زەوی دەکرێ بە بەردەوامی زۆر جەختی لە سەر بکرێتەوە. نەوت دواتر ناسرا بە " زێڕی ڕەش" وەك زێڕیش جۆرێك لە دراوی جیهانی بوو، لە هەموو شوێنێك ئاڵوگۆڕدەکرا بۆ هەموو شتێك. نەوت بە " خوێنی زەوی"یش ناسرا بوو، کە هەروەك خوێن بۆ ئینسان پێویستە ئاوا ئەویش زۆر پێویست بوو بۆ دەمارەکانی یان پاپۆڕەکانی ئابووری پیشسازی، بەڵام بەراوردێکی باشتر بۆ نەوت، لەگەڵ ئۆکسجین بوو، شتێك کە وەك وی گرینگە، بەڵام لەدەرەوە دابینکراوە. نەوت وەك ئۆکسجین دەکرێ ببڕێت و بواری ئابووری بخنکێنێت. بواری ئابووری، دابینکردنی نەوت بە بەردەوامی لە کەنداوی فارس، مەترسییەکی ستراتیژی زۆر گەورە بوو بۆ وڵاتە لیبراڵییەکانی ناوەوە لە کاتی جەنگی ساردا، بە مەترسیش مایەوە، هەرچەند کەم کاریگەرتر بوو پاش کۆتایی جەنگی سارد.

ڕۆژئاوا دووچاری دوو مەترسی گرێدراو بۆوە: کە ئەو سەرچاوانە بچنە ژێر کۆنترۆڵی ئەو گەلانەی کە مەرجی پەسەند نەکراو لە سەر لێشاوی بەردەوامی ڕۆژئاوا دادەنێن و ڕۆژئاوا تووشی سەرانە بکەن، هەروەها ئەوانەشی کە کۆنترۆڵی نەوت دەکەن سامانی گەورە بەسەر

یەکدا کەڵەکە دەکەن لە فرۆشتنی نەوت کە مسۆگەری هێزی سیاسی و سەربازی دەکەن بە شێوەیەك کە دواتر دژی ڕۆژئاوا خۆی دەوەستنەوە. هەرە گرنگترینیان نەوتی کەنداوی فارس بوو کە لە کاتی جەنگی ساردا هێزە ڕۆژئاواییەکان ئامادەیی خۆیان ڕاگەیاند بۆ شەڕ بۆ دڵنیابوون بە گەیشتن بەو نەوتە، لە کۆتایی جەنگی ساردا بەڕاستی چوون بۆ شەڕ بۆ ئەو مەبەستە. نەوت ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی لە ڕووی ستراتیژییەوە، کردە بەشێك لە وڵاتانی ناوەوەی جیهان، وەك تەشتێك بۆ دابینکردنی ئاوی خواردنەوەی شارێك وابوو. جیا لە سەنتەری جیهانی سامان و هێز و داهێنان لە ڕێگای جوگرافیاوە، ناوچەکە بە ئابووری گرێدرا بوو، گرێدانەکەش زۆر ئاشکراو ڕوون بوو لە کاتی حەوتاکاندا.

دووجار لەو دەیەیە کەمبوونەوەی کتوپڕ لە بەرهەمهاوردەی نەوت نرخی نەوتی لە جیهان زۆر بەرزکردەوە، کە لەماوە دە ساڵدا بارتەقای دوانزەجار هەبوو. ئەمە لە بەرابەردا بووە هۆی خراپترین دابەزینی ئابووری جیهانی بوو لەوەتەی سستبوونە ئابوورییە مەزنەکەی سییەکان. دوو سەدمەکەی نەوت، یەکەمیان بە ڕێکەوت بوو لە لایەن ئەو نیمچە گەمارۆیەی لە لایەن وڵاتانی عەرەبی دانرا لە سەر هەناردنە دەرەوەی نەوت لە وەڵامی جەنگی عەرەب و ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٧٣دا، دووەمیان بە هۆی ڕوخانی بەرهەمی ئێرانییەوە بوو بە هۆی لادانی ئەو سەرۆکە ڕۆژئاواییەی کە ناوی " شا" بوو لە ساڵی ١٩٧٩، نەخۆشییەکی پێشبیننەکراو و پێشوازی لێ نەکراوی بە جیهان ناساند کە ناسرا بە " بەرزبوونەوەی نرخی بێ چاڵاکی بازرگانی": بەرهەم کەمی کردو نرخ بەرزبۆوە. سەدمەکانی نەوت گوڕانێکی سامانی گەورەشی کرد لە کڕیارەکانی نەوت بۆ وڵاتانی بەرهەمهێنەری نەوت.

ئەو مەرجانەی کە سەدمەی نەوتی ئاسایی دەکردەوە نەمان لە هەشتاکان و نەوەدەکاندا. خەزنکردنی نەوت زیادی کردو داواکردنیشی کەمبۆوە، کەمییەکەشی لە بەر ئەو سیاسەتانەی لە لایەن حکوومەتە پیشکەوتووەکانی لە ڕەوی کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە بوو کە لە بواری زیاتردا کاریان دەکرد، بە تایبەتیش بە هۆی کارە ئاسایییەکانی بازاڕی ئازادەوە بوو. بەرزبوونەوەی نرخی نەوت وروژانی ئابووری دروستکرد بۆ دۆزینەوەی زیاتری نەوت هەروەها وای لە تەکنیکەکەی ڕۆژئاوا کرد باشتر بن لە ڕووی دۆزینەوە و تەغتییەکردنی نەوت. لە هەمان کاتدا، گرانتربوونی نەوت وای لە کڕیارەکان کرد کە زۆر نەوت بەکار نەهێنن.



هەرکە خەزنکردنەکان فراوان بوو و ڕێژەی گەشەی کڕیاریش کەمبۆوە، نرخی نەوت ڕووی لە دابەزین کرد، ئاڕاستەیەك بەهێزکرا لە لایەن ئەندامانی بەرژەوەندی نەوت، ڕێکخراوی وڵاتانی هەناردنە دەرەوەی نەوت (OPEC)، کە دەستی کرد بە زۆرتر بەرهەمهاوردەی نەوت، ئەو سنوورانەی کە خەزنی جیهانی سنووردار کردو نرخیشی بەرو سەرەوە برد.

گۆڕانێك لە سیفەتی بەرهەمی پیشەسازی لە ڕۆژئاوای ئەوروپا و ویلایەتە یەکگرتووەکان و ژاپۆن فشاری سەر نرخی نەوتی کەم کردەوە. لە هەشتاکان و نەوەدەکان بەرهەمی نوێ و پرۆسەی نوێ لە سەر بنەمای تەکنەلۆژیای نوێ هاتە ئاراوە، وای لە پیشەسازی ڕۆژئاوا کرد کە کەمتر پشت ببەستێت لە سەر وزە لەوەی لە نیوەی سەدەی ڕابردوودا پشتی پێ بەستا بوو. بەهەمان شێوە، وڵاتانی دەرەوە هەموو بە یەکەوە لەگەڵیاندا هەڵیان نەکرد. بۆ هەقیقەت، بەرزبوونەوەی نرخ، هەروەها هێنەرانی نەوتیش، وەك ڕابردوو وا خێرا نەبوو. هەروەها گەشەی ئابووریش لە بەشەکانی تری جیهان بە تایبەتی لە ئاسیای ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا خەزنی نەوتیان زیاتر کرد، کە زۆربەیان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە هاتن. بۆیە ناوچەکە کۆنترۆڵی بارودۆخی کرد وەك بەشێك لە جوگرافیای ناوەوە. مەترسی سەرەکی بوو بۆ بەرژەوەندییەکانی لە ناوەوە و دەرەوەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەروەها دوای حەوتاکان گۆڕانیشی بەسەردا هات، نرخ بەرزبوونەوەی نرخی نەوت بە ڕێژەیەکی بەرز هەڕەشەیەکی مێژوویی بوو بۆ سەر ئەوروپا هاوکات هەڕەشەیەکی ئاشناش بوو.

### *بەربەرەکانێ نێودەوڵەتییەکان*

لە ساڵەکانی کۆتایی جەنگی ساردا دوو هێزی مەحەلی هەوڵیاندا بۆ زاڵبوون بەسەر ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. ئەو دوو هێزەش ئێران لە سەرەتای هەشتاکان و عێراقیش لە سەرەتا نەوەدەکان بوو — ئەمەش بووە هۆی جەنگێکی سەرەکی لە دژی ئەو دوو هێزە. هەروەك ئەوروپییە ڕەهاکانی سەردەمی مۆدێرن، هەریەك لەو دوو هەوڵە بۆ سەرۆکایەتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بنەمای ئایدیۆلۆژیان هەبوو. ئێران نیازی هەڵگێرسانی شۆڕشی ئیسلامی هەبوو بۆ وڵاتانی تری ناوچەکە. عێراق هەوڵی کۆکردنەوەی هاوکاری بوو بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ ڕۆژئاوا،

که به گرتنی دراوسێکەی کوێت دەستی پێکرد، بە بانگەشە کردنی ئـەوەی گوایـا بـەرگری لـە نیشتمانی عەرەبی دەکات.

وەك ئەو باوەڕە سەربازیانەی کە گڕی لە کۆششەکانی ئەڵمانیا و فەرەنسا و یەکێتیی سۆڤیەت بەردا کاتێ بە نیاز بوون زاڵ بن بەسەر ئەوروپا، ئەو دوو سێیە ئایدییە پەیڕەوی شۆڕشگێڕانەیان هەبوو. بەربەرەکانی سیستەمی هەنووکەیی حکوومەت بوونەوە لە نێو وڵاتە سەروەرییەکان و دابەشکردنی دەسەڵات لە ناوچەکەدا. وەك ئایدییە شۆڕشگێڕەکانی ئەوروپا، ئەو وڵاتانەی قوڵیان کردنەوە نیازیان بەکارهاوردەیان هەبوو بۆ دامەزراندنی دەسەڵاتی زاڵی سیاسی خۆیان، بەڵام گەر هەردوو ئایدیۆلۆژیاکە بە فۆرم ڕۆژئاوایی بوان، ئەوا لە ناوەڕۆکدا ڕۆژئاوایی نەبوون. لە ناوەڕاستی هەردووکیاندا ئیسلام هەبوو، بە تایبەتی بە ئاشکرا لە حاڵەتی ئێراندا، بە نادیاری لە حاڵەتی عێراق لەبەر زۆر شتی هەمەجۆر عەرەب هاوبەشیان هەبوو، ئەوەی بە یەکەوەی گرێدان و کردنی بە یەك، کۆمەڵێکی سیاسی بەهێز وەك ئامانجێکی سەرەکی کاری بۆ دەکرا ئەویش باوەڕی ئیسلامی گشتیان بوو.

گەر ئەو ئایدیۆلۆژیانەی کە عێراق و ئێران بانگەشەکانی خۆیان لە سەر بونیاتنابوو بۆ پێشەنگی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە فۆرمدا ڕۆژئاوایی و لە ناوەڕۆکیشدا ڕۆژئاوایی نەبوو بن ئەوا سەرەنجام دژی ڕۆژاوا بوونە. لە نێو مەبەستەکانیاندا کەمکردنەوەی هێزی ڕۆژئاوا بوو، گەر بۆیان بکرێت، ئامادەیی ڕۆژئاوا لە نێو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا نەهێڵن. هێرشە ئایدیۆلۆژییەکانی عێراق و ئێران ڕژێمە مەحەلییەکانی کردە مەبەست کە نزیکەی بە ڕۆژئاوا گرێدرابوون، لە سەرووی هەموویانەوەش، پەیوەست بوون بە ویلایەتە یەکگرتووەکان. هەردووکیان، شۆڕشی ئیسلامی ئێران و نیشتمانی عەرەبی کە عێراق سوور بوو لە سەری بۆ گەورە کردنی جەماوەری خۆی لە تۆڵەی مەحەلییەکانی هێزەکانی ناوەوەی لیبراڵدا، هەستێك بوو ڕەگی خۆی داکوتا بوو لە بەربەرەکانی مۆدێرن لە نێوان ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ڕۆژئاوادا.

ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ماڵی سێ شارستانیەتی گەورەی غەیرە ڕۆژئاواییە: فارس و عەرەب و تورك. ئەمانە پێش چاخی مۆدێرن پەیدابوون. لە نێوان سەدەکانی یانزە تا شانزە شان بە شانی چین ناوچەیەکیان دروستکرد، کە پێشکەوتووترین ناوچە بوو لە جیهان. لەوێ، نەك لە ئەوروپا، هێزی سەربازی گەورە هەبوو، سامانی قەبە پەیدا بوو، ئەو داهێنانە مەزنانە بۆ گەلە ئالۆزەکانی تر کران بۆ ئەوەی بەکاریان ببەن. لە چاخی مۆدێرندا ڕۆژئاوا گەیشتە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و



دواترش پێشی کەوتەوە. لە سەدەی بیستەمدا، لە نێوان هەردوو جەنگە جیهانییەکەدا، بەریتانیا و فەرەنسا ڕاستەوخۆ حوکمی زۆربەی وڵاتانی عەرەبیان دەکرد. پاش ١٩٤٥ ئیمپراتۆرە ئەورووپییەکان لە ناوچوون، بەڵام ویلایەتە یەکگرتووەکان وەك ئامادەیەکی گەورەی هەرێمی پەیدا بوو، هاوکاری مەلیکەکانی کردو دەستی بەسەر زۆربەی نەوتی جیهاندا گرت.

لە سەدەی بیستەمدا، لە ڕێگای جۆراوجۆرەوە بۆ سەرهەڵدانی ڕۆژئاوا هەرسێ شارستانیەتە گەورەکە ڕەدفعلیان هەبوو. تورکیا، دوژمنێکی بەهێزی ئەوروپای مەسیحی بوو لە سەدەی پانزەهەمەوە تا نۆزدەهەم، پاش جەنگی جیهانی یەکەم گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە نە دەتوانێ بەسەر ڕۆژئاوادا زاڵ بێت و نە دەشتوانێت بەرگەی بگرێت بۆیە بڕیاریدا پەیوەندی پێوە بکات. لە ڕووخانی ئیمپراتۆری عوسمانی لە ئەناتۆلیا کۆمارێکی تورکی عەلمانی سەری هەڵدا. پاش جەنگی جیهانی دووەم، تورکیا بە پەشێوی بوو بە وڵاتێکی دیموکراسی، بەشێکی لکێنراوی ناتۆ بوو، ئەندامێکی بەرزخوازی کۆمەڵگای ئابووری ئەوروپی بوو.

ئارەزوو بۆ نیشتەجێبوون و گرێدان بە ئەوروپا لە جیهانی فارس و عەرەبیشدا بەهێز بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ڕەوتێکی سیاسی موعارز هەبوو، سووربوون لە سەر بەرگەگرتن. ئەو سووربوونە هێزێکی بە شۆڕشی ئێران و بزووتنەوە عەرەبی نەخوازراودا بەخشی، کە ڕۆژی پێشەنگی لە ١٩٥٦ تا ١٩٦٧ لە ژێر سەرکردایەتی جەمال عەبدولناسر بوو، دواتر سەدام حوسێن بە نیازی بوژاندنەوەی بوو بۆ مەرامەکانی خۆی لە نەوەدەکان.

شا موحەمەد ڕەزای پەهلەوی سەرۆکی ئێران لادرا لە لایەن شۆڕشی ئیسلامییەوە. شا موحەمەد، کەسێکی ناسراوی سەدەی یەکەمی ماوەی مۆدێرن بوو بە مەلیکێکی مۆدێرن ناسرابوو. لە هەوڵی بونیاتنانی کۆمەڵگایەکی مۆدێرن بوو لە نێو چوارچێوەی دەسەڵاتی سیاسی تەقلیدی. ئەو شۆڕشەی ئەوی لادا ڕابەری کرا لە لایەن پیاوماقوڵە ئیسلامییەکان کە ئەوانیش بە جۆرێکی تری ناسراوی مێژوویی لە چاخی مۆدێرن دەچوون. ئەوان شۆڕشگێڕانە بوون، وەك ئەو پیاوانەی کە شۆڕشی فەرەنسی و ڕووسیان هەڵگیرساند. بە نیازی دروستکردنی سیستەمێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی تەواو جیا دروست بکەن، هەرچەندە لە حاڵەتی ئێران بنەمای ئەو سیستەمە دەبێ کرۆکی تەقلیدی بێت ئەویش ئایینە. بنەما شۆڕشگێڕییەکانی ئیسلامی پیاوە ئایینییەکان بە متمانەوە باوەڕیان وابوو بۆ جێبەجێکردنی لە تەواوی وڵاتانی موسڵمانان لە سەرانسەری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. ئەو ڕژێمانەیان بە ناشەرعی دەزانی کە

حوكمی ئەو وڵاتانەیان دەكرد كە گەلێكیان وەك ڕۆژئاوا بوون و هیچ كامیشیان پابەند نەبوون بە بنەماكانی ئیسلام بە گوێرەی بیروبۆچوونی ئێران. بۆیە ڕژێمە نوێیەكەی ئێران هەڕەشەی لە هەموو وڵاتانی تری ناوچەكە كرد.

یەكێك لەو وڵاتانە ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی شۆڕشی ئێران بۆوە، عێراق بوو. عێراق هەستی بە هەڕەشە كرد لە لایەن ئێرانەوە. عێراق هاوبەشی سنوورێكی كرد لەگەڵ ئێران و بەشێكی دانیشتوانەكەی سەر بە مەزهەبی شیعی ئیسلام بوون، كە پێشەنگ بوو لە ئێران و تەقلیدییەكانی بنەماكانی كۆماری ئیسلامیان داڕشت لەوێ. عێراق وڵاتێكی گەورەی ئەوتۆ و هێزێكی ئەوتۆشی هەبوو، سامانێكی ئەوتۆشی هەبوو كە باوەڕ بەوە بكات كە بتوانێ، بەرامبەر دراوسێیەكی جەماوەری بوەستێتەوە، سەرۆكەكەی سەدام حوسێن، ئەركەكەی دژی شۆڕشی ئیسلامی گرێدا بەوەی كە سەركردەی جیهانی عەرەبی دەكات بۆیە مافی بەخۆی دات ڕووبەڕووی ئێران بوەستێتەوە

كاتێ عێراق هێرشی كردە سەر ئێران لە مانگی نۆی ١٩٨٠، سەدام پێشبینی سەركەوتنێكی خێراو هەرزانی كرد، بەڵام بە پێچەوانەی پێشبینییەكەی سەدام، جەنگ هەشت ساڵ درێژەی كێشا و بە پێی خەمڵاندنەكانیش ١٥٠٠٠٠ تا ٣٥٠٠٠٠ عێراقی و ٤٥٠٠٠٠ تا ٧٥٠٠٠٠ ئێرانی گیانیان لە دەستدا. یەكەم جار ئێران بەرگری كرد، ئێران ئاڵاكانی هەڵگرت، دەستپێشخەر بوو بۆ زۆربەی پێكدادانەكان، ئێران یەكەم بوو، بەڵام هێزەكانی ئێران هەرچەند بێشوومار بوون و لە سەرەتاشەوە زۆر هاندراو بوون، نەیانتوانی سەركەوتنێكی یەكلاكەرەوە بە دەستبێنن. عێراق و ئێران لەو جەنگەدا یەكسان بوون كەس نەیبردەوە، هەردوو لاشیان زۆر ماندوو و ماڵوێران بوون. شۆڕشی ئیسلامی لە دەسەڵات مایەوە لە ئێران، بەڵام هیچی تر هەڕەشەی لە دراوسێكانی نەكرد. جەنگ هەموو وزەكەی وشك كرد. مەلیكەكانی ناوچەكە، بەخۆیان و سامانە بێشوومارەكەی نەوتیان هیچی تر بەرامبەری بێهێز نەبوون، بەڵام ئەمە كۆتایی ئەو بەرەبەرەكانیانە نەبوو بۆ ڕێكخستنەكانی سیاسی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. لە سەر چاكبوونەوەی جەنگی عێراق و ئێران، هاوپەیمانێكی تری نێودەوڵەتی دژی عێراق قووت بۆوە.

سەرچاوەی جەنگەكانی كەنداوی فارس ساڵی ١٩٩١ خەرجییەكەی بێشومار بوو، بەڕای سەدام حوسێنیش عێراق دەبوایە ئەو خەرجییە لە جەنگەكەی لەگەڵ ئێران بدات. بۆیە فەرمانی



دا بە داگیركردنی كوێت لە مانگی هەشتی ساڵی ١٩٩٠، چونكە پێویستی بە پارە بوو بۆ ئاوەدانكردنەوەی عێراق و كوێت، لەگەڵ سامانی نەوتی، كە نموونەی بانقێكی بێ پاسەوان بوو. پاڵنەری ڕاستەوخۆ بۆ داگیركردنی كوێت ئەوە بوو لە ڕووی ڕێكخستنی ژیانی كۆمەڵایەتییەوە كۆن بوو. هێرشێك بە مەبەستی دزی لە لایەن وڵاتێكی بەهێز و بە تەماعەوە ئەنجامدرا لە كاتێكی ناگونجاودا. داگیركردنەكە لەگەڵ بەرز ڕوانینی سەدام بوو كە ببێتە سەركردەی جیهان عەرەبی، زاڵ بێت بەسەر ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، هەروەها سووكایەتی بە هێزە لیبراڵییەكانی جیهان بكات. كەسایەتی دیكتاتۆری عێراق تێكەڵەیەك بوو لە دڕندایەتی و فرت و فێڵ و چڵیسی دەسەڵات بوو، تێكەڵەیەك كە وێرانكەر بوو بۆ گەلی عێراق و ترسناكیش بوو بۆ هەموو ناوچەكە بە گشتی.

بەرنامەی هەوڵەكەی بۆ زاڵ بوون بەسەر ناوچەكە عەرەبچییەكی نەخوازراو بوو، ئەو ئایدییەی كە گەلی عێراق لە یەك نەتەوە پێكهاتووە، كە لە سەر بنچینەیەكی یەك دەسەڵاتی سیاسین، هەروەها دابەشبوونیان بۆ سەر چەند وڵاتیكی سەروەری و بەهیز بەهۆی ڕوانگەی شەڕانگێزی ڕۆژئاوایە تاوەكو بێهێزیان بكات. سەركردەی قارەكانی سەدەی بیست بۆ هۆی عەرەبیچییەتی نەخوازراو ناسر بوو، سوپایەكی داگیركار بوو كە دەسەڵاتی لە میسر گرتە دەست لە ساڵی ١٩٥٢ و حوكمی وڵاتەكەی كرد تا مردنی لە ساڵی ١٩٧٠.

سەدام وەك فیدل كاسترۆی سەرۆكی كوباو كیم جۆنگ ئیلی سەرۆكی كۆریای باكوور، درێژەی بە جۆرە ڕژێمێكی تایبەتی بەدخوو دا تا نێو ماوەی دوای جەنگی سارد. هەركە جارێك ئایدیلۆژیایەكیان داڕشت، هەر سێ حكوومەت پشتیان بە لادانی كەسایەتی بەست. كە دەبێ دەسەڵات تەنها لە ژێر دەستی یەك پیاو و خێزانەكەیدا بێت. ئەم نموونانە، بە قسەی بێرنارد لویس دژیەكێكی سیاسینییە میراتكردنی دەسەڵاتی سەركردایەتی". لە هەرسێكدا، نەمانی جەنگی سارد پێشەنگی ئایدیۆلۆژیا سەركوتكردنی چاند لە حكومی ئەواندا. هەرسێكیان سەرشۆڕ بوون و سەرەنجامی گشتی حوكمەكەشیان بێ بەشبوون بوو: بەردەوامی تەمەن كورتی لە كوبا، برسێتی لە عێراق، قاتو قڕی لە كۆریای باكوور. لە سەرەنجامی دەیەی یەكەمی دوای جەنگی ساردا، لە سەر ڕێیان بەرەو نەمانیان، گەر گەشتبان بە مەرامی خۆیان ئایا بە ئاشتی دەژیان یان حالەتێكی دوودڵیان دەبوو.. عێراق یەك شتی كەم بوو، ئەو شتەش وای لە دووەكەی تر كرد لە سەر حكوم بمێننەوە. هیچ لایەكی ئاو نەبوو، بەڵام، شتێكی جیای هەبوو

بۆسە پەیوەست بوو بە مانەوە، کە دووەکەی تر نەیان بوو، ئەویش نەوت بوو. سەدام حوسێن توانی نەوتی زۆر بفرۆشێت بۆ پاراستنی خۆی لە سەر دەسەڵات سەرەڕای سنوور بۆ فرۆشتنی لە لایەن UN لە سەرەنجامی جەنگی کەنداو دا، کە لە شوێنی خۆی بوو لە کاتی دەیەی یەکەمی دوای جەنگی سارد.

پرسی ئەوەی کە ناسر بەکاری هێنا بۆ بەرهەمهاوردەی پەرۆشی بۆ بزووتنەوەی عەرەبی بە سەرکردایەتی خۆی، کە لە کۆتاییدا کۆتایی بە چلێسییەکەی هێنا، بەڵام، کە سەدامیش، هەوڵی دا هەڵیبقۆزێتەوە لە نەوەدەکان، بەربەرەکانێی عەرەب و ئیسرائیل بوو.

ئەو بەربەرەکانێیە لە پاش جەنگی جیهانی یەکەمەوە دەستی پێکرد، وەك ململانێیەکی گشتی لە نێوان جولەکە و عەرەب فەلەستینی پارێزگای پێشووی عوسمانی و لە ژێر دەستی بەریتانییەکان. لە ساڵی ١٩٧٦ بەولاوە، مشتومڕێك دەربارەی نیشتەجێبوونی ئیسرائیل بوو کە میسر و سوریاو ئوردنی گرتبوو لە مانگی شەشی هەمان ساڵدا. هەردوو فەیسەکە بەیەکەو گرێدران بەهۆی ڕووداوێگی گرینگ لە بەربەرەکانییەکە، ئەویش جەنگی ساڵی ١٩٤٨ بوو. بۆ ئیسرائیل ئەو جەنگە جەنگی سەربەخۆیی بوو. نەتەوە یەکگرتووەکان دەنگی دا بوو بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی جولەکە (شان بەشانی دەوڵەتی عەرەبی)، بەڵام ئیسرائیل هێرشی کرا سەر لە لایەن دراوسیێ عەرەبەکانی ڕاستەوخۆ پاش ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی. لە سەرەنجامی دۆڕانی عەرەبدا، بەرهەڵستکاری کەللە ڕەقی ئیسرائیل شەرعییەتێکی بەخشی بە وڵات، حکوومەتە عەرەبیەکان چێژیان وەرگرت چێژیان لەو گەلانە دەکرد کە حوکمیان دەکردن.

ڕژێمە عەرەبییەکان وجودی تازەی ئیسرائیلیان وەك بەشێکی تری هێرشی کتوپڕی ڕۆژئاوا وەسف کرد بۆ سەر گەلانی عەرەبی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا و ئیبادەکردنیان.(*) دەوڵەتی

(*) بە هەقیقەت ئیسرائیل سەرکەوتووترین نەتەوە بوو لە نێو نەتەوە نوێیەکان کە پەیدا بوو لە حکمی ئیمپڕاتۆری بۆ سەربەخۆیی لە سەرەنجامی جەنگی جیهانی دووەم. ناسنامەیەکی بەهێزی نەتەوەیی ساختە کرد و سیستەمێکی سیاسی دیموکراتی پەیڕەو کرد لە کاتێکدا بەرەنگاری سەرکەوتووی ڕێکدەخست بۆ هێرشە کتوپڕەکانی دراوسێکانی. مەبەستی هەموو ئەو شتانەی ئیسرائیل بەدەستی هێنا، لە بەرەبەیانی سەدەی بیست و یەکدا، پێوەرێکی گوزەران کە شان بەشانی ئەوانەی وڵاتە لیبراڵییە ڕۆژئاواییەکانی ناوەوە بوو سەرەڕای نەبوونی سەرچاوەی سروشتی و ئەرك بۆ هێورکردنەوەی کۆچبەران کە ژمارەیان چەند ئەوەندەی



جولەکان خەریك بوو خەسڵەتێکی ڕەمزی لە کۆمەڵگا عەرەبییەکانی هەبێت وەك بانگەشەی بێجینگ لە سەر تایوان لە چین هەیبوو. ئەوە ئەرکی عەرەبەکان بوو بۆ لابردنی، تەنانەت لە چاخی ناوەڕاستدا زۆریان لە کۆتایی شانشینی خاچپەرستان کرد. بۆ ئەو پرۆژەیە، ناسر بە تایبەتی جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە یەکگرتنی عەرەب زۆر گرینگ و پێویستە (گرینگ نەبوو تەنها لە ژێر سایەی سەرکردایەتی ئەودا). هەستی دژی ئیسرائیل کە ناسر یارمەتی سەرهەڵدانی دا پاڵی پێوەنا بۆ جەنگێك لە ساڵی ١٩٦٧ کە زۆر خراپ دۆڕا. ئەو دۆڕنەش بوو کۆتایی بۆ تەماعە گەورەکەی هێنا بەهەمان شێوە کە سەرەنجامی بەربەرەکانی عێراق و ئێران ڕەوتی ئایدیۆلۆژی کۆماری ئیسلامی ئێران کول کرد.

هەستی یەکگرتنی عەرەب بێهێزتر بوو، بەڵام تەواو نەمرد لە نەوەدەکان و سەدامیش هەوڵیدا بەکاری بێنێت بۆ کۆتای هاوردە خۆی. سەدام بانگەشەی ئەوەی کرد کە هێرشە کتوپڕەکەی بۆ سەر کوێت بەشێك بوو لە پرۆگرامەکە بۆ ڕزگارکردنی فەلەستین لە ژێر دەستی جولەکان، بەڵام هەوڵی سەدام بۆ پێشەنگی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەرەسی هێنا. هاوپەیمانییەکی بەرفراوانی نێودەوڵەتی کۆکرایەوە بۆ دژایەتی داگیرکردنی کوێت لە لایەن عێراقەوە، بە سەرۆکایەتی هێزی سەربازی ویلایەتە یەکگرتووەکان، سوپای عێراقی ڕاونا لە مانگی سێی ساڵی ١٩٩١. هەرچەندە سەدام خۆی مایەوە لە سەر دەسەڵات پاش دۆڕانەکەی.

جەنگی کەنداو جانتایەکی کتێبی پێداویستی گشتی نێودەوڵەتی دابینکرد لە لایەن سەرکردایەتی بەهێزترین ئەندامی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی. ویلایەتە یەکگرتووەکان بەرژەوەندییەکی سەرەکی هەبوو لە ئاوەژووکردنەوەی داگیرکردنی کوێت و کەمکردنەوەی هێزی سەدام. ئایا مناوەرەکەی سەرکەتوو بوو، ڕاستەوخۆ کۆنترۆلی گەنجینەکانی نەوتی عێراق و کوێتی دەکرد، بە ناڕاستەوخۆش لە ڕێگای ترساندنەوە گەنجینە پەترۆلەکانی دراوسێی کوێت سعودیای کۆنترۆڵ دەکرد. لە سەرووی هەموویانەوە، ویلایەتە یەکگرتووەکان چوو بۆ شەڕ بۆ پاراستنی نەوتی عەرەبستانی سعودیە. ئەم ئامانجە زۆری دەهێنا بۆ سەلماندنی وەگەڕخستنی

دانیشتوانی ئەسڵی بوون. بۆیە هەوڵێکی سەنگەری بوو بەرابەر دراوسێکانی، چونکە بیرخەرەوەییەکی زیندووی ئەو دەسکەوتە گونجاوانەیە لە هێورکرنەوە و سوود وەرگرتن لە بەرهەمی هەردوو شۆڕشە مەزنەکە.

سەرمایەی دیپلۆماسی و پێویست بوو بۆ کۆکردنەوەی هاوپەیمانییەکی بەرفراوان و خستنە مەترسی ژیانی ئەمریکییەکان لە ڕێگەی هەناردنی سەربازەکانی بۆ نێو مەیدانی جەنگ.

ئەوانی تری جیهان خۆشیان دەهات بۆ پەیوەندی کردن بەو هاوپەیمانێتییە لە بەر هۆگەلێگی هەمەجۆر. بۆ وڵاتانی نەوت فرۆش بەرژەوەندی ئابووری لە مەترسیدا بوو. بۆ وڵاتانی دەرەوە هەستیار بوو بۆ پەیوەندیکردن لە ژێر چاودێری لە لایەن بەهێزترین ئەندامی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی. بۆ فەرمانڕەواکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش، ڕێگایەك بۆ دووپاتکردنەوەی ئەوەی ناتوانن بژین لە ناوچەیەك عێراق بەسەریدا زاڵ بێت. هەروەها بۆ ئەوانەشی کە سەیری سیاسەتی دەرەوە دەکەن لە ڕووی ئاکارییەوە، داگیرکردن، دەست بەسەرداگرتن، تێکدانی ڕێکخستنی وڵاتێکی نێودەوڵەتی سەروەری ئاشکرابوو وەك یاسای نێو دەوڵەتی.

کات دانانی سەدام لەوە خراپتر نەدەبوو. هێرشی کردە سەر کوێت هەرکە تازە جەنگی سارد کۆتایی پێ دەهات، کە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە یەکێتیی سۆڤیەت بە ئاشکرا دژی ویلایەتە یەکگرتووەکان نەوەستایەوە، وەك ئەوەی پێشتر پێشبینی لێ دەکرا دژی بوەستێتەوە. بە پێچەوانەوە، مۆسکۆ لە دواجاردا پەیوەندی کرد بە هاوپەیمانی دژی سەدام. شەڕەکە زۆر لە کاتی جەنگی سارد نزیك بوو، بەڵام، ئەو هێزانەی کە ویلایەتە یەکگرتووەکان دروستی کردبوو بۆ دەبڕکردنی ئەو ململانێیە هێشتا لە ئامادەبووندا بوو. هەروەها ئەو نەریت و گفتوگۆ سیاسیانەی کە شیاوی کرد بەکاریان بهێنێت هێشتا خەڵکی ئەمریکی هاوکاری دەکرد.

لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا، مەبەستی سەرەکی سیاسەتی ڕۆژئاوا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەمان ئامانجی تەقلیدی بەریتانیا بوو لە کیشوەری ئەوروپا ئەویش: لێنەگەڕێت هیچ وڵاتێك کۆنترۆلی سیاسی و سەربازی بکات. بۆ زۆربەی ئەو ماوەیە، لە نێوان سەدەی شانزە و بیستەمدا بەریتانییەکان دەیانتوانی ئامانجەکانی خۆیان لە دوورەوە تۆمار بکەن. هێزە ئەوروپییەکان یەکتریان هاوسەنگ کرد، بە یارمەتی دیپلۆماسییەت و دارایی لە بەریتانیا. تەنها بە ڕێکەوت سەربازە بەریتانییەکان لە سەر کیشوەرەکە دەجەنگان.

لە پاش جەنگی ساردا، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست سیاسەتێکی هەمەلایەنەی لە ئاوەوە بۆ زەوی هەبوو و هاوسەنگ کردنی گونجاو نەبوو. ڕۆژئاوا نەیدەتوانی پشت ببەستیت بە هێزەکانی ناوخۆ بۆ گەیشتن بە تەوافوقێکی سەربازی کە ببێتە پاراستنی لێشاوی نەوتی دەرهاتوو. عێراق و ئێران بێهێزبوون بەو جەنگانەی هەشتاکان و نەوەدەکان و بە دوژمنی یەکیش مانەوە، بەڵام



هەردووکیشیان دوژمنی ڕۆژئاوا بوون. وێڕی ئەمە، هەروەك بێهێزی ئێران و عێراق، مەلیکەکانی کەنداو، لەسەریدا ئابووری پیشەسازی زۆر بە چڕی پشتی بە نەوت دەبەست، هەر بێهێزتر بوو. ئەم ڕژێمانە داوای هاوکاریان لە دەرەوە کرد، هەروەك ئەوروپای ڕۆژئاوا پاراستنی داواکردبوو لە یەکێتیی سۆڤیەت لە کاتی جەنگی ساردا.

سیاسەتی ڕۆژئاوا لە دوای جەنگی ساردا لە کەندا وەك سیاسەتی ڕۆژئاوا لە ئەوروپا لە کاتی جەنگی ساردا نەهێشتنی بڵاوبوونەوەی هێز بوو. لەبەرئەوەی مەبەستی دوو وڵات بوو لە یەك کاتدا ئەوانیش عێراق و ئێران بوون، ناسرا بە سیاسەتی " نەهێشتنی بڵاوبوونەوەی هێزی وانە". بەرپرسیارێتی جێبەجێکردنی ئەو سیاسەتە کەوتە سەر شانی ویلایەتە یەکگرتووەکان. ئەمە ئەرکێکی تری سەرکردایەتی دوای جەنگی سارد بوو کە هیچ ڕکابەرێکی باوەڕپێکراوی بۆ نەبوو.

لە ئەوروپا لە سەرەنجامی جەنگی ساردا، قەدەغەکردن ڕێگای گۆڕی بۆ زەمانەت، ئاسایشی گشتی شوێنی نەهێشتنی بڵاوبوونەوەی هێزی گرتەوە، بەڵام لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، کۆتایی جەنگی سارد ئەرکی هێزی سەربازی ئەمریکی نەگۆڕی، کە بە قەدەغەکراوی مایەوە بە مەبەتی نەهێشتنی بڵاوبوونەوەی. لەم ناوچەیەدا تۆخمەکانی ئاسایشی گشتی هەموو شتێك بوون بەس وجودی نەبوو. لەکاتێکدا نە عێراق و نەئێرانیش هێزی ئەوەیان نەبوو بتوانن ڕابەرایەتی ناوچەکە بکەن، هەردوو چاویان بە تاماعەوە لەوە بوو بن بە پێشەنگی ناوچەکە، بەڵام ڕێگەیان لێ گیرا، بەڵام خاسیەتی ڕەمزی قەدەغەی جەنگی سارد لە ئەوروپا، جێگیربوونی سەربازی ئەمریکی بوو بە ژمارەیەکی زۆر لە سەر بنەمای بەردەوام لە ناوچەکانی ئەو وڵاتانەی کە دەبێ بپارێزرێن، لە ڕووی سیاسییەوە لێل بوو بۆ گەورەترین و گرینگترینی ئەو ڕژێمانەی کە پێویستیان بە پاراستن هەبوو ئەویش عەرەبستانی سعودییە بوو. بۆیە ویلایەتە یەکگرتووەکان بنکەیەکی سەربازی گەورەیان لەو وڵاتە دامەزراند، هێزێکی بچووکی ئەمریکی نارده ئەوێ لە ناوچە نیشتەجێبووەکان، هەروەها دەستی بەو توانایە گرت بۆ دەستێوەردانی گەر پێویستی کرد.

هەروەك لەگەڵ هەموو ئەرکەکانی ئاسایشی دوای جەنگی سارد ویلایەتە یەکگرتووەکان پاراستنی نەوتی کەنداوی خستە ئەستۆی خۆی دەبوایە تێستیکی دیکە بکات. دەبێ ئەمە پەسەنکراو بێ لە لایەن خەڵکی گشتی ئەمریکا زۆرجار گومانی پابەندبوونی چاودێرەکانی

دەکرد. ئەو وڵاتانەی دەپارێزران بە پێی پێوەری ئەمریکی یەکسان بوون، وەك مۆدیلێکی سەرنجڕاکێشی حوکمکردنی ناوەخۆ، بەڵام لە سەرەنجامی جەنگی کەنداودا، پابەندبوونی ئەمریکا بۆ نەوتی مەلیکەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کەمێك نارەزایی خەڵکی ئەمریکی بەرزکردەوە لە نێو ئەمریکا، چونکە ئەمریکییەکان بەدەگمەن شت بەسەر دەکەنەوە گەر ڕۆژێك لە ڕۆژان گوێی لیّ بێت.

ئەم نموونەی سەرکردایەتی نێو دەوڵەتی ئەمریکا کێشەی ئاشنای 'سوار بوون بە بەلاشی' هێنا کایەوە. ئەمریکییەکان سەرسام بوون بۆچی هاوپەیمانەکان لە کەنداو هیچی دیکەیان نەدەکرد بۆ بەرگریکردن لەخۆیان. ئەو وڵاتانە زیاتر جەماوەری بوون لە عێراق و ئێران، بەڵام بە شێوەیەکی بەرچاو دەوڵەمەنتر بوون. هەروەها ئیسرائیل ژمارەی دوژمنانی گەلیّ زۆر بوو، بەڵام توانی بمێنێتەوە و پێشیش بکەوێت بە بیّ کۆمەکی هیچ هێزێکی سەربازێکی دەرەوە.

ئەمریکییەکان ڕەنگە سەرسام بن بۆچی وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژئاواو ژاپۆن کە زیاتر ویلایەتە یەکگرتوەکان پشتیان بە نەوتی کەنداو بەستووە بەشداری کۆمەکی کارمەندی و دارایی و لۆجیستی ئەمریکیان کرد لە جەنگی دژی سەدام حوسێن، بەشی پاسەوانیشیان قبوڵ نییە کە ڕێژەی نەوت بۆ بەرژەوەندی ئەوان ئەوتۆ نییە. لە هەندیّ باردا، بەهەقیقەت، ئەو سیاسەتانەیان بەکارهێنا پێچەوانەی ئەوانەی ویلایەتە یەکگرتووەکان بە پێویستی دەزانی بۆ ئاسایشی گەنجینەی نەوتی ڕۆژئاوا. لە نەوەدەکان گەلیّ لە وڵاتە ئەورووپییەکان زیاتر لە ئەمریکا خۆشحاڵ بوون بەوەی بازرگانی بکەن لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێران و فشاری نێودەوڵەتی کەم بکەنەوە لە سەر سەدام حوسێن.

بەردەوامی ڕێکخستنەکانی دوای جەنگی سارد بۆ دووپاتکردنەوەی جۆگەی بەردەوامی پێترۆل پشت ئەستوور بوو بەو پرسیارانەی کە بەناگرینگی مابوونەوە بۆ ڕای گشتی لە ویلایەتە یەکگرتووەکان. یان، تا ئەو ڕادەیەی کە ئەو پرسیارانە گرینگ بوون، پشتی بەستا لە سەر پشتگوێخستنی قایل بوونی گشتی لە ڕێکخستنەکان کە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی سارد خستیەڕوو. لە بەرامبەری ئەوەش، خەرجییەکان تا ڕادەیەك لە خوێن و گەنجینەدا گونجاو بوون بە قەدەر دەیەی یەکەمی دوای جەنگی سارد بوون.

ئێران و عێراق هێشتا هەڕەشەیان لە بەرژەوەندییەکانی ڕۆژئاوا دەکرد، بەڵام فۆرمی هەڕەشەکە ڕەوتێکی ئایدیۆلۆژی نەبوو یان هێرشێکی سەربازی کتوپڕی ڕاستەوخۆ. بەڵکو



دەستەبەرکردنی چەکێك بوو بڵاوبوونەوەکەی وڵاتانی ناوەوەی سەرقاڵ دەکات لە نەهێشتنی. بە فشارترین کێشە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا حەشارنەدانی چەکی ناوکییە لە ناوچەکە، کە گرینگییەکی تایبەتی هەبوو و نابێت بەخێرایی بڵاوببێتەوە.

## خێرا زۆربوونی چەکی ناوەکی

گەر نەوت پێش چاخی مۆدێرن گرینگ نەبوایە، چەکی ناوکی هەر مەحاڵ بوو باسی لێوە بکرێت. بۆمبی ئەتۆمیش بۆ مەبەستی سەربازی ڕێگەی پێدرابوو لە دوا سەرچاوەکانی هیمز لە جیهانی ماددیدا، وزە کلیل درا لە جەرگەی مەسەلەکە خۆی، بۆیە زۆربوونێکی کاریگەر لە هێزی وێرانکەر و لابردنی حکوومەت پەیدابوو. یەك چەکی ناوکی، لە شوێنێکی پڕ دانیشتوان بدرێت، بە پێی ئەو پەڕی پێوەری هەر لافاوێك، ئاگرێك یان زەمینلەرزەیەك ئەو ناوچەیە وێران و کۆر دەکاتەوە لە سەرانسەری مێژووی جیهانیدا.

چەکی ناوکی ڕۆڵێکی دیالێکتیکی گێڕا لە سیاسەتی نێودەوڵەتی سەدەی بیستەمدا، بە بەدیل سیاسەتەکانی لێك دەترازان و هێوری دەکردنەوە لەنێو وڵاتانی ناوەوەی جیهاندا. تەنها دوو چەکی ناوکی بەکارهێنراون بە تورەی و دوژمنایەتی لە سەدەی بیستەمدا، دژی هەردوو شاری ژاپۆنی هیرۆشیماو ناگاساکی لە مانگی هەشتی ١٩٤٥، کە ئەمە بووە یارمەتی دەرێك بۆ کۆتایی جەنگی جیهانی دووەم، واتە خولی یەکەمی بەربەرەکانییە گەورە جیهانییەکەی نێوان لیبراڵیزم و نالیبراڵیزم. لە خولی دووەمدا، جەنگی سارد، کەڵەکەبوونی گەنجینەیەکی زۆری چەك و سوپا لە لایەن ویلایەتە یەکگرتووەکان و یەکێتیی سۆڤیەت بەبەرەکانی هەردووکیانی ترسناکتر کرد لەوەی بە بیّ ئەو چەکانە، چونکە هەردوولا دەیانتوانی لایەکەی تر تێك و پێك بشکێنن، بەڵام لە کۆتایدا سەقەماگیر بوون، چونکە هەردوو لەو واقیعە دەگەیشتن کە ئەو مەترسییە بەسەر هەردوولادا سەپێنراوە. چەکی ناوکی جەنگی ساردی درێژکردەوە، لەبەرئەوەی هیچ کام نەیدەتوانی ڕێگاچارەیەکی بەهێز پێشکەش بکات، بەڵام هەردووکیان کۆششێکیان کرد بۆ کۆتایی پێهاوردە لەڕێگای دانانی بنەماکانی ئاسایشی گشتی، بەڵام، گەر چەکی ناوکی لە جیهانی ناوەوەدا بەشداری کردبوایە بۆ هێورکردنەوەی بەربەرەکانی

سیاسی لەوێ، ئەوا بلاوبوونەوەی ئەو چەكانە لەو دیو ناوەوە هەڕەشەی لە هەردوو هێوربوونەوە و ئاسایشی ولاتانی ناوەوە خۆیان دەكرد، هەروەك لە پلۆتی ڕۆمانی ڕێبی مۆند چاندلەردا هاتووە كە تیایدا تاوانێك لەبیركرا بۆ ماوەیەكی درێژ یان فەزاعەتێك بۆ ماوەیەكی درێژ لە ڕواڵەتدا سەركوتكرابوو بۆ تێكشكاندنی ژیانی ئەو خەڵكانەی كە باوەڕیان وابووە لە دووری خۆیان بەجێیان هێشتووە.

وەستاندنی بلاوبوونەوەی چەكی ناوكی بۆ دەرەوە بە قەد ئامانجی لیبراڵی ناوەوەی ڕۆژئاوا لە دوای جەنگی سارد گرینگ بوو بۆ دووپاتكردنەوەی لێشاوی نەوت بە ئاراستەی پێچەوانەدا. كەواتە ئەوەی بەهێز بێت ئەو چەكانە بوون كە ئەگەر ژمارەیەكی كەمیش بن ئەوا هێزێكی زۆر گەورە دەخەنەڕوو. چەكی ناوكی وەك شلەیەكی سیحراوی بوو لە نێو جۆری شەڕابی ئالیس و وەندەرلاندا زۆر بەخێرایی گەشەی كرد. خاوەنی ئەم چەكانەیان خستە ئاستی ئەندامە بەهێزەكانی سیستەمی نێودەوڵەتی، چونكە ئازاری جۆرە تێكشكانێك لە سەر ئەو كۆمەڵگایە چەشت كە پێشتر داوای دۆڕانی سوپاكەی دەكر بۆ بەدەستهاوردەی. بە پێی ناوەندی گونجاوی پێشكەش كردن، خاوەنی چەكی ناوكی بووە بەشێك لە حیساباتی ئاسایشی ولاتان كە دەیتوانی پێیان بگات.

گەر بە شێوەیەكی تر قسەی لێ بكەین، چەكی ناوكی هێزی سەربازی جیاكردەوە لەوەی كە هەمیشە بە پێویست هاوكاری بكرێت ئەویش هێزی نەتەوەیی بوو. ڕێگەیان بە ولاتاندا بازبدەن لە سەر هەموو قۆناغە پێویستەكانی پێشتر بۆ كۆكردنەوەی هێزە سەربازییە گەورەكان. گەر كۆتایی جەنگی سارد ولاتانی ناوەوەی جیهانی لێك پچڕاند لەوانەی دەرەوە، خاوەندارێتی چەكی ناوكی لە لایەن حكومەتەكانی دەرەوە ئەو پەیوەندییەی نێوان ناوەوە و دەرەوەی سەر لە نوێ دامەزراندەوە.

لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا، لە سەرەنجامی وێرانبوونی هیرۆشیماو ناگاساكی، پاشماوەی تیشكی كاری كردۆتە سەر ئەوانەی كە ماون تووشی بێهێزی كردوون و بە ئازارەكەی دەناڵێنن. هەروەها كۆكردنەوەی چەكی زۆر بۆ وێرانكردنی ژیانی مرۆڤ لە سەر زەوی، چەكی ناوكی ترس و تۆقینێكی زۆری بلاوكردەوە. دواتر باسی چۆنیەتی قەدەغەكردنی كرا. بەكارهاوردەیان لەبەرچاوگیرا، لەكۆتایی سەدەكە بە نامرۆڤانەو بیرلێنەكراوە دانرا. وەك مرۆڤ خواردن، بەكارهاوردەی لە هەر بارودۆخێكدا لە بەر هەر مەبەستێك بێت بێ مانا و بەدخوو



بوو. بۆیە لە ٥٥ ساڵی كۆتایی جەنگی جیهانی دووەم تا كۆتایی سەدەی بیست چەكی ناوكی بەكارنەهێنرا. بۆ ئەوەی جیای بكەینەوە لە ئامێرە جەنگییەكانی تر ناوێكی تایبەتیان وەرگرت ئەویش "چەكی بە كۆمەڵ كوژ". بوو.

دوو جۆرە چەكی تر هەبوون كە زۆرجار لەگەڵ ئەو چەكە ناویان دێت ئەوانیش " كیمیایی و بایەلۆژی بوون". وەك چەكی ناوكی، چەكی كیمیایی لە بابەتی قەدەغەكردن بوون، هەرچەند لە پێكداداندا بەكارهێنراون، یەكەم جار لە كاتی جەنگی جیهانی یەكەم و هەندێ جاریش دوای جەنگەكە، بەلام بەقەدەر چەكی ناوكی وێرانكەر نەبوون. یەك هۆ بۆچی كەمتر لە جەنگەكانی سەدەی بیستەم بەكارهێنراون ئەوەبوو كە لە ڕووی سەربازییەوە كاریگەرییەكی تایبەتیان نەبوو.

چەكی بایەلۆژی كە كاریگەری ژەهراویان لە سەر عەمیلەكانی ژیان هەیە وەك بەكتریاو ڤایرۆس، زیاتر دەچێتە خانەی چەكی بەكۆمەڵ كوژ. گەر لە هەوادا یان لە ژێر ئاودا بتەقێنرێنەوە ئەوا گەردیلەكانی دەتوانن بە سەدان هەزار خەڵك بكوژن. لەكاتێكیشدا توانای ئەوەیان هەیە ببن بە چەكی بەكۆمەڵكوژیش، بەلام لە ڕووی مێژووییەوە ئەو جۆرە هێرشانە كەمتر وێرانكەر بوون.

تۆڕەكانی یاساو نەریت و ڕێكخراوەكان دروستكران لەكاتی جەنگی سارد بۆ حوكم كردنی هەر یەك لەو سێ جۆرە چەكە. مەبەست لە هەر حاڵەتێكدا تەسكردنەوەی دابەشكردنی ئەو چەكانە بوو تا ئەو ڕادەیەی كە هەرەسی هێنا، بە مەبەستی قەدەغەكردنی بەكارهێنانیان، بەلام تەنها بلاوبوونەوەی چەكی ناوكی، ناوێكی تایبەتی هەبوو، كە زیاتر بە نەخۆشییەكی درم و كوشندە بوو كە لە یەكتر دەگرنەوە، ئەویش زۆربوونی خێرای چەكی ناوكییە. لەبەرئەوەی زۆربوونی خێرای چەكی ناوكی بووە هۆیەكی گرینگ بۆ بەیەكەوە گرێدانەوەی ناوەوە و دەرەوە، بۆیە زۆرنەبوونی چەكی ناوكی لە لووتكەی ئەگێندەی جەنگی ساردی جیهانی پیشەسازی ولاتە دیموكراسییەكاندا بوو.

وەك یاسا و ڕێنماییەكان بۆ دەستێوەردانی مرۆیی كە پێشكەوت لە وەلامی كێشەیەكی نوێ و جاڕسكەری نێودەوڵەتی لە دەیەی یەكەمی دوای جەنگی ساردا، سیستەمی زۆرنەبوون لە كاتی جەنگی سارد هاتە ئاراوە لە وەلامی بەرەنگاربوونەوەیەكی نوێ و بە فشاری نێودەوڵەتی لەو ماوەیەدا. ناوەڕۆكی سیستەمەكە لە نیوەی دووەمی جەنگی سارداو پاشتریش پەیمانی زۆرنەبوونی خێرا بوو (NPT) لە ساڵی ١٩٦٨. مەبەستەكەی لە ناوەكەیدایە، لە

سەدەی نوێدا نزیکەی ١٨٦ وڵات پەیوەندی بەو پەیمانەوە کرد. NPT ئاژانسی وزەی ئەتۆمی نێودەوڵەتی دروستکرد (IAEA)، کە بەرپرسیاریەتی پشکنینی ئاسانکارییەکانی هێزی بەرهەمهاوردەی ناوکی وڵاتان بوو کە ئەندام بوون لەو پەیمانە، بۆ دڵنیابوون لەوەی کە ئەو ئاسانکاریانە بەکانەهێنرێن بۆ دروستکردنی بۆمب. بۆ هەمان مەبەست، ئەو وڵاتانەی کە کارگەی تەکنەلۆژیایان هەبوو بۆ بەرهەمهاوردەی هێزی ناوکی دەتوانرا بەکاریبهێنن بۆ دروستکردنی چەك کە شێوەی گەنجینەی ناوکیان هەبوو وەك گروپ بۆ چاودێریکردنی بڵاوبوونەوەی ئەو ئامێرە دوانەییە. نزیکەی هەمان گروپی وڵاتان ڕژێمی کۆنترۆلکردنی تەکنەلۆژیای مووشەکیان دامەزراند لە ساڵی ١٩٨٧، کە کۆمەڵێ یاسای دانا بۆ هەڵوەشاندنەوەی کاریگەرترین و ترسناکترین ناوەند بۆ بەرهەمهاوردەی ەکی ناوکی مەودا دوور.

NPT هەندێ بنەماکانی ئاسایشی گشتی جێبەجێکرد بۆ چەکی ناوکی، هەروەها لە سەر ئاستی جیهانی کەمتر لە سەر ئاسی هەرێمی. ڕەتکردنەوەی چەکی ناوکی پەیمانەکە ڕۆحی زاڵ بوونی بەرگری دەستەبەرکرد. ئەویش کەس ناتوانێت هەڕەشەی لێ بکرێت بەهۆی نەبوونی وجوودی چەکی ناوکی. هەروەها IAEA وەکیلێکی باش بوو، ئەرکەکەی بۆ دڵنیاکردنی جیهان کە ئەندامەکانی پەیمانی NPT ئەو بەڵێنانەیان دەگەیاندە جیˇ کە لەکاتی واژۆکردنی ئەو پەیمانە دابوویان. پەیمانی NPT بە ڕێکەوتنی کۆنترۆڵکردنی چەکی ئەوروپی لە جەنگی سارد دەچوو، ئێستاش بە ڕێگایەکی تر. گۆڕانێك لە بیروبۆچوونەکە ئاسایی پابەندبوونی زیاتر گەرەکە. ئەندامەکانی چەکی ناوکیان ڕانەگەیاند، چونکە پەیمانی (NPT) یان واژۆکردبوو. لەبەر چەند هۆیەکی تایبەت بە خۆیان پەیمانەکەیان واژۆ کرد، پیشتر بڕیاریاندابوو ئەو چەکانە بۆ کاری باش بەکاربهێنرێن. پابەندبوون بە NPT ڕێگایەك بوو بۆ بەدەستهاوردەی سوودی ڕەتکردنەوەی ناوکی بە هۆی دڵنیاکردنی ئەوانی تر بۆ ئەم بڕیارە.

لە ڕێگایەکی گرینگەوە، پەیمانی زۆرنەبوونی ناوکی دووپاتی پێوەری ئاسایشی گشتی نەکردەوە. قەدەغەکردنی دژی خاوەندارێتی چەکی ناوکی جیهانی نەبوو. دوو چینی ئەندامانی پەیمانەکەی گرتەوە: ئەو وڵاتانەی بەبێ چەکی ناوکی کە بەڵێنیانداوە بەرهەمی نەهێنن، هەروەها ئەو وڵاتانەشی کە ڕێگا درابوون پێشتر ئەو چەکانەیان هەبێت بە پێی پەمانەکە ڕێگەیان پێدرا بهێڵنەوە. لە پێشدا ویلایەتە یەکگرتووەکان، یەکێتیی سۆڤیەت، بەریتانیا سەر



به وڵاتانی دووەم بوون واتە پێشتر چەکی ناوکیان هەبوو، کۆمەڵەیەکی تایبەت دواتر پەیوەندیان پێوە کرد ئەوانیش فەڕەنسا و چین بوون.

پەیمانی NPT پەیمانێکی نایەکسان بوو، میکانیزمێك کە بە هۆیەوە ولایەتە یەکگرتوەکان و یەکێتیی سۆڤیەت و هاوکارە ئەندازیارەکانیان نیازی پاراستنی ئەوانی تریان هەبوو لە دەستەبەرکردنی بۆمب. ئەمریکییەکان، بەلانی کەم، قەناعەتیان بەوە هاتبوو کە ئەمە خزمەتی بەرژەوەندی تەواوی سەر زەوی دەکات، پێی وابوو سەنتەری سەربەخۆی زیاتری کۆنترۆلکردنی ناوکی، ڕەنگە دەرفەتی ئەوە بڕەخسێنێت بە ئەنقەست یان بە ڕێکەوت هێرشێکی ناوکی بکات. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت چەند وڵاتی خاوەن چەکی ناوکی کەم بێت ئەوەندە جیهان سەلامەتر دەبێت.

چڕکردنەوەی ژمارەی وڵاتی خاوەن چەکی ناوکی سوودی سەربازی و سیاسیی ئەو وڵاتانەشی زیادکرد کە پێشتر پێش ئەو پەیمانە خاوەنی ئەو چەکان بوون، هەروەها لە کاتی جەنگی ساردا خاوەنی گەورەترین کۆگای چەکی ناوکی جیهانی ویلایەتە یەکگرتووەکان و یەکێتیی سۆڤیەت بوون. بمانەوێ و نەمانەوێ، زۆربوونی خێرای چەکی ناوکی سەلامەتی جیهان کەم دەکاتەوە، بە دڵنیایەوە هەردووکیان کەمتر بەهێز دەکات، کە ئەمەش هۆیەکی گرینگ بوو، گەر تەنها هۆ نەبێت، خۆشیان بە هەرەوەزی دەهات بۆ هەوڵی وەستاندنی چەکی ناوکی. بۆ گەیشتن بەو ناڕەزاییەی کە NPT مومارەسەیەکی دووڕوویی بوو لە بەردەوام بوونی ئەوە کە حکوومەتی هیندستان ناوی لێنا " جوودابوونەوەی چەکی ناوکی " بوو، پەیمانەکە ئەو بەڵێنەی تێدا بوو کە وڵاتانی خاوەن چەکی ناوکی کار بکەن بۆ ئامانجی نەهێشتنی چەکی ناوکی خۆیان، بەڵام ئەوە شتێکی ڕووکەش بوو نەوەك بەشێکی گرێدراو بە سیستەمی زۆرنەبوونیی خێرای چەکی ناوکی.

بە مەبەستی سنوور دانان بۆ خێرا زۆربوونی چەکی ناوکی، ئەوانەی کە زۆردەبن بە شێوەیەکی نارەسمی دابەشکراوان بەسەر سێ پۆلدا: ئەوانەی کە سیاسەتی دژی زۆربوونی چەکی ناوکی ناوەوەیان بۆ دانرا بۆ ئاسانکردنی داوا بۆ چەکی ناوکی. ئەوانەی کە جەختیان لە سەر ڕەتکردنەوەی خەزنکردنی ئەو چەکانە بوو، پۆلی سێیەمیش، بۆ ئەو وڵاتانە بوو کە وڵاتە لیبراڵییەکانی ڕۆژئاوا هەردوو هەوڵی بەکاربرد، بەڵام لەو شوێنانە قەدەغەکردن کەمتر بوو لەچاو دووەکەی تر.

پۆلی یەکەم پێکهاتبوو لە هاوپەیانە ئەمریکییەکان. ئەمە ئەو وڵاتانە بوون کە هەردوو پاڵنەریان هەبوو، هەڕەشەیەك لە دوژمنی چەکی ناوکی، هەروەها دەرفەتی بەربەرەکانی پێویستی تەکنیکی بۆ دەستەبەرکردنی چەکی ناوکی خۆیان، بەڵام وایان هەڵبژارد وانەکەن، چونکە پاراستنی چەکی ناوکیان وەرگرت لە ویلایەتە یەکگرتووەکان. ناتۆ و پەیمانی ئاسایشی ئەمریکاو ژاپۆن (هەروەها بۆ ڕادەیەکی کەمتر هاوپەیمانی شیوعی سۆڤیەت لە کاتی جەنگی ساردا) ئالیەتی زۆرنەبوونی چەکی ناوکی بوون. کاتێ یەکێك لەو دوو مەبەستەی سیاسەتی ئەمریکای جەنگی سارد کە سەبارەت بە سیاسەتی قەدەغەکردنی دەبڵ بوو لە ئەورووپا و ئاسیا پاراستنی یەکێتیی سۆڤیەت بوو لە چەکی ناوکی، ئەوەکەی تر قەدەغەکردنی ئەڵمانیا و ژاپۆن بوو لە دەستبەرکردن، تەنانەت ئارەزووی ویستنی چەکی ناوکیان قەدەغە کرد. ئەڵمانە رۆژئاواییەکان و ژاپۆنییەکان خۆشیان دەهات بە پابەند بوون بە پەیمانی NPT، چونکە ویلایەتە یەکگرتووەکان چەکی ناوکی ئەوانی پاراست.

کۆششی جەنگی سارد بۆ بەرەو پێشبردنی قەدەغەی چەکی ناوکی بە هۆی پشکەشکردنی هاوپەیمانەکان بۆ مسۆگەرکردنی و بەدیلێك بۆ چەکەکان خۆیان سەرکەوتنێکی جیهانیان بەدەست نەهێنا. چین قایل نەبوو بەوەی لە ژێر چەتری چەکی ناوکی یەکێتیی سۆڤیەت پەناگەی هەبێت. بێجینگ چەکی ناوکی خۆی گەرەك بوو، و کاتێ سەرکردایەتی سۆڤیەت بەڵێنی دابینکردنی یەك چەکی ناوکیان شکاند، چینییەکان خۆیان بۆمبیان دروستکرد. لەگەڵ کەمپی رۆژئاوا فەرەنسییەکانیش چەکی ناوکی تایبەت بەخۆیان دەستەبەرکرد. مەبەستیان ئەوە بوو کە نەیاندەتوانی پشت ببەستن بە پاراستنی چەکی ناوکی ئەمریکا، چونکە هەرکە یەکێتیی سۆڤیەت ناوەندەکانی دەستەبەرکرد بۆ هێرشکردنە سەر ویلایەتە یەکگرتووەکان، بەرگریکردن لە فەرەنسا بۆردوومانێکی تۆقێنەری قەرەبووی باکووری ئەمریکای گەرەك بوو. ئەمەش ماقوڵ نەبوو، فەرەنسییەکان وتیان ئایا واشنتۆن لە ترسی ئیبادەکردنێکی وادا نیۆیرك دەپارێزێت یان پاریس.

بەڵام ئەمریکییەکان زەمانەتیاندا بە ئەڵمانیا و ژاپۆنی بێ چەکی ناوکی بۆ پاراستنیان، کە ئەمەش گرینگ بوو بۆ یەکگرتنی تەواویان لە دوای جەنگی وڵاتە لیبراڵییەکانی ناوەوەی رۆژئاوا، لەکاتێکدا هێزەکەی، لە بەرابەردا، پەیوەندییەکی زۆری هەبوو بە سەرەنجامەکانی جەنگی سارد. لەبەرئەوەی هاوپەیمانێتییەکانی ئەمریکا لەگەڵ ئەڵمانیا و ژاپۆن سەلمێنرا لە جەنگی



سارد، کۆتایی ئەو ململانێیە ئەوانی خستە مەترسییەوە، کە هەڕەشەی لەو بەربەستە سەرەکییە کرد لە دەستەبەرکردنی چەکی ناوکی. بابەتی هەرە سەرەکی سیاسەتی ئاسایش لە ئەورووپا و ئاسیای ڕۆژهەڵات لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی سارد ئەو هەوڵە بوو هەمیشە ئاوا بە ئاشکرایی نەخراوەتەڕوو، بۆ پاراستنی ئەو ڕێکخستنانە لە شوێنی خۆی کە ئەڵمانیا و ژاپۆنی هێورکردەوە لە وەسوەسەی چەکی ناوکی.

لە کۆتایی جەنگی ساردا، یەکێتیی سۆڤیەت موقابیلی ئەڵمانیا و ژاپۆنی نەبوو، ئەو هاوپەیمانە ڕاستەقینەی کە، بۆ پاراستنی خۆی، گەر وا بکەن، هەردوو وڵاتە سەرەکییەکەی چەکی ناوکی دەکردە بەربەرەکانی یەکتر لە هێزدا، بەڵام ڕووخانی یەکێتیی سۆڤیەت ئەرکی دوای جەنگی سارد خراپترو ئاڵۆزتر کرد بۆ نەهێشتنی بڵاوبوونەوەی چەکی ناوکی. بووە هۆی بێهێزبوونی سەردەمی کۆنترۆڵی سۆڤیەت لە سەر مەوادی ناوکی کە بەسەر یەکدا کەڵەکە ببوو لە نێو سنووری سۆڤیەتی پێشوو و کەمکردنەوەی کاریگەری مۆسکۆ لە سەر ئەو وڵاتانەی کە تموحی چەکی ناوکیان نیگەرانتر بوو بۆ ڕۆژئاوا.

لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا، سەرەڕای تموحەکەیان، هیچ یەکێك نەیارانی چەکی ناوکی سەرنەکەوتن لە پڕکردنی خۆیان بەو چەکانە. ئەو وڵاتانەی کە پەیوەندیان بە یانەی ناوکی کرد سەر بە پۆلێکی جیاواز بوون و بابەتی کۆمەڵە سیاسەتێکی جیا بوون. پۆلەکە هەتیوەکان بوون، هەروەها هیندستان و پاکیستان و ئیسرائیل و کۆریای باشوور و تایوان و ئۆکرانیا و باشووری ئەفریقیای گرتەوە، شتگەلێکی هاوبەشیان هەبوو.

هەموویان جگە لە ئۆکرانیا هۆی خۆیان هەبوو، لە کاتی جەنگی ساردا، بۆ ڕەچاوکردن بە جدی لە دەستەبەرکردنی چەکی ناوکی، چونکە ئەوان بەرەنگاری ئەو هەڕەشانە کردەوە کە چەکی بایەلۆژی یارمەتی دەر دەبوون، گەر پێویست نەبێت بەردەوام لە چاودێریدا بن. لە سەرەنجامی جەنگی ساردا، هەموویان هەندێ پەیوەندیان بە ویلایەتە یەکگرتووەکان هەبوو، بەڵام هیچ کامیان هەستی بە متمانە نەدەکرد لە پلەی پاراستنی ئەمریکا لە چەکی ناوکی کە هاوپەیمانەکانی ناتۆ و ژاپۆن پەیوەندیان پێوە کرد بوو. ئەڵمانیا و ژاپۆن بە چالاکی ویلایەتە یەکگرتووەکانیان بەکاربردووە. بۆ مەبەستی ستراتیژی ئەندامی خێزانەکە بوون. ناوچەکانیان پەیوەندییان بە هەمان زەمانەت کرد بۆ پاراستنەکە، بە گوێرەی ئەوەی حکوومەتی ئەمریکی وتی، هەروەك یەك لە پەنجا ویلایەتەکەی ئەمریکا. هەتیوەکان، بە پێچەوانەوە، لە دواجاردا

دەبوایە پشت ببەستن بە سەرچاوەکانیان بۆ بەیەکگەیشتنی ئەو هەڕەشانەی کە دووچاری دەبوونەوە.

سیاسەتی چەکی ناوکیان بەرفراوان و هەمەجۆر بوو. لە سەرەتای نەوەدەکان هیندستان و پاکیستان پەرەیان بە پرۆگرامی چەکی ناوکیدا، بەڵام هیچ کامیان بە ئاشکرا بۆمبێکیان تاقی نەکردەوە، لە هەشتاکان هەردووکیان وایان کرد، ئیسرائیل وا پێشبینی ئەوەی لێ دەکرا کۆگایەکی گەورەی بۆمبی هەبێت کە حکوومەتەکەی بەئاشگرا دانی پیا نەدەنا. کۆریای باشوور و تایوان دەستیان بە پرۆگرامی چەکی ناوکی کرد لە حەوتاکان، بەڵام دەستیان لێ هەڵگرت لە ژێر فشاری ویلایەتە یەکگرتووەکان. ئۆکرانیا بەشێك لە کۆگایەکی گەورەی چەکی ناوکی یەکێتیی سۆڤیەتی بۆ ماوەیەکی کاتێ سەربەخۆیی خۆی وەرگرت لە ١٩٩١، بەڵام لە کۆتاییدا چەکەکانی گەڕاندەوە بۆ ڕووسیا، وڵاتی جێگرەوەی ڕووسیا کۆگایەکی شەرعی هەموو ئەو چەکانەی نیشاندا. ئەفریقیای باشوور هەندێ بۆمبی دروستکرد، بەڵام کاتێ گۆڕانێکی ڕادیکاڵی ڕوویدا لە سیاسەتی ناوخۆیدا لەگەڵ وازهاوردەی سیاسەتی جوداکردنەوە ڕەچەڵەك حکوومەتەکەی ئەو بۆمبانەی تێك و پێك شکاند.

ویلایەتە یەکگرتووەکان دژی دەستەبەرکردنی چەکی ناوکی وەستایەوە لە لایەن هەریەکێك لەو هەتیوانە. هاوکاری سەربازی و یارمەتی سەربازی دابینکرد بۆ هەریەکەیان لە هەر کاتێك لە کاتەکان، بەڵام بە هیچ شێوەیەك واشنتۆن خۆشی بەوە نەدەهات بچێت تاوەکو زەمانەتی بێ مەرج بکات دژی ئەو هەڕەشەیە کە ئەو بەرژەوەندییەی لە سەر وەستا بوو.

ویلایەتە یەکگرتووەکان پرسە ستراتیژییەکانی هەتیوەکانی پشت گوێ نەخست. واشنتۆن بە نیازی چارەسەرکردنی ئەو پرسە سیاسیانەی کە تموحی چەکی ناوکی ئەوانی بەرزکردەوە بوو لە ڕێگای دیپلۆماسییەوە. پەرەی بە کۆششە بەردەوامەکانی دا بۆ هێورکردنەوەی ئیسرائیل و دراوسێ عەرەبەکانی و هاوکات هەوڵی هێورکردنەوەی نێوان هیندستان و پاکیستانی دا. چەند دانووسانێکی لەگەڵ ئۆکرانیا و ڕووسیا کرد کە بووە هۆی گواستنەوەی چەکی ناوکی سەردەمی سۆڤیەت لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر. سیاسەتی ئەمریکا سەبارەت بە چین و کۆریا، هەرچەندە بە تووندی پشتیان بەست بەسەر قەدەغەکردن، دوا مەبەستی خۆیان هەبوو کۆتایی ململانێکانی نێوان چین و تایوان هەروەها نێوان کۆریای باکوور و باشوور بوو، بەڵام کاتێ دوا پاڵنەری خۆیان پێشکەشکرد، هیچ کامیان ئیختیاری ویلایەتە یەکگرتووەکان نەبوو بۆ ئەوەی بەهێزترین



گەمارۆی بەسەردا بسەپێنێت. خۆشی بەوە نەدەهات بۆ بەکارهاوردەی یان هەڕەشەکردنی بەکارهاوردەی هێز بۆ ڕەتکردنەوەی چەکی ناوکی بۆ هەتیوەکان، هەروەك وابوو لە حاڵەتی سێیەم پۆلی ڕکابەری ناوکی ئەویش وڵاتە زەبەلاحە ترسناکەکان بوون.

لە حاڵەتی هەتیوەکاندا، ڕەتکردنەوەی جبەخانەی چەکی ناوکی کەمتر بە پەلە بوو، چونکە ئەو وڵاتە بێکەسانە کەمتر هەڕەشەی چەکی ناوکیان هەبوو لەوانەی هاوپەیمانەکان یان تاوانباران، جیاوازی گرینگی نێوان هەتیوەکان و هاوپەیمانەکان جیاوازییەکی جوگرافی بوو. هاوپەیمانەکان دەکەونە جەرگەی جیهان، لە دڵی سیستەمی نێودەوڵەتی بوون. دەستەبەرکردنیان بۆ چەکی ناوکی هاوسەنگی هێزی سەربازی دەگۆڕی لەو شوێنەی هێز لە لووتکەدا بێت. وەك ڕێکخستنەوەی دەزگاکانی بیناکردن، ئەمە مەترسی ئەوەی نایەوە کە تەواوی پێکهاتەکە زەوی تەخت بکات و بۆیە گەر بکرێت قەدەغەبکرێت بە هەموو شێوەیەك.

لە تەمەنی مووشەکی بالیستیکدا، بێگومان، دووری بە هۆی تەکنەلۆژیاوە زاڵ دەبوون بەسەری. هیچ لەو هەتیوانە نەدەگەیشتنە ئەمریکای باکوور بە چەکی ناوکی گەر مووشەکی بالیستیکیان هەبێت بۆ مەودایەگی گونجاو، هەروها گەلێ لەو وڵاتانە پرۆگرامی چالاکیان هەبوو بۆ پەرەپێدانی مووشەکی بالیستیك. ئەوەی ئەوانی لە ترسناکەکان جیاکردەوە، ئەوەی وای کرد تموحی ئەوان بۆ چەکی ناوکی کەمتر جاڕسکەرتر بێت لەو وڵاتەکانی جەرگەی جیهان سیاسەت بوو. بە بەکارهاوردەی سیاسەت خۆزگەیان خواست سوپایەکی ناوکی پێك بهێنن جیا لە سوپاکانی تر کە لە ڕاستیدا پێناسەی پۆلی سێیەمی جەنگی ساردی کرد ئەویش بەبەرەکانی ناوکی بوو.

فیکرەی وڵاتێکی ترسناك و زەبەلاح لە وشەی فیلی زەبەلاحەوە هاتووە، بەو فیلە دەڵێن کە لای داوە لە ڕەوەی فیلەکان و هەڵسوکەوتی دڕندانەو وێرانکەر دەکات. زەبەلاحی ترسناکی سیاسی بە هەمان شێوە لە هەردوو ڕووی سیاسی دوورەپەرێز بوو و لە ڕووی سەربازیش ترسناك بوو.

پۆلی وڵاتە زەبەلاح و ترسناکەکان، وەك غەریزە سیاسییەکانی تر، دامەزرا لە لایەن وڵاتانی لیبراڵی ڕۆژئاوای جیهان، وڵاتی گەورە نەبوو. ئێران و عێراق و کۆریای باکوورو لە هەندێ ڕووش سووریا و لیبیای دەگرتەوە. هەموویان جگە لە ئێران پەیوەندییەکی جەنگی ساردی بە جۆرێك بە یەکێتیی سۆڤیەتەوە هەبوو، کە جارێك پێوەرێکی کاریگەری بەسەر بەخشی بە مۆسکۆ بەسەر حکوومەتەکانیان کە دەکرێ لیست بکریت لە بەر هۆی سنووری ناوکی. لەگەڵ ڕووخانی یەکێتیی

سۆڤیەت،کە ڕووداوێکی کاریگەرو بوو، هەر وەك خۆی نەما: وڵاتە زەبەلاحە ترسناکەکان 'هەتیوە' دۆڕاوەکانی جەنگی سارد بوون.

لە ڕوانگەی ڕۆژئاوا بە تایبەتی ئەمریکا، مەبەستی سەرەکی سیستەمی زۆرنەبوونی چەکی ناوکی بۆ ڕەتکردنەوەی چەکی ناوکی بوو لە بەر گروپە بچووکەکان. وەك ئەوەی لەگەڵ هاوپەیمانەکان و هەتیوەکان، هەروەها لەگەڵ پێداویستییە گشتییەکانی تری دوای جەنگی سارد، ویلایەتە یەکگرتووەکان گەورەترین حیسەی ئەو پرسەیەی ڕەچاوکرد. هەروەها زۆرنەبوون لە سەر پێداویستی گشتی نێودەوڵەتی بوو کە خەڵکی گشتی ئەمریکا هیچ هەستێکی نە خراپ نە باشیان نەخستە ڕوو دەربارەی خەرجییەکەی. باجی بۆ چاو و گوێی سیستەمی زۆرنەبووندا. ئامێری زەبەلاحی کۆکردنەوەی هەواڵگری ئەمریکا دروست بوو لە کاتی جەنگی سارد بۆ چاودێریکردنی یەکێتیی سۆڤیەت، کە لە سەرەنجامی ڕووخانی یەکێتیی سۆڤیەت بە زۆری ڕاهێنران لە سەر چالاکییە ناوکییەکانی وڵاتە زەبەلاحە ترسناکەکان. ویلایەتە یەکگرتووەکان بوو زەنگی ئاگادارکەرەوەی لێدا دەربارەی پرۆگرامی چەکی ناوکی کۆریای باکوور، هەروەها لە نەوەدەکان چاویشی هەر لە سەر پەرەی ناوکی سەدام حوسێن بوو. تا ئێستا ئەوو سیستەمە ددانی هەیە شتەکان بگرێت، ئەو دوانە بە زۆری لە لایەن ویلایەتە یەکگرتووەکان دابینکران. لە جەنگی دژی عێراق لە ساڵی ١٩٩١ کە بە شێوەیەکی ڕەسمی بەرپابوو بۆ وەدەرنانی سوپای عێراقی لە کوێت، هێزەکانی هاوپەیمانان بە سەرکردایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەو هەلەی هەڵقۆستەوەو پێگەکانی پرۆگرامی چەکی ناوکی بەغدادی بە خراپی وێران کرد. هەروەها ویلایەتە یەکگرتووەکان ئامادە بوو بچێتە شەڕ لە سەر نیمچە دوورگەی کۆریا لە ساڵی ١٩٩٤ لە سەر پرۆگرامی چەکی ناوکی کۆریای باکوور.

لە سێ دەیەی یەکەمی ووجودەکەیدا، سیستەمی زۆرنەبوون زۆر بەچاکی نمایشکرا. لە ساڵی ١٩٦٣ پێنج ساڵ پێش ئەوەی پەیمانی NPT واژۆ بکرێت، سەرۆك جۆن ئێف کەنەدی پێشبینی کرد کە لە ساڵی ١٩٧٥ پانزە تا بیست وڵاتی خاوەن چەکی ناوکی دەبێت. بیست و پێنج ساڵ دواتر لەو ڕۆژەی ئەو ئاماژەی پێدابوو، تەنها حەوت هێزی ناوکی ئاشکرا هەبوو، کەمتر لە نیوەی ئەو ژمارەیەی ئەو مەزەندەی کرد، هیچ کام لە زەبەلاحی ترسناکەکان نەیانتوانی بۆمبێك دەستەبەربکەن.



بەڵام لە سەردەمی دوای جەنگی ساردا، هەمان پلەی سەرکەوتن مسۆگەر نەکرا. ئەو هێزانە لە بەرژەوەندی بڵاوبوونەوەی چەکی ناوکی خۆراگر بوون و دوور بوون لە بەهێزی. وەك ئەو کاشیانەی لە لێواری دیواری دەریاکان بەدیار دەکەون، ئەو هێزانە هەموو شتێك دەکەن بۆ داماڵینی بەربەستەکانی بەردەمیان گرینگ نییە بە هەر شێوەیەك بێت بپارێزرێن.

ئیشکردن دژی بەربەستە دەستکردەکان بۆ زۆربوونی خێرای چەکی ناوکی، پاش هەموو شتێك، کۆنترین و دەستهەڵنەگرترین پرۆسەی کۆمەڵایەتییە، ئەویش مانتۆری مێژووی مرۆڤ خۆی بوو: بڵاوبوونەوەی داهێنان لە وڵاتانی ناوەی جیهان بۆ دەرەوە. زۆربوونی خێرای چەکی ناوکی تەنها یەکێك لە هەرە کاریگەترین نموونەی سەرەکی ئاراستەکانی سەدەی بیست بوون. بڵاوبوونەوەی داهێنان ئەو بۆشاییەی لە هێز لە نێوان ناوەوە و دەروە تەسك کردەوە. گەلە تەقلیدییەکانی جیهان لەو دیو ئەوروپای ڕۆژئاوا وڵاتی مۆدێرن و ئامێرە جەنگییە مۆدێرنەکانیان بەکاربرد تاوەکو سەروەری سەربەخۆیی خۆیان بەدەست بێننەوە. چەکی ناوکی بەهێزترین ئەو ئامێرانە بوون.

چەکی ناوکی وا بە ئاسانی وەك دەبابەو ڕەشاش نەدەفرۆشرا یان لەبەری نەدەگیرایەوە، بەڵام هەرچەند سادە نەبوو، هیچ تەکنەلۆژیایەکی پەیوەست بەوە نوێ نەبوو. لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا، بۆمبەکە تەمەنی پەنجاو و پێنج ساڵ بوو، مووشەکی بالیستیك کەمێك لەو گەنجتر بوو. ئەو بنەما فیزیکییەکانی کە بۆمب لە سەری وەستا بوو ناسراو بوون. دروستکردنی یەکێك پێیەکی ئەندازیاری بوو، زەحمەت بوو، بەڵام مەحاڵ نەبوو. هەر وڵاتێك نیازی کردنی ئەو کارەی هەبوایە دەیتوانی شتی گەورە فێر بێت و دەزگایەکی زانستی بکاتەوە. هەمان شتیش ڕاست بوو بۆ مووشەکی بالیستیك. ئەوە عادەتی ئەمریکی بوو لە سەر ئەرکێك کە زۆر پسپۆری و مەشقی نەویستبا دەیانووت خۆ زانستی مووشك نییە، لە سەدەی بیست و یەکدا، تەنانەت زانستی مووشەکیش ئەوەندە باوی نەما.

هەروەك لەگەڵ ململانێی سیاسی نێوان چین و تایوان و لە نێوان هەردوو کۆریادا، کۆتایی جەنگی سارد کێشەی زۆربوونی خێرای چەکی ناوکی خراپتر کرد. ڕووخانی یەکێتیی سۆڤیەت، ئەو کۆنترۆلە توندانەی شلکردەوە لە سەر قەدەغەکردنی چەك و کەرستەی خاو، لە سەر کارمەند لەگەڵ پسپۆری زانستی و تەکنیکی بۆ بەرهەمهاوردەیان. تەنها ئەوە نەبوو کە ئەوان ئازاد بوون لەو جۆرە سنوورانە، کە تەنها حکوومەتی تۆتالیتاری دەیتوانی ئەوە بسەپێنێ، بەڵام کەرستەی

چەکی ناوکیش مەبەستی سیاسی و بازرگانی نێودەوڵەتی بوون. چین یارمەتی پرۆگرامی چەکی ناوکی پاکیستانی دا ئەمەش لە بەر کۆنترین هۆی جیۆپۆلوتیکی: بۆ ئەوەی دژی ڕکابەرە گشتییەکەی بوەستێتەوە ئەویش هیندستان بوو، بەڵام کۆریای باکور بە سادەیی بازرگانی بە مووشەکی بالیستیك کرد بۆ بەدەستهاوردەی پارە. بۆ ڕووسیای دوای یەکێتیی سۆڤیەت، هەناردنە دەرەوەی تەکنەلۆژیای مووشك و چاندنی چەکی ناوکی سەرچاوەیەك بوو بۆ داهات بۆ وڵاتێك کە زۆر کەم شتی دروست دەکرو وڵاتانی تر کڕیار بوون. سیستەمی زۆرنەبوونی چەکی ناوکی دارێژرا بۆ نەهێشتنی ئەو جۆرە گواستنەوانە و تۆمارێکی بەرچاویشی هەبوو لەم بارەیەوە، بەڵام ڕوانگەیەکی بوونیاتنەر لە سەر تێروانینە مەودا درێژەکەی دابینکرا لە لایەن کۆششێکی زۆر ماندووهەڵگر کە بە نیوە تەواوی سەرکەوتنی بەدەستهێنا بۆ وەستاندنی ئاودیوکردنی مادەەی نایاسایی تر کە ئەویش نارکۆتیك بوو (Narcotic). جەنگی ڕۆژئاو دژی ماددەی بێهێشکەری نایاسایی یاسایەکی نیمچە جیهانی کاروباری مرۆیی خستەڕوو: لە هەر شوێنێك داوا هەبێت دابینکردنیش دەبێت. هیچ گومانی تێدا نییە حکوومەتەکان دەتوانن زیاتریش ئامادە بن چاودێری و سەرکوتی دەستەبەری کەرستەی ناوکی بکەن لەوەی ئاودیوکردنی کۆکاین لە ئەمریکای لاتین بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان، بەڵام خاڵی گشتی پەیوەست بوو بە هەموو لایەك.

ئەو وڵاتانەی کە بە سەرکەوتوویی سووکایەتیان بە سیستەمی زۆرنەبوونی چەکی ناوکی کرد و چەکی ناوکیشیان دەستەبەرکرد، وێڕای ئەمە، هیچ جۆرە سزایەکیان بۆ دەنەنرا لە هەمبەر ئەنجامدانی ئەم کارەیان و هیچ ئازارێکیشیان نەخوارد. هیچ کامیان لە سەر ئاستی نێو دەوڵەتی سەرزەنشت نەکراو هەر ئاوڕیشی لێ نەدرایەوە. هیچ کامیان لەوەو پێش بازاڕی خۆیان وا بە کەم سەقامگیری نەبینی بوو. بە پێچەوانەوە، ئامانجە ستراتیژییەکانی ئەوانەی چەکی ناوکیان دەستەبەرکرد و بۆمبیشیان دروستکرد لە سەردەمی جەنگی ساردا بە زۆری بەدیهێنران. وێرانکردنی هیرۆشیما و ناگاساکی یارمەتی دەر بوو بۆ قایل کردنی ژاپۆن بۆ ملکەچکردنی لە ساڵی ١٩٤٥. هەروەها چەکی ناوکی یارمەت دەر بوو کە وای لە یەکێتیی سۆڤیەت کرد یەکسان بێت لە ڕووی هێزی سەربازییەوە لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکان. یارمەتی چینیان دا بۆ نەهێشتنی هێرشی سەربازی کتوپڕ لە لایەن یەکێك لەو دوو زلهێزە. نەبوونی خاوەنێتی نادووپاتکراو سوودی زۆری گەیاند بە ئیسرائیل. هەڕەشەی پەیوەندیکردن بە یانەی ناوکی وای لە کۆریای باکوور کرد بایەخ بدات بە سەرەنجی سیاسی یارمەتی ئابووری، بە نەبوونی ئەو هەڕەشەیە



ڕژێمی کیم سونگی دووەم و کوڕەکەی ڕەنگە بە چاکی پەیوەندیان کردبا بە زۆربەی ڕژێمە مارکس و لینینەکانی جیهان کە لە خرت و خاڵی مێژوودا بوون لە سەدەی بیستەمدا.

لە ڕوانگەی وڵاتە زەبەلاحە ترسناکەکاندا، داوای ئەوان بۆ چەکی ناوکی، بە تەواوی ئاشکراو یەکسان بوو. ڕەنگە سەدام حوسێن ڕەنگدانەوەی ئەوە بێت، گەر خاوەنی بۆمب بایە پێش ئەوەی فەرمان بکات بە داگیرکردنی کوێت لە ساڵی ١٩٩١، ئەوا سەرکەوتووتر دەبوو. ئەو بڕیارەی لە لایەن ویلایەتە یەکگرتووەکان و شەریکی هاوپەیمانەکانی بۆ وەدەرنانی سەربازەکانی بەزۆری زەحمەتر دەبوو گەر بیریان لە شیانی هێرشێکی ناوکی کردبوایەوە بۆ سەر هێزەکانیان. حاڵەتی عێراق زۆرترین مشتومڕ هەڵدەگرێت وەك هێزێکی ناوکی، چەکی ناوکی بێهێزەکان بە هێز دەکەن بە هۆی ڕێگەدان بە وڵاتێکی خاوەن ئەو چەکە بۆ بازدان بەسەر قۆناغە ئاساییەکان لە کۆکردنەوەی هێزی سەربازیدا. ناوەندی خێراو ئاسانیان دابینکرد بۆ شتێك کە بە بەرفراوانی ئارەزووی لە سەرە، کە هەردووکیان حیساب دەکات بۆ داوایان و بۆ سووربوونی بەهێزەکان بۆ نەهێشتنی بڵاوبوونەوەیان.

پاش هەموو شتێك، لە کۆی نزیکەی ٢٠٠ وڵاتی زلهێزی خاوەن سەروەری لە سیستەمی نێو دەوڵەتیدا، زۆربەیان بێهێزن نەك بەهێز. بۆیە، لە سەرەنجامی جەنگی ساردا، وڵاتە لیبراڵییەکانی ناوەوەی جیهان، لە سەرووی هەموویانەوە ویلایەتە یەکگرتووەکان، دڵنیا نەبوون لە ژێرکەوتنی نەهێشتنی سیستەمی زۆرنەبوونی چەکی ناوکی، کە بۆ ئەم مەسەلەیە سێ وەڵامی فراوان هەبوو. یەکیان قەدەغەکردن بوو، هەوڵێك و میتۆدێکی ڕاستی مامەڵەکردن بوو لەگەڵ وڵاتە دڕندەکانی خاوەن چەکی ناوکی. دووەم ڕێگای کۆپی کردن لەگەڵ زەبەلاحی ترسناکەکانی خاوەن چەکی ناوکی، بەرگری بوو دژی چەکە ناوکییەکەیان. ویلایەتە یەکگرتووەکان و یەکێتیی سۆڤیەت شمشێری پێشتری بەرگریان هەبوو دژی مووشەکە بالیستیکییەکانی ئەوانی تر لە ڕێگای پەیمانی ABM ساڵی ١٩٧٢، چونکە هەریەکەو هات و ئەو بەرگرییەی لە ڕووی تەکنیکییەوە بە مەحاڵ و لە ڕووی ستراتیژیشەوە بە ناپێویست دانا. بوژاندنەوەی بەرژەوەندی ئەمریکا بۆ بەرگری مووشەکی بالیستیك لە سەرەنجامی جەنگی ساردا، هەروەها ڕاگەیاندنی دیسێمبەری ساڵی ٢٠٠١ کە ویلایەتە یەکگرتوەکان لەگەڵ پاشەکشەکردن بوو لە پەیمانی ABM لەو گریمانەیە سەری هەڵدا کە بەرگریکردن لە دژی زەبەلاحی ترسناکەکان هەم پێویست و هەم مەحاڵیش نەبوو بەڵمو ڕێی تێدەچوو. بە نامەحاڵ دادەنرا، چونکە جبەخانەی چەکی ناوکیان بچووك بوو کە دەکرا

بەرگری کاریگەر لە دژیان بکرێت، هەروەها پێویست بوو لەبەر ئەوەی حکوومەتەکانی ئەو وڵاتانە ناجێگیرو نەبەربینبار بوو، ئەوەندش ڕەق بوون کە قەدەغەکردن ڕەنگ بوو بەدەستیان نەهێنێت وەك ئەوەی یەکێتیی سۆڤیەت هەیبوو. سێیەم ڕێگای کۆپی کردن لەگەڵ تموحی چەکی ناوکی وڵاتە زەبەلاحە ترسناکەکان بەکارهاوردەی هێز بوو دژی چەکە ناوکییەکانیان. ئەمە کارێکی وا ئاسان نەدەبوو. وا بە سادەیی بۆمبکردنی چەکی ناوکی بۆ وڵاتی مەبەست بەس نابێت. داگیرکردن و دەست بەسەرداگرتن ڕەنگە پێویست بکات. ئایا داوای هاوکاری سیاسی بۆ ئەم بەرپرسیارێتییە دەبێت لە کۆمەڵگای نێودەوڵەتیدا، یان لە نێو وڵاتە ڕۆژئاواییەکانی ناوەوەی جیهان تەنانەت لە ویلایەتە یەکگرتووەکانیش، ناکرێ پێشبینی ئەوە بکرێت، بەڵام حکوومەتی ئەمریکی، سەرنجی ئەوەی دا کە ئامادەیە بۆ ڕەچاوکردنی قەدەغەکردن. لە وتارەکەیدا، لە یونیەن ئەدرێسدا لە ٢٩ مانگی یەکی ٢٠٠٢ دا سەرۆك جۆرج دەبلیو بۆش ئاماژەی بە سێ دەوڵەتی زەبەلاح و ترسناك کرد لەگەڵ دەستەبەرکردنی چەکی ناوکی ئەوانیش ئێران و عێراق و کۆریای باکوور بو، وەك شەریکی شەڕانگێزی شەیتان بوون، وتی حکوومەتەکەی لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو سێ دەوڵەتەدا گۆڕێك و مەترسییەکی گەورە دەخاتە ڕوو.

***ئەمریکا ئەوەی پێویستە دەیکات بۆ دووپاتکردنەوەی ئاسایشی نەتەوەییمان. ئێمە بە ئەنقەست و وورد دەبین، بەڵام ئێستا کات لە بەرژەوەندی ئێمەدا نیە. من چاوەڕێی ڕووداوەکان ناکەم، کاتێ مەترسییەکان کۆدەبنەوە. من لە نزیکەوە ناوەستم، هەرکە مەترسی نزیکتر و نزیکتر دەبێتەوە. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕێگە نادات بە ترسناکترین ڕژێمەکانی جیهان هەڕەشەمان لێ بکەن بە وێرانکەرترین چەکی جیهان.***

سیستەمی زۆرنەبوونی خێرای چەکی ناوکی کاردەکات کاتێ ڕووبەڕوو دەبێتەوە لەگەڵ وڵاتی زەبەلاحی ترسناکی خاوەن چەکی ناوکی، ئەمە یەکێکە لەو پرسانەی کە تەنها خودی ئەزموون دەتوانێ وەڵامی بداتەوە. بەهەمان شێوە پرسیارێکی تری پەیوەست بەم بابەتە: کاریگەری بەکارهاوردەی تەواوی هێزی چەکی ناوکی (کە جیهان توانی لاییبات بۆ تەواوی سەدەی بیستەم پاش هێرشی ئەمریکا بۆ سەر ناگاساکی لە مانگی هەشتی ٩، ١٩٤٥)؟ گەر ئەمە ڕوویدات لە دەرەوەی وڵاتانی جەرگەی جیهان، گەر ئاڵوگۆڕێکی ناوکی هەبێت لە نێوان هیندستان و پاکیستان، بۆ نموونە، ڕەنگە مامەڵەی لەگەڵ بکرێت لە لایەن وڵاتانی جەرگەی جیهان بە هەمان شێوەی زۆربەی ئاژاوەکانی دوای جەنگی سارد لە وڵاتانی دەرەوەی جیهان. ڕەنگە هەمان





کاریگەری هەبێت وەك تیفۆن لە بەنگلادیش یان جەنگێکی دڕندە لە ئەفریقیا، تۆقێنەر، بە هەقیقەت تۆقێنەر بوو بۆ تەواوی دیکەی جیهان، پێشکەشەکردنی هاوکاری تەندروستی واستەی نێودەوڵەتی، یان هەردووکیان، بەڵام نەوەك ببێتە هۆی گۆڕانی بنەڕەتی لە سیاسەتەکانی ئاسایشی هێزی وڵاتانی جەرگەی جیهان. هەروەك خاسیەتی سیاسی و عاتیفی چەکی ناوکی لە کۆتای سەدەی بیستەمدا، بەڵام، لە ڕووی بەکارهاوردەوە یەکێکیان هێزی ئەوەی هەبوو دووبارە حیساباتی وردی ئەو سیاسەتانە بکاتەوە بەو ڕێگایانەی کە ناتوانرێن ببینرێن و پێشبینی ناکرێن.

هێرشەکانی یانزەی سێپتێمبەر هەرچەند وێرانکەر بوون، چەکی بەکۆمەڵ کوژی تێدا بەکارنەهات. هەروەها بە شێوەیەکی بنەڕەتی جیهانی سەدەی بیست و یەکیان نەگۆڕی. ویلایەتە یەکگرتووەکان وەك کردەی شەڕ مامەڵەی لەگەڵ کردن، کە لە هەقیقەتیش کردەی شەڕ بوون، بەڵام نموونەیەکی پراکیزەکردنێکی تەمەنی کۆنیش بوون کە، وەك نەوت و چەکی ناوکی، وڵاتانی ناوەوەی جیهانی بە دەرەوەی بەستەوە. ئەمانە کردەی تیرۆریزم بوون.

### *تیرۆریزم*

تیرۆریستان بە ئەنقەست هێرش دەکەن بە بێ پێکدادان بۆ مەبەستی سیاسی. هەرچەند فۆرمێکی ململانێی سوپایی پێك دەهێنن، پێشبینی ئەوە ناکەن مەبەستی سەربازی تەقلیدی کۆنترۆلکردنی ناوچەیەك بەدەست بێنن. لە بڕی ئەوە، ئەو گۆڵانەی ئەوان بە نیازن بەدەستی بهێنن سایکۆلۆژیە.

نیازیان ڕاگەیاندنی ئامادەیی خۆیانە و گشتاندنی ئامانجە سیاسییە گەورەکانیانە. کردەی تیرۆری " پرۆپاگەندەن بە کار". بە ئەنجامدانی ئەمەش دەیانەوێ خەڵك لە هەر شوێنێك بن بۆ ئەم هۆیەی خۆیان کۆبکەنەوە، هەروەها هاندانی هەموو ئەوانی کە پێشتر لە ئامێزیان گرتووە. لە هەمانکاتدا، نیازیان هاوردە خوارەوەی مەعنەویاتی دوژمنەکانیانە بەهۆی ترساندنیان، تۆقین، زراوڕشتنیان، ئەمە تیرۆرە. تیرۆریستان هەمیشە نیازیان وروژاندنی بەرپەرچدانەوەیەکی توندە لە هێرشەکانیان، باوەڕیان وایە کە ئەمە دوژمنەکانیان بەدەردەخات (عادەتەن حکوومەتەکان) هەروەك دڕندانە، هەستی گشتی دەشێوینن و، ئەو خەڵکانەی کە پێشتر جیا یان دژی ئەوان بوون بۆ لای کامپی خۆیان دەهێنن.

پراكتیزەكردنی تیرۆریزم زۆر كۆنە. لە چاخی مۆدێرندا زۆرترین و دیارترین هێرشە تیرۆریستییەكان سەركردەی تاكی سیاسی بوون. تیرۆریستان قەیسەرێكی رووسیان كوشت، سەرۆكێكی فەرەنسیان كوشت، سەرۆك وەزیرانێكی ئیسپانیایان كوشت، ئیمپراتۆری نەمسایان كوشت كە ئافرەت بوو، شایەكی ئیتاڵیان كوشت، هەروەها سەرۆكێكی ئەمریكیان لە نێوان ١٨٨١ و ١٩٠١ كوشت. لە سەدەی بیستەمدا، پراكتیزەكردنی تیرۆر گشتی تر بوو. لە دوا چوار دەیەیدا زیاتر لە شەست سەركردەی نەتەوەیی كوژراون، بەڵام، تیرۆریزم لە سەرەتای سەدەی بیست و یەكدا، جیا بوو لە شێوەكانی پێشووتری بە دوو ڕێگای هەرەشەدارەوە.

یەكەم، هێرشە تیرۆریستییەكان كە سەركەوتووبوون مەبەستیان كوشتنی ژمارەیەكی زۆرتری خەڵك بوو لەوەی پێشووتر. هێرشەكانی سەر نیویۆرك و واشنتۆن دی سی یانزەی سێپتێمبەری ٢٠٠١، كە نزیكەی ٣٠٠٠ كەسی كوشت، وەسف دەكرێت بە كوشتارترین كاری تیرۆر كە تا ئێستا ئەنجام درابێت، بەڵام لە دەیەكانی دواتری هێرشەكانی تیرۆریستی، و هەڵمەتی دژە تیرۆر كە ئەوان وروژاندیان، بەدەیان هەزار كەسی كوشت لە كشمیر و جەزائیر و سریلانكا. وێڕای ئەمە، تەوەقوعاتە ئەخلاقییەكانی كە نەوەی پێشتری تیرۆریستانی پێوە بەند بوون دیار نەمان. لە هێرشكردنە سەر بەرپرسان لە ڕژێمی قەیسەردا، ڕادیكاڵە رووسییەكانی سەدەی نۆزدەم هەوڵیاندا خەڵكی بێتاوان هیچی تر بریندار نەكەن. بە پێچەوانەوە، ئوسامە بن لادن، سەرۆكی تۆڕی قاعیدە كە بەرپرس بوو لە هێرشەكانی یانزەی سێپتێمبەری ٢٠٠١، ئەوەی ڕاگەیاند كە كوشتنی ئەمریكییەكان نەك هەر تەنها حەلالە بەڵكو فەرزێكی ئایینیشە لە هەر شوێنێك و لە هەر كاتێكیش بێت شیاوە.

تیرۆریستان چالاكیان كردووە لە هەموو بەشێكی جیهان، بەڵام لە سەرەتای سەدەی بیست و یەكدا زۆربەی چالاكییە تیرۆریستییەكان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە هاتن. هێرشەكانی یانزەی سێپتێمبەر بۆ سەر ویلایەتە یەكگرتووەكان هەر لەوێ سەری هەڵدا. هەرچەندە بنكەی ماڵی قاعیدە ئەفغانستان بوو، سەركردە و پارە و، هەروەها ئەو خەڵكانەی كە ئەو هێرشانەیان جێبەجێ كرد لە جیهانی عەرەبیەوە هاتن. پەیدابوونی قاعیدە بەشێكی ئاراستەیەكی فراوان بوو، كە چووە ئەودیو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئەویش گرێدانی بەستانەوەی نێوانی چەكدارە ئیسلامییەكان بوو بە توندوتیژی.





حیسەیەكی بێ شوماری ململانێ جیهانییەكان لە سەرەتای سەدەی بیست و یەكدا موسڵمانەكانی گرتەوە. ڕەگی ئەو بەستانەوەیە دەكەوێتە ئەو بەشە بەربەرەكانێییەی دڵتەنگی ئیمان لەگەڵ جیهانی مۆدێرن بە تایبەتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. خەڵكی ناوچەكە نەیانتوانی پێشەنگی گۆڕانی جیهانی گەورە لە پێشكەوتنی سیاسی و ئابووریدا، شۆڕشی فەرەنسی و شۆڕشی پیشەسازی، كە ماوەی مۆدێرنی پێناس كرد بن. لە وشەكانی ڕووناكبیری بەناوبانگ بێرنارد لویس دا هاتوە، " بۆ ژمارەیەكی زۆر خەڵكی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ستایلی میتۆدی ئابووری ڕۆژئاوا هەژاری بۆ ئەوان هێنا، ستایلی دەزگای سیاسی ڕۆژئاوا ستەمكاری هێنا، تەنانەت ستایلی جەنگی ڕۆژئاوا دۆڕان شكستی بۆ ئەوان هێنا" ئەم شكستانە، كۆمەڵگاكانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی خستە دواوەی كۆمەڵگاكانی ئەوروپا و ئەمریكای باكوور لە سامان و هێزدا، كێشەیەكی سەرزەنشتكەرانە بوو، بەڵام خەڵكی ناوچەكە بەلایانەوە سروشتی بوو، بە هەقیقەت فەرمانی مەبەستداری شتگەلێك بوون. لە هەزارەی یەكەمی وجوودی ئیسلامدا ئیسلام ئیمانێكی داگیركەربوو. بە پابەنكردنی ڕێساكان لە نیمچەدوورگەكانی عەرەبییەوە دەستی پێكرد لە سەدەی حەڤدەدا، دواتر زاڵ بوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باشووری ئەورووپاو دواتریش بڵاوبۆوە بۆ ناوەڕاستی ئەورووپاو ڕۆژهەڵات و ڕۆژهەڵاتی باشووری ئاسیا هەروەها ئەفریقیاش، بەڵام سەرەتای سەدەی حەڤدەم، خێرابوونی لە سەدەی نۆزدەدا، ئیسلام ساحەكەی لە دەستدا بۆ مەسیحییەتی ڕۆژئاوا. بۆ خستنە سەری ئیهانە بۆ برینداربوون، لە ڕۆژئاوا ئایدیەو پراكتیس هاتن كە گەلێ لە موسڵمانەكان پێیان سەیر و هەڕەشە بوو، تەنانەت پێیان كوفریش بوو، ئەو ئایدیاو پراكتیزانە جیابوونەوەی ئایین بوو لە كاروباری سیاسی و پێداگرتن لە سەر یەكسانی مەدەنی ئافرەت لەگەڵ پیاودا.

هێرشەكانی یانزەی سێپتێمبەری ٢٠٠١، بە هاوبەشی هەوڵەكانی عێراق و ئێران بوو بۆ زاڵبوون بەسەر ناوچەكە لە هەشتاكان و نەوەدەكانەوە پاڵنەرێكی گشتی بوو هەبوو ئەویش: قایل نەبوون بە هێزو كاریگەری ڕۆژئاوا. لەمەوە ئامانجێكی گشتی هاتە كایەوە: لابردنی هێزو كاریگەری ڕۆژئاوا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بە تایبەتی ئەوەی ویلایەتە یەكگرتووەكان. بن لادن دوژمنایەتی سەرەكی ڕاگەیاند لە جەنگەكەی دژی ویلایەتە یەكگرتووەكان بەرامبەر ئامادەبییەكی بچووكی هێزی سەربازی ئەمریكا لە سەر نیمچە دوورگەی عەرەبی.

کاتێ ڕژێمەکانی نیشتمانی عەرەبی وەك ئەوانەی سەدام حوسێن و جەمال عەبزل ناسر بە گوێرەی بنەماکانی عەلمانییەت حوکمیان کرد (کە تا ئێستا هەرگیز بنەمایەکی وایان نەبووە)، تۆڕی قاعیدە خولیاکانی لە لادانێکی ئیسلامەوە وەرگرتووە کە پێی دەووترێت وەهابیزم (Wahhabism)، بیروباوەڕەکانی ئەو وەهابیزمە لە لایەن فەرمانڕەواکانی عەرەبستانی سعودیاوە قارامانانە بووە.

ئەسڵ و ڕەچەڵەکی ڕژێمی سعودی دەگەڕێتەوە بۆ هاوپەیمانێتییەکی سەدەی هەژدەم لە نیمچە دوورگەی عەرەبی لە نێوان عەشیرەتی سعوود و خاچپەرستێکی دیندار بەناوی کوڕی عەبدول وەهاب. عەبدول وەهاب فۆرمێکی خراپی لە ئیسلام دەووتەوە کە دەگەڕێتەوە سەر ڕەچەڵەکی ئیمان کە لە سەدەی حەوتەمەوە وەرگیرا بوو. عەبدول وەهاب چەند شتێکی بۆ زیاد کرد و هەندێ شتیشی گۆڕی تاوەکو ببێتە میرات خۆی و ئەوانەی کە پاڵپشتیان لێ کرد دوژمنی ئیمان بوون. بە گریمانی ئەوەی کە بەرپرسیارێتی بۆ بەکاربردن و بلاوکردنەوەی ڕێچکەی ئیسلامی وەهابی عەشیرەتی سعوود توانیوانە حوکمی تەواوی نیمچە دوورگەی عەرەبی بکەن، کە لەسەریدا لە دواجاردا کۆنترۆلی زامن کردەوە لە بیستەکان. ئەو ڕێچکەیەی ئیسلام خۆی کردەوە دوژمنی ڕۆژئاوا.

ئیسلامی وەهابی کاریگەری جیهانی بەهێزیان خستە گەڕ لە سەدەی بیستەمدا لە بەر دوو هۆ: یەکەمیان، ئەو ئیمتیازەی دارشت لە ڕێگای موسڵمانانی جیهانەوە بۆ ئەو واقیعەی کە ئەو هۆزە لە ئامێزی گرتووە کۆنترۆلی شارە پیرۆزەکانی مەککەو مەدینەی کردووە: ستایلی مەلەکی سعودی خۆی وەك پارێزەری هەردوو مەزارگە پیرۆزەکە دانا. دووەمیشیان، حوکمی خێزانی هات بۆ دەرخستنی سامانێکی سەرنجڕاکێش بەهۆی مەلەکییەت لە ڕێگەی نەوتی ژێر لمەکانی. مەلیکایەتی عەرەبستانی سعودیا ئەو پارەیەی بەکارهێنا بۆ بلاوکردنەوەی ئیسلامی وەهابی نوێ.

پارەی سعوودیا هاوکاری قوتابخانە ئایینییەکانی کرد لە ڕۆژئاوای باکووری پاکیستان کە گەلێ لە بەرپرسانی ڕژێمی تالیبانی لە ئەفغانستان ڕاهێناوە، کە پراکتیزەی سەرکوتکردنی ئایینی دەکەن لە سەرانسەری وڵاتدا، هەروەها پێشوازی خۆیشی پێشکەش بە سەرکردەکانی تۆڕی تیرۆریستی قاعیدە کردووە. پارەی سعوودیا یارمەتی مزگەوتەکانی ئەوروپای ڕۆژئاوای





کرد کە تیایدا قاعیدە موسڵمانی نوێی دروست دەکرد بۆ ئەنجامدانی ئەرکی تیرۆریستی بەوانەی هێرشەکانی یانزەی سێپتێمبەریشەوە.

گەر ڕژێمی سعوودی پشتی بەستا بێت بە ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ ئەوەی بیپارێزێت لە دوژمنەکانی دەرەوەی، ئەوا پشتی بەستاوە بە بانگەشەی باوەڕی بنەماکانی وەهابی بۆ سەلماندنی وجودەکەی بۆ جەماوەرێکی ترسناکتر و بەهێزتر، ئەو خەڵکەی کە حوکمی دەکات. پێویستی سەلماندنی ئەمە زیادی کرد لە دوا دەیەکانی سەدەی بیستەمدا. ڕژێمەکە لە دەرەوە و ناوەوە سومعەیەکی لە ڕووی گەندەڵی کەسی و کەمی توانای ئابووری پەیداکرد. پێنج هەزار شازادەکەی خانووی سعوود ڕێڕەوی زۆربەی ئەو سامانەیان گۆڕی لە بەرزبوونەوەی نرخی نەوت لە حەوتاکان بۆ بەکارهاوردەی کەسی خۆیان و فەشەلیشیان هێنا لە هەناردنی وڵات بۆ سەر ڕێڕەوێکی گەشەی ئابووری. لە ناوەڕاستی هەشتاکان بۆ کۆتایی سەدەکە، داهاتی هەر کەسێك لە شانشینی یەکگرتوو، لەکاتێکدا هێشتا مورتاح بوون بە پێوەرەکانی جیهانی عەرەبی، لە سەدا چل هاتە خوارەوە. بۆ قەرەبووکردنەوە و هەروەها بۆ وەرگرتنی دەرسێك لە فەشەلەکانی خۆی، ڕژێمەکە هەستا جەختی لە سەر هاوکاریکردنی وەهابیزم و ئیسلامی چەکدار کردەوە، کە لە هەندێ کەرتی موسڵمانانی جیهانەوە پێگەکەی بەهێز کرا لە لایەن ڕۆڵی وەرگیراوی لە وەدەرنانی یەکێتیی سۆڤیەت لە ئەفغانستان لە حەوتاکان. هەردووکیان هانی تێکدانی ئارامی ڕۆژئاوایان دا کە بووەی بزواندنی تۆڕی قاعیدە.

بۆیە لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا، وڵاتانی ناوەوەی جیهان بۆ ژیانی ئابووری خۆیان پشتیان بە ڕژێمێك بەست کە دەسەڵاتی لەدەست بوو پشتی بەستا بوو بە کۆمەڵێك بنەمای ئایینی کە دوژمنایەتییەکی قووڵی هەروەها زۆرجار هێرشی کتوپڕی پڕ لە کوشتاری بۆ سەر، هەمان وڵاتانی ناوەوەی جیهان دەبرد. هەروەها ڕوانگەی باشیش بۆ کورتهاوردە یان بۆ کۆتایهاوردەی مشەخۆری ڕۆژئاوا لە سەر نەوتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا نەبوو یان بۆ هاوردەی ڕژێمێك کە زیاتر تەرخان بکرێت بۆ ئایدیە لیبراڵییەکان بۆ هێز لە عەرەبستان.

لە سەرانسەری مێژووی تیرۆریزمدا، لەکاتێکدا هەمیشە هەڕەشەی بۆ قوربانی بەهێزی و هەندێ جاریش سەرسامی بۆ هەمووو جیهان، زۆر بەدەگمەن ئامانجە سیاسییەکانی بەدەست هێناوە. ئەمە بە هەمان شێوە ڕاست بوو بۆ هێرشەکانی یانزەی سێپتێمبەرەی ٢٠٠١ کە بووە هۆی هێرشێکی پێچەوانەی پێ لە سەرداگیراو لە لایەن ویلایەتە یەکگرتووەکان کە حکومەتی

تالیبانی لەناوبرد لە سەر دەسەڵات لە ئەفغانستان هەروەها بە توندی تۆڕی قاعیدەی تێکشکاند. ئێستا تیرۆریزم هەڕەشەیەکی گەورەتر دەخاتە ڕوو لە سەدەی بیست و یەکدا لەوەی پێشتر. ئەمە لەبەر هەبوونی میتۆدی هێرشی زۆرو وێرانکەر، کە هێرشەکان بارتەقای ژمارەی یانزەی سێپتێمبەری بگرە زیاتریشیان کوشتووە.

بە هەرسێ جۆرە چەکی بەکۆمەڵ کوژ دانرا، ئەوانیش ناوکی و بایەلۆژی و کیمیایی بوون، گروپی تیرۆریستان دەتوانن ماقوڵانە کیمیایی و بایەلۆژی دەستەبەربکەن. هەردوو چەك دەتوانن وێرانیەکی گەروە بنێنەوە، بەتایبەتی گەردیلەی بایەلۆژی، لە سەرانەسەری مێژووی مرۆڤدا تاعونەکان زیاتر کەسیان کشتووە لە جەنگ. گروپە تیرۆریستییەکان کەمتر قەدەغەدەکرێن لە بەرکارهاوردەی ئەو چەکانە لە لایەن حکوومەتەکانی پێش سەدەی بیستەم لە بەر خەوشەکانی خۆیان دووچاری هەڕەشە دەبنەوە: کارێکی ئاستەمە بە وردی ڕووبەڕووی ئەو گروپانە ببیتەوە، ترسی ئەوەی کە ئەو گروپانەش هێرش دەکەن و قوربانییەکانییش زیاتر دەبن، هەروەها ئەگەری تۆڵەکردنەوە لە لایەن ئەو وڵاتانەی کە هێرشیان کراوەتە سەر. گروپە تیرۆریستییەکان وەك قاعیدە نیازیان کوشتنی زۆرترین کەسە، مردنی ئەندامانی خۆیان بە نرخێکی گونجاو حیساب دەکەن بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە، هەروەها ئامانجی زەحمەت دەپێکن لە ڕێگەی موکافەئەو قەرەبوو بوونەوە.

لە بیستی مارسی ١٩٩٥ دا، گروپی یاخیبووی ژاپۆنی بە ناوی ئوم شینریکۆ ( Aum Shinrikyo) هێرشێکی تیرۆریستیان کرد و چەکی کیمیایان بەکارهێنا، ئەویش بەرەڵاکردنی گازی سارین بوو لە سەر پێنج شەمەندەفرە لە تونێلی تۆکیۆ. سەرەڕای تێکەڵکردنی ژەهر لەگەڵ ماددە کیمیاییەکە ژمارەی قوربانیان زۆر گونجاو بوو لەچاو ئەوەی کە چاوەڕوان دەکرا، ئەویش دوانزە کوژران و چل کەسیش بریندار بوو. لەو کامپ و ئۆفیسانەی کە قاعیدە قەدەغکرا لە ئەفغانستان کاتێ پارێزەرە تاڵیبانییەکان لە سەر دەسەڵات لابران، دواتر ئەو دۆکیومێنتانەی کە دۆزرانەوە ئەوەیان ئاشکرا کرد کە خەریکی چالاکییەك لە ڕێگەی بەکارهاوردەی چەکی کیمیایی.

دەستەبەرکردنی چەکی ناوکی زۆر زەحمەترە لە دەستەبەرکردنی بایەلۆژی و بەتایبەتیش چەکی کیمیایی. دروستکردنی چەکێکی ناوکی دیارە کە لەودیو توانای ڕێکخراوە تیرۆریستییەکانە، هەرچەندە کڕینی چەکێك ڕەنگە وا نەبێت، بەڵام گەر کێشەی زۆبوونی



چەکی ناوکی بە پێویست دانەنرا وەك بەشێکی سەرەکی لە کێشەی تیرۆریزم، ئەوا لە ڕێگای گرینگترەوە زۆر بە تیرۆریزم دەچێت. هەردووکیان بەرەنگاری لەیەکچوو دەخەنە بەر وڵاتانی ناوەوەی جیهان لە سەدەی بیست و یەکدا.

کێشەی زۆربوونی چەکی ناوکی و تیرۆریزم چەکی وڵاتە بێهێزەکانن، بە پێی ئەو میتۆدانە گەلی وڵاتانی دەرەوە دەکرێ وێران بکرێن لە مەودای زۆر دوور و لە لایەن هێزی وڵاتانی ناوەوەی جیهان. هەردووکیان ڕۆحی یاسای عورفی دژی هێزی وڵاتانی ناوەوەی جیهان بەکاردەبەن. زۆربوونی خێرای چەکی ناوکی و تیرۆریزمی سەدەی بیست و یەك سوود وەردەگرن لە توێژینەوەی زانستی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا، کە ئەم سوودەی بەخشی بە وڵاتانی ناوەوەی جیهان لە ڕێگەی سامان و هێز لە وڵاتانی تری جیهان.

هیچ کام لەو دوو هەڕەشەیە ناتوانرێ بە تەواوی پوچەڵبکرێنەوە. چەکی ناوکی ناکرێت دانەهێنرێت. هەروەك بۆ تیرۆریزم، کە تائێستا ڕەگی داکوتاوە لە ناقایلی کۆمەڵایەتی و سیاسی، هۆیەکانی بێ سنوورن، تا ئێستا وەك دەربڕینی تایبەتی ڕێچکەکانی کەسایەتی مرۆڤ، هەڕەشەی تیرۆریستی نەمرترن و وا بە ئاسانی لەناو ناچن، بەڵام لەکاتێکدا ئەگەری زۆبوونی خێرای چەکی ناوکی و تیرۆریزم بە تەواوی قەدەغەنەکران ئەوا ئەو دوو هەڕەشەیە دەکرێ بە جدی سەرکوت بکرێن. کلیلی ئەنجامدانی ئەم کارەش لە هەردوو حاڵەتدا یەکەی سیاسەتی نێودەوڵەتی و وڵاتانی خاوەن سەروەری و بەهێزەکانن.

گروپێکی تایبەتی وڵاتە خاوەن سەروەرییەکان و وڵاتە زەبەلاحە ترسناکەکانن، کە دەبنە هۆی بڵاوبوونەوەی چەکی ناوکی بە پێشکەوتنێکی خێرا و بەهێز. لە ئەنجامدا ئەو وڵاتانە وڵاتانی جیهانی ناوەوەن بە سەرۆکایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان، خۆیان تەرخانکردووە بۆ بێبەشبوون لەو چەکانە. ڕێکخراوەکانی تیرۆریستان پێویستیان بەوە نییە ببن بە وڵاتێکی خاوەن سەروەری، بەڵام پێویستیان بە بنکەکانی ئەو وڵاتانەیە کە لێیەوە چالاکی بکەن، هەروەها ئەو بنکانەش دەکەونە نێو سنووری ئەو وڵاتانەی کە حکوومەتەکانیان زۆر گرینگ دەبن بۆ کۆتایی هاوردە بە چالاکییەکانیان.

قاعیدە ڕاپۆرتی لە سەر کراوە کە خانەی چالاکیان لە نزیکەی زیاتر لە پەنجا وڵات هەیە. لە زۆربەی ئەو خانە چالاکانە بە بێ زانیاری حکوومەت، دژی هیوای حکوومەتە ناوخۆکان کار دەکەن، کە دەکرێ لیست بکرێن و سەرکوت بکرێن و لابرێن. بە پێچەوانەوە حکوومەتە

دەوڵەمەندەکان ئاگادار بوون بە چالاکی چاودێری ڕێکخراوە تیرۆریستییەکان لە نێویانـدا. هـیچ سەرسامی تیا نییە کە لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا لیستی ولاتە زەبەلاحە ترسـناکەکان شان بەشانی لیستی ولاتە تیرۆریست لەئامێزگرەکان بە شێوەیەکی بەرچاو لە زۆربووندان.

لە ئاکامی جەنگی ساردا ولاتانی وەك (کۆریا، هەروەها عێراق و ئێران و سـووریا و لیبیـا کە کەوتوونەتە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست) گەورەترین کێشەی ئاسایشیان نایەوە بۆ ولاتانی ناوەوەی جیهان. ڕێگەچارەیەکی بەرچاو بۆ ئەم کێشە گشتییە ئەوەیە ڕژێمی ئەو ولاتانەی کە هێرش یان یارمەتی هێرشبەران دەدەن بۆ سەر ئەوانی تـر نـەمێنن، کەواتـە، لەگـەڵ ئـەو ڕژێمانـەی کـە پابەندن بە بنەماکانی ئاسایشی گشتی کار بکـەن. ئـەم ڕێگەچـارەیە بـە بنـەما دوو پرسـیار کردەیی دەخاتە ڕوو: چ فۆرمێکی حکوومەت زیاتر بە حەزەوە پێوەرەکانی ئاسایشی گشتی لـە ئامێز دەگرێت؟ هەروەها چۆن ئەو جۆرە حکوومەتانە زۆردەبن؟ بۆ ئەم دوو پرسـیارە گرینگـەی سەدەی بیست و یەك، ولاتانی ناوەوەی جیهان ئامادە بوون وەلامی ئەو دوو پرسیارە بدەنەوە.

# بەشی سێیەم

# مێژووی تیۆری لیبراڵ

"وڵاتەکەمان بە بەخت نەبووە. بە هەقیقەت، بڕیاروابوو ئەو ئەزموونە مارکسییە لە سەر ئێمە جێبەجێ بکرێت- چارەنووس بە وردی پاڵی پێوەناین بۆ ئەم ئاڕاستەیە. لە کۆتایدا، سەلماندمان کە هیچ شوێنێك نییە بۆ ئەم ئایدیایە. بە سادەیی پاڵی پێوەناین بەو ڕێگایەدا بڕۆین کە وڵاتە شارستانییەکانی جیهان گرتوویانەتە بەر"

**بۆریس یەڵتسن**
**١٩٩١**

جێبەجێکردنی بنەماکانی ئاسایشی گشتی وەجهی گەورەترین کێشەکانی ئاسایش لە دوای جەنگی سارد دەگۆڕێت. ئاسایشی گشتی دەتوانێ ئەوە دووپات بکاتەوە کە ڕووسیا و چین هێرشیان نەدەکردە سەر دراوسێکانیان، ئاسایشی گشتی دەیتوانی ململانێکان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و لە سەر نیمچەدوورگەی کۆریا هێورکاتەوە، هەروەها دەیتوانی ئەو هەڕەشانەی کە دەخرانە ڕوو لە لایەن وڵاتە زەبەلاحە ترسناکەکان و خاوەن چەکی ناوکی و ئەو حکوومەتانەی تیرۆریستیان لەئامێزگرتووە کەم بکاتەوە.

سیستەمی ئاسایشی گشتی ناتوانێت هەموو ململانێکان لە وڵاتانی دەرەوەی جیهان هێور یا کەم کاتەوە، چونکە گرفتێکی گەورە لەو وڵاتانەدا هەیە ئەویش غەریزەی ئەو وڵاتانەیە بۆ ململانێ، ئەو وڵاتە خاوەن سەروەریانەی کە لە سەر ئاستی نێودەوڵەتی دانیان پیانراوە توانای دانووسانی حکومیان هەیە لەگەڵ یەکتر. خەسڵەتێکی ئاسایشی گشتی دەرفەتی هێوربوونەوەی ململانێکان لە سەر سەروەری بەهێزتر دەکات: هاوردە کایەی خۆشی و کامەرانی هەبوونی ڕێگەچارەی مامناوەند لە ڕووی سیاسییەوە، لە سەر بنچینەی ڕێچکەیەك بۆ هێورکردنەوەی ململانێ سیاسییەکان. هەوڵی لیبراڵ بۆ ئاسایش تا ڕادەیەکی کەمیش یارمەتی دەر نەبوو لە هیچ شوێنێك بۆ هیچ ململانێیەك.

ئاسایشی گشتی بەندە بەسەر پابەندبوونێك بە بێجەنگی، کە پەیوەستە بە سیاسەتە ناوخۆییەکانی وڵاتانی خاوەن سەروەری جیهان. سیاسەتە ناوخۆییەکان خاکی بە پیتی ئاسایشی گشتیە لەو ڕووەی کە حکوومەتەکان ئەو سیاسەتانە بەکاردەبەن بۆ زاڵ بوون بەسەر هێزی گێرەشێوینی نێودەوڵەتی کە هەمووی پێیەوە بەو هێزانە بەندبوون. هەروەها ئەوە لە سیستەمی سیاسی لیبراڵدا هاتووە کە داوا بۆ سیاسەتی ئاسایشی لیبراڵ یەکەم شتە سەرهەڵدەدات. ئەمە دەمانباتەوە سەر ودرۆ ویڵسن کە پێشەنگی هەوڵی لیبراڵە لە پەیوەندی نێوان وڵاتانی خاوەن سەروەری.

ڕوانگەی ویڵسن سێ بەشی هەبوو: حکوومەتی گەل، بازرگانی ئازاد، هەروەها دانانی سنوور لە سەر چەك. لە کۆتایی جەنگی ساردا هەر سێ بەشەکەی سێینەی ویڵسن تەعدیل و فراوانکران. حکوومەتی گەل بوو بە دیموکراسی، کە جیهان فێری دەبوو و وا بە سادەیی دووپات نەکرابۆوە لە کۆتایی حوکمی ئیپڕاتۆرییەت. بازرگانی ئازاد فراوانبوو و پەیوەندی نێوان وڵاتانی خاوەن سەروەری گرتەوە. سنووری چەکەکان بوون بە مەبەستی سنووردارو پەرەپێدانی بەرگری و



شەفافییەت لە ناوەڕۆکی ئاسایشی گشتیدا. ویڵسن ئەو سێ ڕوانگەی بە تەواوی کەری یەکترو بە یەکەوە گرێدراو دەبینی و هاوکاتیش خۆی بۆچوونی جیای بۆیان هەبوو، وەك هەرسێ بەشەکەی خێزانی گشتی پیرۆزی مەسیحییەتی ئۆرتۆدۆکسی، زۆر نزیك پەیوەستن بەیەکتری و، بەڵام لە یەکتریش جودان. بۆ ویڵسن ئەمانە زۆر گرینگ بوون و لەسەرووی هەمووشتێکەوە بوون، هەریەکەو یارمەتی بەرەوپێشبردنی مەبەستە سەرەکیەکەیدا لە کۆنفرانسی پاریس لە ساڵی ١٩١٩: ئەویش ئاشتییە. هەوڵی ویڵسن وەك ئەو پیاوە بوو کە قایش دەبەستێت و پەتەکەشی بەدەستەوەیە. هەر سێ بەشەکەی سێینەکەی بەشداری سەربەخۆییان کرد بۆ هەمان ئامانجی باڵا، بەڵام سەرەتای هەرسێکیان، هەروەها سەرهڵدانیان بۆ زاڵبوونی نێودەوڵەتی دیموکراسی و بازاڕی ئازاد، ئەو پرسیارانە قوت دەکاتەوە: ئایا ڕێچکە لیبراڵییەکان بۆ سیاسەت و ئابووری و ئاسایش بەتەواوی جودا و سەربەخۆن لە یەکتر؟ ئایا هەرسێکیان بە مێتافۆر وەربگیرێن وەك بەشی جیاواز لە سێکوچکەیەك، یان بڵێین سێ قاچی ستاندێکن، کە هەریەکەو دووەکەی تر بەهێز دەکات؟ یان ئایا هەرسێکیان زیاتر بەیەکەوە گرێدراون لەوەی کە هەیە؟ ئایا یەکێکیان ڕابەری ئەوی تر دەکات؟

ئەو پرسیارانە ئەو بۆچوونانە وەردەگرن بۆ چارەسەرکردنی ململانێکانی دوای جەنگی سارد لە ڕێگای دامەزراندنی ڕێکخستنەکانی ئاسایشی گشتی. گەر بەشێك لە سێینەکەی ویڵسن ڕابەری یان هانی ئەوەکەی تریدا ئەوا ئەمە هێمایەکی باشە بۆ ئاسایشی گشتی. لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا، دام ودەزگاکانی دیموکراسی و بە تایبەتی پراکتیزەکردنی ئابووریی بازاڕ هەموویان بەناوبانگ بوون، بە مکومی دامەزرا بوون، بە بەرفراوانی پێشوازیان لێ کرا لە تەواوی سەر ڕووی زەویدا. ئاسایشی گشتی هیچ کا تێك لەوانە نەبوو، بەڵام ڕوانگەی ڕووناك بوو تا ئەو ڕادەیەی دیموکراسی و ئابووریی بازاڕ ئەو خاکەیان دروستکرد تا ئاسایشی گشتی لەسەری بڕوێت. بۆیە پێشینەیەکی مێژوویی بۆ ئەمە هەبوو.

پێش چاخی مۆدێرن ڕێچکە خاسیەتدارە تەقلیدییەکانی سیاسەت و ئابووری ئاسایش — یاسای بە میراتکراو، تیۆرو سیستەمێکی ئابووری و هاوسەنگی ستراتیژییەکانی دەسەڵات- لە هەمان شوێن و لە هەمانکاتدا دەرکەوتن. بەهەمان شێوە، ڕێچکە نالیبراڵییەکان بەدوای یەکدا ڕیز بوون لە سەدەی بیستەمدا: کۆمیونیزمی سەر تەختی دەسەڵات کۆنترۆڵی هەموو چالاکییە سیاسییەکانی کرد و کۆنترۆڵی پلانی سەرەکی چالاکی ئابووری کرد، هەروەها ڕێچکەیەك بۆ ئاسایشی نێودەوڵەتی کە شەڕی لە سەنتەری خۆیدانا گرتە بەر. لیبراڵیزمی نێودەوڵەتی دوای

هەمان ڕێچکە کەوت. لەو وڵاتانەی کە بێ جەنگی بە قوڵی چێنرابوو، کە تیایاندا پراکتیزکردنی ئاسایشی گشتی ڕەواترین شت بوو، ئابووریی بازاڕی دیموکراسی وڵاتانی ناوەوەی ڕۆژئاوا بوون.

لە وڵاتانی ناوەوەی ڕۆژئاوا لە سەرەنجامی جەنگی ساردا وەك شتێکە یا وەك وتارێك بوو لە سەر ئیمان کە ئەم حەزی ناساندنەی هەرسێ بەشی سێینەی ویڵسن بە ڕێکەوت نەبوو. بە تەوسەوە، بۆچوونە سەرکەوتووەکەی پەیوەندی لە نێوان ڕێچکە لیبراڵییەکان بە قسەکانی ودرۆ ویڵسنەن نەدەچوو، بەڵکو بە نووسینەکانی ئەو پیاوە دەچوو بزووتنەوەیەکی گەورەی نالیبراڵی ووروژا ئەویش کارل مارکس بوو.

لەو شوێنەی کە وێڵسن پێشنیاری ئەوەی کرد داهاتوو دابڕێژێت، مارکس ئەو تیۆرەی پێشکەش کرد کە چۆن مارشی ڕووداوە مێژووییەکان و ماوەی مەودا درێژەکان بەرپرس بوون لە دارشتنی داهاتوو. ویڵسن ئارەزووی هەبوو و مارکسیش پێشبینی دەکرد. بۆچوونەکەی ویڵسن ئەوەبوو جیهان پێویستە چۆن بێت؟ تیۆرەکەی مارکسیش ئەوەبوو جیهان دەبێ چۆن بێت؟. نووسینەکانی مارکس کەرەستەی پێناسەکراوی تیۆرێك بوو، ئەویش پێیدەوترا "falsifibility" واتە گۆڕینی شتێك بۆ خەڵەتاندنی کەسێك. پێشبینییەکانی تەواو سنووردار بوون تا تاقی بکرێنەوە دژی ڕووداوە یەك لەدوای یەکەکان.

وا پێدەچوو خەڵەتێنەر بن. مارکس دووپاتی کردەوە کە کارە پێویستییەکانی ئابووریی بازاڕی ئەوروپا- کەئەمەش واتە کاپیتاڵیزم- بە تەواوی سیستەمی کاپیتالی خۆی تێکدەشکێنێ. وتی، ململانێیەکی ناشاشت هەیە لە نێوان هەروو چینە کۆمەڵایەتییەکە کە شۆڕشی پیشەسازی دروستی کرد، واتە لە نێوان بۆرژوازییەکان کە خاوەنی سارمایەکە بوون، هەروەها پرۆلیتارییەکان واتە ئەو کرێکارانەی کە ئەوان بەکرێیان گرتبوون. هەموو ڕێژە گرینەکانی قازانج ژێرکەوتبا، ئەوا کاپیتالیستەکان کرێکارانیان زیاتر دەگوشی بۆ ئەوەی کاری زیاتر بکەن. ئەمەش دەبووە هۆی بەرهەمهاوردەی شۆڕشێکی پرۆلیتاری گەورەو سەرکوتکەرو هۆشیارکەرەوە. لە کۆتاییدا سوپا گەورەو تورە و بەهێز و کرێکارە چەوساوەکان هەڵدەستان و سیستەمەکەیان لادەبرد، ئەو سیستەمەی ئەوانی واهەژار و ناچیز کردبوو. شتەکان بەو ڕێگایە چارەسەر نەدەبوون. بە پێچەوانەوە، لە ماوەیەکی درێژدا، بە هەڵکەوت لەگەڵ پچڕانی وەرزێك بەتایەتیش لە سییەکان، کاپیتالیزم سەلماندی کە بەرهەمهاوردەی گەشەی ئابووری و دابەشکردنی بەرهەمەکەی بە شێوەیەکی بەرفراوان دووپاتی سەقامگیری ئاسایش دەکەنەوە. کەمتر لە دۆڕانی لە نێو بوارەکەدا، کەشتی هەر کەسێك بەسەر سیستەمی بازاڕدا بڕوات بەرزی دەکاتەوە، هیچ کام لە ڕژێمە



کۆمۆنیستەکانی سەدەی بیستەم، لە ڕێگای ڕاپەڕینی چینێکی پابەند بە ئایدیۆلۆژیا و هەژار و بزوێنەر نەهاتنە سەر تەختی دەسەڵات.

گەر پێشبینییەکانی مارکس لە ڕووی زانستی مێژووییەوە هەڵە بن، تێبینییەکانی مارکس وەك مێژوونووسێکی سیاسەت و ئابووری سەدەی نۆزدەهەم ورد بوون تەنانەت یەکێکیان بە تایبەت پەیوەست بوو بە ماوەی دوای جەنگی سارد. مارکس تێبینی ئەوەی کرد کە شۆڕشی پیشەسازی بەردەوام، تەنها کار لە ژیانی ئابووری وڵاتانی خاوەن سەروەری ناکات، بەڵکو کار لە سیاسەتەکانی نێو ئەو وڵاتانەش دەکات.

لە سەرەنجامی جەنگی سارد، لە وڵاتانی ناوەوەی ڕۆژئاوادا، باوەڕێکی بەرفراوان پەیدا بوو لە سەر ئەوەی مێژوو بەڕاستی ڕێچکەیەکی هەیە، شێوەیەکی هەیە، ئاڕاستەیەکی هەیە، کە پشت دەبەستێت بە گرێدانە بەهێزەکان لە نێوان هەر سێ بەشی سێینەکەی ویڵسن. وەك پیاوماقوڵە بۆرژوازییەکە (مۆلێر)، کە هەرگیز بەخۆی نەزانی تاوەکو ئاماژەی پێکرا کە لە هەموو ژیانیدا بە پەخشان قسەی کردووە، چینە سیاسییەکانی وڵاتە لیبراڵییەکانی ناوەوەی ڕۆژئاوا هەرکە هەزارەی نوێ دەستی پێکرد وەك پابەندبوونەکانی بۆچوونێکی بەیەکەوە لکاوی پەیوەندییەکانی ڕابردوو و ئێستا و داهاتوو بیریان لەخۆیان نەکردەبوەوە، بەڵام زنجیرەیەك باوەڕیان دەستەبەرکردو ڕایانگەیان دەکرێت بە مێژووی تیۆری لیبراڵ وەسف بکرێن. ئەو فۆرمە بەلای ماکس ئاشنا نەبوو هەروەها ئایدیۆلۆژیایەکی ڕەسمی نەبوو، بەڵکو کۆمەڵێك باوەڕ بوو کە هەموو دەتوانێت ڕاییگەیەنێت گەر باوەڕی پێ هەبێت. ئابووریناس جۆن کینیس گالبرێس ناوی نا" ژیرییەکی گشتی" کە کۆمەڵە باوەڕێکی شادی هێنەر بوون، بەبەرفراوانی پەسەندکراوبوون، هەموو پێیان ڕاست بوو، لە ڕووی ئاسایشەوە بەرەنگاری نەدەبۆوە. دووبارەبوونەوە لە وتارە ڕەسمییەکانی وڵاتە دیموکراسییەکانی ڕۆژئاوا، ڕێکەوت نین بۆ هەنگاونان بەرەو دەرەوەی سنوورە ئاشناکان. ووتاری گشتی لە وڵاتانی ناوەوەی لیبراڵدا مەشقێکە لە سەر ئەوەی هەر چیت هەیە بیڵێ.

بێگومانیش ناوەڕۆکی مارکسییەت نەبوو، بەڵکو لیبراڵ بوو. مێژووی تیۆری لیبراڵ دەزگاو پراکتیزە گەورە لیبراڵییەکانی لە سەدەی نۆزدەهەمدا پێشخست، کە ودرۆ ویڵسن دەنگێکی دەسەڵاتداری پێ بەخشی پاش جەنگی جیهانی یەکەمو پانتاییەکی ڕەهای لە کۆتایی جەنگی ساردا داگیرکرد، لە بنەڕەتەوە پێکەوە یەك بەوی ترەوە بەستراو بوون. بنەڕەتەکانی دەکەوێتە نێو ئەو ئایدیانەی کە کاری لە ویڵسن کرد، بە تایبەتی پێشبینی فەیلەسووفی ئەڵمانی سەدەی هەژدەهەم ئیمانوئێل کانت کاتێ وتی ئاشتی بەرقەرار دەبێت گەر سیستەمی سیاسی وڵاتانی

خاوەن سەروەری بگۆڕێت لە مەلەکییەوە بۆ کۆماری، ئەمەش قەناعەتی بەریتانییە لیبراڵە کاریگەرەکانی سەدەی نۆزدە لە ڕێگەی بازرگانی ئازادەوە پرۆسەی ئاشتی خێراتر کرد. تیۆری لیبراڵی سەدەی بیست و یەك، ئاڵۆزترو بە متمانەتر بوو لەوەی باپیرە ڕۆشنبیرەکانی. بەهەقیقەت، بە گەشبینی لە ماوەی مێژوویی سەری هەڵدا کە بەهۆیەوە جیهانی ئەنگلۆ ئەمریکی وەرزیانە و بابەتی بوو.

مێژووی تیۆری لیبراڵ دەستی پێکرد بە بۆچوونێکی پاکنووسکراوی کانت کە دیموکراسییەکان بۆ دانانی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ وڵاتانی تر لە سەر بنەمای ئاشتییەوە دەبێت. گەر کلیلی ئاشتی دیموکراسی بێت، ئەی چی وڵاتانی خاوەن سەروەری دەکاتە دیموکراسی؟ ئالێرەدا بۆچوونی هاوچەرخی گەشبینی لیبراڵ داهێنانێکی گرتەوە، بۆچوونێك زۆر بەرفراوان نەبوو لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا: کە لیبراڵیزمی سیاسی بەرهەمی لیبراڵیزمی ئابوورییە، ئابووریی بازاڕ دەبێتە هۆی دیموکراسی. لە چ بارودۆخێکدا، دواتر، وڵاتانی خاوەن سەروەری دەزگاو پڕاکتیزەکانی بازاڕ بەکاردەبەن ؟ وەڵام بۆ ئەو پرسیارە سەرچاوەی جۆرە متمانەیەك بوو کە مێژووی تیۆری لیبراڵ لەگەڵ تیۆری مارکس هاوبەش بوو. هەموو وڵاتانی خاوەن سەروەری نیازی دانانی ئابووریی بازاڕیان هەیە، چونکە هەموو نیازیان ئەوەبوو بگەن بە ژیانێکی شاد و کامەران. لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا، بازاڕ لە سەر ئاستی جیهانی دانی پیانرا وەك تاکە ڕێگایەکی دروست بۆ ڕەفاهییەت. سەرنجی بەرگەنەگری بۆ کۆمەڵە بازاڕ لە جووڵەدا زنجیرەیەك بەرپەرچی هەمەجۆر بوو. ئابووری لیبراڵ دەبێتە هۆی سیاسەتی لیبراڵ، ئەویش دەبێتە هۆی سیاسەتی ئاسایشی لیبراڵ.

مارکس یەقین بوو لەوەی کە مێژوو بە ئاڕاستەیەی ئەو سنوورداری کردبوو دەڕوات (کە ئەو حەزی لێ بوو) کە وەڵامێکی مەنتیقی بۆ پرسیارە سیاسییەکەی شاگردە ڕووسییەکەی لینین خستەڕوو کاتێ پرسیار دەکات — چی بکرێت؟ هیچ! شۆڕش بەخۆی بە بێ یارمەتی هەڵدەگیرسێت، بەڵام لینین و مارکس بێ ئارام بوون. حەزیان دەکرد خێرا بگەن بە شتەکان. هەردووکیان حیزبی سیاسیان دامەزراند بۆ ئەو مەبەستە و لینین دەسەڵاتی گرتە دەست لە ڕووسیا لە ساڵی ١٩١٧.

مێژووی تیۆری لیبراڵ کۆششێکی گرتە بەر بۆ یارمەتی دانی مێژوو کە لە ڕێڕەوی تیۆرێکی نهێنی تردا بەروارد بوون. بەهێزترین وڵاتی ناوەوەی جیهان نیازی هاندان و یارمەتی دانی لە داڕشتن و بەکارکردنی بازاڕی ئازاد لە هەر شوێنێك بێت هەبوو، بە تایبەتی لەو وڵاتانەی کە



خولیای نێودەوڵەتی بە پێویست دانا. لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا ویلایەتە یەکگرتووەکان سەرمایەکی باشی سیاسی و سەرچاوەی دارایی تەرخانکرد بۆ کاری دامەزراندنی ئابووریی بازاڕ لە ڕووسیایەکی نوێی غەیرە کۆمۆنیست. لە هەمان ماوەدا تێنوێتی هەوڵی ئەمریکی بۆ چین لە وشەی ڕەقی ئیدانەکردنەوە گۆڕا بۆ ئینکاری حکوومەتەکەی مافی سیاسی بۆ قسەی گەرم و گوڕی هاوکاری بۆ بەرەو پێش چوون لە دانانی دەزگاو مومارەسەکردنی بازاڕ. واشنتۆن قسە هاندانەکانی خۆی گۆڕی لەبەر جێهێشتنی بازاڕی ئەمریکی بۆ بەرهەمی چینی و خۆشکردنی ڕێگا بۆ مەوادی چینی بۆ نێو ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی. وڵاتە زەبەلاحە ترسناکەکان کە گومانی ئەوەیان لێ دەکرا خولیای چەکی ناوکیان هەبێت هەمان مامەڵەیان لەگەڵ کرا. ویلایەتە یەکگرتووەکان دانووسانی خۆی کردەوە بۆ پەیوەندی ئابووری لەگەڵ کۆریای باکوور هەروەها هەوڵی دالەگەڵ ئێرانیش هەمان شت بکات، ئاڕاستەی خۆی بەهەمان شێوە بەرەوکوبا گۆڕی، هەروەها ئەوەی ئاشکرا کرد کە عێراق دەتوانێت چاوەڕێی هەمان دەرفەت بکات هەرکە ڕژێمی سەدام حوسێن کۆتایی پێ دێت. ئەوروپییە ڕۆژئاواییەکان و ژاپۆنییەکان، گەر هەر هیچ نەبان لەڕووتر بوون لە ئەمریکییەکان بۆ سیاسەتەکانی ئابووری و تێکەڵبوون لەگەڵ وڵاتە بەهێزە ترسناکەکان.

بێگومان، هەوڵی ڕۆژئاوا لە دوای جەنگی سارد بۆ چین و کۆریای باکوور و ئێران تەنها ستایشی بازاڕی ئازاد و داهێنان نەبوون لە بازرگانی. ئەو وڵاتانە لە قەدەغەکردنیش بابەتی واقیعی سیاسی بوون، بەڵام، لە ماوەی زۆربەی جەنگی ساردا، هەوڵی ڕۆژئاوا بۆ دوژمنە سەرەکییەکانی موعەرەز بوون بۆ قەدەغەکردن. لە ماوەی دوای جەنگی ساردا، بەردەوام بوون لەگەڵ مێژووی تیۆری لیبراڵ، گۆلێکی گرینگتر و بەرچاوتر هاتە پێشەوە، ئامانجێك گەر بکرابا، پێویستی بە قەدەغەکردن نەدەما. ئەو ئامانجەش گۆڕان بوو.

بۆ پابەندبوونەکانی، مێژووی تیۆری لیبراڵ ئەوەی خستەڕوو کە جیهان بە بێ خەیاڵی بەو ئاڕاستەیەدا دەڕوات کە خۆیان حەزی پێدەکەن. تەنانەت باشتریش، ڕوانگەی داوەتکردنی ئەنجامدانی ئەو کارەی کردەوە بە هۆی ئەنجامدانی کاری باش. بازرگانی لەگەڵ وەگەڕخەرەکانی وڵاتانی تر دیموکراسی و ئاشتی بەرەوپێش دەبات، ئەم پرۆسەیە لە پتش هەموو شتێك شتێکی سەرنجڕاکێش بوو. مەبەستی بازرگانی و وەگەڕخستنکردن لە دەرەوە لە لایەن وڵاتانی ناوەوەی جیهانبۆ بەرهەمهاوردەی سامان بوو. مێژووی تیۆری لیبراڵ لە ناوەڕۆکەوە وڵاتانی ناوەوەی لیبراڵی هاندا لە ڕووی بەرژەوەندی قازانجکردنی پارەو سەقامگیرکردنی ئاشتی لە جیهان لەگەڵ

یەك بن. ئەو جۆرە جیهانە یارمەتیان نادات، بەڵام سەرنجڕاکێش و بەهێز دەبێت بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان پێیە، ئەمەش خەسڵەتێکی ناسراوی دەروونی مرۆڤە کە گەر حەزیان بە شتێك بێت باوەڕی پێدەکەن گەر نا باوەڕی پێناکەن. ئەو بۆچوونانەی کە مێژووی تیۆری لیبراڵی دروستکرد، لە " با شتە باشەکان پێکەوە بەڕێوەببڕێن" سەرچاوەیان گرت. لە ڕاستیدا هەریەکەو ئەوی تر بەرهەم دێنێت. گەلێك لەو بۆچوونانە واپێدەچوون ڕاست بن. ئەمەش وایان لێناکات کە بگۆڕدرێن تاوەکو کەسانی تر دەسخەڕۆ بکەن.

وەك ئەوەی چۆن مارکیسیزم لە دایك بوو بۆ دروستکردنی هەستی گۆڕانی شۆڕشگێڕانە کە ئەورووپای سەدەی نۆزدەمی ڕامالّی، مێژووی تیۆری لیبراڵیش بەهەمان شێوە پچڕانێك و واقیعێکی مەعریفی ڕوویداوە دراماتیکییەکانی دوا دەیەی سەدەی بیستەم بوو. سەبارەت بە بۆچوونە سەرەتاییەکانی بەڵگەی بەرچاو هەبوون بۆ جەماوەری جیهانی بازاڕ وەك بنەمایەی ڕێکخراوی چالاکی ئابووری. نزیکەی هیچ وڵاتێك ڕەتی هەوڵی لیبراڵی بۆ ڕێکخستنی ئابووری نەکردەوە. لەو شوێنەی ئابووری بازاڕ کەم بوو، وەك لە حاڵەتی زۆربەی وڵاتانی دەرەوەی جیهاندا، ڕەتکرایەوە ئەمەش لەبەرئەوەی حکوومەت نەیتوانی پاڵپشتی کەس بکات. بەرژەوەندی گشتی لە دروستکردنی بازاڕ مانای دووەم بۆچوونی مێژووی تیۆری لیبراڵ هەبوو واتە یەکچوونی ئابووری لیبراڵ و سیاسەتی لیبراڵ، بە بەرفراوانی تاقی دەکاتەوە.

سەبارەت بە سێیەم بۆچوونیش، یەکچوونی نێوان سیاسەتی خۆماڵی لیبراڵ و سیاسەتی ئاسایشی لیبراڵە، ئەمە ئەوە بوو، لە دوا دەیەکانی سەدەی بیستەمدا، بەرژەوەندی بۆ گروپێك لە وڵاتانی ناوەوەی جیهان لەگەڵ شتێك هاوبەش لە گەل مارکس خۆی، کە یەکێك لە هەرە سەرەتایترین و قوتابی سیستەمی کاریگەری کۆمەڵگای مۆدێرن بوو هاتە ئاراوە. دەیەك دواتر زانستناسە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵ هەمان بەرژەوەندی مێژووی تیۆری لیبراڵیان کردە بابەت و زنجیرەیەك توێژینەوەیان لە سەر ئەنجامدا و گەیشتنە ئەو ئاکامەی کە دیموکراسی شەمەندەفەرێکە سەرنشینەکانی بەرەو ئاشتی دەبات.





## چاپتەری -٨-

## ئاشتی لە ڕێگای دیموکراسییەوە

لێکۆڵینەوەی سیستەماتیکی کۆمەڵگا لە سەدەی نۆزدەدا دەست پێدەکات و لە سەدەی بیست و یەکدا بە هەزاران خەڵك، زۆربەیان لە کات و شوێنی ئەکادیمیدا، تێیوەگلابوون. کۆمەڵناسەکان خولیای بەدەستهاوردەی جیهانی کۆمەڵایەتی بوون وەك چۆن سروشتناسەکان بەدەستیان هێنا بۆ جیهانی سروشتی: بۆ دۆزینەوەی ڕێچکەی یاسایی بە نیزام، هەروەك زانستی بنەڕەتی دۆزییەوە، هەروەها، لە سەر بنچینەی ئەو ڕێچکانە، شت دەدۆزنەوە کە هاوکار دەبن لە باشتربوونی مرۆڤ لە سەر بنچینەی زانستی جێبەجێبکرێن.

دوو جیاوازی بنەڕەتی لە نێوان جیهانی سروشتی و کۆمەڵایەتی ئەو ئەرکە زەحمەت دەکەن بۆ زانستناسە کۆمەڵایەتییەکان. یەکەم، ئەو یەکانەی زانستناسەکان لێیدەکۆڵنەوە هەمەجۆرو زۆر گەورەترن لە بلۆکەکانی دروستکردنی سروشت. کۆمەڵگا و سیستەمە سیاسییەکان و مرۆڤەکان زۆر لە یەکتر جیاوازترن لە گەرد و گەردیلە و کرۆمۆسۆمەکان. وێڕای ئەمە، یەکەکانی جیهانی کۆمەڵایەتی مانعی تایبەت بەخۆیان هەیە. بەپێچەوانەی کاری زانستناسە سروشتییەکان، کەواتە، تیۆرەکانی هەڵسوکەوتی مرۆڤ دەتوانن کار لەو هەڵسوکەوتە بکەن.

سەرەڕای ئەو بەربەستانە، لە دوا دەیەی سەدەی بیستەمدا، زانستەناسە کۆمەڵایەتییەکان پەیوەندییەکی بەهێزیان لە نێوان سیاسەتی دیموکراسی لە ماڵەوە هەروەها هەڵسوکەوتی ئاشتیانە لە دەرەوە دانا. بۆ سیاسەتمەداران و هاوڵاتیانی وڵاتانی دیموکراتی ناوەوەی ڕۆژئاوا ئەم دۆزینەوەیە سەرنجێکی دوانەی هەبوو. ئەمەش مانای ئەوە بوو کە هەرچەند جیهان ڕێکخستنە سیاسییەکانی خۆیان دووبارە بەرهەمبهێننەوە ئەوەندە ئارامتر دەبێت، هەروەها ئەوەشی خستە ڕوو کە فۆرمی حکوومەتەکانیان لە بەر خاتری خۆیان پەرەپێداو بەهایان پێ بەخشی، زیادەیەکی هەبوو سوودێکی چاوەڕی نەکراوی هەیە، هەروەك ئەو گێلاسەی لە سەری

کێکێکەوەیە وا پێ دەچێت زۆر خۆش بێت بەڵان زۆر بێتامە، بە هەمان شێوەش مێژووی تیۆری لیبراڵ، کە بەشێکی پێکەوە بەستراو بوون، تیۆری ئاشتی لە ڕێگەی دیموکراسییەوە زۆر باش و دروست بوو، بەڵام جیهان لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا بەڵگەی بەرچاوی دابینکرد لە بەرژەوەندی دەسەڵات و یاسایەکەی.

## هەڵبژاردن و دەستوور

لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا، ئەندامانی وڵاتانی ناوەوەی جیهان و وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژئاوا و ئەمریکای باکوور و ژاپۆن، هاتن لە سەروو هەمووشتێکەوە خۆیان بە وڵاتێکی دیموکراسی ناساند. ئەمە ناوێکی گشتی و نوێی ئەوان بوو، ئەو ئاڵایەی کە لە ژێری دەڕیسن، کە لە ڕاستیشدا وابووو، بەرگری لە ئازادی سیاسی بە شێوەیەکی ئەوتۆ مەبەستی جەنگێکی گرینگی لایەنی براوە بوو لە سێ بەربەرکانی گەورەی سەدەی بیستەمدا. جەنگی سارد ڕەنگە لە سەر ئابووری لایەنێك بیباتەوە، بەڵام بەرپابوو بۆ مەبەستی سیاسی. وڵاتانی ناوەوەی لیبراڵ دژی کۆمینیوم بوون بۆ پاراستن و گەشەپێدانی دیموکراسی لە ماڵەوەو دەرەوە. وڵاتانی ناوەوەی جیهان، بە گشتی ناویان لەخۆنابوو، جیهانی ئازاد نەك جیهانی دەوڵەمەند.

دیموکراسی بۆ بەهێزترین و گەورەترینی ئەو وڵاتانە زۆر گرینگ بوو. لەکاتێکدا بەریتانیاو فەرەنسا پێشتر خاوەن سەروەری خۆیان بوون بۆیە بوون بە وڵاتی دیموکراسی، ویلایەتە یەکگرتووەکان خەسڵەتی دیموکراسی هەبوو هەر لە سەرەتای پەیدابوونییەوە. لە ڕاستیدا، لیبراڵیزمی سیاسی بنەماکانی دابینکرد بۆ دامەزراندنی کۆمارێکی سەربەخۆ لە ئەمریکای باکوور. نەتەوەی ئەمریکا بەو خەڵکە دروست نەبووە کە پێکەوە بە زمانێکی هاوبەش و باوەڕێکی گشتی بۆ چەند سەدەیەك ژیاون. هاوڵاتیانی ویلایەتە یەکگرتوەکان (یان باوباپیرانی ئەمریکی)، لەگەڵ خەڵکە ڕەچەڵەکە بێوێنەکەی ئەمریکای باکوور و خەڵکی باپیرانی ئەفریقیا، ئارەزوومەندانە گەیشتن بە جیهانێکی نوێ لە هەر شوێنێکی تر بە مەبەستی وەرگرتنی سوود لە ئازادییەکەی. جگە لە سەربەخۆیی هیچ شتێکی تر گرینگییەکی زیاتری نەبوو بۆ ژیانی گشتی ئەمریکا و ناسنامەی نەتەوەیی ئەمریکا لەوەی بەهای باڵای سیاسی دیموکراسی. ئەو وشە لە هەموو پارەیەکی ئاسنی ئەمریکادا دیارە.





هەرکە ماوەی دوای جەنگی سارد دەستی پێکرد، ئەندامانی وڵاتانی ناوەوەی جیهان خۆیان ناساند نەك هەر تەنها وەك ئەو وڵاتانەی ئازادیان خۆش دەوێت، بەڵکو وەك ئەوەی کە ئاشتیشیان خۆش دەوێت. ئەمە پێکەوتنێکی دواتر بوو. لە زۆربەی ماوەی سەدەی بیستەمدا، دیموکراسییەکان هەمیشە لەگەڵ هێزە نالیبراڵییەکان لە شەڕدا بوون. هەروەها مێژووی ململانێی چەکداریان هەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ چەند سەدەیەکی ڕابردوو.

بەڵام، لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا، کۆمەڵەی بەڕێوەبردنی دیموکراسی لە ماڵەوە لەگەڵ هەڵسوکەوتی ئاشتی لە دەرەوە خەسڵەتێکی چەسپاوی مێژووی تیۆری لیبراڵ بوو، هاوکاری کرا لە لایەن زەمالاتی ئەکادیمی کە ئەو پەیوەندییە بەهێزەی لە نێوان دیموکراسی و ئاشتیدا دۆزییەوە. وڵاتە دیموکراسییەکان، بە زنجیرەیەك دیراسە لە سەر ئیمپڕاتۆرییەت گەیشتنە ئەو ئەنجامەی زۆر بە دەگمەن لەگەڵ یەکتر بەشەڕ بێن.

گرێدانی نێوان دیموکراسی و ئاشتی ماقوڵە، گەر تەنها نەرێیانە حکوومەتە لیبراڵییەکان زیاتر لە هەموو شتەکانی تر یەکسان بوون، هەڵسوکەوتی ئاشتیان پێ باشترە لە فاشیست یان کۆمۆنیست. بە بۆچوونی وڵاتە دیموکراسییەکان جەنگ هەندێ جار پێویست بوو، بەڵام زۆربەی جار پەشیمانی و ناخۆشی بەدواوە بوو. بە پێچەوانەوە، جەنگ و کەل و پەلی جەنگ وەك ئامێرێکی ئاسایی و قبوڵکراوی پیشەی وڵات دانرا، تاوەکو دەسەڵات و ئیمتیاز و سامانی مەلیکی پێ بەهێز بکات. بۆ ڕژێمە فاشیستەکان و کۆمۆنیستەکانی سەدەی بیستەم، جەنگ بە کردە زیاتر بوو، لە هەموو ئیختیارەکانی تر پەسەنتر بوو لە وڵات: جەنگ سەنتەری هەموو مەبەستەکانیان بوو.

ڕقێکی بنچینەیی و ڕاگەیەنراو بۆ جەنگ بە تەواوی بە توندی سەرەنجامی سیاسەتی لیبراڵ بوو. هەردوو دیموکراسیە کۆنەکان، ویلایەتە یەکگرتووەکان و شانشینی یەکگرتوو، مێژووی سەربازی دوورودرێژیان هەیە کە زۆربەیان سەرکەوتوو خێوناوی بووین، بەڵام دیموکراسی فۆرمی ئەو حکوومەتەیە کە زیاتر بەرەو لای بێجەنگی دەچێت. وڵاتە دیموکراسییەکان زیاتر شت وەردەگرن لەوانی تر، سەبارەت ئەو ئایدییەی کە جەنگ خراپترە لە کارەساتێکی سروشتی و ناخۆش و عادەتێکی بەربەریە وەك کۆیلایەتی کە دەکرێ و دەبێ هەڵبوەشێتەوە، یان لە بڕی ئەوە دەکرێ بڵێین جەنگ کێشەیەکی تەندروستی گشتییە دەکرێ ئەو کێشەیە چارەسەر بکرێت و نەهێلرێت، ئەو ئایدیایە لە وڵاتە دیموکراسییە دەوڵەمەنەکانی وڵاتانی ناوەوەی جیهان بە

بەرفراونی پەسەند کرا لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا. ئەو ئایدیایە لە وڵاتانی ناوەوەی جیهان ڕەگی داکوتاو هەر لەوێشەوە لە هەموو شوێنێك بڵاو بۆوە، تا ئەو ڕادەیەی کە لە کۆتایی دەیەی یەکەمی ماوەی دوای جەنگی سارد، بە تەواوی بڵاو ببووەوە.

پەیوەندی نێوان ئاشتی و دیموکراسی هەرچەند ماقوڵ بوو، بەڵام دوو بۆشایی پڕ گرفتی هەبوو. یەکەم، گرێدانی پۆزەتیفی نێوان هەردووکیان لە ماوەی جەنگی ساردا بە یەکەوە هاتن، بەرزکرنەوەی ئەو ئەگەرەی کە ئاشتی لە ڕێگەی دیموکراسییەوە کارێکی هونەری بەربەرەکانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتە لەوەی کە دەربڕینی شتێکی سەرەکی بێت بۆ دیموکراسی. دیموکراسی ڕەنگە لە شەڕکردن لەگەڵ یەکتر هاتبێتە کایەوە لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا، ئەویش بۆ مەبەستێکی دیار کە هیچ پەیوەندی بە لیبراڵیزمی سیاسییەوە نییە، چونکە هاوپەیمانی یەکتر بوون و دژی هەڕەشە گەورەکەی کۆمۆنیزم وەستانەوە. دووەم ئاستەنگی یەکسانکردنی دیموکراسی بە ئاشتییە لە ئارادایە. لە سەردەمی ماوەی دوای جەنگی ساردا، لیبراڵی سیاسی لە گەلێ بەشی جیهاندا، زیاتر لە سەر هەرێمی پێشووی یۆگسلافیا، هاوکات بوو لەگەڵ زیادبوونی توندوتیژییەکی درێژتر.

ئەو دوو بۆشاییە لە تیۆری ئاشتی لە ڕێگەی دیموکراسییەوە دەکرێ پڕبکرێتەوە بەهۆی نوێ کردنەوەی پێناسەی ئاشتی و دیموکراسی. لە جەنگی ساردا، کاتێ ململانێ لەگەڵ نالیبراڵیزم زاڵ بوو بەسەر کاروباری سیاسی جیهانی، ماناکانیان بە تەواوی ڕاست و دروست بوو: دیموکراسی دژ و پێوانەکردنی کۆمۆنیزم بوو، ئاشتی بە مانای نەبوونی شەڕ هات. لە ماوەی دوای جەنگی ساردا، پێناسەکان ئاڵۆزتر بوون. هەردوو لیبراڵی سیاسی و ڕێچکەی لیبراڵ بۆ ئاسایش دەکرێ بە سوودەوە دابەشکرێتە سەر دوو بەشی جیاواز: لە حاڵەتی ئاشتیدا، ماوەی پەیوەست بەرهەمی دوا دەیەکانی سەدەی بیستەم بوو، لە حاڵەتی دیموکراسیدا، دابەشکردنەکە تەغتییەی ماوەیەکی کۆنتری ئەو حاڵەتە دەگرێتەوە.

ئاشتی لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا، بە دوو شێوەی هەمەجۆر هاتە کایەوە. یەکەمیان لە فۆرمێکی تەقلیدی بوو، بەهۆی نەبوونی ململانێ لەڕێگەی یەکسانی هێزەوە. ئەمە بنەما سەرەکییەکان بوو بۆ ماوەکانی توندوتیژی وڵاتانی چاودێری کراوی نێودەوڵەتییەوە، کە جیهان لە کات کۆنەکان بەولاوە پەیوەندیی پێوە کردبوو. ئەوەکەی تر ئاشتییەکی لیبراڵی بوو کە جێبەجێکردنی بنەماکانی ئاسایشی گشتی بەرهەمی هێنا. بە پێچەونەی جۆری یەکەمی



ئاشتی، ئەوەی دووەم بەرهەمی ناوخۆی کارە ئاساییەکانی هێزە سیاسییەکان نەبوو، بەڵکو سەریهەڵدا لە بەدیلێکی ناچاری بنەما لیبراڵییەکانی هەڵسوکەوتە تەقلیدییە نێودەوڵەتییەکان. ئاشتی تەقلیدی پشتی بەستا بوو بە هۆشیاری مەترسییەکانی جەنگ، ئاشتی لیبراڵ لە سەر قەناعەتەکانی چاکەکانی ئاشتی بوو. جۆری یەکەم ئاگربەستێکە، دووەمیش بە دامرکانەوەیەکی هەمیشەیی سیاسی بەدی دەکرێت. ئاشتی تەقلیدی سەرهەڵدەدات بە پێی ئەو بۆچوونەی کە کەس لە جەنگدا نایباتەوە، بە لانی کەم خەرجییەکی زۆری تێدچێت، ئاشتی لیبراڵ ڕەگی گرتووە لەو باوەڕەی کە بەرهەمی سەرکەوتن زۆر شایانی هەبوون نییە.

ئاگربەستێك لە سەر بنچینەی تەوافوقی سەربازی بە بەردەوامی دیموکراسی گەرەکە. زۆربەی ئەو ئاگربەستانە شکێنراوە لە نێوان حکوومەتە نادیموکراسییەکان. لە سەردەمی دوای جەنگی ساردا، پرسیاری لە ناوەڕۆکی ئاشتی لە ڕێگەی دیموکراسی ئەوەیە: ئایا دیموکراسی خۆی دەخاتە نێو جۆرە ئاشتییەکی لیبراڵ؟ سنووردارتر، ئایا خاسیەتی سیاسەتی لیبراڵ هەن تایبەت خۆیان بخەنە پاڵ بنەما و پراکتیزەکانی ئاسایشی گشتی؟، بەڵام پرسیارەکە هەندێ دەستکاری تری پێویست بوو، بۆ سیستەمی سیاسەتی لیبراڵی وڵاتانی ناوەوە ڕۆژئاوا لە سەردەمی دوای جەنگی ساردا دوو بەهای سیاسی تێکەڵ کرد کە هەموو شتێکیان جیایەو جیاش نابنەوە لە یەکتر، لە زۆربەی کاتەکانی سەردەمی مۆدێرندا یەکنەگرەوە بوون.

دیموکراسی یاسای "دیمۆس"ە کە وشەیەکی یۆنانییە واتە خەڵك. سەروەرییەکی شەعبییە. خەڵك حکوومەت هەڵدەبژێرێت. ئەسڵەکانی دەگەڕێتەوە بۆ یۆنانی کۆن، بە تایبەتی لە 'شار وڵات' ی ئەسینا لە سەدەی چوارەم و پێنجەمی پێش سەردەمی شێتی، لەو شوێنەی کە خەڵك هەر تەنها حکوومەتی هەڵنەدەبژارد، بەڵکو داشی دەڕوێشت. ئەو بنەمایە ونبوو بۆ ماوەی بیست سەدە تاو ئەو کاتەی لە شۆڕشی فەڕەنسادا دووبارە لەدایك بۆوە، لەو کات و شوێنەدا لە سەرانسەری جیهان بڵاوبۆوە.

دەزگای تەقلیدی سیاسی لیبراڵ پێش شۆڕشی فەڕەنسی سەروەری گشتی جەماوەری نەبوو. ئایدیایەکی جیا بوو، ئەو ئایدییە بوو کە دەسەڵاتی فەرمانڕەوا دەبێ سنووورداری بێت. ئەمە بنەمای دەستووربوونە، لەگەڵ بیرۆکەی پەیوەست بە مافەکان، کە ئامانجی دەستوورەکانە بۆ پاراستنی. ئەسڵی ئەو بنەمایە دەگەڕێتەوە کۆماری ڕۆمانی کۆن، کە بووژێنرایەوەو هێنرایە نێو چاخی مۆدێرن لە لایەن بەریتانیاوە.

ماوەی هەستیار لە سەرهەڵدانی دەستوور نووسین لە بەریتانیا سەدەی حەڤدەهەم بوو، کاتێ، پاش شەڕی ناوخۆ، ماڵێکی شایانە لابراو بەلاوەنراو دوورخرایەوە و یەکێکی تر لە شوێنی. لە کۆتاییدا هێوربۆوە کە پەرلەمان چەند ئیمتیازێکی هەبوو مەلیك دەبوایە قبوڵی بکات. سەربەخۆیی لە جیهانی ئەنگلۆ ئەمریکان پێناس کرا وەك سنووری دەستووری لە سەر ڕاهاوردەی دەسەڵات، بەلانی کەم تاوەکو سەدەی نۆزدەم، نەوەك بەشدارییەکی دانیشتوانی فراوان لە هەڵبژاردنی حکوومەت .

هەردوو بنەمایەکە پرسیاری جیاواز قووت دەکەنەوە. سەبارەت بە سەروەری جەماوەری پرسیارەکە ئەوەیە: کێ فەرمانڕەواکان هەڵدەبژێرێت؟ بۆ دەستوور نووسین ئەوەیە: فەرمانڕەواکان دەتوانن چی بکەن (هەروەها پێویستە چی نەکەن) هەرکە هەڵبژێران.

ئەوەی یەکەم سەبارەت بە سیاسەتە، ئەوەی دووەم سەبارەت بە حکوومەتە. هەردووکیان بە هاوبەشی تایبەت نین، بەڵام تاوەکو سەدەی بیست یەکیان نەدەگرتەوە لە کردەدا. بەهەقیقەت، دیموکراسی کۆمەڵ، بە فراوانی بە هەڕەشەیەك بۆ سەربەخۆیی دادەنرا. دیموکراسی یۆنانی، باوەڕی گشتی کەم بوو، کە لێکترازا بۆ زوڵم و ستەم، لە ڕێگەی شتێکی بچووك و کاریگەرەوە، هەڕەشەکەی قسەکەرە لێهاتوو و زۆرزانەکە کە ئاگری لە سۆزی گشتی بەردا و بەرەو نەمانی برد. دیموکراسی دەبێتە هۆی حوکمی قەرەباڵغ، بە دیکتاتۆرییەت کۆتایی پێدێت. پولێك بە سەربەخۆییەوە دەنێت. هەرە کاریگەرترین نووسینە لیبراڵییە سیاسییەکانی سەدەی نۆزدەهەم، وتارە نیگەرانەکەی جۆن ستۆرت میڵ بوو بەناوی " لە سەر سەربەخۆیی" هەروەها دەقە کۆمەڵایەتییە سیاسەکەی ئەلێکس بەناوی دیموکراسی لە ئەمریکا، تەرخانکرابوون، هەریەکە بەڕێگایەکی تایەبەت بەخۆیان، بۆ گەڕان بەدوای هەڕەشەی سیاسی بۆ سەربەخۆیی کە لەلایەن ڕوانگەیەکی فراوانی بەشداری سیاسی خراپوو لەپاڵ بازنەی ڕۆشنبیری بچووکی پیاوە زەنگینەکان.

لە سەدەی نۆزدەدا، دەستوور بەبێ دیموکراسی گشتی بوو کە بەهەقیقەت سیستەمی سیاسی هەردوو وڵاتی سەرکردایەتی لیبراڵی جیهان بوون. لە بەریتانیاوە، تەنانەت پاش دووەم چاکسازی دەنگدانی فراوانی ساڵی ١٨٦٧ کە تەنها لە سەدا ٧,٧ لە گەنجی دانیشتوان مافی دەنگدانیان هەبوو. لە ویلایەتە یەکگرتووەکان، سەرەڕای ئەوەی تا دوای جەنگی جیهانی یەکەم



ئافرەت نەیانتوانی دەنگ بدەن بگرە لە دوا سێیەکی سەدەی بیستەم ئەو ئەمریکیانەی لە باپیرانی ئەفریقیا بوون توانیان بەشداری لە هەڵبژاردنەکان بکەن.

لە سەدەی بیستەمدا، پێچەوانەی بڵاوبوونەوەی ترسی سەردەمەکانی پێشتر، سەربەخۆیی و یەکسانی سیاسی سەلمێنرا کە باشترە یەکبگرنەوە لە بەریتانیا و ویلایەتە یەکگرتووەکان و لە سەرانسەری وڵاتانی ناوەوەی جیهان، چونکە لەهەمانکاتدا سەرکەوتن، لیبراڵیزمی کۆمۆنیست، هەردووکیانی سەرکوتکرد، هەردووکیانی بەجودا دانا، بە تەنیا دژی وەستانەوە. لە کۆتای سەدەی بیستەمدا، وشەی دیموکراسی هەردووکیانی گرتەوە.

جیاوازی هەردووکیان لە سەرەنجامی جەنگی ساردا، زۆر ئاشکرا بوو لە وڵاتانی دەرەوەی جیهان. ماوەی دوای جەنگی سارد بە نموونان دەوڵەمەند بوو کە سەروەری جەماوەری پراکتیزەکرد بەهۆی ئەنجامدانی هەڵبژاردنی ئازاد، بەڵام دەستووری نەقوسان بوو لە سەر ئەو حکوومەتانەی ئاوا هەڵبژێردران. ڕووسیای دوای کۆمۆنیست وابوو، بەڵام یەك نموونەیەك بوو لە نێوان زۆران. لە ڕۆشنایی ئەو جیاوازیەدا، پرسیاری لە ناوەڕۆکی تیۆری ئاشتی لە ڕێگەی دیموکراسییەوە ڕەنگە دووبارە بووترێتەوە: ئایا سەروەری جەماوەری و مومارەسە دەستوورییەکان چی بەشدارییەکیان دەبێت بۆ ئاشتی لە فۆرمە تەقلیدی و لیبراڵییەکەی؟

## دەستوور نووسین و ئاشتی

لە دەقە پێشووەکانی تیۆری ئاشتی لە ڕێگەی دیموکراسییەوە سەروەری جەماوەری جەنگی نەهێڵا. ئەمە ڕوانگەی ئیمانوێل کانت بوو هەروەها هی ودرۆ ویڵسنیش بوو. میکانیزمی نەهێشتن ڕاستەڕێ بوو. خەڵك ڕەتی ئەوەیان کردەوە دەنگی خۆیان بدەن بۆ چوونە شەڕ. هۆی ئەمەش ڕاستەڕێ و ئاشکراو ڕاشکاوانە بوو:، خەڵك باجی ئەوەیدا کاتێ فەرمانڕەواکان لە ئامێرە جەنگییەکان دەسکەوتی دوورهاوێژیان هەبوو. گەر ڕێگەیان پێدرابا دەنگ بدەن، کەواتە، ئەوەیان ڕەتدەکردەوە کە چ شتێك بۆ ئەوان زیانە.

بە پێی تێپەڕبوونی کات ئەو باوەڕەی کە خەڵك دژی جەنگ بوەستنەوە بەرە بەرە پەری سەند، چونکە لە سەدەی نۆزدەدا خەرجییەکانی ئامێری جەنگی بەرزبۆوە وەك بازنەی ئەوانەی ڕاستەوخۆ کاریگەری لە سەریان هەبوو بە هۆی فراوانبوونەکەیەوە. لە جەنگی جیهانی دووەمدا،

نیوەی زیاتری ئەو پەنجا ملیۆین کەسەی کە مردن جەنگاوەر نەبوون. لە جەنگێکی ناوکیشدا، شەڕکردن لە سەر پێوەرێکی ئاسایشی ژمارەی مردوانی خەڵکی زۆر زیاتر دەبێت لەوانەی سەربازی. ئەمە بەڕێکەوت نەبوو، کە لە جیهانی دوای جەنگی ساردا، ئەو وڵاتانەی وادادەنران لە لایەن هێزەکانی ناوەوەی جیهان کە ترسناکترین وڵاتی زەبەلاحن هەموویان بە دیکتاتۆرێك حوکم دەکران بەڕێوەدەبران. یەکێك لەوانە، سەدام حوسێن، دوو گەورەترین جەنگی لە دوو دەیەی جیاوازدا کرد، شەڕی عێراق و ئێران لە هەشتاکان و جەنگی کەنداو لە نەوەدەکان. لە هەردووحاڵەتدا، بە ئاشکرا بڕیارێکی کەسیدا کە هێز بەرێت و کەسی تر بۆی نییە نارەزایی هەبێت یان بەربەستێکی بخاتە سەر.

هەستی جەماوەری هەمیشە ئارام نییە. خەڵکی ئەمریکی بەوەگاهێنرایەوە لە هاوکاری کردەی سەربازی لە دەستپێکردنی جەنگی ئەمریکا و ئیسپانیا لە ساڵی ١٨٩٨. ئەندامە کۆمەڵایەتییە دیموکراتەکانی پەرلەکانی ئەڵمانی وازیان لە نەماکانی دژی جەنگ هێناو لە بەرژەوەندی جەنگ دەنگیاندا لە ساڵی ١٩١٤. کاتێ ئەو ڕووداوانە ڕوویاندا خەرجییەکی مەزنی سەدەی بیستەم بۆ ئامێری جەنگی ئاشکرا بوو، لە سەرەنجامی جەنگی ساردا، پەرۆشی خەڵکی گشتی دەکرێ لیست بکرابا لە هاوکاری جەنگ، نزیکەی جەنگێك لە جۆرێکی تایبەتی بوو.

کاریگەری لیبراڵیزمی سیاسی لە سەر ئارەزوو بۆ شەڕکردن دەوەستایە سەر پاڵنەر بۆ شەڕکردن، بۆیە بەم پێیە، ململانێی چەکداری بە دوو ڕێگای جیاوە هاتە ئاراوە، جەنگی دوژمنداری و جەنگی جیابوونەوە. جەنگی دوژمنداری، هەروەك بە پێی یاسای نێودەوڵەتی پێناس کراوە، بەرەنگاری بوونەوە بوو لە سەر یەکپارچەیی سنوورکان: یەك وڵاتی خاوەن سەروەری هێرشی دەکردە سەر ئەوی تر، بۆ نموونە، ئەڵمانیا ئەمەی پەیڕەو کرد لە هەردوو جەنگی جیهانی و عێراقیش هێرشی کردە سەر کوێت لە ساڵی ١٩٩٠. لە حاڵەتی دووەمدا واتە جەنگی جیابوونەوە، ئەوەی کە ململانێ و مشتومڕشی لە سەر بوو ئەوەبوو کە سنوورەکان بە وردی بکەونە کوێوە و لە کوێ بن. جەنگی جیابوونەوە، هەموویان زۆر ئاشنابوون لە ماوەی دوای جەنگی ساردا، دەگەڕێنەوە سەر مێژووی ماوەی مۆدێرن، چونکە ئامانجە گشتییەکەیان لە دایك بوو لەگەڵ چاخی مۆدێرندا. لەکاتێکدا، هەردوو جەنگی جیهانی و هێرشی عێراق بۆ سەر کوێت پاڵنەری ئەوەیان هەبوو کە لە هەموو قۆناغەکانی مێژووی تۆمارکراودا، ئەو پاڵنەرانە ئامادە



بووین، ئامانجەکانی بەربەرەکانییەکانی بەڵکان لە نەوەدەکان، وەك ئامانجی جەنگی یۆنان بۆ سەربەخۆیی دژی ئیپراتۆری عوسمانی تورکی لە ١٨٢٠، بیر لێنەکراوە بوو پێش شۆڕشی فەڕەنسا.

بە هەقیقەت، دووەم جۆری جەنگ واتە جەنگی جیابوونەوە، بە شتێك ناسراوە کە، بە هۆی ئاماژەکانی تیۆری ئاشتی لە ڕێگەی دیموکراسییەوە، هەر تەنها نەویستراو نەبوو، بەڵکو بە شێوەیەکی ئەرێیانە دژیەك بوو واتە، جەنگی لیبراڵ بوو. لەو ڕووەوە لیبراڵە کە هۆی جەنگەکە بنەمایەکی نەتەوەیی بێت، ئەو ئایدیایەی کە نەتەوەکان دەبێ وڵاتی تایبەت بەخۆیان هەبێت و سنوورە سەروەرییەکان دەبێ دانیشتوانی نەتەوەکە دوویات بکەنەوە، ئەمەش واتە هاوکێشەیەکی دیموکراتی بۆ دیاریکردنی سنوورەکان. کاتێ یەکدەگرێتەوە لەگەڵ لیبراڵیزمی سیاسی، بنەمای نەتەوەیی شتێکی نامۆیە بە تەقلیدە سیاسییەکان کە لیبراڵیزم بەربەرەکانێی لەگەڵ کردووە لە چاخی مۆدێرندا. وڵاتە تەقلیدییەکان جەنگیان بەرپا دەکرد بۆ بەهێزکردنی دەسەڵات و سامانی مەلیکایەتی، ڕژێمە نالیبراڵییەکان بۆ ئەوەی زۆربەی سەر ڕووی ئەم زەمینە بخەنە ژێر باڵ دەسەڵاتی فاشیزم و کۆمینیزم. ئایدیۆلۆژیە غەیرە لیبراڵییەکان ئازاری ئەو دۆڕانەیان چەشت لە سەدەی بیستەمدا، کە بووە هۆی جەستپێکردنی گەلێ جەنگی لیبراڵ بەهۆی هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆری فرەنەتەوەیی کە پشتیان بەو ئایدیۆلۆژیانە بەستابوو. جەنگەکانی جیابوونەوە، لە ڕووی گفتوگۆوە یەکدەگرێتەوە لەگەڵ ڕق لێ بوونەوەی گشتە لە جەنگ خۆی، چونکە ئامانجەکانیان، لە بیری ئەوانەی کە دەیانەوێ جیاببنەوە، ئەوەیە کە تەنانەت ئەو کۆمەڵگایانەی کە خۆیان بە بێ جەنگییەوە گرتوە زۆر ڕەوایە بەرگری لە خۆیان بکەن. ویلایەتە یەکگرتووەکان هیچ پەشیمان نییە سەبارەت بەو جەنگەی کە لە ئەفغانستان کردی وەك وەڵامێك بۆ هێرشەکەی سەر هەردوو شارەکەی. جوداخوازەکان نیازی دەستەبەرکردنی یاخود گێڕانەوەی ئەو سەروەرییەن کە باوەڕیان وایە مافی ئەوانە و هی خۆیانە، بەڵام بە هەڵە لەوان سەنراوەتەوە و یان نکۆڵیان لێ کراوە بۆ ئەوان.

لە ماوەی دوای جەنگی لیبراڵدا، لیبراڵیزمی سیاسی هەڵسا بە ئەنجامدانی هەندێ بەربەرەکانێی نەتەوەیی خراپتر. لە سەر ناوچە ڕووخاوەکانی ئیپراتۆرە کۆمۆنیستەکان، هەروەها لە هەر شوێنێکی تر ی جیهانی دوای جەنگی ساردا، نەتەوایەتی هێزێکی سیاسی بەهێزی سەلماند و بۆیە بنەمایەکی سەرنجڕاکێش بوو بۆ داوا سیاسییەکان. ڕژێمە نوێیە شلۆقەکان گەیشتن بە سەرچاوەکانی شەرعییەتی سیاسی. سیاسەتمەدارەکان پێویستیان بەوەبوو لە هەڵبژاردنەکان

ببەنەوە بۆیە گەڕان بەدوای سەرچاوەی شەعبییەت. لە کێ بڕکێی دەنگداندا هەڵسوڕێنەرەکانی ئۆفیس زیاتر لە یەکێك لە وڵاتانی نوێی خاوەن سەروەری هەوڵ زۆر جیدیان دا بۆ کەمکردنەوەی هەستی نەتەوایەتی یەکتر. لەم ڕووەوە هەندێ لە هەڵبژاردنەکان بوونە سەرچاوەی هاندان و وروژاندنی زەبروزەنگ.(*)

لەو بارودۆخانەدا، دیموکراسی وەك سەروەری گەل پێناسە کرا، کە کاریگەری و ماناکەی پێچەوانەی ئەو دیموکراسییە بوو کە کانت و ویڵسن پێشبینیان کردبوو. لە بڕی ئەوە، ڕەخنەی تەمەنی کۆنی فەرمانڕەواکان لە لایەن خەڵکەوە بە ئیفلیجی لەدایك بوو کە بووە هۆی هاوردەە ئاراوەی مەترسییەکی زۆر و تێکشکاندنی ئاراستەکان، بەڵام گەر یەك بەشی سیستەمی سیاسی بە بەرفراوانی وەك دیموکراسی ناسرا، ئەوە هۆی جەنگ بوو لە سەرەنجامی جەنگی ساردا، ئەوا بەشەکەی تری تەقلیدی سیاسی لیبراڵ بوو ڕێگەچارەیەکی بەخشییە ئەو جۆرە بەربەرەکانێیانە.

گەر سەروەری گەل بتوانێ کێشەی جەنگ خراپتر بکات، دەستوور شەریکی حکوومەتی لیبراڵە دەتوانێ چارەسەری ئەو کێشانە بکات. پەیام و رۆحی دەستوور، کە لە نێوان پەیوەندی چەند گروپێك جێبەجێکراوە سەرچاوەیەکی ئاشتییە. بنەمای دەستوور سنوور لە سەر دەسەڵاتی حکوومەتەکان دادەنێت، کە لە بەرابەردا تاك دەپارێزێت. لە کردەدا، ئەو جۆرە پاراستنە گرفتێکە بۆ ئەوانەی کە جیانە لە هاوڵاتیانی خۆیان یاننیش جەماوەری نین بۆیە جیان لە زۆریەی هاوڵاتییەکانییان، بە واتایەکی تر، دەستوور کەمبە دەپارێزێت. ئەوەی بە گشتی دەستەبەری

(*) لە دەنگدانەوە بۆ زەبروزەنگ بابەتێکی سەرەکی جاك سنایدەرە: ململانێی دیموکراتیزەکردن و نەتەوایەتی، باسی ئەوە دەکات کە لە یۆغسلافیای پێشوو و هەر شوێنێکی تر نوخبە ڕووکەشەکان لە ڕژێمە کۆنەکان نیازی پاراستنی دەسەڵاتیان هەبوو بەهۆی بەرزکردنەوەی هەستی دوژمنایەتی گشتی و لە گروپە نەتەوەییەکانی تر، کە دوورخستنەوەی سەرنجیان بوو لەمەڕ ئیمتیاوز و هەستە نەتەواتییەکانیان. نوخبەی کۆمۆنیستی سربیا بە سەرکردایەتی سلۆبۆدان میلۆسۆڤیچ، خراپترینیان بوو، بەڵام تەنها یەك نموونەش نییە.
کاتێ خۆپیشاندانەکانی مافی مەدەنی دەستیان پێکرد لە باشووری ئەمریکا لە سەرەتای شەستەکاندا، بەرگریکەرانی سیستەمی جودابوونەوەی ڕەچەڵەکی کە ئەمریکییە ئەفریقییە مەحەلییەکان قایل بوون بە هەبوونی یاساو نەریتەکان، بەڵام لە بەشەکانی تری ویلایەتە یەکگرتووەکاندا بە ئیفیلیجی ورژێنرا بوون لە لای خەڵکەوە، کە ناویان لێ نرا بوو هەڵمەتگێرەکانی دەرەوە. سنایدەر لۆمەی زەبروزەنگی نەتەوایەتی لە ماوەی دوای جەنگی ساردا دەکات لە سەر هەڵمەتگێڕەکانی ناوەوە.



چارەسەری ئەو بەرەبەرەکانێیە بکات لە سەر مەوقیعی سنوورەکان، واتە لە سەر تەوزیعی سەروەری مسۆگەرکردنی پاراستنی گروپی کەمینەکانە.

یەکێك لە هۆیەکانی دروستبوونی بەربەرەکانی ترسی کەمبەیە کە لە لایەن زۆربەوە خراپترین مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت. ئەو ترسە دەکرێ کەم بکرێتەوە بەهۆی زەمانەتی دەستوور بۆ باری پێچەوانە. مامەڵە کردنی تایبەت سەرچاوەیەکی تری داواکارییەکانی کەمبەیە، کە دەکرێ جێبەجێ بکرێت بەهۆی پاکردنەوەی بۆشایی سیاسی کە ڕەنگە حکوومەتی ناوەندی تیایدا خۆی تێهەرنەقوتێنی، بۆشایی نەك هەر تەنها بۆ تاکەکان حیجز کراوە، بەڵکو بۆ کۆمەڵەکانیش بە گشتی: واتە، بەهۆی دابینکردنی هەندێ جۆری ئۆتۆنۆمی بۆ هەندێ گروپ.

گۆڕینی ڕۆح و مومارەسەی دەستوور لە تاکەوە بۆ گروپ بنەمایەکە بۆ ڕێگە چارەی مام ناوەندی سیاسی کە بە شێوەیەکی بەردەوام خراونەتە ڕوو، دەستی پێکرد بە پەیمانەکانی لە مەڕ کەمبەکان لە کۆنفرانسی پاریسلە سەر ئاشتی لە ١٩١٩، وەك بنەمایەکی نەتەوەیی بۆ چارەسەرکردنی ململانێکان سەریهەڵدا. هەندێ جار دەستوور ئەم بەربەرەکانێیانەی چارەسەرکرد.

بە شێوەیەکی گشتی تر، خەسڵەتی دەستووری حکوومەتە لیبراڵییەکان ڕێگاچارەیەك بۆ جەنگەکانی دوژمنداری و جیابوونەوە دابین دەکات بە هۆی بەرەوپێشبردنی خەسڵەتی هەڵسوکەوتی سیاسی لە نێو وڵاتانی خاوەن سەروەری بە شێویەك کە گەر چووە نێو پەیوەندییەکانیان، لە بەرژەوەندی ناشەڕانگێزەکانە. هەروەك هەرزەکارەکان بێ هۆشیاری ئەو هەڵسوکەوتانەی کە لە منالییەوە فێری بووین بەرهەمدێننەوە لەگەڵ مامەڵەکردنیان بەوانی تر، بەهەمان شێوە، بە پێی دواترین سەرچاوە، شیکردنەوە کەلتووری ئاراستەی دیموکراسەیەکان پێشکەوت لەگەڵ سیستەمی سیاسی لیبراڵ هێنرایە نێو سەردەمی نێودەوڵەتی، لەگەڵ سەرەنجامی ململانێکانی زەریای هێمن.

شیکردنەوەکە لە ڕووکەشدا هەستیارە. هەردوو بوار، دیموکراتی نێودەوڵەتی پاش هەموو شتێك بە یەکەوە گرێ نەدراون. سەرکردە سیاسییەکان لە هەمانکاتدا هەردووکیان ئەنجام دەدەن. ڕێنمایی و پێوەرە دیموکراسییەکان دەکرێ دزە بکەن لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر. بڵاوبوونەوەی کولتوور، کە زۆر دەوەستێتە سەر گۆڕانی مێژوویی، بە هەمان شێوە لەنێوان کۆمەڵگاکاندا ڕوودەدات، بە هەقیقەت، ئەوەی یەکەم دیارە ئاسانترە، گشتی ترە، خێراتریشە لەوەی دووەم.

دوو خەسڵەتی دیموکراسی زۆر تایبەت و پەیوەستن بە ئاشتی، بە تایبەتی بۆ دوا فۆرمە لیبراڵییەکەی سەدەی بیتسەم کە سیستەمی ئاسایشی گشتییە. یەکێکیان خەسڵەتێکە ڕەچاوی ڕێگە چارەی مام ناوەند دەکات. دیموکراسی جیاوازییەکان هەڵناوەشێنێتەوە. بەڵکو چوارچێوەیەك دابین دەکات بۆ چارەسەرکردنی یان بەڕێوەبردنیان بە بێ زەبروزەنگ. خاسیەتێکی گرینگی سیستەمی سیاسی لیبراڵ بڵاوبوونەوەی ئەو باوەڕە فراوانە و خود جێبەجێکردنەیە کە جیاوازییە سیاسییەکان لە ڕێگەی ئاشتییەوە چارەسەردەکرێن.

ڕەچاوکردنی ڕێگەچارەیەکی گونجاو کە لە سەر ناوەڕۆکی بۆچوونەکەدا ئاسایشی گشتی وەستاوە، کاتی خۆی بێ جەنگی بوو، ڕقی گشتی بنامەیەکە بۆ بەکارهاوردەی هێز بۆ هەموو مەبەستێکی بەرگریکردن.

خەسڵەتی دووەمی دیموکراسی یەکسەر دەچێتە نیو ئاسایشی گشتی: ئەویش شەفافییەتە. سیاسەتی لیبراڵ بە کراوەیی پەیڕەو دەکرێت. خەڵکی گشتی زۆر حەز بەوە دەکات مافی ئەوەی هەبێت ئەمە بزانێت. ڕەتبوونەوە هەمو شتێکە، بەڵام دەگمەنترین بارودۆخەکان بە ناشەرعی دادەنرێن. شەفافییەتی هێزی سەربازی یەکێك لە دوو کۆڵەگەکەی ئاسایشی گشتییە کە ئەوەکەی تریشی زاڵبوونی بەرگرییە.

بێگومان، دیموکراسی، تەنانەت دیموکراسی دەستووری، لە هەر شوێنێك بێت زەمانەتی ئاشتی ناکات. تێکەڵی نێوان هەردووکیان یاسایەکی نێو مێژوو نییە، گەر تەنها لەبەر ئەوە بێت کە هیچ یاسایەکی مێژوو نییە بەراورد بکرێت بەتووندی لەگەڵ جیهانی جەستەیی فزیکی، دەکرێ لەم بارەیەوە چی بووترێت، ئەوەیە کە دیموکراسی سروشتێکی پێشینە بۆ هەڵسوکەوتی ئاشتی هەڵدەگرێت. گەر جەنگ جۆرە نەخۆشییەك بێت، هەروەك لیبراڵیزمی سەدەی بیست و یەك بە گشتی وای دانا، دیموکراسی بەوە دانانرێت کە ڤایرۆسێك بێت دژی ئەو نەخۆشییە. زیاتر وەك سیستەمێکی حەسانەی تەندروستییە، ئەو وڵاتانەی خاوەنی ئەون، باشتر بوون لە تاوانی بەرگەگرتنی ئەو ڤایرۆسە لەوانەی کە نیانە. کەواتە، بەگشتی بەرەوپێشبردنی حکومی دیموکراسی بۆ ڕوانگەکانی ئاشتی و بە تایبەتی دەقی لیبراڵی ئاشتی و ئاسایشی گشتی بە باشی گفتۆگۆکرا. ئەی قسەی پاش ئەوە چییە، لە پاش دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا، سەبارەت بە تێڕوانینە جیهانییەکان لەمەڕ دیموکراسی؟



## *سەرهەڵدانی دیموکراسی*

لە کاتی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا، بە تایبەتی لە دوا چارەگیدا، جیهان بە شێوەیەکی بەرچاوتر دیموکراسیتر بوو. ئاڕاستەکە بێ هەڵە بوو. بەهێزو جیهانی بوو. شەپۆلێکی دیموکراسی هەبوو. شتێکی ڕاستە گەر دیموکراسی سەردەمێك لە سەردەمێکی تر زیاتر بێت، واتە وڵاتێکی خاوەن دیموکراسی تا هەتایە دیموکراسی دەبێت یان نا. بە پێی ئەو پێوەرە وڵاتانی دیموکراسی زیاتر بوون لە ساڵی ٢٠٠٠ لەوەی کە ١٩٥٠ یان ١٩٧٠ هەبون. هەروەها ڕاستە گەر دیموکراسی وەك بە پلە وەربگیرێ.

زۆربەی وڵاتان بوونە لیبراڵ لە دوا دەیەکانی سەدەی بیستەمدا، هەرچەن کە هەموویان سیستەمی لیبراڵیێ سیاسیان نەبوو. چین، بۆ نموونە، چەوساندنەوەی زۆر کەمتری هەبوو هەرچەند هێشتا دوورتر بوو لە هەڵبژاردنی گەل یان حکوومەتێك بە پێی دەستوور. کاتێ لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا هەموو جیهان نەبووبون بە دیموکراسی، هەروەها لە هەندێ ناوچەکانی جیهان پراکتیزو دەزگا لیبراڵییەکان زۆر دەگمەن بوون، لە هەموو شوێنێك هەموویان پێکەوە دیار نەمان، تاك و تەرا دەبینران.

بڵاوبوونەوەی دەزگا و پراکتیزە سیاسییە لیبراڵییەکان سێ هۆی بە یەکەو بەستراوی هەبوو: دیموکراسی سیستەمێکی دیموکراسی زۆربەی زلهێزانی جیهان بوو، ئەو سیستەمە سیاسیانەی کە دژی لیبراڵیزم بوون لە سەردەمی مۆدێرن لەکەداربوون، هەروەها خاسیەتەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی لە ڕووی مێژووییەوە یارمەتی دەر بوون بۆ بڵاوبوونەوەی سیاسەتی دیموکراسی.

دیموکراسی وەك داهێنانەکانی تر، لە خاڵی بنەڕەتییەوە بڵاوبۆو بۆ شوێنەکانی تر، چونکە بە پرۆسەیەکی سەرکەوتوو دەرکەوت، سەرنجڕاکێش بوو، هەروەها لە سەر بنچینەی ئارەزوو بەکاربرا. بڵاوبوونەوەی دیموکراسی گرینگە، بەڵام نەك وەك نموونەی بەدخووی بڵاووبوونەوەی کەلتوورە. هۆی سەرکەوتنەکەی لەو واقیعەوە هات کە وڵاتانی خاوەن سەروەری بەرزترن و بە بەرفراوانی پەسەندیان کرد بۆ هۆکاری سەرکەوتن و سامان و هێز، لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا سیستەمی تەواوی لیبراڵی سیاسیان هەبوو.

ئەو بارانەی یارمەتی دەربوون بۆ بڵاوبوونەوی دیموکراسی جیاوازبوون، زۆر کەمتریش تەواو بوون لەو بارە پێویستیانەی بۆ دروستکردنی دیموکراسی هەبوون. هەروەك لەگەڵ هەر داهێنانێنکدا، یەکەم نموونە زەحمەترین شتە، زۆر زەحمەتە بەدەستی بێنی، هەروەها لە هەندێ حاڵەتدا کۆمەڵە بارێکی باش بوون. دەستوور لە بەریتانیا پەیدابوو لە سەرەنجامی تێکەڵەیەکی جوگرافی و ڕێکی خاك و پێشکەوتنی ئابووری و ئایین و مێژوو، هەروەها زنجیرەی کەسایەتییەکانی مەلیك و ڕکابەرەکانیان. بەبێ هیچ شتێك لەمانە، مێژووی سیاسی بەریتانی، ڕەنگە بە بە شێوەیەکی تر پێشهاتبا. دیموکراسی ڕەنگە پەیدانەبوایە وەك ئەوەی لە ویلایەتە یەکگرتووەکان پەیدابوو بوو، بۆ وەرگرتنی نموونەیەکی تر، بە بێ چینی پارستن لە ئەورووپا زەریای ئەتڵەسی دیموکراسیان دابینکرد.

کاتێ بارودۆخی زۆر گەرم پێویست بێت بۆ دانانی یەکەم تەندەری سیاسەتی لیبراڵ لە سەر ڕووی زەوی، هەرکە زەوی بە مکوکمی دامەزرا دەتوانێ بە هەموو کەش و هەوایەکا بڵاو بێتەوە. کاتێ داهێنان دەگمەن بێت، زەحمەت بێت، هەوەرها تا ڕادەیەکیش مەسەلەی چانس و لاساییکردنەوە بوو، بە پێچەوانەوە، گشتی بوو، ئاسان بوو، هەروەها لەگەڵ ئەو سنوورانەی کە پێشبینیکراو بوون بەدی دێت.

ئەو بارانەی کە دروستکردنی دیموکراسیان گونجاند لە دوورگەکانی بەریتانیا و ئەمریکای باکوور هەموویان پێویست نەبوو بەرهەمبهێنرێنەوە لە ئەفریقیا تاوەکو ڕەگ لەوێ دابکوتێ. دیموکراسی لە ئەمریکا، بەریتانیا، هەروەها گەلێ شوێنی تر لە کۆتایی سەدەی بیستدا خۆی لەخۆیدا بارێك بوو، پێویست بوو هەرچەند بە ئاشکرا بەس نەبوو، بۆ دیموکراسی لە ئەفریقیا.

دیموکراسی زاڵی دوای جەنگی سارد بە تەواوی بەردەوام نەبوو. سەرهەڵدانی سیاسی لیبراڵ پچڕێنرا بوو، هەرچەند پارێزرابوو، پێشتر لە چاخی مۆدێرندا، بەڵام لەو بۆنانەی پێشووتر لیبراڵیزمی سیاسی ڕووبەڕووی ئەو کێشانە بوونەوە کە وادیارە ناتوانرێ حەل بکرێت، هەروەها ئەوەکەی تر، واپێدەچوو فۆرمی ڕێکخستنی سیاسی هەبێت. لە سەردەمی دوای جەنگی ساردا، بە لانی کەم بە شێوەیەکی کاتی بەدیلێکی ئاشکراو تەواو نەبوو بۆ لیبراڵیزمی سیاسی. بەهەقیقەت، سەرکەوتنی دیموکراسی ناتوانرێت، لە ڕووی مێژووییەوە، لە هەرەسی ڕکابەرەکانی جیابکرێتەوە.



سیستەمی سیاسی تەقلیدی بەرەنگاری کرانەوە بە هۆی شۆڕشی فەڕەنسی، لە سەدەی نۆزدەدا بەرگریان لێ کرا، هەروەها داماڵران لە کیشوەری ئەورووپا لە جەنگی جیهانی یەکەمدا. لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا، فۆرمی فاشیست ی نالیبراڵیزم لە ڕووی سەربازییەوە شکستی خوارد. لە نیوەی دووەمیدا، کۆمۆنیستی نالبراڵیزم لە ڕووی ئابوورییەوە وون بوو و بێهێز بوون. دوو ڕکابەری لیبراڵیزم نەك هەر تەنها شکستیان خوراد، هەروەها لە سومعەیان درا. هەر سیستەمێکی سیاسی بە لانی کەم بە ئاشکرا پشتی بەستا بوو لە سەر ئەو مشتومڕەی لە سەر دابەشی دیاری هێزی سیاسی کرا. ڕکابەرە تەقلیدی و نالیبراڵی لیبراڵیزم پشتی بەستا بوو بەو بانگەشانەی لە بەرژەوەندی فۆرمی تایبەتی نایەکسانی سیاسی بوون. مێژووی سیاسی سەردەمی مۆدێرن دوو سەدەی یەکەم لە نێو هەموو ئەوانی تر، مێژووی بێهێزکردن و لە کۆتاییدا دیارنەمانی ئەو بانگەشانەیە.

سیستەمی سیاسی تەقلیدی لە ڕێگەی لەدایك بوونییەوە هێزی سیاسی تەرخانکرد. مافە ئیلاهیانەی شاکان و بەرزی سروشتی ئەریستۆکراسی تاوەکو کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم لە ئەورووپا وەرگیرابوون. لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا، باوەڕ لەو بنەمایانە هەموو شتێکیان هەبوو، بەڵام ونبوون. لە سەدەی بیستدا، بانگەشەکان بۆ هێزی ڕژێمە نالیبراڵییەکان پشتی بەستا بوو بە بەرزی دانراوی خۆهەڵبژاردنی ئەندامانی حیزبی سیاسی تایبەت. لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا ئەو بانگەشەیەی لە سەر لینین و هیتلەر و ئەو حکوومەتانەی لە سەر وەستابوو کە دایانمەزراندبوو لە هەموو شوێنێك متمانەی گێڕایەوە.

لە سەدەی نۆزدەدا دوو جۆری نایەکسانی یەکبوون تەنانەت سەبارەت بە تەقلیدی سیاسی لیبراڵیشەوە. نایەکسانی لە سەر بنچینەی چینی کۆمەڵایەتی یەك بوو: تەنها ئەو پیاوانەی کە خاوەن زەوی و زار بوون مافی دەنگدانیان هەبوو. نایەکسانی لە سەر بنچینەی ڕەچەڵەك و نەتەوایەتی ئەوەکەی تر بوو: هەردووك ویلایەتە یەکگرتووەکان و بەریتاینا درێژەیان بە سیستەمی ئیمپراتۆری دا، بەریتانیا لە ڕووی دانیشتوان و ناوچەوە گەورەترین ناوچە بوو، کە تیایدا خەڵکی ئەوێ کەم و کوڕیان لە هێزی سیاسی هەبوو. لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا، هەردوو جۆری نایەکسانی لە وڵاتانی لیبراڵی ناوەوەی جیهان وەرنەدەگیرا هەروەها هاوکاری بەرجەستەی لە هەموو شوێنێکی تر کەم بووەوە. لە سەردەمی دوای جەنگی ساردا لە زۆر وڵاتدا کە تیایاندا لیبراڵی دیموکراسی غیاب بوو ئەمە عادەتەن وەك فەشەلێکی جێبەجێکردن

شیدەکرایەوە کەمتر لەوەی مەسەلەی بنەمایەك بێت. بێگومان شاز هەر هەبوو. پاشماوەکانی مشتومڕی بە بنەما بۆ نایەکسانی سیاسی کە ڕۆژێك لە ڕۆژان زاڵبوو بەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی سەر ڕووی زەوی بەردەوام بوون لە ماوەی دەیەی یەکەمی جەنگی ساردا، بەڵام ئەو بەرگرییە نیوە دڵانەی ڕۆیشتن لە لیبراڵیزمی سیاسی تەندروستی نەبوو.

لە دوو بەشی جیهاندا، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی عەرەبی و ئاسیای ڕۆژهەڵاتدا، مشتومڕەکان دژی یەکسانی سیاسی هەر دەبیسترا، هەرچەند کەم بوو. مشتومڕەکان جەختیان لە سەر ئامادەیی جیاوازییە کەلتوورییەکان لە نێوان ئەو دوو هەرێمەدا کردەوە و لانکی ڕۆژئاوای سیستەمی سیاسی لە جۆری نایەکسانی ئاشنا بوو لە ڕابردوودا، بەڵام یەکیان نەدەگرتەوە لەگەڵ بۆچوونەکانی لیبراڵیزمی سیاسی سەدەی بیست و یەك. سعوودییە لە لایەن ڕژێمێکی تەقلیدی حوکم کرا، مەلیکایەتییەکی بە میرات، چین لە لایەن حکوومەتێکی کۆمۆنیست حوکم کرا.

هەرتك کەلتووری سیاسی ئیسلامی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و کەلتووری سیاسی کۆنفۆشیۆی ئاسیای ناوەڕاست توخمی نالیبراڵی گرتەوە. جەختیان کردەوە لە سەر یەکگرتنی گروپ و هاوکاری کەمتر لە سەربەخۆیی تاك، هەروەها حەزیان لە بەهێزکردنی ئۆرتۆدۆکسی بوو لە سەر دانیشتنی ئازاد و گفتوگۆی ئازاد. وێڕای ئەمە، فەرمانڕەوا زیاتر دەسەڵاتدارێکی باوانی بوو بەسەر خێزانەوە لەوەی کە هاوڵاتییەکی هەڵبژێردراو بێت بۆ جێبەجێکردنی کۆمەڵێ ئەرکی سنووردار لە لایەن سەروەرییەکی گشتی. ئەوانەی حوکم دەکران دەیانتوانی شکایەت بکەن لە فەرمانڕەواکان لە هەرتك تەقلیدە ئیسلامی و کۆنفۆشیۆکان، بەڵام هەڵیان نەدەبژارد. فەرمانڕەواکان سنووردار بوون لە لایەن پابەندبوونێکی ئەخلاقی بۆ هەڵسوکەوتێکی دیار، بەڵام نەك بەهۆی سنوورەکانی دەستوور لە سەر دەسەڵاتیان.

لە چاخی مۆدێرندا، وێڕای ئەمە، هەرتك ئیسلامی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و چین ئەو ئەزموونەیان کرد، وڵاتانی لیبراڵی ڕۆژئاوا وەك مەترسی، دوژمنداریش بۆ بەرگەگرتنی بەهاکانی سیاسی ڕۆژئاوا وەك بەشێك لە ململانێیەکانیان دژی زاڵبوونی ڕۆژئاوا.

هێشتا، هەردوو تەقلیدەکە، هەرچەند بە دڵنیاییەوە ڕژئاوایی نەبوون، لە ڕووی یەك ڕەگەزییەوە دژی لیبراڵ نەبوون. ئیسلام گۆڕانی بەدەست هینا لە سەر حیسابی مەسیحییەت لە ساڵە سەرەتاکانیدا، چونکە باوەڕێکی سەربەخۆ بوو. کۆنفۆشیۆس ئەوەی فێری گەل کرد کە



فەرمانڕەوا نابێ بە هەڕەمەکی حوکم بکات بەڵکو دەبێ ڕێز لە یاسا ئەخلاقییەکان و نەریتەکان بگرێت. هیچ کامیان نە تەقلیدی ئیسلامی و نە هی کۆنفۆشیۆس ڕووداوە سیاسەکانی چاخی مۆدێرنیان نەگرت.

زۆربوونی ئێجگار لە قەبارەو خێرایی پرۆسەی بڵاوبوونەوەی کەلتوور شیاو کرا بە هۆی پێشکەوتنی تەکنیکی گەورە لە گواستنەوەو گەیاندن لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا، کە زۆربەشداری کرد لە دیارنەمانی کۆمیونیزمی ئۆرتۆدۆکسی، هەروەها ئایدیای لیبراڵی بۆ هەموو بەشێکی سەر ڕووی زەوی هێناکایەوە. زۆر بڵاوبوونەوە و زۆریش بەهێزبوون لە سەرەنجامی جەنگی ساردا هیچ وڵاتێك نەیدەتوانی بە تەواوی بیانتاشێت یانیش پشت گوێیان بخات. هەندێ وڵات، بۆ دڵنیابوون، لە هەندێ وڵاتی تر باریان مەترسیدارتر بوو. ئەوە بە ڕێکەوت نەبوو کە لیبراڵیزمی سیاسی زووتر و بە توندی ڕەگی لە دەرەوەی وڵاتانی ناوەوەی ڕۆژئاوا لەو شوێنانەی کە کە بەشێك بوون لە ئیپراتۆری بەریتانی داکوتا. بەریتانییەکان تەقلیدی سیاسی خۆیان هەنارد بۆ هیندستان، لە ئەنجامدا، بوون بە شێك لە تەقلیدی هیندستانیش.

لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا، ئایدییە سیاسییە لیبراڵییەکان جیهانیان داگیرکرد، تەنانەت لەو شوێنانەی کە ڕەگی بنەڕەتی هەرگیز بە ئەنقەست لانەبراون. گەر مێژووی وڵاتێك پێکهاتبێت لە خاسیەتەکانی ڕابردوو کە ئەگێندای ئێستا دروست دەکات، کەواتە شۆڕشی مەزنی ١٦٨٨، کە عادەتەن بە سەرکەوتنی دەستووری ئینگلتەرای وەسف دەکرێت، سێ سەدە دواتر، کاریگەر بوو بە بەشێك لە مێژوی چینی و عەرەبیش، لەو ڕووەی کە هیچ کامیان نەیاندەتوانی ئەو ئایدیانە پشتگوێ بخەن، چونکە بە پێوەستە بە گەل. لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا هەرتك ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی عەرەبی و ئاسیای ڕۆژهەڵاتی کۆنفۆشیۆ سیستەمی سیاسی لیبراڵی دەستەبەرکرد، یان بەلانی کەم توخەماکانیانی دەستەبەرکرد. گەلێ دیموکراسی تەواو پێشکەوتوو لە ئاسیای ڕۆژهەڵات هەبوون، لەگەڵ یەکێکی چینینش لە سەر دوورگەی تایوان. بەشێك هەڵبژاردنی ئازاد و دەسەڵاتی یاسادانان بە هەندێ دەسەڵاتەوە بەدەرکەوت لە ژیانی سیاسی جیهانی عەرەبی. لە نەوەدەکان نموونە نیمچە لیبراڵییەکان ئوردن و کوێت و قەتەر بوون، کە لە هەریەکەیان، مەلیك دەسەڵاتی ڕەهای وەرگتووە.

وێڕای ئەمە، ڕژێمەکانی چین و سعوودییە لە بەرگری تایبەت بە خۆیان بانگەشەی ئەوەیان نەکرد کە ڕکابەرە تەقلیدی و نالیبراڵییەکانی دیموکراسی دووپاتی کردەوەوە لە سەدەی نۆزدە و بیستەم، کە لیبراڵیزمی سیاسی نەخوازراو نەبوو بە بنەما، بۆیەش لە هەموو شوێنێك ئامۆژگارییەکی نەخۆشی کردووە. دووپاتی ئەوەیان کردەوە، کە هەرچی سوودێکی ل هەر شوێنێك، گونجا نەبوو بۆ ئەوان نەیکەن. هەروەها هیچ کامیشیان بەدوای بنەمای سیاسی نەکەوتن کە لیبراڵیزمی سیاسی بڵاوکردەوە بە شێوەیەکی باش. شانشینی سعوودی زۆرترین دووپاتی لە سەر نەوتەکەی کردەوە کە نەوتەکەشی لە لایەن تەکنۆکراتە مۆدێرن و ڕووناکبیرە ڕۆژئاواییەکان بەڕێوە دەبرا. حیزبی کۆمۆنیستی چینی، ڕێگەی بە زۆربەی ژیانی ئابووری وڵاتەکەیدا حوکم بکرێت بە بنەماکانی بازاڕی ئازاد، کە ناوەڕۆکی ئابووری لیبراڵیزمە.

هەروەها هیچ کام لە حکوومەتی چین و سعوودییە پشتیان نەبەستا بە پەسەندی ئارەزوومەندانەی نایەکسانی سیاسی بۆ مانەوە لە دەسەڵات. هەردووکیان دەستیانکرد بە چەوساندنەوەیەکی هەڵبژێراو. هەردووکیان سعوودییە و چین پشتیان بەستا بە ڕەشوەو زۆرداری. خێزانی شای سعوودی کاتێ حیسەیەکی باشی بۆ خۆی گلداوەتەوە، بەشێکی ئێجگار زۆری لە سامانی نەوتەکەی تەرخانکرد بۆ باشترین و شادترین ژیان بۆ دارودەستەی شانشینەکە. بەهەمان شێوە، ڕژێمی کۆمۆنیستی چینی پشتی بەست بەو گەشە ئابوورییەی کە لە هەشتاکان و نەوەدەکان بەدەستی هێنا بۆ قایلکردنی گەلی چین تا حوکمەکەی پەسەند بکەن.

وێڕای ئەمە، هەردوو ڕژێمی چین و سعوودییە پشتیان بەستا بە سەرچاوەیەکی تر گەر ناشەرعیش بووبێت کە کەمترین لێبوردنە لە سەر بەشێکی ئەوانەی کە حوکمیان دەکرد ئەویش ترسی شتێکی خراپتر. مەلیکایەتی سعوودی ئەوەی دووپاتکردەوە کە بەدیل بۆ حوکمەکەی دیموکراسی لیبراڵی ڕۆژئاوا نەبوو، بەڵکو ئوسوڵییەتی ئیسلامییە لەو جۆرەی کە دامەزرا لە ئێران، بووە هۆی وروژانی شەڕێکی ناوخۆ لە جەزائیر، پابەنبوونی بەدەستهێنا لە تەواوی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، هەروەها تەقاندنەوەی هێرشەکانی تیرۆریستی دژی ویلایەتە یەکگرتوەکان (کە مەلیکایەتی هەوڵی پاراستنی دا لە ماڵەوە بۆ ئارامکردنی). کۆمۆنیستە چینینەکان بانگەشەی ئەوەیانکرد کە بە بێ حوکمیان وڵاتەکەیان دەکەوێتە جۆرێك لە فەوزایەکی زەبروزەنگ کە لێیەوە وڵات ئازاری چەشتووە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا.



سیاسەتە لیبراڵییەکان بزوێنەرێکی گوێزەرەوەیە. لە سەرەنجامی جەنگی ساردا، بەڵام نەك هەموو هەرێمەکان بە یەکسانی بەخێرهاتنی سەرورەی گەل و دەستووریان کرد، چونکە هەموو ئەمانە بارودۆخی یارمەتی دەر بوون بۆ لیبراڵیزمی سیاسی. هێشتا، کۆپەیوەندی دیموکراسی لە سەر سەرهەڵدانی جیهانی دوای جەنگی ساردا بوون.

دیارترینیان، ئەو بارودۆخەی کە سیاسەتی لیبراڵ بەهێزترینان بوو، بەرزبوونەوەی داهاتی هەر تاکێك بوو. هەرچەند دانیشتوانی وڵاتێك زەنگینتربوان، هەموو شتەکانی تر یەکسان بوون، ئەوەندە دەزگاو پراکتیزەکردنی لیبراڵیان تێدا دەچسپا. تێکەڵبێبوونەکە شتێکی دیار و ئاشکرا بوو: داهات دەبێتە هۆی دەرخواردنی سەربەخۆیی، ئارەزووی زانین، کات بۆ دبەشداریکردن لە کاروباری گشتی و خەڵکی، هەروەها مانایەك بۆ بەرپرسیارێتی بۆ ئەوان.

لە ئاسیای ڕۆژهەڵاتدا، لە دوا دوو دەیەی سەدەی بیستەمدا تێکەڵی نێوان داهات و دیموکراسی زۆر نزیك بوو. وڵاتانی ناوچەکە پراکتیزێکی ڕێك و بەردەوامی بەرکاربردنی سیستەمی لیبراڵییە سیاسەکانیان خستەڕوو هەرکە ئاستی کەسی سامانی باش بوو. سەرەنجام پێشبینی ڕێچکەی خاوەنێتی لە ماڵی ئەمریکاوە لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا کرا کە تیایدا کاتێ خێزانەکان داهاتیان بەرزبۆوە بۆ ئاستێکی دیاریکراو، بە بەردەوام لە شارەکانەوە بەرەو لادێکان چوون. ئاستی بەرزی خوێندن و خوێدنەواری پەیوەست بوون بە سیاسەتی لیبراڵ. خەڵکی خوێندەواری باشتر زیاتر لە ڕووی سیاسییەوە چالاك بوون و ڕەتی ئەو مەزهەبانەیان کردەوە کە دەیانگەیەنێت بە بارودۆخێکی سیاسی و هەست بە کەمی کردن. ئاستە پەروەردەییەکانیش، لە هەمانکاتدا بە ڕێژەیەکی زۆرتر لە سەرانسەری جیهان بەرز بۆوە. کۆچ لە دەوروبەری شار بۆ نێو شار، پۆلێکی دیموگرافی چاخی مۆدیرن بوو لە بەر سەرەنجامی شۆڕشی پیشەسازی، هەروەها بە گشتی دەچێتەوە سەر پەرەپێدانی سیاسەتی لیبراڵ، بە تایبەتی بەشداری گەل. دەستەواژەیەکی چاخی ناوەڕاست هەیە دەڵێ " هەوای شار ئازادی بەرەوپێشدەبات" " stadtluft macbt frei"، ئەم قسەیە هەندێ بنەمای هەیە لە ئەزموونی مۆدێرندا.

لەکۆتاییدا، تەکنەلۆژیاکانی گەیاندن لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا سەروەری گەل و دەستووری دروستکرد تا ئەو ڕادەیەی کە ئەو تەکنەلۆژیانە خۆیان بڵاوبوونەوە. بێگومان، مێژوو هیچ پەیوەندییەکی یەك سەرەو سادە ناخاتە ڕوو لە نێوان پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاو

فرەوانبوونی سەربەخۆیی. رۆژنامەوانی چاپکراو یەکی گرتەوە لەگەڵ حوکمی تەقلیدی سەدەکان، تێلێگراف و تەلەفۆن و تەلەفیزۆنیش بڵاوبونەوە لە سیستەمەکانی سیاسەتی نالیبراڵییەکان لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا، بەڵام داهێنانەکانی بەشی کۆتایی ئەو سەدەیە، ئامێری ئاسانکراو کاسێتی گوێگرو لە سەرووی هەمووشیانەوە ئینتەرنێت، واپێدەچیت لە ڕووی میراتەوە یاخین لە حوکمی نادیموکراسی.

ناتوانرێت وا خێرا سانسۆر بکرێن یان بەکاربهێنرێن وەك کەناڵی تایبەت بۆ پەخشکردنی ڕای ڕەسمی. ئەو زانیاریانەی ئەوان دەیگوازنەوە دەتوانن کۆنترۆلی دەسەڵات دابتاشن، هەروەها سەنتەری کۆنترۆلی زانیاریش یەکێك لە حوکمە یاخییەکانی نادیموکراسی بوون لە سەدەی بیستەمدا. لە یەکێتیی سۆڤیەتدا پراکتیزەکردنی samizdat" واتە بڵاوکردنەوەی نووسینی بێ دەسەڵات بەخۆت، بە جەماوەرێکی سنوورداری شلۆق وەردەگیرا. هەندێ دەقی حەرامکراوی کتێب یان وتار دەربڕی سەربەخۆیی بون بە نهێنی دروستکران هەروەها دەوردەدران بە نهێنی. ئینتەرنێت سامیزداتە لە پێورەیێکی زۆر فراوان، خاوەن هەر کۆمپیوتەرێك هەردووکیانە هەم بڵاوکەرەوە هەم خوێنەر، کە زۆر زەحمەترە، هەروەها مەحاڵیشە کۆنترۆل بکرێت.

تێکەڵی سیاسەتی لیبراڵ لەگەڵ سەرکەوتنی ئابووری، ژیانی شارستانی، خوێندەورای و خوێندن و پەروەردە، هەروەها داهێنانەکانی لە تەکنەلۆژیای زانیاری کۆتای سەدەی بیستەم، وەك تێکەڵی نێوان حوکمی دیموکراسی و پەیڕەوی نێودەوڵەتی ئاشتییە، ئاڕاستەیەك، پێش کارەکتەرێك نەك یاسایەکی بەردەوامی سیاسەت. چەند شەوازێك هەیە بۆ شێوازەکە: لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا هیندستان، بە داهاتی کەمی هەر تاکێك، سەرکردەکانی خۆی نزیکەی بە هەڵبژاردنی ئازاد هەڵبژارد، سەنغافورا، بە پێوەرێکی زۆر بەرزی گوزەرکردن و ژین، بە هەڵبژاردنی ئازاد سەرکردەکانی خۆی هەڵنەبژارد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تێکەڵەیەك وجودی هەبوو، هەروەها بڵاوبوونەوەی خاسیەتەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی دیموکراسی ئاوێتەی بوو، تێکەڵ بوو لەگەڵ سەرکەوتنی وڵاتانی لیبراڵی ناوەوەی جیهان لە جەنگی سارد، دیموکراسی سەریهەڵدا بۆ باری ڕەها لە جیهانی دوای جەنگی ساردا، بەڵام، هەرچەندە ڕەها بوو، دیموکراسی جیهانی نەبوو، بەهێزبوو، بڵاوبووەوە، هەروەها بە بێ بەرەنگاری بوونەوەی گەورە دیموکراسی هەر لە سەرانسەری جیهان بڵاو نەبۆوە.



نزیکەی دووسەد وڵات ئەندامی کۆمەڵگای وڵاتانی خاوەن سەروەری بوون، بەڵام هەموویان بە تەواوی لیبراڵ نەبوون، ژمارەیەکی باش هەرگیز لیبراڵ نەبوون. بەسەرێك ئەمە دەکرێ لە ڕێگەی جیاوازییە فراوانەکانی ئەو ڕادەیەی کە چەند سەدەیەك خاوەنی کۆپەیوەندی کۆمەڵایەتی سیاسەتە لیبراڵییەکانە شیبکرێتەوە. بەسەرێکیش مەسەلەکە تەنها کات دیاریکردن بوو. دیموکراسی لیبراڵ کاری شەوێك نییە دامەزرێت یان بهێنرێتە کایەوە تەنانەت هەندێ وڵات بەم دواییە دەستیان پێ کردووە. ویلایەتە یەکگرتووەکان یەکەم هەوڵی نا بۆ سەروەرییەکی تەواوی گەل و دەستوورنووسین لە سەدەی هەژدەهەمدا، بەریتانیا نزیکەی پێش ئەویش. لە سەرەتای هەزارەی نوێدا ڕووسیا دەستی بەو ڕێگایەکردبوو کەمتر لە دەیەیەك. پێشکەوتنی دواتر پەیوەستکران بەو ڕێچکەیەی لە پاڵ وڵاتانی ناوەوی دیموکراسی جیهان.

بەڵام ئەمە تەواوی مەسەلەکە نەبوو. حوکمی ناڕێکی بڵاوبوونەوە دیموکراسی لە سەرەنجامی جەنگی سارد دوو هۆی تری هەبوو، کە خراڕوو لە لایەن ئەزموونەکانی دوو گرینگترین وڵاتی دەرەوەی وڵاتانی ناوەوی لیبراڵی جیهان، ئەوانیش ڕووسیا و چین بوون.

### *دیموکراسی دام و دەزگاکان*

لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا، ڕووسیا و چین ئەو دوو شوێنە بوون لە جیهان کە چەسپاندنی سیاسەتە لیبراڵییەکان هێزی ئەوەی هەبوو فراوانترین کاریگەری نێودەوڵەتی هەبێت. ئەو دوو وڵاتە بوون دەکرێ کە سیاسەتەکانیان بە ئاسانترین شێوە ببێتە هۆی جەنگ. لە هەر حاڵەتێکدا سەرچاوەکانی ململانێ ئاسان دەکرێت تا ئەو ڕادەیەی کە لیبراڵیزمی سیاسی بەرپرسیارێتی هەڵبگرێت. هەریەکە و کەمتر شەڕ دەکات لەگەڵ دراوسێکانی تائێستا وەك خەڵکی گشتی حکوومەت هەڵدەبژێرن بەرپرسیار کراون بە بڕیاردان بۆ جەنگ. ڕۆحی دەستوورنووسین و بۆچوونی دیموکراسی و ڕێگە چارەی مام ناوەند هێزی ئەوەی هەبوو بۆ یارمەتی دانی چارەسەرکردنی پرسە سیاسەکان کە ڕووسییەکان چووبوونە شەڕ لەگەڵ چیچان، هەر لە سەر ئەو پرسانەش چینییەکان هەڕەشەی ئەوەیان کرد کە بەشەڕبێن لە سەر تایوان. بۆچوونەکانی لەمەڕ ئاشتی لە جیهانی دوای جەنگی ساردا، دەکرێ بووترێت بەسەرێك پشت ببەستێت بە بۆچوونەکانی لیبراڵیزمی سیاسی لەو دوو وڵاتەدا.

سیستەمی سیاسییەکانیان چەند خاسیەتێکی هاوبەشیان هەبوو. کۆمیونیزمی ئۆرتۆدۆکس لە هەردووکیاندا مردبوو. زۆر زەحمەت دەبوو بۆ دۆزینەوەی تەنانەت بەرپرسێکی حیزبی لە چین کە باوەڕی بە کارە سیاسەکانی ماو زیدۆنگ بێت و پێی هەڵە نەبێت هەروەها تەنانەت حیزبی کۆمۆنیستی فیدراسیۆنی ڕووسیاش خولیای گەڕانەوەی بۆ سەر سیستەمی ستالینی و سیستەمی ئابووری بێت.

هەرکە سەدەی نوێ دەستیپێکرد نە ڕووسیا و نە چین ئەزموونێکی ڕاستەوخۆیان نەبوو زۆر لەگەڵ لیبراڵیزمی سیاسی. هەردووکیان حوکم دەکران تاوەکو سەرەتاکانی سەدەی بیستەم لە لایەن ئۆتۆکراسییە تەقلیدییەکان. لە سەدەی نۆزدەهەمدا زۆربەی مەلیەکە ڕەهاکانی ئەوروپا هەندێ ڕێگایان کردەوە بۆ دەستوورنووسین، بێگومان کەمبەکان زیاتر کۆتەکانیان لە سەر ئاستی هەرێمی پەسەند کرد. ڕۆمانۆڤ و بنەماڵەکانی کینگ وایان نەکرد. دەسەڵاتیان بە ڕەهایی مایەوە.

لە هەردوو وڵاتدا مومارەسە لیبراڵییەکان دواکەوتن، هێدی هێدی دانران، فەشەلیان هێنا لە چاندنی ڕەگی قووڵ، هەروەها زووش دیار نەمان لە لایەن هێزە داگیرکەرەکانی نالیبراڵیزمی کۆمۆنیست. تەنها پاش ١٨٩٥ هەیچ کامیان بە شێوەیەکی نارەسمی بەشێك نەبوون لە دادگا هەبوونی هیچ خاڵێك بۆ کاریگەری لە سەر سیاسەتی ڕەسمی چینی نەبوو. لە ١٩٠٥دا ڕووسیا پەرلەمانی دانا. هەروەها لیبراڵیزمی چین و ڕووسی نیمچە دوودڵ بوون، کە لابران لە لایەن حیزبە کۆمۆنیستەکان شوێنیان گیرایەوە بە دوو ڕژێمی نالیبرالی لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستمدا.

گەر دیموکراسی بۆچوونێك بێت یان نا، گەر جیهان دابەش کرێتە سەر سەر دیموکراسی و غەیرە دیموکراسی، ئەوا ڕووسیای دوای جەنگی سارد بە دیموکراسی دادەنرێت. بەرپرسە گشتیەکان دەستنیشان دەکران بە هۆی هەڵبژاردنەوە کە تیایدا هەموو هەرزەکارێك دەیتوانی دەنگ بدات. هەڵبژاردنەکانی ڕووسیا مۆدیلی ئەدەبانە نەبوو: یاساکانی هەڵبژاردن بە ڕاستی جێبەجێ نەدەکران، پارەی هەرێمە بەگومانەکان ڕۆڵێکی گەورەی گێڕا لە ئەنجامەکانیان، هەروەها دوا هەژماردنیش تەواو ورد نەبوو، بەڵام هەڵمەتەکانی هەڵبژاردن بە ئاشکراو و کراوە بوو، دەنگدان نزیکەی ئازادانە بوو، هەروەها بۆ یەکسانی گشتی هەڵبژاردنەکانی ڕووسیا لە



نەوەدەکان بە تەواوی ئازاری نەچەشت لە لایەن بەراوردکردن لەگەڵ هەر هەڵبژاردنێکی کە کرابێت لە هەر شوێنێك لە سەدەی بیستەمدا، بە وڵاتانی ناوەوەی ڕۆژئاواشەوە.

سەبارەت بە سەروەری گەلیش، ڕووسیای دوای جەنگی سارد دەستووری پراکتیزکرد، بەلانی کەم لە سەر کاغەز. دەسەڵات دابەشکرا بوو لە نێوان سەرۆکی فیدراڵ و پەرلەمان و حکوومەتی هەرێمی، بەڵام دەسەڵاتی تەشریعی، دوما، دەسەڵاتێکی کاریگەر کەم بوو. یەکەم سەرۆکی هەڵبژێردراوی ڕووسیا، بۆریس یەڵتسین بوو، زیاتر حوکمی کرد بە دەرکردنی بڕیار و وتار لەوەی پرۆسەی ڕەق و زەحمەتی ورژاندنی تەشریعی لە ڕێگای پەرلەمانی پڕ لە کەرت. پارێزگارە هەرێمییەکان زیاتر بە شێوەیەکی هەڕەمەکی کاریان نەکردو پەیڕەوی گەندەڵیشیان نەکرد. لە هیچ ئاستێکی حکوومەتی ڕووسی بەرپرس نەبوو بە شێوەیەکی کاریگەر وەڵامی هەبێت بۆ داواکانی دەنگدەر.

بە پێی پێورەکان یان نا چین دیموکراسی نەبوو، حیزبی کۆمیونیزم دەسەڵاتی سیاسی قۆرخکردبوو، بە دڕندەترین شێوە مامەڵەی لەگەڵ هەرکەسێ دەکرد کە پرسیاری لە قۆرخکردنەکەی بکات و یان هەر گروپێك کە هەوڵی سەربەخۆبوون بدات. هەتا، لە حاڵەتی مەزهەبی ئایینی فالون گۆنگ " Falun Gong" بۆ ئامانجە غەیرە سیاسییەکانیش. حکوومەت سەرکوتی ئەو خۆپیشاندانەی کرد کە لە گۆڕەپانی تیانانمێن لە بێجینگ کرا " Tiananmen Square" هەروەها لە شارەکانی تر لە مانگی شەشی ١٩٨٩ هەمانی خاڵی دروستکرد هەروەك دەستێوەردانی سەربازی سۆڤیەت لە هەنگاریا لە ساڵی ١٩٥٦ ئەنجامیدا و چیکۆسلۆفاکیا لە ساڵی ١٩٦٨ و هێرشی کتوپڕی لە سەر بزوتنەوەی هاوکاری یەکێتیی بازرگانی ئازاد لە پۆڵەندا لە ساڵی ١٩٨١: هیچ بەرەنگارییەك بۆ دەسەڵاتی ڕەهای حیزبی کۆمۆنیست قەبوڵناکرێ و لێی نابوورێت.

هێشتا، چین دوای جەنگی سارد هەندێ خاسیەتی سیاسەتە لیبراڵییەکانی بە دەستکارییەوە خستەڕوو. حکوومەت بە جۆرێك لە جۆرەکان ململانێی هەڵبژاردنە ناوخۆییەکانی کرد لەگەڵ لادێکانی وڵاتدا. پەرلەمان و کۆنگرێسی نەتەوەیی گەل، لەکاتێکدا بە ئازادی هەڵنەبژێران چەند نیشانەیەکی ئارەزوومەندانەیان خستەڕوو جیابوون لەوانەی سەرکردە کۆمۆنیستە باڵاکان. گوڵڕازی بازاڕی ئابووری بەرژەوەندی جیا جیای ئابووری دروستکردبوو کە دەبوایە لەگەڵ پێکهاتەی سیاسەتی گشتی موسالەحە بکات، هەروەها دام و

دەزگا بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە دەستی بە پێشکەوتن کردبوو. خاسیەتە کۆمەڵایەتییەکان تێکەڵ بە سیاسەتە لیبراڵییەکان و سامان و پەروەردە و خوێندن و دانیشتوانێکی شارستانی، هەموویان لە سەرەنجامی جەنگی ساردا لە چین بەخێرایی سەریانهەڵدەدا.

گەر ڕووسیا فۆرمەکانی لیبراڵیزمی سیاسی هەبووبێت بە بێ ناوەڕۆك ئەوا، چین هەندێ لەو ناوەڕۆکەی هەبوو بە بێ ڕێگای ئەو فۆرمانە. هیچ کامیان نەگەیشتن بە پێورەکانی ئەو لیبراڵیزمە سیاسەی کە لە ئەوروپای ڕۆژئاوا و لە ئەمریکای باکوور و ژاپۆندا دامەزرابوو، بەڵام بەربەستی هەرە سەرەکی جیابوو لە هەریەك لە چین و ڕووسیا.

لە چین ئەوە بەرگەگرتنی نوخبەی سیاسی بوو، شتێك کە لە نیوەی دووەمی سەدەی بیست و یەکدا، گشتیترین بەربەست بوو بۆ لیبراڵیزمی سیاسی. هەرچەند نوخبەکان لە سەر ڕێگای دیموکراسی وەستابان دەیانتوانی عادەتەن ئەو ڕێگایە دابخەن. بە پێی ئەوانەوە، گۆڕان بۆ دیموکراسی زۆربەی جار ڕوویدا کاتێ نوخبەی سیاسی، یان بەشێکی ئەو نوخبەیە، ئەوەی لە بەرژەوەندی دابوو و ڕێگەی پێدات، هانی دا، هەتا یارمەتیشی دا بۆ ڕوودانی. ئەمە بەگشتی ئەو شتە بوو کە لە کۆمۆنیستی ئەوروپادا ڕوویدا لە ١٩٨٩ و ساڵی ١٩٩١.

لە ڕووسیا بەربەست بۆ کارکردنی بنەماکانی دیموکراسی دەستووری جیا بوو: حکوومەت توانای ئەوەی نەبوو ئەرکە گشتییەکان جێبەجێبکات کە لیبراڵیزمی سیاسی داوای دەکات. لەم کەم کورییەدا حکوومەت بە تەنها نەبوو. لە سەردەمی ماوەی دوای جەنگی ساردا، بێهێزی ڕووسیا کێشەیەکی بەهێز و پەرت وبڵاو بوو.

بارودۆخ لە ڕووسیا بە قەد گەلێ لە وڵاتانی دەرەوەی جیهان بێهێز نەبوو، بۆ نموونە لەزۆربەی سەب ساهەرانی ئەفریقیا (Sub Saharan) لەو شوێنەی کە بە تەواوی هەرەسی هێنا هەروەها لەو شوێنەی مەلیك حوکمی دەکرد. وڵاتی ڕووسیا هەرەسی نەهێنا لە ئەرکی بنچینەیی حکوومەت، فەرمانی بەردەوام، هەرچەند ڕووسیای دوای کۆمۆنیست شوێنێکی تەواو ڕێك و تایبەت نەبوو. بێهێزی ڕووسیا هەمان شت نەبوو بە بەراورد لەگەڵ ڕوخانی وڵات. حکوومەتی ڕووسیا ئەوەندە بەهێز نەبوو پاڵپشتی سیستەمێکی سیاسی لیبراڵ یان ئابوورییەکی لیبراڵ بکات. وڵاتێکی کارکردەی لەو جۆرە کە ڕووسیا کەمو کوڕی هەبوو پێویست بوو بۆ هەردوو خاسیەتی سیستەمی سیاسی لیبراڵ. تەنها وڵات دەتوانێت هەڵبژاردن ڕێکبخات و ئەنجامی بدات، ئازادی و یەکسانی ئەو هەڵبژاردنانە دووپات کاتەوە. وڵاتێك



گرینگی بۆ حکوومەتێکی دەستووری هەبوو. سنووردانان لە سەر هێزی دەسەڵات ناوچەیەکی ئۆتۆنۆمی دروستکرد بۆ کاری تاك. چەمکی گشتی بۆ ئەو ناوچانە مافەکانە، مافەکانیش دەبێ بپارێزرێن. یەکێك یان شتێك دەبێ شورەیەك دروستکات و بیپارێزێت لە چواردەوری ئەو ناوچە حیجزکراوانە هەروەها هەڵوێستی هەبێت گەر شکێنران یان پێشێلکران. ئەو شتە، بێگومان وڵاتە. مافەکان وەك پاراستنی ژینگەو بەرگری نەتەوەیی پێداویستی گشتین بۆ خەڵك. ئەو مافانە زامن دەکرێن نەك تەنها بە کاری تاك، بەڵکو بەکاری کۆمەڵ، کاریگەرترین وەکیلی کاری بەکۆمەڵ وڵاتە.

لەکاتی جەنگی ساردا، وڵاتانی خاوەن سەروەی جیهان، دەکرێ بەسەر سێ پۆلێندا دابەشکرێن: جیهانێکی ئازادی لیبراڵ، جیهانی کۆمۆنیست، هەروەها جیهانی سێیەم، وڵاتانی جیهانی سێیەم دەکرێ هەڵبژێرن یەك لەم دوونە کە پێیەوە بلکێن. ڕێکخستنی سیاسی بە مەسەلەی ئیختیار سەیردەکرا، لەگەڵ وڵاتانی نەبەستراو وەك کریارەکان لەگەڵ ئیختیارێك لە نێوان بەرهەم و ڕکابەرەکان. گۆڕانێك لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر، کاتێ ئەو گۆڕانە زۆرجار نابێت، هەمیشە ئەگەرێك بووە. هەروەك لە مەسەلەی گۆڕانی ئایینی دا، دەستهەڵگرتن لە ئیمانێك و پابەندبوون بە یەکێکی تر، ڕەنگە لە ڕووی سایکۆلۆژییە و زەحمەت بێت بڕیاری ئەوە بدات پشتیوانی بگۆڕی بۆ لایەکی تر، بەڵام هەرکە بوو، بڕیاری ئەنجامدانی ئەم کارە وا بیر لێ دەکرایەوە کە ئاسان بێت بۆ جێبەجێکردن.

گۆڕانێك لە سیاسەتی دەرەوە، وەك ئەوەی چین لە سۆڤیەتەوە بۆ کامپی ڕۆژئاوایی لە حەوتاکان، بە شێوەیەکی ڕێژەیی سادە بوو، وەك ئەندامێکی پەرلەمانی بەریتانی دڵسۆزی لایەنی پارتیزانی دەگۆڕێت بە هۆی تێپەڕبوونی بە نێو ڕیڕەوی ئەنجوومەنی پیرانی بەریتانی لە بنەچەکانی حیزبێکەوە بۆ ئەوانی تر لە حیزبەکانی تر. ئەمە مەسەلەی ئەوەیە تۆ تفەنگەکەت بە ئاراستەی هەمەجۆر بگێڕیت، بەڵام گۆڕینی سیستەمی سیاسی ناوخۆ، بە تایبەتی گۆڕانێك بکەیت لە نالیبراڵیزمی کۆمۆنیستەوە بۆ لیبراڵیزم، هەموو شتێك بوو بەس ئاسان نەبوو، گریمانەی ئەوەی کە ئەمە بە خێرایی بەدەست دێت بە هەڵە گەڕایەوە، چونکە بەندە بە هەڵەیەك لەبارەی کارەکتەری وڵاتەوە.

وادانرابوو، بەبێ ئەوەی مەسەلەکە بە جدی وەربگیرێت، وڵاتانی دوای سەدەی بیستەم یەك دەگرنەوە لەگەڵ هەردوو پراکتیز و دام و دەزگا سیاسە نالیبراڵییەکان و گۆڕانیش لە سیاسەت

نالیبرالّییەکانەوە بۆ لیبرالّ وەك گۆڕانی یاری سەبەتەیە کە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە دەکرێت بۆ هەمان ئەو یارییەی کە لە ژێر یاسا نێودەوڵەتییەکانەوە دەکرێت. چەند جیاوازییەکی لاوەکی هەیە لە نێوان ئەمانە: بۆ نموونە درێژی گەمەکە، هەروەها دووری لە ئامانجەوە کە گەر ئامانجبکرێت سێ خالّ دەژمێردرێت لەوەی کە دوو بێت، بەڵام هەردوو بارەکە لە بنەڕەتدا وەك یەکن و ئەو یاریزانەی بە یەکێکیان ڕاهاتبێت بە خێرایی بۆ ئەوەکەی تریش دەتوانێت. بە هەقیقەت، جیاوازی نێوان سیاسەتە لیبرالّی و نالیبرالّییەکان دەرکەوت چوون یەکن لەگەلّ ئەو جیاوازییەی نێوان سەلەو لەگەلّ گەمەیەکی تەواو جیاوازی وەك تائیرە کە کۆمەلّە بەهرەیەکی تری پێویستە کە چەند سالّی دەوێ بۆ ڕێبەریکردن، خالّێك کە بە ئاشکاریی خرا ڕوو لە نەوەدەکان کاتێ باشترین یاریزانی تۆپی سەبەتەی جیهان مایکلّ جۆردن، هەولّی دا لە بەیسبۆلّ یاری بکات، بەڵام هەرەسی هێنا لەوەی کە دارەکە بگرێتە دەست و یان پەنجەوانەکە لەدەست بکات هیچ شتێکی بە یاریکەرێکی لێهاتوو نەدەچوو ئەو ئاستەی نیشان نەدا کە لە تۆپی سەبەتە هەیبوو.

هەرچەند هیچ وەڵامێکی ڕاستەوخۆ بۆ ئەو پرسیارەی کە چۆن ولاّتێکی گونجاو دەکرێ دروستبکرێت ئاشکرا نەبوو لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا، دوو خالّی پەیوەست بەم مەسەلەوە پەیدا بوو. یەکێکیان ئەوەبوو کە دروستکردنی ولاّتێکی گونجاو بە خێرایی یان بە ئاسانی ناکرێت. ولاّتێکی لیبرالّ و چالاّك و ماف پارێز ئەنجامی نەك هەر تەنها سیاسەتە ئەنقەستەکانە، بەلّکو هی عادەت و بەهرەو ئەزموونیشە کە بەسەریەکدا کەلّەکە بووین لە ماوەیەکی درێژدا. یەکێك لە خاسیتە ناسراوەکانی پێکهاتەی ولاّتانی ڕۆژئاوا لەو چیرۆکە وەرگیرا کاتێ بە گینا لۆلابریگیدا دەست پێدەکات و بە هەمفێری بۆگارت تەواو دەبێت، لە فلیمێکدا لە سالّی ١٩٤٥ بە ناوی " بیت زە دێڤلّ" خرا ڕوو. ئەو فیلمە باسی ئەوە دەکات کە ئەمریکییەك پرسیار لە باخچەوانێکی ئینگلیز دەکات چۆن ولاّتەکەی ئەو جۆرە فریزە جوانەی بەرهەم هێناوە، ئەو وەڵام دەداتەوە و نهێنییەکەی ئاشکرا دەکا کە بەم شێوەیە " هەندێ فریزی باش بهێنەو هەموو ڕۆژێك بۆ ماوەی شەش سەد سالّ بیچینە"

خالّی دووەم ئەوەیە کە دروستکردنی ولاّتێکی مۆدێرن و لیبرالّ و ماف پارێز بێئومێدییەکی گەورەیە، زەحمەتی دروستکردنی ولاّتێکی لەو جۆرە بە بێ هەبوونی ولاّتێکی لەم جۆرە لە پێشدا زۆر ئاستەنگە.



لە ناو جەرگەی کێشەکە باجدان قوتدەبێتەوە. داهات زۆر گرینگە بۆ موچەدانی ئەو بەرپرسانەی دەست نیشانکراون و هەلّبژێردراون، بیۆرۆکراتەکان، پۆلیس، هەروەها کارمەندی قەزائی پێویستی بۆ چالاّککردنی شێوازێکی لیبرالّ، بەڵام بۆ ئەمەش، ئاژانسێکی کۆکردنەوەی داهات پێویستە و کارمەندەکەشی، دەبێ مووچەی هەبێت، بە بێ پارە ئەمە هەرگیز ئامادەنابێت تاوەکو کۆی نەکەنەوە. لە سیستەمی سیاسییە لیبرالّییەکاندا زۆربەی داهاتەکان خۆبەخشانە کۆدەکرێتەوە، بەڵام، ئەمەش وەك کێشەیەکی هێلکەی مریشکە. هاولاّتی ڕێکدەخرێن بۆ پارەدان خۆبەخشانی گەر بینیان کە ئەوان خزمەتگوزاری دەکرێن کە بۆ ئەوان بەهای هەیە، بەڵام ئەو خزمەتگوزاریانە دابین ناکرێن تاوەکو ئەو هاولاّتیان پێشتر پارەکە نەدەن، تاوەکو ئەوانەی کە خزمەتگوزرای دابین دەکەن بتوانرێ بە کرێ بگیرێن.

هەرچەند بێگومان زەحمەتە، بەڵام ئەرکی دروستکردنی ولاّتێکیش مەحالّ نییە. ولاّتانی سەرکەوتوو و سەقامگیرو دەولّەمەندی ناوەوەی جیهان هەموویان هەموو کاتێ دەتوانن بیکەن، بەڵام دوو هەرە دیارترین ڕێچکەی مێژوویی پێشکەوتنی ولاّت ئەوانەی پەیوەستی سنووردار بوون لە جیهانی دوای جەنگی ساردا. لە نموونەی یەکەمدا، دام و دەزگاکانی دەولّەت لە لایەن ئیمپراتۆرێکەوە چنراون. نەریتەکانی ڕۆمان لە هەموو ئەوروپا بلاّو بۆوە لە سەردەمە کۆنەکاندا، دام و دەزگا بەریتانییەکانیش لە سەرانسەری جیهان بلاّوبوونەوە لە چاخی مۆدێرندا. ئەو شێوازە ناکرێت دووبارە ببایەوە لە سەردەمی دوای جەنگی ساردا. بۆ مەبەستی دروستکردنی ولاّتێکی لیبرالّ ڕەنگە پێچەوانەی کەلتووری نەتەوەیی گشتی چین و ڕووسیا بێت، کە ڕێز لە بەرگەگرتن بگرێت لە سەرووی هەموو دەرکردنە بە زۆرینەکەی داگیرکەران لە ڕۆژئاوا، ئەمە نەهاتێکی مێژوویی بوو بۆ هەردوو ولاّت کە داگیر نەکراون و دەستیان بەسەردا نەگیراوە هەروەها وەك هیندستان حوکم کراون.

شێوازی دووەمی دروستکردنی ولاّتێك ڕوویدا لە وەڵامی داوایەکانی بەرگری و ئامێری جەنگی. ئەو قسەیەی کە "جەنگ ولاّتی دروستکردو ولاّتیش جەنگی دروستکرد" کەپسولێکی ڕەقی وردی کورتەی مێژووی گەلێ لە ولاّتانی ڕۆژئاوایە، بەڵام هاوکێشەیەکی باش نەبوو بۆ ماوەی دوای جەنگی سارد. باش نەبوو، چونکە ئەو ولاّتانەی کە ئامادەن بۆ جەنگ هەمیشە بەشەڕدێن لەگەلّ یەکتردا، هەروەها دیسان باش نەبوو، چونکە لە سەرەنجامی جەنگی ساردا، جەنگ ئارەزووی زۆر کەم بۆوە لە بارودۆخەکاندا. ئامادەکردن بۆ بەرپاکردنی جەنگ هیچی تر

بنکەیەکی سەرنجڕاکێشی پێشکەش نەکرد هەروەك وایان دەکرد بۆ ڕێکخستنی یان بزواندنی کۆمەڵگا.

لە ڕووی مەنتقەوە، ئەسڵەکانی وڵات دەکەوێتە سەر پێویستی کەمترین ئاستی فەرمان، هەروەها هێمای شکستی خراپترین جۆری وڵات لە جیهانی دوای جەنگی ساردا کوشتارێکی بێزەوەر بوو کە لە هەموو شێوەکاندا ئەنجامدرا. بێهێزی وڵاتی ڕووسیا و چین، بە پێچەوانەوە، زیاتر ئاشکرا بوو لە ڕووی ژیانی کۆمەڵایەتییەوە، چونکە مەزەندەی شوێنێکی نەکرد ئابووری تیایدا جێگای ببێتەوە کە بوارێکی زۆر گرینگە و لە پێش سەدەی بیست و یەك لە زۆربەی هەرە زۆری وڵاتانی خاوەن سەروەریشدا نەبوو.

لە زۆربەی مێژووی ئەو وڵاتەدا، ئەرکی دەوڵەت بۆ پاراستنی ڕێکخستن بوو لە نێو سنوورەکانی. لە زۆربەی کاتەکانی سەردەمی مۆدێرندا کاری پێش وەختەی ناسراوی جەنگ بوو. لە ماوەی دوای جەنگی ساردا، لە هەموو شوێنێك لە سەرووی هەموویانەوە لە وڵاتانی ناوەوەی لیبراڵدا سەنتەری سەرچاوەکانی وڵات تەرخانکرا بوو بۆ مەسەلە ئابوورییەکان، بۆیە حکوومەتەکان بە نیازی زیادکردن و دابەشکردنی داهاتی ئابووری ئەو کۆمەڵگایانە بوون کە ئەوان حوکمیان دەکرد. سەدەی نۆزدە، بە هێرشە کتوپڕەکانی بۆ پێکهاتە تەقلیدییەکانی دەسەڵاتی سیاسی، سەردەمی شۆڕش بوو. سەدەی بیستەم لە سەرووی هەموو شتێکەوە سەردەمی جەنگ بوو، جەنگی ڕاست و بەهێز لە نێوان فۆرمە لیبراڵ و نالیبراڵەکانی ڕێکخراوی ئابووری و سیاسی مۆدێرن بوو. سەدەی بیست و یەکیش بە سەردەمی بازاڕەوە دەستی پێکرد.

بازاڕو ئابووری ڕووسیا و چینی دوای جەنگی ساردیان داگیرکرد. حکوومەتی هەر یەك لە چین و ڕووسیا قەناعەتیان بەوە هاتبوو کە کلیلی دەسەڵات و سەقامگیری لەو دیو سنوورەکانەوە سەرکەوتنی ئابوورییە. هەریەك زیاتر قەناعەتی بەوەهاتبوو کە کلیلیش بۆ سەرکەوتنی ئابووری سێیەم بەشی سێیەمی ویلسن بوو، هەوڵی لیبراڵ بۆ ڕێکخستنتی چالاکی ئابووری، ئەویش بازاڕی ئازاد بوو. بە هیچ شێوەیەك بڕیاریان لە سەر سیاسەتی لیبراڵ نەدا، بەڵام کاتێ کە زانیان بازاڕی ئازاد چ دەسکەوتێکی هەیە، ئەوا دەسەڵاتەکانی ڕووسیا و چین لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا پەرۆشییەکی ئاشکرایان خستەڕوو بۆ بازاڕی ئازاد. وڵاتانی ناوەوەی ڕۆژئاوا، لە سەرووی هەموویانەوە ویلایەتە یەکگرتوەکان، هانی ئەو پەرۆشییەیاندا و پێوەرەکانیان بەرەو پێش برد بۆ یارمەتی دامەزراندنی کاری ئابووریی بازاڕ لە ڕووسیا و چین،



چونکە ئەوانیش دەیانویست کۆمۆنیستە زەبەلاحەکاننی ئۆرتۆدۆکسی پێشوو لە ڕووی ئابوورییەوە سەرکەوتوو بن،  بەڵام هۆی سەرەکی بۆ ئەم جەختکردنەوەی ڕۆژئاوا، ئەو باوەڕە بوو کە لیبراڵیزمی ئابووری دەبێتە هۆی پەرەپێدانی لیبراڵیزمی سیاسی. بنەمای ڕێبەری سیاسەتی ڕۆژئاوای دوای جەنگی سارد بۆ ڕووسیا و چین، هەروەها بۆ وڵاتانی دەرەوەی جیهان، یەکێ لە بۆچوونەکانی مێژووی تیۆری لیبراڵ بوو، واتە: بازاڕی ئازاد مرۆڤی ئازاد درست دەکات.

## دیموکراسیی بازاڕ

ئەو قەناعەتەی کە لیبراڵیزمی ئابووری سوودی کاریگەری نائابووری هەیە کە لە باوەڕی سەدەی نۆزدەمەوە سەرچاوەی گرتووە لە گرێدانێك لە نێوان بازرگانی نێو دەوڵەتی بێ کۆت و زنجیر، واتە بازرگانی ئازاد، و ئاشتییەوە هاتووە. پەیوەندی ئابووری سنووربڕ و گونجاو دەبێتە هۆی ئاشنایی و سۆز لە نێو ئەو وڵاتانەی تێوەگلاون، ئەمەش دەبێتە هۆی دروستبوونی ڕوانگەیەك کە لە سەدەی بیستەم ناسرا بە بێلایەنی، کە لە بەرابەردا ئاشتی ئاشکرا دەکات. بە پێی پێناسەی ئەوانەی کە بەشداری لە سوودی بازرگانی دەکەن، گەر نەیکەن شتەکانی خۆیان لەماڵەوە دەپارێزن. گەر بازرگانی لێکترازا بێت بە هۆی جەنگەوە ئەوا قازانجەکانی خۆیان لە دەست دەدەن. بۆیە هەرگیز خۆزگەی ئەوە ناخوازن شەڕ بکەنەوە، بەڵام لە سەدەی بیستەمدا شەڕیان کرد. وڵاتانی خاوەن سەروەری بە لێشاو کەل و پەلیان بە نێو سنووری یەکتردا هێناو برد، لەگەڵ ئەوەشدا لە جەنگی جیهانی یەکەمدا لەگەڵ یەکتر بەشەڕ هاتن. بازرگانی ئاشتی مسۆگەر ناکات، بەڵام ئەو ئەزموونەی جەنگی جیهانی یەکەم ئەوە ناسەلمێنێت کە بازرگانی نێودەوڵەتی ناتوانێت هەرگیز کاریگەر هەبێت هێوربوونەوە لە هەموو شوێنێك بکات. سزای سوودەکانی بازرگانی تەنها زیانێکی نییە لە جەنگ، بەڵکو دەکرێ سزایەکی بەرجەستە بێت، هەروەها ئەو وڵاتەی بیر لە ململانێی چەکداری دەکاتەوە بێگومان کاریگەری خۆیشی لە سەر بازرگانی لەبەرچاو دەگرێت.

مەترسی وروژاندنی دوورەپەرێزی ئابووری نێودەوڵەتی بێگومان لەو هۆیەدا سەرچاوەی گرتبوو کاتێ چین لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا هەڕەشەی کۆنترۆڵکردنی تایوانی نوێ

کردەوە. پەیوەندییەکانی ڕووسیای دوای کۆمۆنیست لەگەڵ وڵاتانی تر کاریگەری لە سەر هەبوو لە لایەن کێشی سیاسی ئەو گەلەی کە قازانجی لە ناوەندی ئابووری کردبوو بۆ تەواوی دیکەی جیهان لە کاتێکدا ڕژێمی کۆمۆنیست ئەوەی قەدەغەکردبوو.

بە پێی هەندێ لێکدانەوە ئاشتی ئەنجامێکی پرکتیزەکانی لیبراڵیزمی ئابوورییە لە نێو وڵاتانی خاوەن سەروەری. بە ڕای ئابووریناسی نەمساوی ئەمریکی لە سەدەی بیستەمدا، ئاشتی دەبێت بە میراتی وڵاتانی کاپیتالیست، چونکە ئەوان تەرخانکراون بۆ ئەقڵییەتی ئابووری بە ئەوپەڕی بەرهەمهێنەری سامان پێناسەکراون، جەنگیش مەشقێکە بۆ تێکشکاندنی ئەو سامانە، بۆیە لە ڕووی ئابوورییەوە جەنگ لە لای ئەوان شتێکی بێ مانای کەم ئەقڵییە. (جەنگی جیهانی یەکەم ئەمەی بەدوا داهات، چونکە کۆمەڵگا ئەوروپییەکان بە تەواوی کاپیتالیست بوون). مێژووی تیۆری لیبراڵ سێیەم گرێدان دەخاتە ڕوو لە نێوان ئابووری لیبراڵ و ئاشتی، هەروەها گرێدانی ناڕاستەوخۆش لە ڕێگەی سیاسەتی لیبراڵ بوو: بازاڕ بەرەو دیموکراسیمان دەبات و دیموکراسیش بەرەو ئاشتی.

بە دڵنیاییەوە وڵاتانی ناوەوی جیهان ڕاستەوخۆ هەوڵی بەرەوپێشبردنی دیموکراسیاندا. لە دوا دەیەی سەدەی بیستەمدا قسەکانی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا جەیمس بەیکەریان خستە بەرچاو کاتێ وتی، " ئەرکێکی نوێ...... ئەویش پێشخستن و پشتیگیریکردنی دیموکراسییە"، هەروەها چەند ئاژانسێکیان دامەزراند کە هەڵسا بە ڕێکخستنی پرۆگرام بۆ ئەو مەبەستە، بەڵام، مەشقی زیاتر لە ئارادابوون لە دەربڕینی نیازەکانی خۆیان تا لە گواستنەوەی پێکهاتە سیاسییەکانی وڵاتانی خۆیان. پرسیار لەمەڕ بودجەکان گونجاو بوون و هیچ بەڵگەیەکیش نەبوو لە سەر ئەو بودجەیەی بۆ ئەو چالاکیانە تەرخانکرابوون، چەند کۆنفراسێك سازدران، هاوەڵێتی دابینکران، ئەرکەکان بۆ چاودێریکردنی هەڵبژاردنەکان جێبەجێکران، گەلێ ڕاپۆرت بلاوکرانەوە، ئەو شتانەی کە تەرخانکرابوون گرینگی و کاریگەرییەکی ئەوتۆیان نەبوو لە سەر ڕێکخستنەکانی سیاسەتی ناوخۆی ئامانجی وڵاتان. دەیانتوانی کاری کەم ئەنجام بدەن بۆ زاڵ بوون بەسەر دوو بەربەستە سەرەکییەکەی سەدەی بیست و یەك بۆ دامەزراندنی لیبراڵیزمی سیاسی: بەرهەڵستکاری بەهێزی ناوخۆو هەروەك لە چین، هەروەها نەبوونی دەزگا داواکراوەکان هەروەك لە ڕووسیا.



بۆیە ستراتیژی سەرەکی وڵاتانی ناوەوی جیهان بۆ پێشخستنی دیموکراسیی ناڕاستەوخۆ بوو: هاندانی سیاسەتە لیبراڵییەکان بە هۆی هاوکاریکردنی ئابوورییە لیبراڵییەکان بوو. جەرگەی سیاسەتی ڕۆژئاوا بۆ ڕووسیای دوای کۆمۆنیست تێکەڵەیەك بوو لە قەرز و بەخشین و هاوکاریی تەکنەلۆژیاو هەروەها دروشمێکی بەرز، هەموو کاریان دەکرد بۆ هاوکاری گواستنەوە، لە پلانێکی سەنتەری ئابووری بۆ ئابووریی بازاڕ دەستپێشخەری کرا پاش ڕووخانی یەکێتیی سۆڤیەت.

سیاسەتی ڕۆژئاوا بۆ چین دووپاتی لە سەر پێشخستنی لیبراڵیزمی ئابووری کردەوە، ئالییەتە سەرەکییەکان لە حاڵەتی چینینەکان وەگەڕخستن و بازرگانی تایبەت بوون. لە وڵاتانی پێشەنگی ناوەوەی جیهان، ویلایەتە یەکگرتووەکان، سیاسەتی ناوخۆی سیاسەتی چین لە دەیەی یەکەمی دوا جەنگی جیهان بەدەوری ئەو پرسیارە خول دەخوات کە ئایا بۆ بەخشینی باری بارودۆخی بازرگانی ئاسایی بۆ کۆماری گەلی چین یان لە بری ئەوە بۆ ڕەتکردنەوەی سزایەك بۆ پراکتیزەکانی سیاسەتی ناوخۆی نالیبراڵی بێجینگ کار بکرێت.

لە هەردوو حاڵەتدا، ئەقڵیەتی ڕەهای هەوڵی ڕۆژئاوا بە قەد باری سیاسی ئابووری بوو. حکوومەتی ڕووسیا هەوڵی دامەزراندنی دیموکراسی دەدا. بە بێ سەرکەوتنی ئابووری، ترس لەوە هەبوو، ئەم هەوڵە فەشەل بێنێت و دیموکراسیش سووکایەتی پێ بکرێت لە چاوی ڕووسیاوە هەروەك شکستە ئابوورییەکان لە شەڕی ناوخۆدا لە کۆماری ویمەر (Weimar). حکوومەتی چینی، بە پێچەوانەوە، هەوڵی دامەزراندنی دیموکراسی نەدەدا. فەرمانڕەوا کۆمۆنیستەکان لە بری دامەزراندنی دیموکراسی هەوڵی بنبڕکردنیان دەدا. ڕۆژئاوا پێی وابوو کە بە لیبراڵیکردنی ئابووری دیموکراسی پێشدەخات سەرەڕای هەوڵەکانی کۆمۆنیستەکان بە پێچەوانەی ئەوە بوو. لە حاڵەتی ڕووسیا، هاوکاری بۆ بازاڕ بە ڕابەری ڕەوڕەوی چەرخەکان بۆ پایسکلی دیموکراسی، نیازی دووپاتکردنەوەی ئەو ئەزموونەی هەبوو کە ڕووسەکان لە سەر ئەو پاسکیلە ناگلێن. لە چین ئەسپێکی تەرواده بوو، کە دەبوایە چەرخی بۆ دروست بکرێت لە نێودیوارەکان لە کاتێکدا کۆمۆنیستە چینینەکان ئەو چەرخەیان دژی لیبراڵیزمی سیاسی دروستکردبوو.

ئایا شیکردنەوەو ئایدیای ڕۆژئاوا ڕاست بوون؟ هەروەك لەگەڵ دیموکراسی و ئاشتیدا، گرێدانێکی سادەو ڕاستەوخۆ هەوەنتە نەبوو لە نێوان لیبراڵیزمی سیاسی و ئابووری. وڵاتانی خاوەن سەروەری لەگەڵ ئەنجامدانی ئابووری بەپێی یاساکان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ نەبوون بە

دیموکراسییەکی کارا لەگەڵ هەڵبژاردنی ڕێك و سەروەری گەل و دەستووری کاریگەر، بەڵام هەروەك دیموکراسی و ئاشتی، هەردوو مەنتق و بەڵگەی مێژوو پێشنیاری گرێدانێکی نێوان هەردووکیانی کرد.

لە ڕووی مێژووییەوە، ئابووریی بازاڕ زۆر پێویستە، بەڵام تاکە مەرجێکی پێویست نییە بۆ سیاسەتە دیموکراتییەکان. هەموو وڵاتان لەگەڵ ئابووریی بازاڕ و دیموکراسی نەبوون، بەڵام هەموو دیموکراسییە مۆدێرنەکان، بە بێ شەواز، ئابووریی بازاڕیان هەبوو. وێڕای ئەمە، وڵاتە مۆدێرنەکان ئابووریی بازاڕیان ئاسانتر دۆزییەوە لەو وڵاتانەی بێ ئابووریی بازاڕ سیستەمێکن بۆ بەکاربردنی سیاسەتە دیموکراسییەکان. وڵاتانی باشووری ئەوڕوپا لە حەوتاکان و ئەمریکای باکوور لە هەشتاکان، کە بازاڕی ئابووری تێکەڵکرد لەگەڵ حوکمە نادیموکراسییەکان، گۆڕانی بۆ دیموکراسی سیاسی دروستکرد ئاسانتر لە وڵاتانی پێشووی کۆمۆنیستەکانی ئەوروپای ڕۆژهەڵات و ئاسیای ناوەڕاست لە نەوەدەکان، لە نێو هەموویاندا ئابووری بەلانی کەم بۆ ماوەی چوار دەیە بە شێوەیەکی سەرەکی پلانی بۆ دانرابوو.

ئابوورییە لیبراڵییەکان و سیاسەتە لیبراڵییەکان لە ڕێگای گەشەی ئابوورییەوە بەیەکەو گرێدرابوون. بەرزبوونەوەیەکی پێوەری ژین پەیوەست بە دیموکراسی، لە کۆتای سەدەی بیستەمیش، دام و دەزگا ئابوورییە لیبراڵییەکان پراکتیزەکانیش زۆر نزیك پەیوەست بوون بە زیادبوون لە تەواوی کۆمەڵگای سامانی داهاتی تاکدا، بەڵام پەیوەندی نێوان هەردووکیان فراوانترو قوڵتر بوو لەوەی گەشەی ئابووری، بەڵام پەیوەندییەکی گرینگیش بوو بۆ تێکەڵی نێوان نەخشە و ڕێنماییەکانی ئابووری لیبراڵ بە لایەك و ئەوانەی سیاسەتە لیبراڵییەکانیش بە لایەکی تر.

ئابووریی بازاڕ و سیستەمی سیاسەتەکانی لیبراڵ دوو بواری جیاواز بوون: بازاڕی ئازاد بە پێی پێناسە بەلانی کەم نیمچە سەربەخۆیی کۆنترۆلی سیاسی بوو، بەڵام دوو خاسیەتی پێناسکراوی سیاسەتە لیبراڵییەکان هاوتای هەیە بۆ ئابووریی بازاڕ. یەکەم، ئیختیاری تاك باڵا بوو. سەروەری گەلی کە بە هۆیەوە حکوومەتەکان دەستنیشان دەکرێن لە پرسەکانی دیموکراسی بوون بۆ بنەمای کڕیاری سەروەری لە بازاڕ، کە بە هۆیەوە ئارەزووی تاك سوورە لە سەر ئەوەی بەرهەم بەدەست دێنێت و ئەو نرخانەی کە بەرهەمەکان لە سەری دەفرۆشرێن. دووەم، گەیشتن



بە وڵات سنووردارە، لەگەڵ ناوچەی سنووردار، مافە سیاسییەکان لە حاڵەتی دیموکراسی و موڵکی تایبەت لە ئابووریی بازاڕ لە کۆنترلی حکوومەتەوە دوورەپەرێزکران.

هەرچەند جوودان، بەڵام دوو بواری بە یەکەوە گرێدراون.. هەروەك لەگەڵ سیاسەتی ناوخۆ و سیاسەتی دەرەوە، بەربەست لە نێوان سیاسەتەکان و ئابووری دیوارێکی ئاسنییە کەمتر لە پۆشراوێکی پیرۆز بوو. نەریت و ئایدییە لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر دزەی دەکرد. کەسێك لێڕاهاتووە بەوەی بڕیاری ئابووری تایبەت بەخۆی بدات بە شتێکی نامۆش نازانێت هی سیاسیش بدات. کاتێ حکوومەتەکان بەلاوەدەنرێن لە چالاکییە گەورەکانی ئابووری بە شتێکی نامۆشی مەزانە کە هەمان شوورە بۆ چالاکی سیاسیش بکەن. لەم ڕووەوە، سیاسەتە لیبراڵییەکانی ئابووری لیبراڵ وەك ویلایەتە یەکگرتوەکگان و کەنەدان: جیان لە یەکتر هاوکات بەیەکەوەش گرێدراون، کە بە ئاشکرا سنوور لە نێوانیاندا کێشراوە، بەڵام زۆر نیزکن لەو ڕووەی کە شت لەگەڵ یەکتر ئاڵوگۆڕ دەکەن، گەر یەکێك لەو دیو سنووری کەنەداوە بچێتە نێو ویلایەتە یەکگرتووەکان هەست ناکات چووەتە شوێنێکی جیاواز.

بەڵام سیاسەت و ئابووری زۆر لەوە زیاتر بەیەکەوە گرێدراون. بە ڕێگایەکی زۆر گرینگدا دەچنەوە سەر یەك. بازاڕێکی ئابووری بنەمایەکە بۆ یەکێك لە خاسیەتە سەرەکییەکانی سیستەمە سیاسی لیبراڵییە مۆدێرنەکان، واتە کۆمەڵگای مەدەنی. کۆمەڵگای مەدەنی پێك دێت لە ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییە سەربەخۆکان و گروپە ئایینی و پیشەییەکان و یەکێتییەکانی کرێکاران، کۆمەڵە مەدەنییەکان، لە نێوان یەکەی بنچینەیی خێزان دەوەستێت کە خێزان و وڵاتیش دەگرێتەوە. ئەو وڵاتانەن کە لە ژێر باڵی یاسای نالیبراڵدا هەموو ئەمانەی سەرەوەی نەقووسانە. ئەمە ئامانجی نازی و وڵاتە سۆڤیەتەکان بوو بۆ نەهێشتنی ئەو گروپە کۆمەڵایەتیانەی کە حیزبی باڵادەست کۆنترۆلی نەبوو بەسەریانەوە. کۆمەڵگای مەدەنی بەشداری لە هەردوو بەشی سیاسەتە لیبراڵییەکاندا دەکات. کێش دەدات بە ڕێساکانی دەستوور بە هۆی دابینکردنی هێزێکی هاوسەنگ بە وڵات. کەرتێکی ئابووری تایبەت بە هاوڵاتیان بنچینەیەکە دژی ئەوەی کە حکوومەت دەیکات. هەروەها بنارێکە بۆ زۆربەی چالاکییە سیاسەکانی پەیوەست بە سەروەری گشتیی. لە وڵاتانی ناوەوەی جیهاندا،کە دیموکراسین، لە نێوان حیزبە سیاسەکاندا ململانێ لە کاتی هەڵبژاردنەکاندا ڕوو دەدات، بە هەمان شێوە لە نێوان دەزگا گرینگەکانی کۆمەڵگای مەدەنیشدا ئەو ململانێیە ڕوودەدات. وا باوە حیزب خۆی

یەکبخات و نوێنەری چەند بەرژەوەندییەك بکات و زۆربەی ئەو بەرژەوەندییە گرینگانەش ئابوورین. لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا ئەوە ئابووری تایەبت بوو کاری لە سەر سەرهەڵدانی ڕێکخراوە بەهێزەکاندا کرد.

ئابووریی بازاڕ و سیستەمی سیاسییە دیموکراسییەکان لە ڕێگایەکی بە بەرهەمترو ئەنجامتر سەری هەڵدا. دەستپێك و کاریگەرییەکی گشتیان هەبوو، یەك لەوانە زۆر گرینگ بوو کە هەمیشە بە بەشێکی گرێدراوی سیستەمی سیاسی لیبراڵ خۆی دادەنرێت ئەویش: حوکمی یاسایە. ئەم چەمکەش دەگەڕێتەوە سەر جێبەجێکردنێکی گشتگیرو یەکسان و بەردەوامی یاسا ناسراوەکانی نێو کۆمەڵگا. گەر دیموکراسی داهێنانێکی یۆنان بێت، دەستوور نووسین هی بەریتانیا بێت لە چاخی ڕەهاگەریدا، ئەوا حوکمی یاسا دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆمانە کۆنەکان. پراکتیزەکرنی بۆ ماوەی چەند دەیەك وەستا، دواتر بوژایەوە لە ئەوروپای چاخی ناوەڕاست و بە تایبەتی لە دوورگەکانی بەریتانیادا.

حوکی یاسا جیایە لە دوو ڕکابەرەکەی سیستەمی سیاسەتە لیراڵیەکان. وك ئەو وایە کە هەڵبژاردنی ئازادت هەبێت بە بێ دەستوور نووسین یان حوکمی یاسا، گەلێ دیموکراسی نالیبرالی لەو جۆرەدا لە ئارادا بوون، لە سەرەنجامی جەنگی ساردا، بۆیە مێژوو گەلێ نموونەمان پێ دەبەخشێت کە تیایدا حوکمی یاسا بەدیهاتووە، لەو شوێنانەی کە نەریتەکان بە بەردەوامی جەختیان لەسەر بووە، بەڵکو خەڵکی گشتی هەرگیز قسەیەکی نەبووە لەوەی کە یاسا دەیکات، یان لە لایەن کێوە یاسا دەرەچێت، هیچ بازنەیەکی پارێزراویش نەبووە کە تیایدا تاکەکان بۆ مەشقی مافە سیاسەکانیان بیپارێزن. کۆلۆنە بەریتانییەکان وەك ئەوانەی دوا گرینگەکانن، بۆ نموونە هۆنگ کۆنگ، گەورەترینیان، هیندستان، بوو بە دیموکراسی لەساڵی ١٩٤٧ بە هۆی زیادکردنی سەروەری گشتی و دەستوور نووسین بۆ حوکمی یاسا کە بەریتانییەکان پێشتر دایانمەزراندبوو.

لە مشتومالی مێژوودا، زەحمەتە وڵاتێکی سەروەری بدۆزیتەوە کە تیایدا مافی پارێزراو بێت و حوکمی یاسای نەبووبێت. بە هەقیقەت، دوو ڕووی یەك دراون. دەستوورنووسین حوکمی یاسا جێبەجێ دەکات بۆ بازنەی گشتی، لەبارەی سیاسەت و حکوومەتەوە. ئەوەی بەگشتی حوکمی یاسا دەخاتە ڕوو دروستی دەکات، لە سەردەمی ڕۆمانەوە تا ئێستا، حوکمی یاسا بە کێشە شەخسییەکان بە تایبەت جێبەجێ کراوە. تاوانبارێکی کۆمەڵگاو کۆدی مەدەنی



دەگرێتەوە، هەروەها یاسای مەدەنی بە شێوەیەکی سەرەکی پەیوەستە بە کاروباری ئابووری. ئەو دوانە برایانە، دەستوورنووسین و حوکمی یاسا پەیوەندی پیوەستە بە بیرۆکەی موڵکایەتییە.

موڵك بێگومان، بیرۆکەیەکی ئابوورییە. هەروەها مافێکیشە. مافەکانی موڵکایەتی مافی تاکەکەسین کە ئەو شتانە دەگرێتەوە کە دەکرێ بکڕدرێ و بفرۆشرێن. حوکمی یاسا هاتە ئاراوە بە شێوەیەکی گشتی بۆ پاراستنی ئەو مافانە. لە تەواوی مێژووی فەلسەفەی سیاسیدا زۆرجار لە نێو هێڵەکانی جێرێمی بێنسام ئەم وتەیە دووبارەو دووپات دەکرێتەوە " Jeremy Bentham" کە دەڵێ " موڵکایەتی و یاسا بە یەکەوە لەدایك دەبن و پێکەوەش دەمرن". پێش یاساکان هیچ موڵکایەتییەك نەبووە، هەرکە یاساکان نەمان موڵکایەتیش نامێنێت.

موڵکایەتی پانتاییەکی نەرم و نیان بوو نەك هەر تەنها بۆ حوکمی یاسا، بەڵکو بۆ دەستوورنووسینیش خۆی. لە ڕووی مێژووییەوە ئەوە موڵکایەتی بوو ژیانی بە مافە سیاسەکان بەخشی. ڕووداوە بە ئاژاوەکان لەمەڕ پەیدابوونی مۆدێرنی سەربەخۆیی لە ڕۆژئاوا ململانێ بوون لە سەر پیرۆزی موڵکایەتی. ململانێی ئینگلیزەکان لە سەدەی حەڤدەمدا لە نێوان مەلیك و پەرلەمان لە سەر ئەوە بوو ئایا شا دەتوانێت داهات تەرخان بکات واتە بۆ موڵکایەتی ئەوانی تر، بێ ڕازیبوونی ئەوانەی خاوەنی ئەو شتەن هەروەك لە سیستەمی تەشریعیشدا هاتووە. سەرەنجامی ململانێکە ئەوەبوو کە شا نەیتوانی ئەم کارە بکات. شۆڕشی ئەمریکی گڕی گرت بە هۆی ململانێیەکی لەم جۆرەوە. دروشمی کۆلۆنیستە یاخیبووەکان " باج نادەین گەر نوێنەرمان نەبێت" هەمان بنەمای دووپاتکردەوە: موڵکی کەسێك ناکرێ لە لایەن وڵاتەوە بە بێ ڕازیبوونی کەسەکە خۆی زەوت بکرێت. ئەمە شتێکی بەڕێکەوت نەبوو کە کاریگەرترین فەیلەسووفی سەربەخۆیی بەریتانی و ئەمریکییەکان، ئەو ڕووناکبیرەی کە گرێدرابوو بە شۆڕشی ئینگلیزەکان و ئەمریکییەکان، جۆن لۆك، مافی موڵکایەتی لە پێش هەموو شتێکەوە دانا. بە هەمان شێوە، شۆڕشی فەرەنسی دەستی پێکرد بە هەوڵەکانی مەلیك بۆ گلدانەوەی داهاتی زیاتر و سووربوونی تەشریعی لە سەر مافەکانیان لە مەسەلەکاندا.

کەواتە حوکمی یاسا لە ناوەڕۆکی مۆڵکایەتی سەربەخۆ و بەهێزکردنی هەردوو مافە سیاسی و ئابوورییەکاندایە. لە ڕووی مێژووییەوە، ئەو سێ بەشەی کە سەدەی بیست و یەك پێناسی کردووە وەك سیاسەتە لیبراڵییەکان دامەزرێنران لە زنجیرەیەکی تایبەتدا: یەکەم حوکمی یاسا لە ئابووری (مافەکانی موڵکایەتی)، دواتر حوکمی یاسا لە بازنەی گشتی (دەستوورنووسین)، کۆتاییش فراوانکردنی مافی دەنگدان بۆ هەموو هاوڵاتییە هەرزەکارەکان.

جێبەجێکردنی حوکمی یاسا بە گشتی و بە تایبەتی بەهەقیقەت ئەرکێکە بە بێ بوونی دەوڵەت مەحاڵە. هەروەها دەوڵەتێکی ماف و موڵکایەتی پارێز ئەوەیە کە بە وردی ڕووسیا و چین و وڵاتانی تری کۆمەڵگای خاوەن سەروەری سیاسی نەیانبوو لە سەرەنجامی جەنگی ساردا. دروستکردنیان گرینگترین کاری ئەوان بوو لە پیشەی دوای جەنگی سارد و هەروەها ئەمە هەمان حاڵەت بوو بۆ گەلێ لە وڵاتانی خاوەن سەروەری. کلیلەکە ئابووریی بازاڕ بوو. لە ڕووی مەنتق و مێژووەوە، بە بێ دەوڵەتێکی ماف پارێز ئەو جۆرە دیموکراسییە مەحاڵ بوو بێتە ئاراوە، هەروەها موڵکایەتی بەشێکی زۆر گرینگی پێش ئابووریی بازاڕ بوو. بە مافی موڵکایەتی کە زۆر پێویستە بۆ چالاکردنی مۆدێرن، بەرهەمهاوردەی سامانی ئابووریی بازاڕ لە وڵاتانی ناوەوەی ڕۆژئاوا، گرینگ نین بۆ گەرمی بازاڕ.

بازاڕە مەحەلەیە سنووردارەکان کە تیایاندا ئاڵگۆڕکردن خۆبەهێزکردنە لە هەموو جیهان دۆزرانەوە لە غیابی ئەو وڵاتانەی کە ماف دەپارێزن. وجودیان هەیە لە سەرەتای تۆمارکردنی مێژوودا، هەروەها هیچ گومانێك لە پێش ئەو کاتەدا نەبووە. لەم جۆرە بازاڕە بازرگانیانە، زۆرجار ئەوەی کە کراوە بە هۆی ئاڵوگۆڕکردن خۆبەهێزکردنە: دوو حیزب بە یەکتری دەگەن، ئەو شتانە ئاڵوگۆڕدەگەن کە کڕیویانە، هەروەها یەکتریش جێدەهێڵن، بەڵام بەرهەمی بازاڕە ئابوورییەکان، کە لە پێش چاخی مۆدێرن شتێکی مەحاڵ بوو لە مێژوودا و سامانی ڕۆژئاواش بە خەونیش بەرهەمی وای بەخۆوە نەدیبوو، بەگوێرەی کات و شوێنەوە وەبەر دەهاتن. فراوان دەبوون تا ئەو دیو شوێن و کاتانەی کە بەرهەمی بەرجەستە دەستەو دەستی دەکرد و لە گۆڕاندابوو. بۆ بەشداری کردن لە بازاڕێکی ئابووریدا، بۆ ئەوەی خۆشیت لەوە بێت کە شت بنێریت بۆ شوێنی دوور و بۆ وەگەڕخستن لەو پرۆژانەی کە دەبێتە هۆی بەرهەمێکی زۆر یان دانی بڕێکی پارەی زیادە لە داهاتوو، پێویستی بە متمانە هەیە، ئەو متمانەیەی کە موڵکایەتی مسۆگەرەو و پارەدانیش پشتی پێ دەبەسترێت. واتە، متمانەی پێویست بۆ بازاڕێکی ئابووری بەرهەمهاوردەی سامان ئەو متمانەیە کە ڕێز لە موڵکایەتی دەگرێت. گرینگی ئێستا یان نەبوونی ئەو متمانەیە دەکرێ بەردەوام زیادڕەوی تێدا بکرێت و دووبارە بکرێتەوە. جیاوازی نێوان ئاڵوگۆڕکردنی مەحەلی و خۆبەهێزکردن و موعامەلەیەکی جیهانی بەرفراوان و ئاڵوگۆڕکردنی بۆ چەند دەیەیەك، کە متمانە لە مافەکانی موڵکایەتی دەیگونجێنێت، جیاوازییە لە نێوان کوخە مام ناوەندەکان کە تیایدا ئەوانەی کە تێوەگلاون لە بازرگانی مەحەلی سنووردار دەژین و بە فراوانی دابین دەکرێن، ئامێرە تەکنەلۆژییەکان دروست دەکرێن، هەندێ جار بیناکردنی تاوەرە باڵەخانەکان دروست



دەکرێن بە هۆی ئەو کاریگەرەی کە بازاڕی فراوان دەیگونجێنێت. جیاوازییە لە نێوان هەژاری و دەوڵەمەندی.

ئەو متمانە پێویستەی بۆ بازاڕی ئابووری بەرهەمهاوردەی سامان دابین دەکرێت لە ڕێگەی دەوڵەتێکەوە دەکرێت کە مافی موڵکایەتی دەپارێزێت. ئەو دەوڵەتەی مافی موڵکایەتی دەپارێزێت بە هۆی بەهێزکردنی گرێبەستەکان کە بنەمای موعامەلەی بازاڕ دروست دەکات. سیستەمی بازاڕ دەوەستێتە سەر سیستەمێکی یاسایی و سیستمێکی یاسایش دەوەستێتە سەر دەوڵەت. زۆربەی ئاڵوگۆڕکردنەکان لە ئابووریی بازاڕدا نابێ بەزۆری بێت. جێبەجێکردن دەبێ ئارەزوومەندانە بێت، بەڵام هەر بەشەو بە ملیۆن موعامەلەی رۆژانە لە وڵاتێکی هاوکاری ئابووریی بازاڕ دەتوانێ بە هۆی متمانەوە پێش بکەوێت، زانینی ئەوەی گەر بەڵێن شکاندنەکانی تر کە وڵات هەنگاوی بۆ دەهاوێژێت بۆ پاراستنی موڵکایەتی بێت. وڵات بۆ ئابووریی بازاڕ تۆرێکی سەلامەتییە بۆ سرکێتێکی وایەری بەرز: مسۆگەرکردنی پاراستن لە حاڵەتێکدا کە شتێك خراپ بەڕێوەبچێت.

ئەو متمانەی کە ئابووریی بازاڕ پێکەوە گرێدەدات پێویستە بۆ هەوڵی لیبراڵیش بۆ پەیوەندییە ئەمنییەکان لە نێوان وڵاتانی خاوەن سەروەری، هەروەها ئاسایشی گشتی ب هەمان ڕێگادا بەرهەم دەهێنرێت، شەفافییەت بۆ ئاسایشی گشتی و ئەو متمانەیە و بۆ سیاسەتە لیبراڵییەکانیش شتێکی گشتیە. فرۆشیارە بەهێزەکانی بەرهەمەکان و شتە داراییەکان ئاساییی هەموو زانیارییەکی پەیوەست بە مانە پێویستە لەبارەی ئەوەی چی دەکرن بێ ئەوەی پارەی خۆیان بە ش بەش بکەن. بە هەمان شێوە، وڵاتانی خاوەن سەروەری خۆشیان بەوە دێت کە سنوور دابنێن بۆ چەکەکانیان، بەڵام تەنها ئەگەر دڵنیا بن لەوەی کە وڵاتانی تر ڕەچاوی هەمان سنوور بکەن لە چەکەکانی خۆیاندا. موقابیل بۆ ئابوورییە لیبراڵییەکانی بنەمای زاڵ بوونی بەرگری لە ئاسایشی گشتی وجودی دەوڵەتە. هەردووکیان زەمانەت دەبەخشن دژی ئازار، یەکەم لە ڕێگەی تێکدانی توانای سەپاندنی ئەو ئازارە، دووەمیش بەهۆی پێشکەشکردنی پاراستن دژی ئەو ئازارە.

ئەو دەوڵەتەی گرێبەست دەسەپێنێت لە مەیدانەکەدا جۆرە دەوڵەتێکی تایبەتە. دەوڵتێکی لیبراڵ، چەند بەهێز بێت بۆ پاراستنی موڵك و سەربەخۆیی، ئەوەندە بەهێز نییە یان بەرزخوازبێت یان هەڵقورتێنەر بێت هەروەك چەوساندنەوەی سەربەخۆیی یان موڵك زەوت بکات. دەوڵەتێکی بە توانایە و خۆشی بە سەپاندنی یاسا دێت نەك پێشێلی بکات. دەوڵەتی لیبراڵ، کە پاڵپشتی حوکمی یاسا دەکات لە هەردوو بازنەی گشتی و تایبەتیدایە، لەکاتێکدا هەردوو مافی موڵکایەتی و سیاسی دەپارێزێت،

بۆیە، جۆرە دەوڵەتێکە بۆ چوونە ژوورەوە و سەرنجی ڕێکخستنە سیاسی و سەربازییەکان بۆ ئاسایشی گشتی، زەوی ناوەڕاست داگیر دەکات لە نێوان توونڕەوەکانی گێرەشێوێنی و زوڵمەت و ستەم.

ئەوە دەوڵەتێکە بازاڕ بەهێز دەکات و مافی موڵکایەتی دەپارێزێت کە ئەزموونەکانی هەردوو دەسەڵاتە دۆڕاوە نالیبراڵییەکەی جیا دەکاتەوە لە پاش کارەساتی جەنگی جیهانی دووەم لە چارەنووسی ڕووسیا و چین لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا. ئەڵمانیا و ژاپۆن ئابووریی بازاڕێکی پێشکەوتوویان دروستکردو ئەو دەوڵەتانە کە زۆری لە حوکمی یاسا دەکەن و هاوکاری ئەو ئابووریانە دەکەن ئەوەی کە وەربگیرێن لە لایەن ئایدیۆلۆژییە نالیبراڵییەکان کە جیهان و ئەوانی بەرەو شەرێکی وێرانکەر دەبات. لە زۆربەی کاتەکانی سەردەمی مۆدێرندا، ئەڵمانیا نموونەیەکە لە سیستەمی سیاسی لە ڕێگەی حوکمی یاساوە، بەڵام بێ سەروەرییەکی گشتی یان دەستوور نووسین. لە ئەڵمانیاوە ئەو چەمکە دێتە ئاراوە کە بەکار دێت بۆ وەسفکردنی دەوڵەتە ماف پارێزەکان.

پرووسیای سەدەی هەژدەهەم، ناوەوەی مۆدێرنی ئەڵمانیا، شوێنێکی زیندوو بوو لە ڕووی ڕێکی و پێوەرکانی وجودی ئەو چاخەوە. ئەو کۆدەی یاساکانی دانران لە لایەن شای پرووسیا فرێدریك لە نیوەی دووەمی ئەو سەدەیە، لە هێزدا مایەوە تا ساڵی ١٩٠٠ هەروەها چوارچێوەیەکی یاسایی دابین کرد لەو ئەڵمانیایەی کە پەیدا بوو وەك وڵاتێکی گەورەی پیشەسازی ئابووری لە نیوەی دووەمی سەدەی داهاتوودا، بەڵام، لە ژێر باڵی هیچ کامیان نە فرێدریك نە جێگرەوە مەلیکایەتییەکەی ئەڵمانیا دەسەڵاتی تەواوی نەبوو بۆ هەڵبژاردنی حکوومەتەکەی، هەروەها مافە سیاسییەکانیشیان بە تەواوی نەپارێزرا بوو. هەروەك بۆ ژاپۆن، یەکێك لە هەرە سەرنجڕاکێشترین خاسیەت گۆڕانە سەرسامەکەی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا لە دەوڵەتێکی تەقلیدییەوە بۆ مۆدێرن دامەزراندنی دەوڵەتێکی موڵك پارێز بوو کە بە ماوەیەکی کەم و بە باوەڕێکی گەورەوە لە سەرووی هەموو شتێکەوە بوو.

پاش ساڵی ١٩٤٥، ئەڵمانیا و ژاپۆن توانیان بە خێرایی دەوڵەتە موڵك پارێزەکەی خۆیان ببوژێننەوە، کە دواتر بوو بە هاوکارییەکی گەورە بۆ دۆزینەوە ئابوورییەکانیان بە خێرایی. لە هەمانکاتدا، نزیکەی مەسەلەیەکی ئاسان بوو بۆ تەبەنی کردنی ئەو دەوڵەتانە بۆ پاراستنی سیاسی وەك پاراستنی مافەکانی موڵکایەتی. لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتێکی لیبراڵ لە شوێنی خۆی لە بازنەی ئابووریدا، گۆڕین بۆ سیستەمی سیاسی لیبراڵ ئاستەنگێکی ئەوتۆ نەبوو.

بەڵام، لە سەرەنجامی جەنگی ساردا، ڕووسیا و چین ئەو دەوڵەتە لیبراڵەیان نەبوو. زۆربەی هەرە زۆری ڕۆیشتنەکانی لە ڕەهاییەتەوە بۆ کۆمەنیزم، کە هیچ کامیان نە ڕووسیا نە چینیش





پێکهاتەیەکی سیاسی لیبراڵی هیچ هێزیکیان توندی ئەوتۆیان نەبووە. لە هیچ کامیاندا حوکمی یاسا بە هیچ شێوەیەك کاری پێ نەکرا: کۆمینیزم خۆی لە خۆیدا لە کردەدا بنەمایەکی بێ یاسایی بوو، تەنها بەرژەوەندی و ئاواتی حیزبی کۆمۆنیستی دەویست کە لە لایەن سەرکردەکانیانەوە پێناسکراوە بە وەرگرتنی دەسەڵات لە سەر یاسا ڕەسمی و ناشەخسییەکاندا. لە هیچ کام وڵاتدا، تایبەتمەندی کارەکتەرو عادەتی هەڵسوکەوت تێکەڵ بە لیبراڵیزمی سیاسی نەبوو، لە سەرووی هەمووشیانەوە متمانەو ڕێگە چارەی مام ناوەند بە هیچ شێوەیەك بەربڵاو نەبوو. لە سەردەمی کۆمۆنیستدا شتێکی کوشندە بوو هیچ کامیان بخەیە ڕوو تایبەتمەندی کارەکتەرو عادەتی هەڵسوکەوت تێکەڵ بە لیبراڵیزمی سیاسی بێت. هەروەها دەزگای تایبەت موڵکایەتی تەواو ڕەگی دانەکوتابوو. نەبوونی ئەمە ڕووسیای جیاکردەوە لە وڵاتانی دیکەی ئەوروپا. لە هەشتاکان یەکێتیی سۆڤیەت بە سووکی پێی دەوترا " بۆرکینا فاسۆ " Burkina Faso" واتە وڵاتێکی بچووکی ئەفریقی پڕ لە مووشەك. پۆلێنکردنی کارەکتەر ورد بوو، هەر بە وردیش مایەوە لە ماوەی دوای کۆمۆنیستدا، لەوەیان، کە بنەماکانی دەوڵەتی لیبراڵ لە بەرچاو گیرا، ڕووسیا نیزکتر بوو لە زۆربەی وڵاتانی ئەفریقی تا لە زۆربەی نەتەوە ئەوروپییەکانی ڕۆژئاوا. لەبەر ئەم هۆیەش، گۆڕانی ڕووسیا و چین بۆ پراکتیز و دەزگا لیبراڵییەکان خەریك بوو ببێت، لە باشترین حاڵەتیدا درێژترو دژوارتر بوو لە چاو ئەڵمانیا و ژاپۆن کە نیو سەدە پێشتر هەیانبوو.

دەیەی یەکەمی دوای جەنگی سارد ئەو بەڵگەیەی خستەڕوو، کە سەرەڕای کەمی ئەزموونی پەیوەستی مێژوویی لە ڕووسیا و لە بەردەمی بەرهەڵستکار بۆ لیبراڵیزمی سیاسی لە سەر بەشی فەرمانڕەوا چینیەکان، هەردووکیان دەستیان بەو گۆڕانە کرد. چەند هۆیەك هەبوو هەبوو بۆ باوەڕکردنی ئەمە، واتە، کە ماوەی ڕووداوەکان پێشبینی کرا لە لایەن مێژووی تیۆری لیبراڵ لە ڕێ بوو، هەروەها نەك تەنها لە دوو وڵاتە هەرەگرینگە نا لیبراڵییەکان، بەڵکو لە هەر شوێنێکی تر، بەهەقیقەت کاتی جیا جیا بۆ دڵنیابوون لە هەموو جیهان.

سێیەم بۆچوون لە سێ بۆچوونەکەی مێژووی تیۆری لیبراڵ ئەوەبوو کە وڵاتانی دیموکراسی ئاشتیخواز بوون، هەروەها ئاڕاستە ناشەڕانگێزییەکانی وڵاتان لەگەڵ سیستەمی سیاسەتی لیبراڵ بنەمایەکی هەبوو لە مەنتق و ئەزموونێکی مێژوویی هەبوو. دووەم بۆچوونی گرێدانێکی خستەڕوو لە نێوان سیاسەتە دیموکراسیەکان و ئابوورییەکانی بازاڕ. ئالێرەدا، لە ڕووی مەنتق و مێژووەوە، ژمارەیەك

گرێدان لە نێوان هەردووکیان ئاشکرا بوو، کەمترینیان ئەو واقیعە بوو کە هەردووکیان وەستانە سەر دەوڵەتی لیبراڵ و حوکمی یاسا بە ناچاری کرا.

هەروەك بۆ یەکەم بۆچوون، داوای جیهانی بۆ بازاڕ، ئەمە لە هەموویان گرینگتر بوو. مەکینەی تیۆری لیبراڵ، سەربەخۆیی هەمەجۆر، دروشمی هێزی هەنوکەیی لیبراڵ بە بەرفراوانی لە جیهان لە سەرەنجامی جەنگی ساردا، لیبراڵیزمی ئابووری بوو. هەروەها ڕوانگەکانی لەمەڕ ئاشتی، ئامانجی گەورەی لیبراڵ کە ودرۆ ویڵسن نیازی بوو لە پاریس ١٩١٩، بەڵام دواتر بە لێڵی سەلمێنرا لە تەواوی سەدەی بیستەمدا، هەروەها ڕوانگەکان بۆ دیموکراسی، کە گەلێ نەوەی هاوڵاتیانی وڵاتانی ناوەوەی جیهان بەرگریان کردبوو لە ماوەی هەمان سەدە، ئەوانەی دیموکراسی بە توندی وەستا لە سەر بۆچوونەکانی لە مەڕ سیستەمی ئابووری لیبراڵ کە یەکەم جار لە لایەن ئادەم سمیس " Adam Smith" وەسف کرا لە دوای چارەگی سەدەی هەژدەهەمدا. کەچی لە ڕوانگەی مێژووی بازاڕی مارکسەوە، کاپیتالیزم خراپ و دۆڕاو بوو، لە هاوتاکەی لە سەدەی بیست و یەکدا بازاڕ بە ڕۆڵی پاڵەوان و براوە دانرا. هەروەها ٢٢٥ ساڵ پاش بڵاوبوونەوەی " سامانی نەتەوەکان"، بۆچوونەکانی هەرگیز ڕووناکتر نەبوون.

تا ماوەیەك هەوڵی لیبراڵ بۆ پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و ئاسایشی گشتی نوێ و ناسك بوون، هەروەها هەوڵی لیبراڵ بۆ حوکم کردن و دیموکراسی نە کردە کرا و نە لە هەموو شوێنێکیش بڵاو بۆوە، هەوڵی لیبراڵ بۆ ڕێکخرای ئابووری و بازاڕی ئازاد، هەموو شتێك نەبوو، بەڵام سەرنجی جیهانی بۆ خۆی ڕاکێشا. لە سەرەتای هەزارەی سێیەمدا، هەندێ لە وڵاتانی خاوەنی سەروەری لیبراڵیزمی ئابووریان ڕەتکردەوە. لیبراڵیزمی ئابووری تەقریبەن هیچ ڕکابەرێکی نەبوو، هەتا ڕکابەرێکی نهێنیشی نەبوو. هۆیی زۆر بەهێز هەبوو بۆ ئەم پەسەندکردنە بەرفراوان و سەرنجڕاکێشەی لیبراڵیزمی ئابووری. مێژووی سەد ساڵی پێشتر بە بەرفراوانی وا دادەنرا کە کە بە لانی کەم بڕیارێکی ڕوونی دابێت. گەر سەدەی نۆزدەهەم هێزێکی بەرگرینەکردەی دامەزراندبێت بۆ گەشەی ئابووری کە شۆڕشی پیشەسازی شیانی کرد، ئەوا سەدەی بیستەم ئەوەی خستەڕوو کە تاکە ڕێگایەکی بەرچاو هەیە بۆ بەدەستهاوردەی. بازاڕ ڕێگایەکە بۆ گەیشتنە دەوڵەمەن بوون و سامان. بە چاوی وڵاتانی ناوەوەی جیهان خاسیەتی پێناسکراو دیموکراسی بوو: ئەوان جیهانی ئازاد بوون. ئەوەی بۆ ئەوانی تر گرینگترین و سەرنجڕاکێشترین و شیاوترین بوو سیستەمی ئابووری گشتییەکەیان بوو. ئەوان جیهانی دەوڵەمەند



بوون، چونکە دەستەبەرکردنی سامان ئامانجێکی هەرە گەورە بوو بۆ ڕووسیا و چین لە ئەنجامیشدا بۆ هەموو کۆمەڵگایەکی سیاسی ڕێکخراو، ئەمە جیهانێك بوو هەموو نیازی پەیوەنیدکرنیان هەبوو.

خولیای بازاڕ لە نێو حکوومەتەکان ڕەگی خۆی داکوتابوو لە سەرهەڵدانی ڕەفاهیەتی ئابووری وەك بنەمایەکی گرینگ بۆ شەرعیەتی سیاسی. لێرەدا سەرەنجامەکانی دوو شۆڕشە گەورەکە کە پێناسەی جیهانی مۆدێرنیان کرد لە سەر ڕێگایەکی هاوتەریبدا بوون. لە سەرەنجامی شۆڕشی فەرەنسا، یارمەت دانی هەندێ ئەندامانی کۆمەڵگا لەگەڵ هێزی سیاسی کارێکی زۆر قورس بوو لە بەر باوباپیرانیان. لە سەدەی بیستەمدا، ئەمە پەسەند کراو حکوومەتیش دەبوایە ئیرادەی گەل بنوێنێت، هەروەها سیستەمی نێودەوڵەتیش بەدەستهاوردەی ئەمەی لە بەر چاو گرت لە ڕێگەی میتۆدە لیبراڵییەکان یان نالیبراڵییەکانەوە. بە هەمان شێوە، هەرکە شۆڕشی پیشەسازی هەڵگیرسا، دیسان پاراستنی ئەو ڕەفاهیەتەی بۆ وڵاتانی جیهانی ناوەوە بەدیهاتبوو کارێکی قوڕس و مەحاڵ بوو یان بە هیچ شوێنێك پەیوەست نەبوو. لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا، بەدەستهاوردەی ڕەفاهیەت ئەرکێکی چەسپاوی حکوومەت بوو لە هەر شوێنێك، یانی لایەنی کەم هۆگری بەدەستهاوردەی ڕەفاهیەت بێت لە جیهان، چونکە گۆلێکی ویستراو بوو بۆ باشتربوونی مولکایەتی و ماددیەت. پرسیاری هەرە گەورەی لە مێژووی ئابووری جەرگەی سەدەی بیستەم لە سەر هاوکێشەی ڕەفاهیەت و لیبراڵ یان نالیبراڵ بوو کە پرسیارێکی کاریگەرتربوو. هەروەها وەڵامی ئەو پرسیارە لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا بەدیارکەوت.

## سەرکەوتنی بازاڕ

لە ئەورووپای **چاخی** ناوەڕاستدا کیمیاناسەکان وێڵ بوون بەدوای دۆزینەوەی هاوکێشەیەك بۆ گۆڕینی ئاسنی بنەڕەتی بۆ زێڕ. لە سەردەمی مۆدێرنـدا هاوکێـشەکە دۆزرایـەوە. کیمیاگـەری مێتافۆڕێکە بۆ پرۆسەی پیشەسازی، پرۆسەی گۆڕینی کەرەستەی خاو بۆ بەرهـەم بـە نرخێکـی بەرزتر. ئەمـە لـە ڕاسـتیدا لـە پـێش کیمیاگەرییـە، کـە مەبەسـتی، بـە قـسەی ئابووریيـە مۆدێرنەکان، دروستکردنی هێزێکی کڕینی زیاتر بە بێ بەرهەمهاوردەی شتی زۆرتر بۆ کڕین.

شۆڕشی پیشەسازی ئەوەی لە سامانێکی بەرزتردا دروستکرد، شـتی زۆرتـر بـۆ خـەڵك بـۆ کڕین و بەئەنجامدانی ئـەوەش بـووە کاریگـەترین پێـشکەوتن لـە مێـژووی مرۆڤـدا لەوەتـەی داهێنانی کشتوکاڵ دە ساڵ لەمەوبەر.

لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا، نزیکەی زیاتر لە سەد ساڵ پاش ئەوەی شـۆڕی پیـشەسازی دەستی پێکرد، تاوانی بەرهەمهاوردەی سامان لە ڕێگەی گەشەی ئابوورییەوە، هەرکە لە بابەتە خورافییەکان بوون، بوو بە واقیعێکی مکومی ژیان. ئەم قۆناغە لە ململانێی سەدەی بیـستەم بۆ سووربوون گونجاوترین چوارچێوەی سیاسـی بـۆ ئـابووری پیـشەسازی بـوو، کـە سیـستەمی ناوەندی پلاندارێژراوی جیهانی کۆمۆنیستی تەی کرد دژی بازاڕە غەیرە ناوەندییەکانی ڕۆژئاوا.

ئەنجامەکانی یەکلاکەرەوەو گرینگ بوون. لـە دوا دەیـەکانی سـەدەی بیـستەمدا، هەرکـە بازاڕە ئابوورییەکانی کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکان پێوەری گوزەرانی خەڵکی خۆیان بۆ ژیـان بـەرزتر کردەوە، ئابووری کۆمۆنیستە زەبەلاحەکەی یەکێتیی سۆڤیەت و چـین هاتنـە نێـو جۆرێـك لـە کیمیاگەرییەکی پێوانەیی: ئەو کەرەسـتە خاوانـەی ئـەوان بەکرایانـدەهێنا بـۆ بەرهـەمهاوردە نرخێکی بەرزتری هبوو لە سەر بازاڕی جیهان لـە چـاو ئـەو شـتە دروسـتکراوانەی کـە لـەوان وەبەرهاتبوون. لە هەموو دەرهاوێشتکانی سەدەی بیـستەمدا، ئـەو سـەرکەوتنە بـە لێـشاوەی بازاڕی ئازاد زۆر بە بەرفراوانتی پەسەندکرا، بۆیەش گـرنگترین کـار بـوو لـە جیهـانی سـەدەی بیست و یەك.





لە دەیەی یەکەمی ماوەی دوای جەنگی ساردا بازاڕ ڕۆڵێکی بالای هەبوو. زۆربەی ولاتـانی خـاوەن سـەروەری جیـا نـەبوون لـە ئاسایـشی گـشتی و هـەوڵی لیـبراڵ بـۆ پەیوەندییـە نێـو دەوڵەتییەکان. گەلێك لەو ولاتانە دووڕوو بوون سـەبارەت بـە دیموکراسـی و میتـۆدی لیبراڵـیێ حوکمگێڕان. ئێستاش لە کۆتاییدا هەموویان هاوکێشەی لیبراڵیان لە ئامێزگرت بۆ ڕێکخستنی چالاکی ئابووری. بارودۆخی پێشەنگی بازاڕ بە لانی کەمیش دانەڕێژرا لە سـەرەنجامی جـەنگی ساردا، کە لە نێو شتەکانی تـر، پێـشبڕکێیەکی سیـستەمی ئـابووری هـەبوو. بـە هەقیقـەت، شێوازی پێشبڕکێی ئابووری زۆر بە هەردوو جەنگی جیهانی دەچوو کـە لـە سـەدەی بیـستەمدا ڕوویاندا لە چاو بەربەرەکانی سەربازی سۆڤیەت و ئەمریکا.

لە ڕووی سەربازییەوە، جەنگی سارد جەنگێکە کەس تیایدا ناباتەوە. لە سەرەتادا ترسـناك بوو، لە کۆتاییەکەیدا هێوربۆوە و سەقامگیر بوو کەسیش نەیبردەوە، وەك یـاری شـەترەنج کـە هەردوو یاریزانە ڕکابەرەکە ڕازیدەبن لە سەر تـەعاودلبوونی هـەردوولا. ڕووخـانی کۆمیـونیزم سەرەنجامی سەرکەوتنێکی سەربازی نەبوو.

هەروەك لە هەردوو جەنگی جیهانیـدا، لـە قۆنـاغی یەکـەمی ململانێـی ئابووریـدا، کـە درێژبۆوە بۆ سێیەکی ناوەڕاسـتی سـەدەکە، هێـزە لیبراڵییـەکان لـە بەرەوپێشـچووندا بـوون و ڕۆژئاواش پاشەکشەی دەکرد. سیستەمی ئابووری کۆمیـونزیم، کـە تیایـدا هـەموو چـالاکییە ئابوورییەکان پلانی بـۆ دانـرا بـوو لـە لایـەن حکوومەتیـشەوە کـۆنترۆڵ کرابـوون، زیـاتر لـە سیتسەمێکی چالاك و سەرکەوتوو دەچوو لەچاو سیـستەمی بـازاڕ. یـەکێتیی سـۆڤیەت، کـە تیایدا سیستەمی پێشەنگ لەوێ یەکەم جار دامەزرا، وادەرکەوت کە ڕابکات لە کاریگەرەکانی سستە مەزنەکەی بازاڕ لە سـییەکان کـە هاوشـێوەی کاپیتـالیزمی جیهـان بـوو. سەرچـاوەی سەربازی هێنا کایـەوە کـە وای لـە یـەکێتیی سـۆزیەت کـرد بتوانێـت بەرامبـەر داگیرکـاری ئەڵمانیای نازی بوەستێتەوە و پاشەکشە بە هێزەکانی نازی بکات لە جەنگی جیهانی دووەمدا، هەردووکیان پێش جەنگ هەروەها لە دوو دەیەی پاش جەنگیش گەشـەی ئـابووری بەرچـاویان بەرهەمهێنا.

لە سێیەکی ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا، سیستەمی ئابووری پێشەنگ بوو، نەك بازاڕ، کە بووە هۆی سەرسامی و چاولێکردنی ئەو سیستەمە. لەو شوێنانەی حیزبە کۆمۆنیستەکان هێزی سیاسیان قۆرخکرد، لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات و چین و ڤێتنام و کوبا لاسایی هەمان ئابووری سۆڤیەتیان کردەوە. هەتا لەو شوێنانە ئۆرتۆدۆکسی کۆمیونیزم بەرپرسیارێتی نەگرتە ئەستۆ، هەندێ خاسیەتی سیستەمی ئابووری خۆی بەکاربران. لە زۆربەی ئەو شوێنانەی کە ناسراون بە جیهانی سێیەم، حکوومەتەکان خاوەنی زۆربەی ئابووری بوون و بەڕێوەیان دەبرد. دەوڵەت پلانی بۆ هەموو شتێك دانەدەنا، بەڵام تاڕادەیەکی زۆریش پلانی گرینگی دادەنا.

لە پێشبڕکێی ئابووری جەنگی ساردا لە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، وەك لە هەردوو جەنگی جیهانیدا، ئاڕاستەکە لە کۆتاییدا گۆڕا. لە دوا سێ دەیەی سەدەی ئابووری کۆمۆنیستدا بنەماکان پاشەکشەیان کرد. لە کۆتایی سەدەکەدا، بەقەد قولّی ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩١٨ و ١٩٤٥ دۆڕان، سیستەمی پێشەنگ واتە ئابووری کۆتایی پێهات و مرد.

لە لای ڕۆژئاوادا، وێڕای ئەمە، بەربەرەکانی ئابووری، بەپێچەوانەی پێشبڕکێی سەربازی، بەرپا بوو لە لایەن هاوپەیمانێکی ڕاستەقینە، کە وەك هەردوو جەنگی جیهانی وابوون. کەچی لە کاروباری سەربازی جەنگی ساردا ئەڵمانیا و ژاپۆن ڕۆڵێکی نەرێی گەورەیان گێڕا، لە سەردەمی ئابووریدا بەشداری گرینگ و سەربەخۆیان کرد لە سەرکەوتنی ڕۆژئاوادا.

ئابووری ئەوان گەورەترین ئابووری بوو لەو دوو ناوچەیەدا لە کاتێکدا پێشبڕکێی ئابووری گرینگترین پیشبڕکێ بوو. ئەورووپاو ئاسیای ڕۆژهەڵات هەردووکیان بەشێك بوون لە وڵاتانەی ناوەوەی جیهان، کە هێز و سامان گرێدرابوون و لێیانەوە داهێنانی کەلتووری پەیدابوو. لە هەردوو ناوچەدا، خەڵکی تر ڕاستەوخۆ هاتە نێو پێشبڕکێییەکە. هەریەکەیان بازاڕ و ئابووری پێشەنگیان تیا بوو هەندێ جاریش دەلکێنران بە بەشی دواوەی دابەشی هەمان نەتەوە: ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای ئەڵمانیا، کۆریای باکوور و باشوور، چین و تایوان. لە هەر یەك لەو حاڵەتانەدا بنەماکانی بازاڕ بە پێشەنگ سەلمێنران. ئەورووپای ڕۆژئاوا لە چارەگی سێیەمی سەدەکەدا و ئاسیای ڕۆژهەڵات چوارەم تۆمار بوون لە سەرنجڕاکێشترین گەشەی داب و نەریت لە سەر زەویدا.

ئەڵمانیا و ژاپۆن هەردووکیان لە شکان و دۆڕانی سەربازییەوە سەریانهەڵدایەوە کە خۆیان کردە بەهێزترین هێزی ئابووری جیهان. هەردووکیان پەرەیان بە پێشکەوتنی ئابووری دا لە





ماڵی خۆیان بە هۆی هەناردنی شت بۆ دراوسێ هەژارەکانی تریان. لە ئەورووپا، ئەڵمانیا شەریکێك بوو بۆ دراوسێ ڕۆژئاواییەکان، ئەندامێکی دامەزرێنەری کۆمەڵەی سیاسی و ئابووری بوو کە لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا بوو بە پانزەمین ئەندامی یەکێتیی ئەورووپا. لە ئاسیاش، ژاپۆن هەرچەند شەریکێکی کەمتر مۆدێل بوو، وەك وڵاتە ئاسیاکانی ڕۆژهەڵاتی تر خاسیەتەکانی سیستەمی ئابووری خۆی بەکاربرد کە ئەنجامی سەرنجڕاکێشی لێ کەوتەوە. کۆریای باشوور، تایوان، سەنغافورا، هۆنك کۆنگ هەروەها گەلێ وڵاتی تری ڕۆژهەڵاتی باشووری ئاسیا بەدوای ڕێبەری ژاپۆن کەوتن لە بەدەستهاوردەی ڕێژەی بەرزی گەشەی ئابووری. کۆی ئەزموونی ئەو وڵاتانە ناسرا بە موعجیزەی ئابووری ئاسیا.

گرینگە بزانیت سەرکەوتنی بەم دواییەی سەدەی بیستەم لە بازاڕ تەنها سەرەنجامێکی جەنگی سارد نەبوو، بەڵکو هەڵکەندنێکی مێژووی ئابووری سەدەی بیستەمیش بوو، کە بابەتێکی سەرەکی فراوانکردن و تەسککردنەوەی ڕۆلی وڵاتان بوو لە کاروباری ئابووریدا.

## هەڵبەز و دابەزی هەڵسوڕاندنی دەوڵەت

لە زۆربەی کاتەکانی سەدەی بیستەمدا، ڕۆلی حکوومەت لە بواری ئابووریدا بەرفراوانییەکی بەرچاوی بەخۆوە بینی. لە دواهەمین سێدەیەی هەمان سەدەدا، ئاڕاستەی حکوومەت لە بوارەکەدا ئاوەژوو بۆوەو دەوڵەتیش پاشەکشەی کرد لە ئەرکە سەرەکییەکانی نێو چالاکییە ئابوورییەکان بۆ نموونە: وەگەڕخستن، بەرهەمهاوردە و دابەشکردن. لە دەستپێکی سەدەکەدا، لە وڵاتانی ناوەوەی جیهاندا، بە بەرفراوانی ئەوە پەسەندکرا کە حکوومەت بە باشترین شێوە ڕۆڵێکی گونجاوی هەبێت لە هەرسێ بواردا واتە لە ئیستمارکردن و بەرهەمهاوردە و دابەشکردندا. دەستێوەردانی حکوومەت لە کاروباری ئابووریدا لە پێش نەریتی پیشەسازی و جیهانی نادیموکراسیدا، کە لە پاشەکشەیەکی تەواو دابوو لەکاتی ماوەی سەدەی نۆزدە و لە ئەوروپاش داماڵرابوو لە جەنگی جیهانی یەکەمدا، بەڵام ئەو جەنگە ئەو سەرژمێرییەی لە سەر هاوسەنگی ئاشکرای لە چالاکییە ئابوورییەکاندا هەڵگەڕانەدەوە لە نێوان دەوڵەت و بازاڕ.

لە جەنگی جیهانی یەکەمدا، حکوومەتی ولاتە شەڕخوازەکان زۆر لە کاتەکانی پێشتر بیریان بەلای بەرپرسیارێتییە ئابوورییەکانەوە دەچوو. ئەو ولاتانە کۆنترۆلی بەرهەمی پیشەسازیان گرتە دەست، سەرپەرشتی تەرخانی سەرمایەو کرێکاریان دەکرد، هەروەها بەشیان هەبوو لە ناوەندەکانی گوزەرکردن، هەموو ئەمانە بۆ بەهێزکردنی تەقەلا سەربازییەکانیان بوو. بۆ جاریی یەکەم، هەموو سەرچاوەکانی کۆمەڵگا بەکاربران بۆ مەرامێکی تایبەت، کە ئەمە دەوڵەت بوو ئەو سەرچاوانەی بەکاردەبرد. جەنگ ئەوەی خستەڕوو کە دەستێوەردانی حکوومەت دەتوانێ چی بەدەست بێنێت، هەروەها لە نیو سەدەدا لە نێوان سالانی (1920، 1970) ڕۆڵی ئابووری دەوڵەت فراوانبوو، هەندێ ولات زیاتر لە هەندێکی دیکە.

لە ولاتانی ناوەوەی جیهان کە ئەمریکای باکوور و ئەوروپای ڕۆژئاواو ژاپۆن دەگرێتەوە، بازاڕ وەك میکانیزمێکی سەرەکی ئابووری مایەوە، بەلام بە کۆتاهاتنی ڕێچکەکانی سالانی پێش بەرپابوونی جەنگی جیهانی یەکەم، ڕۆڵی دەوڵەت گەشەی کرد. وەگەڕخستنکردن بە بەرفراوانی مایەوە، بەلام دوور لە حیجزێکی تایبەت وەك کەرتی تایبەت، بەلام حکوومەت کاریگەری لە سەر تەرخانی سەرمایە هەر هەبوو، بە تایبەتی لە ژاپۆن. زۆربەی کارگە و دەزگاکان لە لایەن کەرتی تایبەتەوە هەڵدەسوڕێنران و خاوەندارێتی دەکران، بەلام هەندێکیان لە ژێر دەسەلاتی دەوڵەتەوە بوون، زۆربەی دەگوازرانەوە بۆ کۆنترۆلی حکوومەت لە لایەن ئەو پرۆسەیەی کە ناسرا بوو بە نیشتمان پەروەرێتی. سەبارەت بە دابەشکردنیش، حکوومەتی ولاتانی ناوەوە ڕێژەیەکی زۆرتری بەرهەمی نەتەوەییان ئاڕاستەکردەوە بۆ ئەو ولاتانەی کە موحتاج و شایەن بوون، وەك ولاتانی کۆن و دواکەوتوو، یان بۆ ئەو ولاتانەی بە دەسەلاتێکی سیاسی تەواو یان بۆ هەردوو جۆرە ولات. ولاتانی ڕۆژئاوا لە سەدەی بیستەمدا بوون بە تێکەڵەیەکی مەکینەی گەسك و سیستەمی ئاوپڕژێن و، داهاتیان لە ڕێگەی باجەوە وەردەگرت.

لە شێوازی ئابووری سۆڤیەتی نالیبراڵدا دەوڵەت بەرپرسیارێتی هەموو شتێکی لەئەستۆ بوو. لینین زۆر سەرسام بوو بە جەنگی ئابووری ئەڵمانیا کە دواتر کردی بە مۆدێل بۆ ولاتە کۆمۆنیستەکان. حکوومەت پلانی دادەڕێشت بۆ وەگەڕخستن. ئەو بەرهەمانەی لە کارگەو کێڵگەکانەوە بەرهەم دەهێنران لە لە لایەن دەوڵەتەوە وەك خاوەنێك هەڵدەسوڕێنران. ڕژێمە کۆمۆنیستەکان پیشەسازی و کشتوکاڵیان کرد بە شتێکی نەتەوەیی لە تەواوی کەشتییەکەدا.



هەروەها بڕیارەکانیش لە مەڕ دابەشکردن لە لایەن حیزبی بالادەستی دەوڵەت دەدرا. لەکاتێکدا لە ولاتانی ناوەوەی جیهاندا، هەروەها لە زۆربەی ولاتەکانی تری جیهاندا، نرخ و موچەکان زۆربەیان لە لایەن هێزی بازاڕەوە دیاریدەکران، لە ولاتە کۆمۆنیستەکان دەسەلاتداران دایاندەنا بە پێی فەرمانی کارگێڕی.

لە زۆربەی ئەو شتانەی ناسرا بوون لە کاتی جەنگی ساردا وەك جیهانی سێیەم، لە ئەمریکای لاتین و ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و بەتایبەتیش باشووری ئاسیا، سیستەمێکی ئابووری پێشکەتوو پەرەی سەند. حکوومەت کۆنترۆلی زیاتر بوو لە سەر وەگەڕخستن لە ولاتانی ناوەوەی جیهان، هەرچەندە خاسەتی کۆنترۆلی تەواوی پێشەنگی ئابووری نەبوو. کەرتێکی پیشەسازی دەوڵەت دروستکرا، بەلام، بە پێچەوانەی سیستەمە کۆمۆنیستەکان، کە کاری شانبەشانی پرۆژە پیشەسازییە تایبەتەکان دەکرد. حکوومەتیش بیری لە بەرپرسیارێتییەکی بەرچاو لە دابەشکردن دەکردەوە.

لە سێیەم هەوڵی هەڵسوڕاندنی ئابووریدا، ڕۆڵی حکوومەت لە هاوکاری ستراتیژی تایبەتی پێکەوتنی ئابووری بوو، کە تەواو کاریگەر بوو لە لایەن نموونەی کۆمۆنیستەوە. ئەو ستراتیژیەتە مەبەستی پێشخستنی پیشەسازی توند بوو، کە لە زۆربەی کاتەکانی سەدەی بیستەمدا، بە هاوکاری مامناوەندی ئابووری دانراو ڕێگایەك بوو بۆ سامانی نەتەوەیی و هەروەها بنەمای هێزی سەربازی نەتەوەیی.

ئەم ستراتیژیەتە ناسرا بوو بە پیشەسازی بە سەرکردایەتی دەوڵەت. هەروەها بە ناوی بەدیلی هاوردەیش ڕۆیشت، کە یەکێك بوو لە سیاسەتە سەرەکییەکانی: ئەو ولاتانەی بەدوای کەوتن مەبەستیان دروستکردنی ستایلی تایبەت بە خۆیان بوون لەوەی ناچاربکرێن بیهێنن. لە توێژینەوەی ئەم ستراتیژیەتەدا، حکوومەتی ولاتانی جیهانی سێیەم ڕقێکیان لە کردەدا بەرامبەر ئابووری لیبرالیزم هەڵگرت بە تایبەتیش بەرامبەر ئابووری کۆمۆنیست: هاننەدانی بازرگانی لە تەواوی ولاتانی دیکەی جیهان و وەگەڕخستن لەوانەوە.

لە پالپستکردنی بۆلشڤیکەوە لە دەسەلات لە ڕووسیا تا کۆتایی شەستەکان، ئاڕاستەی سەرکەوتووی ئابووری لە ولاتانی ناوەوەی جیهان، لە کەرتی کۆمۆنیستدا، هەروەها لە ولاتانی جیهانی سێیەمدا، ئاڕاستەیەکی لیبرالێ نەبوو. هەندێ قوتابی لە کاروباری سیاسی و ئابووریدا پێشبینی ئەوەیان کرد کە بۆ ماوەیەکی درێژ، پراکتیزە ئابوورییەکانی کۆمیونیزم و ڕۆژئاوا بە

یەکدەگەنەوە، لەگەڵ ڕۆڵی ئابووری دەوڵەت لە هەموو شوێنێك زۆر فراوانتر بوو دەوڵەتیش زیاتر دەستی لە کاروباری ئابووری وەردەدا.

لە کۆتایی سەدەکەدا، جۆرە بەیەکگەیشتنێکی جیاواز بوو لە واقیعدا. ئابووری هەموو جیهان لە دەزگاو پراکتیزەکردندا لە هەرکاتێك زیاتر بەیەکچوون لەوەتەی جەنگی جیهانی یەکەمەوە، بەڵام مۆدێلی ئابووری کە لە سەریدا بە یەکدەگەیشتن ئەوەنەبوو کە ئەوان بۆی دەچوون لە دەیە ناوەڕاستەکانی سەدەکەدا. لە دواهەمین سێ دەیەی سەدەکەدا، هەریەك لە سێ جۆرەکەی ئابووری کێشەی دەنایەوە کە وا پێ دەچوو بازاڕ تاکە ڕێگەچارەی ئەو گرفتانە بێت.

لە حەوتاکان وڵاتانی جیهانی ناوەوە لە هەمانکاتدا ئەزموونی بەرزبوونەوەی لە نرخیان کرد و نائومێدیان دادەبەزی لە ڕێگەی گەشەی ئابووریانەوە. لە وەڵامی ئەم تێکەڵە نیگەرانییەدا، کە دواتر ناسرا بە بەرزبوونەوەی بەردەوامی نرخ "stagflation"، حکوومەتی ڕێکخەری بازاڕ هاتنە سەر دەسەڵات لە بەریتانیا لە ساڵی ١٩٧٩، لە ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٨١، هەروەها لە ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩٨٢. بە سەرکردایەتی مارگەرێت تاتچەر "Margaret Tatcher"، ڕۆناڵد ڕێگان "Ronald Regan"، هێلمەت کۆهل "Helmut Kohl"، هەر یەك لەو وڵاتانە هەنگاویان گرتە بەر بۆ کەمکردنەوەی ڕۆڵی ئابووری دەوڵەت. ڕێگان و تاتچەر تایبەتمەندێتیان پراکتیزەکرد، فرۆشتنی ئەو پرۆژانەی کە دەوڵەت خاوەنیانە بە موستەسمیری تایبەت و هەڵسوڕێنەر، هەروەها هەستان بە کاری نائینتیزامی واتە سپاردنی چالاکییە ئابوورییە مونتەزیمە پێشوەکان بە یاساکانی بازاڕەوە.

سوڕانەوەی ئاراستە بەرەو کۆنترۆڵی گەورەتری حکوومەت لە سەر ئابووری کە ڕوویداوە تەنانەت پارێزکاری خودشێوازی داماڵیینی نەکرد. لە ساڵی ١٩٨١ دا فرانسۆ میتران بوو بە سەرۆکی فەرەنسا و یەکەم حکوومەتی شۆسالیستی لە وڵاتەکەدا دروستکرد لە ماوەی بیست و پێنج ساڵدا، کە بەرەو پێش چوو بۆ جێبەجێکردنی ئەو سیاسەتە ئابووریانەی کە سۆشیالیستە فەرەنسییەکان هەمیشە حەزیان پێی کردووە، ئەو سیاسەتانەش: نیشتمانپەروەرێتی، زۆربوونی خەرجی حکوومەت، و پابەندبوونی زیاتر بوون. ئەنجامەکە قەیرانێکی دراوی بوو currency. کاپیتاڵ ڕای کرد لە وڵات و بەهای فرانکی فەرەنسی زۆر دابەزی. لە وەڵامدا، سوڕانەوەی ئابووری جێبەجێکرد، ئەو سیاسەتانەی لە شوێنی خۆی دانا کە بە هەمان ئەو سیاسەتانە دەچوو جێبەجێکرابوون لە باکووری ئەوروپا و ئەمریکای باکوور. لە گەڵێ کەرتی هەمەجۆری



ئابووری لیبراڵیزم لە وڵاتانی ناوەوەی جیهاندا، حاڵەتی فەرەنسا سەر زارەکی ترینیان بوو. تاتچەر و ڕێگان و کۆهل ئەو سیاسەتانەیان پەیڕەو کرد کە خۆیان باوەڕیان پێ هەبوو. بە پێچەوانەوە، میتران، خۆی لەوەدا بینییەوە کە چاودێری جۆرە سیاسەتێکی ئابووری دەکات کە حیزبەکەی دژی بوو. سەرکردە بەریتانی و ئەمریکی و ئەڵمانییەکان بە قەناعەتەوە لیبراڵی بوون. حکوومەتی سۆشیالیستی میتران بازاڕی لە ئامێزگرت، چونکە هیچ بەدیلێکی تری نەبوو. کارپێکردنی ناماقوڵی ئابووری کە بووە هۆی سوڕاندنەوەی کۆرسەکە لە بەدیلی هاوردەدا لە وڵاتانی جیهانی سێیەم قەیرانێکی قەرز بوو. لە سەرەتای هەشتاکان ژمارەیەك لە وڵاتانی ئەمریکای لاتین هیچی تر نەیانتوانی پارەی بەرژەوەندی بدەن لە سەر ئەو قەرزانەی کە ئەوان وەریانگرتبوو لە بانقە سەرەکییەکانی ڕۆژئاوا. تەقدیمیان کردبوو بۆ حەوانەوە. بانقەکان و حکوومەتەکانی ڕۆژئاوا و و دەزگا داراییە نێودەوڵەتییەکان سوور بوون لە سەر ئەوەی کە تاوەکو ئەو قەرزە وەرگرن ئەو وڵاتانە دەبێ پێوەرە لیبراڵییەکانی ئابووری بگرنە بەر: فرۆشتنی ئەو شتانەی دەوڵەت خاوەنیانە، کەمکردنەوەی چاودێری و ئاڕستەکردنی حکوومەت بەسەر چالاکی ئابوورییەوە، هەروەها کردنەوەی وڵاتەکانیان بۆ شتومەك و سەرمایە لە دەرەوە. هەرچەند ئەمە مانای ئەوەبوو ڕەتکردنەوەی ئەو بنەمایانەی کە لە سەریدا ئەوان سیاسەتە ئابوورییەکانیان وەستاندبوو، قەرزدارەکان ڕازی بوون.

دەیەك دواتر هیندستان لە هەمان بارودۆخدا خۆی بینییەوە. گەورەترین وڵات بوو لە پەیڕەوی بەدیلی هاوردە و پابەنترینیان بوو لە هەر یەکەیان بۆ ئەو ستراتیژیەتە ئابوورییە تایبەتە. پاش سەربەخۆبوون بە چوار دەیە هیندستان کەرتێکی پیشەسازی گەورەی دامەزراند کە دەوڵەت خاوەنی بوو و ئابووری خۆی لە پابەندبوونێکی سەیردا گرێدا کە زۆر ئاڵۆز بوو بەوەی داوا لە حکوومەت کرابوو بۆ چالاکییەکانی زنجیرەی وەرگرتن و دەرکردنی کارمەندان بۆ کردنەوە و دانانەوەی کارگە لە ناو وڵاتدا تاوەکو هیچ شتێك لە دەرەوە نەهێنن. کەواتە ئەوەی گشتگیر بوو ئەو پابەندبوونانە بوون، کە کاتێ حکوومەتی ئیمپراتۆری نیوەی یەکەمی سەدەکە پێی دەوترا ڕاجی بەریتانی، ئەوەی دوای ئەو جێی گرتەوە ناسرابوو بە ڕاجی بەمۆڵەت "License raj".

لە مانگی شەشی ١٩١٩ دا، حکوومەتی هیندستان خۆی لە هاوسەنگییەکی قەیرانی قەرزدانەوە بینییەوە، کە دراوێکی بەس بوو تەنها بۆ دوو هەفتە هاوردە. ئەمە تەقدیم کرا بۆ

پارەی گەنجینەی نێودەوڵەتی بۆ قەرز، کە هەمان ئەو مەرجانە بو کە دەیەك پێشتر وڵاتانی ئەمریکای لاتین ناچارکران پەسەندی بکەن. لە بنچینەدا هیندستان ڕازی بوو بۆ کردنەوەی ئابووری خۆی، بۆ بڕینی پابەندبوونەکانی، هەروەها ڕوونکردنەوەی کەرتە پیشەسازییەکانی کە دەوڵەت خاوەنی بوون.

کۆتایی سێیەم هەوڵی جیا بۆ هەڵسوڕاندنی ئابووری، ئابووری پیشەنگی کۆمۆنیست، بە دوو قۆناغدا ڕوودیدو تێپەڕی. لە ١٩٧٨ دا چین دەستیکرد بە بەرنامەی چاکسازی ئابووری کە بە ماوەیەکی کەم بووە هۆی موڵکی تایبەت لە کشتوکاڵدا، لە سەردەمی ماو دا کەرتێکی پیشەسازی تایبەت شان بەشانی پرۆژەکانی کە دەوڵەت خاوەنیانە دروست بوو، نرخەکان دانران بەهۆی بازاڕ، هەروەها بازرگانی کردن لەگەڵ تەواوی وڵاتانی دیکە وەگەڕخستن بوو لەوانەوە. لە نەوەدەکان حکوومەتی چین هەتا پابەندبوونێکی بەلاغیشی ڕێگە گرت بۆ پلانێکی داڕێژراوی ئابووری.

چین بەرە بەرە بە چاکسازی ئابووری دا چوو. دەیەك دواتر وڵاتە کۆمۆنیستەکانی یوراسیا ئەزموونی ڕووخانی کتوپڕی سیاسیان کرد. کۆتایی حوکمی کۆمۆنیست لە دەرهاویشتەی خۆیدا بیست و حەوت وڵاتی دوای کۆمۆنیستی جێهێشت کە لە سنووری ڕۆژهەڵاتی ئەڵمانیاوە بۆ ڕۆژئاوای سنووری چین درێژبوونەوە. لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا، تاوەکو دروستکردنی گۆڕانێك لە پلانی سەرەکییەوە بۆ بازاڕی ئازاد، هەموو خۆیان پابەندکرد بۆ بەرزخوازیەکی زیاتر. ڕێگەیەکی زەحمەتری پێچانەوەی پێوەرەکانی فشار بوو لە سەر وڵاتی بەدیلی قەرزداری وڵاتانی جیهانی سێیەم. ئەو پێوەرانەی نرخی ئازادی تێوەگلاند لە کۆنترۆڵی حکوومەت دوە، گۆڕینی موڵکایەتی لە دەوڵەتەوە بۆ دەستە تایبەتەکان، هەروەها دروستکردنی ئەو دەزگایانەی کە بازاڕی کارای ئابووری داوای دەکات. لە دەستپێکی سەدەی بیست و یەکدا، سەرکەوتن لە دروستکردنی ئەو گۆڕانکاریانە هەمەجۆر بوو لە نێو هەردوو بیست و حەوت وڵاتدا، بەڵام هەموو دەستیان، لانی کەم بە دوودڵی، بە گۆڕان کردبوو. هیچ کامیان هەوڵی ئەوەیان نەدا[*] سیستەمی ئابووری کۆمۆنیست بپارێزن.

(*) کێشە ئابوورییەکانی وڵاتانی ناوەوی جیهان لە حەوتاکان و قەرزدارانی وڵاتانی جیهانی سێیەم لە هەشتاکان، بە نرخی وزەوە گرێدرابوون. هەردوو سەدمەی نەوت لە ١٩٧٤ و ١٩٧٩، یەکەمیان پەیوەست بوو



دواهەمین بەش لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا پاشەکشەی دەوڵەت دەستپێکرد بەهۆی قەیرانە داراییەکانی ئاسیا لە کۆتایی نەوەدەکاندا، کە ئەمەش کاری لە وڵاتانی جیهانی سێیەم کرد کە لە دواهەمین سێدەیەی سەدەی بیستدا ڕۆچووبووە نێو گەورەترین سەرکەوتنی ئابووری. ستراتیژی ئابووری وڵاتانی ئاسیای ڕۆژهەڵات لەوەی کە بەدوای ئەمریکای لاتین کەوت، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئاسیسای باشوور زیاتر لیبراڵ بوو. بۆ گەشە پشتی بەستا بوو بە نێرەرەکان تا بەرهەمهاوردە بۆ بازاڕێکی ناوخۆی پارێزراو. ئەمە وڵاتانی ئاسیای ڕۆژهەڵاتی خستەڕوو بۆ کرۆکی ئابووریی بازاڕ، ململانێیەکی پیس، بە تایبەتی لە ویلایەتە یەکگرتووەکان، کە زۆربەی بەرهەمی ئەوانی کڕی لە هەر وڵاتێکی تر. هەرچەندە وڵاتانی ئاسیای ڕۆژهەڵات گەلێ لە پراکتیزە ئابووری نالیبراڵی وڵاتانی جیهانی سێیەمی نەهێشت، دووی لەوان گرتە ئامێز. حکوومەتەکانیان ڕۆڵی سەرەکیان بینی، هەرچەند کۆنترۆڵی ئاڵوگۆڕی بێگانە و کاریگەری لە سەر بانقە گەورەکان کە خزمەتیان کرد وەك گەنجینەیەکی گەورە بۆ کاپیتاڵ. هەروەها هەرچەندە، پشتیان بەستا بە ئەکسێس بۆ بازاڕی وڵاتەکانی تر، وڵاتانی

بە جەنگی ئیسرائیل و عەرەب لە مانگی دەی ١٩٧٣، دووەمیان پەیوەست بوو بە شۆڕشی ئێران لە ساڵی ١٩٧٩، بەرابەری باج سەپێنرا بەسەر ڕۆژئاوا و بەشداربوو لە سستی ئابووری. ئەم هەمان زیادکردنی نرخە وڵاتانی جیهانی سێیەمی لێخوڕی بۆ قەرزکردن زۆر بۆ پاراستنی لێشاوی نەوت کە لە سەریا ئابوورییەکایان پشی پێ بەست بوو، بەڵام کاتێ وڵاتانی ناوەوەی جیهان، بە تایبەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان، تووشی سستی بازاڕی ئابووری هات لە کۆتایی حەوتاکان و سەرەتای هەشتاکان، ڕووخانێك بەهۆی بەرزبوونەوەی ڕێژەکانیان ڕوویدا دروستکرا بۆ نەهێشتنی ئەو نرخ بەرزییەی کە سەدمە نەوتییەکان دروستیکرد کاتێ حکوومەتەکان پارەیان لە چاپدا بۆ جێگەگرتنەوەی هێزی فرۆشتن کە لێشاوی نرخی نەوت لایبردبوو، قەرزدارەکان نەیانتوانی شت ڕەوانەی بازاڕەکان بکەن بە قەبارەیەکی پێویست بۆ دەسکەوتنی دراوی باش بۆ خزمەتی قەرزەکانیان.

هەروەها، سەدمەکانی نەوت کاریگەری هەبوو لە سەر ئابووری کۆمۆنیستەکان. بەرزی نرخ نێرەرێکی نەوتی و حەلاوەیەکی ئابووری بەخشی بە ڕووسیا، کە ئاستەنگی ئابوورییەکانی دوا خست، یان بەلانی کەم دەمامکی دا. ڕمی نرخ هەردوو ڕێزکاری پێکا لە وڵاتە کڕیارەکان و کەشفبوونی سەرچاوەی نوێی پاشەکەوت، کە بووە هۆی دابەزینی نرخی نەوت لە هەشتاکان. ئەمە سزای یەکێتیی سۆڤیەتی داو کڕیارەکانی بە هۆی کەمکردنەوەی سەرچاوەی سەرەکی دراوی توونديان (پارەی زۆر).

ئاسیای ڕۆژهەڵات وەڵامیان نەبوو بە هۆی کردنەوەی تایبەت بە خۆیان بۆ هاوردە. کاتێ دراوەکانیان دابەزی ئەوانیش بە دوای قەرز کەوتن. هەروەك لەگەڵ ئەمریکای لاتین و هیندستان، قەرزەکان لەگەڵ مەرەجەکان دەهاتن. ئەو مەرجانە ئاشنا بوون، پابەندبوون بۆ کەمکردنەوەی ڕۆڵی دەوڵەت لە چالاکییە ئابوورییەکاندا.

ئەوەی ڕوویدا لە دواهەمین سێ دەیەی سەدەی بیستەمدا ئاشکرایە: ڕۆڵی ئابووری دەوڵەت و فراوانبوونی ڕۆڵی ئابووری دەوڵەت لە نیوەی سەدەی داهاتوودا دەستی کرد بە گرێبەست لە سەرانسەری جیهان. چۆنیەتی ڕوودانی ئەمەش ئاشکرایە: لە وڵاتانی ناوەوەی جیهان و لە وڵاتانی نیمچە لیبراڵی جیهانی سێیەم و لە وڵاتە کۆمۆنیستەکانی تەواو غەیرە لیبراڵی کێشەی ئابووری، یان قەیرانەکان، سەری هەڵدا کە لیبراڵیزمی ئابووری ڕێگەچارەی ئەو کێشە یان قەرانانە بوو.

بەڵام بۆچی ئەم شتە ڕوویدا؟ بۆچی دەوڵەت لە پاڵەوانەوە گۆڕا بۆ تاوانبار، لە کلیلەوە بۆ گەشەی ئابووری بۆ بەربەستێك بۆی؟ بە تایبەتی بۆچی توندترین ڕێچکەی هەڵسوڕاندنی حکوومەتەکان و ئابووری پیشەنگی کۆمۆنیست لە زۆربەی کاتەکانی سەدەی بیستەمدا یەك لە سەرکەوتنە هەرە گەورەکانی مێژوو بوون. بە کلۆجێك هەرەسی هێنا کە لە کۆتای سەدەکە بە تەواوی دەستی لێ هەڵگیراو نەهێڵرا؟ فەشەلەکەی دەکرێ بزانرێت بەهۆی دانانی مێژووی ئابووری دواهەمین دەیەی سەدەی بیستەم بۆ نێو ململانێیەکی فراوانتر کە دەگەڕێتەوە بۆ هەردوو وڵاتی سەردەمی مۆدێرن، هەروەها وا ڕوودەدات دەگەڕێتەوە بۆ داپۆشینی زۆربەی مێژووی شۆڕشی پیشەسازی.

## گەشەی ئابووری و شەرعییەتی سیاسی

خاسیەتی ناسراوی شۆڕشی پیشەسازی گەشەی ئابوورییە. دەستی پێکرد لە دوا دەیەکانی سەدەی هەژدەهەم و بەردەوام بوو تا سەرەتای سەدەی بیست و یەك، بەرهەمێکی ئێجگار زۆری بۆ بەکارهاوردەە مرۆییەکان وەبەرهێنا. گەشە سێ سەرچاوەی هەیە: زۆربوون لە سەرمایە لە ڕێگەی وەگەڕخستنەوە، زۆربوونی کرێکار لە ڕێگای زۆربوونی دانیشتوان، کۆچکردن، یان بەگرتنەخۆی ژمارەیەکی زۆرتری کۆمەڵگا لە هێزی کاردا، هەروەها زۆربوونی داهات کە





بڕێکی کەمی بۆ تێچوو بوو، سەرمایە و کرێکار دەتوانن زۆربوون بەرهەم بێنێنن، زۆربوون بەو دیوەی کە ناسراوە بە بەرهەمهاوردە. لە خاڵی جیاجیادا لە شۆڕشی پیشەسازیدا ئەو ڕێگایەی کە ئەو سێ خاڵە بە یەکەوە گرێدراون جیا بوو.

قۆناغی بەرایی گونجا بە هۆی داهێنانی یەکەم مەکینەی گرینگ کە لێدەخوڕا بە هێزێکی نەبزۆك، مەکینەی هەوایی، خلۆکەی بزۆك، تەکنیکە سەرەتاییەکانی هەڵکەندنی خەڵوزو توانەوەی پۆڵا. هەرکە ئەوانە بەردەستکران دوو پێشکەوتن هێزی بەخشی بە بەریتانیا، پێشەنگ لە شۆڕشی پیشەسازی، دواتر وڵاتانی تری ڕۆژئاوا، بۆ سوود وەرگرتن لێیان. یەکێکیان کۆکردنەوەی سەرمایە بوو، لە سەدەی هەژدە و نۆزدەدا بەریتانیا بەهێزترین و ئاڵۆزترین سیستەمی دارایی هەبوو لە جیهان. ئەوەکەی تر جوڵەی ژمارەیەکی زۆری خەڵك بوو لە لادێ وە بۆ نێو شارو لە کێڵگەکانەوە بۆ کارگەکان، کە لەوێ دەیانتوانی مەکینەی نوێ بە ئیش بخەن. ئەمە بە زۆربوونێك لە بەرهەم دانرا هەرکە کرێکا گوێزرایەوە لە کەرتێکی ئابووری کەمەوە بۆ کەرتێکی ئابووری زۆر.

قۆناغی یەکەمی شۆڕشی پیشەسازی کۆمەڵگای ڕەهای نەریتی دروستکرد، چونکە شۆڕش یەکی نەدەگرتەوە لەگەڵ داوا بنەڕەتییەکانی ئابووری پیشەسازی. لە نێو ئەو داوایانەدا بە بازرگانیکردنی کشتوکاڵ بوو. خاك دەبێ مامەڵەی وەك کەل و پەل لەگەڵ بکرێت کە بکڕێت و بفرۆشریت تاوەکو خواردنی پێویست بەرهەم بێنێت بۆ دەرخواردی دانیشتووی شارستانی گەشەکردوو، هەروەها بۆ دروستکردنی هەندێ کرێکاری لادێیی هەڕەمەکی تاوەکو خەڵك بتوانێت بچێتە شارەکان بۆ کار لە کارگە نوێیەکان. کۆمەڵگا نەریتییەکان هەمەجۆر بوون بە بەرفراوانی لە جیهان، بەڵام لە هەموو شوێنێك بە خاك پشتیان بەستابوو کەچی لە هیچ شوێنێکیش خاك وا بە سادەیی موڵك نەبوو. لە بڕی ئەوە بنەمای تۆڕێکی ئاڵۆزی ئەرك و ئیمتیاز بوو، پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی خاوەن کرێکاری بەگەڕ دەخست، گەورە بۆ جووتیار. ئەمە ئەو دەزگا نەریتیانە و ئەو جیهانە کۆمەڵایەتیانە بوو، کە شۆڕشی پیشەسازی هەڕەشەی لێ کردو لە کۆتاییدا لەناوچوو.

بە پێچەوانەی جیهانی تەقلید، بۆ ئەم قۆناغی یەکەمەی سیستەمی کۆمۆنیست سەروبەری سەلماند. بە هەقیقەت، بۆ ماوەیەك بە ئیختیاری دەچوو. ئابووری وەك پێشەنگێك نەیدەتوانی مەکینە بەرهەم بێنێت کە یەکەم قۆناغی شۆڕشی پیشەسازی لە سەریدا وەستا بوو، بەڵام،

هەرکە داهێنران، هەروەها شێوازە سەرەتاییەکانی پیشەسازی کردن دامەزران، سیستەمی پێشەنگی ئابووری خزمەتی خۆی سەلماند. دەسەڵاتی باڵای دەوڵەت ناوەندەکانی گووشینی قاسەکانی بەخشی بە حکومەت لە سەرەنجامی کەرتی کشتوکاڵی بۆ ئاراستەکردنی پیشەسازی لە سەر پێوەرەێکی گەورە. ولاّتە کۆمۆنیستەکان ڕێژەی بەرزی وەگەڕخستنکردنیان هەبوو لە هەر ولاّتێکی بە بازاڕی ئابووری، هەروەها حکوومەتەکانی ولاّتانی جیهانی سێیەم هەوڵی ئەوەیاندا دەوڵەت سەرکردایەتی پیشەسازی بکات، هەروەها خۆشیان تەرخان کردبوو بۆ ئاڕاستەکردن و تەحەکوم بە وەگەڕخستنکردن بکەن. حکوومەتە کۆمۆنیستەکان توانیشیان کرێکاری لادێکان ناچار بکەن بچن بۆ شار و کار بکەن لە کارگەکان.

بە هەقیقەت، سیستەمی پێشەنگی ئابووری کۆمۆنیست، یەکەم جار پێشکەوت لە لایەن یەکێتیی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٢٠ەکان، بە سادەیی توونـدترین ڕێچکەی شێوازی گشتی پیشەسازی بوون بوو کە تیایدا شۆڕشی پیشەسازی درەنگتر هاتە ولاّتێك کە چڕترین ڕۆڵی حکوومەت لە پەرەپێدانی دابوو، لە سەرووی هەمووییانەوە لە جولاّنی سەرمایە بۆ وەگەڕخستن. بێگومان، دەستی ڕێبەریکردنی دەوڵەت بە پێی پێویست بالاّ نەبوو بۆ دەستی نادیاری بازاڕ لە پەرەپێدانی قۆناغی بەرایی شۆڕشی پیشەسازی. لە ڕواڵەتدا، گەشەی ئابووری ڕووسیا ڕوون نییە تەنانەت خێراتر بوو لە ژێر ئەو سیستەمەی کە بۆلشیڤیك لە شوێنی خۆی دایناَ. ڕووسیای ئیمپراتۆر دانرابوو لە سەر ڕێگایەکی تەقلیدی تری پیشەسازی (هەرچەندە ئەوەی کە حکوومەتی ڕووسی ڕۆڵێکی کاریگەری گێڕا) پێش جەنگی جیهانی یەکەم. گەر بەردەوام بوا لە سەر ئەو ڕەوتە ڕەنگە زۆر بە خێرایی و زۆر بە تەواویش گەشەی کردبا، هەروەها نرخی گەشەدانەکەش بە خوێن دەدرا لە لایەن ڕووسییەکان و گەلەکانی تری یەکێتیی سۆڤیەت بە نزمتر دەبوون

بەلاّم گەر وەك زەروورەتێك بالاّ نەبێت بۆ بازاڕ، سیستەمی پێشەنگی ئابووری کاری کرد. یەکێتیی سۆڤیەت و ولاّتانی ئەوروپای ڕۆژهەلاّت کە تیایدا USSR دانرا لە ڕووی ئایدیۆلۆژییەوە لە حکومەتی چوون یەك پاش جەنگی جیهانی دووەم، هەروەها چین پاش ١٩٤٩ لە ژێر هاوکاری کۆمۆنیست ئابووری پیشەسازی دەستەبەرکرد. ژمارەیەکی زۆر لە خەڵك لە دەوروبەری شارەوە چوونە نێو شارەکان. حکوومەتەکان کارگەی پیشەسازی گەورە گەورەیان دروستکردو بوونە خاوەنی و هەڵیانسوڕاند.



ولاّتانی جیهانی سێیەمی پابەند بە دەوڵەت سەرکردایەتی پیشەسازی سوودی ئابووریشیان بەدەستهێنا، بە تایبەت لە پیشەسازی قورسدا. ڕێگەی گەشەی ساڵانەی ئابووری لە هیندستان پاش سەربەخۆیی لە سەدا ٣,٥ بوو. مەزندەی ئەمەش ئاستەم بوو، هەروەها لە بەرئەوەی دانیشتوانی هیندستان زۆر بوو، گەشەی داهاتی تاك نزم بوو، بەلاّم ئەو ڕێژەیە سەلماندنێك بوو لە سەر ڕێژەی مەزندە کراوی لە سەدا ١,٣ بۆ ماوەی حوکی ڕەسمی بەریتانیا لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە بۆ ناوەڕاستی بیستەم.

بەرهەمە سەرەکییەکانی قۆناغی بەرایی شۆڕشی پیشەسازی مولّکی کاپیتالّ بوون، کە خۆیان بەکاردەهێنران بۆ بەرهەم هاوردە تا بە کرپارە تاکەکان بفرۆشرێن. هەروەك کارل مارکس و فریدریك ئێنگلّ لە مانیفێستۆی کۆمۆنیستدا ئاماژەیان پێداوە، نووسراوە لە ١٨١٨، بۆرژوازییەکان سوودبەخش و پەرەپێدەری پیشەسازی بوون، هێزی بەرهەم هاوردەی گەورەتر و کۆمەلّ تر دروستکرد لەچاو هەموو نەوەکە بە یەکەوە. بێ یارمەتی هێزی سروشت بۆ مرۆڤ، مەکینەوانی، جێبەجێکردنی کیمیا بۆ پیشەسازی و کشتوکالّ، گەڕانی هەوایی دەریایی، هێلّی شەمەندەفەر، تێلێگرافی کارەبایی، پاککردنەوەی هەموو کیشوەرەکە بە کیلان، هەلّکەندنی ڕووبارەکان، هەموو دانیشتوان لە سەر خاك هەموارکران.

ئەمانە گۆڕانی گەورە و شایستە بوون، بەلاّم جیا بوون لە گۆڕانە کۆمەلاّیەتییەکانی ژیان کە ڕوویاندا بە هۆی قۆناغی داهاتووی شۆڕشی پیشەسازی. ئەو گۆڕانە یەك بە دوای یەکانە لەوانە نەبوون کە بەرهەم هاتبوون، هەروەها لە سەرووی هەمووشیانەوە لەوانەی کە خەلّك دەتوانن خاوەنی بن و خۆیان بەکاربهێنن. قۆناغی داهاتوو هات بۆ ژیانی مرۆڤ کە شتێك بوو مارکس و ئێنگیلّ نەژیان ببینن: ئەویش چاخی سەرفکردنێکی بە کۆمەلّ بوو. بۆ یەکەم جار خەلّك ژمارەیەکی زۆر ئەکسێسی بەدەستهێنا کە سەردەمانێك زۆر بەدەگمەن بەدەست دەهاتن یان هەر لە ئەسلّدا نەبوو، چونکە بوونیان نەبوو. سوودمەندە گەورەکانی ئەم قۆناغەی پێشکەوتنی ئابووری، ئەندامانی دانیشتوانی گشتی بوون. هەر ئەوان بوون کرپاری سەرەکی شتە بەرهەم هێنراوەکان بوون لە سەر پێوەرێکی گەورە.: خەلّکی وای لێ نەبوو کە سامانی زۆر بێت بیانکرێت.

لە ١٩٦٤ کۆمەلّناس دێڤید ڕایزمان کۆمەلّە وتارێکی بلاّوکردەوە لە سەر ژیانی ئەمریکا بە ناوی " زۆری و بۆری بۆ چی؟ ?Abundance for what، ناونیشانەکە کەس لە هیچ

کاتێك و لە هیچ شوێنێکی تر بیری لێ نەکردبۆوە. زۆری و بۆری شتی مادی هەرگیز وجودی نەبوو لە هیچ کۆمەڵگایەك و لە هیچ شوێنێك پێش سەدەی بیستەم، بەڵام لە ناوەڕاستی بیستەمدا، لە دەوڵەمەندترین وڵاتی ناوەوەی ڕۆژئاوا، هەروەها لە دەیەکانی دواتر لە وڵاتانی تری ناوەوە، زۆری و بۆری بوو بە واقیعێکی ڕۆژانە. خەرجی بە کۆمەڵ گرینگ بوو بۆ گەشەی ئابووری لە سەدەی بیستەم کەچی وانەبوو لە سەدەی نۆزدەهەم، هەروەها فەشەل سەرچاوەی درێژبوونەوەی سستە مەزنەکەی بازاڕ بوو لە سییەکان.

گرینگییەکەی بەقەد تێرمی ئابووری بوو، لە سەدەی بیستەمدا خەرجی بە کۆمەڵ گۆڕا بۆ گرینگییەکی سیاسی. شتێك بوو کە هەموو کەس لە هەموو شوێنێك حەزی دەکرد بەشداری بکات. مارکس بە ئایینی دەوت " حەشیشەی کۆمەڵەکان." پێی وابوو نهێنییە لێڵکەی خەڵکی وڵاتە کاپیتاڵیستەکانی وەرگەڕان و وای لێ کردن بە دوای سەربازی بکەون بۆ بەرژەوەندی ڕاستی خۆیان—نەهێشتن و زاڵبوون بەسەر کاپیتالیێزم. لە سەدەی بیستەمدا، حەشیشی کۆمەڵەکان کڕیار بەرهەمەکان بوون، شکست لە دروستکردنی دابینکردنێکی باش کە بۆی بەرەنگاری سیستەمە سیاسییەکان بوون کە بەناوی مارکسەوە دامەزرابوون.[*] زاراوەی ئابوورییناسەکان بەکاردێت بۆ کڕیارەکان، " شتی خزمەتگوزاری"، ئاشکرا دەبوو. کەل و پەل شتەکانی لە سەر ئاستێکی جیهانی دەخستەڕوو بۆ ئەوەی پۆوزەتیڤ بن و ڕەواجی هەبێت. خزمەتگوزارییەکان ئەوانە بوون کە ئامادەبوون، پێش سەدەی بیستەم، تەنها بۆ ئەوانەی دەوڵەمەند بوون یان تەواو ئیمتیازیان هەبوو بۆ دامەزراندنی خزمەتکار. لە سەدەی بیستەمدا شتەکان و خزمەتگوزارییەکان ئەوەبون خەڵکی ئەم وڵاتە چی دەوێت، سووربوون لە سەر

* دەکرێ دوورتر لەو هاوتەریبە ڕابمێنین. لە کۆمەڵگای تەقلیدی زۆربەی وێنە ئاشناکان، ئەوانەی کە زاڵ بوون وێنەی مرۆڤکرد، ئایینی بوون: کەنیسەکان، ئایکۆنەکان، کاری هونەری، وەسفکردنی دیمەنی ئیننەوە. لە جیهانی موشتەریدا ئەوەی کە بەرچاو بوو هەموو شتێك بوو تەنها بۆ بیرکەوتنەوەی بەرهەمەکان ئەویش ئیعلانکردن بوو. گۆرانیبێژی جۆن لێنۆن هەرکە شتێکی ناخۆشی نایەوە بە دووپاتکردنەوەی ئەوەی کە گروپەکەی، زە بیتڵس " the Beatles" زیاتر بەناوبانگتر بوو لە حیساب. لێدوانەکەی گومانی هەبوو هەتا لەو کاتەی کە کرا، بەڵام وێنەی وتنەکە، بوتڵێك کۆکا کۆلا بە هەمان شێوە ئاشنا بوو لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم وەك وەسفی کەسێکی ناوەندی مەسیحی.



بەدەستهاوردەی، هەروەرها داوایان وردە وردە زیادی دەکرد کە حکوومەتەکانینان یارمەتیان بدەن لە دەستبەرکردنیان.

خەرجی بە کۆمەڵ داهێنانێکی تری وڵاتانی ناوەوەی ڕۆژئاوا بوو. لێرەدا پێشەنگ ویلایەتە یەکگرتووەکان بوو و بەشدارییەکی بەرچاوی ئەمریکی بۆ شارستانییەتی مرۆیی هەستی پێکرا. وەك داهێنانەکانی تر، هەرکە دروست کرا و ڕوون بوو کە دەکرێ دروست بکرێت، کاریگەری خستنەڕووی خەرجی بەکۆمەڵ وا دەرکەوت کە بەهێز بێت. لەگەڵ گەشت و پەیوەندیکردن پێوەرەێکی زۆر بەرفراوان ڕەخسا لە سەدەی بیستەم، هەرکە بینیان بۆ خۆیان ویستیان.

ئەم پێشکەوتنە دەرەنجامی سیاسی هەبوو. لە وڵاتانی ناوەوەی ڕۆژئاوادا، هەڵبژاردنە نەتەوەییەکان زۆرجار لە سەر هەل و مەرجی ئابووری دەستیان پێ دەکرد. گەشە کاتەکانی ئێستای خواست، ئامادە نەبوون سوودی گەیاند بەوانەی بەرەنگکارکەرەوە بوون. کاتێ وڵاتانی ناوەوە چوونە نێو چاخی خەرجی بە کۆمەڵ گەلێ لە وڵاتانی دەرەوەی جیهان نەچووبوونە نێوەوە، توانایەکی گرینگی گەورەتری بەخشی بۆ پاراستن و پاڵپشتێك بۆ ئابوورییەك کە بتوانێت کڕیار پەیدا بکات و سڕە بگرن بۆ شتەکان. ئەو توانایە بوو بە تێستێکی شیاو نەك حیزبێکی سیاسی تایبەت، بەڵکو هی سیستەمێکی خۆی. چاکسازییە ئابوورییەکانی چین گەواهیدەری ئەم حاڵەتەن. حیزبی کۆمۆنیست دەستی هەڵگرت لە زۆربەی ئایدیۆلۆژییە ڕووکەشەکانی و زۆربەی کۆنترۆلی لە سەر کۆمەڵگای چینی تاوەکو پێشکەوتنی ئابووری دەستەبەر بکات کە چانسەکانی مانەوەی لە دەسەڵات، وای لێ هات باوەڕ بکات، وەستا بوو لە سەری. هەتا لە ڕۆڵدا زۆربەی تەختکران لەوەی کە لە لووتکەی (ماویستی) دابوو.

لە زۆربەی کاتەکانی چاخی مۆدێرندا، تێستی شەرعییەتی سیاسی توانای هەبوو بۆ پاراستنی سنوورەکانی سەروەری. لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا تێستێکی تر گەر گەورەتر نەبێت گرینگییەکی یەکسانی هەبوو: توانا یەك بوو بۆ پێشکەشکردنی شتەکان. ئەمە تێستێك بوو بە خراپی ئەنجامدرا لە لایەن وڵاتانی دەرەوە کە سەرکردایەتی کارگەی پیشەسازیشیان دەکرد، هەروەها لە سەر هەمان تێستدا سیستەمی ئابووری پێشەنگ جیهانی کۆمۆنیست خراپتر کرد. بەڵگە بۆ شکستی کۆمیونیزم کاریگەریەکی قوڵی هەبوو لە سەر سەرۆکی یەکەمی ڕووسیای دوای کۆمۆنیست، بۆریس یەڵتسن.

خاڵی وەرچەخان لە پێشکەوتنی ڕووناکبیرانەی یەڵتسن ڕوویدا لە کاتی یەکەم سەردانی بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان لە مانگی نۆی ١٩٨٩، تایبەتی تر یەکەم سەردانی بۆ سوپەرمارکێتێکی ئەمریکی لە هۆستن، تکساس. نیگای ڕەفە کەڵەکەبووەکانی یەك بە دوای یەك بەرێکی دانرابوون کە هەمووی پڕ بوو لە هەموو جۆرە خواردنێکی پێچراو و ئامادە بۆ نێو ماڵ، هەر جۆرەو دەلزەنێکی هەبوو، هەردووکیان یەڵتسنیان سەرسام و پەژارە کرد، بۆ یەڵتسن، وەك هەر یەك لە سەردانکەرە یەکەمین جارەکانی ڕووسی بۆ ئەمریکا، ئەم سەردانە سەرسام تر بوو لە سەرنجی گەشتێك بۆ پەیکەری ئازادی و یادگاری لینکۆڵن. بە وردی سەرنجڕاکێش بوو، چونکە لە بەر ئاساییەکەی... لە سەر تەیارەکە سەفەر لە هۆستنەوە بۆ مایامی، یەڵتسن واپێدەچوو ون بوو بێت لە نێو بیرەکانی بۆ ماوەیەکی درێژ. سەری خستبووە نێو هەردوو دەستی. لە کۆتاییدا شەکرێکی شکاند. " ئەوان دەبێ خەڵك شێت بکەن" وتی، ئێستا ڕوون و ئاشکرایە بۆچی زۆر زەحمەتە بۆ هاوڵاتییەکی ئاسایی سۆڤیەت بچێت بۆ دەرەوە. لەوە دەترسان کە چاوی خەڵکی بکرێتەوە."

هەتا لە یەکێتیی سۆڤیەتیشدا پێش سەردەمی گۆرباشۆڤ، وڵاتێك بە تەواوی بە بێ ئازادی سیاسی، فەرمانڕەواکان هەستیان بەو پێویستییە کرد بۆ دروستکردنی ڕێگەدان بە خۆزگەی ئەوانەی کە فەرمانڕەوایەی دەکەن. لە قۆناغەکانی دوایی وجودی عەقدێکی کۆمەڵایەتی نارەسمی و نهێنی هەبوو لە نێوان هەرتك، کە تیایدا دانیشتوان وازی لەوە هێنا بەشداری بانگەشەی سیاسی لە ئاڵوگۆڕدا بۆ بەرزکردنەوەی پێوەری ژیان بە بەردەوامی بکات. لە ساڵەکانی بەراییدا، سیستەمی پێشەنگی ئابووری میکانیزمێك بوو بۆ هەڵکردن بۆ ئەوەی بگەنەوە بە وڵاتانی ناوەوەی پێشکەوتوو لە بواری پیشەسازی و ئابووری، لە کۆتاییدا، بوو بە زۆری تر لە پشتییەوە کەڵەکە بوون. هۆی ئەوەی کە لە تێستەکەدا سەرنەکەوت تێستی پێکەشکردنی شتەکان، چونکە نەیانتوانی پێشکەشی بکەن. بە شێوەیەکی نائەنقەست داڕێژرا بوو بۆ شکست.

دەرچوون لە تێستەکە پێویستی بو گۆڕان هەبوو لە شێوازی پێشکەوتنی ئابوورییەوە، گەشەی ڕووکەشی یەکێك بۆ گەشەیەکی چڕو پڕی یەکێکی تر. هەوڵی یەکەم داهاتی زیادکرد بە هۆی زیادکردنی مایە، هەوڵی دووەم بە هۆی دروستکردنی بەکارهاوردەی زیاتر وجودی مایە. گەشەی شێوازی یەکەم بە سەرکردایەتی وەگەڕخستن بوو، دووەمیان ئەنجامدرا بە



پێشکەوتنەکانی بەرهەمهاوردە. پێشکەوتنەکان لە بەرهەمهاوردە بەشێکی گرینگی قۆناغی یەکەمی شۆڕشی پیشەسازی بوو، بەڵام بەدەستهێنران بە لانی کەم بە هۆی گۆڕانی کرێکار لە کشتوکاڵییەوە بۆ کەرتی پیشەسازی. لە قۆناغی داهاتوو، کە هەروەها قۆناغی بەرهەمهاوردە بوو بۆ خەرجی بە کۆمەڵ (فرۆشتنی بە کۆمەڵ) کە کرێکاری زیاتر هیچی تر نەبوو، چاکردنەکان لە بەرهەمهاوردە دەبوایە ڕووبدات لەگەڵ کەرتەکان، بەهۆی بەکارهاوردەی کاریگەرتری جۆگە بەردەوامی سەرچاوەکان بوون. ئەمە ئابووری پێشەنگ سەلماندی کە ناتوانێ ئەنجامی بات: جۆری بەرهەمهاوردە لە سەریدا گەشە لە سەدەی بیستەمدا پشتی پێ بەستا بوو لەو دیو ئەمانەدا بوو بۆ پێشکەشەکردن.

بەرهەمهاوردە لە ئابووری وڵاتانی ناوەوەی سەدەی بیستەم شتێك بوو زیا لە بەدەر گرینگ بوو، گەشە پشتی پێ بەستا بوو، بەڵام لێڵ و نادیاریش بوو. ئابووریناسەکان دەیانتوانی پێوەرەی بکەن، بەڵام نەیاندەزانی چۆن بیگشتێنن، بەڵام گەر ڕێگای ورد بۆ وەبەرهاوردەی چاکردن لە بەرهەمهاوردە نەناسراوبوو، ئەو بارودۆخانەی کە تیایدا چاکردنەکان بەخۆشی خۆیان ڕووبدەن، خاسیەتەکانی سیستەمی ئابووری بۆ ئەوان بوو، ئاشکرابوون. وەئەمانە وای لێ هات بوون بە خاسیەتی گرێدراو بۆ ئابووریی بازاڕ و ڕێگەپێدراو لە سیستەمی پێشەنگی ئابووریدا.

ململانێ لە نێوان کارگەکان گرینگ بوو بۆ بەرهەمهاوردە. فشار دەخاتە سەر پرۆژەیەك بۆ باشترکردنی، بەرهەمی کەمتر و گران کەمترین ڕکابەرەکانی تا دەرەوەی بازرگانی لێیدەخوڕن. ئابووری پێشەنگ بەدەر بوو لەو ململانێیە و ئەو پێوەرانەی دەرکرد کە بە هۆسەوە مللامنێی بازاڕ بەرپابوو ئەویش، قازانجکردن بوو. کارگەکان دەبێ ئۆتۆنۆمی بن تاوەکو ئازاد بن بۆ ئەزموون لەگەڵ ڕێگای جیا جیا ئەنجامدانی شتەکان، ئەمەیە چۆنیەتی دۆزینەوەی ڕێگای باشتر. لە سیستەمی ئابووریدا کارگەکان بە تەواوی کۆنترۆل کرابوون لە لایەن پلاندارێژەرانی حکوومەت و لە زۆربەی ئابووری وڵاتانی دەورەوی جیهان لە جەنگی ساردا، هیندستان بۆ نموونە، بە توندی پابەند بوو و بەشدار بوو لە لایەن نیزامەکانی حکوومەت ، بەڵام بۆ پەرەپێدانی سوود لە بەرهەمهاوردە خاوەنی تایبەت پێویستە، چونکە خاوەن هێزێکی چڕ دەبەخشێت بۆ دۆزینەوەی ڕێگاکان بۆ زیادکردنی قازانج: قازانجەکان کۆدەبێتەوە بۆ ئەوان. ئەو دەوڵەتانەی خاوەن پرۆژەن هیچ یەکێك وەستانێکی کارمەندی بۆ قازانج لە نمایشێکی باشتر و نەوەستان بۆ پاڵپشتی زیانێکی بەراورد، بۆ شتی کەسی لە یەکێکی خراپەوە.

سیستەمی بازاڕ دەتوانێت یەکێك لە بەهێزترین پاڵنەری مرۆڤ بخاتە نێو قایمەی خۆیەوە، درێژەپێدان بە بەرژەوەندی خود، لە داوای گەشەی ئابووریدا. لەم ڕووەوە ئابووری لیبراڵی کەمتری وڵاتانی دەرەوەی جیهان کەمتر سەرکەوتوو بوون، هەروەها ئابووری پێشەنگی جیهانی کۆمۆنیست بە تەواو ژێرکەوتوو بوون. ئەو دام و دەزگاو پراکتیزانەی پێویست بوون بۆ گەشەی ئابووری لە دوا بەشی سەدەی بیستەم نەك هەر تەنها لە دەستدرا بوون لە ئابووری دارێژراودا، بەڵکو دژی ئابووری و بەندەکانی سیاسی بوون کە سیاسەتەکان دەستەبەریان کردبوون.

هەروەك سیستەمی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی یەکی نەدەگرتەوە لەگەڵ پێداوایستییە بەراییەکانی شۆڕشی پیشەسازی، بەم شێوەیە کۆتایی سەدەی بیستەمی سیستەمی ئابووری کۆمۆنیست ئەوەی سەلماند کە یەك ناگرێتەوە لەگەڵ داواکارییەکانی قۆناغی داهاتوو. یەك بەدوای یەکیشدا ڕەتکرانەوەو بەلاوەنران. مارکس سوور بوو لە سەر ڕایەکەی خۆی. ئەوەی دووپات کردبۆوە کە کاپیتالیزم قۆناغێکی ئینتیقالی بوو لە نێوان کۆمەڵگای تەقلیدی و کۆمیونیزم. لە بری ئەمە، کۆمیونیزم ئەوەی سەلماند ببێتە وێستگەو ڕێگایەك لە نێوان کۆمەڵگا جووتیارییەکان کە تیایدا دەسەڵاتی گرتە دەست و کۆمەڵگای فرۆشتنی بە کۆمەڵ کە تەنها هەولی لیبراڵ بۆ هەڵسوڕاندنی ئابووری دەتوانێ دابینی بکات. لە وشەی گەشەسەندنی سروشتی، سیتستەمی بازاڕ خۆی سەلماند کە بەکاربرێ، لەکاتێکدا سیستەمی پێشەنگ (کەمتر کۆنترۆلی لاساییکەرانی کرد) هەرەسی هێنا لە گەیاندنی بەکاربردنی سەرەکی تێستەکە، موقابیل بۆ توانای گەشەسەندن بۆ بەرهەمهاوردە، کرپار زیاتر پەیدابوو. ئێستا سیستەمی کۆمۆنیستی و تەقلیدی کە بازاڕ شارییەوە جۆرە تۆڵەیەکی هاوچەرخی هەبوو پاش ئەوەی مرد.

### *بەرهەڵستکاری بازاڕ*

بۆ هەموو ئەوانەی بەدیهێنەری سامان بوون، بازاڕی ئازاد سومعەیەکی بەردەوامی ناسەلامەتی هەبوو، تایبەتمەندی مرۆڤی پێویست بۆ کردەی سەرکەوتووی بازاڕ بە دەگمەن بوو و بە بەرزی نرخێنرا، کەمترینیان لەو ڕێگایانەوە بوون کە هونەرمەندان وەسفی کۆمەڵگاکانی ڕۆژئاوایان کردووە.



لە سەردەمی دەرەبەگایەتی ئەوروپادا، لە سیستەمی کۆمەڵایەتی هیندستاندا، هەروەها لە چینی ئیمپراتۆردا، بازرگانەکان هەرگیز نەدەوەستان لە لووتکەی شاولی کۆمەڵایەتیدا. لە کاتی مۆدێرندا حیسابات و ڕێگەچارەی مامناوەند و سووربوون لە سەر بەرژەوەندی خود کە گرِ لە سیستەمەکە بەردەدەن زۆری دروستکرد زۆربەی کات زیاتر سەرزەنشتکراوە تا مەدح بکرێت. خودنەویستی زاراوەیەکە لە ڕازیبوون، بەڵام ئەنانییەت وانییە. ئێستا سیستەمی بازاڕ، کە بە ئاشکرایی پشت دەبەستێت بە ئەنانییەت، زیاتری کرد بۆ ئەوانەی دەژین لە کۆمەڵگاکان کە کاری پێ کرد تا سیستەمی پلاندانان، کە، بە ئاشکرا دەربڕینی خود نەویستانە بوو. ئەوەی کە مرۆڤی خۆش دەوێت مەدح بەدەست دیچنێت بۆ بەلاوەنانی پارە، نەك بۆ دروستکردنی پارە.

ئەدەبی مۆدێرن بە ڕەحم نەبووە بۆ مرۆڤ لە کاتێدا زیندەگییە ئیشکەرەکان لە شوێنی بازاڕدا سەرفکران. خاوەن و وەگەڕخەرەکانی بەلزاك کارەکتەری سەرنجڕاکێش نین، هەروەها ناودارترین بازرگانی ئەمریکی خەیاڵی بەشی یەکەمی سەدەی بیستەم، سینکلێر لویس بابیت ئیعلانێك نییە بۆ ژیانی بازرگانی.

یەك بەشداری سەرنجداری سەدەی بیستەم بۆ تێگەیشتن لە جوڵەکانی گەشەی ئابووری ڕۆڵێکی قارەمانانەی پێناس کرد لە بازاڕی مۆدێرنیتەو سەرهەڵدەدات. لە هەولی شیکردنەوەی ئەوەی چۆن ئەو داهێنانەی کە گەشەی ئابووری شیاو دەکات هات بۆ تێپەڕبوون، ئابووریناس جۆزێف شومپیتەر بەشێکی گرینگی ڕاسپارد بۆ تاك کە ئەو پێی وت ئەو بازرگانەی بە موخاتەرە پارە قازانج دەکات " Entrepreneur"، کەسێك کە ڕێگایەکی نوێی کارکردن دەخاتە ناو بازاڕەوە. ئەو بازرگانە سەرکردەیەکی قارەمانە، دژی سەیرەکانە، بە بێ ڕێبەری ئەوانەی پێشی، هەروەها لە موخاتەرەدا بۆ سامانەکەی پرۆژەیەك دروست دەکات کە نوێ و بیۆیێنەوە بە قازانجیشە.

ئەو بازرگانە، ئەو جێبەجێکەرەشی کە ئەو پرۆژەیەی بەڕێوەبرد کە بازرگانەکە دایمەزراند، جەماوەرێکی سەرنجڕاکێشی بینییەوە لە سەدەی بیستەم لە ویلایەتە یەکگرتووەکان. گالیسکەیەکی ڕوون بۆ ستایشکردنی چاکەکانی بەرژەوەندی هەرە گەورەی گشتی نەتەوە گۆڤارێکی هەفتانە، کات TIME بوو. بەتایبەتی لەکاتی دەیەکانی بیستەکان و پەنجاکان و نەوەدەکان کە پڕ بوون لە حەپەسان، کاپتنەکانی پیشەسازی بە ڕێکی تەغتییەی گۆڤارەکەی

شکۆمەند کرد، کە کاری کرد وەك بیلبۆردێکی نەتەوەیی بۆ هەفتەیەك، جۆرە ئاشکراییەکی گشتیی عادەتەن هەیە تەنها بۆ فیگەرەکانی نێو سیاسەت و رابواردن و وەرزش، بەڵام هەتا لە ویلایەتە یەکگرتووەکان، بازاڕ و ئەو کەسەی کە لە نێویدا کاردەکات لە سەر ئاستی جیهانی سەرنجڕاکێش نەبوو. لە وەسفدا شەفافییەتی سینەمایی جەرگەی سیستەمی دارایی ئەمریکا، جادەی دیواری ئۆلیڤەر ستۆن، فیگەرێکی مەرکەزی، گۆردۆن گێکۆ، ناوی لە جۆرە مارمێلکەیەك وەردەگرێت و کارەکەترێکی خشۆکیش دەخاتە ڕوو. ئەو سومعە تێکەڵەی کە بازرگانی و پیشەسازی پەیوەندی کرد بە وڵاتانی ناوەوەی ڕۆژئاوا هەتا کاتێ ئەو دوڵەمەندانەی کە پێشر خەونیان پێوە دەبینی بە زەحمەت بەربەستێکی کوشندە بۆ کۆکردنەوەی خەڵك بۆ نێو ئاستی خۆیان دەبڕی، بەڵام لە سەرەتادا لە سەدەی نۆزدەدا بەر ڕەخنەگرتن دەکەوت لەو دیو ئاڵۆزی ئیدیعاکراوی لە دانانی شێوازی نەخوازراو ی هەڵسوکەوتەوە، ئەمانەش سەرەنجامی سیاسی قوڵتریان هەبوو.

ئەو جۆرە ڕەخنانەش ئەوەبوو کە بازاڕ وا نەبوو ناکرێ وابێت، کاریگەرترین ڕێگای ڕێکخستنی چالاکی ئابووری. بازاڕ بە پێچەوانەوە بۆ ڕۆحی چاخی مۆدێرن و بۆ بیرۆکەی سەنتەری بەرهەم هاوردەی ئەوروپا بیری دەکرایەوە کە بووە هۆی زەمینە خۆشکردن بۆی: هێزی ڕوناکبیری مرۆڤ بۆ تیگەشتن و هەڵسوڕاندنی جیهان. لەم ڕووەوە، هەولێکی باشتر بۆ هەڵسوڕاندنی ئابووری تا پشت بە خۆراك و شتکڕین و پەناگە بە هەڕەمەکی و بێ هەماهەنگی ببەستێت، بەئاشکرا کارەکانی بازاڕی ئازاد هەڕەمەکی دەبێت.

بە هەقیقەت، بازاڕ بە هەڕەمەکی کار ناکات. وەك پلاندانانی سەنتەرە، سیستەمێکی تەنسیق کردنە، بەڵام کە یەکێك کاردەکات بە ڕێگەی نامەرکەزی بەردەوامی بەرژەوەندی خود لە سەر بنەمای یاسا ناشەخسییەکان تا لە ڕێگەیەوە بە شێوەیەکی هەڕەمەکی ئابووری پێشەنگی بەڕێوەبرد درا بە بەرپەرسەکانی حکوومەتەوە. سیستەمێکی لیبراڵی تەنسیقکردنە، بە پشت بەستن بە ئارەزووی تاك و موعامەلەی بە ئارەزوومەندانە لە ململانێی یاسای جیهان تا نالیبراڵێك کە تیایدا مەشقێکی کەمتری هەڕەمەکی هێز لە سەر گەلێك نەکات. ئادەم سمیس پێی دەڵێت " سیستەمی سەربەخۆیی سروشتی" و گۆڕان کە کاریگەر بێت لە پەرەپێدان گەشەی ئابووری. لە ئابووریدا کە بە قەد سەدەی بیستەم ئاڵۆز بوو، بڕێکی قەبەی زانیاری



پێویستە پەخش بکرێت، کاری کردە سەری، بەدەستهاوردە لە ڕێگای نامەرکەزییەوە زۆر زەحمەترە تا ڕێگایەکی مەرکەزی.

گوتنی ڕەخنەی بازاڕ تاوانی زیاتر کرد لە ڕووی ئابوورییەوە، گێژخواردنی بە ئازار هێنا پێش لە نێوان بەرزبوونەوە و داشکاندا. ئەم ڕەخنەیە بە باشی دۆزرابۆوە. لە دەیە زووەکانی سەدەی نۆزدەهەم ئابووری وڵاتانی ناوەوە لە تەختەوە بۆ تەلار بەرزکردەوە، کە تیایدا کەم دەبێتەوە لە بەرهەم هاوردە بازرگانی شکاند و خەڵکی لە کارەکانی خۆی بێ بەش کرد. خراپترینیان، لە سییەکان، زۆر توند بوو کە باوەڕی لە بازاڕ بە ڕێگای ڕۆژئاوا هەژاند. پلاندانانی سەنتەر گۆڕانی بەرهەم هێنا، چونکە واپێدەچوو بەتوانا بێت بۆ نەهێشتنی ئەو داشکاندنانە.

ئەوە دەسکەوتی جۆن ماینارد کینس بوو، کاریگەترین ئابووریناسی سەدەی بیستەم بوو، بۆ دۆزینەوی چۆنیەتی مامناوەندی، گەر هەڵنەوەشێنێتەوە، کاپیتالیزمی ڕۆژئاوا دێتە خوار. پێش کینس بازاڕ بە میکانیزمێکی خۆ ڕێکخەر دەرکی پێدەکرا، واتە داشکاندن ناکرێ قەدەغەبکرێت، بەڵام ئەوە لە کۆتاییدا خۆیان ڕاست دەکەنەوە. کینس بۆچوونێکی جیای لەم بارەیەوە هەبوو. ئەو ئابووریی بازاڕی وەك مەکینەیەك دەبینی کە بەکار دەکەوێت لە لایەن هێزی پاتری کە موشتەرییە. جار جار پاتریەکە شەحنی نامێنێت، مەکینەکە بەرەو عاتل بوون دەبات، ئەمە ئەوەبوو کە ڕوویدا لە سییەکان. مەکینەکە دەکرێ ریستارت بکرێتەوە بۆ هۆی شەحنکردنی پاترییەکە، کە سەرف دەکرێت لە لایەن حکوومەت دەکرێ بەدەست بێت. بەڕای کینس پیشەی ئابووری بوو بە خۆی. لەکۆتای سەدەی بیستەمدا، بوو بە بەردی بناغەی ژیانی ئابووری، دەسەڵاتەکەی بەوەی زانی، ئامۆژگارییەکانی و ئەندامانی کە تەواو گرێدراون بۆ نێو حوکی دەوڵەت مۆدێرنەکان.

وەك شۆڕشی پیشەسازی خۆی، هەروەها وەك هەولّی لیبراڵ بۆ پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان، ئاسایی گشتی، هەروەها هەولّی لیبراڵ بۆ سیستەمی سیاسی، دیموکراسی و دیراسەی میتۆدی لیبراڵی ڕێکخستنی ئابووری و بازاڕ، ئەسڵی خۆی هەبوو لە جیهانی ئەنگلۆ ئەمریکا. دامەزرێنەری ئابووری مۆدێرن فیگەرێکی ڕێبیەری سەدەی هەژدەم بوو، بەرهەم هاوردەی سکۆتلاند، ئادەم سمیس بوو. ئەو ئەوەبوو کە سامانی نەتەوەکانی " بڵاوکردەوە لە ١٧٧٦ کە وەسفی تەفاسیل کارەکانی بازاڕی تیایە. زۆربەی جێگرەوە دیارەکانی، کینس پێشەنگی

هەموویان بو لە نێویاندا، یان ئەمریکی یان بەریتانی بوو بە لە دایکبوون، مەشق پێکردن یان دانیشتن، یان هەرسێکیان. هەموو ئابوورییە نیوکلاسیکەکان وانە نامارکسییەکان لە ئادەم سمیسەوە مایەوە لەو ڕووەوە کە هەموو نیوکلاسیکە ئابووریناسەکان لە کاتی خۆیدا وەك ڕێگای تەنسیقکردنی چالاکی ئابووری وابوون.

لە ئابووری سەدەی بیستەمەوە مەیدانێکی دانیشتن و پراکتیز خەڵاتی نۆبڵی پێ بەخشرا سەری هەڵدا: ئەویش دەرمانە. هەردووکیان زانستی جێبەجێکردن بوون تەرخانکرابوون بۆ بەهێزکردنی ئامێرە مرۆییەکان. هەردووکیان پێش سەرهەڵدانیان بە هۆی ئەزموونی لە ڕێگای دادگایی و هەڵە، هەردووکیان زۆر گرینگتر بوون لە کۆتای سەدەکە تا سەرەتای سەدەکە. ئابووریناسەکان، وەك جێبەجێکەرە پزیشکییەکان، زۆرتریان دەزانی، دەیانزانی چرکە بە چرکە چی دەکەن. هەردووکیان پشتیان بەستا بە پێوەرێکی تەواو. زانیاری زیاتر هەردووکیانی بەسوودتر کرد. خەڵك دەوڵەمەنتر بوون لە ژیان لە ١٩٠٠ تا ٢٠٠٠، ئەمەش لە بەر پێشکەوتن لە ئابووری و دەرمان و پزیشکیدا.

دۆزینەوەی زانستی پزیشکی و ئابووری، وێڕای ئەمە، لە سەر ئاستی جیهانییەوە عەمەلی بوون. هیچ دوو لاشەیەکی مرۆڤ چوون یەك نین، بێگومان، هەروەها چارەسەرکردنی هەمان نەخۆشی لە حاڵەتێکەوە تا حاڵەتێکی تر جیایە، بەڵام هەندێ بنەمای پزیشکی بنەڕەتی بۆ هەموو کەسێك ڕاستن. بە هەمان شێوە، کاتێ ئابووری نەتەوەیی لە ڕێگای فراوانەوە جیا دەبێت، هەندێ بنەما ئابووری پەیوەستە بە هەموویانەوە. لە هەمووی گرینگتر بنەماکانی گەشەسەندنە. لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا، سەرژمێرییەك هەبوو لە نێوان ئابووریناسەکان لە سەر ئەوەی چی پێویستە بۆ گەشەی ئابووری لە هەر شوێنێك: بازاڕێکی لیبراڵ و بەهێز دەوڵەت خاوەنییەتی کە مافی موڵکایەتی دەپارێزێت و هانی وەگەڕخستن دەدات، ئازادی بۆ کارگە و کۆمپانیاکان بۆ چوونە ژوورەوەو پێشبڕکێ لە بازاڕ، کراوەیی بۆ بازرگانی لەگەڵ وەگەڕخستن و لە تەواوی دیکەی جیهان، دەنگی پارەو سیاسەتی ئابووری لەگەڵ کەم و کورِی گونجاو و کەمی بەرزبوونەوەی نرخ، هەروەها پێوەرەکان بۆ بەهێزکردنی تەندروستی و ئاستەکانی پەروەردەی دانیشتوان.

ئەمە مانای ئەوەبوو کە گەشەی خێرای ئابووری ئاسیای ڕۆژهەڵات لە دواهەمین سێ دەیەی سەدەی بیستەمدا سەرەنجامی فۆرمێکی تاکی مەحەلی هەڵسوڕاندنی سیاسی نەبوو، بەڵکو



سەرنجێکی بە ئەسپایی بۆ ئوسوڵەیەکان، بەتایبەتی وەگەڕخستن هاوکاری مادی دەکرا لە لایەن ڕێژەی بەرزی خەزنکردنەوە. هەروەها ئەوەشی دەگەیاند کە ئەفریقیا هەژار نەبوو بۆ هەر هۆیەکی ناشازی ئەفریقی، بەڵکو لەبەرئەوەی وڵاتانی هەرێمەکە پراکتیزەو دامو دەزگایان لە شوێنی خۆیان دانە نابوو کە ئەوانی لە هەژاری و دەردەنا. وڵاتە هەژارەکان هیچ پێویستیان نەبوو بۆ داهێنانی مەکینە و تەکتەلۆژیای بەرهەم هاوردەی پیشەسازی، کە ناسراون و بەرفراوانی هەبوو. دەبوایە بە سادەیی ئەو هەلومەرجانە دروست بکەن کە تیایدا ئەمانە بە کاریگەری دەبوایە سوودی لێ وەربگیرێت.

هەرچەند، هاوکێشەیەکی سیحری نەبوو، هاوکێشەیەك کە هەموو وڵاتێك بە ئاسانی دەکرێ بەکار ببرێت. گەر وابوایە، بۆشایی نێوان وڵاتە هەرە دەوڵەمەندو هەرە هەژارەکان بەرێکی تەسك دەبۆوە لە ساڵانەی کە بە دوای کۆتایی جەنگی ساردا هات، لەگەڵ کەمترین سامانی، بە ڕێك خێرایی، ئەو ڕێڕەوەی کە سەرکردەکان، بە کۆششێکی زیاتر، گرِی گرتبوو. لە برِی ئەمە، بۆشاییەکی فراواتر بوو، چونکە هەردوو دوو سەد وڵاتە کۆنە خاوەن سەروەرییەکەی سیستەمی نێو دوڵەتی بە زۆری هەمەجۆر نەبوو لە توانای خۆیان بۆ دانانی لە شوێنی خۆی هەلومەرج بۆ گەشەی ئابووری. فەشەل بۆ بەجێهاوردەی ئەمەش، لە ئەفریقیا و هەر شوێنێکی تر، ڕەگی خۆی هەبوو لە مێژووی مەحەلیدا، کەلتوور، سیاسەتەکان، هەروەها لێرە ئابوورییەکان زۆر بە دەرمان نەدەچوو وەك تەندروستی گشتی.

نەهێشتنی شێرپەنجە، کە هیچ عیلاجێك نەزانرا لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا، پشتی بەستا بە پێشکەوتن لە سنوورەکانی زانستی پزیشکی. نەهێشتنی کۆلێرا، بە پێچەوانەوە، کە بەرگریکەرێك هەبوو، بەڵام کارکردنیشی لە هەندێ وڵاتی هەژار هەر هەبوو، ئەمە کە کێشەیەکی تەندروستی گشتی بوو. ئەوەی نەقوسان بوو لە حاڵەتی کۆلێرا تێگەیشتنێکی زانستی نەبوو لە نەخۆشییەکە، بەڵکو زیاتر توانای ئیداری و دواتریش سیاسی بوو بۆ بگەڕخستنی ئەو پێوەرانەی کە بەدوای تێگەشیتنی زانستی دەکەوتن.

بۆ فراوانکردنی هاتنە نێو ژیانەوە لە وڵاتە دەوڵەمەندەکان، بۆ وەرگرتنی نموونەیەکی تر، لە حەوتا و پێنج تا سەد ساڵ کێشەیەکی زانستییە، بۆ فراوانکردنی لە پەنجاوە بۆ حەوتا و پێنج لە وڵاتە هەژارەکان کێشەیەکی سیاسی بوو. بەهەمان شێوە، بۆ بەرزکردنەوەی ڕێژەی مەودا زۆری گەشەی ئابووری، کێشەیەکە لە توێژینەوەکن لە مەڕ ئابووری ئەنجام دەدرێت، برێکی

گەرەکە لەڕێگای تێگەشتنی سروشتی بەرهەمهاوردەکە. گەشەی هێواش لە وڵاتە هەژارەکان کێشەیەکی سیاسەیە، داوا بۆ ڕێگە چارەی بە توانا و ئیرادەی سیاسی بۆ دروستکردنی مەرجەکان زانراو بۆ شیانی دروستکردنی پێشکەوتنی ئابووری.

لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا، ئابووریناسەکان باوەڕیان بە بازاڕ نەدەکرد، ئامێری ناسراو بۆ نەوەی زۆربوونی مەواد هەرچەند هەبوو، دەیتوانی هەموو ئەو وەزیفانە بکات کە ئابووری پێویستییەتی. بە پێچەوانەوە، یەکێك لە بابەتە سەرەکییەکانی توێژینەوەی ئابووری بۆچی و چۆن بازاڕیش فەشەل دێنێت. ئەوە هەرەسی بازاڕ بوو کاتێ بەدواکەوتنی بەرژەوەندی تاك نەبێت هۆی سەرەنجامی ئیختیاری، کە پێویستی بۆ پێداویستی گشتی دروستدەکات، بەشێکی توێژینەوەی ئابووری بڕیاردانە لە سەر ئەوەی بازاڕ دەتوانێ چی بکات و چی نەکات باشترین بۆ قەرەبوو بوونەوەی بەخشیشەکانیانە. لە چاخی مۆدێرندا بەرەنگاری بەردەوام بۆ سیستەمی بازاڕ، بەرەنگارییەك کە بەدیلی بنەڕەتی خێرا کرد لە سەدەی نۆزدەدا مۆدیلی کاپیتالیزمی پیشەسازی بوو، لە هەرەسی بازاڕەوە هات، بەڵام لە سەرکەوتنەکەشی هات. لە ڕووی مێژووییەوە، هەڕەشەی سەرەکی بۆ توانای سیاسی سیستەمی ئابووری لیبراڵ ئەوەیە کە نەیتوانی هیچ بکات، بەڵام زۆر بە باشی کاری خۆی کرد.

### *کێشەکانی چۆنیەتی سەرکەوتن*

کارەکانی بازاڕ هەراسان بوو لە شۆڕشی پیشەسازی بۆ گوزەرانی بە ملیۆن خەڵك. بازاڕ ئازار و زیانێکی جەستەیی و روحی لە سەر ئەو پێوەرەی کە پێش چاخی مۆدێرن هەتا جەنگەکایش بەدەگمەن کردیان وەبەرهێنا. مارکس و ئێنگل بە تایبەتی ڕەوان بوون لە سەر بێشوێنی سایکۆلۆژی.

بۆرژوازییەکان... کۆتایی بە هەموو دەرەبەگایەتی و پیاو سالاری بەهۆی پەیوەندی هێمن و بەئاشتی هێنا. بێ بەزەییانە پەیوەندییە پتەوەکانی دەرەبەگایەتی تێکشکاند کە پەیوەستی دەکات بە سەرووی سروشتەوە، هەروەها هیچ شتێکی تری لە نێوان پیاو تا بەرژەوەندی خودی بە پارەدانی ڕاستەوخۆ نەدەکرد. خولیا هەرە قورسەکانی شعوری ئایینی خنکاند، خولیای سوارچاکێکی پەرۆشی، بووە هۆی هەست، لە ئاوێکی بەفراوی چیایی سەختەوە. چارەنووسی



کەس بۆ نێو ئالوگۆری بەهادار بوو، لە شوێنی بێ شوماری ئازاد، ئەو ئازادییە تاکەی بێ هاوتایەی بازاڕی ئازادی دروستکرد.

لە کۆمەڵگای تەقلیدیدا، خەڵك هەمان ژیانی پەیڕەو کرد، لە هەمان شوێندا، هەروەك باوانی باپیرانی بەسەریانبرد. لە کۆمەڵگای مۆدێرندا کە شۆڕشی پیشەسازی دروستکرد، جیهان بۆ نەوەکانی تر نوێ دەبۆوە. ئەمە هەوڵی باشتربوونی بۆ درا، بێگومان گەلێ خەوشی نائاشناش بەرهەم دێنێت. ژیان لە کۆمەڵگای تەقلیدیدا پرۆسەیەی دووبارەبوونەوە بووە، لە کۆمەڵگای مۆدێرندا یەکێك لە بەرکارهاوردە بووە. کۆچکەرێك لە دەوروبەری شارێکی تەقلیدییەوە بۆ شارێکی مۆدێرندا جولا لە ئاسایشەوە بۆ نائاسایش، کە بووە هۆی دروستبوونی نارێکی و نامورتاحی. بەڕێکەوت نەبوو کە یەکێك لە داهێنانە پزیشکییەکانی چاخی مۆدێرن، کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا لەدایك بوو لە سەدەی بیستەمیشدا بە خێرایی گەشەی کرد، لە ڕووی جەستەییەوە، هەروەها یەکێك لە بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکانی ئیعلانکردنی نیگەرانی بوو.

ژیانی پیشەسازی تۆڵەیەکی جەستەیی هەبوو. سەرقاڵ بوون بە پاڵکەوتن، کارکردن بە جدی لە کان و کارگە ناسەلامەتەکانەوە، کرێکارن نێچیر بوون بۆ نەخۆشییەکان و ڕووداوەکان کە جووتیارە بەسەنگەکانی نەدەبوایە دژ بێت. لە سەدەی نۆزدەدا هەژاری شارستانی خراپتر نەبوو لە کەموکوڕی کرۆنیکی ژیان و تاعونی بەڕێکەوتی کۆمەڵگای لادێی تەقلیدی، بەڵام دیارترو بە ئازارتر بوو، چونکە خراپتری کرد لە ڕوانگەو گەیشتنی سەرهەڵدانی کاریگەری کە گەشەی ئابووری بەرهەمی هێنا. لە هەژاری کۆمەڵگای تەقلیدیا گروپێکی نەهێڵراو سروشتی زۆرینە بوو. لە کۆمەڵگای مۆدێرندا خەڵکی خولیا و چاوەڕیی شتێکی باشتریان دەکرد. کولفەکانی ژیانی شارستانی مۆدێرن سەرنج درا، وەرگیرا، لە ئەدەبدا. لە شۆڕشی پیشەسازیدا ڕۆمانی ڕیالیزمی سەدەی نۆزدەی هێنا کایەوە، لەگەڵ بابەتە سەرەکییە لوغزەکەی (هەندێ جار) هی نارەزایی کۆمەڵایەتی، هەروەك پراکتیزکرا لە لایەن نووسەرەکانی وەك چارلس دیکنس لە ئینگلتەرا، تیۆدۆر درێیسەر لە ویلایەتە یەکگرتووەکان، هەروەها ئێیلی زۆلا لە فەرەنسا. بە گشتی، تێکەڵی بازاڕ و شۆڕشی پیشەسازی لە ئامێری مرۆیی زیادی کرد، هیچ کامیان پاڵپشتسان لێ نەکرا بۆ ماوەی دوو سەدە دواتر، بەڵام پێشکەوتن لە بەرژەوەندی باشتر بوون بە نرخێکدا هات. ئەمە دەبوایە وا بێت.

سشومپیتەر ناوی لە گەشەی ئابووری نا : پرۆسەیەکی داهێنەرانەی تێکشکاندن. بە پێی سروشتی خۆی، گەشەی ئابووری لە دروستکردن و تێکشکانەوە دێتە کایەوە، یا لە ڕێگەی تێکشکانەوە دروست دەبێت. گەشەی ئابووری بە شێوەیەکی سەرەکی پشتی بە بە زۆربوونی بەرهەمهاوردە بەست. بەرهەم هاوردە ئەنجامدانی شتی هەمەجۆری تێوەگلاند: دروستکردنی شتی نوێ، یان دروستکردنی شتی نوێ لە کۆن، یان هەمان شت بە هەمان ڕێگا، بەڵام لە لایەن خەڵکی جیاواز لە شوێنە نوێیەکاندا دروست بکرێت. کرۆکی بەرهەمهاوردە گۆڕانە،گۆڕانیش هەمیشە ئاستەمە و بە ئازارە. ئەنجامدانی گۆڕان کارێگی ئاستەمە، ئەوانەی ناتوانن بیکەن باجی خۆیان دەدەن.

ئەو میکانیزمەی کە لێیەوە بازاڕ گەشە بەرهەم دێنێت باسکراوە لە چیرۆکێك کە لە بەشی بەراییدا دەقەکە خەسڵەتێکی ئابووری ستاندارد وەردەگرێت. گەر پۆڵا بە نرخێکی هەرزانتر لە هەر شوێنێکی تر دروست بکرێت، لە ژێر مەرجەکانی بازاڕی ئازادا کرێکارانی پۆڵای مەحەلی کاری خۆیان لەدەست دەدەن. کرێکار و کاپیتال ئازاد دەبن و بەڕەڵا دەبن تاوەکو بتوانن کاری باشتر هەوڵ بدەن و قازانجتر و باشتر بکەن.. لە تیۆردا، کرێکارێکی نوێ و دانەمەزراوی کارگەیەکی پۆڵا دێنێتە بەرچاوی خۆی، گۆڕان لە جلە قورسەکانییەوە بۆ جلێکی مورتاحتر، پیاسە کردن لە نێو جادەکان بەرەو ئۆفیسێکی تازە دروستکراو و کارێکی وەك بەرنامەدانەری کۆمپیۆتەر دەکات. لە هەندێ ئاستدا، چیرۆکەکە بەم شێوەیە ڕاستە، هەروەها کۆتاییەکی دڵخۆشیشی هەیە. لە ژێر فشاری بازاڕدا، کارگەی پۆڵا کەم دەبنەوە و دانانی دەزگای بەرنامەی کۆمپیۆتەری فراوانتر دەبێت، بە دروستبوونی هەردووکیان نرخی پۆڵا و دانانی بەرنامە لە هەموو شوێنێك بۆ کڕیارەکان کەم دەبێتەوە. گوزرە کردن بەم شێوەیە بۆ کۆمەڵگا باشترە و لە قازانجی کڕیارەکانیشە.

بەڵام لە ڕێگەی ئەم چیرۆکە دڵخۆشکەرە گرێیەکی لاوەکی دڵسارد هەیە. کرێکارانی دانەمەزراوی پۆڵا دۆڕاون. گەر هەندێکیان دووبارە دامەزرێنەوە وك بەرنامەداری کۆمپیۆتەر، گەلێکیان هەندێ کار دەکەن بە پارەیەکی کەمتر لەوەی لە کارەکەی پێشوویان وەریان دەگرت، هەروەها هەندێکیان هیچ کارێك نادۆزنەوە. لە لادێدا، کۆمەڵگای تەقلیدی هەموو کەسێك دارێکی لە سەر بەردێك دادەنا بۆ ئەوەی ژیانی خۆی بباتە سەر لە سەر ئەم زەوییە. دانەمەزراندن واقیعێکی چاخی مۆدێرنە. بە هەمان شێوەش هەژاری لە هەموو واقیعەکان





گەورەترە. لە لادێدا، لە کۆمەڵگای تەقلیدیدا لە بەر زۆری کارکردن بۆ بژێوی خێزانەکانیان خەڵکێکی زۆر بۆ ماوەیەکی کەم دەژیان. پێشکەوتنی پزیشکی بووە هۆی دابینکردنی ژیانێکی درێژتر و کرێکاری لە کارگەکان تێکشکا، لە سەدەی نۆزدەدا، ژمارەیەکی زۆری خەڵك نەیانتوانی بەردەوام هاوکاری خۆیان بکەن لەبەرئەوەی تۆڕێکی خێزانی چڕیان نەقوسان بوو کە هاوکاری ئەوانی دەکرد لە ژیانی تەقلیدیدا.

خەرجییە کۆمەڵایەتییەکانی شۆڕشی پیشەسازی ناچاری قەرەبووی بێکارەکان بکاتەوە کە ئەم خەرجییە، لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا، فۆرمێکی سیاسی وەرگرت. ئەم فۆرمەش ناوی بزوتنەوەیەکی سیاسی وەرگرت و لە ڕێگەی ئامانجەکانییەوە خۆی لە قالبی سۆشیالیزم دەدا. لە سەدەی بیستەمدا، سۆشیالیزم بووە دوو بەرە. باڵی مارکس و لینین دەسەڵاتی گرتە دەست لە ئیمپڕاتۆری قەیسەری پێشوو، بزووتنەوەی کۆمۆنیستی نێودەوڵەتی دروستکرد کە کۆنترۆڵی گرتە دەست لە ئەوروپای نێوەڕاست، هەروەها هەڵگری ئالای نالیبراڵیزم لە ململانێی لەگەڵ ڕۆژئاوای لیبراڵدا لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا بوو.

لە وڵاتانی ناوەوەی ڕۆژئاوادا، بزووتنەوە سۆشیالیستەکان بە گشتی وەك دیموکراسیەتێکی سیاسی بێ قسە قسە قبوڵ کراو و هەروەها پێشەنگی ئابووری لە بازاڕ پەسەند کرد. نیازیان وابوو، بە مانای دیموکراتی، کاریگەرە تێکشکێنەرکانی بازاڕ بگونجێنن. سۆشیال دیموکراتی ئەوروپییەکان سەرنج ڕاکێش بوون، لە زۆربەی کاتەکانی سەدەی بیستەم، لە گێڕانی ڕۆلێکی فراوان بۆ حکوومەت بۆ وەگەڕخستنکردن، بەڵام پلانەدانان لە بەرهەمهاوردەدا، لە ڕێگای خاوەنێتی دەوڵەتەوە بوو. ئەم پەرۆشیە مرد لە دوا دەیەکانی سەدەکە، بەڵام بەرژەوەندی سەرەکی سۆشیال دیموکرات، کە کە پێکەوە هاوبەش بوون لەگەڵ هێزە سیاسەکان لە ئەمریکای باکوور، ئەوەبوو بۆ بێهێزکردنی ڕۆلی دەوڵەت لەو بەشەی کە کۆمەڵگا بەرهەمی دێنا بە ڕێگایەك کە ئاسانکردنی سەرەنجامی شارستانیەتی پیشەسازی توونده. ئالێرەدا، لقی ڕۆژئاوایی بزووتنەوەی سۆشیالیست سەرکەوت. دەوڵەتێکی خۆش گوزەری دروستکرد.

فشاری سیاسی هانی دروستکردنی دەوڵەتێکی خۆشگوزەرانی دا. ئەو هێزانەی داوای پاراستنی حکوومەت دەکەن لە سەدمەکانی شۆڕشی پیشەسازی و پێشکەوتن لە هێزدا لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا بۆ ناوەڕاستی سەدەی بیستەم، زاڵبوونی بەسەر بەرگەگرتنی پارتیزانەکانی سیاسەتی سنوورداری ڕێگەی دا بە بازرگانی تایبەت بۆ پیشکەوتن بە بێ

کۆنترۆڵی حکوومەت. هەروەك پاڵپشتی گەشەیان کرد لە هێزدا (هەروەها سوودەکانی لە ژمارەدا زیادی کرد)، دەوڵەتی خۆشگوزەر لە مەودادا فراوانبوو، لە دابینکردنی تەقاعودانەی خەڵکی بە تەمەنەوە بۆ زەمانەتی بێکاری و چاودێری تەندروستی. لەگەڵ هەر پۆلێنێکدا لە نێو وڵاتانی ناوەوەی ڕۆژهەڵات، ئەو خزمەتگوزاریانەی بۆ هاوڵاتیان دابین دەکران حیساب کرا لە سەریان، ئەو برە پارەیەی کە حکوومەت لە سەریان سەرفی دەکات، کاتێکیش ئەمانە لە زیادبووندا بوو، گەیشتنە ئەو قەناعەتەی کە هاوڵاتی پێویستە باج بدات.

دەوڵەتی خۆش گوزەر هاتە بوون و فراوان بوو نەك تەنها لە بەر پاڵپشتکەرانی کە زۆر بەهێزبوون، بەڵکو لەبەر گەشەی شەرعییەتی ئایدیاکەشی بوو کە کۆمەڵگا هەندێ لە فۆرمەکانی پاراستنی کۆمەڵایەتی قەرزداری ئەندامانی خۆی بوو. لە پاڵ ئایدیاکە سێ دەمەتەقێی تر هەبوو. یەکێکیان ئەوەبو کە قوربانییەکانی شۆڕشی پیشەسازی شایەنی هاوکاری بوون. ئەوان قوربانیانی ململانێییەك بوون کە سوودێکی زۆری بەو کۆمەڵگایانە گەیاند کە ئەو شۆڕشەیان بەرپاکرد. پێشکەوتنی ئابووری وەك جەنگێك بوو کە بەرپاکردنی شایەن بوو و بەسەرکەوتوویی کۆتایی هات، بەڵام ئەو جەنگەش خەڵکی زامدار کرد کە قەرزداری قەرەبوونەوە بوون بۆ قوربانی و زیانەکانیان.

یەکێکی تر ئەوەبوو کە ئەو قەرەبوونەوەیە بۆ موخاتەرەکانی شۆڕشی پیشەسازی پێویست بوو بۆ قایلکردنی خەڵك تا بەشداری بکەن تیایدا لە یەکەم شوێندا. دەوڵەتی خۆش گوزەرە "تۆڕێکی سەلامەتی کۆمەڵایەتی" دابینکرد، کە چەمکێکە پێشنیاری ئەوە دەکات کە بەشداریکردن لە ئابووری مۆدێرن وەك ئەوە وایە کە لە سەر وایەرێکی بەرز بڕۆی: هیچ کەسێکی ماقوڵ هەوڵی ئەوە نادات و نایجەڕبێنێت، هیچ کەسێکیش تەواو متمانەی بەخۆی نییە بەسەرکەوتوویی بەسەر ئەو وایەرە دا بڕوات، بە بێ زانینی ئەوەی کە کۆمەڵگا شتێك دابین دەکات نابێ هەوڵ بدەیت ئەگینا تووشی شکست دەبێتەوە. سێیەم پاڵنەر بۆ بەرهەمهاوردەی داواکان بۆ خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی ترس بوو: بە بێ هەندێ پاراستن لە خەرجییەکانی سیستەمی بازاڕ، ئەوانەی کە سوودیان لێوە بینی هەقی خۆیان بوو نیگەران بن، قوربانییەکانی و قوربانییە بەهێزەکان زیادیان دەکردو ئەو قازانجەیان نەهێشت. تموحەکان و پاش ساڵی ١٩١٧ دا، دەسکەوتەکانی باڵی شۆڕگێڕی سۆشیالیزم وەك هێزێکی هاندەر کاری کرد بۆ چینە خاوەندارەکان بۆ تێپەڕکردنی داواکان بۆ باڵی دیموکراسیانەی خۆی. ئەمە ڕێگایەك



بوو بۆ کڕینی ئاشتی ناوەخۆ و سەقامگیری کە بە بێ ئەم دووانە بازاڕی ئازاد هیچ کارێکی بۆ نامێنێتەوە و پێشی ناکرێت، هەروەها ئەمە بە ڕێکەوت نەبوو کە خەرجییەکی کۆمەڵایەتی بێ شومار ڕویدا لە ڕۆژئاوا لە دوای ١٩٤٥. لە سەرەتای سستە مەزنەکەی بازاڕ تا کۆتایی جەنگی جیهانی دووەم هەموو وڵاتانی ناوەوەی ڕۆژئاوا بە هۆی ململانێی کۆمەڵایەتییەوە گرێدرابوون، کە ئەمەشی خراپتری کرد، گەر هەمیشە دروستی نەکردبێت، بە هۆی فشاری ئابووری. لە زۆر حاڵەتدا ململانێکە لە لێواری شەڕی ناوخۆدا نزیك بۆوە، هەروەها لە هەندێ حاڵەتیشدا پێیدا تێپەڕی.

گەشەی دەوڵەتی خۆشگوزەر بە شێوەیەکی بەرچاو مۆدێلی لیبراڵیزمی ئابووری سەدەی نۆزدەهەمی تەعدیل کرد. لە دەیە سەرەتاکانی شۆڕشی پیشەسازی ئۆرتۆدۆکسی لیبراڵ ئەوەی کرد کە ڕۆڵی ئابووری دیاری حکوومەت کەمترین شت بوو. ئایدیاڵ " دەوڵەتی پاسەوانی بە شەوان" بوو، لەگەڵ پاسەوانی حکوومەت لە بەردەم کارگەکاندا دەوەستان بۆ نەهێشتنی دزیکردن، بەڵام هیچی ئەوەشی ڕوون نەکردنەوە بۆ کردنی ئەم کارە لەگەڵ بەگەڕخستنی کارگە. لە سەدەی نۆزدەدا، لە وڵاتانی ناوەوەی ڕۆژئاوا، دەوڵەت پێویستی بە ڕۆڵێکی گەورەتر بوو لە بەڕێوەبردنی بەرهەمەکانی گەشەی ئابووری، ڕۆڵێك کە ئادەم سمیس هەرگیز بۆی نەچووبوو هەروەها زۆربەی هێزە سیاسییە بەتواناکانی سەدەی نۆزدەهەم دژی وەستانەوە.

سەرهەڵدانی دەوڵەتی خۆشگوزەر هەردوو پێگەی لیبراڵیزمی سیاسی ئاشتەوەر کرد، بەشداری گشتی دانیشتوان و دەستوورنووسین، کە لە سەدەی نۆزدەدا ئەم دووانە لەگەڵ یەکتر بە سەیری سەیر دەکران. دەوڵەتی خۆشگوزەر سەروەری گشتی دروستکرد لە ڕێگای ئازاری گەردوون کە یەکی دەگرتەوە لەگەڵ پاراستنی موڵکی تایبەت بە هۆی زەوی دان بە هەر هاوڵاتییەك لەو قاڵبەی کە ئەو هاوڵاتییە دەبێ سوود لە دەوڵەت وەربگرێت. دەوڵەتی لیبراڵی سەدەی بیستەم پاراستنی کۆمەڵایەتی هەژارانی مسۆگەرکرد هەروەك مسۆگەری بازرگانی دەوڵەمەندانی کرد، بۆیە بەخشینی هاوکارییەك بە گروپی یەکەم (هەژاران) هەروەك هی دووەم (دەوڵەمەندان)درێژەپێدانی پاراستنی هەردووکیانە.

بۆ ماوەی سەد ساڵ، بە دەست پێکردن لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەوە، پرسیاری ناوەڕۆکی سیاسەتەکانی وڵاتانی ناوەوی لیبراڵی ڕۆژئاوا ئەوەبوو ئایا دەوڵەت دەبێ قەرەبووی خەڵك

بداتەوە لە هەمبەر ئاوارەبوونیان و زامداربوونیان بە هۆی شۆڕشی پیشەسازییەوە. لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمیشدا مشتومڕێکی تر چارەسەر کرا. بۆ نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم، سیاسەتە ناوخۆییەکانی وڵاتانی ناوەوەی جیهان پەیوەست بوون بە سوودەکانی حکوومەتەکانی خۆش گوزەر بەوەی دەبێ چەند فراوان بێت.

به هۆی زیاتر پێشکەوتنی پزیشکی خەڵکی تەمەنێکی درێژتر دەژیان، بۆیەشە خەرجی سوودەکان زیادی دەکرد بەوەی بەڵێن بە هەرکەسێ درابوو پاش تەمەنی تەقاعودبوون زەمانەتی تەندروستی هەبێت. بە ئاشکرا هەموو سوودێکی گشتی لە هەموو وڵاتێکی ڕۆژئاوادا لە سەر بنچینەی " هەرکە دەڕۆی بدە" پاڵپشتی دارایی دەکرا، مانای ئەوەیە کە پاڵپشتی دارایی دەکران لە سەر داهاتە هەنووکەییەکان کەمتر لە ڕێگەی خەزنە هەنووکییەکانەوە، بەڵام لە دەیەی یەکەمی سەدەی بیست و یەکدا ڕێژەی خەڵکی بە تەمەن لە کارکردندا،کە دەبوونە هۆی بەرهەمهاوردەی داهات، بۆ کەرتی دانیشتوان توانای وەرگرتنیان هەبوو بەرەو نەمان چوون، لە ئەنجامدا لە هەموو ئەو وڵاتانەدا ڕێژەی کارکردن کەم بۆوە.

بۆیە، کاتێ ژیانی گشتی لە وڵاتانی ناوەوەی جیهاندا لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا بەرەو ئەوە خولی دەخوارد چۆن سوودەکان بەرزبکرێتەوە و فراوان بکرێن، سیاسەتەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیست و یەك وا پێدەچوو لە سەنتەری خۆیان مەسەلەی ئەوەیان هەبێت ئەو سوودانە چەند بێت و چەند بە خێرایش کەمی بکەنەوە. سیاسەتی بە بەزەیی ئاسانتر و خۆشتریش پەیڕەودەکران لە سیاسەتەکانی سنووردارکردن. بەخشین لە هەر ڕووداوێکدا باشترو ئاسانترە لە سەنین، بەڵام تەنانەت ڕازیبوونی کەمتری هەریەك لەو دووانە دەبێ زاڵ بێت بەسەر مشتومڕە سیاسەیەکان و هەڵبژاردنەکانی ئەوروپای ڕۆژئاوا و ویلایەتە یەکگرتووەکان، هەروەها لە ژاپۆن لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیست و یەکدا، ئەمە هێشتا کۆمەڵە ئەرکێك و ئیختیاری ئاسانتر دروست دەکات و تا ئەوانەی کە زۆربەی زۆربەی وڵاتانی دەرەوەی جیهان دووچاری بوونەوە.



## چاپتەری -١٠-

## سەرچاوەی شوێنێکی شاراوەی شت دروستکردن

کاتێ پەیوەندی کرد بە حیزبی شۆڕگێری، بۆڵشێڤیك وەك سەرکردەیەکی باڵای یەکێتیی سۆچییەت شوێنی جۆزێف دجوگاشڤیڵ گرتەوە، لەو سیمیانەری لە جۆرجیای سازکردبوو، بڕیاریدا بە خۆی بڵێت " ستالین"، واتە پیاوی پۆڵا. ئەم ناوە پڕ بە پیستی ناوی کۆمۆنیستان بوو، چونکە پۆڵا کرۆکی سیاسەتی ئابووری کۆمۆنیست بوو. کرێکاران دەچوونە نێو کانەکان و پۆڵاش دەبووە سەرچاوەی بەرهەم، هەروەها لە سەرەنجامی ئەوەی بەرهەمیان دەهێنا کارگە سەرنجڕاکێشەکان بینا هەوربڕەکان بوون، هەروەها ئەو دەبابانەی کە ئابووری نەخشە دارێژراوی ستالینی لە یەکێتیی سۆڤیەت تەرخانکرابوو بۆ دروستکردنی ئەم شتانە. کۆمیونیزم و پۆڵا هەردوو یەکێتیی سۆڤیەت و چینی ماوی گۆڕی بە مەنزڵگایەکی زۆر گەورەی شت دروستکردن، هەروەها لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا گەلێ لە حکوومەتەکانی وڵاتانی جیهانی سێیەم نیازی ئەوەیان هەبوو بە دوای ئەم نموونەیە بکەون.

بەڵام، لە کۆتایی سەدەکەدا، داهاتێکی زۆری پۆڵا ببوو بە نیشانەی پاشەکشەی ئابووری، نەك هێز، هەروەها سیستەمی نەخشەداڕشتنی سەرەکی کە ئەوەی بەرهەمهێنابوو لە یەکێتیی سۆڤیەت و چین بوو بە بەربەستێك بۆ پێشکەوتنی ئابووری. کەواتە، لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا، ڕووسیا و چین هەروەها گەلێ لە وڵاتانی دەرەوەی جیهان بوون بە شوێنێکی نادیاری زۆر گەورەی شت دروستکردن، بەڵام ئەو شتەی لە ژێر دروستکردن بوو نادیار بوو، نەك بەرجەستە ئەویش: دام و دەزگاکانی ئابووریی بازاڕ بوو، کە لە هەموو شوێنێکدا بوون بە گالیسکەیەکی پێویست دانرا بۆ بەدەستهاوردەی سامان.

پرۆژەی دروستکردنی دووەم (نەریت و پراکتیز) زەحمەتر خۆی نواند لەوەی یەکەم (بیناو کارگەو دەبابە). وا پێدەچوو زیاتر درێژتر بێت. کارگەکان و بیناکان و دەبابەکان دەکرێ بەرهەم بهێنرێت بە بڕی زیاتر لە نێو ڕێچکەی پرۆژەیەکی پێنج ساڵیدا، بەڵام بۆ کۆکردنەوەی نەریت و

پراکتیز و بەهرە پێویست بوو بۆ بەگەڕخستنی ئابوری بازاڕ ئەمە کاری نەوەیێك و نەوەیەکە. گەر کات بەربەستێك بێت، سیاسەتێکیش بەربەستێکی ترە.

دووەم مەشقی مۆدێرن لە مەودا فراوانـی دروسـتکردن تێکـشکاندنی پێکهاتـەی تـەواوی ئابووری کۆنە، ئەمەش دووچاری بەرگەی سیاسی بۆوە. کاتێ پرسیاریان لە ئەنشتاین کـرد لـە سەر ئەوەی بۆچی مرۆڤ عەقڵی بە دروستکردنی بۆمبی بەهێز و چاوەڕوان نـەکراودا دەشـکێت، بەڵام هەرگیز عەقڵی بەلای کارێکی مرۆییانەدا ناچێت کە ئەم چەکانە بەکارنەهێنن. ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: " سیاسەت زۆر زەحمەترە لە فیزیا". ئەو ئاستەنگانەی کە گـەلێ لـە وڵاتـانی خاوەن سەروەری، لە کۆی دوو سەد وڵاتدا، دووچاری بوونەوە لە دروستکردنی کارکردنی بـازاڕی ئازاد ئەوەی خستەڕوو کە، لە سەدەی بیست و یەکدا، سیاسەت زۆر زەحمەترە لە ئابووری.

## ستراتیژییە ئابوورییەکان

ئەرکی وڵاتانی ناوەوەی سەدەی بیست و یەك پاراستنی بازاڕێکی مکـوکی ئـابووری بـوو بـۆ ئەوەی بە باشی و بەرێکی کار بکات. وڵاتانی دەرەوەی جیهـان دەسـتیان بـە پرۆژەیـەکی گـەلێ زەحمەتر کردبوو کە دروستکردنی ئابووریی بازاڕ بوو. لە نێو وڵاتەکانی کە تیایانـدا دروسـتکردنی بازاڕ زاڵ بوو بەسەر ئەگێندەی گشتی بەشی یەکەمی سەدەی نوێ ڕووسیا و چین بوون.

هەردووکیان توانایەکی بەرچاوی ئابووریان هەبوو. ڕووسیا دەوڵەمەند بوو لە ڕێگەی سەرچـاوە سروشتییەکان و خەڵکی بەهرەدار و زیرەك، چین زۆرترین ژمارەی دانیشتوانی هەبوو لە چـاو هـەر وڵاتێکی تری دیکەی جیهان، کە زۆربەی هەرە زۆریان تەواو ڕۆشنبیر و خوێنـدەوار بـوون، بـەڵام بوارە سیاسییەکان لە ڕێگای ئابووری دوای جەنگی سارد گـەر هـەر شـتێك بـووبن، بـەرزتربوون لەوانەی ئابووری، چونکە ئەوان لێکترازاترین ئەندامی سیستەمی نێودەوڵەتی بوون، ڕووسیاو چین ئەو وڵاتانە بوون کە مێژووی تیۆری لیبراڵ، گەر بە وردی بیسەلمێنێت، گـەر لیبراڵیزمـی ئـابووری بـووە هـۆی لیبراڵیزمـی سیاسـی، کـە هاوکـاری سیاسـەتی دەرەوەی لیـبراڵ کـرد، قـوڵترین و کاریگەترین هێزی دەبێت لە سەر سیاسەتە نێو دەوڵەتییەکانی سەدەی بیست و یەکدا.

جیاوازییە ئابوورییەکان لە نێوان هـەردووکیان لـە دەیـەی یەکـەمی دوای جـەنگی سـاردا بەرزدەبوونەوە. لە هەشتاکان و نەوەدەکان چـین لـە ڕووی ئابوورییـەوە بـە قـەد خێرایـی هـەر



وڵاتێکی تر لە مێژوودا پێشکەوت، هاوکاریکردنی ڕێژەیەکی ئاسایی لە سەدا هەشتی گەشـەی ساڵانە لە هەردوو دەیەیەکدا. ڕووسیا ئەزموونێکی پێچەوانەی ئـەوەی چـینی هـەبوو، کتـوپڕ ئاستی بەرهەم هاوردەی دابەزی لە چاو هەر وڵاتێکی تـری کـاتی سـستە مەزنەکـەی بـازاڕدا. هەتا ڕێگەدان بە ئەگەری ئەوەی کە گەشەی چینی بە ڕەسمی زۆر جەختی لە سـەر دەکرایـەوە و بەرهەمهاوردەی ڕووسیاش پشتگوێ خرا، لە بواری نمایشی ئابووری هەردوو وڵاتدا لە کۆتاییـدا کەوتنە دژی یەکتر.

ئەو نمایشە دژیەکە، وێڕای ئەمە، هاتە کایـەوە وەك ئـەنجامی هـەوڵی یەکـسان و هاوتـا، دەیەکی ویست بۆ گۆڕان لە پلاندانانی سەنتەرەوە بۆ بـازاڕ. ئەمـە سروشـتی بـووە هـۆی ئـەو پرسیارەی، کاتێ هەوڵدانی هەمان شت، بۆچی چین زۆر بە باشی ئەنجامی دا و ڕووسـیاش ئـاوا بە خراپی. وەڵامەکان بۆ ئەم پرسیارە دەکەونە نێو دوو پۆلێنەوە: ئەوانەی تاکیدیان لە سەر ئەو مەرجانە دەکردەوە سەرکەوتن لە هەردوو وڵاتدا کـاتێ دەسـتیان بـە مامەڵـەی خۆیـان کـرد، هەروها ئەوانەشی کە تاکیدیان لە سەر ئەو ستراتیژییەتە ئابوورییە جیایانەی کە ڕووسیا و چـین بەکاریان دەبرد کردەوە.

ڕوونکردنەوەی یەکەم زیاتر قایلکەرە. کۆمینیزم جلەوێکی بێهێزتری هەبوو لە سەر چین لـە کۆتایی حەوتاکان تا لە سەر ڕووسیا لە سەرەتای نـەوەدەکان. ژاوەژاوی سیاسـی شەسـتەکان و حەوتاکان بە شۆڕشی کەلتووری ناسران کە کـۆنترۆڵی کۆمۆنیـستی چـینی بـڕی و حیزبەکـەش بێهێز بوو لە دەوروبەری چیندا، کە لەو شـوێنانەدا یەکـەم جـار چاکـسازی بـازاڕ سـەریهەڵدا. ڕووسیای لادێی، بە پێچەوانەوە، وەك گەرم کەرەوەیەکی مناڵان کارناکـات لـە بـازاڕ. کـەرتی کشتوکاڵی بەشـێکی بـچووکتری ئـابووری و کۆمەڵایـەتی بـوو و بـە زۆری زاڵبـوو لـە لایـەن سیستەمی کۆمۆنیست.

وێڕای ئەمە، زۆربەی گەشەی چینی کۆتای سەدەی بیستەم، وەك ئەزموونی گەشەی هەموو ئەو وڵاتانەی لە قۆناغی یەکەمی شۆڕشی پیشەسازیدا، هاتە کایەوە لە گۆڕانی خـەڵك یـاخود گواستنەویان لە بەرهەمی کەمتری کاری کشتوکاڵی بۆ بەرهەمی زیاتر کـاری دامەزرانـدن لـە پیشەسازیدا، ڕێگایەك کە نزیك بوو لـە ڕووسـیا لـە نـەوەدەکان. کـاتێ چـین کاریگەرییـەکی گەورەی لە سەر کشانەوەی جووتیاران هـەبوو، بـەڵام ڕووسـیا نـەیبوو. چـین پێـشتر وڵاتێکـی

شارستانی بوو. گەشەی ئابووری لە ڕووسیا پێویستی بە چاکاکردنەوە هەبوو شان بە شانی کەرتی پیشەسازی.

گەر سیستەمی کۆمۆنیست بێهێزتر بوو، ژینگەی ئابووری کە تیایدا چاکسازی دەستی پێکرد سەقامگیرتر بوو لە چین تا لە ڕووسیا. کۆتایی یەکێتیی سۆڤیەت بواری یەککگرتووی ئابووری دابەش کرد بەسەر پانزە وڵاتی خاوەن سەروەری، سستکردنی ئەکسێسی بازاڕە ئاشناکان و بەڕێوەبردنی سەدمەیەکی توندی ئابووری بۆ ڕووسیا سەری هەڵدا لە گەرماوگەرمی ململانێ کردن بۆ دامەزراندنی بازاڕی ئازاد.

دوو جیاوازی تر لە نێوان ڕووسیا و چین ڕۆچووە نێو نمایشە جیاوازەکەی ئابووریان. ڕووسیا گواستنەوەی خۆی دەست پێکرد بە زۆربوونێکی جدی، سەرەنجامی چاپکردنی زۆری پارە لە دوا ساڵەکانی کۆمیونیزمدا. بۆ نەهێشتنی ئەوپەڕی زۆربوون، پێوەرە دڕاندانەییەکان پێویست بوو کە دواتر ناسران بە : "چارەسەرێکی سەرسام". چین بەرەنگاری ئاستەنگە ئابوورییەکان بۆوە، ئەمە وەڵامێك بوو بۆ ئەوان کە حکوومەت دەسەڵاتی گۆڕانکارییەکانی هەیە کە بووە هۆی دەستپێکردنی چاکسازی، بەڵام نەك ئەو کێشە تایبەتییە. هەروەها لە هەشتاکان و نەوەدەکان کۆمەڵگای چین ڕێژەیەکی بەرزتری خەزنی هەبوو، کە بووەی هۆی ئاسانکاری وەگەڕخستن، بەڵام ڕووسیای دوای کۆمۆنیست ئەو ڕێژەیەی نەبوو.

هەروەها چین دوای چاکسازییەکی جیاو ستراتیژییەتێکی هێواشتری ئابووری کەوت لە چاو ڕووسیا، کە ئەمەش بنەمایە بۆ ڕوونکردنەوەی دووەم بۆ جیاوازە تووندەکەی نمایشی ئابووریان. چین بە ئاسانکردنی کۆنترۆڵی دەوڵەت لە کەرتی لادێی دەستی پێکرد. جووتیارە چینییەکان سوودیان لە بوارێکی گەورەتر وەرگرت بۆ دەستپێشخەری سەربەرخۆ، سنووری پێشبینییەکانی حکوومەتی بڕی، هەروەها پرۆژەی تایبەتی و موڵکی تایبەتی لە کشتوکاڵ دروستکرد. لە هەمانکاتدا، خاوبوونەوەی چاودێری حکوومەتی مەرکەزی بووە زۆربوونی پرۆژەی تایبەتی نوێ کە پەیوەست بوو بە دروستکردنی کارگە و بازرگانی لە ژێر چاودێری هەڵسوڕاندنی دەسەڵاتی ناوخۆی چینی. ئەو پرۆژانەی لادێ و شارۆچکەکان گرینگترین داهێنانی ئابووری بوون لە ئەزموونی چیندا. بە تەواوی مەسەلەی تایبەتی نەبوون، هەروەها حکوومەتی کۆمۆنیستی چین مافی ڕەسمی موڵکداری دانەنا کە ئەگەری فراوانبوونی ئابووری گونجاند لە هەرە شوێنێکی تر،



بەڵام وجودیان هەبوو لە دەرەوەی قسەی پلانەکە پەیڕەو دەکران لە ڕێگا گەلێکەوە وەك بازرگانی تایبەت.

لە ئەنجامدا، چین پەرەی بە بواری ئابووری دوو سەرە دا. لە لایەك بەسەر ئابووری کۆندا چۆوە بە هاوکاری دەوڵەت، لەگەڵ تەواو دڵنیا بوونی کۆمۆنیست لە پیشەسازی تەواو. لە تراکێکی هاوتادا کەرتی ئابووی تایبەت کەرتە نیمچە تایەبەت بچووکتر و خێراترەکەی بزواند، کە ئەمەش بووە هۆی فراوانبوونی چاکسازی بە شێوەیەکی بەرچاو لە ساڵی ١٩٧٨ و کە لێیەوە زۆربەی گەشەی مەزنی چین هاتە کایەوە.

ڕەخنەگران لە سیاسەتی ئابووری ڕووسیای دوای کۆمۆنیست تاکید دەکەنەوە کە مۆسکۆ دەبوایە هەمان ستایلی هێواشی چینی پەیڕەوکردبا لە ماوەی گۆڕانی ئابووری پاش ڕووخانی کۆمیونیزمدا. هەتا گەر ڕووسیا واشی بکردایە، جیاوازییەکان لە مەرجە سەرەتاییەکان باری ئابووری ڕووسیای سەختتر دەکرد لە چاو هی چین، بەڵام ڕووسیا لەو ئاستەدا نەبوو پەیڕەوی ئەمە بکات. کرۆکی ستراتیژی هێدی هێدی دڕێژەپێدانی کەرتێکی کۆمۆنیستی و ئابووریی بازاڕی ئازاد بوو. بۆ هەڵسوڕاندنی ئابووری کۆمۆنیست پێویستی بە حکوومەتێکی کۆمۆنیست بوو. لە مانگی ١٢ ١٩٩١ دا ڕووسیا کۆتایی پێهات و بوارێکی وای نەبوو. گۆڕانی سیستەمی ئابوورییەکەی فشار کرایە سەر ڕووسیا بە هۆی شۆڕش لە سیاسەتەکەیدا. ڕووسییەکان نەیاندەتوانی بە هێوری بۆ نێو ئاوی بازاڕ وەك چینییەکان کردیان ڕۆبچن. خۆیان لە نێو گێژاوی ڕووداوە سیاسییەکاندا بەرەو ناوەڕاستی دەریاچەکەدا بینییەوە، کە تیایدا ناچارکران یان ئەوەتا بخنکێن یانیش مەلە بکەن.

بۆ هەموو جیاوازییەکانیان، ڕووسیا و چین یەکچوونی گرینیگیان لە ڕووی ئابوورییەوە خستە ڕوو. وەك وڵاتانی تری دەرەوەی جیهان لە کۆتایی دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا، هیچ کامیان ئابووریی بازاڕێگی گەرم گوڕیان نەبوو، هەروەها ململانێی بونیاتنانی بازاڕێکی کارا دەبوایە ململانێیەکی سەرەکی بوایە بۆ کاروبارە گشتییەکانیان دوای جەنگی سارد. ئالێرەدا ڕووسیاو چین هەرتك نموونەیی بوون و نموونەی وڵاتانی خاوەن سەروەری دەرەوەی جیهان بوون. نموونەیی بوون لەوەی کە هەر سێ بەربەستە سەرەکییەکە ئەوان دووچاری بوونەوە هەمان ئەو بەرەباستانە بوون کە وڵاتانی تر بەرەنگاری بوونەوە کە ڕیزیان بەست لە پاڵ سەرکردە ئابووریەکانی وڵاتانی ناوەوەی جیهان. هەموویان نەقوسانیان لە دام و دەزگای ئابووری و

سیاسی بەهێز هەبوو، هەموویان تووشی نەخۆشی تاعونی گەندەڵی ببوون، هەموویان دەبوایە هەڵبکەن لەگەڵ لاربوونەوەی ئابووری کە سەرەنجامی دەیە درێژەکانی و تەوجیهە سیستەماتیکییەکەی سەرچاوەکانە بۆ بەکارهاوردەی بە بێ قازانج. هەردووکیان ناشاز بوون لەوەی پێشینەی گشتی کۆمۆنیستیان هەر کێشەیەکیان جدی تر کرد بۆ زۆربەی وڵاتانی تری دەرەوەی جیهان.

ڕووسیا و چین نەقوسانیان لە دام و دەزگاکان هەبوو کە پەیوەست بوون بە ئابووریی بازاڕ و پێداویستی بۆ گەشەی ئابووری. دەرسی گەورەی نەوەدەکان لە کۆمۆنیستی پێشووی یۆارسیا ئەوەبوو کە سیاسەتی ئابووری گرینگ نییە چەند لە بەرچاو دەگیرا و بە دانایی نەخشەی بۆ دارێژراوە، شکست دێنێت بە بێ دام و دەزگای گونجاو بۆ جێبەجێکردنیان. ئەمە بۆ بۆچوونەکانی کۆمەڵگای دارایی نێودەوڵەتی زۆر کەمیان کرد بۆ ئابوورییەکانی گەلێ لە وڵاتانی کۆمۆنیستی پێشوو. ئەو پێوەرانەی ڕاسپێدران وەك بەرنامەکانی کۆمپیوتەر بوون بەبێ پێداویستی سیستەمی بەکارخستن. بۆ زۆربەیان لە نێوان نەبوونی دام و دەزگاکان دەوڵەتێك هەبوو بۆ بەهێزکردنی بازاڕ، حکوومەتێك کە یاساکانی بازاڕی بەهێز دەکرد، موڵك بپارێزێت و هەروەها مامەڵەی ئاسایشی ئابووری بپارێزێت لە ساختە و دزی و فرت و فێل کاتێ جێهێشتنی بڕیارە ئابوورییەکان بۆ کارکردنی تاك بە پێی یاساکانی بازاڕ.

ئالێرەدا میراتی (دەرهاویشتەی) کۆمۆنیست خراپتر بوو لە بێ کەڵکی، چونکە کۆمۆنیستەکان سیستەمی خۆیان بونیاتنابوو لە سەر بنەمایەکی پێچەوانە ی ئەمە. حکوومەتێك بوو بە هۆی یاساکانەوە، بێگومان پارستنی موڵکی تایبەت بوو، بەڵکو بەهۆی ئەو بڕیارانەی هەموو پێشەنگەکانی ژیانی ئابووری ئەوانەی کە مومارەسەی دەسەڵاتی سیاسی دەکەن گلاند.

هەروەها لەبەر ئەوەی حوکم دەکران لە لایەن کۆمۆنیستەکان ڕووسیا و چین هیچ هەلێکیان نەبوو بۆ دامەزراندنی دام و دەزگای پێویستر بۆ بازاڕ و سیستەمێکی دارایی، کە، وەك دام و دەزگا سیاسییەکان، کاتی دەوێت بۆ پێشکەوتن. سیستەمێکی داراییش هەرتکیانە هەم سیستەمی گێڕانەو هەمیش عەقڵی ئابوورییە، سەرمایە بەڕێوەیان دەبات لە وانەی کە خاوەنی سەرمایەن بۆ ئەوانەی کە دەتوانن ئەو سەرمایە بەکاربێنن و بەرهەمی لێ دروست بکەن، بۆیە





ئەو کەسەی وەگەڕخستن دەکات بەتوانای دەکات، هەموو بە شێوەیەکی مامناوەند سوود لە بەرهەمهێنەر وەردەگرن.

سیستەمێکی دارایی دەبێ بوەستێتە سەر سیستەمێکی سیاسی گونجاو. هیچ کەس پارەی بە قەرز یان وەگەڕخستن ناکات بە بێ زەمانەتی دانەوە کە دەوڵەتی لیبراڵ دابینی دەکات، بەڵام سیستەمێکی دارایی زیاترە لە کۆمەڵە دەزگایەك، بانق و کۆگاو بازاڕی گرێبەست هەرچەندیشە ئەمانە گرینگی خۆیان هەیە. هەروەها کۆمەڵە بەهرەیەکە، هەڵسەنگاندنی دەرفەتەکانی وەگەڕخستنکردنە، هەڵسەنگاندنی موخاتەرەیە، هەروەها وەك عەقڵی مرۆڤ نە لادەبرێت نە بۆ ماوەیەکیش بەردەوام دروست دەکرێت.

لە گەلێ وڵاتانی دەرەوەی جیهان دوای کۆتایی جەنگی سارد، هەندێ خەڵك هەمان بەهرەیان هەبوو. کاتێ جودابوونەوە لەگەڵ کۆمیونیزمی ئۆرتردۆکس، ڕووسیا و چین هیچ بەهرەیەکیان نەبوو. لە سەردەمی کۆمۆنیستدا، وەگەڕخستن لە لایەن یاسا ی کارگێڕی حکوومەتەوە دیاری دەکرا بە پێی ئارەزووەکانی پلاندانەر، نەك لە سەر بنەمای بۆچوونی قازانجکردنەوە. جیا لە بەلاوەنانی دەرفەت بۆ بەرەو پێشبردنی ئەو بەهرانە، کۆمیونیزمی ئۆرتۆدۆکس کردبوونی بە نایاسایی. لە بەرزترین دەسەڵاتی ماو لە چین، هەروەها ستالین لە یەکێتیی سۆڤیەت، گومان لە پەیڕەوکردنی ڕێژەی کاپیتالیست هۆی زیندانی و یان خراپتریش بوو. نەبوونی دام و دەزگای پەیوەست بوو، مەحاڵ بوو بە خێراییش ئەو دام و دەزگایانە دەستە بەر بکەیت، لە هەموو شتێکی تر زیاتر، گواستنەوەی دروستکرد لە پلانەوە بۆ بازاڕ لە سەر هەرێمەکەی پێشووی یەکێتیی سۆڤیەت کە زۆر زەحمەت بوو لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی سارد.

## گەندەڵی

نەبوونی دام و دەزگاکان پەیوەست کرابوو بە بەربەستێکی نموونەیی تر بۆ دامەزراندن و خستنەگەڕی ئابووریی بازاڕ، کە لەمەوە شتێك بە فراوانی سەریهەڵدا ئەویش گەندەڵی بوو. گەندەڵی خراپ بەکارهاوردەی دەسەڵاتی گشتییە بۆ دەسکەوتی تایبەتی. ڕوودەدات کاتێ کەسێکی تایبەتی ڕیشوە دەدات بە بەرپرسێکی گشتی بۆ دەستەبەرکردنی ئیمتیازێکی ئابووری بە سوود زۆر زیاتر لە ڕەشوەکە، یان مەسوولێکی گشتی مەنسەبی خۆی بەکاردێنێت بۆ خۆدەوڵەمەندکردن بە شێوەیەکی لامەرکەزی. هەبوونی گەندەڵی پەیوەستە بە خودی

حکوومەت، لەگەڵ قۆرخکردنی دەسەڵاتی ڕەوا. بۆیە گەندەڵی دەکرێ لە هەم ناوخۆی وڵاتدا و هەمیش لە سەر ئاستی جیهانیشدا ڕوو‌بدات.

هەروەها زۆر پەیوەستە بە حوکمی یاسا. کاتێ یەکێك بەهێزە، ئەوەکەی تر بێهێز دەبێت. لە ڕووی ئابوورییەوە، گەندەڵی واتە باج، چونکە لە هەموو شوێنێك بە جۆرێك لە فۆرمێکدا دۆزراوەتەوە، بە وڵاتە هەرە دەوڵەمەندەکانیشەوە، باج بە ئاشکرا ناتڕووخێنێ لە ڕووی ئابوورییەوە. گەندەڵی بەربەستێکی زەق ناخاتە بەردەم گەشەی ئابووری وا بە ئاشکرایی. هەندێ وڵات لە چاو هەندێکی تر گەندەڵ ترن. لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا، وڵاتانی ناوەوەی جیهان بە گشتی زۆربەیان کەمتر گەندەڵ بوون لەوانەی دەرەوەی جیهان و هەروەها کەمتریش گەندەڵ بوون لە چاو ڕابردوویان. هەرچەند گەندەڵی زۆر بە بێ باج بەرزتر دەبێ، بەمەش دەبێتە هۆی وشکی چالاکی بەرهەم هاوردە. لە خراپترین حاڵەتدا، حکوومەت خۆی دەبێتە مومارەسەیەك لە گەورە بچووك خواردن (واتە گەورە بچووك دەخوات)، بەبێ دابنکردنێکی هیچ پێداویستییەکی گشتی، بە سەلامەتی گشتیشەوە. لە هەندێ حاڵەتدا نووسینگەی گشتی (نووسینگەی حکوومی و حیزبی) دەبێتە مۆڵەتێك بۆ تاڵان و دزی.

کاریگەری ڕاستەوخۆی ئابوورییەکەی هەرچییەك بێت، گەندەڵی سەرەنجامی سیاسی دژی لێ دەکەوێتەوە، کە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ نمایشی ئابووری بەرگەی دەگرێت. سوودمەندانی گەندەڵی بەرژەوەندییەکی بێ وێنەیان لە داخستنی دامەزراندنی حوکمی یاسا دا هەیە، لە کاتێکدا حوکمی یاسا هەڕەشە لە دەسکەوتی ئەواندا دەکات. دەکرێ پێشبینیان لێ بکرێت کە شوێنێك پێکبهێنن و دژی خاسیەتی سەرەکی لیبراڵیزمی سیاسی بوەستنەوە، کە ئەمەش یەکێکە لە مەرجەکانی بازاڕی باش. بەربەستی سەرەکی بۆ سیاسەتە لیبراڵییەکان لە زۆربەی جیهاندا لەو شوێنانەی کە وجودی نییە لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا پابەندبوونێکی بە بنەما نەبوو بۆ فۆرمە نالیبراڵییەکانی حکوومەت، یان هەتا خولیایەك بۆ دەسەڵاتی هەڕەمەکی، بەڵام زیاتر لە پێوستی قۆرخکردنی دەسەڵات بۆ پاراستنی سامانی بە گەندەڵی بەدەستهاتوو. هەرچەند گەندەڵی زیاد بێت لە کۆمەڵگا، ئەوەندە ئەو هێزانەی کە دژی لیبراڵیزمی سیاسین بەهێز دەبن، هەروەها دامەزراندنی حوکمی یاساش زەحمەتر دەبێت.

لە ڕووسیا و چینی دوای جەنگی ساردا گەندەڵی لە هەردوو وڵاتدا لە دەرەوەی کۆنترۆڵ کردنیاندا بوو. ڕووسیا بە تایبەتی گومانی لە سەر بوو، چونکە دەوڵەمەند بوو لە کەرەستەی





خاو، کە زەمینەیەکی بەهێزی بۆ دروستکردبوو بۆ گەندەڵی کردن لە هەر شوێنێك خۆیان بینیباوە. موڵك بە تەنها مسۆگەری سامان دەکەت. هیچ شتێکی تەکنەلۆژی، هیچ داهێنانێکی ئیداری و هیچ بەهرەیەکی بازاڕکردن پێویست نەبوو بۆ دەستبەرکردنی سەروەت لە نەوت یان ئەڵماس یان دڕ و یاقوت و مەرجان. ئەوەی لە سەرووی هەموویانەوە بۆ ئەوان پێویست بوو ناونیشانێك بوو، ئەمەش دەکرێ بکرێت بە هۆی دەسەڵاتی سیاسی. کەواتە دەسەڵات دەبێتە هۆی سامان بە شێوەیەکی ئاسان و ڕاستەوخۆ. دانی مەسوولێك بۆ بەدەستهاوردەی کۆنترۆلی کەرەستەی خاو، یان بەکارهاوردەی مەنسەبێکی ڕەسمی بۆ دەست بەسەراگرتنی کەرەستەی خاو، ڕێگایەکی سەد دەر سەدە بۆ دەوڵەمەندەکان و ئەم ڕێگایە گەلێ لە بەرپرسان گرتوویانەتە بەر.

پێشینەی کۆمۆنیستی گشتی ئەوانیش وای لە ڕووسیا و چین کرد موعەرەز بن بۆ گەندەڵی. کرۆکی ئابووری کۆمۆنیست گونجاوە بۆ پێناسەی بنەڕەتی گەندەڵی: تەرخانکردنی سەرچاوەکان لە لایەن دەسەڵاتی سیاسی کەمتر لە یاساکانی بازاڕ. لە کۆمەڵگا کۆمۆنیستەکاندا چالاکی بازاڕ گرێدرا بوو بە ئابووری نهێنی، بازاڕی ڕەش، کە حکوومەت هەوڵی سەرکوتکردنی دا. گەر بازاڕی ئازاد سیستەمێکی سەربەخۆیی سروشتی بێت، ئەوا ئابووری پێشەنگ سیستەمێکە بۆ گەندەڵی سروشتی. کاتێ چاکسازییەکانی بازاڕ دەست پێ دەکات لە ڕووسیا و چین، ئەوەی بووە بە موڵکی دەوڵەت کتوپڕ بوو بە موڵکی تایبەتی. زۆربەی شتە بەهادارەکان دەستەبەرکرا لە لایەن ئەوانەی بە باشترین شێوە دەستیان بەسەردا گرت بە هۆی ئەوەی کە لە نێو دەسەڵاتدا بوون یان لێیەوە نزیك بوون. زەمینەکە لەبار بوو، هەروەها لە نەبوونی دەوڵەتێکی لیبراڵی تۆکمە و پتەو بە تواناداٍ، هیچ شتێك و هیچ کەس نەبوو ئەو گەندەڵیە بوەستێنێت.

سازانی سامان شتێکی بێ مانا بوو بۆ گەلی چین و ڕووسیا بە هۆی گومان پەیوەست بە سیاسەتەوە بە قەد سومعەی بازاڕ بەهێز بوو، کە بە ملیۆن ڕووسی و چینی هاتن دزی کردنیان ناساند، هەروەها بەشێکیش بەرپرسیار بوون بۆ بێ خوێنی بزووتنەوەی لە دووری پراکتیزی ئابووری کۆمۆنیست لە هەردوو وڵاتدا و هەروەها لە سیستەمی سیاسی کۆمۆنیستدا لە ڕووسیا. بە هۆی گەندەڵییەوە ئەوانەی جڵەوی سیستەمی کۆنیان لە دەست بوو بەرژەوەندی نوێی دەسەتەبەر کرد لە سیستەمی نوێدا. مەسوولەکانی کۆمۆنیست لە هەردوو وڵاتدا، کە

هۆی بەهێزیان هەبوو بۆ بەرگەگرتنی لێکترازانی سیستەمی دارێژراو، کران بە هۆی حیسە وەرگرتن لە پرۆژەی نوێی نێو بازاڕدا. ئەمە مەسەلەیەکی ڕوون بوو لە خزمەتگوزاری ئاشتیدا، پەرەشووتێکی زێڕین بوو بۆ ئەو خەڵکانەی کە پاڵنەرو دەرفەتیشیان بۆ نانەوەی کێشە هەبوو.

ئەمە یارمەتی یەکێك لە ڕێگەکان دەدات کە تیایدا، پاش هەموو شتێك گۆڕانی شۆڕشگێڕی بوون لە ڕووسیا و چین لە دوا دەیەکانی سەدەی بیستەمدا کە جیا بوو لە شۆڕشە مەزنەکانی تری سەردەمی مۆدێرن. لە مومارەسەکانی پێشوودا نوخبەی کۆن بەرگەیان گرت، شکستیات پێ هات، هەروەها چوونە مەنفا: پاش شۆڕشی فەرەنسا بۆ نەمسا، پاش شۆڕشی ڕووسی بۆ ئەڵمانیا، لە سەرەنجامی سەرکەوتنی کۆمۆنیست لە شەڕی ناوخۆی چین بۆ تایوان، هەروەها پاش شۆڕشەکانی کوبا لە شەستەکان و هی ئێران لە حەوتاکان بۆ مایامی و لۆس ئەنجلۆس بە شێوەیەکی نزیکەیی. لە دووەم شۆڕشە مۆدێرنەکانی ڕووسیا و چین، لە حاڵەتی ڕووسیادا، سیستەمی ئابووری سیستەمی سیاسی گۆڕا بە شێوەیەکی ڕادیکاڵی، بەڵام نوخبەی کۆنی کۆمۆنیست بەکاربراو مایەوە تا شەڕ کردن و هەڵاتن.

## چەواشەکاری

سەرەڕای نەبوونی دەزگای کارامە و بڵاوبوونەوەی بەرفراونی گەندەڵی، ڕووسیا و چین، هەروەها زۆربەی وڵاتانی تر لە وڵاتانی دەرەوەی جیهان دووچاری گەندەڵی بوونەوە، لە سەردەمی دوای جەنگی ساردا، سێیەم بەربەست بۆ دروستکردن و بەگەڕخستنی سەرکەوتوو هی ئابووریی بازاڕ: ئەنجامەکانی چەواشەکاری سیاسەتەکانی ئابووری بوو. هێڵی نێوان گەندەڵی و چەواشەکاری هێڵێکی لێڵە. وك گەندەڵی، چەواشەکاری تەرخانکردنی سەرچاوەکان بە هۆی بڕیارە سیاسییەکان کەمتر یاساکانی بازاڕ دەگلێنێ. وەك گەندەڵی، چەواشەکاری فۆرمێکی " بەرژەوەندی مەزاد بۆ لایەنێك"، ئەمەش لە ڕووی ئابوورییەوە جیاوازییە لە نێوان نرخی بازاڕی ئازاد و نرخی بەرزتر لە لایەن دەسەڵاتی سیاسی دادەنرێن بۆ ململانێ. بەڵام جیاوازی زۆر گرینگیش لە نێوان هەردوو نرخدا هەر هەن.

بەڵام چەواشەکاری، وەك گەندەڵی، هەندێ جار بەکاردەبرێ بۆ دەسکەوتی شەخسی، هەمیشە مەبەستێکی فراواتری هەیە، بۆ بەخشینی سوود لە سەر گروپێکی بەرژەوەندیدار تا





تاکێتی تایبەت، یاخود لە سەر کۆمەڵگا بە گشتی. گەندەڵی سەرچاوەکان دەگوازێتەوە بۆ مەبەستی خەرجکردن. فۆرمێکی ڕاوکردنە. چەواشەکاری وەگەڕخستن دەگلێنێ. چەواشەکاری مومارەسەیەکە بۆ دروستکردنی و عادەتەن ڕوودەدات لە سەر پێوەرێکی بەرزتر لە گەندەڵی. بۆیە، کاتێ گەندەڵی بە قەد ڕێکخستنی ژیانی کۆمەڵایەتی کۆنە، چەواشەکاری، دابەشکردنی سەرچاوەکان بە پێوەرێکی فراوانتر بۆ بەکارهاوردەی نەزۆك لە ڕووی ئابوورییەوە، پێویستی بە تواناکی دەوڵەتی مۆدێرنە ببێت بە خۆی.

گەندەڵی پێچەوانەو یاخییە لەگەڵ سیاسەتە لیبراڵییەکان. چەواشەکاری هەمیشە ئاوا نییە. لە ڕووی ئابوورییەوە ڕەنگە نامەنتقی بێت، بەڵام چەواشەکاری هەمیشە و هەموو کاتێك ناشەرعی نییە. حکوومەتە دیموکراسییەکان بە شێوەیەکی ڕووتین پراکتیزیان کرد. بە هەقیقەت، هەرکە سەدەی بیست و یەك دەستی پێکرد، کێشە سەرەکییەکانی وڵاتە دیموراسییە فراوانەکان، ژاپۆن و هیندستان، ڕەگی هەبوو لە چەواشەکردنی ئابووری لە سەر پێوەرێکی زۆرتر بۆ ماوەیکی زۆر درێژ.

ئابووری ژاپۆن دابەشکرا بەسەر دوو بەش. یەکێکیان، تەرخانکرا بۆ هەناردن و کارکردن بە گوێرەی بنەماکانی بازاڕ، مۆدیلێکی توانست بوو. ئەوەکەی تر، بە شێویەکی بەرچاو وزەی گرتەوە، دابەشکردن و گواستنەوە و دروستکردن دەفرۆشێت توانست نەبوو، دروستکردنی چەواشەی دەستەبەرکردن لە لایەن پێوەری سنورداری ململانێ وەك باج و گروپی بەرژەوەندی و ئیشتراکات و کە دابینکرابوو لە لایەن حکوومەت ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ لە ڕێگەی قەرزی هاندانی حکوومەت وەبوو. ئەم بەشی دووەمەی ئابووری ژاپۆن خەڵکی زۆر زیاتری تەعین کرد بە مووچەی بەرزتر بە داهاتی کەمتر، لەوەی کە حاڵەتێك بووبێت موعەرەرز بوو بۆ ڕامانی تەواوی بازاڕ.

بە هەمان شێوە، لە هیندستان ڕاجی بە مۆڵەت وەك ئالییەتێك بۆ چەواشەکردنی ئابووری خزمەتی کرد، هەروەك لایەنەکانی حکوومەت وایان کرد بۆ دەسەڵات و ئاو، کە نرخی خۆیان جێگیرکرد بە کەمتر بۆیە خەرجی زیاتریان هاندا تا ئەوەی حاڵەتەکە بێت بە دەر لە حاڵەتەکە. چەواشەکردنی سیاسەتەکانی ئابووری هەروەها کەرتێکی فراوانی کە دەوڵەت خاوەنییەتی پیشەسازی بە گەڕدەخاو بەرهەم هێنا لە ئابووری هیندستان.

لە کۆتایی دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا، چەواشەکاری زاڵ بوو بەسەر ژیانی ئابووری لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش. تورکیای دیموکرات، ئێرانی نیمچە دیموکرات، میسری غەیرە دیموکرات، سووریای نالیبراڵ هەموویان دەوڵەتی خاوەن کەرتی فراون بوون و هەروەها بەشداری حوکمەتیان دابینکرد بۆ چالاکی هەمەجۆری ئابووری. ئەمە ڕاست بوو بۆ وڵاتەکانی ئەمریکای لاتینیش.

چەواشەکاری سەرەنجامێکی ئابووری نەویستراوی هەیە. گەشە هێواش دەکات. چالاکی ئابووری لە سەرنجامی چەواشەکاری ئەو سەرچاوانە دەخوات کە بۆ بەرهەم هاوردە بەرکادێت، کێشی ئابووری هێنا خوارەوە و سستی کرد. کەرتە پارێزراوەکان لە ژاپۆن، چەواشەکردنی بەرهەمەکانی ئابووری لە هیندستان، بەشەکانی ئابووری وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەمریکای لاتین کە چەواشەکاری کاریگەری دروستکرد لە سەر ئابوورییەکانی کرمی مشەخۆری سەر لاشەی مرۆڤ. باری کەرتی پارێزراو دەکەوێتە قوڵایی ناخی و درێژکردنەوەی سستی بازاڕی ژاپۆنی ساڵی نەوەدەکان. چەواشەکاری هیندستانی پاراست تا نەوەدەکان بە ڕێژەی گەشەی لە سەدا ٣,٥، کە درێژبۆوە بۆ پشتەوەی نمایشی چینی هەشتاکان و نەوەدەکان و بەرزنەبوو بە پێی پێویست بۆ دوورخستنەوەی ئەو هەموو خەڵکەی هیندستان لە هەژاری.

ئەنجامێکی گشتی هەرچەند ناڕاستەوخۆشە هی چەواشەکاری ئاشناترینیان بوو، لە خراپترینی و وێرانکەرترین زانستی بازاڕ ئەویش بەرزبوونەوەیە. نرخەکان بەرزدەبنەوە و پارەی زۆر لە کایە بۆ شتی زۆر کەم. حکوومەت پارە زۆر زۆر چاپ دەکەن کاتێ نە دەتوانن ئەرکەکانی خۆیان کەم بکەنەوە نە دەشتوانن داهات بەرزبکەنەوە بۆ باجدانی ئەوان. بەرزبوونەوە میتۆدێکی باجدانە بە بێ نوێنەرایەتی کردن، هەرکە حکوومەت بە شێوەیەکی هەرەمەکی دەسەڵاتی کڕین دروست دەکات بۆ بەکارهاوردەی تایبەتی خۆی. بۆنەی کلاسیك بۆ بەرزبوونەوە کاتی جەنگە، کاتێ داواکان بۆ سەرفکردن بە پەلە بوون، بەڵام حکوومەتەکان ناتوانن باج بە دانیشتوان بدەن لە ئاستی پێویست بۆ گەیشتن بەوان.

چەواشەکردنی سیاسەتەکانی ئابووری بە هەمان ڕێگا بۆنەی بەرزبوونەوەی کرد کە جەنگەکان کردیان. بە تایبەتی، هەرچەند بە شێوەیەکی تایبەتی نا لە وڵاتانی دەرەوەی جیهان، حکوومەت نەقوسانی هێزی بۆ کۆکردنەوەی تەواوی باج بۆ هاوکاریکرنی چالاکییە نەزۆکەکان هەبوو. داهاتی باجی بەرجەستە سەرکوتکرا لە لایەن چەواشەکاری لە سەر گەشەی ئابووری،



هەروەها ئەم حکوومەتانە پشتیان بەست بە زۆری پارەی چاپکراو. ئەنجامەکە بەرزبوونەوەی بەرز بوو، هەتا لە حەڤدە وڵاتی دوای کۆمۆنیستی یۆراسیا، زۆری بەرزبوونەوە، زۆرجاریش قەیرانی دراو، وەك هەڵگرانی ناوخۆی پارە خێرابوون لە گواستنەوەی بۆ دراوی سەقامگیرتر.

کاتێك هەموو حکوومەتەکان بەرژەوەندی ئابووری بەهێزیان هەبوو لە کەمکردنەوەی چەواشەکاری، کەمکردنەوەکان زۆربەیان لە ڕووی سیاسییەوە زەحمەت بوون بەدەستە بهێنرێن. گەلێ خەڵك سوودی وەرگرت لە چەواشەکردنی سیاسەتەکان. ئەوان تەحەمولی لەدەستدانی زۆر دەکەن وەك، داهات و ئیمتیازەکان و کار، گەر ئەو سیاسەتانە کۆتایی بێت. لە ئابووریی بازاڕی ڕێك و بەکار ئەم جۆرە زەرەرانە ئاساین. کۆمپانیاکان فەشەل دێنن، خەڵك کاری لە دەست دەدات، کرێکار لە کەرتێکەوە دەگۆڕێت بۆ کەرتێکی تر بە نیزامەوە، بەڵام لە ئابووریی بازاڕی ڕێکو بەکار هەموو ئەمانە هێواشتر ڕوودەدەن تا ئەوەی کاتێ چەواشەکردنی سیاسەتەکانی ئابووری لە پڕ لە ناوبراون. جیاوازی نێوان شکاندنی هێواشی بازاڕی ئاسایی و ڕاستکردنەوەی چەواشەکردنی سیاسەتەکان بەگشتی جیاوازییە لە نێوان گەڕان بە دوای چاودێری ددان بە نیزام، پاکردنەوەی زۆرجار دەگلێنێ و پڕکردنەوەی بۆنەیی نێو لووتان، لە لایەك و، هەروەرها لە لایەکی ترەوە پشتگوێ خستنی مەسەلەکە تا هەمەو ددانەکان پێویستان بە ڕەگ هەبێت یاخو دەرهاوردە. یەکەمیان ناخۆش یان بێزار کەر بن، دووەم عادەتەن بەئازارە و لێکترازاوە.

وشەکان بەگشتی بەکاردەهێنران بۆ وەسفکردنی ئەوەی ڕاستکردنەوەی چەواشەکاری پێویستییەکی بێ لایەن بوو. واتە" چاکردنەوە" و "بوژاندنەوە" پێویست بوو بۆ هەمووان، بەڵام ئەمانە خەڵکی ئیحراج دەکەن بۆ ئاژاوە، هەروەها بە ملیۆن خەلكٚ بێ جێ و بێ بەش دەکەن. ئەو تۆڕە سەلامەتییەی کۆمەڵایەتی لە سەر ئاستی جیهان لە باوەشگیرا جۆرێك لە چەواشەکاری ئابووری وەسف دەکات، ئەمەش بەرهەمی بڕیارە سیاسییەکانە تا ئابوورییەکان. زۆرجار چەواشەکاری خزمەتی هەمان مەبەست دەکات: کەرتە پارێزراوەکانی ژاپۆن جۆرێك بوون لە سیستەمی خۆشگوزەرانی بۆ ئەو خەڵکانەی لەوێ تەعینکرابوون.

چونکە ئەوان زیان بە سوودمەندەکان دەگەیەنن، ئەو پێوەرانەی داڕێژران بۆ کۆتایی چەواشەکاری دژی بەرگەگرتنی سیاسی بوون، کە دەکرێ کاریگەتر بن لە دیموکراسی تا سیستەمی سیاسییە نادیموکراسییەکان. حیزبی لیبراڵی دیموکراسی ژاپۆن (LDP) لە دەسەڵات

بوو نزیکەی لە بەردەوامییەکانی کارەساتی جەنگی جیهانی دووەمەوە تا وەرچەرخانی سەدەکە، زاڵبوونی سیاسی خۆی دامەزراند لە سەر هاوکاری حکوومەت بۆ چەواشەکاری ئابووری. لە بەرابەردا ئەوانەی سوودمەندن دەنگی خۆیان دا بە GDP. لە هیندستان، یەکێتییەکان تەعینکردنیان سەپاند بەسەر حکوومەتەوە، هەروەها خاوەن زەوی زارە لادێیەکان دەوڵەمەند بوون لە لایەنی حکوومەتەوە لە دەسەڵات و ئاو، کەرتی ڕێکخستنی دەنگدان کە ئەوان پێشکەشیان کرد بۆ سیاسەتمەداران کە بەڵێنیان دا بۆ بەردەوام بوونی ئەو چەواشەکاریانە بوو.

سیاسەتمەدارە دیموکراسییەکان کە سوود وەردەگرن موخاتەرەی دەنگدان دەکا لە دەرەوەی ئۆفیس. سەرکردەکان لە سیتەمی سیاسی کە دیموکراسی نین دەبوایە خۆیان ڕەچاو بکەن لەگەڵ هەڵبژاردنەکاندا، بەڵام موخاتەرەکەش بەڕێوەدەبات وەك پرۆتێستی توندوتیژ تەنانەت لابردنیش. هەردووکیان دەگیرێن لە نێوان scylla ی بەرزبوونەوەو هێواشی گەشە و charybids ی زۆری بێکاری. لەو شوێنەی چەواشەکردنی ئابووری بایەخی پێدەدرێت، مەنتقی ئابووری دەبێتە شتێك سیاسەت بەرابەری دەوەستێتەوە. بێگومان لە ماوەی درێژدا کۆمەڵگایەك کە چەواشەکاری خۆی لادەبات باشتر دەبێت لە ڕووی ئابوورییەوە، هەروەها متمانەش بە جۆرێك دەبەخشێت بە سەرکردە سیاسییەکان، بەڵام سیاسەتمەداران بۆ ماوەیەکی مەودا کورت دەژین.

کاتێ توانا بۆ پاڵپشتی سیاسەتی ئابووری چەواشکرا حکوومەتەکانی لێ خوری بۆ گەنجینەی پارەی نێودەوڵەتی، مەرجەکان بۆ قەرز تێوەگلا لە کۆتایی هاوردەی ئەو سیاسەت و پراکتیزانەی کە بوونە هۆی دروستکردنی کێشە. حکوومەتی جاڕسکراو هەمیشەی مەبدەئییەن مەرجەکانی پەسەندکردووە، بەڵام هەمیشە نەیتوانیوە جێبەجێیان بکات. لە دوا دەیەکانی سەدەی بیستەمدا، تورکیا شانزە ڕێکەوتنی بەست لەگەڵ گەنجینە، بەڵام تەنها دوانی تەواو کرد بە سەرکەوتوویی.

لە کۆتایی دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا، ململانێ لە نێوان هێزی بەرگەنەکراوی ئابووری وەك بابەتێکی بەرژەوەندی خودی سیاسی زاڵبوو بەسەر ئەگێندەی سیاسی گەلێ لە وڵاتانی خاوەن سەروەری دەرەوەی جیهان لە کۆی نزیکەی ١٥٠ وڵات. لە نێو هەموویاندا، ڕووسیا و چین زۆر بە توندی پەیوەست بوون بە چەواشەکاری ئابووری، کە بۆیان مابۆوە لە کۆمۆنیستی ئۆرتۆدۆکسی ڕابردوو. مەبەستی هەرە گەورەی سیاسەتی ئابووری کۆمۆنیست



دروستکردنی پێکهاتەیەکی پیشەسازی بوو بە وردی کە ڕەها بێت لە سەدەی بیست و یەك. نەخشەکێشانی سۆڤیەت پسپۆر بوون لە کانی پۆڵایی زۆر گەورە و کانە خەڵوزی زۆر قەبە، هەروەها کارگەی دەبابەی زەبەلاح. هەموو کاریان کرد لە ژێر " بودجەیەکی سنوورداری سست"، پێویستیان بە هەر چەند گەنجینە بوایە وەریاندەگرت لە حکوومەت بە بێ لەبەرچاوگرتنی پسپۆرایەتی، تاوەکو تەنیا ئەوان قازانج بکەن. دەرکردنی کرێکاران نەزانراو بوو، موفلیس بوون بیری لێ نەدەکراوە. دەرهاویشتەکە زنجیرەیەك دوورگە بوون درێژدەبوونەوە بە نێو ڕووسیاو لە دەریای باڵتیکەوە بۆ چیاکانی ئۆرال، کە بە ملیۆنەها خەڵکی تەعینکرد کە هەمووی بەرهەمی لێ کەوتەوە لە بەرابەریشدا هیچ داوایەکیان نەبوو.

دەسەڵاتە کۆمۆنیستەکان لە چین دوای نموونەی سۆڤیەت کەوتن. هەتا دوای پەنجا ساڵی حوکمی کۆمۆنیست وڵاتەکە هەر لادێی وەك پێشتر مایەوە، بەڵام دانیشتوانی چین زۆر بوون کە تەنانەت ڕێژەی لایەنی گونجاوی ئابووری چینی کە پێکهاتووە لە کارگەی پیشەسازی کۆمۆنیستی زەبەلاح بە میلۆن خەڵکی تەعینکردووە.

گەلێ لە کارگە قەبەکان لە هەردوو وڵاتدا گونجاون بۆ پێناسەی بنەمای ئابووری. گرێبەستی لاوەکی بەهادار بوون. ئەمەش مانای ئەوەیە کە تایبەتمەندێتی کێشە سیاسی و ئابوورییەکان چارەسەر ناکات کە ئەو کارگانە دەیخەنە ڕوو، چونکە لە ڕووی ئابوورییەوە بەردەست نەبوون. خاوەنە تایبەتەکان خۆشیان بەوە نایەت یان ناتوانن بەردەوام بن بۆ تەعینکردنی خەڵك کە کاریان بۆ ئەوان کردووە. داخستنی ئەو کارگە دایناسوریانەش شتێکی زۆر زەحمەتر بوو، چونکە لە ڕووسیا، بەڵام لە چین نا، هیچ ئابوورییەکی تایبەتی پێشکەوتوو نەبوو کە تیایدا کرێکارە بێ کارەکان بتوانن لەوێ بگوزەرێن. داخستنی دیسان زەحمەت بوو لە بەر خاسیەتی سیستەمی ئابووری کۆمۆنیست هاوبەش بوو بۆ هەردووك.

لە ژێر کۆمیونیزم سوود و خزمەتگوزرای بنەڕەتی و چاودێری تەندروستی، نیشتەجێبوون و پەروەردە و هەتا خۆراکیش، گرێدرابوون بە دامەزراندن و هەبوونی کارەوە. شوێنێك بۆ ژین و شتێکی بۆ خواردن لەگەڵ کارێك دەبێت و نابێت گەر کارەکە لە دەست بچێت. بێکاری لە هیچ شوێنێك ئەزموونێکی ئەوەندە خۆش نییە، بەڵام لە وڵاتانی پێشووی ئۆرتۆدۆکسی کۆمۆنیست کارەسات دەبوو. هەتا کارگە ڕووسی و چینییەکانیش لەگەڵ بۆچوونی باش بۆ هەڵسوڕاندنی تایبەت قازانج ناتوانێت بژیت لە نێو بازاڕ کاتێ لەمپەری خرا پێش ئەرکی خۆش گوزەرانی

کۆمەڵایەتی سەردەمی کۆمۆنیست. بازاڕێکە ئابووری وەزیفەدار لە هەردوو وڵاتدا پێویستی بە جوودابوونەوەی ئەو ئەرکانە هەیە لە دامەزراندنەوە.

بەڵام ئەوەش لە بەرابەردا بازاڕێکی تایبەتی نیشتەجێبوونی گەورە بوو، سیستەمێکی چاودێری تەندروستی، هەروەها بوژاندنەوەی سیستەمی پەروەردەی سەرەتایی ناوەندی. ئەمانە بەرپرسیارێتی لاوەکی نەبوون. هەموو کاتیان گەرەك بوو بۆ بەدەستهاوردە، هەروەها پارە کە نە حکوومەتی ڕووسیا و چین توانای ئیداریان هەبوو بۆ سەرهەڵدان. هەردووك حکوومەت زۆر بێ کاریگەر بوون لە کۆکردنەوەی داهات تا وڵاتانی خاوەن سەروەری ناوەوەی جیهان، بەڵام بەبێ هاوکاری بۆ نیشتەجێبوون و چاودێری تەندروستی و هەروەها پەروەردە، کۆتایی چەواشەکردنی ئابووری کە ڕووسیا و چین، بەدەستییەوە ناڵاندیان، موخاتەرەی ئەوەی کرد بە ملیۆن خەڵکی دەستەوسان و ئەبڵەق و توڕە کرد، موخاتەرەیەك کە هیچ کام حکوومەت گەر بکرێت نەیتوانی لاببات. لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا، کەواتە، ڕووسیا و چین بەرەو ستراتیژییەتی نەهێشتنی بێکاری هەنگاویان نا کە هەرچەند تەقینەوەی کۆمەڵایەتی و سیاسی ناهێڵێت، کێشە ئابوورییە گرینگەکانی خراپتر کرد.

## ڕێگەچارە ئابوورییەکان

وەڵامی بەرایی حکوومەتی ڕووسیای دوای کۆمۆنیست بۆ ئەو کێشە پیشەسازییە ڕەهایەی بە بێ داهاتی پێویست چاپکردنی پارەی زیاتر بوو. سەرنجام، بێ شك، پارە بەرز بووەوە، کە حکوومەتی ڕووسیا هەڵیسوڕاند، لە نیوەی دووەمی نەوەدەکان، بۆ خستنە نێو کۆنترۆڵی خۆی. دواتر هەوڵی پڕکردنەوەی بۆشایی نێوان داهات و ئەرکەکانیدا بە هۆی قەرزکردنەوە. بەسەر قەرزکەوت و گەلێ گرێبەستی گرێدا، بەڵام خەرجی بەرژەوەندی و باشترین بەڕێوەبردنی توانای حکوومەت بۆ بە یەك گەیشتنیان، لە مانگی هەشتی ١٩٩٨، کەوتە سەر لە ئەرکەکانی و دراوەکەی بێ بەها بوو، مامەڵەیەك بۆ لێشاوێکی توونتر بۆ بێهێزییەکی پێشتری ئابووری. لە هەمانکاتدا، لە ماوەی نەوەدەکاندا تێکەڵەی مردووی بێ توانایی سیاسی بۆ داخستنی یانیش کەمکردنەوەی زنجیرە دوورگە بە ئاو دەورە دراوەکە لەگەڵ نەبوونی توانای ئابووری بۆ هاوکاریکردنی وای لە ئابووری ڕووسیا کرد پێشبکەوێت بە ڕێگایەکی تایبەت. بە هۆی



تێکەڵەی مووچە و وەسڵی دواخراو، کاتێ دەبوایە پارە بدرێت بە خاوەن متمانتەکان و کارگەکان یان بۆ حکوومەت، پاشەکەوتکردنی بەرهەم زیاتر لە پارە. بایەخی پیشەسازی ڕووسیا توانی بەردەوام بێت لە کار، بە ئاستێکی زۆر نزمتر. ئەم تێکەڵەی (IOU) وەکان و ئاڵوگۆڕکردنە، " ئابووری چاکی " ڕووسیا، خزمەتی کرد وەك سیستەمی هاوکاری ژیان بۆ ئەو پرۆژە قەبەو گەورانەی کە کۆمۆنیست دروستی کردبوو.

چینیش ئەزموونی ئەم جۆرە بەرزبوونەوەیەی بینی، بەڵام ڕێگایەکی تری دۆزییەوە بۆ پاڵپشتی ئەو پرۆژانەی کە دەوڵەت خاوەنیان بوو و بێ قازانج بوون. دانیشتوانی چینی لە ڕێژەیەکی بەرزدا خەزن کرا. گەنجینەکانی چووە نێو بانقە گەورەکانی دەوڵەت، هیچی تر بەردەست نەبوون، کاتێ بەرژەوەندی مامناوەندی دا بۆ ئەوان. بانقەکان بوون بە کەناڵی پرۆژەکانی دەوڵەت، کە دەیانتوانی بەردەوامی بدەن بە کار و دامەزراندنی ژمارەیەکی زۆری کرێکاران. دواخستنی دانی ئەم خەرجیانە شیکردنەوەی چەواشەکاری ئابووری چینی لەخۆ گرتبوو، بەڵام لاینەبردن. بە هەقیقەت، ئەو چەواشەکاریانە زیاد کرد. لەکاتی هەردوو دەیەی چاکسازی ئابووری دەوڵەتی خاوەن کەرت گەشەی کرد لە بڕی ئەوەی لە ناوبچێت.

هەرکە گەنجینەی زیاتری چینی چووە نێو چالاکی نەزۆرکی ئابووری، کەمتر بەردەست بووت بۆ کەرتی تایبەت، ئەمەش ڕێژەی گەشەکردنی هێنا خوارەوە. لەبەرئەوەی بایەخەکان سەرمایەیان وەردەگرت بە قازانج نەبوون، نەیاندەتوانی قەرزەکانی خۆیان بدەنەوە، کە مانای ئەوەبوو بانقەکان فەشەل دێنن گەر خەزنەدارەکان بە ژمارەیەکی زۆر داوای پارەی خۆیان کردەوە. ئەوە لە بەرابەردا، بەرەبستێك بوو بۆ دامەزراندنی سیستەمێکی مۆدێرنی دارایی لەگەڵ دام و دەزگاکان کە بتوانێت مونافەسەی بکات لەگەڵ بانقەکانی دەوڵەت بۆ گەنجینە نێودەوڵەتییەکان.

لە سەنتەری کاروباری سیاسی چینی و ڕووسیدا لە سەرەنجامی جەنگی ساردا پێویستی بە کەمکردنەوەی کەرتی مشەخۆری ئابووری بووو ئەنجامدانی ئەم کارەش ئاستەم بوو. ئاستەم بوو نەك تەنها بۆ ئەو دوو حکوومەتە، بەڵکو بۆ هەموو حکوومەتەکانی سەرانسەری وڵاتانی دەرەوەی جیهان، ئەوەش پرسیاری ئەوەی قوت کردەوە ئایا ئەوانەی کە بە دیموکراسی هەڵنەبژێردراون و بە دیموکراسیش حیساب نەکراون باشتر شوێن کراون بۆ نانی هەنگاوی

پێویست، چونکە کەمتر گوماندار بوون بۆ فشاری گشتی لە چاو ئەوانەی حوکم دەکران بە پێـی بنەما لیبراڵییەکان.

مێژووی تیۆری لیبراڵ ئەوە دەخاتە ئەستۆ کە بازاڕی ئازاد هانی دامەزراندنی سیستەمی لیبراڵی سیاسی دەدات، بەڵام ئەمە مەسەلەیەکە مشتومڕ هەڵدەگرێت ئایا سیاسەتە دیموکراسییەکان، هەرکە دامەزران، ئاراستەی ئەوەی هەبوو بۆ خستنەڕووی کاری کاریگەری بازاڕ. سوودمەندەکانی چەواشەکاری ئابووری نیازی پاراستنی ئەوانی هەیە و سیستەمێکی دیموکراسی سیاسی هەلی ئەوەیان پێ دەبەخشێت بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە بە کراوەیی و شەرعیانە و یاساییانە، هەروەها زۆرجار بەسەرکەوتووییش. بە پێی تێپەڕبونی کات، کۆمەڵگا دیموکراسییەکان نیازیان کۆکردنەوەی ئەو گروپانە بوو، وەك ئەو خێرایی ژمێرانەی سەر کەشتی کە خێرایی کەم دەکەنەوە.

بەڵگەی سەبارەت بە پەیوەندی نێوان گەشەی دیموکراسی و ئابووری ئاکامگیرە، بەڵام هیچ هۆیەکی مەنتقی نییە بۆ باوەڕکردن کە حکوومەتە غەیرە لیبراڵییەکان باشترن لە کەمکردنەوەی چەواشەکاری ئابووری لە وڵاتانی لیبراڵی ناوەوەی جیهان. ڕژێمە غەیرە دیموکراسییەکان تۆماری بێ خەوشیان نییە لە بێ ئەقڵی بنەمای بازاڕی ڕژێمەکانی نالیبراڵی کۆمۆنیستی سەدەی بیستەم، چونکە بازاڕیان سەرکوت دەکرد، خراپترین سەرکوتکەرانی جیهان بوون لە بەشداریکردنی چەواشەکاری سیاسەت ئابوورییەکان. وێڕای ئەمە، گەر کەمی بەرپرسیاریتی ڕەنگی سیاسەتی ئابووری حکوومەتە غەیرە دیموکراسییەکان سەربەخۆ بکات، نەقوسانی شەرعییەتی ڕەنگە کاریگەری دژیان دەبێت. لە هەوڵێکدا بۆ بردنەوەی لێبووردنی گشتی حکوومەتە کۆمۆنیستەکانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات و ناوەڕاست تۆڕی سەلامەتی کۆمەڵایەتی باشتر دروستکرد لەوانەی ڕۆژئاوا، کە لەگەڵیدا جێگرەوە لیبراڵییەکانیان لەمپەریان لە بەردەم بوو لە ١٩٨٩.

لە ئەورووپای دوای کۆمۆنیستدا، لەو شوێنەی کە سەرکەوتنی ئابووری گلا لەگەڵ هەڵکردنی چەواشەکاری ماوەی کۆمۆنیست، سەرکەوتووترین وڵات دیموکراسیترین وڵات بوو. ڕەنگە ئەو خەڵکە بێت زۆر خۆشیان بەوە بێت بۆ پەسەندکردنی ئازاری کۆمەڵایەتی چاکردنەوە بکەن، گەر شتێکی خودکار بێت، واتە، سەپێنراو بێت لە لایەن ئەو حکوومەتەی کە ئەوان هەڵیان بژاردووە دەتوانێت بە پێی دیموکراسییەت لای ببەن. هەروەها هەتا گەر حکوومەتە





غەیرە دیموکراسییەکان بە ڕێکەوت بتوانن مامەڵە باشتر لەگەڵ چەواشەکاری ئابووری و سیستەمی سیاسەتی لیبراڵییەکان بکەن لەچاو دیموکراسییەکان کاریگەرترن لە سەرکەوتن بەسەر هەردوو بەربەستە سەرەکییە گەورەکە بۆ بازاڕێکی باش و مکوم و پتەو. ئەمەش لەبەر نەبوونی دەزگای پێوست بۆ ئەم کارە و بوونی گەندەڵی.

لە سەدەی نۆزدەدا لە، وڵاتانی ناوەوەی ئەورووپا، ڕژێمە تەقلیدی و هەتا نیمچە لیبراڵییەکانیش لە ژێر فشاری بوون بە ناشەرعییەوە هاتن، چونکە ئەوان بە شێوەیەکی ئەوتۆ لیبراڵ بوون، حوکم دران هەروەك خۆیان لە ڕۆژهەڵات لە لایەن مەلیکەکان و لە ڕۆژئاواش لە لایەن پەرلەمانەکانەوە کە هەڵبژێردران لە لایەن لایەنی بچووکی دانیشتوانی هەرزەکار. لە سەدەی بیست و یەکدا، لە وڵاتانی دەرەوەی جیهاندا، شەرعییەتی سیاسی بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ پشتی بە لیبراڵیزمی ئابوورییەوە بەستا. ڕاستەوخۆش پشتی بە بەرهەمی ڕەفاهییەت بەستا، کە مانای فراوانکردنی هۆکاری گەیاند بۆ کڕیاری شتەکان و پێوەرێکی ستاندەردی ژیان. لە سەرەنجامی جەنگی ساردا، ڕەفاهییەت پێدەچوو تەنها بەهۆی ئابووری بازاڕێکی ئەتۆ و بەگەڕ بێتەدی. ئابووریی بازاڕ ئەوەبوو کە زۆربەی وڵاتانی خاوەن سەروەری دەرەوەی وڵات هەوڵی بونیاتنانیان دەدا.

ئەمە لە هیچ شوێنێك پرۆژەیەکی بێ ئازار نەبوو، بەڵام لە هەموو شوێنێك هەبوو، لە یەکەم نموونەوە، ئابووریی بازاڕ شتێکی تایبەت و تەنها بوو. دروستکردنی دام و دەزگا و کۆنترۆڵکردنی گەندەڵی و کەمکردنەوەی چەواشەکاری کەوتنە خوار لەگەڵ ململانێ و بەرپرسیارێتی حکوومەتە تاکەکان، بەڵام دروستکردنی بازاڕی ئازاد، سەرەتای بەرپەرچی زنجیرەیەك باش بخرێتە ڕوو لە لایەن مێژووی تیۆری لیبراڵ، بوعدێکی نێودەوڵەتیشی هەبوو.

## بەربەستێکی زێڕین لە بەردەم پێشکەوتن

جیهان کاریی لە پراکتیز و سیاسەتە ئابوورییەکانی تاکی وڵات کرد لە کاتی ستایش کردن : لە ڕێگای نموونەوە. لە داڕشتنی سیستەمە سیاسییەکان لە سەدەی بیست و یەکدا پرۆسەی پەخشکردنی کەلتووری لە کاردا بوو. خەڵك و حکوومەتەکانی دەرەوەی جیهان سەرەنجی ئابووری وڵاتانی ناوەوەی جیهانیاندا، بە ئارەزووەوە سەرسام بوو، هەروەها نیازی

دووبارەکردنەوەی ئەوانەیان هەبوو کە بە چاوی خۆیان بینیان، بەڵام جۆرە کاریگەرێکی تر لە کاردا هەبوو. کاروباری ئابووری، وەك ئاسایش، بەڵام بە پێچەوانەی حوکمی ناوخۆ، بە سروشت نێودەوڵەتیی بوون هەروەهاش لە بواردا ناوخۆ بوون.

لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا وڵاتانی ناوەوەی جیهان نەك هەر تەنها زنجیرەیەك پێکهاتەی ئابووری لیبراڵ بوون لە نێو سنووری وڵاتانی خاوەن سەروەری، بەڵکو سیستەمێکی ئابووری نێودەوڵەتی لیبراڵیش بوون کە پێکەوەیان گرێدەدان، بەشداریکردن ئاڕاستەی بەرەو سیاسەتەکانی پراکتیزەکانی ئابووری لیبراڵیّ بەهێز کرد لە ناوخۆدا. هەروەها لە سەرەنجامی جەنگی ساردا، گرێدان بە ئابووری جیهانی لیبراڵ شتێك بوو کە بە باشی هەموو وڵاتێکی دەرەوەی جیهان بە نیازی بوون.

ئەمە گۆڕانێکی خستەڕوو. لە زۆربەی سەدەی بیستەم بۆچوونی زاڵ لە وڵاتانی دەرەوەی جیهان بۆ سیستەمی ئابووری نێودەوڵەتی زاڵی ڕۆژئاوا، هەروەها بۆ گرێدانی ئابووری لەگەڵ وڵاتانی ناوەوی جیهان، ئیختیاری هەبوو لە هەستی خراپ و باش بۆ دوژمنکارییەکی تووڕە. وڵاتە کۆمۆنیستەکان بۆ زۆربەی بەشەکان خۆیان داخست لە تەواوی دیکەی وڵاتانی جیهان. وڵاتانی تر لە دەرەوەی وڵاتانی ناوەوەی جیهان وا ئەوتۆ هەمەجۆر نەبوون، بەڵام گەلیّ لە بەرەبەستەکانییان ڕەقتر کرد دژی ئەو بەرهەمانەی لە هەموو شوێنێك وەبەرهاتبوون و سەرمایەی بێگانەی پێشوای لیّ نەکراو بوو، ڕەچاوگرتنی وەك ئالییەتێکی یاخیگەرانە و کۆنترۆل بوو، بەردەوامی هەڵقۆزینەوەی ئیمپریالی بەهۆکاری تر بوو. لە کۆتایی سەدەکە هەستی زاڵ شوێنی خۆی گرت. ئابووریی بازاڕ وای لێهات وەك کلیلێك سەیر دەکرا بۆ ڕەفاهییەت کە هەردووکیان ویستراو بوون بۆ خاتری خۆی و پێویستی بۆ سەقامگیری سیاسی، هەروەها بەشداربوون لە بازاڕە نێودەوڵەتییەکان بۆ شتەکان و سەرمایە وای لێهات بوو بە بەشێك و پاشکۆی بەکاربردنی سیستەمی بازاڕ بێت.

بەرهەمی دەستکردی بێگانان ویستراو بوو، چونکە کڕیارە ناوخۆییەکان دەیانویست. سەرمایەی بێگانە زەروور بوو بۆ وەگەڕخستن کە گڕی لە گەشەی ئابووری بەردا لەو وڵاتانانەی ڕێژەی گەنجینەیان کەم بوو. هەتا لەو شوێنەی گەنجینەکان بەرزبوون، وەگەڕخستنی بێگانە تەکنەلۆژیا و تەکنیکی ئیداری هێنا کایەوە لە سەر ئاستی ناوخۆ بەرجەست نەبوو.



خۆزگەی بڵاوبوونەوە لە وڵاتانی دەرەوەی جیهان بۆ بەشداریکردن لە بازرگانی زاڵی ڕۆژئاوا و سیستەمی پارەداری سەرەنجامی خۆیان هەبوو بۆ سیاسەتی بێگانەی خۆیان. غەریزەیەکی دروستکرد بوو بۆ سیاسەتەکان کە دەبووە لەمپەر لە بەردەم هۆکار بۆ ئابووری نێودەوڵەتی، وەك خێزانێك بە هەندیّ باردا دەڕوات و ناهێڵێت کارەباکەی ببڕێت. ڕووسیا و چین سنووردار بوون، هەرچەند بە هەمەجۆری قەدەغەنەکرابوون، لە هێرشکردنی دراوسێکانیان لە لایەت خەمێك بۆ سەرەنجامەکانی ئابووری نێودەوڵەتی بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە. ترس لە دابڕانی بازرگانی و سەرمایەی بازاڕی جیهانی هۆیەك بوو کە حکوومەتی چینی سیاسەتێکی بە گشتی هۆشیارانە پەیڕەوکرد بەرەو تایوان. هەر سەرکردەیەك لە بێجینگ نیازی وەرگرتنی کۆنترۆلی دوورگەی هەبوایە بە هۆی هێزەوە دەبوایە کاریگەری جەنگ هەڵبسەنگێنێت لە کەناڵی تایوان لەسەر پەیوەندییە ئابوورییەکان لەگەڵ وڵاتانی ناوەوەی جیهان و لە سەر بۆچوونەکانی بۆ گەشەی ئابووری چین، کە لە سەریدا سەقامگیری سیاسی وڵات و شەرعییەتی سیاسی حیزبی کۆمۆنیست وای لێهات زۆر بە زەحمەت پشتی پیّ ببەستێت. ئەمە بە هیچ وەرنەدەگیرا لە سەردەمی ماودا.

هەروەها سەرەنجامی هەبوو بۆ کاریگەری بونیاتنانی بازاڕ. بۆ گەشتن بە سوودی جیهانی پێویستی بە جۆرە پلاکێکی بەهێز هەیە. پراکتیزو دام و دەزگا ئابوورییە لیبراڵییەکان لە ماڵەوە پێویست بوون بۆ سوود وەرگرتنی سیستەمی ئابووری جیهانی لیراڵ. حەزی بەشداریکردن لەو سیستەمە، هەروەها خستنەڕوو بۆی، کاری کرد وەك هێزەکان بۆ پێکهاتەی سیستەمی ئابووری لیبراڵ لە ماڵەوە.

بازرگانی، یەکێك لە هەرە چالاکییە کۆنەکانی مرۆڤ، پێش چاخی مۆدێرن گەورەترین بەربەستی لە پێشدا بوو، بۆیە کاریگەرترین میتۆدی پەخشی کەلتووری بوو. سەرچاوەیەکی بەهێزیشە بۆ پراکتیزی باش و هێزێك بۆ بەکاربردنی پێشکوتووترینیان، هەروەك مارکس و ئێنگڵس لە خوارەوە سەرەنجیان داوە:

*بۆرژوازییەت، بە هۆی چاکردنی خێرای هەموو ئالییەتەکانی بەرهەمهاوردە، بە هۆی تۆماری ئاسانکراوی زۆر گەورەی پەیوەندیکردن، هەموو نەتەوەکان هەتا زۆربەی بەربەرییەکانیش کێش دەکاتە نێو شارستانیەت. نرخی هەرزانی کەل و پەلەکانی جبەخانە قورسن کە لەگەڵیدا هەموو دیواری چین دەڕوخێنن، کە لەگەڵی داوا لە بەربەرییەکان دەکات بە*

*چڕی سوور بێت لە ڕقی بێگانەکان بۆ ملکەچ بوون. هەموو نەتەوەکان ناچار دەکات، لە سەر ئازاری ئیبادە و مردندا، مۆدی بۆرژوازی بەرهەم هاوردەی بەکاربرد، ناچاریان دەکات بۆ پێناسکردنی ئەوەی پێی دەڵێن شارستانیەت بۆ سەنتەری خۆیان، واتە، خۆیان ببەن بە بۆرژوازی. لە یەك وشەدا، جیهانێك تایبەت بەخۆی دروست دەکات.*

ئەو وشانەی جێبەجێدەبن لە سەدەی بیست و یەك بە قەد سەدەی نۆزدەدا. بازرگانی ململانێ دەهێنێتە کایەوە و ململانێش هێزێکە بۆ توانستی ئابووری. بەرهەم هاوردە بەرز دەکاتەوە بە هۆی زۆری لێکردنی دەزگا ناوخۆییەکان بۆ بەکاربردنی کاریگەرترین پراکتیزە بەردەستەکان، کە ئەمەش کلیلێکە بۆ بەرهەم هاوردە. لە سەر ئاستی ناوخۆ بەرهەمی هێنا کایەوە یان ئەوەتا هاوردە لە نرخ بگونجێت و یەکسان بێت یانیش ئەوەتا فەشەل بێت بۆ دۆزینەوەی کڕیارەکان، زۆری لێکردنی بەرهەمهێنەرانی خۆیان لە دەرەوەی بازرگانی. بۆیە بازرگانی بارێکی هاوسەنگ کەرە، هەروەها ناچاری ڕاستکردنەوە دەکات بۆ شێواندنی ئابووری. بۆ ئەم هۆیەش، هەندێ حکوومەت نیشانەیەکی ڕێکەوتنی بازرگانی لابردنی هاوردەی بەربەستەکان بە دەقیقی ڕازی دەکات تاوەکو فشار بهێنێت لە سەر پیشەسازی کەم و پراکتیزە نالیبرالّییەکان.

ئەندامێتی مەکسیکۆ لە کۆمەڵەی بازرگانی ئازادی ئەمریکای باکوور و بڕیاری چین بۆ پەیوەندیکردن بە ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی (WTO) ڕەنگە وەك کاریگەری حکوومەتەکانی خۆیان و بەرپرسە مێشك لیبراڵەکان لە نێو حکوومەتەکانی خۆیان، بۆ هاوپەیمانی خۆیان لەگەڵ هێزە نێودەوڵەتییەکانی لیبراڵیزمی ئابووری سەیر بکرێن. هەردووکیان وێڵ بوون بە دوای لیستکردنی جبەخانەی بێگانە بۆ داڕوخانی بەربەستەکان بۆ ئابووریی بازاڕی کاریگەر کە ناتوانرێت لابرێت لە ڕێگەی هێزە سیاسە سنووردارە ناوخۆییەکان. یاساکانی WTO پێویستی بە بەربەستە نزمەکان بوو کە چین بەرزی کردبۆوە بۆ پاراستنی کشتوکاڵ، شت دروستکردن، هەروەها دارایش، ململانێ کۆمپانیا چینییەکان ناچار دەکات تا بە پێی پێوست بن و فشار زۆر بکەن بۆ کۆتایی هاوکاری حکوومەت بۆ ئەوانەی کە بە پێی پێویست



نین.(*) ئەندامێتی WTO یش سەلاحییەتی ئەوەی هەبوو کار لە ڕێکخستنە سیاسییە ناوخۆکانی چین بکات، لەبەرئەوەی پێویستی بەوە هەبوو کە بازرگانی نیزام بکرێت بە هۆی باجدان و چاودێری بکرێت بە هۆی دەزگایەك کە کۆماری گەلی چین نەقوسانیان هەبوو: سیستەمێکی قەزائی سەربەخۆ.

هاوردەی سەرمایەش کاریگەرییەکی لیبراڵی بوون مەشق دەکات. بانقەکان دەتوانن مومارەسەی هێزی بەرچاو بکەن بەسەر قەرزدارانەوە. کاتێ کۆمپانیاکان پێویستیان بە قەرز هەیە بۆ مانەوە، بانقەکان بە گشتی سووردەبن لە سەر ئەوەی کە هەنگاو بنێن بۆ ئەوەی وا کار بکەن قازانج زیاتر بکەن. IMF، کار بکات وەك بانقێك بۆ ئەو وڵاتانەی لە ڕووی داراییەوە ڕووتێنراون، زۆرجار سوورن لە سەر گۆڕانەکان لە سیاسەتە ئابوورییەکانی ناوخۆی وڵات وەك مەرجەکان بۆ قەرزەکان. زۆرجار ئەمانە کەم و کوڕی بودجەی نزم دەگلێنن، کە لە بەرابەردا پێویستی بە کەمکردنەوەی چەواشەکاری هەبوو لە ئابووری. بە ڕێکەوت IMF زۆرتر ڕۆیشت، سوور بوو لە سەر ئەو گۆڕانانەی کە باسی لە بەرەبەستەکانی تر دەکەن بۆ کارکردنی ئابووریی بازاڕ بە ڕێکی. گەنجینەکە ڕەتی ئەوەی کردەوە بۆ درێژکردنەوەی قەرز بۆ کینیا تاوەکو

---

* لە وڵاتانی ناوەوەی جیهان و یەکێتیی ئەوروپادا کاریگەرییەکی هەمان شێوەی لیبراڵی کردن هەبوو. یاساکان بۆ بەشدار بوون لە دراوی گشتی یۆرۆ، وای لە حکوومەتەکان کرد کەم و کوڕی بودجەی نزمی خۆی کەم بکاتەوە، چەواشەکاری ئابووری زۆربەی دەبووە هۆی ئەمە. ئیتاڵیا نموونەیەك بوو. ڕەنگە کاریگەترین نموونە یەکێتیی ئەوروپا کاریگەری لیبراڵیێ بوون، خاڵی وەرچەرخانی فەڕەنسی سیاسەتی ئابووری بوو لە سەرەتای هەشتاکان. بەرپرسە فەرەنسییەکان گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە بەردەوامی ئەو سیاسەتانەی کە فرانسۆ میتران خستیەڕوو وڵات ناچار دەکات لە دەرەوەی سیستەمی پارەی ئەوروپی، پێشینەی یۆرۆ، ئەندامێتی لە ناویدا پاڵپشتی بۆ پرۆژەیەکی دروستکردنی ئەوروپای یەکگرتوو بکات. بۆیە میتران دەبوایە لە نێوان سۆشیالیزم و ئەوروپا یەکێکیان هەڵبژێرێت. ئەوروپای هەڵبژارد.

ئەندامێتی یەکێتیی ئەوروپا قووڵترین کاریگەری هەبوو لە سەر ئیسپانیا و ئێرلەندا، دوو وڵات لە ئەوپەڕی ئەوروپای ڕۆژئاوابوون کە سەرنجیان درابوێ، بۆ یەکەم دوو سێیەکی سەدەی بیستەم، هۆی سەرەکی بۆ پاشەکشەی ئابووری شەڕی ناوخۆ و کۆچکردن بوون.. هەروەك یەکێتیی ئەوروپا خۆیان گواستەوە، لە دواهەمین سێ دەیەی سەدەکە، بۆ دەوڵەتی نەتەوەیی مۆدێرن بەئاشتی و ڕەفاهییەتی ئەوروپی.

حکوومەتی کینیا یاسایەکی دژە گەندەڵی پەیڕەو نەکرد بە نووسراو بە پێی تایبەتمەندییەکانی IMF.

لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا، لێشاوی تایبەتی سەرمایە لە ناوەوەی جیهان بۆ دەرەوەی جیهان بە شێوەیەکی بەرچاو قەبارەی قەرزو بەخشینەکان لە حکوومەتەکان و دەزگای دارایی نێودەوڵەتی زۆر کرد، هەروەها وڵاتەکانی دەرەوەی جیهان ململانێیان لەگەڵ یەکتر کرد بۆ کێشکردنی ئەم سەرمایە تایبەتە. ململانێ بۆ وەگەڕخستنی تایبەت جەختی کردەوە لە سەر پێشەنگترین بەربەستی بازاڕێکی بەکار و نەبوونی حکوومەتێکی بەهێزکردنی یاسا. بێگانەکان خۆشحاڵبوون بۆ دانانی پارە لە وڵاتان کە تیایدا نەیاندەتوانی دڵنیا بن لەوەی کە دەبێ دڵنیا بن، ئەو زەمانە پێوستی بە حکوومەتێك بوو بتوانێن مافی موڵکایەتی پاراست. نە بێگانەکانیش حەزی لە وەگەڕخستن بوو بۆ سەرمایە هەروەها فشاری دروستکرد بۆ سیاسەتە سنووردارە بەهێزەکان، کە پێوستی بە هێرشکردنی چەواشەکاری ئابووری دەبوو، ئەرك بۆ هاوکاری ئەو چەواشەکاریانە بیرۆکەی بەرزی بەخشی بە بەرزکرنەوەی دراوی ناوخۆ، هەروەها بەرزبوونەوە لە بەرابەردا بەهای وەگەڕخستنی بێگانەی داماڵی.

بەکاربردنی سیاسەت و پراکتیزە ئابوورییەکان پێویستیان بە کێشکردنی پارە لە دەرەوە یەکسان بوون لە بەرکردنی، ئەویش دەستەواژەیەك داتاشرا لە لایەن " تۆماس ئێڵ فریدکان"، بەربەستێکی زێڕین لە بەردەم پێشکەوتن" پێکەوە ئەو پێوەرانە ژوورێکی بچووك پێشکەش بکەن بۆ مانووڤەر لە سیاسەتی ئابووری. گۆڕانی یان تەعدیلکردنیان حکوومەتەکانیان ئازادتر دەکرد بۆ کارکردن، بەڵام هەروەها ئەوانەشی کە حوکمی دەکردن هەژارتری دەکردن، لەبەرئەوەی سەرمایەی دەرەوە دووبارە ئاراستە دەکرایەوە بەرەو ئەو وڵاتانەی خۆشیان بەوە دەهات کە بژین لەگەڵ سنورداربوون.

بەربەستێکی زێڕین لە بەردەم پێشکەوتن پێویست بوو بۆ کێش کردنی وەگەڕخستنی ڕاستەوخۆی دەرەوە، وەگەڕخستن لە خاوەنێتی خاك، ڕووەك و ئامێرەکان تا بەشی یەکسان. وەگەڕخستنی ڕاستەوخۆ هێرشی کردە سەر چەواشەکارییەکان لە لایەن پێشکەوتنەوە. سەرەڕای ئەمە، هێرشی کردە سەر وڵاتانی کەلتوور کە تیاید چەواشەکاری ڕوویدا. وڵاتانی خاوەن ڕووەك و کارپێکردنی بوون بە دوورگەی مۆدێرن و توانست. پراکتیزی ئابووریان فەرامۆشکرد. مووچەو



پێوانەکانی کرێکار لەو کارگانەی ئەمریکا خاوەنیانە لە باکووری مەکسیکۆ بەرزتربوون لەوانەی لە سەر ئاستی ناوخۆ خاوەن ڕووەك بوون لە هەر شوێنێکی تر لە وڵات.

ڕێستورانتەکانی هەمبەرگری ماکدۆناڵد کە لە هەموو شوێنێکە، نیشانەکانی بەم دواییەی سەدەی بیستەمی حازربوونی ئابووری ئەمریکا لە سەرانسەری جیهان بوو، لەوە گونجاوی هەڵگرانی نەریتە سیاسی و کەلتووریەکانی ڕۆژئاوا لە تەقلیدی موژدە بەخشەکان و هەتا یاسای ئیمپریالین. بە ڕێستورانتە سەلامەت و خاوێنەکانی کە خەڵك دەیتوانی کاتیان تێدا بەسەر ببات، هەروەها بازاڕەکەی و کارمەندی لێهاتوو، ماکدۆناڵد توانی بیرۆکەی ڕۆژئاوا خزمەتگوزار بکات بۆ چین. زنجیرەی ڕێستورانتەکە ئایدیای ستایشکردنی لەدایکبوونی منداڵ بناسێنێت بە وەجبە خواردنێکی ڕێستورانتەکە بە کۆمەڵێ دیاری، ئەمە دزەی کرد بۆ نێو کەلتووری چینی دوو بەها لە دڵی سیاسەت و ئابووریە لیراڵیەکان: تاکگەرایی و عوتلە کەسێکی تەقدیر کرد زیاتر لە نەتەوە یان حیزبێك، هەروەها خواردن و خواردنەوەش.(*)

یەکێك لە هەرە موڵکە گرینگەکانی مێژووی تیۆری لیبراڵ، هەروەها ئەوەی هاوبەش بوو لەگەڵ مارکسیزم قەدەغە ناکرێت. نەك هەر تەنها لە مێژوودا بە ئاڕاستەی لیبراڵ دەڕوات، نەك

(*) کۆکا کۆلای گرێدراو بە ماکدۆناڵد وەك یەکێکە لە هەرە شتە بینراوەکانی ئەمریکی لە جیهان. بەم شێوەیە، هەردووکیان بابەتی ناڕەزایی بوون: کۆکا کۆلا قەدەغەکرا لە لایەن حکوومەتی هیندستان لە حەوتاکان، ماکدۆناڵدیش لە فەڕەنسا هێرشی کرا سەر لە نەوەدەکان. هەرچەند، جیاوازی هەبوو لە نێوان هەردووکیان. کۆك ماددەیەکی نارکۆتی تێدابوو لەوەی کە سەرچاوەی ساردی بێت. هەمبەرگری ماکدۆناڵد ڤیتامینی زیاتر تێدا بوو لەوە کە چێژی بە زۆربەی خەڵك لە زۆربەی وڵاتانی دەوەرەی جیهان دەبەخشی، هەروەها ئەو خزمەتانەی کە ڕێستورانتەکان پێشکەشیان دەکرد بە شێوەیەکی نەزانراو بوون. کۆکا کۆلا یەکەم جار لە جیهان بڵاو بۆوە لە لایەن سوپای ئەمریکی لە جەنگی جیهانی دووەم. گەشەی جیهانی ماکدۆناڵد هەمان کات بوو لەگەڵ ئامادەبوونی سەربازی ئەمریکا. کۆك هاوکێشەکەی جیا بوو بۆ تامێکی شیرینی هەبوو لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، بەڵاك ئەوەی ماکدۆناڵد بەهێزترو ڕێکخراوتر بوو. لە شاری بۆمبێی هیندی، بۆ نموونە، کرێی بنەڕەتی ماکدۆناڵد گۆشت نەخۆر بوو. بێ شك موبالەغە دەبێت بۆ ئەوەی بە کۆك بڵێی بەرهەمێکی نالیبراڵ و بە هی ماکدۆناڵد لیبراڵ، بەڵام حاڵەتێکە کە چین پێش چاکسازییەکان پێشوازی لە کۆك کرد، یەکێتیی سۆڤیەتیش ڕکابەری کۆك و ماکدۆناڵدی، پێپسی کۆلای ڕاگەیان، لە سەردەمی بریژنێڤ، کاتێ ماکدۆناڵد چووە نێو ڕووسیا و چین تەنها پاش چاکسازییەکان لە هەردوو شوێندا دەستی پێکردبوو.

هەر تەنها شتی باش دەکات پێکەوە بڕوات، بەڵام ئەوە ڕوودەدات لە وڵاتانی دەرەوەی جیهان بەبێ کۆششی هەر وڵاتێك لە سەر بەشی جێبەجێکەرانی لیبراڵیزم لە وڵاتانی ناوەوەی جیهان. حکوومەتەکان هەوڵی خۆیان دەخەنە گەڕ بۆ بونیاتنانی ئابووریی بازاڕ، چونکە ئەم جۆرە ئابووریانە، بەخۆیان بە تەنها، ڕەفاهییەتی باش دەکەن. ڕەفاهییەت مەرجێکی دوای جەنگی سارده بۆ شەرعییەتی سیاسی، شەرعییەت گرینگە بۆ مانەوە، هەروەها هەموو حکوومەتێك، وەك هەموو جۆرە بوونەوەرێك لە گۆڕمەی گەشەی سروشتی، وێڵە بە دوای مانەوەدا. پراکتیزەکانی ئابووری لیبراڵ بەشدار دەکەن، بە هەندێ ڕێگا داواکراو، ڕێگایەکی سیاسی لیبراڵیێ گەرەکە.

بازاڕ بەرهەم وەبەر دەهێنێت، هەروەها خۆی لە ڕێگەی دیموکراسییەوە بەرهەم دێت. وڵاتە دیموکراسییەکان ئارەزوویان زیاترە لە وڵاتە غەیرە دیموکراسییەکان بۆ پراکتیزەکردنی سیاسەتەکانی دەرەوەیان بەئاشتی، هەروەها بە تایبەتیش لە ئامێزگرتنی بنەماکانی ئاسایشی گشتی. هەشت دەیە دوای کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم، کەواتە، جیهان بەرەو جۆرەکانی سیاسەتی ئابووری و ئاسایشەوە دەچوو کە بنەمای پرۆگرامی نێودەوڵەتی چاکسازیان پێکهێنا کە ودرۆ ویڵسن پێشکەشی کرد لە پاریس.

بەڵام هەتا گەر ئەم زنجیرە هۆیە ماقوڵ با، هەتا گەر هەموو بۆچوونەکان کە پێکی دەهێنن ڕاست بوون، یان بەلانی کەم ماقوڵ بوون و بە فراوانی جێبەجێ دەکرا، کێشەیەك هەبوو لەگەڵ یەکەمیان، کێشەیەك کە کۆششێکە و پێویست بوو لە لایەن وڵاتانی ناوەوەی جیهان بۆ باس کردن. هەموو حکوومەتەکان ڕەنگە خۆزگەی ئەوە دروستکردنی ئابووریی بازاڕ بخوازن، هەروەها ڕەنگیشە هەوڵی بونیاتنانی بدەن، بەڵام زۆربەی، هەتا لەگەڵ باشترین ئیرادە لە جیهاندا، دووچاری ئاستەنگی زۆر بوونەوە لە ئەنجامدانی ئەم کارە. سەرچاوەیەکی سەرەکی بۆ زاڵ بوون بەسەریاندا، سیستەمی ئابووری لیبراڵی نێودەوڵەتی بوو، هەروەها ئا لێرەدا بوو کە بەرپرسیارێتی پاڵپشتکردنی ئەگێندەی لیبراڵی جیهانی کەوتە سەر وڵاتانی ناوەوەی جیهان، چونکە سیستەمی ئابووری نێودەوڵەتی دروستی کردبوو، هەروەها درێژەپێدانی بەرپرسیارێتی بوو، دروستکردنی وڵاتی بەهێز و ڕەفاهی و لیبراڵی ناوەوەی جیهان بوو، بە تایبەتی بەهێزترینیان، کە ویلایەتە یەکگرتووەکان بوو.



## چاپتەری -١١-

## سوودێکی جیهانی

کاتێ هێوربوونەوەکەی پاش جەنگی جیهانی یەکەم فەشەلێکی شەخسی بوو بۆ ودرۆ ویڵسن، کە تەنانەت نەیتوانی قەناعەت بە وڵاتەکەی خۆیشی بهێنێت بۆ پەیوەندی کردن بە عوسبەتول ئومەم، کاری بۆ ڕێکخستنی کردبوو، هەروەها کارەساتێکیش بوو بۆ جیهان بە گشتی، چونکە دوو دەیە دواتر ویڵسن تۆوی جەنگی جیهانی وێرانکەریشی دوورییەوە.

جۆن ماینارد کینس کە بەشداریکرد لە کۆنفرانسی ئاشتی پاریس وەك بەشێك لە شاندی بەریتانی، خەوشی کوشندەی هێورکردنەوەکەی دیاریکرد. نەخشە ڕێژکرا بوو بۆ سزادانی هێزە دۆڕاوەکان کەمتر لەوەی مەرجەکانی هاوکاری ئابووری بەهێز بکات کە تیایدا هەمووی ئەورووپا پێشبکەوێت. کلیلێك بۆ ڕەفاهییەت بزووتنەوەی ئازادی شتەکان بوو لە نێو سنوورەکان، شتێك کە ئاشتی پاریزان بە جدی هەوڵی دامەزراندنیان نەدا. لە ئیدانەکردنە گاڵتەجارییەکەی هێوربوونەوەدا " سەرەنجامەکانی ئابووری ئاشتی" لە ساڵی ١٩٢٠ بڵاوکراوە، کینس دەنووسێت: لە ڕژێمێکی بازرگانی ئازاد و تێکئالانی ئابووری ئازادا دەبێتە سەرەنجامێکی بچووك کە پۆڵا دەکەوێتە بەشێکی سنووری سیاسی و کرێکار، خەڵوزیش وەك بڵێسەکانی بەلاکەی تردا دەتەقێتەوە، بەڵام هەروەك خۆی، پیاوان ڕێگای هۆکاریان هەبوو بۆ هەژارکردنی خۆیان و ئەوانی تر، پەسەندی دوژمنکارییەکی دەستە جەمعی دەکەن بۆ دڵخۆشییەکی تاکرەوی.

بیست و پێنج ساڵ دواتر، لە کۆتای جەنگی جیهانی دووەمدا، هەتا دوژمنکارێکی بە کۆمەڵی دڕندانەتر، دەسەڵاتە براوەکان چانسی دووەمیان هەبوو بۆ دانانی بنەماکانی ڕەفاهییەت و دواتریش ئاشتی. ئەم جارە بە دوای ڕاوێژکاری کینس کەوتن، لە هیچ بەشێکی بچووکیشیان پشتگوێ نەخست، چونکە خۆی بەشداری لە دانووسانێکی گرینگ کرد. سیستەمێکی ئابووری نێودەوڵەتیان دروستکرد لە سەر بنەما لیبراڵییەکان کە بەسەرکەوتوویی

کاری کرد بۆ ئەوانی تری سەدەی بیستەم و بۆ نێو سەدەی بیست و یەك. ئەم یاساو دامودەزگا لیبراڵیانە و هەروەها گەشەی ئابووری بەرچاو و گرینگ کە ئەوان پەرەیان پێدا، ڕۆڵێکی کاریگەری گێڕا لە سەرکەوتنی ڕۆژئاوا لە جەنگی ساردا. لە سەرەنجامی ئەو ململانێیەدا سەرنجدانی ئەو یاسایانە و بەشداریکردن لەو دام و دەزگایانە لە لووتکەوە وەستا بۆ ئەگێندەی گشتی هەموو وڵاتێکی خاوەن سەروەری لە سەر ڕووی ئەم زەمینە. بۆ وڵاتانی دەرەوەی جیهان سیستەمی بازرگانی جیهان و بازاڕی سەرمایەی نێودەوڵەتی، هەردووکیان ڕێکیان خست و زاڵ کران لە لایەن وڵاتانی ناوەوە، جۆرە سوودێکی جیهانی پەیدا بوو کە گەر بتوانن لێی نزیك ببنەوە دەتوانن ئابووری خۆیان بەهێز بکەن.

## ئابووری جیهانی

ئابووریی بازاڕ، بە ڕای ئادەم سمیس، لە سروشتی مرۆڤەوە هەڵدەقوڵێ. مرۆڤ خولیایەکی سروشتی هەیە بۆ " جموجۆڵ و بازرگانی کردن و شتێك بە شتێکی تر ئاڵوگۆڕ بکات"، کە ئەمەش ڕاستەوخۆ بەرەو بنەمای ئەو سامانەی دەبات کە بازاڕ دروستی دەکات: دابەشکردنی کرێکار. هەموو کەسێك لە بەرژەوەندی خۆیدا خۆی دەدۆزێتەوە بۆ تایبەتمەندکردنی دروستکردنی یەك شتی تایبەت تاوەکو شتی زیاتر هەبێت بۆ ئاڵوگۆڕکردن، بۆیە دەتوانێت هەموو شتێك زیاتر بۆ خۆی دەستەبەر بکات. بە پێی ئەم مەنتیقە، چالاکی ئابووری کارێکی سروشتی و ئارەزوومەندانەی نێودەوڵەتییە. هەرچەند دابەشکردنی کرێکار چڕتر ببێت، ژمارەی خەڵك زۆرتر دەبێت لە بەشداریکردنی کارو زنجیرەی پسپۆریش فراوانتر دەبێت، کە ئەمەش ڕێژەی سامانی بەرهەم هاتوو زیاتر دەکات. یەکێك لە ئەرکە سەرەکییەکانی حکوومەت، بە ڕای سمیس، حکوومەت دەبێ زاڵ بێت بەسەر بەربەستە فیزیکییەکان بۆ ئاڵوگۆڕکردن لە ڕێگەی چاکردنی میتۆدەکانی گواستنەوەی شتەکان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر و لە ڕێگای دروستکردنی ڕێگا بان و کەناڵ و بەندەر. حکوومەت دەبێ شتە گشتییەکان دابین بکات، نابێ لە سەر هیچ ئەساسێك لەمپەر بخاتە بەر ئاڵوگۆڕکردن.

بەڵام بێگومان حکوومەتەکان لەمپەر دەخەن بەر دەمی بازرگانی نێودەوڵەتی، و هەمیشە هەرواش دەکەن. باج دەسەپێنن و سەپاندنی بەربەستی تر بۆ بازرگانی لە ڕێگای سنوورەوە. لە





سەردەمی ئادەم سمیسدا، هەروەك لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا، مەبەستی هەوڵی لیبراڵ و ئابووری دابەشکردنی سەروەری لە جیهان پێچەوانەی ئەو شتە بوو کە دەویسترا. لە لایەکی ترەوە، دەسەڵاتی فرەیی کە لە سەر زەوی دابەشکرابوو ئاسانکاری کرد بۆ حکوومەتی هەمە جۆر بۆ پچڕاندنی ئاڵوگۆڕ لە نێو سنوورەکانیان. لە لایەکی تر، لە بەر پێشکەوتنی چالاکی ئابوری لە سەر پێشبینی کردن، کە باشترین شێوە دابینکرابوو لە لایەن حکوومەتێکی بەهێزی بازاڕ کە گرێبەست بەهێز دەکات و ئاڵوگۆڕی مەودا دوور دەوەستێتە سەری، هەروەها لە بەرئەوەی، ئارەزوومەندانە، دابەشکردنی کرێکار دەبێ هەموو سەر زەوی بگرێتەوە، پێویستە حکوومەتێکی گشتی لە جیهاندا هەبێت،  بەڵام لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا، هەروەك لە کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەمدا کاتێ ودرۆ ویڵسن بۆچوونی لیبراڵی سیستمی جیهانی لە لووتکەی ئەگێندەی نێودەوڵەتی دانا، هەروەها لە ساڵی ١٧٧٦، ساڵی کارە گەورەگەی سمیس بوو" سامانی نەتەوەکان" بڵاوکرایەوە، هیچ حکوومەتێکی جیهانی نەبوو.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئابوورییەکی نێودەوڵەتی هەبوو، هەروەها لە سەرەتا سەدەی بیست و یەکدا، ئەو سەرقاڵ و چالاك بوو لە گەشەکردنیشدا بوو. قەبارەی ئاڵوگۆڕی نێودەڵەتی زۆر فراوان بوو، هەروەها شتێکی گرینگ بوو کە وڵاتانی خاوەن سەروەری تێوەی گلاَن و چەمکێکی لێکەوتەوە کە زۆر جار بەکار دێت بۆ سەردەمی دوای جەنگی سارد خۆی ئەویش: جیهانگیری " globalization".

چەمکەکە دەگەڕێتەوە بۆ گرێدان و تێکەڵبوونی زۆری ئابووری لە تەوای سەر ڕووی زەویدا. گرینگترین یەکەی چالاکی ئابووری هیچی تر شەقامێك نەبوو، گوندێك نەبوو، سەرەکی نەبوو، دەوڵەتێکی نەتەوەیی نەبوو، هەتا کیشوەریش نەبوو، بەڵکو بە خێرایی بوو بە خودی سەر زەوی.

بەکارهاوردەی گشتی چەمکی جیهانگیری لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا دەستنیشانی نەك هەر تەنها گەشەی چالاکی ئابووری نێودەوڵەتی، بەڵکو گرینگییەکانی ئەو گەشەکردنەش دەکا وەك خاسیەتێکی ناسراوی سەردەمی دوای جەنگی سارد. گرێدانی ئابووری نێودەوڵەتی بوو بە گۆلێکی باڵای هەموو وڵاتانی خاوەن سەروەری سیستەمی نیو دەوڵەتی هەروەها کاریگەرییەکی زۆری لە سەر ئەو وڵاتانەدا هەبوو. کاتێ نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم سەردەمی جەنگی سارد بوو، چونکە کێشەی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا زاڵ بوو بەسەر کاروباری نێودەوڵەتیدا، جیهانی گۆڕی بۆ نێو داشماڵێکی تاکی شەترەنج، لە سەرەتای ماوەی

دوای جەنگی ساردا زاڵبوونی کاروباری نێودەوڵەتی ئەم ئەستێرەیەی گۆڕی بۆ تاکە بەدالەیەك، کە هەر بەشێکی بەستراوە بە هەموو بەشەکانی تر. هێزەکانی جیهانگیری لە سەرەنجامی جەنگی ساردا لە ڕووی جوگرافییەوە هاوسەنگ نەبوون. لێشاوی ئابووری زۆرتر بوو لە نێو وڵاتانی ناوەوەی جیهان لە چاو ئەوەی نێوان وڵاتانی ناوەوە و دەرەوەی جیهان، هەرچەند قەبارەی مامەڵەی ناوەوە و دەرەوە بە خێرایی فراوان دەبوو. گرێدانی ئابووری سەردەمی دوای جەنگی سارد شتێکی وا نەبوو کە یەکەم جار بێت ڕوویدا بێت. لە ڕاستیدا، دووەم سەردەمی نەك یەکەمی جیهانگیری بوو.

یەکەمیان دەستی پێکرد لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە، کاتێ شۆڕشی پیشەسازی بە باشی بەڕێوەبوو لە ئەوروپا، هەروەها بەردەوام بوو بۆ ١٩١٤، بە دەستپێکی جەنگی جیهانی یەکەمەوە وەستا. بە پێی پێوەری نێودەوڵەتی جیهان زیاتر بەیەکەوە گرێدرابوو لە سەردەمی یەکەمدا بە بەراورد لەگەڵ زۆربەی کاتەکانی سەردەمی دووەمدا. بە سنووردارتر قسە بکەین، سەردەمی دوای جەنگی سارد دووەم بەشی سەردەمی دووەمی جیهانگیرییە، چونکە ئەو ئاڕاستەیەی بەرەو گرێدانی ئابووری نێودەوڵەتی پاش ١٩٤٥ دەستی پێکرد، یەکەم جار لە بنەڕەتدا لە وڵاتانی ناوەوەی ڕۆژئاوا و دواتر زیادی کرد لە وڵاتانی دەرەوەی جیهانیش.

لە سەردەمی یەکەمدا، هۆکاری کشتوکاڵی و خەڵك بە قابارەیەکی زۆرەوە بە نێو سنوورە نەتەوەیەکاندا تێپەڕین: ماوەی زووتری جیهانگیری چاخێکی مەزنی کۆچکردن بوو. لە دووەمدا، لێشاوی تێپەڕین بە نێو سنوور بە شێوەیەکی سەرەکی بەرهەمی دروستکراو و سەرمایەی تێوەگلاند. گۆڕانی تەکنەلۆژیا سەردەمی بەرایی جیهانگیری دروستکرد. کەشتی و هێڵی شەمەندەفەر گواستنەوە و هاتوچۆیان خێراتر کرد لە شوێنە دوورەکان لە چاوی سەردەمەکانی تری مێژوودا. دانەوێڵە لە ناوەڕاستی ئەمریکای باکوور گەشەی کرد کە دەکرێ بە بڕ بنێردرێت بۆ ناوەڕاستی ئەوروپا، خەڵك لە دایك بوو لە ناوەڕاستی ئەوروپا دەتوانن دووبارە شوێن نشین بکرێنەوە بە ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆژئاوای هێمیسفێر. لە هەمانکاتدا، تێلێگراف شوێنە زۆر دوورەکانی لێك نزیك کردەوەو پەیوەندی خێراتر کرد.

گۆڕانی تەکنەلۆژیا بەشێك بوو لە سەردەمی دووەمی دوای ١٩٤٥ ی جیهانگیری. فڕۆکە نەفەر هەڵگرەکان خەڵکیان گواستەوە لە کیشوەرێکەوە بۆ کیشوەرێکی تر خێراتر لەوەی کەشتی دەیگواشتنەوە. لەگەڵ داهێنانی مایکرۆشیپ، بە ملیۆنەها دۆلار لە سەرانسەری



جیهان گەمەی پێ دەکرا لە ڕێگەی تەنها یەك دوگمەوە. گرینگتریش لەوە شکاندنی بەربەستەکان لە گرێدانی ئابووری نێودەڵەتی لە دووەم ماوەدا، هەرچەندە بە شکانی گرێ سیاسییەکان دادەنران. ئەمە هەرەسی بەدیلەکان بوو بۆ هەوڵی لیبراڵ بۆ ئابووری کە بەرەو، دوای جەنگی جیهانی یەکەم لە وڵاتانی ناوەوەی جهان و لە هەشتاکان و نەوەدەکان لە دەرەوەی جیهان، کەم کردنەوەی بەربەستە دەستکردەکانی مرۆڤ برد بۆ بازرگانی جیهانی و وەگەڕخستن کە هەستایەوە لە سەدەی بیستەمدا. لە دەیە دواییەکانی ئەو سەدەیەدا بەربەستەکان لە جیهانی دەرەوە دەستی بە کەمکردنەوە کرد، چونکە پەیوەندیە ئابوورییەکان لە سەر ئەو بنەمایەی کە کۆمۆنیست و حکوومەتی جیهانی سێیەم ئەوانی گرێدابوو بە ئاسانی بە دیار کەوتن.

بەکارهاوردەی چەمکی جیهانگیری هەندێ جار ئەوەی خستەڕوو کە پرۆسەکە تەنها قەدەغە نەدەکرا ئەگینا هەموو شتێکی پێ دەکرا. ئەمە وا نەبوو. ئەو بڕیارە سیاسیانەی مەرجەکانی دروستکرد کە تیایدا گرێدانی ئابووری نێودەوڵەتی گەشەی کردبوو دەکرێ ئاوەژووبکرێتەوە. هەستی قەدەغەکردن لەگەڵ ڕوحی مێژووی تیۆری لیراڵ بوو. کە پێشبینی ئەوەی کرد ڕەفاهییەت گۆلێکی گرینگ بوو بۆ هەر حکوومەتێك کە تاکە میکانیزمی بەدەستهاوردەی ئابووریی بازاڕ بوو. گرێدان بۆ ئابووری جیهان یەکێك بوو لەو ڕێگایانەی کە بازاڕ ڕەفاهییەتی بەرهەم هێنا. کەواتە گرێدانی نێودەوڵەتی بەشێکی میکانیزمەکە بوو کە بە هۆیەوە میتۆدی لیبراڵی ڕێکخراوی ئابووری بنەماکانی سەدەی بیست و یەکی بەرهەم هێنا بۆ شەرعییەتی سیاسی. ئەو ئینتباعەی بە جیهانگیری دەورە درابوو ئەوەی خستەڕوو کە هەر وڵاتێك دەبوایە ئابووری خۆی ڕێکبخات تاوەکو بتوانێت خۆی بە سوودی گەورەی جیهانی بلکێنێت، چونکە ئابووری جیهان وای دەخواست. بە مێتافۆرێکی هەمەجۆر، هەر وڵاتێك دەبوایە ڕێگای ئاسان دروست بکات بۆ گەیشتن بە هەردوو ڕێگا سەرەکییەکەی ئابووری جیهان: سیستەمی بازرگانی نێودەوڵەتی و سیستەمی پارەی نێودەوڵەتی.

بە پێچەوانەی هەوڵی لیبراڵ لە پێناو ئاشتی و شەڕ، سیستەمی بازرگانی نێودەوڵەتی و سیستەمی پارەی نێودەڵەتی بە باشی دامەزرا بوو کاتێ دیواری بەرلین ڕووخا لە ١٩٨٩. هەر یەکەیان دروستکرابوون لە کۆتایی جەنگی جیهانی دووەم و بۆ نزیکەی نیو سەدە بەسەرکەوتوویی پاڵپشتکران لە کاتی دەستکاری و فراوان کردنیدا. لە جەرگەی هەریەکەیان پراکتیزی بنەڕەتی لیبراڵ بۆ ئاڵوگۆڕی ئازاد وەستا بوو. هەروەها هەر یەکەیان پێشینەی خۆی

هەبوو. وەك توخمەکانی تری سیستەمی لیبراڵ، سەروەری گشتی، دەستوور نووسین، حوکمی یاسا، هەروەها نەریت و پراکتیزەکانی ئاسایشی گشتی، سیستەمی لیبراڵی بازرگانی جیهانی و سیستەمی پارەی نێودوەڵەتی داهێنانی بەریتانی و ئەمریکییەکان بوون کە بڵاو بۆوە بۆ وڵاتانی تریش لەکاتی دوو سەدەی یەکەمی سەردەمی مۆدێرندا. لە چاخی یەکەمی جیهانگیریدا، بەریتانیای یاساکانی بۆ بازرگانی جیهانی دابینکرد و لێشاوی پارەی بە نێو سنووردا. پارچە پارچە بوون بە هۆی هەردوو جەنگی جیهانی و سستییە گەورەکەی بازاڕ، هەردوو سیستەمەکە لە سەرەتاوە دروستکرانەوە لە ژێر سەرکردایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە پاش جەنگی جیهانی دووەم. ئا لەوێدا ئەمریکا چاودێری کۆمەڵێك یاسا و پراکتیز و دەزگای کرد کە جیهانی دوای جەنگی سارد کردە بە میراتی خۆی.

بازرگانی و ئاڵوگۆڕکردن بە سادەیی لە جەرگەی بازاڕی ئازادا پەیڕەو کران لە نێو سنوورە سەروەرییەکاندا. بنەماکانی سیستەمی بازرگانی جیهانی ئایدیایەکی ڕاستەڕێیە کە لە سەریدا ئاڵوگۆڕکردنی نێودەوڵەتی دەبێ بە ئازادی کاری خۆی بکات، بەبێ سەپاندنی قەدەغەکردنی حکوومەت، هەروەها ئایدیای بازرگانی ئازاد گرینگی سیاسی بەرچاوی هەبوو لە سەدەی نۆزدەهەمدا.

لە سەدەی نۆزدەمدا بەریتانیا زۆر نزیك گرێدرابوو بە مەسەلەی سەربەخۆی سیاسی. ڕکابەری سیاسی بۆ فراوانکردنی مافی دەنگدان و بۆ شکاندنی بەربەستەکان بۆ بازرگانی چوون یەك بوون بە چاوی هەندێ لەوانەی کە بەرپایان کرد، لکێنران، لەوەتەی هەردووکیان هێزی حکوومەت یان کەم کردەوە و مەودای ئیختیاری مرۆڤیان فراوان کرد. بازرگانی ئازادیش گرێدرابوو بە ئاشتی بە چاوی پارتیزانەکانی، کە بەسەریان خست بۆ پیشەیەکی سەرەکی. بازرگانی ئازاد لە بەریتانیا لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا دەستی پێکرد، بە ئینتباعی نموونەی بەریتانی و دەمەتەقێ بەریتانییەکان بۆ سوودەکانی، پراکتیزەکە بەنارێکی بڵاو بۆوە بۆ ئەوروپا و ئەمریکای باکوور.

لە ڕووی ئابوورییەوە بەریتانیا بەهێزترین دەوڵەت بوو لە جیهان لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا. سەد ساڵ دواتر، ویلایەتە یەکگرتووەکان وەك بەریتانیا لە پێشدا ئەو مەنسەبەی گرتەوە و ڕێگای بازرگانی ئازادی گرتە بەر. بە لە بەرچاوگرتنی نیشانەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکان، حکوومەتی وڵاتانی تر دەستیان کرد بە لابردنی ئەو بەربەستانەی خۆیان دایان





نابوو لە ڕێگای بازرگانی نێودەوڵەتی، یەکەم لە نێو وڵاتانی ناوەوەی ڕۆژئاوادا و دواتر، لە کۆتایی سەدەکەدا، بە زیادەوە لە وڵاتانی دەرەوەی جیهانیش.

پارە ڕۆڵێکی یارمەتیدەر دەگێڕێت لە کاروباری ئابووری نێودەوڵەتیدا: یارمەتی گۆڕان دەدات. پارە وەك کارایەکی گشتی کار دەکات، یەکەیەکی جیهانی ئەو حیسابەیە ناکرێ بە هیچ شتێکی تر ئاڵوگۆڕ ناکرێت. بەم شێوەیە میکانیزمێکی زۆر کاریگەری پارەدانە تا بازرگانی. پارە وەك سیستەمێکی کەناڵەکانی گواستنەوەیە کە پێایدا پارە لە فرۆشیارەکانەوە دەگوازرێتەوە بۆ کڕیارەکان. هەروەها ناوەندێکیشە بۆ وەگەڕخستن. سیستەمێکی دارایی، نێودەوڵەتی یا ناوخۆیی بێت، وەك سیستەمێکی ئاوەڕۆیە، کە تیایدا هێزی کڕین لەوانەی کە هەیانە دەچێت بۆ ئەوانەی کە پێویستیان پێ یە بۆ دروستکردنی سامان.

سیستەمی پارەی نێودەوڵەتی سەدەی نۆزدەهەم، پێوانەی زێڕ، گەشەی سەندو کاتێك بەریتانیا زێڕی بۆ مامەڵە نێودەوڵەتییەکاندا بەکارهێنا. کاتێ کاتی ئەوە هات بۆ دانانەوەی سیستەمی پارە لە نزیك کۆتایی جەنگی جیهانی دووەم، ویلایەتە یەکگرتووەکان، لەگەڵ بەریتانیای وەك شەریکێکی گەورە، هەوڵی دووبارەکردنەی کۆششی دوای جەنگی جیهانی یەکەمی نەکردەوە بۆ بوژاندنەوەی پێوانەی زێڕ، بەڵام لە بڕی ئەوە لە کۆنفرانسێك لە برێتن وودس، نیو هامشێر، لە ساڵی ١٩٤٤ دا پێوانەیەکی یەکچووی، بەڵام ئاڵۆزتری ڕێکخستنەکانی چاودێری پارەی هێنا کایەوە، بە ڕێژەی ئاڵوگۆڕی سەقامگیر و دۆلاری ئەمریکی هەندێ لەو ئەرکانە نمایش دەکات کە پێشتر بە زێڕی سپاردبوو.

هەرتك سیستەمی بازرگانی و پارە بە شێوەیەکی بەرچاو گۆڕا لە دەیەکانی دوای جەنگی جیهانی دووەمەوە، بەڵام لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا هەردووکیان هێشتا هەر هەبوون، وەجهی ناسراوی ئەوەی دەستی پێکرد لە نزیك کۆتایی هێزەکانی جیهانگیری دوای جەگی سارد. لە کاتێکدا ئابووریی بازاڕ لەگەڵ گەلێ لە وڵاتانی خاوەن سەروەری دەرەوەی جیهان دەبوایە لە سفرەوە دروستبکرابانەوە، سیستەمی پارە و بازرگانی نێودەوڵەتی دەبوایە تەنها لەگەڵ سیستەمی کارکردنەوە هەبێت و بەکار ببرێت بۆ زۆرترکردنی ژمارەی بەشداربووان کە سەرکەوتنی بازاڕ وەبەری دەهێنێت.

بەڵام درێژە پێدان و پاراستن نە سانا و نەسادەش بوو، هەردوو سیستەمی پارە و بازرگانی موعەرەز بوون بۆ ئاستەنگەکان کە لە جەنگی ساردەوە هەڵیگرتبوو. ڕێگای بازرگانی جیهانی

موعەرەز بوو بۆ ڕوودا و قەرەباڵغی هاتووچۆ، لە تەواوی سەدەی بیستەمدا یاساکانی نرخی ڕێگا بە حاڵێك خۆی سەلماند بۆ دامەزراندن. هاتوچۆ دەبێ بەردەوام بێت بە بێ بەرابەری نیشانەی وەستان و ڕووناکی هاتووچۆ. هەڵسوڕاندن، ئاگادارکردنەوە و هاوکاری پێویست بوو بۆ پاراستنی کردنەوەی ڕێگای پارە و هەتا موعەرەزیش بوو دوا تر بۆ ڕوودا و تەڵەکانەوە.

لە کاتێکدا باری دروستکردنی بازاڕی بە گەڕ لە وڵاتانی دەرەوەی جیهاندا لەگەڵ حکوومەتەکاندا خەڵکی وڵاتەکان تێوەگلان، بەرپرسیارێتی بۆ ڕێگەنەگرتن و نەخستنە تەڵەی ئەم نرخە قولانە، بۆ پاراستنی سیستەمی ئابوری نێودەوڵەتی لە مەرجێکی کارکردنی باشدا بۆ سوودی هەموو شەراکەتی جیهان بۆی بەسەرەکی کەوت بۆ وڵاتە دیموکراسییە دەوڵەمەندەکانی ناوەوەی جیهان، لە سەرووی هەمووشیانەوە ویلایەتە یەکگرتووەکان بوو.

## بازرگانی ئازاد

سوودەکانی بازرگانی ئازاد مەسەلەیەکی مەنتقییە، هەمان مەنتق کە هاوکاری دابەشی کرێکار دەکات. هەروەك ئادەم سمیس بەم شێوەیەی خوارەوە بۆی دەچێت:

"هەر جۆرە بازرگانییەك کە ئەنجام دەدرێت لە نێوان هەردوو وڵاتێك دەبێ سوودی بۆ هەردوو لا هەبێت....... کاتێ دوو پیاو لە نێوان خۆیان بازرگانی دەکەن، بێگومان بۆ سوود و قازانجی هەردوولایە... حاڵەتەکە هەمان ئەو حاڵەتەیە لە نێوان هەردوو نەتەوەیەکدا. ئەو شتانەی کە بازرگانە ئینگلیزەکان دەیانەوێت بۆ هاوردە لە فەرەنساوە زۆر گرینگترن بۆ ئەوان لەوانەی ئەو شتانەی کە ئەوان دەینێرن بۆ فەرەنسییەکان".

هەروەها سوودەکانی بازرگانی مەسەلەی واقیعێکی دامەزراوی خودییە. سەلماندنی نرخەکەی دەوەستێتە سەر بنەمای پێشکەوتنی بەراوردکار، بەناوبانگترین خۆپیشاندان کە دابینکرا، لە سەرەتای سەدەی نۆزدەدا، لە لایەن ئابووریناسی بەریتانی دەیڤد ڕیکاردۆ بوو. ڕیکاردۆ ئەوەی خستەڕوو کە هەتا یەك وڵات دەتوانێت هەموو شتێك هەرزانتر بەرهەم بهێنێت لەوەکەی تر، هەریەکەو سوود لە بازرگانی لەگەڵ ئەوەی تر وەردەگرێت. بازرگانی هەریەکەیان باشتر دەکات گەر بازرگانی نەبێت هەرگیز کاتێ بەرهەمهێنەرێکی کاریگەرتر تەرکیز دەکاتە سەر شتەکان کە تیایدا دوورپەرێزەکانی سوودەکانی بە کاریگەرە، سوودی بەراوردکاری،



گەورەترە. بنەمای قازانجی بەراوردکار لە ڕووی ئابوورییەوە شێوەی یاسای فیزیکی هەیە. لەگەڵ شێوازی کەمینە هەمیشە لە هەموو شوێنێك ڕاستە.

بازرگانی ئازاد تەواوی سامانی کۆمەڵگا بەهێز دەکات. بەربەستەکانی بەردەم بازرگانی کەمی دەکاتەوە. تا ئێستا بازرگانی ئازاد لە هەموو شوێنێك پراکتیز نەکراوە. لە زۆربەی کاتەکاندا، لە زۆربەی شوێنەکاندا، شاز بووە، نەك یاسایەك بووبێت. هۆیەك بۆ ئەمەش ئەوەیە کە وڵات گەلێکی کەم گەر هەبووبن پێش مۆدێرنیتە حکوومەت یان کردە ئامانجی سەرەکی خۆیان بۆیە دانیشتوان لەوپەڕی خۆشگوزەرانی دابوون. لە ئەوروپای تەقلیدا، مەبەستی سەرەکی بەهێزکردنی دەسەڵات بوو، ئیمتیاز بوو، هەروەها سامانی مەلیکەکان، زۆرجار بە بەرپاکردنی شەڕەوە بەدەست دەهێنران. جەنگ پێویستی بە سوپا بوو، کە بەرزدەکرانەوە و هاوکاری دەکران لە مەیدان لە ڕێگەی ئاسنی خۆش کراو بۆ ئەم مەبەستە. ئەمانە بەدەست هاتن، لە کاتێکدا ئەسڵیش نین، وەك پارەدان بۆ هەناردن. بۆیە مەلیکێکی تەقلیدی نیازی کۆششکردنی بازرگانییەکی زیاتر بوو، کە دەبوو بەرهەم هاوردەی تۆڕێك لە کەرەستەی خاوی ئاسنی بەهادار. ئەمە سیستەمی mercantilism واتە کاروباری بازرگانی و بازاڕ بوو.

مێرکانتلیزم، پراکتیزێکی ئەوروپی بوو. لە ئاسیا بازرگانی ئازاد جەماوەری نەبوو لە زۆربەی سەردەمی مۆدیرن لە بەر هۆی جیاواز. لە هەرتك ژاپۆن و چین پێویستی بە سومعەیەکی باشی سیاسی بوو وەك ئەنجامی نوێگەرێکی هاوکار. بازرگانی لەگەڵ ڕۆژئاوا هێنرایە هەردوو وڵات بە هۆی هێزی سەربازی ڕۆژئاوا و بەم شێوەیە ئەزموونیان کرد وەك هێرشێك بۆ سەر سەروەریان. کەشتی چەکی ئەمریکی ژاپۆنی کردەوە بۆ بازرگانی لە ساڵی ١٨٥٤. بەریتانیا چینی کردەوە بە هەمان ڕێگا و، لە ڕێگای زیادکردنی بریندار بۆ هەڕەشە، یەکێکە لەو هۆکارانەی کە بۆی چین پێشتر بۆی کرابۆوە ئەویش حەشیش بوو. هەرکە حەشیش بەردەست بوو بەکارهاوردەی بە خێرایی بڵاو بۆوە لە نێو خەڵکی چینی، لەگەڵ لەمپەرکردنی سەرەنجامەکان.

ڕژێمە نالیبراڵییەکانی سەدەی بیستەم و ئەڵمانی نازی و ئیمپراتۆری ژاپۆن، هەروەها کۆمۆنیستی ڕووسیا و چین، لە کاتێکدا جیا بوو و لە ڕێگای گرینگەوە لەو حکوومەتە تەقلیدیانەی جییان گرتەوە، لەگەڵ ئەوانەی پێش خۆیان هەمان ڕقی بەرابەر بازرگانی نێودەوڵەتیان هەبوو، هەروەها بۆ هەمان هۆ. ئامانجی هاوبەشیان زۆرکردنی هێزی دەوڵەت بوو،

نەك خۆشگوزەرانی خەڵك، هەروەها حیسابی ئەوەیان دەكرد كە كۆنترۆل لە سەر ئەوەی چووە نێو وڵات و بە جێی هێشتووە دەتوانێت ئەمە بە دەست بێنێت.

بازرگانی ئازاد پراكتیزەیەكی لیبراڵە، قارەمانی سەردەمی مۆدێرنە لە لایەن دەسەڵاتە لیبراڵییەكان. شتێكی مەنتقییە بۆ چاوەڕێ كردنی سەربكەوێت تا ئەو ڕادەیەی كە ئەندامانی سیستەمی نێودەوڵەتی ئابووری و سیاسەتی خۆیان ڕێك دەخەن شان بەشانی هێڵی لیبراڵییەكان. بۆیە سەلمێنراوە بۆ سەر خاڵەكە، بەڵام هەتا وڵاتە لیبراڵییەكانیش وەك بەریتانیا و ویلایەتە یەكگرتووەكان بەربەستیان تووند كردووە بۆ بازرگانی نێودەوڵەتی. مانای یاسایی چەمكەكە بەكارهێنرا بۆ گەڕانەوە بۆ ئەم پراكتیزە و پاراستنە. پێشنیارێكی پۆزەتیڤی هەیە. پێشنیاری پاسەوانی شتێكی بەهادارە گەر بكرێت، هەروەها ئەوەی پیشتیوانانی پاراستن لە بازرگانیدا بەنیازی پاراستنی بوون عادەتەن بەهای بەرچاوی ئەم شتانە بوون.

ڕوحی مێركانتیلیزم ژیا لە سەر كۆمەڵگای لیبراڵ لە كۆتایی سەدەی بیستەم، لەو شوێنەی هەستی تەركیزنەكراو بڵاو بۆوە و سوور بوو لەسەر ئەوەی هەناردن شتێكی باشە و هاوردەیش خراپ. وڵاتانی خاوەن سەروەری وا سەیر دەكران كە لە ململانێی ئابووری دان لەگەڵ یەكتر، هەرچەند ئابووری باشی وڵاتێك لە لایەن كۆششەكانی ئەم وڵاتە دیاری دەكرێت، بەخشینەكانیان، هەروەها ئەوە سیاسەتەكانە ئەو كارە دەكەن نەك لە لایەن ئەو شتانەی كە ئەوانی تر دەیكەن. هاوسەنگی بازرگانی وڵاتێك وەك پێوەرێك وەردەگیرا بۆ توانای نەتەوەیی، هەروەها ئاستێكی بەرزتری هاوردە لە هەناردن بە نیشانەیەكی بە گرفتی بێهێز سەیر دەكرا، لە كاتێكدا لە ڕاستیدا جۆرە ناهاوسەنگییەكی ئاوا خۆی لە خۆیدا هیچ شتێك دیار ناكات سەبارەت بە تەندروستی ئابووری و سیاسی و هەروەها هەتا ویستراویش دەبێت. نایەكسانی و بەرژەوەندی یەك لایەن دژی بازرگانی هەمیشە ئەفسانەیەكی لەم بابەتەی بە دواوەیە: كە سیاسەتەكانی بازرگانی پێدا دەگرێت ئایا وڵاتێك لە زیادە دایە، لەگەڵ زیاتر هەناردن تا هاوردە، یا لە كەم بووندایە، كاتێ پێەوانەكەی ڕاستە. لە ڕاستیدا، پشت بەستن بە پێشبینییە ناوخۆییەكان، ڕێژەی خەزنەكان بۆ وەگەڕخستن بەرز دەكاتەوە.

هەستی بەرگەگر لە كۆمەڵگا لیبراڵییەكان بۆ توند كردنی بەربەستەكان بۆ بەرهەمەكان دەرەوەی دروستكرد نەك هەر تەنها ئەنجامێك بوو لە پاشماوەی هاوپێچ بۆ بنەما بنەڕتییەكانی مێركانتیلیزم بەڵكو لە پشتگوێ خستنی كارەكانی ئابووریی بازاڕ. ئەم پشتگوێ خستنی





بنەمای سوودی بەراوردكار بوو. چوون بەرەو بۆ باوەڕێكی هەڵە كە بە بێ سوودێكی ڕەها لە بڵاوكردنەوەی شتێك، بازرگانی نێودەوڵەتی بەسوود نابێت. هەروەها ئەو تێنەگەیشتنە بازرگانی وڵاتانی ناوەوە و دەرەوەی جیهانی گرتەوە، چونكە بازرگانییە لە نێوان دوو كەس یەكێكیان مووچەی كەمەو ئەوەكەی تر زۆر، دەبێ ئەنجام بێت لە وڵاتێكی دەوڵەمەنتر لە دەستدانی كار بۆ هەژارترەكان. بازرگان و سیاسەتمەداری ئەمریكی ئێچ ڕۆس پێرۆت ئەم باوەڕە هەڵەیەی كورت كردەوە كاتێ دژی دروستكردنی ناوچەی بازرگانی ئازاد وەستایەوە لە ئەمریكای باكوور لە سەر ئەو بنچینەیەی كە " دەنگێكی مژەری زەبەلاح" وەبەر دەهێنێت وەك دامەزرندن لە ویلایەتە یەكگرتووەكانەوە گوازرایەوە بۆ مەكسیكۆ. لە ڕاستیدا، تەواوی تەعینكردن لە هەر وڵاتێك ئاكامی هێزە ناوخۆییەكانە. باوەڕێكی پەیوەست بەمە بەردەوامی دەبەخشێت بە هەستی پاراستن هەتا لە كۆمەڵگا لیبراڵییەكان و دەوڵەمەندەكانی وڵاتانی ناوەوەی جیهان ئەوە بوو كە بازرگانی لەگەڵ وڵاتانی مووچە كەم مووچە دەهێنێتە خوارەوەو ئاستەكانیش دادەبەزن لە نێو دەرەوە لە كۆمەڵگا دەوڵەمەنترەكانیش. ئەمەش هەڵەیەك بوو: مووچە بە گوێرەی بەرهەم دادەنرێت، كە بەرزترە لە وڵاتانی ناوەوە، چونكە ئاكامی سەرمایەی وەگەڕخستن و مەشقكردنە، كە زیاتر قەدەغە كراوە لەوێ.

بەڵام، لەوەتەی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم، دەمەتەقێی باش و هەروەها نەتەوەیی هەبوو لە بەرژەوەندی هاوردەی سنووردار، یان بەلانی كەم دەمەتەقێكان كرا لە لایەن خەڵكی زەحمەت، بەئابووریناسە پرۆفێشناڵەكانیشەوە. كاریگەترینیان دەمەتەقێی " پیشەسازی ساوا بوو"، یەكەم جار زەق كرایەوە لە لایەن ئەڵمانی سەدەی نۆزدە، فرێدریك لیست. مێتافۆرەكە ئەو دەمەتەقێیە دەگرێتە خۆ: پیشەسازی وەك منداڵ وایە. لە ساڵە بەراییەكانیدا دەبێ بپارێزرێت، چونكە، بێهێزە و پێكهاتەیەكی پتەوی نییە، گەر خرا ڕوو بۆ فۆرمە ئاساییەكانی ململانێ كە بۆی پیشەسازی تازە بە شێوەیەكی ڕوونیش مەعەرەزە كە لە ژێر پێشكەوتندان، یان بە تەواوی دەمرن. دیواری بازرگانییەكان وەك قۆزاخە وایە كە كرمۆكە بێهێزەكانی ناو زەوی دەگوازرێنەوە بۆ سەرەوە بۆ پەپوولەكان. كاتێ گەشەی تەواوی قەبارەی خۆیان كرد، هەروەها فێری نهێنییەكانی مانەوە بوون كە ڕكابەرەكانی سەركردایەتیان كردووە، دەتوانێت خۆی بپارێزێت، هەروەها بە ڕای لیست دەبێ، دوور بخرێنەوە، لێیان بگەڕێن با بمێننەوە، فشارە

ئاساییەکانی بازاڕ وەك هەرزەکار دەبێ ڕووبەڕووی ژیانە پڕ گرفتەکەی کە منالّە ببێتەوە، گەر چانسی ئەوەیان هەبێت ڕووبەڕووی ببنەوە.

ئەلّمانیا هەندێ لە پیشەسازی خۆی پەناگە کرد لە سەدەی نۆزدەدا، بەرهەمی پیشەسازی کە لە جیهانی سەرکردەی ئابووری دروستکراون؛ واتە بەریتانیا پاراست. ولاّتێکی تری پاراستنی ئەو سەردەمە ویلایەتە یەکگرتووەکان بوو، هەروەها لیست کاریگەری نمونەی ئەمریکی لە سەر بوو. لە سەدەی بیستەمدا باجدان وەستا بوو لە سەر پیشەسازی ساوا کە لە گەلێ ولاّتدا توووند بوو، بە تایبەتی، لە دوای جەنگی جیهانی دووەم، لە ولاّتانی دەرەوەی جیهان. لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا، ویلایەتە یەکگرتووەکان خۆی، قەلاّی لیبرالّیزمی ئابووری نێودەولّەتی، ڕێچکەیەکی تایبەتی گرتە بەر بۆ هاوکاریکردنی پیشەسازی ساوا. بانگەشەی هاوردە سنووردار نەکرا، بەلّکو بۆ دابینکردنی هاوکاری حکوومەت بۆ پیشەسازی دلّنیا بۆ چاکردنی بۆچوونەکان بۆ هەناردن. ئەمە مەزهەبی " بازرگانییەکی ستراتیژی بوو".

بازرگانی ستراتیژی بە دەستپێشخەری هێنا کایەوە لە ڕێگەی دۆزینەوەی لە لایەن ئابووریناسەکان کە سوودی بەراورد هەمیشە ئەنجامی کاری خوا یان سروشت نییە. هەندێ جار گۆڕانکارییەکانی مێژوو بەرپرسیارن. دەولّەتی جۆرجیا بوو بە سەنتەرێکی کارگەی فەرش، چونکە بازرگانییەکی کەمی دروستکردنی فەرش لەوێ دەستی پێکرد ئیتر ئەوانی تر بەدوای کەوتن کەواتە لەگەلّ وێنەی جولّەی پیشەسازی و باشووری کالیفۆرنیا هەلّیکرد. ویلایەتە یەکگرتووەکان پیشەسازییەکی بەرفراوانی فڕۆکەی هەبوو، چونکە، لە نێو شتەکانی تر، داوای فڕۆکەی سەربازی زۆربوو ئەویش وەستابووە سەر دۆزینەوەی ئابووریناسی پرۆفێشنالّ کە تیایدا کۆمپانیای کەم زالّ بوون (پیشەسازی فڕۆکە نموونەیەکە)، حکوومەتەکان بە تیۆر دەتوانن هەلّەکانی کۆمپانیا زەبەلاحەکان چاك بکەنەوە، بێ یەکێك لە نێو هەلّبژێرەرەکان بە هۆی دابین کردنی هاوکاری دارایی و پاراستن، هەروەها فۆرمەکانی تری هاندان. مەزهەبی بازرگانی ستراتیژی سێیەم توخمی هەبوو: ئەو قەناعەتەی کە هەندێ لە پیشەسازییەکان بەهادار تر بوو لەوانی تر. ئەمە سەدای ئەسلّی دەمەتەقێی پیشەسازی ساوا بوو، کە دووپاتی ئەوەی کردەوە پیشەسازی بەهادارترە لە کشتوکالّ. لە ڕێگەی دوای سەدەی بیستەمدا، پیشەسازییەکان کە بەرهەم وەبەر دەهێنن بە تەکنەلۆژیای بەرزەوە وا پێدەچوو بەهادارترینیان بێت.



مەزهەبەکە ئەوەی خستەڕوو کە حکوومەتی ئەمریکی دەبێ پەرە بەو جۆرە پیشەسازیانە بدات لە بەر خاتری بۆچوونی ئابووری مەودا درێژی نەتەوەیی. پشتیوانانی باوەڕیان بەوە هەبوو کە ژاپۆن خاوەنی سەرکەوتنی ئابووری دوای ١٩٤٥ بوو بە وردی پراکتیزەکانی کە ئەوان پەلەیان لێ دەکرد کرد لە سەر ویلایەتە یەکگرتووەکان. حکوومەتی دووربین و بەکار گرینگترین بەرهەمی دەست نیشانکردووە و ئەو سیاسەتانەی لە شوێن داناوە کە کۆمپانیا ژاپۆنییەکانی بە توانا کرد بۆ بەدەست هاوردەی شوێن پێ، هەروەها لە هەندێ حالّەتدا مەنسەبی پێشەنگ لە بازاڕی جیهانی بۆ ئەم بەرهەمانە.

بەرەنگاری هەمەجۆر بۆ بازرگانی ئازاد مشتومڕکرا و تاقیکرایەوە لە نێو ئاستەکانی پیشەی ئابووری، کە بە ڕێکی فراوان بوو لە ماوەی سەدەی بیستەمدا. بە گشتی بەرەنگارییەکان لەگەلّ بانگەشەکانی پەیدابوون و دووپاتیش کرایەوە. کۆمپانیای نوێ لە پیشەسازی باش، پاش هەموو شتێك، دەتوانێت بە ئاسایی قەرزی بازرگانی مسۆگەر بکات بۆ پالّپشتکردنیان تاکو بە قازانج بن. پیشەسازی لە سەرانسەری جیهان باجی پاراستنی وەرگرت لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا بۆ کۆتایی بیستەم. هەندێکیان پێشکەوتن، بەلاّم بەلّگەی ڕاستەوخۆی کەمی هەبوو کە ئەوانەی پێشکەوتن وایان کرد لە بەر ئەو پاراستنەی ئەوان وەریان گرت و وشك بوون بە بێ ئەوان. هەندێ دیراسەت ئەوەی دۆزییەوە کە ڕۆلّی حکوومەتی ژاپۆنی لە هەولّدان بۆ پەرەپێدانی کەرتی پیشەسازی هەمەجۆر یان هیچ هەولّێك بەرهەم ناهێنێت یانیش ولاّتەکەی بە گونجاوی دروست کات کەمتر باش بەڕێوە دەچن.

سەبارەت بە سیاسەتی بازرگانی ستراتیژی، ڕەخنەگرانی سەرنجی ئەوەیان دا کە ئەو واقیعەی سوودی بەراوردکار هەندێ جار بەرهەمی هێزی نەبەربینبارو و ئالّۆز ی مێژوو بوون، مانای ئەوە نەبوو دەبێ بەڕاستی دروست بکرێن بە هۆی دەستە شێواوەکەی دەستی حکوومەت . سیاسەتی پیشەسازی سەرکەوتوو و بەهرەدار بەم شێوەیە نەبوو بۆ سەرهەلّدانی داهاتی نەتەوەیی. زۆربەی سیاسەتەکانی حکوومەت لەم ناوچەیە بەهرەدار نەبوون. بۆ هەموو چاکەکانیان، حکوومەتی لیبرالّ بەم شێوەیە لە ڕووی سیاسەتەوە سەربەخۆ نییە بۆ هەلّبژاردنی پرۆژە هەرە باشەکانی لە ڕووی ئابوورییەوە (کەمتر لە ڕووی سیاسییەوە باشترین گرێدان بوو) هەروەها بەس هاوکاری بەوان ببەخشن ئەوان پێویستیان پێ بوون بۆ سەرکەوتن لە شوێنی بازاڕی نێودەولّەتیدا. هەروەها ئەوەشی نەخستەڕوو " پیشەسازی های تەك" پێویست بوون بۆ

بوونی نەتەوەیی لە سەدەی بیست و یەکدا. ئەوەشی سەلماند کە زەحمەتە هەتا بۆ وتنی ئەوەی پیشەسازییەکان دەگەڕێنەوە سەر ئەم پۆلێنە. هەروەك ئابووری ژاپۆن، ئیلهام و مۆدیلی مەزهەبی بازرگانی ستراتیژی، وشك بوو لە دواهەمین دەیەی سەدەی بیستەم، پەرۆشی ئەمریکای باکوور بۆ ئەم ئایدیایە، هەروەها سیاسەتەکانی کە ئەو پێشنیاری کرد، ئەویش لە ناو چوو.

## پاراستن (پرۆتێکشینیزم)

لێشاوی بەرەنگاری دوای سەدەی بیستەم بۆ مەزهەبی بازرگانی ئازاد نەبووە هۆی تێك و پێك شکاندنی هەموو بەربەستەکانی بەردەمی، چونکە هەروەك ئادەم سمیس دانی پێ دانا، بەهیزترین هێز لە پاڵ سیاسەتەکانی پاراستن کەم پەیوەندی هەبوو بە هەر مەزهەبێك یان هەر تیۆرێك. بازرگانی ئازاد بەربەستی لە بەر دەم بوو لە لایەن بەرژەوەندییە بازرگانییە شەخسییەکان.

بە هەر حاڵ، بازرگانی چالاکی ئاسایی بازاڕ بوون، بە تایبەتی لە تەمەنی شۆڕشی پیشەسازیدا، بە میراتەوە لێك ترازاون. ئاڵوگۆڕکردنی شتومەکی دەرەوەی هەرزانتر بۆ شتی دروستکراوی ناوخۆی گرانتر کرۆکی بازرگانییە، بەڵام، بەرهەم هێنەرانی ناوخۆ بریندر کران. بە هۆی ئاڵوگۆڕکردنی شتی هەرزانتر بە شتی گرانتر، بازرگانی گەشەی ئابووری پێش دەخات، بەڵام گەشە پرۆسەی وێرانکردنێکی دروستکراوە و هەروەها ئەوانەی کە وێران دەکرێن بە شەڕانگێزی کاریگەرەکانی ئاست ئاسۆییە بۆ هەوڵدان بۆ نەهێڵانی کەمکردنەوەی. لە حاڵەتی بازرگانیدا، ئەمە مانای پاراستنی بەرهەمەکانی دەرەوەیە. سیاسەتەکانی پاراستن داڕێژراوە بۆ پاراستنی ئەوانەی بریندار بوون لە لایەن ئاڵوگۆڕی نێودەوڵەتی ئازاد.

بازرگانی بە سادەیی سوود وەرگرتنە لە بەرهەم هاوردە، میتۆدێکی هەرزانتری بەرهەم هاوردەی شتێك. سوود لە بەرهەم هاوردە کە دەرەوە دەهێنێت کایەوە، بەڵام، ئاسانترن بۆ پێچەوانەی تا سوودی بەرهەم هاوردە کە گەشەی لە ناوخۆن. کاتێ سەرچاوەی لێکترازان دەرەوەیە، هۆی پاراستن دەتوانێت خۆی کۆبکاتەوە لەگەڵ بەهێزترین هەستی سیاسی لە سەردەمی مۆدێرندا: ناشنالیزم. یەکێك کە دەوەستێتە سەر چاکردنی بەرهەم هاوردەی نێو ماڵ



بە فراوانی بە کاردانەوکان دانراون، بەڵام یەکێك کە دەوەستێتە سەر ئەم جۆرە چاکردنانە لە دەرەوە دەتوانێت نیشتمانی پەروەرییەك بخاتەڕوو، دەوەستێتە دژی ئەو وڵاتە بێگانەیەی کە تووشی هاتووە.

بازرگانی دەکرێ بە فۆرمێکی دوژمنکاری دەرەوە بچێت، چونکە لە هەردوو هاوڵاتی خۆشگوزەر و بازرگانی بریندار بووین لە لایەن بێگانەوە. بێگومان هاوڵاتییەکان سوود وەردەگرن لە بازرگانی نێودەوڵەتی، هەروەها سوودمەندەکان بە شێوەیەکی زۆر ئەوانەی ئازاری لە دەستدان ژمارەیان زۆر دەکات، بەڵام دابەشکردنی دەسکەوت و زیانەکان لە بازرگانییەوە بە شێوەیەکی ئاسایی سوودی سیاسی تەرجەمە دەکات بۆ ناوەندی لیبراڵیکردن. بە هەقیقەت، کێشی سیاسی بە ئاڕاستەی دژیەکە.

کۆی دەسکەوت لە بازرگانییەوە گەورەترن لە کۆی زیانەکان، هەروەك ئابووری لەوەتەی ڕیکاردۆ ئەوەی خستەڕوو، هەروەها براوەکان زیانەکان زیاتر دەکەن، بەڵام بۆ هەریەك لە گەلێ براوەکان، سوودەکان مامناوەند بوون: نزیکەی نرخێکی کەمتر بۆ شتێکی هێنراو، کراسێك بۆ نموونە، لەوەی کە لە ناوخۆوە دروستکراوە تەکلیف دەکات. دەسکەوتەکان بەم شێوەیە بڵاو دەبنەوە. زەرەرەکان، بە پێچەوانەوە، جەختیان لە سەر دەکرێتەوە. تەنها هەندێ دروستکەری کراس کاری خۆیان لە دەست دەدەن، بەڵام هەریەکەیان قازانج لە دەسکەوتی کڕیارەکانەوە وەردەگرن. دۆڕاوەکان بە وردی ئاگادارن بەوەی کە زەرەریان کردووە لە کاتێکدا براوەکان بە گشتی بێ ئاگان چەندیان قازانج کردووە.

کەواتە براوەکان هاندانێکی کەمتریان هەیە بۆ ئەوەی خۆیان ڕێکبخەن بۆ چوونە نێو بازرگانی ئازادەوە. پارە کاتە، هەروەها نرخی کاتیش سەرفیان دەکرد لە چالاکی دەسکەوتی زیاتری سیاسی، زیانە لاوەکییەکان ئەوان ئازاری پێ دەبینن لەوەدایە گەر نرخی کراسێك کەمێك بەرزتر بێت. دۆڕاوەکان، بە پێچەوانەوە، پاڵنەرێکی بەهێزیان هەیە بۆ ڕێکخستنی خۆیان لە بەرهەڵستکاری بازرگانی بێ سنوور. بۆ ئەوان، نرخی چالاکی سیاسی شایەنی نرخێکی باشە. مەسەلەی بازرگانی ئازاد، لە ڕووی تایبەتمەندییەوە لایەنێك هەڵدەکۆڵێت کە بۆی قەدەکانی زۆر بەرزن دژی یەکێکی تر کە بە بەردەوامی ئاگادارە بەوەی ململانێیەك لە ئارادایە.

بێگومان، کاتێ دۆڕاوەکان لە بازرگانی سەردەکەون، کۆمەڵگا نرخێکی دەدات، بەڵام گەر شیکردنەوەی ئابووری بەرەو دەرەنجامێکی بردن، لە خاڵی هەموو خۆشگوزەرانی کۆمەڵگا،

سنوورەکان لە سەر بازرگانی نێودەوڵەتی هەرگیز ناسەلمێنرێن، هەڵسەنگاندنێکی سیاسەتەکانی بازرگانی ئەو پرسیارە قوت دەکاتەوە چۆن شتێکی ئاسایی دەبێت بۆ بازرگانی کە ئازاد بێت.

شکاندنی بەربەستە مەزنەکانی مێژوویی، بەرابەر بە سیاسەتی ئابووری نێودەوڵەتی لیبراڵ ساڵی ١٦٨٨ بۆ حوکمی یاسا و ساڵی ١٧٨٩ ی پاراستنی کشتوکاڵ لە بەریتانیا لە ساڵی ١٨٤٦. یاساکانی دانەوێڵە هەڵوەشێنرایەوە بە هۆی ئابوورییەوە. زۆربەی پەرلەمانی بەریتانی قەناعەتی پێ هێنرا بۆ نرخی هەرزانی دانەوێڵە لە دەرەوە، ئەم سیفەتە باشە بڵاوکرایەوە لە لایەن ڕێکخراوێك پێکهاتبوو بۆ ئەم مەبەستە، یانەی دژە یاسای دانەوێڵە، بەڵام ڕکابەرانی پاراستن توانای ئەوەیان هەبوو سەربکەون، چونکە هی ئەوان بەشێك بوو لە ململانێیەکی فراوانتری سیاسی. هۆی بازاڕی ئازاد لە کشتوکاڵ وای لێ هات گرێ بدرێت بە قازانجی سەربەخۆیی سیاسی (هەندێ کە قازانجیان لە خۆراکی هەرزانتر کرد مافی دەنگدانیان پێ بەخشرا لە کاری چاکسازی ساڵی ١٨٣٢) و لەگەڵ ململانێ بۆ دەسەڵاتی سیاسی لە نێوان بازرگانەکان و دروستکەرەکان کە شۆڕشی پیشەسازیان دروستکرد، لە لایەکی ترەوە، هەروەها ئەریستۆکراتی زەوی، کە زاڵ بوو بەسەر پەرلەمان و وڵاتدا پێش سەدەی نۆزدەهەم و کە بەرژەوەندییە ئابوورییەکانیان یاساکانی دانەوێلە خزمەتی کرد، لە لایەکەی تر.

وەك هەموو داهێنانێك، یەکەم مومارەسە لە بازرگانی لیبراڵی کردن دووچاری بەربەستێك بوو کە لەگەڵیدا جێگرەوەکانی نەدەبوایە لەگەڵی هەڵ بکەن: نەقوسانی سێینە بوو. هەروەك کە گرینگ بوو، بەڵام، هەڵوەشاندنەوەی یاساکانی دانەوێڵە لە یەك ڕێگای گرینگەوە بوو پێشینەیەك نەبوو بۆ بازرگانی لیبراڵی کردنی سەدەی بیستەم. کارێکە بە بڕیاری یەك لایەنە بوو. پەرلەمان سوور نەبوو لە سەر ئەوەی کە وڵاتانی نێرەری دانەوێڵە باسی خۆیان بەرزکردۆتەوە لە سەر کارگەکانی بەریتانی. لە ڕووی پاکی ئابوورییەوە، ئەمە مانادار بوو. وڵاتێك قازانج دەکات لە پەسەندکردنی هاوردە لە وڵاتیکی ترەوە هەتا ئەوانی تریش ڕەت بکەنەوە لە هەناردن، بەڵام شێوازی زاڵی بازرگانی لیبراڵیکردنی سەدەی داهاتوو نیوەی جیا بوو.

دەستنیشان کرابوو لە لایەن گەشەکردنی زنجیرەیەك بەرهەم هێنەر بۆ بەرپەرچدانەوەی بەربەستەکان بۆ بازرگانی و داڕووخانی بەربەستەکان. پەیمانی کۆبدن چیڤلەری ساڵی ١٨٦٠ لە نێوان بەریتانیا و فەڕەنسا بنەمای " پەسەنترین و خوازراوترین نەتەوە" ی ناساند، بە پێی ئەم پەیمانە هەر پارتێك بۆ ڕێکەوتنی بازرگانی بەڵێن دەدات هەر هەلێکی بازرگانی ببەخشێت بە



لایەنەکەی تر کە پێشتر بەخشراوە بۆ سێیەم لایەن. لە دەیە دوای یەکەکاندا بە بەرفراوان بەکار برا، ئەم پراکتیزە سەلماندی ئامێرێکی کاریگەری بازرگانی لیبراڵی کردن.

لە ساڵانی پاش جەنگی جیهانی دووەمدا، کار کردن بە موقابیل و فرە بڕیاری یەك لایەنانە دەستەبەرکرا لە زنجیرە دانووسانێکی ئاڵوز و ئەوتۆ کە پێشتر نەکرابوو، کە تیایدا ژمارەیەکی زۆرتری وڵاتان بەشداریان کرد و کە ئەوەش زنجیرەیەك شیکردنەوەی و مامەڵەی بەهێزکردنی بەرهەم هێنا لە سەر گەلێ مەسەلەو بەرهەم. بە هاوکاری یاساکانی بازرگانی پارێزرا لە ڕێکەوتنی گشتی لە سەر باج و بازرکانی (GATT)، چوار جەلسەی دانووسان کرا لە نێوان ١٩٤٦ و ١٩٦٠. پاش ١٩٦٠ کەنەدی ڕاوند هات، ناوی نرا سەرۆکی ئەمرکا کە بانگەشەی بۆ کرد، لە ١٩٦٢ وە تا ١٩٧٦، پاشان جەلسەی تۆکیۆی بەدوادا هات، کە لە پایتەختی ژاپۆن دەستی پێکرد، لە ١٩٧٣ وە تا ١٩٧٩. دواهەمین و ئاڵۆزترین کۆمەڵە دانووسانێك، جەلسەی ئۆرۆگوای بوو، یەکەم کۆبوونەوەی کرا لە وڵاتی ئەمریکای باشوور، دیرێژکراوە لە ١٩٨٦ تا ١٩٩٤.

هۆی ئابووری هەبوو بۆ پێشبردنی بڕیاری یەك لایەنە. لە هەندێ بارودۆخی سنووردراردا باجی یەك لایەنە دەکرێ خۆشگوزەرانی زیاتر بکات لەو وڵاتانەی بەسەریاندا دەسەپەێنێت، لە کاتێکدا خۆشگوزەرانی ئەو وڵاتانە لە کەمیدا بوو. سوود دیار نامێنێت، بەڵام، گەر ئەوانی تر، وەڵام بدنەوە بە باجی تایبەت بە خۆیان، لە هەر حاڵەتێکی هەر وڵاتیکدا خراپترن لەوەی بە بێ هیچ باجێك بن بۆ هەمیشە. ڕێکەوتنی فرە کەواتە ئەو هەستەی بۆ هەوڵدانی بە بڕیاردان تاك لایەنە نا بۆ زۆرترکردنی ئەم جۆرە باجە ئارەزوومەندانەیە.

هۆی سەرەکی بازرگانی لیبراڵی کردن پێشکەوت بە فرە بڕیاری تام کەمتر لەوەی، هەروەك هەڵوەشاندنەوەی یاساکانی دانەوێڵە، لە سەر بنچینەی بڕیاری تاك، بەڵام، سیاسی بوو. ئابووریناسەکان ڕەنگە ئەوە بخەنە ڕوو کە کەمکردنەوەی تاکبڕیار لە بەربەستی بەردەم بازرگانی بەسوودن، بەڵام، لە سەدەی بیستەمدا، حکوومەتەکان بە دەگمەن خۆشیان بەکارکردن دەهات لە سەر بنەماکانی تیۆرە ئابوورییەکان. گشتی سوور بوون لە سەر بەرپەرچدانەوە، زمانی سیاسەتەکانی بازرگانی دیسان پێشبینیان دەکرد. کەمکردنەوە لە بەربەستی بازرگانی وای لێ هات پێی بووترێت " ڕێگە پێدان" بۆ پارتەکانی تر، ئەوەی خستەڕوو کە شتێك بوو تەنها بەرژەوەندی وەرگرت و ئەوانەی لەگەڵی پێشکەشکردنی وڵات بەشێك بون تەنها ناخۆشحاڵ بوون. لە ڕاستیدا، لە ڕووی ئابوورییەوە، ئەم جۆرە ڕێگە پێدانە بەڕاستە سوودێکە لە لایەن

خەڵكی ئەو وڵاتەی كە دروستی دەكەن، بەڵام واقیعە سیاسییەكانی بازرگانی دانووسانەكان بازاڕی ئازادیان دروستكرد، وەك ئاسایشی گشتی، جۆرەكانی پێداویستی گشتی، شتێك بەدەست هات بێت تەنها بە هۆی كۆمەكی كردنی بە كۆمەڵەوە بێت، كاتێ هەموو پارتەكان كاریان بۆ كردووە لە هەمانكاتدا قەناعەتیان پێ بێت پارەی پێ بدەن، لەگەڵ باج كەمكردنەوە لە یەكەم حاڵەتدا، سنووری چەكەكان لە دووەمدا.

فرە دانووسانە بەردەوامەكان وای لێ هات بینران، لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا، پێویست بینران بۆ بازرگانی بە لیبراڵی كردن. جەلسە سەركەوتووەكانی بازرگانی مانتۆڕێك بوو هێز بەو پیشە ناسكەی بازاڕی ئازادا دەدات دژی ڕێكی سیاسی بەهێزی پاراستن. دانووسانەكان كێشێكی پێویستی دابینكرد بۆ فشارێكی بەردەوام بۆ سەر پاراستن سەرییهەڵدا لە بەرگەگرتنی هەموو ئەوانەی بە هۆی هاوردەوە بریندارببوون و ئیمتیازی گشتی دژی لیبراڵیزمی سەربەخۆیە. ئازادكردنی بازرگانی، بۆ بەكارهاوردەی میتافۆرێكی تر لە دراوی گشتیدا، بەرابەری سواربوونی پاسكیلێك بوو: بە بێ جوڵەیەكی بەردەوامی بۆ پێشەو پرۆژەكە بە تەنها ناوەستێت، بەڵكو بەریش دەبێتەوە.

ئەمە پاش ١٩٤٥ بەرەو پێش چوو. بە هەقیقەت، وەك پەیدان لێدان كە خوار لێ بدەی، مۆنەمێنتێكی بەدەست هێنا. سەرچاوەكانی پاراستن، حیساباتی سیاسی بازرگانی و ڕقی جیهانی بۆ كاری سەربەخۆیانە، هەروەها بەشدار بوو بۆ دژەكەشی، كە لیبراڵی كردن بوو. وایان كرد، چونكە نێرەرەیان گۆڕی بۆ نێو پاڵپشتی چالاك بۆ بازرگانی ئازاد كە بە ئاسایی ئازاریان دەچەشت لە پێوەرەكانی پاراستن لە لایەن وڵاتی خۆیانەوە وەرگیرابوو، چونكە وڵاتانی تر تۆڵەیان دەكردەوە، بازاڕەكانیان دادەخست كە تیایدا بەرهەمەكانیان دەفرۆشن. وەك ئەو بابەتانەی بۆ ململانێكردن لە هاوردەوە، نێرەرەكان باش ئاگاداربوون بەوەی قەد بۆ ئەمان بەرزە. وەك هەموو ئەوانەی كە كارەكانیان هەڕەشەی لێ دەكرێت بە هۆی هاوردەوە، بەڵام بە پێچەوانەی كڕیارەكان كە قازانج لەوان دەكەن، پاڵنەری نێرەر بۆ ئازادكردنی بازرگانی بۆ بەرژەوەندی خۆیان لە بەر چاو بوو.

دانووسانەكانی دوای ساڵی ١٩٤٥ بۆ بازرگانی لیبراڵی كردن بەسەركەوتوویی بە دەست هات و بازرگانی جیهانی فراوان بوو بە ڕێكی، گەشەی ئابووری بەرەو پێش برد. هەروەها بەس وەك گەشەی بازرگانی پەرەپێدراودا، گەشە بازرگانی ئاسانتر كرد. هەرچەند قەبارەی چالاكی



ئابووری مەزنتر بێت، ئەو كۆمپانیایانەی كە لە سەر هاوردە ڕكابەری دەكەن باشتر چاوەڕێ كردنی ئەو كارەیان لێ دەكرێت. گەشەی ئابووری، كە بازرگانی پێی پەیوەستە، مانای ئەوە بوو كە كرێكارە دەركراوەكان بە باشتر دەتوانن كار بدۆزنەوە، هەروەها پرۆگرامەكانی حكوومەت بۆ هاوكاری، قەرەبوو دەكرێنەوە، هەروەها دووبارە مەشقی قوربانیانی لێكترازان نوسراو لە لایەن بازرگانی دەكرێ بە بەزەیی و باشتر بێت. قەبارەی بازرگانی نێودەوڵەتی، بەهاكەی، هەروەها ڕێژەكەی بۆ كۆی داهاتەكەی هەموو گەشەی كرد لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا، یەكەم جار بە فراوانی لە وڵاتانی ناوەوەی ڕۆژئاوادا، بەڵام دواتر، بە زۆری، لە وڵاتانی دەرەوەی جیهانیش. دووەم سەردەمی جیهانگیری ئەوەبوو، وەك ئەوەی یەكەم، چاخێكی مەزنی بازرگانی بوو، بۆیە كەواتە، وەك ئەوەی یەكەم، پێویستی بە هاوكاری بوو لە سیستەمێكی پارەی نێودەوڵەتی.

## زێڕ وەك پارەیە

پارە لە نێو وڵاتانی خاوەن سەروەری بۆ دوو مەبەست خزمەت دەكات: یەكەیەكی حیساب كردنە، بۆ ئاسانكردنی ئاڵوگۆڕكردن، هەروەها كۆگایەكی بەهایە، تاوەكو خەڵك سامانی خۆیان بپارێزن بە فۆرمێكی بەكارهاتوو و شلە و ئامادە. لە ئابووری نێودەوڵەتیدا، هەردوو ئەرك ئاڵۆز دەكرێن بە هۆی وجودی وڵاتانی فرە سەروەری، كە زۆربەیان پارەی خۆیان بڵاو دەكەنەوە، سیستەمێكی پارەی نێودەوڵەتی دەبێ بۆ هەموو ئەمانە شیاو بێت، كە لەگەڵ یەك وڵاتن، لەگەڵ پارەی خۆی، لەو شوێنانە شت بكڕن كە دراوی ڕەسمی جیایە. ئەمە ئەركی گۆڕانە. ڕێكخستنەكانی پارەی نێودەوڵەتی دەبێ ئەوەش بگرێتەوە هەندێ میتۆد بۆ هاوسەنگكردنی وەسڵی وڵاتان و سەرفكردنی پارە بەسەر كاتەوە، گەر یەكێكیان دراوی نەما ئەوەكەی تر پەسەندی دەكات.

ئەمە كێشەی تەوازنە: بەدەست هاوردەی ئەركی گۆڕانە. یەكەم سیستەمی مۆدێرنی پارەی نێودەوڵەتی، پێوەری زێڕی بەریتانی دوا بەشی سەدەی نۆزدە و سەرەتای ساڵەكانی بیستەم، گۆڕان و ئاڵوگۆڕی شیاو كرد.

بە چەمکێکی سادەوە، پێوەری زێڕ کاری کرد، چونکە زێڕ وەك دراوێکی گشتی پەسەند کرا لە لایەن هەر یەك لە بەشداربووەکانەوە لە سیستەمەکەدا. کاتێ ولاتی یەك شتێك دەکڕێت لە ولاتی دوو ئەوا ولاتی یەکەم زێڕی لە بڕی پارە بۆ ولاتی دوو دەگوازێتەوە. ئەمە پارەیەکی کەمتری بەخشی بە ولاتی یەك، بەلام لە هەمانکاتیشدا کۆمەڵە جوڵیەك بوو کە بەهۆیەوە هاوسەنگی هەردولا گێڕدرایەوە. بە زێڕی کەمتر هەردووکیان هێزی کڕین و ئاستی نرخی ولاتی یەك نزم بۆوە، سنووردارکردنی ئەوە چ دەکڕێت لە دەرەوە کاتێك هەرزانکردنی شتەکان بۆ ئەوانەی دەرەوە. وەك سەرەنجامێك، هاوردە کەمی کرد و هەناردن زۆری کرد، دانانی زەرەری بەرایی زێڕ. لە ولاتی دوودا پرۆسەی پێچەوانی ئەمە ڕوویدا: هێزی کڕین و ئاستی نرخی هەردووکیان بەرزبۆوە، هاندانی هاوردە و سەرکوتکردنی هەناردن، بۆیە زیانی بەرایی زێڕی نەهێشت.

لە کردەدا پێوەری زێڕ بە شێوەیەکی ئاوا ڕێك کاری نەکرد، بە شێوەیەکی یان ڕێگایەکی ڕاست. هەندێ ولات زیویان بەکارهێنا وەك زێڕ و پارە. زۆرجار زێڕ دەگوازرێتەوە لە نێوان بانقەکان لەوەی بە نێو سنوورەکاندا ببرێت. لە هەمووی گرینگتر، کەمتر لە گۆڕینی زێڕ، ئالوگۆڕ هەمیشە بەدەست دێت بە هۆی گۆڕانی ڕێژەی داشکانی بانقەکانەوە. ئەمە ڕێژەیەکی بەرچاوی بەرز یا نزم کردەوە، کە بەرزی کردەوە یان نزم، هەرشتێك کە گونجاو بێت، داوای هاوردە. زۆربەی هەموو ئەمانە لە لەندەن ڕوودەدەن. بەریتانیا جۆرە بەشدارێکی فراوان بوو لە بازرگانی نێودەوڵەتی و سیستەمی پارەدانی سەدەی نۆزدەهەم کە بە کاریگەر بە سەربەرخۆیی بتوانێت کارەکانی پێوەری زێڕ هەڵبسوڕێنێت.

سیستەمی زێڕ کە گالیسکەی پارەدانی نێودەوڵەتی بوو لە چاخی یەکەمی جیهانگیریدا بە قەد ئەوەی هەمیشە کاری کردبێت نزیك بوو لە سیستەمێکی تەواوی لیبرالی پارە. لەوە لیبرال بوو کە پارە بە ئازادی لێشاوی دەکرد لە نێوان سنوورەکان، بۆیە کەواتە، دەتوانێت بازرگانی بکات. حکوومەتەکان بەهای دراوی خۆیان ناشکێنن، کە جێگیر کرابوو، بۆیە دڵنیای ئەوە دەکەنەوە کە وەك کۆگای موعتەمەدی بەها دەمێننەوە و بۆیە بنەمایەکی تری لیبرال دەکەن ئەویش حوکمی یاسا لە کاروباری پارەدا. لە کۆتاییدا، پێوانەی زێڕ سیستەمێکی لیبرال بوو لە حکوومەتەکان بەگشتی کە دەست نادەنە لەگەڵ پرۆسەی ئالوگۆڕ بۆ گێڕانەوەی هاوسەنگی ناکەن.

بەلام ئەمە، کارنەکردنی سیستەمەکەی سەلماند. بۆ پرۆسەی ئالوگۆڕکردن (هەموارکردن) وەك کارە ئاساییەکانی بازاڕ لە نێو ولاتاندا، کاریگەری بە گرفتی هەبوو. هەروەها بەس وەك کارە



ئاساییەکانی بازاڕی ولاتانی ناوەوەی جیهان، لە سەدەی بیستەمدا ئەو لێکترازانانە لە ڕووی سیاسییەوە مەحاڵی پاڵپشتکردنی سەلماند.

لە ژێر پێوانەی زێڕدا، کەم و کوڕییەکانی پارە نەهێڵران لە ڕێگای نزمکردنەوەی ئاستی چالاکی ئابووری لە ولاتانەی خۆیان کەم و کوڕیان هەیە. نرخەکان دابەزین کاتێ پارەیەکی کەم بەردەست بوو، ڕێژەی بەرژەوەندی بەرزبۆوە کاتێ بانقەکان ڕێژەی خۆیان زیادکرد بۆ قازانجکردنی زێڕ، ئاستی سەرجەمی دامەزراندن (تەعینکردن) زۆرجار بە توندی کاری لێ کرا. ئەمە مانای ئەوەی گەیاند کە هەندێ خەڵك ئازاری چەشت لە برینداری ئابووری لە پرۆسەی هەمواركردندا. بازرگانی وای لێهات قازانجی کەم ببێتەوە، کرێکاران کارەکانی خۆیان لە دەستدا، دەبوایە جووتیارەکان باجی زیاتر بدەن بۆ ئەو متمانەیەی کە پشتیان پێ بەستووە. لە زۆربەی کاتەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا، بەلام، پارتە بریندارەکان ناتوانن سیاسەت و میکانیزمەکان بگۆڕن کە بووە هۆی برینداری. لەگەڵ مافی دەنگدان دەسەلاتی بەهێز سنووردار و تەسك (یان حکوومەتەکان بە تەواوی بەرپرس نەبوون لە خەڵك) گەڕایەوە لە سەرانسەری ولاتانی ناوەوەی جیهان، بۆ ئەوانەی کە کاریگەری ئەو لێکترازانەیان لە سەر نەبوو کە بە هۆی هەمواركردنەوە دروست ببوو. لە سەدەی بیستەمدا ئەمە گۆڕانکاری بەسەردا هات. لەگەڵ سەرهەڵدان و بلاوبوونەوەی دیموکراسی جەماوەری، ئەوانەی زەرەرمەند بوو، لە ژێر پێوانەی زێڕدا، لە لایەن پرۆسە ئاساییەکانی هەمواركردنەوە دەنگی بەدەست هێنا و هەروەها مافی ئەوەیان هەبوو داوا لە حکوومەت بکەن ئەو زەرەرانە بنبڕ بکەن، هەروەك ئەوانەی داوای ئەوەیان کرد کە حکوومەت تۆڕێکی سەلامەتی کۆمەلایەتی دابین دەکات بۆ بەرگریکردنی ئەو سەرسامیانەی لە لایەن کارە ئاساییەکانی بازاڕەوە سەریان هەڵدا. کاتێ پێوانەی زێڕ کاری پێکرا، لە لووتکەیدا وای لێهات هیچی تر بەردەست نەبێت، هەمان پێشکەوتنە کۆمەلایەتی و سیاسییەکان کە سەدەی نۆزدەهەمیان دروستکرد و ڕێچکەی پرۆسەی ڕێگە دان بە پێشکەوتنی بازرگانی تایبەتی ئابووریی بازاڕ، کە بەردەست نەبوو، لە سەدەی بیستەمدا بووە هۆی کۆتاییەکەی لە هەمان سەدە.

لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا دوو خەوشەکەی (عەیبەکەی) تر بۆ پێوانەی زێڕ ڕۆشن بوونەوە. سەرهەڵدانی بانقی حیجزکردنی لقدار، مومارەسەیەك کە بانقەکان بەردەوام بوون لە سەر گەنجینەی پارە وەرگرتن کە تەنها بەشێك لە ئەرکی دیاری بانقەکان بوو، ئەو مومارەسەیە چالاکی ئابووری زیاد کرد، بەلام چەند دامودەزگایەکی موعەرەزی دروستکرد بۆ وەرگرتنەوەی ئەو پارانە لە

نێو بانقەکان کە ئەمەش داوایەکی ترسناک و گەورەو کتوپڕ دەیتوانی بانقەکان بنەڕەتەوە تێك بشکێنێت، بەڵام بە شێوەیەکی کاتی شوێنی خۆیان گرتبوو، نەهێشتنی تێکشکاندنی بانقەکان بەم ڕێگایەدا پێویستی بە حکوومەتە بۆ ئەوەی کار بکات وەك " دواهەمین ئیختیاری قەرزدان"، حکوومەت دەبێ متمانە بۆ بانقەکان دابین بکات تاوەکو ئەوانیش لەو ئاستەدا بن بۆ پارەدان، تاوەکو ئەو داوایە ترسناکە هێوربکەنەوە بۆ پارە وەرگرتنەوە و دانی ڕاستەوخۆ، بەڵام ئەمە پێویستی بە تەسفییە کردنی پارە هەبوو، کە یاساکانی پێوانەی زێڕی پێشێلکرد.

دووەم خەوش ڕەگی داکوتا بوو لە شرۆڤەکردنی کینس بۆ سستییە مەزنەکەی بازاڕ. کینس باسی ئەوە دەکات کە ئەم سستییە مەزنە دروست بوو بە هۆی سەرفکردنی تایبەتی پارەیەکی زۆری نەگونجاو. دەکرێ ئەم سستییە چابکرێتەوە بە هۆی حکوومەتەکانەوە کە پارەی لە دەستچوو و سەرفکردنەکانی تایبەت بەخۆی قەرەبوو بکەنەوە بە هەقیقەت، پاڵپشتکردنی نەریتەکانی پێوانەی زێڕ یەکەم هۆ بوو کە حکوومەتەکانی وڵاتانی ناوەوەی جیهان لە بەراییدا هەرەسیان هێنا لە وەڵام دانەوەی سستییەکەی سییەکان بە ڕێگایەك کە ئەو سستییە ئابوورییە چارەسەر بکەن. سەرفکردنی حکوومەت بەس بوو بۆ کۆتایی هاوردەی ئەو سستییە ئابوورییە، بۆیە هەموو حکوومەتەکان پێکەوە دەبوایە چاوەڕێی بۆنەیەك بکەن کە بە هۆیەوە حکوومەتەکان هەمیشە خۆشیان بەوە دەهات بۆ بەلاوەنانی هەموو یاسا ئاساییەکان ئەویش: کاتی جەنگ بوو.

### *داشکانێکی مەزن لە نرخ*

لە کۆتایی جەنگی جیهانی دووەمدا، هیچی تر یاساکانی پێوانەی زێڕ بەکار نەهێنران. حکوومەتەکان لە وڵاتانی ڕۆژئاوای ناوەوەی جیهاندا ناچار بوون واز لە پێوانەکانی زێر بهێنن بە پێی یاس نەگونجاوەکانی کۆمەڵگا کە هەموارکردن لە ژێر ئەو یاسایانەوە بەدیهات. هەروەها لە بارودۆخە ناهەموارەکاندا، هەستیان بەوە کرد کە ناچارن بۆ دروستکردن و سەرف کردنی پارە. ئەمە کۆمەڵە ئیختیارێکی جارسکەری بۆ ئەو وڵاتانە خستەڕوو. سێ خەسڵەت لە هەر سیستەمێکی پارەدا پێویستە. یەکێکیان، سەرەنجامی شۆڕشی لیبراڵیزمی سیاسییە لە ماوەی سەدەی نۆزدەدا، توانایەکە بۆ هەر حکوومەتێك بۆ پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی پارەی سەربەخۆ تاوەکو سەرسامییەکان هاوسەنگ بکات کە کارە ئاسییەکانی ئابووریی بازاڕ



پێشکەشی دەکات. دوو خاسیەتە پێوستەکەی تر سیاسەتی لیبراڵی بنەڕەتین: ڕێژەی جێگیری ئاڵوگۆڕکردنە تاوەکو هەموو ببێت بە کۆگایەکی بەردەست و بەهادار، هەروەها لێشاوی ئازادی سەرمایە بەنێو سنوورەکان، بۆ هاوکاری کردنی بازرگانی ئازادو ئەوپەڕی هاوکاریکردنی خۆشگوزەرانی.

بوونی هەر سێ خەسڵەت سازانێکی مەحاڵ بوو. سەرکوتکرنی چالاکی ئابووری و گۆڕانی بەهای دراوی نەتەوەیی و هەروەها کۆنترۆڵکردنی لێشاوی شتەکان و پارە سێ میتۆدن بۆ نەهێشتنی کەم و کوڕییەکان لە هاوسەنگی پارەدانی وڵاتێکدا. گەر هیچ یەکێکیان بەردەست نەبوون، ئەوا لە سیستەمێکی پارەدا هەر سێ خەسڵەتە پێویستەکە دەبێ هاوکاری یەکتر بکەن، ئەگینا هەر کۆمەڵە ڕێکخستنێکی پارە دەبوایە لە دەست بچێت ئەویش: میتۆدی هەموارکردنە. پێوانەی زێڕ دووەم و سێیەم خەسڵەتە پێویستەکەی دابینکرد بە هۆی لابردنی یەکەم خەسڵەت. کاتێ، لە بەر پێشکەوتنە سیاسییەکانی سەدەی یەکەمی سەردەمی مۆدێرن، سەربەخۆیی پارە شتێکی مەحاڵ بوو، وڵاتانی خاوەن سەروەری دواتر ڕووبەڕووی داشکانێکی مەزنی لە نرخ کردەوە کە چوارچێوەیەکی پێکهێنا بۆ سیاسەتەکانی پارەی نێودەوڵەتی.

سیستەمی پارە پاش ١٩٤٥ داڕێژرا لە برێتن وودس، وەك دەوڵەتە خۆشگوزەرەکانی سەدەی بیستەم، هەوڵێك بوو بۆ ڕێگە چارەیەکی مام ناوەند لە نێوان بنەماکانی لیبراڵیزمی ئابووری و داخوازییەکانی دیموکراسی جەماوەری. (هەروەها ئەمەش ڕێگەچارەیەکی مام ناوەند بوو لە نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکان، چونکە چاوەڕێی هاوسەنگ بوونی پارەکانی کرد و بۆیە پێویست نەبوو بۆ هەموارکردن، ئەمە مشتومڕی لە سەر کرا بۆ لیبراڵیزمی ئابووری، هەروەها بەریتانیا لە لایەن (کینس)ەوە خرا ڕوو و چاوەڕێی کەم و کوڕی لێ دەکرا، نیازی دابینکردن بوو بۆ هێورکردنەوەی کاریگەری هەموارکردن.). سیستەمی پارە داڕێژرا بۆ دابینکردنی قازانجەکانی پێوانەی زێڕ، ڕێژەی ئاڵوگۆڕی جێگیر و لێشاوی ئازادی پارە بەنێو سنورەکان، بە بێ خەوشەکانی، میتۆدێکی تاك و لە ڕووی سیاسییەوە هەموارکردنی پەسەند نەکرد. کرۆکی سیستەمی برێتن ودس شتێکی تەعدیلکراوی پێوانەی زێڕ بوو. بەریتانی و ئەمریکییەکانیش سیستەمێکی دۆلار بەرامبەر زێڕیان دروستکرد واتە دۆلار بە زێڕ کە نرخی یەك میسقاڵ زێڕ ٣٥ دۆلار بۆ دانرا، دراوەکانی تر لکێنران بە دۆلارەوە. کەمتر لەوەی سووربوون لە سەر ڕێژەیەکی جێگیری ئاڵوگۆڕکردن بۆ دراوەکانی غەیرە دۆلار، برێتن ودس زۆرجار ڕێگەی بە

گۆڕاندا لە نرخ لە نێو سنوورە تایبەتییەکان. هەروەها ئەوەشی ورووژاند کە وڵاتانی خاوەن کەمو کورِی لە ڕووی بە هاوسەنگی پارەدان دەتوانن قەرز وەرگرن بۆ نەهێشتنی پێویستی بۆ هەمووارکردن لە ڕێگەی دروستکردنی چالاکی ئابووری، هەروەها دەکرا بارودۆخە شازەکان نرخ کەم بکرێتەوە، واتە نرخی نزمتری ئەو دراوانەی دژی دۆلار و زێڕن، کە ئەمەش بووە هۆی کەمکردنەوەی نرخی هەموو ئەرکە بێگانەکان. بۆ هەمووارکردنی قەرزەکان و سەرۆکایەتی کردنی بێ بەهایی کۆنفرانسی برێتن ودس گەنجینەی پارەی نێودەوڵەتی دروستکرد (IMF).

سیستەمی برێتن ودس وەك ئەوەی پلانی بۆ دانرا بوو کاری خۆی بە چاکی ئەنجام نەدا. ئەوەی ورووژاند کە کۆنترۆڵەکانی کاتی جەنگ لە سەر بزووتنەوەی سەرمایە خێرا بەرزدەبێتەوە پاش کۆتایی جەنگ، بەڵام ئەمە ڕووی نەدا. متمانە بۆ کۆنترۆلی سەرمایە خاسیەتێکی ڕوتینی سەردەمی برێتن ودس بوو، هەتا لە لایەن ویلایەتە یەکگرتووەکانیشەوە. کەم نرخی زیاتر بوون لە بیناسازی برێتن ودس کە نیازی وابوو حکوومەتەکان کە بەهای دراوەکانیان نزم کردەوە کەمتر جارِس بوون بۆ ڕاوێژکاری کردنی IMF، لێگەڕێ با بە تەنها روخسەتی خۆی وەرگرێت، پێش ئەنجامدانی ئەم کارە. وڵاتانی خاوەن کەم و کورِی لە ڕووی هاوسەنگی پارەوە هاوکاری داراییان وەرگرت، بەڵام نەك بە پێی پێویست لە IMF. گرینگترین هاوکاری لە سەرەتای ماوەی دوای جەنگ لە ویلایەتە یەکگرتوەکانەوە هات لە سەر شێوەی پلانێکی گشتی.

چاکبوونەوەی (ئاکیلەس) ی سیستەمی برێتن ودس ئەوەی سەلماند ڕۆڵێکی تایبەتی بگێڕێت لە دۆلار. بەسەرێکیان، بارودۆخی بە ئیمیتیازی دراوی ئەمریکی پێویست بوو. دۆلار شان بە شانی زێڕ بەکارهێنرا وەك لە سەر ئاستی جیهانەوە پەسەند کرا لەگەڵیدا مامەڵەی نێودەوڵەتی دەکرێ پەیڕە بکرێت. ئەمە ئاستێکی بەرزتری چالاکی ئابووری نێودەوڵەتی شیاو کرد تا بڕی دیاریکراوی زێڕ ی بەردەست بۆ وڵاتانی ناوەوەی جیهان هاوکاریان بکات، بەم شێوەیە جیهانی دەوڵەمەنەتر کرد. بەرزبوونەوەی ئابووری دوای جەنگی جیهانی دووەم پشتی بەست بە مامەڵەکردنی دۆلار وەك پارەیەکی نێودەوڵەتی کە وەك زێڕ بە قەدر بوو.

لە لایەکی دیکەوە، ئەم بارە تایبەتە تەناقوزێکی دروستکرد. بە هۆی یاساکانی برێتن ودس، دەکرێ دۆلار بە زێڕ فیدییە بکرێت، واتە نرخی هەر میسقاڵێك زێڕ ٣٥ دۆلار بێت، بەڵام ئەمریکا هەرچەند دۆلاری زۆر هەبێت لە نێو بازاڕدا، ئەوەندە ئەرکی ویلایەتە یەکگرتووەکان بە بەراورد لەگەڵ گەشەی گونجینەی زێڕ بە هێواشی، ئاستەمتر دەبوو بۆ





پاراستنی ئەم بەڵێنە. لە شەستەکان پاراستنی ئەم بەڵێنە مەحاڵ نەبوو. ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەوەندە زێری پێوستی نەبوو بۆ فدییەکردنی هەموو دۆلارەکان لە بازاڕی دەرەوەدا هەرچەند لە تیۆردا پابەند بوو بەوەی کەوا بکات.

حکوومەتی فەڕەنسی هەڕەشەی لە دۆلاری خۆی خستەڕوو بۆ فدییەکردن. پاڵنەری کەمتر هەبوو بۆ بەهێزکردنی گەنجینەی زێڕی خۆی، بۆیە ناڕەزایی خۆی بۆ ئیمیتازی بارەکانی دۆلار لە سەر حکوومەتی ئەمریکی دەربڕی، چونکە دۆلار دراوێکی حیجزکراوی هەموو جیهان بوو، دۆلار دەبوایە لە سەر ئاستی جیهانییەوە پەسەند کرابوایە. بۆ وڵاتانی تر، ڕەتکردنەوەی دۆلار سیستەمی پارەی نێودەوڵەتی دەخاتە مەترسییەوە لە کاتێکدا هەموو وڵاتان پشتیان بە دۆلار قایم بوو، بەڵام پەسەندی بێ سنوور و جیهانی دۆلار مانای ئەوە دەگەیەنێت کە ویلایەتە یەکگرتووەکان دەتوانێت وەسڵەکانی دەرەوەی خۆی بدات بەو پارەیەی کە خۆی چاپی دەکات. بە بۆچوونی فەڕەنسا (نەك هەر تەنها لە ڕوانگەی فەڕەنسییەکانەوە) هیچ وڵاتێك مۆڵەتی ئەوەی نییە پارە بە گشتی و بەخۆڕایی سەرف بکات هەروەها ئەو پارەیەشی نییە. ئەو ئیمتیازەی ویلایەتە یەکگرتووەکان تامی لێ وەردەگرێت ئەوانی تری سزادا، چونکە، بە هۆی پەسەندکردنی دۆلارەوە، خەزنی پارەی خۆیان زۆرترکرد، کە لە کۆتاییدا ئاستی بەرهەمهاوردەی بەرز کردەوە. بۆ نەهێشتنی بەرزبوونەوەش دەبوایە هەنگاو بگرنە بەر بۆ سەرکوتکردنی چالاکی ئابووری خۆیان، ئاستەمییەکەی لە ڕووی سیاسییەوە ئەوەبوو پێوانەی زێڕ کۆتایی پێ دەهات. بە هەقیقەت، ئەمریکییەکان ئەوانی تریان ناچار دەکرد بۆ هەموارکردن.

کاتێ وەرگرتنی سوود لە ئیمیتازی باری تایبەتی دۆلار بەخشرا، حکوومەتی ئەمریکی بە پێداگرتنی لە سەر سنوورەکانی ئەم بارە خستەڕوو. گرێی سیستەمی پارەی نێودەوڵەتی ویلایەتە یەکرگرتووەکان، هەروەك هەموو وڵاتانی تر دەتوانن، ئەو ناتوانێت بەهای دراوی خۆی بگۆڕێت، بەڵام تەواو پشووی نەدا فشاری خستە سەر هەموارکردن، واتە لە ڕەگی لێشاوی دەرەوەی دۆلار، هەروەها هەنگاوەکان بۆ بەدەستهاوردەی ئەمە کاریگەری هێواشکردنی ئابووری ئەمریکی هەبوو، وای لە حکوومەت دەکات جەماوەری نەبێت لەگەڵ هەڵبژێرەری ئەمریکی. سەرەڕای ئەمە، بەپێی تێپەڕبوونی کات دۆلار بەهادار تر بوو بە بەراورد لەگەڵ دراوی وڵاتانی تری ناوەوەی جیهان. ئەمە شتێکی سەرسام نەبوو. ڕێژەی ئاڵوگۆڕەکان دانرا بوون لە کارەساتی ڕاستەخۆی جەنگ کاتێ دراوەکانی شەریکی بازرگان ئەمریکی ئابووریان

بەش بوو بەهۆی جەنگەوە، هەروەها لە ڕووی مێژووییەوە بێهێز بوون ئەم بارە ناسەقامگیرە قورس بوو لە سەر هەناردنەکانی ئەمریکا. لە کۆتاییدا، لە مانگی ئابی ١٥، ١٩٧١، حکوومەتی ئەمریکی بە تەنها خزمەتی پەیوەندی نێوان دۆلار و زێڕی کرد هەوەرها کۆتایی هێنا بە سیتسەمی برێتن ودس.

بەرپرسە ئەمریکییەکان بە نیازی بەلاوەنانی برێتن ودس نەبوون بە تەواوی. مەبەستی ئەوان دابەزینی نرخی دۆلار بوو، نەهێشتنی کەم و کوڕی هاوسەنگی باجدانی ئەمریکی بوو، هەروەها پاشان ڕژێمێکی ڕێژەی ئاڵوگۆڕکردن دروست بکەنەوە لە سەر بنچینەی نرخێکی نزمتر، بەڵام کۆششی دووبارە گێڕانەوەی برێتن ودس پێکەوە شکستی هێناو جیهان پێی نایە سەردەمێك کە تیایدا ڕێژەی ئاڵوگۆڕکردن خەریك بوو بەسەر بکەوێت، هەروەها وڵاتانی ئەورووپاو گروپە هەرێمییەکان کۆششێکی ئەوتۆیان نەکرد بۆ جێگیرکردنی ئەو ڕێژەیە.

سیستەمەکە لە ساڵی ١٩٤٤ دامەزرا بە غەیرە سیستەمێك جێگاکەی گیراوە کە تیایدا لە سەر ئاستی جیهانییەوە لە سەر ئەو یاسایەنە کۆك نەبوون بۆ حوکمکردنی لێشاوی دراوی نێودەوڵەتی، هەرچەند لە کردەدا هەتا حکوومەتەکان لەگەڵ ڕێژەی بەسەر کەوتو، هەوڵی وروژاندنی دراوەکانی خۆیاندا تاوەکو نرخی جیا جیا بە شێوەیەکی فراوان یان بە خێرایی نەهێڵن. ئەم غەیرە سیستەمە ئەرکە بنەڕەتییەکانی پارەی پێکهێنا کەمتر لەو ئەرکانەی کە پێشبینیان دەکرد، چونکە نرخەکانی دراو ئێستا بەرز و نزمی تیایە، لە ڕوانگەیەکی نێودەوڵەتییەوە هەموو دراوەکان بە دۆلاریشەوە کەمتر پشتیان پێ دەبەسترا هەم وەك کۆگاکانی نرخ و هەم وەك یەکەکانی ئاڵوگۆڕکردنیش. غەیرە سیستەمەکە سیستەمێکی پارەی لیبراڵی کەمتر بوو لەوەی برێتن ودس، تەنیا تر بوو لەوەی پێوانەی زێڕی سەدەی نۆزدەهەم، چونکە حکوومەتەکان ئازادتر بوون بۆ کۆنترۆڵکردنی دراوەکانیان، هەروەها کۆنترۆڵکردنی نرخە جیهانییە گرینگەکان.

ترسی ئەوەی کە کۆتایی برێتن ودس و دەستپێکردنی ڕێژەی بەسەرکەوتووی ئاڵوگۆڕی جیهانی، جیهانی بازرگانی دەوەستێنێت، بەڵام، دانی پیا نەنرا. ترسەکە هەم بنەمای مەنتیقی و هەمیش مێژوویی هەبوو. هەڵبەز و دابەزی بەردەوام یانیش هەندێ جار لە نرخی دراوەکان مامەڵە نێودەوڵەتیان سارد دەکاتەوە، چونکە کڕیار و فرۆشیار ناتوانن دڵنیا بن لە نرخی کۆتایی مامەڵەیەك و گومانیش لەمە دوژمنی چالاکی ئابوورییە. ئاڵوگۆڕکردن ڕوونادات بە



بێ متمانەی ئەوەی کە پەیوەندییەکان بەهێز دەبن، بۆیە دادەخرێن کاتێ بەشداربووان گومانیان هەبێت لە بەهای پارە کە دەستا و دەست ئاڵوگۆڕ دەکرێت و دەگۆڕدرێتەوە. لە ئەزموونی پێشتری ڕێژەی ئاڵوگۆڕی ناجێگیردا، پاش سستییەکە بە ڕووخانی پێوانەی زێڕیشەوە لە ماوەی نێو جەنگدا، قەبارەی بازرگانی دابەزی. حکوومەتەکان کۆنترۆڵکردنی دراویان بەکارهێنا وەك ئامێرێکی پاراستن، نرخی دراویان دابەزاند تاوەکو نرخی شتەکانی وڵاتانی تر لە دەرەوەی بازاڕی ماڵی ئەوان هەرزانتر بکڕن لە کاتێکدا بەرهەمی دروستکراوی خۆیان بە هەرزانتر بە دەرەوە دەفرۆشن. ئەم سیاسەتە بەناوبانگەش ناوی لێنرا" دراوسێی سواڵکەر" کە هەموو ئەوانەی ئەو سیاسەتەیان پەیڕەو کرد خراپتر بوون، سیاسەتەکانی برێتن ودس، سەرەڕای دووپاتکردنەوەی سەقامگیری ڕێژەی ئاڵوگۆڕکردن، بە ئاشکرا داڕێژرا بووو بۆ نەهێشتنی نرخی جیا جیا.

ئەو ڕێژەیەی کە بازرگانی جیهانی فراوانکرد هاتە خوارەوە پاش ١٩٧١، بەڵام ئەمە چەند هۆکارێکی لە پاڵ بوو: نەك هەر تەنها کۆتایی ڕێژەی جێگیرکردنی ئاڵوگۆڕکردن، بەڵکو سستبوونی بازرگانی جیهانی حەوتاکانیش دەستیپێکرد بە هۆی بەرزبوونەوەی زۆری نرخی نەوت، کەمکردنەوە لە ڕێژەی گەشەی ئابووری لە وڵاتانی ناوەوەی جیهان لە بەر تێگەیشتنی ڕێژەی چاکردنی بەرهەم هاوردەی کەم کردەوە، هەروەها فۆرمی نوێی پاراستنی ناسراو بە " بەربەستی بێ باج" دەرکەوت. لە سەرانسەری جیهان بازرگانی بەردەوام لە فراوان بووندا بوو پاش پازدەی ئابی ١٩٧١، هاوکات ئەو ڕێژەیەشدا لە دابەزیندا بوو. جیهان ڕاهات بەوەی چۆت بژیت، هەمیشە بە مورتاحی نا، لەگەڵ ڕێژەی سەرکەوتووی ئاڵوگۆڕکردن.

بەڵام کۆتایی برێتن ودس هیچ ئاکامێکی لێ نەکەوتەوە بۆ ئابووری نێودەوڵەتی. نەك هەر ئاکامی گرینگی لێ نەکەوتەوە، بەڵکو زەلکاوی بەرفراوانی سەرمایە بەدەرکەوت و بەکارهێنرا بۆ داگیرکردن دژی ئەو مەترسیانەی ڕێژەی ئاڵوگۆڕکردنی بە ناجێگیری بەرزکردەوە. ئەم گەنجینانەی پارە بەردەست بوون بۆ قسە و قسەلۆکی دراو بوو. هەروەها قسە و قسەلۆکی دراویش وای لێهات بوو بە خاسیەتێکی ناجێگیری سەرەکی دەیەی یەکەمی دوای جەنگی سارد، نیشانەیەك بوو کە، سەرەڕای سەرکەوتنی بازاڕ لە نێو وڵاتانی خاوەن سەروەری، پێکهاتە لیبراڵییەکانی ئابووری نیودەوڵەتی بە پێی پێویست نیازی بە ڕێکی کارکردنی نەبوو لە سەدەی بیست و یەکدا.

## چاپتەری -١٢-

## داهاتووی ئابووری نێودەوڵەتی

کچێکی بچووك سەردانی دەستە خوشکەکەی دەکات بۆ نانی ئێواریێ. دایکی هاورێکەی دەڵێت " سۆزی، ئەمشە و گیای برۆکسلّمان هەیە"، " حەزت لێیە؟"، کچەکەش لە وەڵامدا دەڵێت " ئۆو بەڵێ، زۆر خۆشە". بەڵام کاتێ دایکەکە دوای نانخواردن قاپەکان هەڵدەگرێتەوە، سەیر دەکات ئەو برە گیای برۆکسلّەی بۆ کچەکەی داناوە هەروەك خۆیەتی و هیچی لێ نەخواردووە. دەڵێت " سۆزی وابزانم تۆ ووتت حەزم لە گیای برۆکسلّە"، کچەکەش لە وەڵامدا دەڵێت بێگومان حەزم لێیەتی، بەڵام حەزەکەم ناگاتە ئەو رادەیەی بیخۆم."

بنەماکانی لیبراڵیزمی ئابووری نێودەوڵەتی بۆ نزیکەی زۆربەی وڵاتان لە جیهان لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا هەمان ئەو چیرۆکەی سەرەوەیە. هەموویان گەرانەوە یان حەزیان لێ بوو پەیوەندی بکەن بە رێکخراوە سەرەکییەکەی ئابووری نێودەوڵەتی و رێکخراوی بازرگانی جیهانی و گەنجینەی پارەی نێودەوڵەتی. مەبدەئیەن هەموویان پابەندبوون بەو ئایدیانەی کە ئەو رێکخراوە دەستەبەری دەکرد: لێشاوی ئازادی شتەکان و سەرمایە چووە نێو سنووری نێودەوڵەتی، بەڵام کاتێ هاتە سەر رێگەدان بە ئەکسێسێکی تایبەت بۆ بازاڕی خۆیان و پارەی تری وڵاتان هەروەها بە تایبەتی هەناردنی تایبەتی وڵاتانی تر، هەموو حیجزیان هەبوو، چونکە بەرهەم و پارە لە دەرەوە دەتوانن لێکبترازێن وەك ئەوەی دەوڵەمەن بن. لێکترازان تێچووی سیاسی دەسەپێنێت، کە حکومەتەکان حەز دەکەن نەیهێڵن.

کەواتە، وەك سۆزی و گیای برۆکسلّ، بابەتی سەرەکی کاروباروی ئابووری جیهانی نێودەوڵەتی لە سەدەی بیست و یەکدا ململانێ بوو لە نێوان پابەندبوونێکی سەرەکی و رقێکی کردەیی لە بنەما لیبراڵییەکاندا.



### قەیرانی پارە (دراو)

نەوەدەکان، واتە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی سارد، گەلێ قەیرانی سەرەکی پارەی بەخۆوە بینی. لە هەریەکەیاندا حکومەتێك ناچارەکرا بۆ نەهێشتنی دراوێك کە بەڵێنی دابوو بۆ بەرگریکردن (واتە، فدییەکردن لە ئالۆگۆڕکردن بۆ حیجز) لە رێژەی جێگیر، داواکان بۆ ئازادکردن گەشەی کرد تا ئەو رادەیەی کە حکومەت خۆی خستە مەترسییەوە تەواوی بکات لە کۆگاکان تاوەکو نرخەکەی کەم بکاتەوە و پێشکەشی پارەی تایبەت بەخۆی بکات، واتە هەڵگرتنی پارەی زۆر هەرزانتر کرد.

یەکەم قەیران لەم قەیرانانە لە ئەورووپای رۆژئاواوە هات. لەوێ رێچکەیەکی هەرێمی رێکخستنەکانی برێتن وودس دامەزارو پێی وترا سیستەمی پارەی ئەورووپی (EMS)، کە بە هۆیەوە دراوەکان رێگەیان پێدرابوو بۆ بەرزی و نزمی تەنها لە نێو چوارچێوەیەکی دارێژراودا. لە ساڵی ١٩٩٢ دا بەریتانیا و ئیتاڵیا بریاری ئەوەیان دا بەرگری لە دراوەکانیان نەکەن لە رێژەی EMSدا، پاشەکشەیان لە سیستەمەکەدا کرد، هەروەها نرخی دراوەکانی خۆیان دابەزاند. دوو ساڵ دواتر (پیزۆ)ی مەکسیکی کەوتە بەر هێرشان و حکومەتی مەکسیکی نەیتوانی بەرگری لێ بکات بەو رێژەی کە خۆی پێ پابەند کردبوو. پاشان، لە ساڵی ١٩٩٧، قەیرانی دراو لە ئاسیا دەستی پێکرد. لە مانگی تەمووزی ئەم ساڵەدا تایلاند و مالیزیا بەرگریان لە دراوی خۆیان نەکرد. لە مانگی دە و یانزەدا ئەندەنوسیا و کۆریای باشوور هەمان شتیان کرد. ساڵی پاشتر هەمان ترس لە رووسیاش بلاو بۆوە. لە مانگی ئابدا، حکومەتی رووسی نەك هەر تەنها بەرگری لە رۆبڵ نەکرد، بەڵکو رێگەی پێدا نرخی بە ئاستێکی زۆر نزم دابەزێت، هەروەها پارەدانیشی راگرت بۆ هەندێ ئاسایشی دەرەوەی رووسیا.

قەیرانەکانی دراو لەم جۆرە قەیرانی بێوێنە بوون لە ماوەی دوای جەنگی ساردا، بەڵام وەك شەپۆلی توندوتیژی رەگەزی نەوەدەکان، هەریەکەیان لە پێشکەوتنە سیاسییەکەی بەروە کۆتایی جەنگی سارد رەگیان داکوتا. سەنتەری رووداوەکانی ئەورووپا یەکگرتنەوەی ئەڵمانیا بوو پاش ماوەی جەنگی سارد. رووخانی کۆمۆنیستی پێشووی کۆماری دیموکراتی ئەڵمانیا، کۆماری فیدرالی ئەڵمانیا رووبەرووی دارمانی خەڵك بۆوە کە لە رۆژهەڵاتەوە دەچون بۆ رۆژئاوا بۆ کار پەیداکردن بە مووچەی بەرزتر و خۆیان بگونجێن لەگەڵ سوودەکانی کۆمەڵایەتی ئەڵمانیای رۆژئاوا کە خێری باشتر بوو بۆ ئەوان. بۆ هێشتنەوەی هاوڵاتییەکانیان لە ماڵ، حکومەتی ئەڵمانیا

بڕیاریدا مووچە و قازانجی خۆی لە ڕۆژهەڵات بەرز بکاتەوە. ئەمەش خەرجییەکی زۆری دەویست، چونکە وەزیری دارایی حکوومەت هێلموت کۆهل بەڵێنی ئەوەی دابوو باج بەرز نەکاتەوە لە کاتی یەکگرتنەوەدا، هاوکاری کران بەوەی کە قەرزیان پێدرا. سەرەنجام، ڕێژەی بەرژەوەندی ئەڵمانی بەرزبۆوە، بە پێی یاساکانی EMS، ڕێژەی بەرژەوەندی لە وڵاتە ئەندامەکانیش بەرزبۆوە، کە لە ڕووی سیاسییەوە دەسکەوتێك بوو بۆ بەریتانیا و ئیتاڵیا.

لە مەکسیکۆ و ئاسیا سەرکەوتنی جیهانی بازاڕ وای لە وڵاتانەی کە پێشتر بێگانە بوون، کرد ئەوە لە یاد بکەن کە شوێنی سەرنجڕاکێشن بۆ سەرمایەی ڕۆژئاوا. لە کاتێکدا، لە کاتی جەنگی ساردا ناسرابوون بە " وڵاتە پێشکەوتووەکان"، لە ماوەی دوای جەنگی ساردا دەرچوون وەك وڵاتی " بازاڕە پەیدابووەکان" و گوازرانەوە، بە چاوی ڕۆژئاواییەکان، لە کاندیدەکانەوە بۆ هاوکاری گشتی نێودەوڵەتی بۆ دەرفەتەکان تاوەکو قازانجی تایبەتی بکەن. سەرمایە بوو بە زریان لە ناوەوە، مەترسی پارە دانەوە خەریك بوو سەرهەڵبداتەوە.. تاکە هۆ لە پاڵ زیادبوونی مەترسی بەستنەوەی چین بوو بە نێو سیستەمی ئابووری جیهانی کە ڕۆژئاوا سەرکردایەتی دەکرد. بە کرێکارە هەرزانەکانییەوە، چین وەك ڕکابەرێکی ئابووری گەورە خۆی دادەمەزراند بۆ دراوسێکانی لە ئاسیا لە بازاڕە ڕۆژئاواییەکان، بایەخی بەرزبوونەوە لە ڕۆژئاوا کە وڵاتە ئاسیاوییەکانی تر نەیاندەتوانی دراوی پێویستی قازانج لە دراوی ڕۆژئاوا بکەن بۆ خزمەتکردنی قەرزەکانی ڕۆژئاوا بۆ بانقەکانیان. ئەو بایەخانە یارمەتی ئەوەیاندا قەیرانی دراوی ئاسیایی دەست پێبکات. هەروەها بێگومان، تاعونێکی ناسەقامگیری دراو نەدەکرا لە ڕووسیا بڵاو بووباوە لە کاتی جەنگی ساردا، چونکە یەکێتیی سۆڤیەت بەشداری نەکرد لە سیستەمی لیبراڵی پارەی نێودەوڵەتی.

قەیرانەکانی دراو پولی سەردەمی دوای جەنگی ساردی هەڵگرتبوو بە ڕێگایەکی تر: لە جەرگەی هەر یەکەیان کۆششێك هەبوو بۆ درێژەپێدانی هەرتك ڕێژە جێگری ئاڵوگۆڕکردن و لێشاوی ئازادی سەرمایە، لە ڕۆحی بنەماکانی ئابووری لیبراڵ پاش ڕووخانی کۆمیونیزم ڕێژە جێگری ئاڵوگۆڕکردن و لێشاوی ئازادی سەرمایە بەرەنگاریان لێ نەکرایەوە. یەکەم لە وڵاتانی ناوەوە دواتریش لە وڵاتانی دەرەوەی جیهان، کۆنترۆڵەکانی سەرمایە بە ڕێکی لێکترازان لە سەردەمی دووەمی جیهانگیریدا. وڵاتانی دەرەوە وەك مەکسیکۆ وای لێهات پشت بە سەرمایەی دەرەوە ببەستێت بۆ گڕبەردانی گەشەی ئابووری، هەروەها دراوەکانی خۆیان بە



دۆلار گۆڕییەوە بۆ دڵنیاکردنی وەگەڕخەرە بێگانەکان لە کاتێکا ئەوەی دانرا بوو دەکرێ بە بێ زەرەر بکشێنەوە لە نرخی دراودا.

لە هەر حاڵەتێکدا، قسە و قسەلۆك بووە هۆی چاندنی گومان و پرسیار بخەنە سەر ئەو وڵاتانەی کە ناتوانن بەرگری لە ڕێژەی ئاڵوگۆڕکردن بکەن کە خۆیان پێی پابەند کردبوو، هەروەها نەبوونی کۆنترۆڵی سەرمایە دەبێتە هۆی ئەوەی بڕێکی زۆری پارە دەرەوەی دراوە ناوخۆییەکان زۆر بەخێرایی بگوازرێتەوە. ئەوانەی لەم سەین و بەینەدا تێڕادەمان دراوی خۆیان دەفرۆشت نەبادا هێرشی نرخ دابەزینی دراویان بکرێتە سەر. بۆیە پەلەیان کرد خێرا ئەوەی هەیانبوو جێبەجییان کرد، بەمەش سەرکەوتن، چونکە پێشبینییەکەیان لە مەڕ ئەو هێرشە هاتە جێ. لە هەر حاڵەتێکدا، حکوومەت دەستپێشخەری کردو پاراستنەکانی خۆی گواستەوە بۆ بەرگریکردن لە دراوەکانی، بەڵام بڕی پارە دەستکەوت بۆ هێرش، کۆگاکانی سەرمایە کە کۆکرابۆوە لەوەتەی کۆتایی سیستەمی برێتن ودس، ئەوەندە زۆر ببوون حکوومەتی زۆر سەرقاڵ کرد.

جیاوازی گرینگ هەبوون لە نێوان هەر سێ دەستپێکی ناسەقامگیری دراو. بە پێچەوانەی ئیتاڵیا و بەریتانیا، ئەوانەی ئاسیا قەرزی تایبەتیان تێوەگلاند کەمتر لەوەی ئەرکەکانی حکوومەت، قەرز هەبوو تەنها لە لایەن بانقە ناوخۆییەکان کە دۆلاریان هێنا بوو لە ڕێژەی جێگیر و دواتریش پارەیان بە قەرزدەدا بە دراوی ناوخۆیی. بە پێچەوانەی ئەوانی تر، هێرشەکانی سەر دراوەکانی ئاسیا دەست پێنەکرابوو لە لایەن ناهاوسەنگی ئابووری حکوومەت. وێکچوونێکی لەخۆ گرت بۆ بڵقی دارایی مەزنی مێژوویی لە نێوان، زەنبەقی هۆڵەندی شێتی سەدەی حەڤدەهەم یان بڵقی دەریای باشووری سەرەتای سەدەی هەژدەهەم. لە هەر حاڵەتێکدا پارە بۆ وەگەڕخستنێکی تایبەتی بەکار هات، دروستکردنی ئیتیباعی چەوت بەوەی نرخەکەی بەردەوام لە بەرزبوونەوەدا بوو. لە هەندێ خاڵدا سۆزی زاڵ لە تەماعەوە گۆڕا بۆ ترس. هەڵگرانی شتەکان، درەوشانەوەی زەنبەقی هۆڵەندی، بەشی هەیە لە کۆمپانیای دەریای باشووری تایوەنی، کۆریای باشوور، دەستی بە فرۆشتن کرد. ئەمە پاڵەپەستۆیەکی دروستکرد کاتێ وەگەڕخەرەکان، تەوەقوعی دابەزینی نرخیان دەکرد، پەلەیان کرد لە شیکردنەوەی سەرمایە، بۆیە نرخیش دابەزی. لەم جۆرە بارودۆخانەدا، ترس مەنتقییە. لە بازاڕێکی دابەزیودا، هەرچەند وەگەڕخەر خێراتر شتەکانی بفرۆشێت، ئەوەندە زیاتر وەگەڕخستنەکەی دووبارە دەبێتەوە.

قەیرانەکان لە مەکسیکۆ و ئاسیا گۆڕاو بوون، هەروەها ناسەقامگیری دراو بڵاو بۆوە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر. ئاستەنگی بەرایی دراو لە هەردوو حاڵەتدا وای لە وڵاتانی هەمان شێوە یان دراوسێ بکات کتوپڕ خۆیان بخەنە مەترسییەوەو بە پەلە دراوەکانیان بفرۆشن. کاتێ نرخ لە وڵاتێك دادەبەزی، دراوی وڵاتانی تر دەستبەجێ دەنێردرایە نێو بازاڕەوە، چونکە پاڵپشتکردن لە نرخی هەنووکەیی هەناردنی وڵاتی ئیفلیج دەکرد و بێ بەش دەبوو لە دراو. پێشبینی مەنتیقی ئەوەبوو کە نرخی ئەو دراوانە دادەبەزی، بۆیە ئەو ماوەیە گرینگ بوو بۆ فرۆشتنی دراوەکانیان. بۆ مەکسیکۆ و وڵاتە نائومێدەکانی ئاسیا، بەڵام بۆ بەریتانیا، ئیتاڵیا نا، بازاڕی نێودەوڵەتی ڕێکخرا بوو و قەرزی تەواویش دابین کرابوو، ئەمەش بەهۆی پەلەکردنی ئەمریکا، لە ڕێگەی IMFوە. سەرەڕای قەرزەکان، لە وڵاتانی دەرەوەی جیهاندا قەیرانەکانی دراو کاریگەرە ئابوورییەکانیان وێران کرد. بەریتانیا و ئیتاڵیا سوودیان لە دابەزینی نرخی خۆیان وەرگرت بە بەرزبوونەوەی هەناردن و نزمبوونەوەی بێکاری. بەرهەم هاوردە لە مەکسیکۆ بە تایبەتی لە ئاسیا بە خێرایی دابەزی. بانق و بازرگانی و، هەروەها کارگەکانیش داخران، کار نەما، مووچە زۆر کەم بۆوە، نرخ زۆر بەرز بۆوە. لە مەکسیکۆ و هەندێ وڵاتانی ئاسیا (جگە لە ئەندەنووسیا) گەشە دەستی پێکرد لە ماوەیەکی زۆر کەمدا بە پرۆشیەوە دەستی پێکرد، بەڵام ڕووخانی ئابووری لە زۆربەی وڵاتانی تر خراپتر بوو زیا لە هەر سستییەکی بازاڕی وەرزی لە وڵاتانی ناوەوەی ڕۆژئاوا پاش ساڵی ١٩٤٥.

## هۆشیارکردنەوەی بەرایی بۆ " پارە"

لە سەرەنجامی قەیرانەکانی دراودا، سەرژمێرییەك ئەنجامدرا لە سەر پێوەرێك بۆ نەهێشتنی دووبارەبوونەوەی هەمان ڕووداوە خراپەکە واتە: متمانەی چڕتر، لە وڵاتە گرێدراوەکاندا، لە سەر پراکتیزە بنەڕەتییەکانی توندڕەوی شەفافییەت. بانقە ئاسیاییەکان کە قەرزیان وەرگرتبوو لە وڵاتانی ناوەوەی جیهان جۆرە زانیارییەکیان سەبارەت بە کارەکانیان دەستەبەر نەکردبوو، هەروەها زانیاریان لە بارەی توانای ئابووری قەرزەکان کە هێنا بوویان نەبوو، کە لە ڕۆژئاوا بە پێی یاسای ستانداردەوە هەژمار دەکرا. (حکوومەتی مەکسیکیش بە تەواوی کاندید نەکرابوو بۆ پۆستی ئابووری)، چونکە هەواڵە خراپەکان چاوەڕێ نەکراو بوون، کاتێ هەواڵەکان



ڕووکەشی بوون لە فۆرمی ڕاپۆرتەکانی قەرزە زۆرەکان لە سەر حیجزەکانی بانقە ئاسیاییەکان، بۆ نموونە، وەگەڕخەرەکان بە خێرایی گەنجینەی خۆیان سەحب کردەوە لە بانقەکان.

چاکسازییەکی پەیوەست و درێژخایەنتر لە ئارادا بوو بۆ کەمکردنەوەی پشت بەستن بە بانقەکان هەروەها زیادکردنی هاوردەی بۆرسە و بازاڕەکان بە یەکسانی، کە پێویستی بە زانیاری هەبوو لە بانقەکان تاوەکو کار بکات. بەبێ شەفافییەت وەگەڕخەرەکان بە پارەکەی خۆیان نابن بە بەشێك لە بازاڕدا. هەروەها بازاڕەکان، بە پێچەوانەی بانقەکان، ناتوانرێ بە ژمارەیەی کەمی خەڵك ئاسایی کۆنترۆل بکرێت. سیستەمی بەڕێوەبردنی پارە لە ڕووی ئابوورییەوە پرۆژەیەکی ئابووری بوو تاوەکو لە ڕووی سیاسییەوە خەڵکی تەواو پەیوەست بەو پڕۆژەیە قازانج بکەن، کە دواتر ناسرا بە " هاوەڵی کاپیتاڵیزم"، گەر بانقەکان کەمتر لە بازاڕەکان بریکاری ناوەندی دارایی بن ئەوا کارکردن ئاسانتر دەبوو.

میتۆدێکی ناسراوی تری هێرشێکی نامۆ و نەهێشتنی ڕوودانی شتێك لە سەر دراو نەبوونی کۆنترۆلکردن بوو لە سەر بزووتنەوەی نێودەوڵەتی سەرمایە، هەروەها ئەمەش وای لێهات ببێت بە پێگەیەك لە سەرەنجامی قەیرانەکانی دراودا. جۆرە کۆنترۆڵکردنێکی ئاوا خزمەتی هەمان مەبەست دەکات وەك کۆنترۆلکردنەکان لە سەر سیستەمی ئاوەڕۆ: کۆنترۆلکردنی سەرمایە زیاتر گفتوگۆهەڵگر بوو لە پراکتیزەکانی شەفافییەت. هەروەك سنوورە سەپێنراوەکانی حکوومەت لە سەر ئاڵوگۆڕکردنی نێودەوڵەتی ئازاد، جودابوونەوە لە ئۆرتۆدۆکسی لیراڵ خۆیان خستە مەترسی دابەزینی ئاستی ئابووری.

وێڕای ئەمە، لە سەردەمی دووەمی جیهانگیریدا، بە کەناڵە قەبەکانی سەرمایە و بازرگانییەکی چڕ، پارە زۆر زەحەمت بوو کۆنترۆل بکرێت. وەك ئاو بە نێو هەموو کەلێنێکدا ڕۆدەچوو هەتا بەنێو ئەو بەربەستانەش دزەی دەکر کە دژی دانرا بوون. یەکێك لە وڵاتە ئاسیاییەکان کۆنترۆڵی سەرمایەی سەپاند، ئاکامێکی سەرکەوتووی لێکەوتەوە، بەڵام تەمەنی کورت بوو، بەڵام مالیزیا، لە لایەن پیاوێکی دڕندەو سەیر کە ناوی موحەمەد موهزیرە بوو سەرکردایەتی دەکرا، هەستا ئایدیایەکی نەگۆڕ و ناشیرین و کۆنی وروژاند بەوەی کە لۆمەی پێشبینیکەرانی جوولەکەی کرد بۆ کێشە داراییەکانی وڵاتەکەی. لە سەر ڕۆیشتن و لێك جودابوونەوە لە بنەماکانی ئابووری لیبراڵ کە کۆنترۆلە سیاسەکان خرانە ڕوو، کادری پسپۆری

ئابووری نێودەوڵەتی، بە پێچەوانەی یاسای مەسیحی، یاسا باشتر لە سەر تاوانەکە جێبەجێکرا لەوەی لە سەر تاوانبارەکە جێبەجێ بکرێت.

رۆڵی IMF بە قەد کۆنترۆڵەکانی سەرمایە گفتوگۆهەڵگر بوون لە سەرەنجامی قەیرانەکای دراودا. هاوکارانی رێکخراوەکە متمانەیان پێ کرد بە نەهێشتنی زەرەری ئابووری خراپتر لەوەی بە هەقیقەت روویدا لە لایەن دابینکردنی قەرزەکان بۆ یارمەتیدانی سەقامگیرکردنی دراوە داشکاوەکان. رەخنەگرانی ئەو رێکخراوە دوو بەرپرسیارێتیان دژی گەنجینەکە خستەڕوو. یەکێکیان ئەوەبوو بارگە رزگارکراوەکانی گرفتی " ترسی مەعنەویان" خراپتر کرد، ترسەکەش وەگەڕخەرەکانی رزگار دەکرد لە سەرەنجامەکانی بەگەڕخستن بە شێوەیەکی خراپ بە ئاسانی هانی وەگەڕخستنی خێرا دەدات. پاش هەموو شتێك، ئەمە مەترسی هەرەسهاوردە بوو کە رێسای بازاڕ بەرهەم دێنێت، جۆرە هۆشیارییەك لەگەڵ وەگەڕخستنی ئەوەی کە کەناڵەکانی سەرمایە بۆ شوێنی بەرهەمدار بە ناچاری ئەنجام بدرێت. لەو شوێنەی سەرمایەی کۆکراوە بایەخی پێدەدرێت، وجودی تۆڕێکی سەلامەتی دەتوانێت هانی کەم تەرخەمی بدات. (وەرگرتنی مۆڵەتە مەنتیقییەکەی ئەم ڕوانگەیە پێشنیاری ئەوە دەکات کە IMF نابێ بە هیچ شێوەیەك وجودی هەبێت). رەخنەگرانی تر ئەوە دەخەنە ئەستۆ کە سیاسەتە ئابوورییەکان کە IMF داوای کرد سەبارەت بە دراوەکانی ئاسیا لە بەرابەری قەرزەکانی، بە تایبەتی بەرزبوونەوە رێژەی بەرژەوەندی بۆ بەدەستهاوردەی یان دووبارە هێرشکردنی سەرمایەی بێگانە، بە شێوەیەکی ناپێویست سستی بازاڕی قوڵ کردەوە کە ئەوان تێی کەوتبوون.

کاریگەرترین خاسیەتی قەیرانی دراوی نەوەدەکان لە وڵاتانی دەرەوەی جیهان، هەروەها روونترین بەڵگە کە بەرهەمەکانی سەردەمی دوای جەنگی سارد بوون، سەرەنجامە ئابووریی و سیاسیەکان بوون لە وڵاتە تێوەگلاوەکاندا. کاتێ کارەساتی ئابووری لە وڵاتانی ناوەوەی جیهانی لە سێیەکان، ئابووری و سیاسەتە لیبراڵییەکانی تێکدا، وای لە لیبراڵیزمی وای لە سیستەمە کۆمۆنیستیە نوێیەی دانرابوو لە ئیمپراتۆری قەیسەری پێشوو، بە باشی بێتە بەرچاو و ببێتە هۆی هاوکاری رژێمە لیبراڵییەکان لە ئەڵمانیا و ژاپۆن. هەموویان رەتی دیموکراسی و بازرگانی ئازاد، هەروەها سیاسەتی بە ئاشتی دەرەوەیان رەتکردەوە. پاش شەش دەیە، لە جیهانی دەرەوەدا، سەرەنجامەکان جیا بوون. ئەو دەرسەی وڵاتانی تێوەگلاند سەرچاوەی گرتبوو لە



ئەزموونە کانی خۆیان پێویستی بە لیبراڵیزمێکی گەورەتر بوو. ئەمە چووە ئەو دیو ناساندنی شەفافییەتەوە بۆ نێو سیستەمی دارایی. هەروەها سیاسەتیشی گرتەوە.

لە مەکسیکۆ حەوت دەیەی حوکمی تاکە حیزبێك کۆتایی پێهات لە ٢٠٠٠، کاتێ کاندیدی موعەرەز بۆ پۆستی سەرۆکایەتی، ڤیسێنت فۆکس، زاڵ بوو بەسەر پاڵێوراوی حوکمی حیزبی شۆڕشگێڕی نێودەوڵەتی. ئەمە دووبارە بۆوە، شەش ساڵ دوای قەیرانەکانی دراوی وڵاتەکە، بەڵام لە ئاسیا سەرەنجامە سیاسەکانی سەرسامییە ئابوورییەکان زۆر بە خێرایی هاتنە پێش و لیبراڵیش بوون. لە ئەندەنوسیا، حوکمی دیکتاتۆری سی و پێنج ساڵەی ژەنەراڵ سوهارتۆ جێی گیراوە بە دیموکراسی، لە شوێنی سیستەمێکی ناسك و ناڕێك دیموکراسی چێنرا. کیم دا جونگ لە کۆریای باشوور، کە یەکێك بوو لەو یاخیبوانەی لە رژێمی ئەو وڵاتەوە بە دیل گیرابوو، بە سەرۆکی ئەم وڵاتە هەڵبژێردرا.

پێشبینی خۆپیشاندانێکی بە قەناعەتی لەم جۆرەی ئایدیای رەهای لیبراڵییەکان ئاستەمترە لە پێشبینی سەرنجامە دەستبەجێکانی قەیرانە داراییەکانی نەوەدەکان و ئاستەنگە ئابوورییەکان، کە ئەم وڵاتانە ئەزموونیان کردبوو، پاش هەموو شتێك، لە گرێدانی خۆیانەوە بۆ سیستەمی پارەی نێودەوڵەتی رێکخرابوو زاڵیشکرابوو لە لایەن هێزە لیبراڵییەکان لە سەر بنەمای لیبراڵییەکان، بەڵام لە سەرەنجامی جەنگی ساردا، بنەماکانی لیبراڵ تاکە رێگە چارە بوو بۆ هەر گرفتێك. دەیەی یەکەمی دوای جەنگی سارد گومانی جیهانی خستەڕوو بۆ سەرسامییە گەورەکانی پارە، بەڵام هەروەها پابەندبوونێکی جیهانیشی وەك ئەوەی لیبراڵ بۆ سیستەمی پارە خستەڕوو، گەر تەنها وەك بەدیلێکی نەقوسانیش بێت.

## کێشەی گۆڕانکارییە بازرگانییەکان

بڕیاری یاسایی دەیەی یەکەمی دوای جەنگی سارد لە سەر بازرگانی نێودەوڵەتی بڕیارێکی تێکەڵ و پێکەڵ بوو. کۆبوونەوەی ئۆرۆگوای لە مەڕ دانووسانە بازرگانییەکان، کە پڕ گفتۆگۆترین و گەرم و گوڕترین کۆبوونەوە بوو، بەسەرکەوتوویی تەواو بوو لە ١٩٩٤. تەواوبوونەکەی بووە هۆی پێکهاتەی شتێك کە لە کۆتایی جەنگی جیهانی دووەم پێشکەش کرابوو، بەڵام، بە زۆری لە بەر ناڕەزایی ئەمریکییەکان، هەرگیز دانەمزرا: دەستەیەکی رەسمی بۆ قەناعەت پێکردنی بازرگانی نێودەوڵەتی، رێکخراوی بازرگانی جیهانی (WTO)، بەڵام

کۆبوونەوەیەکی WTO لە سیاتڵ Seattle لە مانگی دوانزەی ١٩٩٩، سازدرا بۆ هەناردنی " کۆبوونەوەیەکی هەزارە" ی نوێی گفتوگۆ بازرگانییەکان، ٥٠٠٠٠ (نارەزایی دەربڕ)ی بۆ لای خۆی کێش کرد کە بە دەنگی بەرز نارەزایی خۆیان دەردەبڕی لە سەر بازرگانی نێودەوڵەتی. ژمارەیەك لە نارەزاییەکانیان کاریگەریەکانی بازرگانی تێوەگلاند لە سەر هەژاری جیهان، هەرچەند هەموو ئەوانەی کە ئەو جۆرە نارەزاییەیان تۆمار دەکرد هاوڵاتی بوون لە وڵاتە دەوڵەمەندەکانی ناوەوەی جیهان و نوێنەری بەراستی وڵاتانی دەرەوەی جیهان بوون کە کەمێك سۆز زاڵ بوو بەسەر بۆچوونەکانیان. ئەو خۆپیشاندانانەی کە نارەزایی دەربڕەکان ئەنجامیان دا توندوتیژی لێکەوتەوە.

لەو وڵاتانەی کە خاوەن گەورەترین ئابووری جیهان بوون، بۆ نموونە ویلایەتە یەکگرتووەکان، چارەنووسی لیبراڵیزمی بازرگانی شتێکی تێکەڵ بوو. قارەمانانی بازرگانی ئازاد سڕەی گرینگی زۆر سیاسیان بردەوە لە کۆنگرێسی ویلایەتە یەکگرتووەکان، کە نەك هەر تەنها ئەو پەیمانەی سەلماند کە هاتە کایەوە لە ئاکامی کۆبوونەوەی ئۆرۆگوای، بەڵکو ڕێکەوتنی بازرگانی ئازادی ئەمریکای باکوور (NAFTA)، لە ٢٠٠٠ گرێدرا، پەسەندترین بارودۆخی بازرگانی نەتەوەیی چین زەمینەی خۆشکرد بۆ زۆربەی وڵاتانی پڕ دانیشتوانی جیهان دا بە WTO بنێن، بەڵام بەرهەڵتسکاری بۆ هەر یەکێك لەم پێوەرانە زۆر بوو و هەمووشیان وەك نیشانەیەکی ئەو گەلانە بوون کە خۆشیان بە بازرگانی ئازادا نەدەهات، چونکە NAFTA و بارودۆخی بازرگانی ئاسایی بۆ چین ئاشکرا بە سوود بوون بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان، لە کاتێکدا بازاڕی ئەمریکا کراوەتر بوو لە بازاڕی مەکسیکۆ یان چین.

هەر بە تێکەڵی، شێوازی سیاسەتەکانی بازرگانی لە سەرەنجامی جەنگی ساردا ناسران. بەرگەی سیاسی بۆ لیبراڵیزم هەموو شتێك بوو تەنها سوودی نەبوو، چونکە کاتێ سامان دروست دەکات، بازرگانی لێکدەترازێنێ شوێنێکی نابێت، هەروەها هەموو ئەوانەی کە ژیانیان لێکدەترازێت ڕێکدەکەون بۆ پاراستنی خۆیان دژی کاریگەرەکانی. هەرچەند قەبارەی ئاڵوگۆڕکردن گەورەتر بێت لەگەڵ یان لە نێو وڵاتانی خاوەن سەروەری، هەروەها جیهانگیری پێناسکرا، پاش هەموو شتێك، بە هۆی قووڵی و پانی یەکبوونی ئابووری، ئەوەندە بەرگەگرتن چڕتر دەبێت. لە سەردەمی یەکەمی جیهانگیریدا، زۆربوونی مامەڵەکانی بە نێو سنووردا کاردانەوەیەکی ئەوتۆی لە پێکهاتەی پاراستووی باجدا کرد دژی ئەوەی کە هەموو جار



بازرگانی دەکرا بە بەرهەمە کشتوکاڵییەکان و هەروەها ئەو یاسایانەی سنووریان بۆ لێشاوی خەڵك بە نێو سنووەرکان دادەنا، کۆچکردن، لە زاراوەیەکی پەیوەستدا، گەورەتر بوون لە سەردەمی یەکەمی چاخی مۆدێرن تا لە دووەم سەردەمیدا.

هۆگەلێکی تەقلیدی هەبوون بۆ چاوەڕێ کردنی فرە کارگەیی لیبراڵیزمی بازرگانی بۆ دروستکردنی سەرەتایەك بە نەرمی لە سەرەنجامی جەنگی ساردا. یەکێك لەو هۆیانە زیادکردن بوو لە ژمارەی ئەو وڵاتانەی خاوەن سەروەری و تێوەگلابوون. لە سەرەنجامی سەرکەوتنی لیبراڵیزمی ئابووری هەموو وڵاتێك حەزی لێ بوو بە شداری بکات لە سیستەمی بازرگانی جیهانی و هەمووشیان نیازی قسەیەکیان هەبوو لە نووسینی یاساکەیدا. هەرچەند ژمارەی حیزبەکان بۆ دانووسان زیاتر دەبوون، گەیشتن بە ڕێکەوتنێك ئەوەندە ئاستەمتر دەبوو.

لەگەڵ ئەوەش، پاش ١٩٤٥ فۆرمی نوێی پاراستن هاتە فۆرمە کایەوە کۆنەکانیش کەم بوونەوە. باجە فەرمییەکان داشکان، بەڵام بەربەستەکانی بێ باجی کە هەمان کاریگەری هەبوو، هەروەك سنوورەکانی هەناردنی ئارەزوومەندانە و دژە لابردنی یاساکان، دروستکران، وێڕای ئەمە، مەسەلەی نوێی بازرگانی سەریان هەڵدا کە گەیشتن بە ڕێکەوتنێك لە سەریان وا ئاسان نەبوو، هەتا بە دانووسانی کەمتریش، چونکە ئاڵۆزکرابوون و دەستیان لە مەسەلەی هەستیاری حکوومەتی ناوخۆ وەردابوو. بە تایبەتی دوو لەو مەسەلانە گفتوگۆ دەمەتەقێیان نایەوە: ئەو داوایەی کە ڕێکەوتنەکانی بازرگانی پێوانە ژینگەییەکان دەخەنە پاڵ یەك هەرەوەزی حکوومەت دەکەن کە مافی کرێکاران لە ژێر دەستە.

ئەو داوایانە مەبەستیان وڵاتانی دەرەوەی جیهان بوو، کە هەردوو کۆمەڵە نەریت، کاتێ هاتنە وجود بە هەر حاڵ، زیاتر بێ ئاگا بوون و کەمتریش بە سەختی ناچارکران لە چاو وڵاتانی ناوەوە. وڵاتە هەژارەکان شکی ئەوەیان کرد کە ئەوانەی پاڵپشتیان کرد بەو مەسەلانەشەوە لە گفتوگۆکانی بازرگانی بەنیازی بەرزکردنەوەی نرخی بەرهەمی خۆیان بوون هەروەها پاراستنی کاری کرێکارەکان بوون لە کارگەکانی وڵاتانی ناوەوەی جیهان کە ململانێی لەگەڵ هەناردنی وڵاتانی دەرەوەی جیهان دەکرد. سەرهەڵدانی ژینگە و کرێکار وەك مەسەلەی بازرگانی ڕەگی لە بەرەنگاری ناوەندی بۆ سیستەمی بازرگانی دوای جەنگی ساردا هاتووە: هەموو وڵاتانی دەرەوەی جیهان بە تەواوی پێکەوە گرێدران. لە کاتێکدا لە کاتی جەنگی ساردا بەرگەگرتن بۆ تەواوی هەرەوەزی خۆیان بە شێوەیەکی سەرەکی لە وڵاتانی دەرەوەی جیهان خۆیان هاتبوون، لە

ماوەی دوای جەنگی ساردا ئەمە وڵاتانی ناوەوەی جیهانبوون کە کەمتر لە پەرۆشی ئەو کارە بوون. لە لایەك ئەمە سەیر بوو: زۆربەی بازرگانی وڵاتانی ناوەوەی جیهان لەگەڵ یەکتر بوو، نەك لەگەڵ دەرەوە، بەڵام خاسیەتێکی تایبەتی بازرگانی لەگەڵ وڵاتانی ناوەوەی ڕۆژئاوا کە موعەرەزانی سیاسی هێورکردەوە ون بوو لە بازرگانی لە نێوان وڵاتانی ناوەوە و دەرەوەی جیهان. بازرگانی لە نێوان وڵاتانی ناوەوەی جیهان نیازی وابوو بکرێت لە لایەن ئەو کۆمپانیایانەی کە بەرهەمیان دەهێنا بۆ بازاڕی ناوەوە و دەرەوە. ئەمە وای لە وڵاتانی ناوەوە کرد خۆشیان بەوە بێت خۆیان ئامادە بکەن بۆ پاراستن وەك جاری یەکەم لە بەر ترسی لەدەستدانی هۆکار، بە ڕێگەی تۆڵە سەندنەوە، بۆ جاری دووەم. کارگە پیشەسازییەکانی لە ژێر فشاری هەناردن لە وڵاتانی دەرەوە، وەك کاشی، هەستی بە هیچ فشارێکی لەم جۆرەی نەکرد، چونکە بە وڵاتانی دەرەوەیان نەدەفرۆشت.

هەوڵی ئازادترکردنی بازاڕی بازرگانی لە سەردەمی دوای جەنگی ساردا شایەنی بارێکی دیکەی لەخۆ گرت: نەبوونی مەرجەکانی جەنگی سارد کە یارمەتی هۆی لیبراڵیزمیاندا. پێشەنگترینیان لە نێویاندا ڕۆڵی وڵاتە هەرە بەهێزەکانی جیهان بوون. لە سەرەنجامی جەنگی جیهانی دووەمدا ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەوەندە بەهێز بوو دەیتوانی شتێك بۆ ئابووری نێودەوڵەتی بکات وەك ئەوەی حکوومەتەکان دەیکەن بۆ ئابووری لە نێو وڵاتانی خاوەن سەروەری. گەر بەهێزکردن و دواتریش ئاسایش نەبێت، هەروەها سیستەمێکی هاوپەیمانی دابین نەکرێت کە تەواوی کردنی مامەڵ مسۆگەر بکات بە بێ دەستێوەردانی هێزە دوژمنداررییەکان. هەروەها ویلایەتە یەکگرتووەکان، وەك حکوومەتی وڵاتانی تر، دراوی خەزنکرد بۆ مامەڵە نێودەوڵەتییەکان. ئەمریکا جیهانی بە حکوومەتێك دابین نەکرد، بەڵام بێگومان وەك سەرکردەیەکی وڵاتانی ناوەوەی جیهان کاری کرد، دەستپێشخەری کرد لە ڕێکخستنی بازرگانی لیبراڵ و سیستەمەکانی پارە کە کاریان کرد لە ڕێگەی جەنگی سارد و لە سەری ژیا بۆ نێو سەردەمی دوای جەنگی سارد.

حکوومەتی ئەمریکی هاندانیان پێشکەش کرد، لە فۆرمی ناوەندەکانەوە بۆ بازاڕی خۆی، دەوڵەمەنترینیان لە جیهان، قەناعەت پێکردنی وڵاتانی تری ناوەوەی بوو بۆ بەشداریکردن لە سیستەمێکی کراوەی بازرگانی. جوانکردنی دراوی جیهانی و درێژکردنەوەی قەرزدان یارمەتیدەر بوو لە پەرەپێدانی دارایی بۆ بازرگانی ویلایەتە یەکگرتووەکان، لە ماوە زووەکانی



دوای جەنگدا، دەزگایەکی بۆ سیستەمی پارە دانا کە تیایدا سەرمایە بە ڕێژەیەکی زۆر ئازاد و لە زۆربووندا بوو.

حکوومەتی ئەمریکی بەشداری دامەزراندنی پێوەرە ئابوورییەکانی نێودەوڵەتی لیبراڵیشی کرد بە هۆی ناچارکردنی دەست هەڵگرتنی ئەوانی تر لەو پێوەرانە، حوکمە لیبراڵییەکان بەدوایدا هات هەتا کاتێ ئەوانی تر وایان نەدەکرد، بۆیە سیستەمەکەی بە زیندوویی پاراست. لە کاروباری پارەدا، ئەوروپییەکان ئامانجی لیبراڵی دروستکردنی دراوی خۆیان بەدەست نەهێنا کە بە تەواوی شان بەشانی دۆلار و دراوەکانی تریش بڕوات تا ١٩٨٥. لە بازرگانیدا، ویلایەتە یەکگرتووەکان هانی پێکهاتنی کۆمەڵەی بازرگانی ناوچەیی دا لە ئەوروپا کە دواتر بوو بە یەکێتیی ئەوروپا، هەروەها بەرگەی بەربەستەکانی بەردەم هەناردنی گەلێ جۆری کەل و پەلی ژاپۆنی گرت تا ئەو کاتەی بازاڕی خۆی کردەوە بۆ هەناردنەکانی ژاپۆن.

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەڵسا بە بەکاربردنی ئەم جۆرە سیاسەتانە بۆ هەمان هۆ کە بەریتانیا ڕۆڵێکی بەراوردی گێڕا لە سیستەمی لیبراڵی ئابووریدا لە سەردەمی یەکەمی جیهانگیریدا. وڵات بە بەهێزترین ئابووریدا لە جیهان دەوەستێت بۆ ئەوەی قازانج بکات لە دەرفەتی هەناردنی شتەکان و سەرمایە کە حوکمە لیبراڵییەکان پێشکەشیان دەکرد. ئەو قەناعەتەی کە بەشدارە بازرگانییەکان سیاسەتی دەرەوەی بە ئاشتی دەگرتە بەر بۆ یەك و دوو، کە ودرۆ ویلسن وەری گرتبوو لە سەدەی نۆزدەهەمی بۆچوونەکانی بەریتانی ئەو ئایدیایە، زۆر زیندوو بوو لە ویلایەتە یەکگرتووەکان. لە ڕێگەی جەنگی جیهانی دووەمەوە پاڵپشتی سەرەکی وەزیری بەرگری بوو کە ناوی کۆردڵ هوڵ بوو. قەناعەتەکە بەهێز کرا لە پەندی کارەساتەکە، بەوەی ئەمریکییەکان بە دەرسەکانی جەنگی جیهانی دووەمەوە وەریدەگرن. باوەڕیان بەوە بوو کە پچڕاندنی بازرگانی و دروستبوونی ڕکابەر، یان بەلانی کەم بێ هاوکاری، کەرتەکانی پارە لە ماوەی نێو جەنگدا بەشداریان کرد بۆ دەستپێکی ململانێی چەکداری لە ئەوروپا لە ساڵی ١٩٣٩ و زەریای هێمن لە ١٩٤١. سیاسەتە نالیبراڵییەکانی ئابووری دەقاو دەق بوو بە هۆی سیاسەتی نالیبراڵی دەرەوەی کە ئەویش سیاسەتی: جەنگ بوو.

کاریگەرترین پاڵنەری ئەمریکا بۆ دامەزراندن و پاڵپشتکردنی سیستمێکی لیبراڵی ئابووری، لە جەنگی ساردەوە سەریهەڵدا. ئەمریکییەکان وەك بە شێك لەو ململانێ جیهانیە سەیری سیستەمەکانی پارە و بازرگانیان دەکرد، بەرگری دژی نالیبراڵیزمی کۆمۆنیست کرد،

چونکە وڵاتانی ناوەوەی ڕۆژئاوایان بەهێز کرد و یەکیان خستەوە. پلانی سەرەکی ساڵی ١٩٧٤، کە یارمەتی دروستکردنی سیاسەتەکانی ئابووری لیبراڵیدا(هەروەها هەرەووزی ئابووری ناوچەیی) ئاسان و سەرنجڕاکێش بکات بۆ ئەوروپای ڕۆژئاوا، کە مەبەستێکی ئاشکرای دژە کۆمۆنیستی هەبوو: بۆ بەهێزکردن و هاوکاریکردنی حکوومەت ئەمریکییەکان لە سەر کیشوەرەکە دژی یاخیبوونی هاوپەیمانی مۆسکۆ بوو، پشتیوان بوون لە نێو سنوورەکانی خۆیان.

پێویستی هاوکاری لەنێو هاوپەیمانی ڕۆژئاوا هۆیەکی گرینگ بوو کە ویلایەتە یەکگرتووەکان ژاپۆن و ئەوروپای ناچارکرد پراکتیزەکانی ئابووری لیبراڵی نێودەوڵەتی جێبهێڵن، هەمان هۆش بوو کە هاوپەیمانەکانی ئەمریکا لە بەرابەردا، ویلایەتە یەکگرتووەکانیان ناچار کرد. حکوومەتی ئەمریکی ئەو پێویستییەی هەڵگرت بۆ کەم کردنەوە خەرجییەکانی، هەروەها لێشاوی دۆلاریش ڕاگرت، لە لایەن حەزی ئەڵمان و ژاپۆن بۆ خۆگرتنی ئەمان هەتا کاتێ ئەمە لە ڕووی ئابوورییەوە بێ قازانجیش بوو بۆ ئەوان، هەروەها لە لایەن بەشداری هاوپەیمانەکان بۆ ئەو ڕێکخستانەی کە بوونە قەڵغانی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە پاراستنی بەلێنەکانی بۆ ئاڵوگۆڕکردنیان بۆ زێڕ. هەموو حیزبەکان قوربانی ئابووریان دا بۆ مەبەستی ستراتیژی. پێداویستییەکانی جەنگی سارد ئامێرسازی ئابووری نێودەوڵەتی وڵاتانی ناوەوەی ڕۆژئاوای چەور کرد. لە نەوەدەکان ئەو چەورییە وای لێ هات کۆتایی پێهات.

نەبوونەکەی ئاشکرا بوو لە سیاسەتەکانی بازرگانی ئەمریکی لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا، کە بە تیژی وەستا دژی ئەوانەی کە وڵات بەکاریی بردبوون لە کارەساتی جەنگی جیهانی دووەم. لە کاتێکدا پاش ساڵی ١٩٤٥ ویلایەتە یەکگرتووەکان دوای حوکمە لیبراڵییەکان کەوت هەتا کاتێ ئەوانی تر لەو حوکمانە لایاندا، پاش جەنگی سارد ویلایەتە یەکگرتووەکان دووپاتی ئەو مافەی کردەوە بۆ پشتگوێخستنی هەمان ئەو نۆرمە لیبراڵیانە. پێوەرە فرە بڕیاری دانووساوەکان دڵی ڕێنمایی ئابووری لیبراڵی نیودەوڵەتی بوون، بەڵام ئیدارەی کلینتۆن، یەکەمیان، لەگەڵ هەل بۆ پێناسی هەوڵی ئەمریکی دوای جەنگی سارد بۆ جیهان، سوور بوو لە سەر مافی ئەوەی کار بکات بە سەربەخۆیی. کرۆکی هەوڵی لیبراڵ بۆ ئابووری ڕێگەدان بە بازاڕ، بڕیارە تایبەتەکان، بۆ سووربوون لە سەر تەرخانکردنی سەرچاوەکان و بەرهەمی ئاڵوگۆڕکردن. ئیدارەی کلینتۆن هەوڵی ناچارکردنی ژاپۆنیدا بۆ ڕازیبوون لە ئامانجە بێسنوورەکانی کڕینی ئەو بەرهەمانەی کە لە لایەن ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە دروست دەکران. لە پاش جەنگی جیهانی دووەمەوە، ئەمە سیاسەتی حکوومەتی



ئەمریکی بوو بۆ قوربانیدانی قازانجی ئابووری مەودا کورت بۆ ئامانجی گەورەتری بونیاتنانی سیستەمی ئابووری لیبراڵی نێودەوڵەتی. پاش جەنگی سارد پێشینەکە ئاوەژوو بۆوە. ویلایەتە یەکگرتووەکان وێڵ بوو بە دوای قازانجی ئابووری مەودا کورت بە نرخی یەکڕیزی ئەو سیستەمەی کە بە شێوەیەکی سەرەکی بەرپرس بوو بۆ دامەزراندنی. بۆچوونەکان بۆ سیستەمی ئابووری لیبراڵی جیهانی لە سەدەی بیست و یەکدا پشتی بەست بە هەمان دوودڵی و گومان هەروەك بۆچوونەکان بۆ هەوڵی لیبراڵ بۆ ئاسایش لە ئەوروپا و ئاسیای ڕۆژهەڵات: ئایا ویلایەتە یەکگرتووەکان تێچووی سەرکردایەتی دەدات.

بێگومان، سەرکردایەتی ئابووری نێودەوڵەتی ئەمریکی بە تەواوی غیاب نەبوو لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا. واشنتۆن دەستپێشخەری کرد لە کۆکردنەوەی بارە ڕزگارکەرەکان بۆ مەکسیکۆ و وڵاتە ئاسیاوییەکان لە وەڵامی قەیرانی دراوەکانیان. ویلایەتە یەکگرتووەکانیش بەردەوام بوون لە دابینکردنی گەورەترین و کراوەترینی جیهان بازاڕ بۆ هەناردن، کە بە تایبەتی گرینگ بوون لە سەرنجامی ئەو قەیرانانە لە بەر ئەو وڵاتانەی کە لە کێشەی تەعینکردنەوە گلابوون دەبایە ئەو حیزجزانەی ئەوان پێویستیان پێ هەبوو بۆ قازانج کردن بگێڕنەوە کە بە شێوەیەکی سەرەکی سەرچاوەی گرتبوو لە هەناردن. لێرەدا، ویلایەتە یەکگرتووکان ڕۆڵێکی گێڕا بۆ وڵاتانی تر کە کینس ڕایسپاردبوو بە حکوومەتەکان لە نێو وڵاتانی خاوەن سەروەری. ئەمە دەستپێکی بەرزبوونەوە لە بەرهەمهاوردەی ئابووری لەگەڵ تواناکانی لە ژێر قازانجدا بوو. دەیەی یەکەمی دوای جەنگی سارد ڕێکەوت بوو لەگەڵ پێشبینی ویلایەتە یەکگرتووەکان کە زۆر پێشوازی لە لە هەناردن کرد لە گەلێ وڵاتی تر کە بووە هۆی پێشخستنی گەشەی ئابووری.

دەست هەڵگرتنی ئەمریکا لە سیاسەتەکانی لیبراڵی بازرگانی لە نەوەدەکان سیستەمی بازرگانی جیهانی تێك نادات تەنانەت زەرەریشی پێ ناگەیەنێت. لە بەر یەك شت، ژاپۆن پرۆگرامی ئەمریکای قەبوڵ نەکرد بۆ " بازرگانی هەڵسوڕێنراو"، لە بەر شتێکی تریش، هەوڵ و کۆشش بۆ پێناسەی یەکەم دەستهەڵگرتنی ئەمریکا نەبوو لە ئۆرتۆدۆکسی لیبڕلی بازرگانی. لە بری ئەمە، بەشێك بوو لەو ئاڕاستەیەی کە سێ دەیە کۆن بوو. لەوەتەی حەوتاکان، ویلایەتە یەکگرتووەکان وێل بوو بەدوای گەلێ ناوەند بۆ کەمکردنەوەی یان نەهێشتنی کەم و کوڕی بازرگانی خۆی لەگەڵ ژاپۆن. کاتێك میتۆدی ئەنجامدانی ئەم کارە ئەمەو زۆرترکردنی هەناردنی ئەمریکی کەمتر لە تاکتیکی پاراستنی هاوردەی سنوورداری ژاپۆنی بوو، ئەوا پێوەری پێشکەوتنی هەهەناردن بە تەنیا

ئەمریکای تێوەگلاند یان ئامانجی جێگیر بۆ بەرهەمی ئەمریکی ڕوحی پەیامی بازاڕی ئازادی پێشێل کرد. پەیمانی کاری ساڵی ١٩٧٤ بەشێکی تێدایە ڕێگە دەدات (کاتێك ئەوەی دواتری پەیمانی کاری بازرگانی ١٩٨٨ پێویستی پێ بوو) بە حکوومەتی ئەمریکی بۆ سەپاندنی گەمارۆ لە سەر ئەو وڵاتانەی زیاد لە پێویست شت دەنێرن کە بە ڕای ویلایەتە یەکگرتووەکان وا پێدەچوو سەرەنجامی پراکتیزی بازرگانییەکەیان یەکسان نییە لەگەڵ ئەمریکا. ئەمە پێشێلکارییەکی بەرچاوی نۆرمەکانی بازاڕی ئازاد بوو.

لە دوا دەیەکانی سەدەی بیستەمدا، دەمەتەقێی بەردەوامی بازرگانی ئەمریکی ژاپۆنی گرینگترین بەرەنگاری خستەڕوو بۆ کردنەوەی سیستەمی بازرگانی جیهانی. ڕەخنەگرە ئەمریکییەکان ئەوەی خستەڕوو کە ژاپۆن بە شێوەیەکی سیستەمی و بە ئەنقەست لە پراکتیزی بازرگانی ناعادیلانە تێوەگلا، پاراستنی بازاڕی ماڵی خۆی کاتێك هان و بەشداری هەناردنەکانی کۆمپانیاکانی دەدا کە ڕێگەی پێدان بۆ گرتنی پۆستی زاڵ لە بازاڕی ئەمریکی. بۆ بەرگریکەرانی ژاپۆنی، شرڤەکردنی ڕەخنەگران ناتەواو بوو و جێهێشتنی هەمەجۆر لە پراکتیزی بازرگانی لیبراڵ کە وەك چارەسەرێك پێشکەشکرا بێ بیانوو بوون. وتیان، ژاپۆن کارێکی باشی کردووە یاساکانی بازرگانی نەشکاندووە بۆ سوودی هەردووك ژاپۆن و شەریکەکانی لە بازرگانیدا.

ڕازیبوونی ئەمریکا، لەم ڕووەوە، دەبوایە وەك بەرهەمی " ڕای بێوێنەو زەبەلاحی وێرانکەر" بزانرابا، هۆشیاربوون لە سەیرکردنی کەمکردنەوەی پەراوێزی گەورەو گۆڕاوی پێشینەی ئابووری لە سەر وڵاتانی تر. هۆشیار بوون و ترس بووە هۆی فشارکردن لە سەر سیاسەتی بازرگانی ئامۆژگاری خراپ، هەروەك کە هەیبوو لە بەریتانیا لە کۆتایی سەردەمی یەکەمی جیهانگیری کاتێ بەریتانیا سەرکردایەتی لە بەرهەمی ئابووری کرد، کە لە دایکبوونی شۆڕشی پیشەسازی لە نێو سنوورەکانی ئەوەی شیاو کرد، لابرا لە لایەن گەشەی خێرای ئابووری وڵاتانی دیکە، بە تایبەتی ئەڵمانیاو ویلایەتە یەکگرتووەکان.

لە کاتی جەنگی سارد پابەندبوونی گشتی هەردوو وڵات بۆ هاوکاری سیاسی ململانێی ئەمریکی ژاپۆنی لە نێو سنوورەکانی خۆی پاراست، هەرچەند سنوورەکان لە سەر دەمەتەقێکە بەهێزتر بوو لە پەنجاکان و شەستەکان لە چاوی هی حەوتاکان و هەشتاکان. لەگەڵ کۆتایە هاتنی جەنگی سارد ئەو پاڵنەرە تایبەتییە دیار نەما، بەڵام دەیەی یەکەمی دوای جەنگی سارد



دەستنیشان کرا بە هۆی سستی بازاڕی تووند لە ژاپۆن کە وای لە ئابووری ژاپۆن کرد زۆر کەمتر بەهێز بێت، هەروەها کەمتر زاڵ بێت، هەتا بۆ سەخترین ڕەخنەگرانی ئەمریکی.

بە خۆشحاڵییەوە، درێژەپێدانی پەیوەندییەکی بازرگانی لە نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکان و ژاپۆن ئاسان کرا لە ڕێگەی بەرەبەستەکان بۆ هاوردن یان سنوورەکان بۆ هەناردن بە تەواوی پشتیان نەبەستا بە نمایشە ئابوورییە هەژارەکەی لە لایەن ژاپۆن. لە ماوەی تەواوی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا، ئایدیای بازرگانی ئازاد زۆر بە فراوانتر پەسەند کرا، بە لانی کەم مەبدەئییەن. بێشك ڕێچکەی سیاسی هێشتا تێشوێك بوو لە ئاڕاستەی موعەرەزییەوە، بەڵام پاڵنان دژی ئەو ڕێچکەیە هەموو جیهان بەردەستێك بوو بۆ توێژینەوە ئابوورییەکان، زۆربەی زۆریان پەیڕەویان کرد لە دوای جەنگی جیهانی دووەم، کە بە تەواوی کارێکی بە کۆمەڵ بوو بە بۆچوونی ئادەم سمیسەوە: بازرگانی ئازاد پەیوەست بوو بە دەوڵەمەندکردنی نەتەوەکان.

تەنها بەشێکی بچووکی دانیشتوانی جیهان هیچ ئاشنایەتییەکیان لەگەڵ ئەو توێژینەوانە نەبوو، بێگومان، بەڵام بەشێکی فراوانتر دەیتوانی سەرنجی ئەو بەڵگەیە بدات لە سەری بنچینە کرابوون. وڵاتە هەرە سەرکەوتووەکان لە ڕووی ئابوورییەوە سیباسەتی لیبراڵی بازرگانیان پەیڕەو کرد. بازرگانی ئازاد پەیوەست بوو بە فراوانبوونی ئەو سامانەی کە بە قەد ترس و تۆقینەکان خاسیەتێکی گرینگی سەدەی بیستەم بوو.

پابەندبوون بە بنەماکانی لیبراڵی ئابووری نێودەوڵەتی لە کاتی جەنگی ساردا هێزی وەرگرت لە یادگارەکانی سیاسەت و ئابووری لە وڵاتانی ناوەوەی جیهان لە سییەکان و چلەکان هەروەها لە خودی جەنگی ساردا. لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا یادگارییەکان لە ڕووی سیاسییەوە کەمتر وەردەگیران و جەنگی ساردیش کۆتایی هات، بەڵام لە شوێنی خۆیان، بۆ بەهێزکردنی ئەو پابەندبوونە، مێژووی ئابووری پێشینەی نیو سەدە بوو. کە هەرکە سومعەی سیاسەتەکانی لیبراڵ پشتی بەستا بوو، کاتێکیش لە ڕووی ساسییەوە ڕوویدا پەیڕەویان نەکرد، ئێستا پشتی بەستاوە بەوەی کە لە ڕووی ئابوورییەوە ڕوویدا. وێڕای ئەمە، ئەوەی پێویستی بە هاوکاری سیاسی بوو لە سەرەنجامی جەنگی ساردا پێویستی بەو هاوکارییە نەما، هەروەك لە دوای کارەساتی جەنگی جیهانی دووەمەوە، دروستکردنێکی تەواو نوێی سیستەمی ئابووری نێو دوڵەتی نەبوو لە سەرجەمی پاشماوەی شەڕدا. بەڵکو کەمتر ئەرکی باجدانی پاراستن و درێژکرنەوەی ئەوەی کە وجوودی هەبوو.

ئەمە مانای ئەوە نییە بڵێین کە لیبراڵیزمی ئابووری نێودەوڵەتی دووچاری هیچ بەرەنگارییەك نەبۆوە لە سەرەتای هەزارەی نوێدا. بێگومان دووچاری هەندێ شت هەر بۆوە، بەڵکو بەهێزترینیشیان وەك حەپەسانێك وابوو. سەردەمی دووەمی جیهانگیری ئاراستەیەکی بەرەو ڕێکخستنی کاروباری ئابووری جیهانی بە خۆوە بینی نەك لە سەر ئاستی جیهانی، بەڵکو لە سەر بنەمای ناوچەیی.

## پرۆژەی ئەوروپا

لە سەرەتای **١٩٩٩** دا دوانزە ئەندامی یەکێتیی ئەوروپا دەستیان کرد بە یەکخستنی دراوە هەمەجۆرە نەتەوەییەکانیان بۆ یەك تاکە دراو. لەدایکبوونی یۆرۆ و دراوەکانی تر، بزووتنەوەیەکی زۆر دیار نەبوون بەرەو زۆربوونی پارە، ئەسڵی خۆیان هەبوو لە وەرچەرخانێکی مەزنی دراودا بەو پارەیەی کە لەگەڵیدا بوو جیهان دەبوایە فیکە لێبات لە زۆربەی زۆری کاتەکانی سەدەی بیستەم. برێتن ودس هەوڵێکی خستەڕوو بۆ گرێدانی هەر سێ خاسیەتە ویستراوەکە: لێشاوی ئازادی سەرمایە، ئۆتۆنۆمی سیاسەتی پارەی نەتەوەیی، هەروەها ڕێژەی جێگیری، گەر لە شوێنی خۆی نەوەستێت، ئاڵوگۆڕکردن، ئەوەی کۆتایی بەهۆی دۆزینەوەی بنەڕەتێکی ناوەند لە نێوان ڕێژە ئاڵوگۆڕە جێگیرەکانی سەردەمی پێوانەی زێڕ و ڕێژە سەرکەوتووەکانی ماوەی نێو جەنگدا بوو. لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا، ئەم هەوڵە واپێدەچوو شکستی هێنابێت.

وڵاتە ئاسیاییەکان تێوەگلان بەهۆی قەیرانی دراوەوە، لە نەوەدەکان، هەوڵی ڕێگە چارەی ئەو قەیرانەیدا. ئەوان ڕێژەی ئاڵوگۆڕیان بەروار دەکرد لەگەڵ دۆلار، بەڵام نەیانتوانی بەرگری لە خۆیان بکەن. پەندی شکستەکەی ئەوەبوو کە ڕێژەکان دەبوایە یان ئەوەتا بە توندی جێگیر کرابووان، کە مانای ملکەچی یان ئۆتۆنۆمی پارە یانیش لێشاوی ئازادی سەرمایە بوو، یانیش بە ئازادی بەرز بێتەوە. وڵاتانی هەرە دەوڵەمەندی ئابووری، ویلایەتە یەکگرتووەکان و ژاپۆن، ڕێگەیان بە ئاڵوگۆڕی خۆیاندا بۆ بەرزبوونەوە، بەڵام بەرزبوونەوە نەدەگونجا بۆ وڵاتە بچووکەکان، چونکە ئابووریان زۆر بێهێز ببوو بە هۆی گۆڕانی زۆر لە نرخی نێودوڵەتی دراوەکانیان.



گومانی ڕێژەی ئاڵوگۆڕی ناجێگیر شتێکی زۆر زەحمەتر بوو بۆ ئەوان، وەك ئەندامانی یەکێتیی ئەوروپا، بە چڕی بازرگانیان لە گەل یەکتری دەکرد. کاتێك بەرزبوونەوەی ڕێژەی ئاڵوگۆڕکردن داوای لە سەر نەبوو لە لایەن ئەوروپییەکان و کۆنترۆلەکانی سەرمایە، چونکە ئەم وڵاتانە نیازی دروستکردنی بازاڕێکی دیکەیان هەبوو لە نێوە خۆیاندا بۆ سەرمایە و بازرگانی کەل و پەل. هەروەك چۆن پابەندبوون بە جێگیرکردنی ڕێژەی ئاڵوگۆڕکردن و جوڵەی سەرمایە، بە هۆی زاراوەکانی ئەوروپییەکان دەبوایە لەگەڵ دروستکردنی یۆرۆ واز لە سیاسەتی پارەی سەربەخۆ بهێنن. دواتر هەر ئەو کارەشیان کرد.

هیچ گروپێك لە هیچ وڵاتێکی دیکە وا سەرکەوتوو نەبوو لە زۆرکردنی پارە بە قەد ڕۆژئاوای ئەوروپا، بەڵام ژمارەیەك لە وڵاتانی دەرەوەی جیهان هەنگاوێکیان گرتە بەر لەم ئاراستەیەدا کە ڕێژەکەی دواتری پێوانەی زێڕ بوو ناسرا بە داشماڵی دراو، کە تیادیا دۆلارێك (یانیش، بە تیۆر، هەر دراوێکی بە نرخ) ڕۆڵی زێڕی بینی. کاتێ گەنجینەی دۆلار فراوان بوو یانیش تەسك بۆوە، بەهەمان شێوە، لە ڕێژەی دیاریکراودا، دراوی ناوخۆییش ڕۆڵی زێڕی بینی.

لە بازرگانیدا، ئاڕاستە بەرەو گرێدانی ناوچەیی زیاتر ڕاگەیانرا. لە دواهەمین سێ دەیەی سەدەی بیستەمدا ژمارەیەك ڕێکخستنی بازرگانی ناوچەیی پێکهێنران. یەکێتیی ئەوڕوپا کۆنترینیان بوو و زۆر نیزکتر بە یەکەو گرێدرابوون. کە دواتر کۆمەڵەی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی باشووری ئاسیا (ASEAN) لە ناوچەی زەریای هێمن و NAFTA لە ئەمریکای باکوور و Mercusur لە ئەمریکای باشوور، هەروەها گەلێکی تر دامەزران. ئەم ڕێکخراوانە ویستراو نەبوون لە ڕووی ئابوورییەوە تا ئەو ڕادەیەی کە ئەمان بازرگانیان گواستەوە لە گەنجینەی نرخی کەم لە کەرتی دەرەوە بەرامبەر بەرزترین نرخ، بۆیە دابەزینی نرخ سامانی کۆکردەوە، کەمتر لەوەی دروستکردنی ئەو بازرگانییەی کەوا نەبووایە ڕووی نەدەدا. ڕێکخستنەکانی بازرگانی ناوچەیی بەرزبۆوە، تەنانەت کەرتێکی سیاسی نیگەرانتر پەیدابوو.

مێژووی تیۆری لیبراڵ ئەو شتە باشانەی کە پێکەوە هەڵدەکەون دەگرێتە بەر. ئەزموونی مێژووی چاخی مۆدێرن پێشنیاری ئەوە دەکات کە شتی خراپیش پێکەوە دانوویان دەکوڵێ، واتە پراکتیزە نالیبراڵییەکان بە نێو زنجیرەی چالاکی ئابووری و سیاسی. هەرەسهاوردەی ئیمپڕاتۆری لە ماوەی پێش جەنگی جیهانی یەکەم بە بەشێك قایلکردنەوە دانرا، لەگەڵ ڕەگەکانی لە قالبێکی نوێتری تیۆری گەشەسەندنی داروین، کە ڕەفاهییەت و هەتا مانەوە پشت

دەبەستێت بەسەر دروستکردنی کەرتی گەورەی ئابووری و سیاسی پێکەوە گرێدراو. چالاکی ئابووری لە ڕووی جوگرافییەوە، داگیرکاری ئیمپراتۆری و دواجاریش جەنگ لە نێو زلهێزەکاندا باش پێکەوە لکێنرابوون. هەتا لە جەنگی جیهانی دووەمدا زیاتر پەیوەست بە یەکتربوون. ئەو ساتەی کاتێ جیهانی مۆدێرن زۆر لەوە نزیکتر بوو بۆ ئەوەی ڕێکبخرێت شان بە شانی هێڵە ناوچەییەکان ڕوویدا لە سەرەتای چلەکاندا. لە لووتەکەی دەسەڵاتی ئەواندا، نازی ئەڵمانیا و ژاپۆنی ئیمپراتۆری مامەڵەی ناوچەی گەورەی یۆراسیا و زەریای هێمنی کرد کە ئەوان داگیریان کردبوو وەك ناوچەی ئابووری تایبەت و چەند ناوچەیەك بۆ هەڵقۆستنەوە و تالآن. توندترین فۆرمی نالیبراڵیزمی ئابووری شان بە شانی توونـدترین نالیبراڵیزمی سیاسی و نالیبراڵیترین سیاسەتەکانی دەرەوە و جەنگی دوژمنکارانە و دڕندانە و بەردەوام بەڕێوە چوو.

ئەم تۆمارە مێژووییە بنەمای ئەو بایەخە بوو کە چوونە دەرەوەیەك لە بنەما لیبراڵییەکان لە کاروباری ئابووریدا، ئەوەی ناوچەگەرێتی ئابووری هێزی ئەوەی هەبوو پێش بکەوێت، دەیتوانی بەرەو جێهێشتنی جدی تر و ترسناکتریشی بەرێت لە بنەما و پراکتیزە لیبراڵییەکاندا. ئەو پاڵنەرانەی بۆ پێکهاتەی ڕێکخراوەکانی بازرگانی ناوچەیی هەندێ جار دەورەیان داوە، لە هەمانکاتدا بە شاراوەیی، ترسە جیۆپۆلەتیکەکەکان و حیساباتەکانی ماوەی نێو جەنگدا بوون. یەکێك لە هۆیانەی کە ویلایەتە یەکگرتووەکان ڕازیی بوو بە فۆرمی NAFTA، بێگومان گرینگترین هۆش بوو ئەو نیگەرانییە بوو کە یەکێتیی ئەوروپا جێهێشتنی سیاسەتی لیبراڵی بازرگانی و ترسی هاوردنی ژاپۆنییەکان بۆ نیوەی ڕۆژئاواییەکان بوو. گرێدانی ئەورووپیش هانی پێکهاتنی کۆڕگەی هاواری ئابووری زەریای هێمن و ئاسیای دا واتە (APEC) لە ١٩٨٩. ئەو ئاڕاستەی بەرەو زۆربوونی ئابووری ناوچەیی لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا دوو پرسیاری قوت کردەوە: ئەو بۆچوونانە چی بوون بۆ ڕێکخستنی جیهان شان بە شانی هێڵە ناوچەییەکان؟ هەروەها، ئەمە چەند مەترسدار دەبێت؟ تاقیکردنەوە بۆ هەردووکیان ئەوروپا بوو.

شوێنی لە دایکبوونی جیهانی مۆدێرن، شوێنی هەڵگیرسانی شۆڕشی پیشەسازی و فەڕەنسا هەروەها شوێنی داهێنانە سیاسییەکان کە زاڵ بوو بەسەر سەردەمی مۆدێرن، ئەوروپا بوو، هەروەها لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا شوێنی داهێنانێکی تر: کۆمەڵەی دەوڵەمەندی ئابووری و سیاسی پانزە وڵات بوو کە ئەمەش یەکێتیی ئەوروپا بوو.



ئەندامانی یەکێتیی ئەوروپا نیازی لە دروستکردنی یەکێتییەکەیان زیاتر گومرگ بوو کە لە کۆتایی سەدەکە دەستەبەریان کرد، یان تاوەکو ناوچەیەکی زیاتر گرێدراوی دارایی بێت، کە هەڵسوڕاندنی ئەو ناوچەیە سەرکەوتووی یۆرۆ دروستی دەکرد. لە دواجاردا مەبەستیان قسەکردن بوو بە یەك دەنگ و یەك کار وەك یەك یەکێتیی لە سەر مەسەلە سەربازی و سیاسییەکان. پەیمانی Maastricht ی ساڵی ١٩٩١، واژۆکرا لە لایەن هەموو ئەندامانی یەکێتیی ئەوروپا، ئەم پەیمانە پابەندی کردن نەك هەر تەنها بۆ یەك دراو، بەڵکو بۆ سیاسەتی دەرەوە و ئاسایشی گشتی. لە کاتێکدا ئامانجی ئەوروپای فیدراڵ کە بە فەرق و جیاوازی دابەشکرا لە نێوان ئەندامانی یەکێتیی ئەورووپاوە، هەندێ لە مەرامەکانی نادیار بوو کە ئەو ئەندامانەی خۆیان پێی پابەند کردبوو پێشنەکی گرینگ بوون، گەر زۆرینە نەبوون، لەگەڵ ئەواندا هاوکاری بکەن.

بە تەواوی وا خەیاڵ ئامێز نەبوو بۆ تەسەورکردنی ئەوەی، لە سەدەی بیست و یەکدا، ئەوروپایەکی زۆر یەکگرتووتر خزمەتی دەکرد وەك مۆدەیەك بۆ کەرتی ناوچەیی بەراوردکار لە بەشەکانی تری جیهان، بەڵام بەقەد فۆرمی ڕێکخراوەکانی ئابووری و سیاسی یەکەم جار لەوێ پێشکەوت لە دواجاردا بڵاو بۆوە لە سەرانسەری جیهاندا. لە تێڕامانی مێژووی سەدەی بیستەم ئەمە مەشقێك نەبوو لە ترسی سیاسی بۆ نیگەرای ئەوەی جیهانێکی لەم چەشنە کەمتر بێت لە جیهانێکی لیبراڵ. مێژووی درێژی شارستانیەتی مرۆڤ پڕە لە تەناقوزات. کەمترینیان نابێت گەر، پاش نەمانی دەزگا سیاسی و ئابوورییە تەقلیدییەکان لە سەدەی نۆزدەهەم و زاڵ بوون بەسەر بەرەنگاری نالیبراڵیزم لە فۆرمە هەمەجۆرەکانی لە سەدەی بیستەم، لیبراڵیزمی نێودەوڵەتی، بە تەنها وەستا وەك کۆمەڵە بنەمایەکی ڕێکخراو بۆ ژیانی گشتی لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا، وای لێهات لەگەڵ خۆیدا تۆوەکانیش بگرێتەوە، گەر تۆوی خۆوێرانکردن نەبێت، کەواتە هی چاکردنە بەرجەستەیی و نەویستراوەکەیەتی. دابەشی جیهان بۆ نێو غەریزە، هاوبەشییەکی تایبەتە، هەروەها کەرتە جیاوازە سیاسی و ئابوورییەکان وەك سەرەنجامی کۆششەکان بۆ هەڵکردن لەگەڵ گرفتەکان پەیوەست بوو لەگەڵ ئەو کردەی سیستەمی لیبراڵی پارەی نتێودەوڵەتی بە قەد ئەوەی کە چاوەڕێ دەکرێ دەپارێزرێت. لە کاتێکدا ئەمە کۆرسێك بوو کە مێژووی نێودەوڵەتی دەکرێ بچێتە نێو سەدەیەکی نوێوە، هەرچەند، هۆی باش هەبوون بۆ گومان کردن لەوەی کە ئەمە ڕێچکەیەك بوو کە جیهان

بەدوایدا دەکەوت: داهاتووی ئەوروپا بە تەواوی دڵنیا نەبوو: بۆچوونەکان بۆ کەرتە لێکچووە ناوچەییەکان لە هەر شوێنێك بووبن لێل بوون، هەروەها دەسەڵاتی ئایدیا و دەزگا لیبراڵییەکان بەهێز بوون.

یەکێتیی ئەوروپا پابەندکرابوو بە قوڵکردنەوەی، واتە، چڕکردنەوەی، پەیوەندییەکانی لە نێو ئەندامانی کە پەیوەندییەکە دراوێکی گشتی بوو (واتە یۆرۆ)، بەڵام سەرکەوتنی یۆرۆ مسۆگەر نەکرابوو. موعەرەرز بوو بۆ هەمان ئەو گرفتەی کە کۆتایی هێنا بە پێوانەی زێڕ. دەسهەڵگرتنی ئاشکرا لە سیاسەتی سەربەخۆی پارە بەهۆی پابەندبوون بە یۆرۆ ڕەنگە لە ڕووی سیاسییەوە زەحمەت بێت بۆ پاڵپشتکردن.

یەکێتیی پارە بە بێ ڕاڕایی موعەرەزە بۆ " سەرسامییەکی دووبەشی لێك جیا"، ڕووداوەکان کاریگەریان هەیە لە سەر وڵاتان بە ڕێگای جیا جیا. گەر ئاستی دامەزراندن (تەعین) بێتە خوارەوە لە وڵاتێکی ئەوروپیدا لەگەڵ سیاسەتی پارەی تایبەت بەخۆشییەوە، ئەوا حکوومەت دەتوانێت بەرزی بکاتەوە بە هۆی نزمکردنەوەی ڕێژەی بەرژەوەندییەکانەوە، ئاسانتر پارە قەرز بکات بۆ دەستپێکردن بە کارکردن کە ئەمەش خەڵکی دەوێ بە کرێ بگیرێت (واتە کار پەیدابوو). کاتێ ئەو وڵاتەی بەشێکە لە یۆرۆ، هەرچەند، دەسەڵاتی ئەوەی نییە ڕێژە بەرژەوەندییەکانی خۆی بهێنێتە خوارەوە. ئەمە بۆ بانقی ناوەندی ئەوروپایە بۆ دابەزاندنی ئەو ڕێژانە، گەر تەعینکردن زۆربێت لە وڵاتە ئەوروپییەکانی تر، ڕەنگە باش بڕیار بدات کە وا نەکات، نەبادا سزابدرێت بە ڕێژەی بەرزی بێکاری بۆ ئەندامێتی لە دراوی گشتی. سەرسامییە دووبەشە لێك جیاکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکان زۆرجار ڕوویداوە، سیازەهەمین کۆلۆنییە بنەڕەتییەکە کە لێیەوە کۆنترین و سەرکەوتووترین یەکێتیی دراوی جیهانی پێکهێنا. یەك بەشی وڵاتەکە ڕەنگە قازانج بکات، بەڵام ئەوانی تر دەناڵێنن لە دابەزینی ڕێژەی بەرژەوەندی، هەروەها موقابیلی ئەمریکی بۆ بانقی ناوەندی ئەوروپا، بۆردی حیجزی فیدراڵە ڕەنگە ئەوە هەڵبژێرێت کە ئەو ڕێژانە دانەبەزێنێت، بەڵام ویلایەتە یەکگرتووەکان ڕێگای تری هەبوو بۆ دڵدانەوەی نیگەرانی ئابووری ناوچەیی. حکوومەتی فیدراڵ دەتوانێت گەنجینەکان بەڕێوەبباتەوە بۆ بەشە تێوەگلاوەکانی وڵاتەکە. گوزەری خەڵك لەو شوێنەیە کە تیایدا کار کەمە و کارێك دەدۆزێتەوە لە ناوچەی ڕەفاهی تر لە چاو هەمان وڵاتی خۆی. ئەم ئەگەرانە، کە وا لە ویلایەتە یەکگرتووەکان بکات ببێت بە " ناوچەی دیاری ئارەزوومەندانە"، تیایدا تاکە دراوێك کە هەم



لە ڕووی ئابوورییەوە بەسوود بوو و هەمیش لە ڕووی سیاسییەوە بەردەست بوو، ئەمە کارە نەبوو لە ئەوروپا. هیچ حکوومەتێکی ناوەندی بەهێزی تر نەبوو بۆ دابەشکردنەوەی سەرچاوەکان لە سەر پێوەرێکی نرخێنراو لە ڕووی کەلتوورییەوە دەبێت، گەر هەمیشە لە ڕووی یاساییەوە نەبێت. زەحمەتە بۆ هاوڵاتیانی وڵاتێك کە لە وڵاتی خۆیان بڕۆن و کار لە وڵاتێکی تر بکەن، زمان هەمیشە کاریگەترین بەربەستە بۆ کۆچکردن بە قەد باج بۆ بازرگانی.

ئایا وڵاتانی ئەندام لە یۆرۆ سوودی بە پێی پیۆست دەدۆزنەوە بۆ قەرەبووکردنەوەی زەرەری ئامێرێکی کاریگەری سیاسەتی ئابووری نەتەوەیی کە پرسیارێك بوو تەنها ئەزموونی دراوێکی گشتی دەیتوانی وەڵامی بداتەوە. بە هەمان شێوەش، پرسیارێکی پەیوەست بەمە ئەوەبوو ئایا، لە سەر بنچینەی گرێدانی ئابووری، ئەوروپا پێی دەکرا تاکە سیاسەتێکی دەرەوە و ئاسایش پەیڕەو بکات؟.

سەبارەت بە فراوانکردنی یەکێتییەکەش، بۆ گرتنە خۆی وڵاتە کۆمۆنیستەکانی پێشووی ئەوروپای ڕۆژهەڵات و ناوەند، ئەمە دیسان کارێکی ئاسان نابێت. هەرچەندە نەك لە سەر ئەو پێوەرەی حکوومەتی فیدراڵی ئەمریکا، یەکێتیی ئەوروپا هەندێ یەکێتیی فراوانی گەنجینەی هەبوو کە لە وڵاتانی دەوڵەمەنتری باکوورەوە هاتبوون و دەکرێ ئاڕاستەی هەژارەکان بکرێت هێشتا هەڕەشەی ئەوەی لێ دەکرا بۆ زۆرکردنی وەسڵ بۆ باکوور لە کاتێکدا کەمکردنەوەی داهات بۆ باشوور، بۆچوونێك بۆ هیچ لایەکیان سەرنجڕاکێش نەبوو. فراوانکردنی ئەندامێتی بۆ ڕۆژهەڵات ئەمەش ڕووبەڕووی یەکێتیی ئەوروپا دەبێتەوە لەگەڵ کێشەی سیستەمی بازرگانی جیهانی کە دووچاری بۆوە لە بەر جەنگی سارد: ئەندامی زیاتر کاری یەکگرتووی هەر جۆرێکی زەحمەتر دەکرد. ئارەزووەکانی یەکێتیی ئەوروپا بۆ قسە کردن بە یەك دەنگ و کارکردن بە یەکلاکەرەوەیی لە ناوچەی نێودەوڵەتی لە گرژیدا بوون لەگەڵ خولیای هەمان کاتی بۆ گرتنەخۆی زۆربەی زۆری ئەوروپا بە شیاوی.

## مۆدەی ئەوروپی

گەر لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا، بۆچوونێك بۆ ئەوروپایەکی یەکگرتوو تر بە بێ گرفت نەبوایە، هیچ کامیان بێ ئومێد نەدەبوون. مێژووی پرۆژەی ئەوروپا لەوەتەی هەناردنی پاش جەنگی جیهانی دووەم یەکێك بوو لە پێشکەوتنە شیاوەکان بەرەو قووڵییەکی زۆرترو و

پانییەکی گرێدراو لە ڕێگای پرۆسەی بەکاربردنی دەزگا و هەروەها بە شێوەیەکی بەرفراوان سیاسەتی کار و مامەڵەکردن و ڕێگە چارەی مام ناوەندەوە، بەڵام هەتا گەر یەکێتیی ئەوروپا فراوانترو قوڵتر کرابایە، وڵاتانی ناوچەیەکی دیکە وا مەسەلەکەیان بە ئاسانی نەدەهاتە بەرچاو بۆ پەیڕەو کردن و بەدواکەوتنی هەمان ڕێچکە. ئەوروپییەکان باش هاوکاری کرابوون بە پێچەوانەی گرێدانی ناوچەیی: ڕۆمانی گشتی و مەسیحییەت و چاخی ناوەڕاست، هەروەها باکگراوندێکی مۆدێرن، مێژوویێکی دوور و درێژی تێکەڵ بوون، هەروەها قەبارەیەکی بەراوردی تووند و ئاستی پێشکەوتنی ئابووری.

لەکاتی نەبوونی هەر یەك لەم خاسیەتانە، نیوەی ڕۆژئاوا بنەمای باشیان هەبوو بۆ گرێدانی یەکرێزی ئابووری. لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکان لە پۆستی زاڵدا، هەتا بۆ یەکگرتنی سیاسی، لە سەرەنجامی بڵاوبوونەوەی دیموکراسی لە ئەمریکای لاتین، بەڵام ئاسیا، تەنانەت تەنها ئاسیای ڕۆژهەڵات، زۆر گەورە و فرەڕەگەز بوو، هەروەها گفتوگۆهەڵگر بوو بۆ هەر کۆششێکی جدی لە یەکرێزی لە ساڵانی بەرایی سەدەی بیست و یەکدا، لە دوا دەیەی سەدەی بیستەمدا، ژاپۆن وەگەڕخستنی تایبەتی لە وڵاتە هەژارترەکانی ناوچەکەدا کرد، هەروەك ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ئەمریکای لاتین کردی. هەندێ لە ژاپۆنییەکان ڕوانیانە ئەمە وەك بنەما بۆ کەرتی ئابووری ناوچەیی، مێتافۆرێك بۆ ئەمە (شێوەی پیتی ڤی هی پەڕێکی قازێکی فڕیو بوو)، لەگەڵ ژاپۆن لە پێشەنگدا، بەڵام کەرتی ئاسیای ڕۆژهەڵاتی و ژاپۆنی ناوەندی بە شێوەیەکی بەرچاو ئەگەرێکی دوورتر بوو لە چاو کۆمەڵەی ئابووری ناوەندی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

لە بەر یەك شت، ژاپۆن و وڵاتانی تری ئاسیای ڕۆژهەڵات، هیچ بەرژەوەندییەکی تریان نەدەبوو لە ڕێکخستنەکان کە دووریان بخاتەوە لە بازاڕەکانی ئەمریکا لەوەی کە ویلایەتە یەکگرتووەکان دەیان بێت لە دوورخستنەوەی ئابووری لە ئاسیا. جیهانگیری زیا لە دروشمێکی هەیە: چالاکی ئابووری نێودەوڵەتی ڕوودەدات لە سەر پێوەرێکی جیهانی و دەستێوەردانی نرخی ئابووری ڕاستەقینە دەسەپێنێت. لە بەر شتێکی تر، وڵاتە هەژارترەکانی ئاسیای ڕۆژهەڵات کەمتر سەرنجڕاکێش دەبن بۆ سەرکردایەتی ناوچەیی ژاپۆنییەکان لەوەی ئەمریکای لاتین، لەگەڵ نیگەرانی مێژووی گەورەی ئەوان بۆ باکوور، دەبێتە ڕێزگرتنی لە پاش ویلایەتە یەکگرتووەکان. ئەمە بە هەمان حاڵەت بوو بۆ چین، گەورەترین وڵاتە لە ناوچەکە لە ڕووی دانیشتوانەوە. گەر



ئاسیای ڕۆژهەڵات سەرکردەیەکی ناوچەیی هەبا، تاکە کاندید بۆ چینییەکان تەنها چین دەبێت. هەروەها هەتا گەر مۆدەی ئەوروپییەکان ڕێکخراوی ناوچەیی بڵاو دەبێتەوە بۆ نیوەی ڕۆژئاواو ئاسیای ڕۆژهەڵات لە سەدەی بیست و یەکدا، بەشە گەورەکانی ئەم زەمینە، یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوو، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئاسیای باشوور، ئەفریقیا، هێشتا لە دەرەوەی هەر یەکێکیان دەمێننەوە.

یەکگرتنەوەی ئەوروپا، هەرچەند بە خێرایی پێشکەوت و هەر کاریگەرییەکی هەبێت لە سەر تەواوی وڵاتان دیکەی جیهان، سیستەمێکی دوژمنکارانە و شێواو نالیبراڵی جیهانی نەخستە ڕوو لە سەدەی بیست و یەکدا بۆ هۆیەکی تر، کە ئەمە لە هەموو شتێك گرینگتر بوو. هۆیەکە ئەمە بوو: یەکگرتنی ئەوروپا خۆی پرۆژەیەکی لیبراڵی بوو. ئەندامانی یەکێتیی ئەوروپا داوایان لێ کرابوو ببن بە لیبراڵ و دیموکراسی و پەیڕەوی دەستوور بکەن. یەکرێزی ئابوورییەکانیان بازرگانی فراوان کرد و وەگەڕخستنیش لە نێونیان بە بێ کەمکردنەوەی لێشاوی شت و سەرمایە لە نێوان ئەوروپا و وڵاتانی دیکەی جیهان بەردەوام بوو. شتێکی ئاساییە ڕێکخستنی ناوچەیی وەك بەرابەری بازرگانی وڵاتێکی خۆشگوزەر بۆ ئابووری ناوخۆ و سیستەمی برێتن ودس بۆ پارە دەمژمێر بکەیت: ڕێگە چارەیەکی ناوەند لە نێوان ئەوەی لە ڕووی ئابوورییەوە ویستراوە و ئەوەشی لە ڕووی سیاسییەوە شیاوە و بۆیەش هەنگاوێکی تووندە، کەمتر لەوەی بەربەستێکی ڕووخێنەر بێت، بۆ سیستەمێکی ئابووری لیبراڵی نێودەوڵەتی پێویست بوو. هەروەها پەیوەندییەکان لە نێوان ئەندامانی یەکێتیی ئەوروپا بە تەووای ئاشتیانە بوو لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا، وای لە ئەوروپای ڕۆژئاوا کرد ببێت بە مەنزڵگەیەکی دوور لە شەڕانگێزی لە سەر ناوچەکە کە لە نیوەی یەکەمی هەمان سەدەدا، تووندترین و وێرانکەرتین جەنگ لە هەموو مێژووی تۆمارکراوەوە بەرپا بوو. مێژووی سیاسی و ئابووری ئەوروپای ڕۆژئاوا لە پاش جەنگی جیهانی دووەمەوە بەهێزترین بەڵگە بوو لە بەرژەوەندی مێژووی تیۆری لیبراڵ: لەوێ هەموو شتە باشەکان و دیموکراسی و ڕەفاهییەت و ئاشتی بە یەکەوە هەڵیان دەکرد.

گەر یەکێتیی ئەوروپا پێشەنگی وڵات بێت و لە ڕێگای جیهانی سەدەی بیست و یەکەوەش ڕێکبخرێت، کەواتە، شتێکی زۆر خراپتری سیستەمی لیبراڵی نێودەوڵەتییە لەوەی نالیبراڵی، خاڵێك کە دەکرێ بە هێزبکرێت بە هۆی سەرنجدانی لە ڕێگاکانی کە یەکێتیی ئەوروپا لە

سەرەتای سەدەی نوێدا بە سیستەمی ئاسایشی گشتی لە ئەوروپا و سیستەمی بازرگانی جیهانی و ڕێکخستنەکانی پارەی نێودەوڵەتی دەچوو، پەیکەرەکان بۆ لیبراڵیزمی نێودەوڵەتی کە ئامانجەکانی ئەو سێینەیەی دەستەبەرکرد کە ودرۆ ویڵسن پەردەی لە سەر لادان لە پاریس لە ١٩١٩.

شیکردنەوەی هەریەکەیان جیهانێکی وڵاتانی خاوەن سەروەرین. لە سەدەی بیست و یەکدا، بە قەد سەدەی بیستەم و نۆزدەهەم، هەروەها هەموو سەدەکانی پێشتر، هیچ حکوومەتێکی جیهانی نەبوو بۆ بەردەوامبوونی فەرمان یان کار بکات وەك دەسەڵاتی پارەی جیهانی، دەرکردنی دراو و ڕزگارکردنی وڵاتە تووشبووەکان بەقەیرانی دراو. لە سەر مەسەلە هەرە گرینگەکان، لە نێو یەکێتیی ئەوروپادا بە قەد ئەوەی لەگەڵ ئاسایشی گشتی و بازرگانی و پارە و دەسەڵاتی ڕەها ژیا لەگەڵ دەسەڵاتە سیاسییە نەتەوەییەکان. لە هەریەکەیاندا، کەواتە، وڵاتە بەشداربووەکان سەرنجی نۆرمە لیبراڵییەکانیان دا بە ئارەزوومەندانە، سەرکەوتنی هەریەکەیان لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستدا ئەوە دەخاتە ڕوو کە سیستەمی نێودەوڵەتی بە بێ حکوومەتی نێودەوڵەتی شیاوە.

هەریەکەیان تێوەگلابوون دواتریش زۆرتر بەوای داهاتن. هەریەکەیان یەکەم دەبوایە نێردرابوا و دواتر هەموار کرابا وەك گۆڕانی ئامانجەکان و بارودۆخەکان. ئەمە پێویستی بە دانووسان و ڕێگە چارەی مام ناوەند هەبوو. واتە، سیاسەتی کەمتر لە ئیدارە تێوەگلاند. لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستدا، بە پلەی جیا جیا، ئەندامانی یەکێتیی ئەوروپا و حیزبەکانی سەر بە سیستەمی ئاسایشی گشتی ئەوروپا و هەروەها بەشداربووان لە سیستەمی بازرگانی نێودەوڵەتی و پارەدا تاوانی تەواویان هەبوو بۆ ڕێکەوتن بۆ دامەزراندنیان و پاڵپشتکردنیان. ئەو ڕێگایانەی کە تیایدا ئەنجامیان دا زۆر جیا بوو. لە نێو یەکێتیی ئەوروپا و سیستەمی بازرگانی جیهانیدا، دانووسانی بەردەوام ڕێکەوتنی ئاشکرای لێکەوتەوە. لە سیستەمی پارەی نێودەوڵەتی، بە تایبەتی لە پاش کۆتایی سیستەمی برێتن ودس، ڕێکەوتنی فەرمی جار بە جار هەبوو، بەڵام زۆر جار هەماهەنگی نافەرمی هەبوو، هەرکە وڵاتەکان تێوەگلان سیاسەتی پارەی خۆیان ورووژاند تاوەکو نەهێنە نێو ململانێی ترسناك لەگەڵ هی ئەوانی تردا.

بێ دەسەڵاتێکی زۆر بەهێز، وڵاتانی خاوەن سەروەری چوونە نێو نۆرمە لیبراڵییەکان نەك لە بەر ئەوەی داوایان لێ کرابوو بن بە لیبراڵ، بەڵکو خۆزگەیان بە ئەنجامدانی ئەم کارە دەخواست.



خۆزگەکە بە گشتی بە فراوانی بە پابەندبوونێکی قووڵەوە بە بنەما لیبراڵییەکان لە دایك بوو کە لە هەر حاڵەتێکدا، ڕەگی داکوتابوو لە سیاسەت و ئابووری وڵاتانی بەشداربوو خۆیان. دەیانتوانی لە هاوکاری کردنی یەکترەوە لیبراڵیزم بونیاتبنێن و بیپارێزن، چونکە پراکتیزی لیبراڵیان کرد لە دەرەوە بە تەنیا. ئەمە تەنها یەکێتیی ئەوروپا نەبوو، بەڵکو سیستەمی ئاسایشی گشتیش بوو و سیستەمی بازرگانی نێودەوڵەتی و پارە بوو کە مێژووی تیۆری لیبراڵیان بەردەست کرد. یان بەلانی کەم شیکرنەوەی سەرەکی، کە بەها لیبراڵییەکان و پراکتیزەکان بە هاوبەشییەکی بەهێز بە نێو کەرتی جیا جیاوە بەرەو ژیانی ئابووری و سیاسی چوون.

دامەزراندن و سەرکەوتنی بەهاو پراکتیزی لیبراڵییەکان یارمەتی کۆتایی جەنگی ساردیان دا لە سەر زاراوەی ڕۆژاوایی. لە بەرابەردا، کۆتایی جەنگی سارد، دەرفەتێکی بۆ دیموکراسی و ئابووریی بازاڕ و هەوەرها ئاسایشی گشتی دروستکرد بۆ ئەوەی دەبمەزرێن کە ڕۆژێك لە ڕۆژان حەرام بوون، هەروەها بۆ بۆ سیستەمی بازرگانی و پارەی نێودەوڵەتی بۆ فراوانبوون بۆ گرتنە خۆی ئەو وڵاتانەی کە لە دەرەوەی ئەوان وەستا بوون لە زۆربەی کاتەکانی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا. هەروەها ئەو ڕادەیەی کە بۆی دەمەزرابوون و فراوانبوون، ئەو ڕادەیەی کە ئەوان بەدوای کەوتن، بە قەد مێژووی مرۆڤ کۆن بوو، بە قەد بڵاوبوونەوەی کەلتوور پێوەر دەکرێن، لە سەدەی بیست و یەك، ئەوەی کە کۆتایی جەنگی سارد شیاوی کرد ئەویش سیستەمێکی نوێی جیهانییە.

## دەرەنجام

له فیلمی برایانی مارکس (Duck Soup)، دەقەکە لە سەر سیاسەتی نێودەوڵەتییە، دیمەنێك ڕوودەدات لە ئۆفیسی ترێتینۆ، باڵیۆزی سیلڤانیا. بەرقییەك دەگات و هارپۆ برای بێدەنگ هەمیشە دڵخۆش دەبێت بە هەراو هۆسە، دەیگرێت و دەیقۆپێنێتەوە. بۆ باڵیۆزە ساختەکە، چیکۆ، برا ئیتاڵییەکەی پیانۆی بە هەڵە عەزف دەکات، خۆی بەم شێوەیە پارچە مۆسیقاکەشی دەکاتەوە: ئەوەی ناتوانێت بخوێنێتەوە زوو دەستەمۆ دەکرێت".

ئەم دیمەنە دەکرێ گەورە بکرێت بەسەر جیهاندا لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا. سێینەی لیبراڵی ویڵسن کە ئاشتی و دیموکراسی و بازاڕی ئازادە، هەمان باری بەدەست هێنا وەك خوێندەواری: هەرچەند جیهانێکی نەبوو، بەڵام بە فراوانی بڵاوبۆوە، زاڵ نەبوو، بەڵام بەرەنگاریشی نەکرایەوە. میتۆدە تەقلیدییەکان یاخود نالیبراڵییەکانی ڕێکخستنی ژیانی ئابووری و سیاسی نێودەوڵەتی هیچی دیکە شەرعییەتی نەبوو و هیچ لایەکی پێشەنگ نەکرد لە سەر ئەو دەمەتەقێیەی لە مەڕ نەخوێندەواری کرا.

ئێستاش ئەمە مانای ئەوەنەبوو کە هەموو وڵاتانی خاوەن سەروەری جیهان بنەما لیبراڵییەکانی ویڵسنیان بە تەواوی پراکتیز نەکردووە. هەرچەندە هەموو وڵاتێك ئابووریی بازاڕی ویستووە، بەڵام هەموویان بازاڕێکی سەرکەوتوویان دەستەبەرنەکردووە. لیستی وڵاتە دیموکراسییە لیبراڵییەکانی جیهان زیاتر وڵاتانی خاوەن سەروەرییە لەچاو پێشوودا، بەڵام هەمووشیانی نەگرتەوە. گەلێ لە حکوومەتەکانی وڵاتانی دەرەوەی جیهان، لە پشت پەناگەی دەستوور نووسین و سەروەری جەماوەری، دەسەڵاتیان گرتە دەست بە زۆری و مومارەسەکردنی هێز بە شێوەیەکی هەڕەمەکی نەوەك بە ڕازیبوون. سەبارەت بە هەوڵی لیبراڵ بۆ پەیوەندی نێودەوڵەتی و ئاسایشی گشتی، بەدەر لە شێوازێکی سەرکەوتوو لە سەرانسەری جیهان، بۆ خزمەتی ئەورووپا دەستی بەسەردا گیرا بوو. هەمان بارودۆخی سەرەتا سەدەی نۆزدە لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا دووبارە بۆوە بەوەی کە دیموکراسی و بازاڕی ئازاد لە سەدەی بیست و یەکدا بەقەدەر سەرەتای سەدەی نۆزدەدا دوو شتی نوێ و باش و ناسك بوون ویڕای ئەمە، فەشەلهاوردە بڵاوبۆوە بۆ دەستەبەرکردنی پراکتیز و دەزگاکانی لیبراڵیزم، بە تایبەتی بازاڕ، ئەمەش ڕازیبوونی لێکەوتەوە دژی سێینەی هیجیمۆنی گەورە و ئەو وڵاتانەی کە پراکتیزو دەزگاکانی لیبراڵیزمیان دەستەبەر کرد. ئەمە هەستە لە بەرابەردا ڕاست و بەهێز گرێ لە هێرشەکان بەردا، لە سەر





بنەمای سیستەمی لیبراڵ. سەرنجڕاکێشترینیان هێرشەکانی سەر نیۆیرك و واشنتۆن بوون لە یانزەی سێپتێمبەری ساڵی ٢٠٠١، بەڵام تیرۆریزم تەنها هەڕەشە نەبوو بۆ سەر سیستەمی دوای جەنگی سارد. تەنانەت جیدیترین هەڕەشە نەبوو.

### زۆرداری کەلتوور

دووسەد ساڵی زیاتری مێژووی تەمەنی مۆدێرن، ئاڵۆز و چڕ و تێکەڵ بوو، لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکەوە، بیرنا، بابەتێکی ڕوونی هەبوو: سەرهەڵدانی باری هەوڵی لیبراڵی ڕەها بۆ سیاسەت و ئابووری و هەروەرها (بە خاسیەنەکانییەوە) ئاسایش کە ودرۆ ویڵسن پاڵپشتی کرد لە ساڵی ١٩١٩ لە پاریس، هەرسێکیان بە ڕەگی جیهانی بەریتانی و ئەمریکییەکانی سەرەتای چاخی مۆدێرنەوە بوون.

لە سەدەی نۆزدەهەمدا، لیبراڵیزم بەرەنگاری ڕێگا تەقلیدییەکانی ئەنجامدانی شتی کرد و زاڵ بوو بەسەریاندا. لە سەدەی بیستدا، هەوڵە لیبراڵییەکان لە جەنگی جیهانی دووەم و جەنگی ساردا سیستەمە نالیبراڵییەکانی سیاسی و ئابووری و سیاسەتی دەرەوەی تێکشکاند کە فاسیشت و هێزە کۆمۆنیستەکان دەستەبەریان کردبوو.

هەموو وڵاتەکان بە یەکسانی وەك یەك لیبراڵ نەبوون. بە هەقیقەت، هەندێکیان بە هیچ شێوەیەك لیبراڵ نەبوون. کاتێ بۆچوونەکانیان بۆ ئاشتی و دیموکراسی هەمەجۆر بوو، هەرچەند، زۆربەی وڵاتە سەروەرییەکانی لە کۆی دووسەد وڵاتی جیهان بە نیازی دروستکردنی، یان درێژەپێدانی ئابووریی بازاڕ بوون، ڕێچکەیەکی گلۆبالی بوو کە ڕەگی داکوتا بوو لە گۆڕانی سەرەکی لە کاروباری نێودەوڵەتی لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەهەمدا.

ئەم گۆڕانە وەرچەرخانێك بوو لە سروشتی شەرعییەتی سیاسی، سەرچاوەی کۆتایی حکوومەتێك لە هێز و مانەوە لە دەسەڵاتدا بوو. لە کاتە یادنەکراوەکاندا، تێستی مەرکەزی شیاوی هەر حکوومەتێك بۆ حوکم کردن ئەو توانایە بوو بۆ بەرگریکردنی سنوورەکانی خۆی. چاخی مۆدێرن تێستێکی تری هێنا ئاراوە. حکوومەتەکان داوایان لێ کرابوو، بە هەر ڕێگایەك بێت، نوێنەری ئەوانە بکەن کە حوکمیان دەکەن، جگە لە حاڵەتی هێزە نالیبراڵییەکانی سەدەی بیستەمدا، لە ڕێگای هەڵبژاردنی ئازادو لە ڕووی سیاسییەوە بەرپرسیار بن ئەوانەی هەڵدەبژێردرێن. لە کۆتایی سەدەی بیستدا، سنوورەکانی زۆربەی وڵاتانی خاوەن سەروەری

فەرمانی دا بە پەسەندییەکی فراوان و هەندێ ڕژێم مانەوە کە تیایدا حاکمەکان جڵەوی دەسەڵاتیان گرتە دەست لە ڕێگەی میراتەوە، هەروەك زۆربەی هەرە زۆریان بەو چەشنە هاتبوونە سەر حوکم پێش شۆڕشی فەڕەنسا. سەبارەت بە گرینگی بەرگریکردن و نوێنەرایەتی کردن کەم بۆوە، لەکاتێکدا سێیەم بنەمای شەرعیەتی سیاسی پەیدا بوو کە ئەویش ڕەفاهییەت بوو.

لە ماوەی سەدەی بیستەمدا، شتێکی ئاشکرابوو کە شتی باش بۆ هاولاَتیانی ولاَتێك شیاو بوو لە سەر پێوەری پێشخۆیان کە کارێکی چاوەڕێ نەکراو بوو. کاتێکیش ئەو شتە باشە کرا، دەوڵەمەندی و ڕەفاهییەت بوو بە ئارەزوو. بەرزترین ئامانجی ژیانی سیاسی بۆ خێرا بەدیهاوردەی ئەو خۆشییە بوو. مێژووی ئابووری سەدەی بیستەم ئەوەشی خستەڕوو کە میکانیزم بۆ پێشکەشکردنی ڕەفاهییەت بازاڕ بوو، بۆیە فشاری زۆری خستە سەر ئەوانەی کە حەزیان بە حوکمکردن بوو بۆ پڕ ئامێکردنی کۆمەڵگاکانیان بە سامان کە دەبێتە بەرهەمهاوردەی سیستەمی ئابووری لیبراڵ.

سیستەمی نێودەوڵەتی وای لێهات بە گالیسکەیەکی شەمەندەفەر دەچوو یان کاروانێکی کەشتییەکان کاتێ بە یەك ئاراستەدا دەڕۆن، بەلاَم کاتێ گالیسکەکان لە گالییسکەیەکی شەمەندەفەردا و کەشتییەکان لە کاروانێکدا لە یەکتر نزیك دەبنەوە بە مەبەستی سەلامەتی، لە سیستەمی نێودەوڵەتی دوای جەنگی ساردا ولاَتانی خاوەن سەروەری جیهان ڕیزیان گرتبوو بە ڕێگایەکەدا بەرەو لیبراڵیزم. بۆچی هەندێ ولاَت زۆر دوور بەدوای ئەوانی ترەوەن؟

گەلێکیان بەم دواییە دەستیان پێکرد، پابەندبوون بەقەد ئەوەی کە وابوون بۆ زۆربەی سەردەمی مۆدێرن بۆ ئابووری و سیاسەتی نالیبراڵی تەقلیدی. هەرکە پابەندبوونێکیان بۆ لیبراڵیزم دروستکرد و، پێشکەوتن کە دەبوایە ئەو پابەندبوونە پێشتر هەبووایە. لیبراڵییەکان دووچاری بەرهەڵستکاری ناوخۆ دەبن لە سەر سیاسەتی دیموکراسی لەوانەی کە دەسەلاَتیان گرتە دەست و حەزیان نەکرد بەش وەرگرن و بەرگەبگرن بۆ دروستکردنی ئابووریی بازاڕ بۆ سوودمەندانی شێوانی سیاسی و ئابووری. ئێستا شتێکی مەسەلەیەکی قوڵتر هەبوو کە هەندێ ولاَتانی خاوەن سەروەری دوورتر ڕۆیشتبوون لەوانی تر لە چەسپاندنی سێینەی ویڵسن: کەلتوور، پێناسە دەکرێت وەك بەهاو بۆچوونەکان و باوەڕەکانی کۆمەڵگا.

لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا، کەلتوور پەیوەندییەکی زۆر گەورەی هەیە بەوەی کە ئایا ولاَتانی خاوەن سەروەری ئابووریی بازاڕیان دامەزراندووە. بازاڕێکی گەرم و گوڕ دەبێ دەستە بەر





بکرێت لە کۆمەڵێك هاوکار بێت بۆ دەزگا سیاسی و ئابوورییەکان و توانا بۆ پێشکەوتن و بەکارخستنی ئەم دەزگایانە بە توندی پشت دەبەستن بەوەی ئایا بەها زاڵەکانی کۆمەڵگایەك خۆیان ئامادەن بۆ ئەنجامدانی ئەرکێکی لەم جۆرە. لە گەلێ حاڵەتدا، وایان نەکرد. کەواتە هەنگاوێکی گرینگ لە بونیاتنانی ئابووریی بازاڕ، هەروەها دروستکردنی پابەندبوونێك بە ئاشتی و دیموکراسی، دەستەبەرکردنی کۆڵەگە و هاوکاری کردنی کەلتوورێکی گونجاوە.

گۆڕان لە بەهاکان گۆڕانی ڕێکی هەڵسوکەوتی بەدوادا هات، سەرەنجامی پەیوەندی لە نێو غەریبەکان هێزێکی کاریگەری مێژووی مرۆڤەو سەردەمی مۆدێرنە کە پڕە لە نموونی گۆڕانی کەلتوور. ئەڵمانیا و ژاپۆن، لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا لە نێو ولاَتە هەرە شەڕخوازکاندا بوون لە سەر ڕووی زەوی، بەلاَم لە نیوەی دووەمی سەدەکەدا بوون بە دوا کەس کە حەزیان بە شەڕ بێت. خێرا بە شارستانی بوونی هەموو هێزە نالیبراڵییەکان بەرهەمی ڕووداوێکی سەرسام بوو ئەویش جەنگی جیهانی دووەم و هەورەها داگیرکاری بێگانەشی بە دوادا هات. گۆڕانی کەلتوور ڕوودەدات لە ڕووێکی دیکەی مێژوودا، ئەویش ڕووی ئارەزوو و پێشکەوتنەکانە، ئەو ڕووە بوو کە مێژوونووس فێرناند برۆدل ناوی لێ نا ماوەی درێژ. ئەو جۆرە گۆڕانە کەلتوورییەی کە کار لە نمایشی ئابووری دەکات زیاتر دەوەستێتە سەر توانای فێربوونی کۆمەلاَیەتی لەبەرئەوەی ئەزموونی ملیۆنێك تاکی جیا جیا لەچاو ترۆمایەکی تاکێکی نەتەوەیەك باشترە.

ئەم جۆرە گۆڕانانە بە شەوێك ڕوونادات. نەوەی نوێ کاتەکان بەیەکتر دەبەستێتەوە، وەرچەرخانێکی بەها سەرکەوتووەکانی کۆمەڵگا پێویستی بەوەیە کە ئەو خەڵکانەی ئەزموونێکی زۆریان هەیە جێگەیان دەگیرێتەوە بە هۆی نەوەیێکی نوێ کە سوود لەو ئەزموونانەی پێش خۆیان وەردەگرن کە خەڵکی پێشخۆیان لە ئامێزیان گرتووە، لە کات و بارودۆخێکی تردا ئەو ئەزموونانە بەهای جیا جیان. وەك فێربوونی زمانێکی نوێ، فێربوونی بەهای نوێ زەحمەتتر دەبێت لە لایەن بە تەمەنەکاندا. هەروەها بەدیلی بۆچوونێکی کەسی لە کۆمەڵگا ڕوودەدات، لە ماوەی ئاسایی ڕووداوەکان، کاتێ نەوەیێك جێگای نەوەکەی پێش خۆی دەگرێتەوە.

کەواتە کاتێ کەلتوور دەگۆڕێت (هەمیشە لە گۆڕانیشدایە) هەروەها بارودۆخەکان لە ماوەی مۆدێرندا دەگۆڕێن، ناتوانن یەکسەر بگۆڕدرێن لە ڕێگەی کاری سیاسەتی فەرمییەوە. سیستەمی سیاسی لیبراڵ پێویستی بە حوکمی یاسا هەیە، ئابووری لیبراڵ و سیستەمێکی دارایی و موڵکێکی تایبەتی، سیاسەتەکانی ئاسایشی گشتی و پابەندبوونێك بۆ بێ جەنگی. هەموو بەها

تێوەگلاوەکان و ئەوانەشی کە دەوروژێنرێن، لەو شیووەی کە وجدیان هەیە، لەماوەی نەوەدەکان، دامەزراندنی دەزگا سیاسی و ئابوورەیەکانی لیبراڵ و لە باوەشگرتنی سیاسەتی ئاسایشی لیبراڵ کەمتر وەك بیناسازای وایە زیاتریش لە دیراسەی گەشەی گوڵ و سەوزە و میوە دەچێت.

ئەمە مانای ئەوەیە لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا، کردەوەی بە کۆمەڵ و ڕێکخراو ئەنقەست هێزی کەم تری هەبوو بۆ بەدەستهاوردەی ئامانجی سیاسی سەرەکی لەوەی حاڵەتێك بێت لە دوو سەد ساڵ لەمەو بەر. شۆڕش، شاکاری سەدەی نۆزدە، لە لایەن خەڵکەوە هەڵگیرسا و لە لایەن سەرکردە سیاسەکانەوە ڕێبەری کرا. جەنگیش کاری سەرەکی سەدەی بیست بوو و بەرپابوو لە لایەن ئەو سوپایانەی کە لە لایەن حکوومەتەوە ڕێکدەخران و بەڕێوەدەبران و پڕ چەك دەکران. بڵاوبوونەوەی دەزگا و پراکتیز و بەها لیبراڵییەکان، خاسیەتی هەرە گرینگی ژیانی نێودەوڵەتییە لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا، ناکرێ بە هەمان ڕێگا بانگەشەی بۆبکرێت و کۆنترۆل بکرێن. ئەم بڵاوبوونەوەیە دەستپێشخەری یان ئامانجێکی وا بە خێرایی نەبووە. لەم حاڵەتەدا مێژوو دروست ناکرێت، بەڵکو ڕوودەدات.

ئەمە ناکۆکی دوای جەنگی ساردی دروستکرد. وڵاتانی لیبراڵی ناوەوەی جیهان بە بەراورد لەگەڵ پێشتردا هەم بەهێز هەمیش بێهێز خۆیان دۆزییەوە. نموونەی گشتیان کێشەیەکی ڕوونەداوی لەخۆگرت. وەك مۆدێلێکی ئابووری و سیاسی، لیبراڵیزم هیچ ڕکابەرێکی نەیبوو، بەڵام ئامێرەکانی سیاسەتی دەرەوە کە هێزەکانی ناوەوە مەشقیان دەکرد بە بەراوردکارییەوە بێهێز بوون. دەسکەوتی ئامانجی باڵای نێودەوڵەتیان، دروستکردنی جێهانێکی تەواو لیبراڵ، کەمتر پشتی بەستا بەو شتانەی کە وڵاتانی دیکە کردیان لەو دیو سنوورەکانیان لەوەی چۆن ئەو وڵاتانە لەگەڵیاندا پێشدەکەون. ئالیەتە تەقلیدییەکانی سیاسەتی دەرەوە، چەك، پارە، بەڵێنەکان یانیش پێشنیارکردنی بەکارهاوردەی یەکێك یان هەردووکیان، بە چەشنێکی تایبەتی ئەوتۆ کاریگەر نەبوون. نوکتەیەکی سەیری ئەمریکییەکان ئەم خاڵە ڕوون دەکاتەوە: " چەند پزیشکی نەخۆشی دەروونی پێویستە بۆ گۆڕینی ڕووناکی گڵۆپێك؟ هیچ. ڕووناکی گڵۆپ دەبێ خۆی بیەوێ خۆی بگۆڕێت." لە زیادکردنی حەز بۆ گۆڕان، نموونەی ڕۆژئاوا کاریگەیەکی بەهێزی هەبوو، لە بەدیهاوردەی حەز بۆ گۆڕان ڕۆژئاوا ئالییەتی باشتری بەکارهێنا.

وشەی سیاسەتی دەرەوە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان ڕەنگدانەوەی ئەم دژیەکە بوو. ئەندامانی دەزگای سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا وەك پێشتر لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا عادەیتان



ناچارکردنی وڵاتانی تر بوو بۆ ئەنجامدانی ئەوەی ئەمریکا دەیەوێت و بەن بەوەی ئەمریکا دیخوازێت. گێڕانی ڕۆلێکی چالاك لە پاڵنان بە وڵاتانی تر بۆ ئاڕاستەیەکی بە دڵی ئەوان بە بەرپرسیارێتی خۆیانیان دەزانی، بەڵام لەبەرئەوەی تەنها توانایەکی سنووردایان هەبوو بۆ کارکردن لە هەرە گرینگترین لەو دیو سنوورەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە، گفتوگۆکانیان پەرش و بڵاودەکردەوە بە یەك جۆرە فرمان، کە تەرخانکرابوو بەقازانجترین کار بە بێ گواستنەوەی هەر کردارێکی تایبەت.

ئەمریکییەکان لە یەکەم دەیەی دوای جەنگی ساردا بانگەشەی ئەوەیان کرد کە خۆیان بە پابەند دەزانن بۆ برەودان و خێراکردن و هاندان و ئاسانکاریکردنی دیموکراسی و بازاڕی ئازاد (نەك ئاماژەکردن بە شێوەکردنی ژینگەی نێودەوڵەتی). ئەم وشە باشانە مانایەکی مێتافۆرییان هەبوو واتە هەڵوەشاندنەوەی پەیوەندی و نزیکی لەگەڵ واقیع. مانای هیچ شتێکیان نەبوو لە ناوەڕۆکدا.

لاوازی سیاسەتی حکوومەتی دوای جەنگی سارد، بۆچوونەکانی بەرزنەکردەوە بۆ بڵاوبوونەوەی هەر سێ بەشەکەی سێینەی ویڵسن. خێرا بڵاوکردنەوەو دوور ڕەوانەکردنی سێینەی ویڵسن لە سەدەی بیست و یەکدا پشت دەبەستێت بە هێزی ئەو تێکەڵ بوونانەی کە لە لایەن مێژووی تیۆری لیبڕاڵەوە دانراون، تا ئەو ڕادەیەی کە ئابووریی بازاڕ بۆ سێینەکە لە دایك دەبێت بۆ دیموکراسییە سیاسییەکان و ئەو ڕادەیەشی کە دیموکراسییە سیاسییەکان بنەماکانی شەفافییەت و زاڵبوونی بەرگری لە سەنتەری سیاسەتەکانی ئاسایشی خۆیان دادەنێن.

ئەو تێکەڵبوونە یان دەزگایانە نیزاماتی یاساکانی زانستی فیزیایان نییە. تەنها بۆچوون و پێشبینین. هەبوونی بازاڕێکی گەرم و گوڕ زەمینەیەکی لە بار دەڕەخسێنێت بۆ هەڵبژاردنی ئازاد و حکوومەتی دەستووری، هەرچەند مسۆگەری ئەمانەش ناکات. هەمان شت ڕاستە بۆ دیموکراسی و ئاشتی. وێڕای ئەمە، هێزی ئەو دەزگایانە بەوە بەستراوە کە جیان لە وڵاتێکەو بۆ وڵاتێکی تر، هەروەك بەرگری باشی لیبراڵیزمی ئابووری و سیاسییە. هێشتا، دەزگا و پڕاکتیزە لیبراڵییەکان زۆر بە فراوانی دابەشکراون و بە قووڵی بە پێی پێویست ڕەگیان داکوتاوە، هەروەها بۆچوونەکانی تیۆری مێژووی لیبراڵ ماقوڵانە بە دیارکەوت، کە جیهانی هەزارەی نوێ بە هەمان ئەو جیهانەی پێش سەد ساڵ لەمەو بەر دەچێت.

وەرچەرخانی سەدەی بیست، وەك وەرچەرخانی سەدەی بیست و یەك، ساتێك بوو لە ولآتانی ناوەوەی جیهان لیبراڵیزم لە زۆربووندا بوو. بەرهەم و سەرمایە بە بەراورد لەگەڵ سەردەمانی پێش ئەو سەدەیە زۆر ئازادانەتر و بە قەبارەیەکی فراوانتر مامەڵەیان پێدەکرا، ئەم ماوەیە یەکەم چاخی درێژی جیهانگیرییە. لە سەرانسەری ئەوروپا ژمارەی ئەو خەڵکانەی کە مافی دەنگدانیان هەبێت بە باشی فراوانیکرد و ولآتەکان یەك بە دوای یەك دەستووریان بەکار برد: لە ١٩٠٥ هەتا قەیسەرە ئۆتۆکراسییەکانی ڕووسیاش یەکێکیان قەبوڵ کرد. سەبارەت بە ئاسایشی نێودەوڵەتیش، ئاشتی لەو ساتەدا خەریك بوو پێش بکەوێت. لە ١٨٩٩ کۆنفرانسێکی نێودەوڵەتی لە لاها ڕێبەری بڵاو کردەوە بۆ سنووردانانی چەکداماڵین و بانگەشەی کرد بۆ دروستکردنی دادگای نێودەوڵەتی بۆ هێورکردنەوەی دەمەتەقێ نێودەوڵەتییەکان ئەگینا ڕەنگە ئەو دەمەتەقێیانە بە شەڕ دامرکابوایەوە. (ئەننەوە نۆرمان) پیاوێکی مەزن و پڕ وەهمی ئینگلیز بوو باسی ئەوە دەکات کە یەك جەنگ لە ئەوروپا متمانەو بازرگانی نێودەوڵەتی لە یەکتر جیادەکاتەوە، بۆیە شەڕێکی لەم جۆرە هەرگیز ڕێگەی پێ نادرێت دەست پێ بکات گەر دەستیشی پێ کرد ئەوا زۆر بە خێرایی دەوەستێنرێت.

ئەننەوە بە سەهو و هەڵە لە قەڵەمدرا، بەڵام ئەو متمانە و گەشبینی لیبراڵییەی ئەو باسی لێوەدەکرد مرد لە جەنگە گەورەکەی ١٩١٤ تا ١٩١٨، دەرهاویشتەکەی سەردەمێك بوو تیایدا لیبراڵیزم کەوتبووە ڕکابەرییەکی زۆر توند لەگەڵ هەوڵە نالیبراڵییەکان لە ڕەوتی سیاسی و ئابووری سیاسەتی دەرەوە. لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا، لیبراڵی ڕەها هەمان چارەنووسی لە سەرەتای دوای جەنگی ساردا بەخۆوە بینی کە ئەو چارەنووسە لەو دیو شانشینی ئەگەرەکاندا نەبوو. جەنگ بە پێوەرێکی بەرفراوان مەحاڵ نەبوو. هەروەها ئەوەندە حەزیشی پێ ندەکرا لە بەر ئەو سێ ڕێگایەی کە سەرەتای سەدەی بیست و یەکی جیاکردەوە لە سەرەتای سەدەی بیست.

بارودۆخی جەنگ گواستنەوەی کاریگەر وەك ئەزموونێك بینی بوو. لە ١٩٠٠ حکوومەتەکان و خەڵکی ولآتانی ناوەوەی جیهان پێشبینی جەنگیان جەنگیان دەکرد، گەر شتێکی زۆر ئاسایی نەوابوایە، بەلانی کەم هەندێ جار زۆر بە پێویست و گرینگیشیان دەزانی. سەد ساڵ دواتر، بە چاوی ئەوانەی جێیان گرتەوە، لە ڕووی ئەخلاقییەوە جەنگ شتێکی بێ مانا بوو لە ڕووی سیاسیشەوە مەرامێکی لەپاڵ بوو. وێڕای ئەمە، حکوومەتەکانی دواتر دەبوایە بە جدی هەڵبکەن



لەگەڵ چەکی ناوکی، کە تەنها یە ك هێرشی لەو جۆرە کارەسات و وێرانکاریەکی ئێجگار دڵتەزێن بنێتەوە کە هەرگیز باسی لێوە نەکرێت و پێشبینی نەکرێت لە ١٩٠٠. هەروەها خاڵێکی زۆر باشە گەر لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا چاوێك بەوانەدا بخشێنیەوە کە سەد ساڵ لەمە بەر ژیاون و ئەزموونێکیان بۆ ئێمە جێهێشتووە: ئەویش ترس و تۆقینەکانی هەردوو جەنگی جیهانیە. ئەو ئەزموونانە حەز و هەوەسی بەرپاکردنەوەی ئەو جەنگانەیان دووبارە نەکردەوە. بێگومان هەردوو جەنگی جیهانی لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا، وایان لە ولآتانی ناوەوەی جیهان کرد تێکەڵ بە واقیعی چەکی ناوکی بن و بێشەرمانە هەموو شتێك بکەن لە پێناو پراکتیزکردنی کەرەستە کۆنەکانی جەنگ دیکتاتۆری و شۆڕش و ئاژاوە نانەوە هەردوو ڕووداوی سەدەی بیستەمی (هەردوو جەنگی جیهانی) بەیەکەوە بەستەوە، بەقەدەر ئەو هێزانەی لە سەدەی بیست و یەکدا بەیەکەوە گرێدراون. مەحاڵبوونی جەنگ و سەرکردایەتی شۆڕشگێڕی، بە شێوەیەکی بەرچاو تەسك بۆوە. ڕەگەزپەرستی وای لە هیتلەر کرد دەسەڵات بگرێتە دەست و ببێتە ڕابەری هەموو شتێك، هەروەها مارکسیزم کە خزمەتی هەمان مەبەستی کرد بۆ لینین و ستالین و ماو، هەموو ئەمانە لەناوچوون. ژیری مرۆڤ بێگومان بە توانایە بۆ پلانی بەدیلی ئایدیۆلۆژیای تر بۆ لیبراڵیزم، بەڵام لە سەرەتای سەدەی نوێدا هیچ نیشانەیەك و هیچ کۆششێکی جدی بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە نەبینرا. وێڕای ئەمە، ئایدیۆلۆژیای سەدەی بیستەم کە رادیکاڵی و بکوژ بوون جڵەوی دەسەڵاتیان گرتە دەست، بێنە سەر تەختی دسەڵات، ئەمەش دەرهاویشتە و دروستکراوی جەنگە گەورەکان بوو، جەنگێك ئێستا ئارەزووی کەمتر لە سەرە، لە کۆتاییدا، لینین و ستالین و ماو سەرکردایەتی ئەو کۆمەڵگانایەن کرد کە بە شێوەیەکی سەرەکی پێکهاتبوون لە جووتیاری نەخوێندەوار. ئەم جۆرە کۆمەڵگایانە بە تەواوی بیهێزتر و دەبەنگتر لەوانەی سەدەی بیست و یەك، سەرەڕای شاری گەورە گەورەو ڕێژەی بەرزی خوێندەواری و کەناڵی ڕاگەیاندن و خێرا پێشکەوتنی چینی ناوەڕاست.

کورتهاوردەی سەرچاوە گەورەکانی ئاژاوەی سەدەی بیستەم مانای ئەوە نییە کە جیهانی سەدەی بیست و یەك وەك خۆی و نەگۆڕ دەبێت. شتێکی ئاساییە کە ڕێژەی گۆڕانی سیاسی لە کۆتاییدا سست دەبێت. جیهانێکی سیاسی جێگیر، هەڵخەڵەتێنەرە، هەرچەندە جیهان نزیك نەبۆتەوە لەم جۆرە بارودۆخەی دەستپێکی سەدەی نوێ. هەتا گەر پێویستی بنەڕەتی بۆ خواردن و پەناگەی هەر کەسێکی سەر ئەم زەمینە قەناعەت بەو خەڵکە بهێنێت، ئەوا ویستەکانی مرۆڤ

هەر وەك خۆی دەمێنێتەوە. لەوەتەی پێشخستنی بەردەوامی زانست و تەکنەلۆژیا مسۆگەری دابینکردنی شت و پێویستەکانی کردووە، ئەوەی ئادەم سمیس ناوی لێنا گەڕان بەدوای سامان هەر بەردەوام دەبێت. کینس بەرەو ئاسۆی ئەو ڕۆژەی ڕوانی کاتێ، بە داواکارییە ماددییە قایلکەرەکان، مرۆڤ دەتوانێت تەرکیزکاتە سەر لایەنی جەمالی و ڕۆحی. بۆ هەموو زەمین بە گشتی، ئەو ڕۆژە هەرگیز نایەتە دی.

بازاڕی ئازاد بەردەوام دەبێت لە دروستکردن و تێکشکاندن لەو شوێنەی کە کار بکات، هەندێ خەڵك قازانج دەکات و هەندێکیش زەرەرە دەکەن. بەرژەوەندییە جیاوازییەکانی هەردوو گروپ ململانێی سیاسی دروست دەکات هەتا گەر ئەو ململانێ گەورەی سیستەمەکان کە سەدەی نۆزدەو بیستەمی خستەڕوو نەیەتە ئاراوە. بەم پێیە، سیاسەت مێژوو، هەرگیز کۆتایی نایەن، بەڵام جیاوازییەك هەیە لە نێوان گۆڕانی بەردەوام لە نێو تاکەکانی وڵاتدا، کە ئەمەش شتێکی چاوەڕوانکراوە، هەروەها گۆڕانی سەرەکی لە پەیوەندیەکانیان لەگەڵ یەکتر و سیستەمی نێودەوڵەتی کە هەموویان بۆی دەگەڕێنەوە. ئەمە جیاوازی نێوان ئەو گۆڕانەیە کە سەرەنجامی پڕۆژەی لیبراڵییە کە لە لوتکەی ئەگێندەی جیهاندایە لە سەرەنجامی جەنگی ساردا و هەروەها ئەو گۆڕانەشی کە ئەو ئەگێندەیە دەگۆڕێت. لە سەردەمی مۆدێرندا هەندێ گۆڕان لەزۆربووندان و ئاسایین، ئەوانی تر کتوپڕو گەورەن پێشوازیا لێ ناکرێت.

لەکاتێکا جیهان پڕ لە جەنگ و شۆڕشەکانی سەدەی بیستەم بە تەواوی خاسیەتەکانی سەدەی بیست و یەك نەبوون، سەرچاوەی تری گۆڕان بە جۆرێکی تر هاتە ئاراوە. ململانێی سەربازی و سیاسی بەرزدەبێتەوە لە بۆشایی نێوان دەوڵەمەند و هەژاری جیهان، گومانەکانی لە دەوری سیاسەتی دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانن، دوودڵی ڕووسیا و چین بەرەو سێینەی لیبراڵی ویلسن کە زاڵ بوو بەسەر سەردەمی دوای جەنگی سارد، هەورەها بەرەو بڵاوبوونەوەی چەکی ناوکی.

## ترس و هەڕەشە سیاسیەکان

لە نەوەدەکان بۆشایی لەمەڕ کەل و پەلی باش لەنێوان هەژارو دەوڵەمەندی سیستەمی نێودەوڵەتی زۆر بەرفراوان بوو. نامورتاحی ئەخلاقی گەشەی سەند لە ناوچە دەوڵەمەندەکانی وڵاتانی ناوەوەی ڕۆژئاوا، ڕێکخراوە تایبەتییەکان و هەتا نووسینگەی حکوومەت خۆیان تەرخان کرد، بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە، بەڵام سەرنەکەوتن، هەروەرها ڕای ڕەشبینی سەبارەت بە داهاتوو ورووژاند



گوایی بۆشاییەکە دەبێتە هۆی دەستپێکردنی ململانێ لە نێوان بە سامان و داماوەکان (دەوڵەمەند و هەژار).هەروەها ڕەنگە تەشەنە بکات بۆ گەشەی تۆڕی دژە تیرۆریستی ڕۆژئاوا لەگەڵ ئەسڵەکانی ئەو تۆڕانە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. ئەمە ئێستاش کێشەیەکی جیهانی تری سەدەی بیست و یەکە کە حکوومەتەکانی وڵاتانی ناوەوەی جیهان خۆشیان بەوەنەهات کۆششێکی ئەوتۆ بخەنە گەڕ بۆ قسەکردن و ڕاگەیاندن.

وڵاتە دەوڵەمەندەکان زەربەیان وەشاند لە هەژارەکان لە ڕووی ئابوورییەوە لەکاتی جەنگی ساردو ئەو واقیعەش لە لایەن هیچ کامیانەوە بە بێ سەرنج و تێبینی خۆی تێنەپەڕی. حکوومەتە دەوڵەمەندەکان و دەوڵەتە هەژارەکانی جیهان ئیدانەی هەژاریان کرد لە گروپی دووەم، بۆ ئەم مەبەستەش وڵاتەکانی ناوەوەی جیهان هاوکاری داراییان دابینکرد، بەڵام لە سەرەنجامی جەنگی ساردا گۆڕانەکان لە هەردوولادا باوەڕی ئابووری و بارودۆخی ئابووری فشاری کەم کردەوە لە سەر ڕۆژئاوا بۆ چارەسەکردنی کێشەی ئابووری وڵاتانی دەرەوەی جیهان.

لە زۆربەی کاتەکانی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا، وڵاتانی دەرەوەی جیهان، دوو مەزهەبی ئابووریان لە ئامێز گرت. یەکێکیان زۆر ئاشکرایە حکوومەت ڕۆڵێکی زۆر گەورە ببینێت لە هەڵسوڕاندنی ئابووریدا. ئەوەکەی تر حکوومەت بیری لە هەژارییەکەی کردەوە، بە لانی کەم ببێت بە بەشێك لە سەرەنجامی سامانای وڵاتانی ناوەوە، ئەمەش بەرپرسیارێتی خستە سەر شانی دەوڵەمەندەکان بۆ سانا کردنی کاری ئەو حکوومەتە هەژارانە.. لە سەرنجامی جەگی ساردا، گەر هەر وڵاتێك لە ڕووی ئابوورییەوە خراپ مامەڵە بکات، ئەوا هەڵەکە بە زۆری دەکەوێتە نێو سنوورەکانی خۆی.

کاپیتالیزم پێویستی بەسەرمایە هەیەو وڵاتانی دەروەی جیهان سەیری وڵا تانی ناوەوەیان کرد بۆ خەزنکردنی سەرمایە، بەڵام نەیانتوانی بە واقیعی بەهیوای ئەوەبن حکوومەت لە دەرەوە یارمەتی وەربگریت و ئەو سەرمایە دابین بکەن. یارمەتی دەرەوە ئەوەیە کە دەوڵەمەند دەیداتە هەژار لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستدا ئەم یارمەتیدانە کارێکی گونجاو بوو، هەروەها ئەنجامەکان دابینکردنی سامانێکی زۆر سەرنجڕاکێش نەبوو. بە پێی هەندێ لێکدانەوە، یارمەتی ڕەسمی کاریگەری بە ئازاری لێکەوتۆتەوە، چونکە حکوومەتی وەرگر بە گەندەڵییەوە ئەو یارمەتییەی بەکارهێناوە. یارمەتی دەرەوە وەك شیرینی وابوو: شیرینی و خووپێوەگرتن، لە ماوەیەکی کورتدا سەرچاوەیەکی وزە بەدەست دێنی، بەڵام بۆ ماوەیەکی درێژ تەندروستیت باش نابێت. هەتا گەر یارمەتی دەرەوە بە ژیریش بەکاربهێنرێت، هەتا گەر وڵاتانی ناوەوەی جیهان زۆرترین و فراوانترین

خێر بکەن، ئەوا تەنها بەشێکی بچووکی خێری سەرچاوەکان خەزن دەکرێن بۆ وەگەڕخستن کە وڵاتانی دەرەوەی پێویستیان پێ بوو لە دەرەوەی سنووری خۆیان، زۆربەی ئەو یارمەتیان دەبایە لە سەرمایەکی فەرمی کۆنترۆلکراوەوە بهاتبا، لێشاوی سنوور بڕین لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا قەبارەی یارمەتی ڕەسمی بچووك کردەوە.

ڕاکێشانی سەرمایەی تایبەتی پێویستی بە دەزگای گونجاو کارا هەیە پەیڕەوی سیاسەتی گونجاو بکات. واتە پێویستی بە 'چاکەتێکی زێڕی' هەیە پێیدا بدرێت تاوەکو بە سەرچاوەی وەرگری وەگەڕخستن بچێت (واتە زۆر بە قازانج بێت)، شتێکی ئاسایی وەك کۆنە لە بەر بکات بەهیوای وەرگرتنی شتی خێرو بێر بێت. چاکسازی لە ماڵەکەی خۆت کلیلی سەرکەوتنی ئابوورییە لە هەر وڵاتێك نەوەك چاوەڕێی بەزەیی لە وڵاتانی دەرەوە بکات خێرێکی پێ بکەن.

گەلانی وڵاتانی دەرەوەی جیهان پێوستیان بە ناوەند هەبوو بۆ بازاڕەکانی ناوەوە تاوەکو پارە قازانج بکەن لە ڕێگەی فرۆشتنی بەرهەمەکانیان (بە شێوەیەکی سەرەکی بەرهەمی کشتوکاڵی). بۆ ئەم بەرهەمانە وڵاتانی ناوەوە، بە پێچەوانەی بۆچوونی لیبراڵی بنەڕەتی ئابووریی بازاڕی ئازاد، سنوورەکانی خۆیان بەردەوام نەکردەوە. ئەمە شێوازێکی جەنگی ساردی بەدی هێنا، کە لەو کاتەدا حکوومەتەکانی ناوەوە هاوشانانی خۆیان ناچارکرد لە دەرەوە بۆ چەسپاندنی دەزگاکانی ئابووری لیبراڵی خۆیان. لە سەردەمی دوای جەنگی ساردا، حوکمەتی دەرەوە نارەزایی دەربڕی لە سەر ئەوەی کە وڵاتانی ناوەوە فەشەل لە پراکتیزکردنی بنەماکانی ئابووری لیبراڵ بە خراپی بکات لە کاتێکدا زۆرجار قسەی لە سەردەکەن.

سیاسەتە ئابوورییەکان هەرگیز بە تەنهایی ئاماژەیان پێنەکرا لە لایەن تیۆرە ئابوورییەکان. لەکاتی هاوکاری ئابووری جەنگی سارد لە وڵاتانی ناوەوە بۆ وڵاتانی دەەروەی جیهان، وەك تەداخولی سەربازی، پاڵپێوەنرا بەهۆی بەزەیی و قەناعەتی ڕووناکبیرانە بە قەدەر ترس و تۆقینەوە. هێزەکانی ناوەوەی جیهان لەوە ترسان کە، تاوەکو هاوکاری ئابووری پێشکەش نەکەن، حکوومەتی دەرەوەی جیهان هەر پەیوەندی بکەن بە کامپی ئایدیۆلۆژی بەرامبەر لایەنی بەرهەڵستکار. بە کۆتایی جەنگی سارد کە ترس لەگەڵ زۆربەی ئەو پاڵنەرەی هەبوو بۆ بەخشینی یارمەتی لە دەرەوە نەما (هەروەها یارمەتی هەناردن بۆ تەداخولاتی چەکداریش نەما). بێ هیچ چارەیەك لای هەژار بەرگری کرد و توانای ئەوەشی نەبوو هەڕەشە لە دەوڵەمەندەکان بکەن.

بێگومان، چەکێکی ناوکی یان دووان لە ژێر دەستی حکوومەتەکان لە دەرەوە بۆ تەرکیزکردنە سەر سەرنجی وڵاتانی دەوەرە باشە بۆ سەر پێداویستییە ئابوورییەکانیان. لەکاتێکدا زەحمەتە بۆ



بیرکردنەوە لە دیکتاتۆرە دڕندەکانی کۆمۆنیستی کۆریای باکوور وەك کیم سونگی دووەم و کوڕەکەی و جێگەروەکەی کیم جۆنگ ئیل وەك چیرۆکە بەناوبانگەکەی فۆلکلۆری ئینگلیز لە بارەی ڕۆبن هوود، کە دزی لە دەوڵەمەندان دەکرد و دەیدا بە هەژاران، هەڕەشەیەکیان بە کارهێنا بەوەی داوای چەکی ناوکی دەکەن تاوەکو سەرچاوەی هەڕەشە لە ویلایەتە یەکگتووەکان و ژاپۆن و کۆریای باشوور وەربگرێت، هەرچەندە ئەمە بە پێچەوانەوە بوو، هاوکاری گەیشتە ئەو خەڵکە هەژارانەی کە ئەوان حوکمیان دەکردن، بەڵام وڵاتە موحتاجەکانی تر پارەی ئەوەیان نەبوو بە دوای ڕێچکەی ئەواندا بکەون، ئێران و عێراق دەیانتوانی بگەن بە چەکی ناوکی، چونکە نەوتێکی زۆر لە سنووری ئەواندایە و بە پێی پێوانەی وڵاتانی دەرەوەی جیهان پێی دەوڵەمەند بوونە. تموحیان بۆ چەکی ناوکی پەیوەندییەکی کەمی هەبوو بە وەرگرتنی پارە لە وڵاتانی ناوەوەی جیهان، کاتێکیش پارەیان وەردەگرت ئەوە هی نەوت بوو کە دەیانفرۆشتە ئەو وڵاتانە

هەژارانی جیهان یەك شتیان هەبوو لەگەڵ کاریگەرێکی بەهێز لە سەر دەوڵەمەندان: کە ئەویش (خۆیان) بوو. هەڕەشەی پاڵەپەستۆی شەپۆلی نارێکی کۆچکردن لە وڵاتانی دەرەوەی جیهان، لە تیۆردا، ڕێگایەك بوو بۆ ناچارکردنی وڵاتە دەوڵەمەندەکان بۆ بەشداریکردن لە باشکردنی گوزەرانی هەژاران. کۆچکردن لە وڵاتانی دەرەوەی جیهان بۆ ناوەوە بۆ ماوەی چەند دەیەك واقیعێکی ژیانی نێودەوڵەتی بوو. هۆی ئەو کۆچانەش بۆ نێو وڵاتە زەنگینەکان هەمیشە هەر هەبووە لەبەر ئەوەی پارەی زۆری لێیەو باری ئابووری باشە. کۆچکردن کرێکاری گەنجی موحتاجی هێنا بۆ وڵاتان کە تیایدا تەمەنی هێزی کار هەڕەشەی لە پێکهاتەی هەنووکەیی سوودەکانی خۆشی گوزەران دەکرد بە هۆی زۆربوونی ڕێژەی خانەنشین بۆ چالاکی کرێکاران. سەبارەت بە ڕابردوو، کۆچکردن بابەتێکی گفتوگۆ هەڵگر بوو. لە ماوەی یەکەمی جیهانگیری، دەیەکان بوونە هۆی جەنگی جیهانی یەکەم، نارەزاییەکان بۆ کۆچکردن بە شێوەیەکی بەرفراوان لە سیفەتدا ئابووری بوون: ئامادەبوونیان بە مووچەی نزم دادەنرا. لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا، بە پێچەوانەوە، کۆچکردن شتێکی جەماوەری نەبوو، چونکە کۆچبەران چاوەڕێی ئەوەیان لێ نەدەکرا یان خۆشیان بەوە بێت زمانی ناوخۆ فێر بن (هیسپانیك لە ویلایەتە یەکگرتووەکان) یان نەریتی ناوخۆ بەکاربهەن (موسڵمانەکان لە ئەوروپای ڕۆژئاوا)، لە سەدەی بیست و یەکدا، وڵاتانی ناوەوە بێگومان لێشاوێکی زۆر لە کۆچیان وەردەگرت، بەڵام ئەو بۆچوونەی کە هەڕەشەیان لێ دەکرێت بە هۆی لێشاوێکی زۆری کۆچ لە وڵاتە هەژارەکان بە دوورخراوە.

له جیهانی دوای جەنگی ساردا، وڵات لەگەڵ فراوانترین توانا بۆ دزەکردنی لێکترازانی جیهانی ویلایەتە یەکگرتووەکان بوو. ویلایەتە یەکگرتووەکان هێزی زیاتری هەبوو و بەرپرسیارێتی زۆرتری گرتبووە ئەستۆ بۆ پاڵپشتکردنی یاساکان و دەزگاکان لە هەر وڵاتێکی تر. هێزە سەربازییەکانی ئەمریکا هاوکاری ئاسایشی گشتیان کرد لە ئەوروپا هەروەها سەقامگیری سەربازی لە ئاسیای ڕۆژهەڵات و وەك مسۆگەرکەرێکی ناوەندی وڵاتانی ناوەوە کاری کرد بۆ نەوتی کەنداوی فارس. ویلایەتە یەکگرتووەکان وەك سەرۆکی هێزی تایبەتی پۆلیس کاری کرد کە وەك پاسەوانێك وەستا دژی بڵاوبوونەوەی چەکی ناوکی بەرامبەر ئەوانەی بە ئەنقەست دەیانەوێ بە خراپی بەکاری بهێنن. لە ئابووری گلۆباڵدا، بازاڕی ئەمریکا گەورەتین و کراوەترین بازاڕ بوو، لە بواری هەناردن کە تەندروستی ئابووری گەلێکی تر پشتی پێ بەستا بوو. بەرپرسانی ئابوری ئەمریکا بەرامبەری دارایی گلۆباڵی وەك تیپێکی خۆبەخشی ئاگرکوژێنەوەن کاتێ کۆدەبنەوە بۆ کوژاندنەوەی ئاگرێکی گەورە، ئاوا بە گومانەوە دەڕواننە بازاڕی ئازاد.

لەبەرئەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکان تاکە سەرۆکێکی چاودێر نەبوو، بەڵام بیناکارێکی سەرەکی و سوودمەندێکی سەرەکی ڕێکخستنەکانی لیبراڵی جیهان بوون، هەر زەرەرێکی دەکرد بۆ ئەوان بە ئەنقەست نەبوو، بەڵکو بە ڕێکەوت بوو. ڕێکەوتیش لە دوو فۆرمدا زۆر ئازاری ئەمریکای دا.

گەنجینەی زۆری دەسەڵاتی لە هەموو بوارەکانیدا وای لە ویلایەتە یەکگرتووەکان کرد بیر لە بڕیاری تاك لایەنە نەکاتەوە لەبارەی فشارکردنە سەر دەستپێشخەری وەك فراوانکردنی ناتۆ و سەحبکردن لە پەیمانی مووشەکی ئەتلەسی (ABM) لەبەر بەرهەڵستکار لە وڵاتانی ترەوە. کاتێ سەرۆك جۆرج دەبلیو بۆش ناوی لە کۆریای باکوور و عێراق و ئێران نا " تەوری شەیتان" لە مانگی یەکی ٢٠٠٢ و ئاماژەی بە کردەی سەربازی ئەمریکی کرد دژی ئەو وڵاتانە بۆ هۆشیارکردنەوەیان بۆ ئەوەی چەکی ناوکی دەستەبەرنەکەن، بەرپرسانی وڵاتانی تر نائومێدیان دەربڕی لە مەڕ ئەو هەڕەشەیەی ئەمریکا کە شەڕ بکات بێ ئەوەی ڕاوێژکاری لەگەڵ حکوومەتەکانی تر بکات. توندترین ڕەخنە لە کۆنترین و نزیکترین هاوپەیمانەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە هات لە ئەوروپای ڕۆژئاوا. گەر زۆر دوور فشار بکەیت، ئەوا پێوەرە سەربەخۆکان هێزی ئەوەیان هەیە ناو لە بەرهەڵستکارییەکی دژ بێنن و جۆرە ململانێیەکی سیاسی بەرهەم بێنن و ئاشنای ململانێی سەربازی لە سەردەمە زووەکانی مێژوودا بن.

هەڕەشەیەك، بە قەد پەرۆشی جدی لە پەیڕەوی سیاسەتە ناشەعبیەکان لە تەواوی دیکەی جیهان، پاڵپشتێکی پێویستی نەبوو لە لایەن خەڵکی گشتی ئەمریکا بۆ سیاسەتەکانی لەکاتێکدا



وڵاتانی تر ڕازیبوون بەو سیاسەتانە. ئەمە ئەو ترسە بوو کە خەڵکی گشتی هەڵدەستن لە پاڵپشتکردنی ڕۆلی وڵات ئەمریکا) لە دوای جەنگی سارد وەك سەرکردەیەکی جیهان. لەکاتێکدا کولفەی سەرکردایەتی نێودەوڵەتی ئەمریکا کەم بۆوە لەوەتەی دوای ڕۆژانی جەنگی سارد، ئەو هۆیانە پاڵی بە ویلایەتە یەکگرتووەکان نا بۆ گێڕانی ئەم ڕۆڵە، لە هەمان کاتیشدا بە ناچاری ئەو ڕۆڵەی نەبینی. هێرشەکانی یانزەی سێپتێمبەر، هەندێ پەلەکردنی لە کارەکانی جەنگی ساردی ئارام کردەوە لەبارەی تێوەگلاّن بە تەواوی دیکەی جیهان. بنبڕکردنی تیرۆریستان لە سەرانسەری جیهان بوو بە مەسەلەیەکی بەرگری لەخۆکردن، هەروەك کۆمۆنیزمی دژ وابوو، بەڵام ئایا ئەمریکا چۆن تا چەند دەتوانێت کۆتایی بە هەڕەشەی تیرۆریستان بێنێت؟، هەروەها تا چ ڕادەیەك ئەو هەڕەشە یارمەتی پاڵپشتکردنی ڕاپرسەیەکی سیاسی دەدات لە نێو ویلایەتە یەکگرتووەکان لە بەرژەوەندی سەرکردایەتی نێودەوڵەتی؟، مێژووی سەدەی بیست و یەك وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانە دەداتەوە. سەرکردایەتی نێودەوڵەتی بێگومان جۆرە باجێکی سەپاند بەسەر خەڵکی ویلایەتە یەکگرتووەکان و بۆچوونی ئاسایی بەرەو باجدان دەربڕا لە تێکەڵەیەکی تر لە لایەن یاسادانەرێکی ئەمریکی بەناوی ڕەسڵ لۆنگ، کە زۆر بایەخ بە بواری باج دەدات لە کاتی پیشەکەی وەك سیناتۆرێکی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ١٩٤٨ بۆ ١٩٨٧:

**باج نادەم بە تۆ،**
**باجم پێ مەدە،**
**باج بەو پیاوەی پشت دارەکە بدە**

کاتی هێرشە تیرۆریستییەکانی سەر نیۆیرك و واشنتۆن مەهانەیەکی بەهێز و نوێی بەخشی بە گەلی ئەمریکا بۆ سەرقاڵکردنی خۆیان بە توندی لەگەڵ تەواوی دیکەی جیهان، لەگەڵ ئەوەشدا شتێکی هەڵخەڵەتێنەر بوو و ماندوو دەبن، چونکە وەك پیاوەکە وان لە پشت دارەکە، بە تایبەتی گەر هەڕەشەی تیرۆریزم نەما.

ڕەنگە بگەنە ئەو ئەنجامەی کە ئەوروپییەکان و ژاپۆنییەکان هیچی تر داوا لە سەربازانی ئەمریکی نەکەن لە نێو دراوسێکانیان بسوڕێنەوە، کە بە ئاشکرا تەواو سەلامەت و پارێزراون، لە هەر حاڵەتێکدا، گەر مەحەلییەکان توانای لە ئەستۆ گرتنی بەرپرسیارێتیان هەبێت ئەوا ڕەنگە ئەمریکییەکان بڕیاری ئەوە بدەن کە کولفەی دڵنیاکردنی لێشاوی نەوت بۆ وڵاتانی ناوەوە و نەهێشتنی زۆبوونی چەکی ناوکی دەبێ لەدایك بێت لە لایەن ئەوانەی ڕاستەوخۆ کاریگەرتر دەبن بە هۆی ژێرکەوتنی لە هەر حاڵەتێکدا بە بەراورد لەگەڵ ژێرکەوتنی ئەمریکا. ڕەنگە ئەمریکییکان

ئایدیای داخستنی سنوورەکانی خۆیان سەرنجڕاکێش بکەن بۆ ئەو بەرهەمانەی لە هەموو شوێنێك دروستکراون ئەرکی پاراستنیان نەکەوێتە سەر ئەمریکییەکان، یان بەدەرنانی هەر بەرپرسیارێتییەك بۆ هەڵکردن لەگەڵ ئاژاوەی ئابووری لە وڵاتانی تر لە کاتێکدا ببێتە هۆی سیاسەتێکی دەبەنگ، یان دەزگایەکی هەڵە، یان هاندانی بازاڕ، یان هەرسێکیان.

زۆرهەڵگرتنی یان ژێر نمایشکردنی سایسەتی دەرەوەی ئەمریکا دەتوانێت سیستەمی دوای جەنگی سارد بە تایبەتی بخاتە مەترسییەوە تا ئەو ڕادەیەی کە دژی ڕوسیا و چین بوەستێتەوە یان بەرەو پێشیان بەرێت. بە پێی قەبارە، شوێن، هێزی سەربازی، هەروەها ئەزموونی مێژوویی ئەم دوو وڵاتە لە سەدەی بیست و یەکدا، هێزی ئەوەیان هەیە دەست بە شەڕی گەورە بکەن. لە نەوەدەکان هەردووکیان وازیان هێنا لە باوەڕی مارکسیزم و لینینیزمی ئۆرتۆکسی، بە نەخشەی جەنگیشەوە وەك کرۆکی پەیوەندییە سیاسییەکان لە لە نێو وڵاتاندا، بەڵام، ئەوە نەبووە بۆچوونێکی بێ جەنگی وەك دیموکراسییە لیبراڵییەکانی وڵاتانی ناوەوەی ڕۆژئاوا، هەروەها لە پەیوەندییەکانی هەردووکیان لەگەڵ دراوسێکانیاندا بنەماکانی ململانێی چەکداری بزواند.

لە حاڵەتی چیندا، ترسناکترین مەسەلە، بە ڕاستی ترسناکترین مەسەلە لە سەر ڕووی زەوی لە سەرەنجامی جەنگی ساردا، ڕەوشی تایوان بوو. ڕێگەچارەیەکی ململانێی سیاسی، کە شەڕێك لە سەری دەکرێت، دەوەستێتە سەر ئەو گۆڕانکاریانەی لە ژێر دەستدایە لە سەر خاکی چینییەکان و بەدواهاتنی ئەو ڕێگەیەی کە بووە هۆی مێژووی تیۆری لیبراڵ، لەم ڕێگەیەوە ڕژێمی بێجینگ دەستی لە بانگەشەی خۆی شت لە سەر تایوان، یانیش تایوان خۆی هیچی تر بەرگەی ئەوە ناگرێت نزیکی چین بێت، یاخود هەردووکیان تێکەڵ بن.

کاتێك پرسی تایوان لە جەنگی ساردەوە هات، بنەماکان لە سەر ناقایلی ڕووسیا لەگەڵ هەوڵی نالیبراڵ بۆ پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان ڕەگی داکوتابوو لە ڕووداوەکانی نەوەدەکان. ترسیش ئەو دەستپێشخەریەی ڕووسیا بوو دژی ڕۆژئاوا، وەك فراوانبوونی ناتۆ، جەنگ دژی یۆگسلافیا، هەروەها بیرۆکەی پەیمانی ABM حکوومەتی ڕووسیا بەرەو قۆرخکردنی بۆچوونێکی هەمیشەیی دەبات، کە ڕووسیا لەگەڵ ئەو بۆچوونە ژیانی دوای کۆمۆنیستی دەست پێکردبوو، لە بەرژەوەندی هاوکاریکردنی لەگەڵ ڕۆژئاوا لە سەر مەسەلە نێودەوڵەتییەکان و هەروەها خەڵکی گشتی ڕووسیا قایل دەکات لە بەردەوامی دوای جەنگی ساردا، هەروەك لە زۆربەی مێژووی تۆمارکراودا، تەنها هێزی سەربازی دڵنیای مامەڵەیەکی بەڕێز دەکاتەوە لە لایەن وڵاتانی ترەوە.





یەك هۆی سەرەکی لە پاڵ بەهێزبوونی دژایەتی ڕووسیا و چین هەبوو بەرامبەر سیستەمی لیبراڵی سەدەی بیست و بگرە هەڕەشەیان لەو سیستەمە دەکرد ئەوەبوو هەردووکیان چەکی ناوکیان هەبوو. هەڕەشەیەکی تر ڕەگی داکوتا بوو لەو بۆچوونەی کە وڵاتانی خاوەن سەرەوەری پێشتر دژی سیستەمی لیبراڵ بوون و داوای ئەم جۆرەی چەکانەیان دەکرد. مەسەلەی داماڵینی چەکی ناوکی هەبوونی ئەو چەکەیە نەك بەکارهاوردەی، بۆیە سیستەمی زۆرنەبوونی چەکی ناوکی دانرا بۆ نەهێشتنی ئەو چەکانە. بێگومان یەکێکیان مەرجێکی پێویستە بۆ ئەوەی تر، بەڵام مەسەلەیەکی تریش هەیە ئەوەیە هەبوونی بۆمبێك سوودێکی ستراتیژی ڕوونتری هەیە بە بەراورد لەگەڵ بەکارهاوردەی بۆمبەکە. کاتێك وڵاتێك چەکی ناوکی دەستەبەر دەکات دەسەڵاتی ئەو وڵاتە بەهێز دەبێت، کاتێکیش یەکێکی تر بەکاری هێنا بێت ئەوا پێی ناوەتە نێو ژینگەیەکی ستراتیژی نوێ و واقیعێکی ترسناك.

سەدەی بیستەم هەوڵ و میتۆدێکی واقیعی وەبەر هێنا بۆ ئەوەی حکوومەتەکان چەکی ناوکیان هەر هەبێت، بەڵام بەکاری نەهێنن: ئەویش میتۆدی قەدەغەکردنی بەکارهاوردە بوو. ئێمە هەموومان دەبێ سوپاسی بێ پایانی ئەو میتۆدی قەدەغەکردنە بکەین. هیچ بۆمبێکی ناوکی بەکارنەهێنرا لە پاش دەیەکانی کاتی هێرشی ئەتۆمی ئەمریکا بۆ سەر هیرۆشیما و ناگاساکی، لەگەڵ ئەوەش بە دەیان هەزار تەقەمەنی ناوکی دروستکراو و چەسپێنران لە سەرانسەری جیهان. لە دوا چارەگی سەدەی بیستەمدا سیستەمی زۆرنەبوونی چەکی ناوکی سەرسام کاریگەری خۆی هەبوو، هەرچەندە هەندێك هەر دزەی کرد. سیاسەتی قەدەغەکردن لە ڕاستیدا تۆمارێکی تەواوی هەبوو، بەڵام هیچ شتێك تەواو مسۆگەر نییە.

سەرەنجامەکانی هەرەسی قەدەغەکردن دەوەستێتە سەر ئەو بارودۆخانەی گەر دووەم جەنگی ناوکی مێژوویی بەرپا بێت. گەر ڕووسیا، یان چین یاخود ویلایەتە یەکگرتووەکان تێوە بگلێن، ململانێیەکە خاسیەتی جەنگێکی زۆر گەورە بەخۆوە دەگرێ، ئەمەش کاریگەرییەکی فراوانی دەبێت لە سەر ئاسایشی نێودەوڵەتی. لە لایەکی ترەوە گەر وڵاتانی دەرەوەی جیهان تێوەگلێن، سەرەنجامەکانی ئەو فەشەلە ڕەنگە بگەڕێتەوە بۆ ئەو شوێنەی یان ئەو شوێنانەی کە هێرشێکی ناوکیان کردووە یان لەبەر هێرشێکی لەم جۆرە زیرەیان کردووە.

لە ١٩٩٩، هیندستان و پاکستان، هەردوکیانساڵێك پێشتر تێستی تەقینەوەی ناوکیان ئەنجامداوە، بوون بە یەکەم هێزی ناوکی و خەریك بوو لەگەڵ یەکتر بجەنگن ڕاستەوخۆ دوای شەڕەتەقەی سنووری سینۆ سۆڤیەتی ١٩٦٧، کاتێ سەربازە هیندییەکان لەگەڵ ئەو هێزانە جەنگان

که له لایەن پاکستان مەشقپێکران و هاوکاری و ئامادەکران له سەر مشتومڕی پارێزگای کشمیر. گەر ململانێ سەر کشمیر ببایە هۆی هێرشێکی ناوکی ئاسایی وڵاتانی ناوەوەی جیهان کاردانەوەیان دەبوو هەروەك کاردانەوەیان بۆ شێواندنی وڵاتانی دەرەوەی جیهان له دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا: واتە، بە بایەخێکی تایبەتییەوە، ترس له وێرانکردن و بەزەیی بۆ قوربانیان له پێناو بەرژەوەندییەکی نافەرمی بوو. لەو حاڵەتەدا، کەمی ئارەزووی هێزەکانی ناوەوەی جیهان له دوای جەنگی ساردەوە بۆ خۆهەڵتێقورتاندنیان له کاروباری سایسی وڵاتانی دەرەوەی جیهان بەهێز دەکرێت. هێزەکانی ناوەوە ڕەنگە بە باشی مامەڵە لەگەڵ ناوچەی پڕ چەکی ناوکی بکەن، بەڵام بە هەمان چەشن مامەڵە لەگەڵ ئەو ناوچانە نەکەن کە چوونەتە نیویان.

زەربەیەکی ناوکی بە توڕەیی ڕەنگە شەرعییەتی تەداخولی سەربازی بەهێز بکات لە کاروبارەکانی ناوخۆی وڵاتانی خاوەن سەروەری. نەهێشتنی دەستەبەرکردن، یان ڕێگە گرتن لە بەکارهاوردەی چەکی بە کۆمەڵ کوژ پەیوەستە بە ڕزگاری گەلێکی هەراسان کراو وەك هۆیەکی شەرعی بۆ تەداخولی سەربازی. ڕێکخستنە نوێیە نیێودەوڵەتییەکان بۆ پەیڕەوکردنی تەداخولی نوێی ڕەوا ڕەنگە لەگەڵ ئەو جۆرە گۆڕانە بێتەوە بە پێوەری نێودەوڵەتیدا. ئەم جۆرە ڕێکخستنانە وای لە نەتەوە یەککگرتووەکان کرد هەنگاو بگرێتە بەر لە پاش جەنگی کەنداوی ساڵی ١٩٩١ بۆ دڵنیا بوونی ئەوەی کە ڕژێمی سەدام حوسێن چەکی بەکۆمەڵ کوژی دەستەبەر نەکردووە. یو ئێن تیمی پشکنەرانی دامەزراند بۆ چاودێریکردنی چالاکییەکانی عێراق، بەڵام نەقوسانی هەبوو لە هێزێکی سەربازی بەرگریکەر بۆ دووپاتکردنەوەی ئەوەی کە پشکنەران بتوانن ئەرکی خۆیان بکەن بە بێ ئەوەی کەس ڕێگەیان پێ بگرێت. جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە کەوتە سەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کە یەکەم جار ئەم ئەرکەی بە ناڕێکەی جێبەجێکرد، دواتریش هەر بە بێ نیزام هەڵسا بە جێبەجێکردنی ئەو ئەرکە.

هەروەها سەبارەت بە ترس و هەڕەشە سیاسییەکانیش، دوو هەڕەشەی ئابووری دەنگی دایەوە لە سەرانەسەری جیهانی سەدەی بیست و یەك. یەکێکیان ترسی هەرەسی ئابووری، لەو جۆرەی کە ڕوویدا لە سییەکان. ئەوەکەی تر پەیوەست بوو سەرکەوتنی ئابووری بە شێوەیەکی پێشبینی نەکراو. ئەمەی دووەم ترسی ئەوەی هەبوو کە گەشەی ئابووری توانای سەر زەوی ماندوو و نەزۆك دەکات، چونکە هەر وڵاتە بەرهەمی ناوخۆی خۆی دەبێت چی تر شت لە هیچ وڵاتێکی تر ناکرێت!



## مەترسی شاراوەی ئابووری

شەڕ هەرچەند بە شێوەیەکی چاوەڕێ نەکراو بووە هۆی گۆڕانی کتوپڕی نێودەوڵەتی لە سەردەمی مۆدێرندا، بازاڕەکان کاریگەری بەراوردیان هەبوو کاتێ فەشەلیان هێنا بە پێوەرێکی گەورە. دوو خاسیەتی مەترسی شاراوەی ئابووری تووشی تاعونیان دەکات. یەکێکیان گۆڕانی بەرزبوونەوەی بەهای شتێکە کە دابەزینێکی کتوپڕی بە دوادا دێت کاتێ گەشبینی دەبێتە ترس، پاڵەپەستۆیەکی بە ترس بۆ فرۆشتنیان دەست پێ دەکات. ئەوروپا ئەزموونێکی لەم جۆرەی بینیوە بە چاکی پێش چاخی مۆدێرن. شۆڕشی پیشەسازی زانستی نەخۆش ناسی بازاڕی دووەمی لە گەڵ خۆی هێنا ئەویش دابەزینی نرخ بوو. هەرکە گەشەی ئابووری بووە شتێکی ئاسایی بەرابەرەکەی دابەزینی ئابووری بوو. لە سەدە و نیوی یەکەمی چاخی پیشەسازی ئابوورییەکانی وڵاتانی ناوەوەی جیهان موعەرەز بوون بۆ دابەزینی نرخ. خراپترینیان، لە سییەکان بوو، بە هۆی کۆتاییەکی کتوپڕی ئابووری، بۆرسەی ئەمریکی ١٩٢٩، کە تەواوی دیکەی ئابووری ڕۆژئاوای تووش کرد لە ڕێگای ئەو دەزگایانەی کە دارایی و بەرهەم پێکەو گرێ دەدات، ئەویش سیستەمی بانقە.

لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا وڵاتانی ناوەوەی جیهان ڕێگایان دۆزیەوە بۆ ساناکردنی کاریگەرییەکانی هەردوو کێشەی یەك بەدوا یەکی مێژوویی. نیزامەکانی حکوومەت زۆری باری ئابووری کتوپڕی کەم کردەوە. کاتێ بارە ئابوورییەکان پێك دەهاتن و کۆتاییان دەهات، حکوومەت ڕۆڵێکی گێڕا بۆ "قەرزدەری دوا بار" ئاسانکاری دەکات بۆ پاشەکشەی لە ڕەگ و ڕیشەوە کە دەیتوانی دەزگا داراییەکان تێك بدات. هەروەها ئایدیاکانی کینس، وەرگێڕدرایە نێو سیاسەتی گشتی، ئەوەی خستەڕوو کە حکوومەتەکان دەتوانن کار بکەن لە دابەزینی ئابووری لە ڕێگای بڕێکی زۆری سەرفکردنی پارەی کڕینی هێز بۆ نێو ئابووری یان ئەوەتا بە هۆی دروستکردنی متمانە یانیش سەرفکردنی پارە.

توێژینەوەی ئابووری و سیاسەتی ئابووری ئەو نەخۆشیانەیان هەڵنەوەشاندەوە کە بازاڕی ئازادی بێهێز کرد بوو لە چاخی مۆدێرندا، بەڵام بێگومان میتۆدیان دابینکرد بۆ کۆنترۆڵکردنیان و سنووردانان بۆ زەرەرەکەیان. هەروەك گەلێ ململانێی توندوتیژی هەبوو، بەڵام هیچ کامیان چەکی ناوکیان بەکار نەهێنا لە ١٩٤٥ تاوەکو کۆتایی سەدەکە، هەروەها لە کاتی ئەو دەیانەی دابەزینی ڕێکی ئابووری لە وڵاتانی ناوەوەی جیهان، بازاڕ سست بوو، بەڵام هیچ کامیان ناگەنە توندی سست مەزنەکەی بازاڕی ساڵانی سییەکان. بەرزی ئابووریی بازاڕی سەدەی بیست و یەك

دەوەستێتە سەر بۆچوونی ڕوونبینی کاتێ بازاڕەکان موعەرەزن بۆ سستبوون بە ڕێکەوت، نیگەرانی گەورەو بەهێز و وێرانکەر دەکرێ لابرێت. هەروەك لەگەڵ چەکی ناوکی بەکارنەهێنراودا، هەرچەند، بەردەوامی تۆماری ئابووری سەرنجڕاکێشی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم مسۆگەر ناکرێت. ئەو نەخۆشیانەی کە بازاڕ ڕەنگە تووشیان بێت، لە سەدەی بیست یەکدا، ئەو سنوورانە ڕاگرێت کە سیاسەتی گشتی سەدەی بیستەم لە سەریانی دانــاوە بەهەمان ڕێگا کە نەخۆشی کوشندە زاڵ دەبێت بەسەر تاك یان تەواوی دانیشتوان، سەرەڕای پێشکەوتنی دەرمانی پزیشکی مۆدێرن و تەندروستی گشتی.

نەخۆشەکە ڕەنگە ڕەتی چارەسەرەکە بکاتەوە. لە ڕووی ئابوورییەوە پێوەری هەستیار هەندێ جار دەگات بە بەرگری سیاسی، بۆیە گەلێ لە وڵاتانی دەرەوە ئازاریان چەشت لە شێواندنی ئابووری. یاخود، تاو کۆکەی ئابووری ڕەنگە زۆر بەهێز بێت بۆ ئەو حکوومەتانەی کە مەناعەیان بەهێزە. یاخود، ڕێگایەکی نوێی نەخۆشی ئابووری بەدیار کەوێت، کە یەکێك لەو دژە پێوەرانە هێشتا بۆی دانەنراوە و دروستنەکراوە. پرۆسەی بەردەوامی دروستکردن و تێکشکاندنی گۆڕان نەك تەنها کۆمپانیاکان و کارگە پیشەسازییەکان، بەڵکو تەواوی ئابوورییەکان بەرەو سستی دەبات، بەو ڕێگایانەی نەك هەمیشە زوو تێیگەشتوون.

لە خراپترین حاڵەتدا، یەك یان زیاتر لەو نەخۆشیانە دەتوانن پەرە بە هەرەسی ئابووری بدەن لە وڵاتانی ناوەوەی جیهان لە سەر پێوەرێك بزر لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا. سەرنجی نیمچە گەردوونی جەنگی سارد بۆ ئابووری لیبراڵ پشت دەبەستێت بە توانای بازاڕی ئازاد بۆ بەرهەم هاوردەی بەرزبوونی ئاستی سامان. هەروەها دابەزینی ئابووری لە سەر پێوەری خەمی گەورە ڕەنگە پرسیار لە بارەی بەهای بازاڕی ئازاد بکات، هەروەك لە ساڵانی سییەکان ئەو پرسیارەی کرد، هەروەها دامەزراوەکانی سیستەمی نێودەوڵەتی بلەرزێنێت. دابەزینێك بۆ ئەو قەبارەیە دەتوانێت تەنها سەر هەڵبدات لە هەرەسی جدی لە گەلێ لە وڵاتانی ناوەوەی جیهان، لە سەرووی هەمووشیانەوە ویلایەتە یەکگرتووەکان. ڕووخانێکی ئابووری لە سەر ئاستی نێودەوڵەتی ڕەنگە بەسەر ئەگێندەی جیهان بکەوێت، پرسیاری ئەوەی چۆن ئەگێندەی ئابووری گلۆبالی لە سەدەی بیست یەکدا کە سیاسەتەکانی ئەو حکوومەتانە پەیڕەو دەکات پێشتر ئەو ئەگێندەیان بەدەستان هێناوە بۆ ئابووری نەتەوەیی لە سەدەی بیستەم.

هیچ ئاژانسێکی یاسایی نێودەوڵەتی وجودی نییە بۆ کۆنترۆلکردنی تێڕامانێکی زۆر، هەرچەند، پێوەری دانپیانراوی نێودەوڵەتی هەیە (گەر بە زۆری نەبن) بۆ قەرزدان و وەگەڕخستن.



هەروەها جیهانیش قەرزدەرێکی نێودەوڵەتی نییە بۆ دوا بار. گەنجینەی پارەی نێودەوڵەتی زۆرجار ئەم ڕۆڵەی پێشنیارکراوە لە قەیرانی دراو، بەڵام لەگەڵ ئاستەمە سەرەکییە داراییەکاندا هەڵناکات لە گەلێ لە وڵاتانی ناوەوەی جیهان. هیچ دەسەڵاتێکی جیهانی نییە هێزی هەبێت بۆ زیادکردنی داوای نێودەوڵەتی لە ڕووی سستبوونی زۆری بازاڕی جیهانی، هەرچەند ویلایەتە یەکگرتووەکانیش وەك مەکینەی ئابووری جیهان کاری خۆی کرد.

بۆ جێبەجێکردنی بە شێوەیەکی کاریگەر و باوەڕپێکراو ئەرکەکانی یاسای جیهانی، قەرزدانی جیهانی لە دوا باردا، هەروەها دابینکردنی داوا لە سەر پێوەرێکی جیهانی داوای شتێکی وا دەکات کە ماوەتەوە لە پاڵ گفتگوگۆی زۆر جدی لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا ئەویش دروستکردنی حکوومەتێکی جیهانیە. سەروەرییەکی جیهانی وەڵامێکی مەنتقی بوو بۆ خراپترین ڕێگەی چاوەڕێ کراوی هەڕەشەیەکی بەهێزی دیکە بۆ سیستەمی جیهانی لیبراڵی سەدەی بیست یەك: ئەویش گەرم بوونی جیهانی، کە زۆربەی کەش و هەوای سەرزەوی دەگۆڕێت.

ئا لێرەدا هەڕەشەکە ڕەگی لە هەرەسی ئابوورییەوە دانەکوتاوە، بەڵکو لە سەرکەوتنی ئابوورییەوە. هەرچەند ئابووری جیهانی ئەوەندە بەرهەم هێنەر بێت، ئەوەندەش ئەم ترسە بە گوشارە مەترسیدارتر دەبێت، ئەوەندە بنەمای مێژووی تیۆری لیبراڵ زیاتر دەبێت، ئەو سەیرانەی کە بازاڕی ئازاد دەتوانێت کار بکات، بۆیە بەرگەی ناگرێت. ئەمە ئەو جۆرە مەترسیەیە کە وەسفکراوە لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەدا کاتێ ناوچەی بەریتانی لە سەر ئابوورییەکان (پاش سامانی نەتەوەکان)، وتاری تۆماس ماتۆس لە سەر دانیشتوان، کە لە وتارەکەیدا هۆشیاری ئەوەی دا کە ژمارەی مرۆڤکان دەبێتە دوو ئەوەندی توانای زەوی کە دەبێ خواردنیان بۆ دابین بکرێت.

پرۆسەی پێشکەوتنی کشتوکاڵ دەستی پێکرد، چونکە بواری دا بە مرۆڤی ئەو سەردەمە کە دەرچن لە ڕێچکەی سەرکەوتوی ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤ لە باندی بچووکی ڕاوکەرەکان و کۆکەرەوەکانەوە بۆ فۆرمکردنی کۆمەڵگایەکی جێگیر کە، لە تەواوی ئەو هەزارەیەدا، پێشکەوتن زۆرتر بوو و لە ڕووی کۆمەڵایەتیشەوە ڕەوشەکان ئاڵۆزتر بوون. کشتوکاڵ گەشەی تیۆری لە نێو دانیشتوانی مرۆڤی سەر ئەم ئەستێرەیە، سەبارەت بەو دەرەنجامانەی کە ماتۆس هۆشدارییەکەی بڵاوکردەوە.

هەرچەندە شۆڕشی پیشەسازی، بە بەرفراوانی کۆنترۆلی مرۆڤ بۆ ماددیەتی جیهان فراوانکرد هەروەها یارمەتی فراوانکردنی گەنجینەی سەر ڕووی زەوی دا، بۆیە بە تواناکردنی جیهان ڕاکردنە

لەو چارەنووسەی کە مالتۆس پێشبینی دەکات. کۆمەڵگا کشتوکاڵییەکان دارستانەکانیان تەختکرد بۆ ئەوەی شوێنی زیاتریان هەبێت بۆ ژیان و بەدوای سووتەمەنیدا بگەڕێن لە ژێر زەویدا. کۆمەڵگا پیشەسازییەکان هەڵکەندی ئەو زەوییە ڕەقەیان خێراتر کرد، کە لە سەدەی بیستەمدا بووە هۆی بزووتنەوەی سیاسی لە وڵاتانی ناوەوەی جیهاندا، بە تایبەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان، بۆ پارێزگاریکردنی ئەو زەویانە. لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا کاریگەرییەکانی بەرهەمی پیشەسازی لە سەر ئەم ئەستێرەیە دوورتر ڕۆیشت. دەستیکرد بە تێکدانی هەردوو توخمە پێویستەکان بۆ ژیانی مرۆڤ کە ئاو و هەوان. ئەمەش وەڵامێکی سیاسی وروژاند، لە فۆرمی بزووتنەوەکان لە وڵاتان ناوەوەی جیهان بۆ پاراستنی ژینگەی ئەم ئەستێرەیە.

پیسبوونی هەوا یان ئاو لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا بە شێوەیەکی گشتی مەحەلی بوون، نەتەوەیی یان بە زۆری کێشەی ناوچەیی بوون و باسکران لە لایەن ئەو سیاسەتانەی پەیڕەودەکران لە لایەن حکوومەتی تاك لایەن، بەڵام یەك کاریگەری بەهێز و ترسناکی بەرهەمی پیشەسازی لە سەر ژینگە هەموو جیهانی تێوەگلاند ئەویش گەرم بوونی جیهان بوو.

بەرهەمی پیشەسازی، بە تایبەتی پاشماوەی سووتانی سووتەمەنی، گازی سەرفکردوو، دایۆکسیدی کاربۆن، کە بەسەر یەکەوە کەڵەکە بوون بۆ چەند دەیەیەك و گەرمی پەیداکرد لە نێو کەشی زەویدا. کاریگەریی هەموو ئەمانە وەك یەکە لە بەرهەمهاوردەی گەرمیدا، بە مەبەستی گەشەکردنی ڕووەکی ناوچە گەرمەکان (هێڵی قرژاڵ ئاسا) لە کەش و هەوای فێنکتردا، بە هۆی نەمامگەکانەوە، لە بەر ناوی گازەکانی نەمامگەکان. کاریگەری نەمامگە و باغات ژیان لە سەر ئەم ئەستێرەیە ئاسایی دەکات. بە بێ ئەمە زەوی زۆر سارد دەبێت بۆ ژیانی مرۆڤ، بەڵام بەرزبوونەوەیەك لە پلەی گەرمی ئاسایی ڕووکەشی زەوی، کە ئەوەی زانستناسەکان بە زۆری قەناعەتیان پێی هەبوو گەشەی قەبارەی گازی نەمامگە دەستکردەکانی بوو، موعەرەز بوون ببێتە لێکترازانی ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی سەر ڕووی زەوی وەك جەنگە گەورەکانی سەردەمی مۆدێرن دووچاری ژیانی سیاسی سەر ئەم ئەستێرەیە بوونەوە.

لێڵترین پێشبینییەکان بە تاعونەکانی ئەم دواییەی دەچوو کە ئیننەوە تۆمارەکانی سەفەر دەرکرد بۆ سەر میسرییە کۆنەکان وەك سزایەك بۆ مامەڵەی خراپیان بەرامبەر ئیسرائیلییەکان. گەرمی جیهان دەتوانێت هەندێ بەشی جیهان گەرمتر و وشکتر بکات لە کاتێکدا ئەوانی تر بەرەو ساردتر و شێدارتر دەچن، شێوازەکانی کیلاّن کشتوکاڵ کردن لەکار دەخات کە گەنجینەی خۆراکی جیهان پشتی پێ دەبەستێت. دەتوانێت لووتکەی جەمسەرە بەفرینەکان بتوێنێتەوە،



بەرزکردنەوەی ئاستی زەریاکانی زەوی و بەسەر ئەو ناوچانەی دەکەونە شوێنە نزمەکان، کە هەندێکیان دانیشتوانێکی چڕیان هەیە. گەرمبوونی جیهان دەتوانێت ڕێچکەی کەش و هەوای زەوی بگۆڕێت، گەر ڕووداوی زۆرترو توندترو وێرانکەتر دروست نەکات.

پیسبوونی ژینگە نموونەیەکە لەوەی کە ئابووریناسان پێی دەڵێن "دەرەکییەکان". فۆرمێکی پڕ لە زەرەرە کە کارەکانی ئاسایی بازاڕ راستی ناکەنەوە. هۆکارێکی دەرەکی لەم جۆرە، شتێکی گشتی خراپە، نەهێشتنی یانیش قەرەبووکردنەوەی کەل پەلێکی گشتییە، بەڵام لەگەڵیدا کێشەی گرینگی (سواربوونی بەلاش) دێتە ئارەوە: چۆن وا لە وڵاتانی خاوەن سەروەری بکەیت ئەرکێك بگرێتە ئەستۆ لەگەڵ گەرمبوونی جیهان لە کاتێکدا دەسەڵاتێکی بەرپرس نییە بۆ ناچارکردنیان بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە. گرتنەخۆی گەرمبوونی جبهان پێویستی بە کەمکردنەوەی گاز و گەرمی و ڕووناکی گازی نەمامگەکانە، کە لە بەرابەردا کەمکردنەوەی بەکارهاوردەی پاشماوەی سووتەمەنی پێویست دەکات. لە بەر پشت بەستنی قورسی هەموو ئابوورییەکی نەتەوەیی لە سەر خەڵوز، نەوت و گازە سروشتییەکان ئەمە بە کولفە دەبێت، بەلانی کەم لە مەدایەکی کورتدا. پرسیاری ئەوەی چۆن ئەم کولفانە گونجاو بکەیت وڵاتانی ناوەوە لە دەرەوە جودا بکاتەوە، لەگەڵ گرووپی هەر وڵاتێکدا دەبێ هۆیەك بدۆزرێتەوە و بۆ ئەوەی زۆربەی ئەو وڵاتانە کار بۆ دۆزینەوەی ڕێگە چارەی گەرمی جیهان بکەن.

لە وڵاتانی ناوەوەی جیهان، پێشەنگەکانی شۆڕشی پیشەسازی، پێشتر تەرکیزیان لە سەر زۆربەی هەرە زۆری نەمامگە گازییەکان کردۆتەوە لە کەش و هەوادا ئەم وڵاتانە بەردەوام بوون بن بە فراوانترین هەناردنە دەرەوەی دەنگ و ڕووناکی و گەرمی و گازیان، لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکان وەك سەرکردە لە ڕووی تێرمی و ڕەهاو داهاتی تاکەکەسدا. لە لایەکی ترەوە، وڵاتانی دەرەوەی جیهان لە بەر هۆی جوگرافی و ئابووری ئازاریان دەچەشت لە کاریگەرە هەرە توندەکانی گەرم بوونی جیهان. ڕێژەیان بۆ زۆرترکردنی پاشماوەی سووتەمەنی بەرزتر بوو لە چاو وڵاتانی ناوەوەی جیهان، چونکە وزەیان کەم کاریگەتر بەکارهێنا، کەمکردنەوەی سووتەمەنی هەرزانتر بوو بۆ ئەوان: بەرهەمی هەر یەکەیەکی وزەی پێشبینی نەکراو نزمتر بوو بۆ ئەوان لەوەی بۆ وڵاتانی ناوەوەی جیهان.

پەیمان لە سەر گەرمبوون ئیمزا کرا لە کیۆتۆ، ژاپۆن لەساڵی ١٩٩٧ پرسیاری ئەوەی چۆن ئەو کولفانە تەرخان دەکەیت هێور بکرێنەوە کرد. وڵاتانی ناوەوە خۆیان پابەند کرد بە ئامانجەکان بۆ کەمکردنەوەی دەردانی ڕووناکی و گەرمی و گازی نەمامگەکان، بەڵام وڵاتانی دەرەوەی جیهان

بەشێك نەبوون لە ڕێکەوتنەکە و سیناتۆری ویلایەتە یەکگرتووەکان ڕوونی کردەوە کە پەیمانەکە پەسەند ناکات، هەرکە دەبوایە بیکات تاوەکو ڕێکەوتنەکە پەیوەست بکات بە ویلایەتە یەکگرتووەکان، تاوەکو هەموو ولاتانی تر هاوبەشی کولفەکە بۆ کێشەکە ڕانەگەیەنن. لە سەر گەرم بوونی جیهان، سەرکردایەتی نێودەوڵەتی لە فۆرمی هەڵگرتنی بەشێکی زۆری کولفەکان شتێك نەبوو ویلایەتە یەکگرتووەکان نیازی هەبێت مومارەسەی بکات.

لە دەیەی یەکەمی دوای جەنگی ساردا، گەرم بوونی جیهان گفتوگۆی بەرچاوی ورووژاند لە نێو پسپۆران و سیاسەتی گونجاوی گشتی بە مەبەستی قەدەغەکردن. بە پێچەوانەی کەم و کوری ڕووسیا و چین لە پابەندبوونی گشتی بە پەیوەندییە نێودەوڵەتییە لیبراڵییەکان، بەڵام وەك تەرخانکرا بوون بۆ چەکی ناوکی یان دابەزینێکی توندی ئابووری جیهانی، گەر ڕووداوێکی کاریگەر دەست پێبکات بە هۆی گۆڕانی کەش و هەوای دەستکرد، وەك گەرم بوونی جیهان و تەقاندنی چەکێکی ناوکی بە تورەیی، ئەوا ڕای جیهان بە گڕ دێت و فشار بۆ ڕێگەچارەیەك بۆ کێشەکە پەیدا دەبێت، پێویستی پێوەرەکان کردەی کاریگەر لەخۆدەگرێت لە سەر ئاستی نێودەوڵەتی.

میتۆدێك دەبێ بدۆزرێتەوە بۆ تەرخانکردن لە نێو دوو سەد ولاتی جیهان بۆ کولەفەکانی کەمکردنەوەی دەردانی گازەکانی نەمامگەکان بۆ سەلامەتکردنی ئاستەکان و دڵنیاکردنەوەی ئەوەی ئەو کولفانە بە ئەرکەوە بدرێن. گەر بەو شێوەیەی کە دەبینرێ، هەتا سیستەمێکی هەژێنەر لە تەقلیدی جەنگێکی سەرەکی زەمینەی خۆش نەکردبێت بۆ دروستکردنی دەستەیەکی سەروەری نێودەوڵەتی کاریگەر، ئەوا جیهان ڕووبەڕووی ئەرکەکە دەبێتەوە، کە ڕەنگە وای لێ بێت زاڵ بێت بەسەر ئەگێندەی نێودەوڵەتی سەدەی بیست یەك، ئەرکی بەڕێوەبردنی جیهان بە بێ بوونی حکوومەتێکی جیهانی.

بۆ ئەم ئەرکە مۆدێلی لیبراڵی ڕێکخراوی سیاسی موستەمسەکاتی باشتری هەیە لەوانی تر. سیستەمی سیاسی لیبراڵ ڕێگەدەدات بە گفتوگۆی کراوە کە کێشەکان دەهێنێتە بەر دیدی خەڵك. هەروەها ڕێگەش دەدەن بە پەیڕەوکردنی سیاسەت کە ئەو حکوومەتانەی ناچار دەکات کار بکەن لە سەر ئەو کێشانە. دەوڵەتە لیبراڵییەکان تۆمارێکی باشتریان هەیە لەوانی تر لە سەر ڕێگە چارە کە ئەم جۆرە کێشانە پێویستێتی ئەویش: هەرەوەزی نێودەوڵەتییە. ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان جیهان کۆڕگەیان بۆ ئەم جۆرە هەرەوەزییە دروستکردووە. بە هەقیقەت، ئەو ئایدیایەی کە هەرەوەزی نێودەوڵەتی لە پاڵ زەواجی کاتیە بۆ خاتری شەڕکردن دانراوە ئایدیایەکی



لیبراڵییە. کەواتە جیهانێکی ولاتانی سەروەری لیبراڵ بە دووەم باشترین ڕێگە چارە دەمژمێر دەکرێت، پاش حکوومەتی جیهانی، بۆ کێشەکانی جەنگی ناوکی، ڕووخانی ئابووری، گۆڕانی کەش و هەوای جیهانی. گەر باشترینی نێو ڕێگە چارە پێشنیارکراوەکان نەبێت، ئەوا باشترین ئەگەرە بۆ ئەم مەسەلەیە. ئایا ئەوە دەسەلمێنێت (زۆربە) زۆر باش بێت و هەڵ بکات لەگەڵ ئەو کێشانە لە سەدەی بیست یەکدا، ئەمە پرسیارێکە تەنها مێژووی ئەو ولاتە دەتوانێت وەلامێك بداتەوە. وەلامەکان بۆ هەردوو پرسیارەکەی دەربارەی جیهانی سەدەی بیست و یەك، پێشتر بەردەست بوون: چۆن سەدەی بیست و یەك جیایە لە سەردەمی مێژوویی کە یەکسەر پێشی کەوتووە؟ هەروەها ئایا سەدەی بیست یەك باشترە یان خراپترە بە بەراورد لەگەڵ سەردەمەکانی پێش خۆی؟

## ئەو ئایدیانەی کە دەستیان بەسەر جیهاندا گرت

لە مانگی سێی ٢٠٠٠ دا، ناتالی فریدمانی بێسدا، ماری لاند تەمەن دوانزە ساڵ، پێی نایە نێو پێشبڕکێیەکی ڕۆژی مێژوویی نەتەوەیی بۆ قوتابیانی ناوەندی. ڕکابەرەکان پرسیاریان لێ کرا لە بارەی خستنەڕووی وەرچەرخانێکی مێژوویی ئیختیارەکەیان لە ڕێگەی ئەو تێکست و وێنانەی لە سەر بۆردێکی گەورە دانرابوون. هی ناتالی تەمەن دوانزە ساڵ، کە بڕیاری باشترینی لە سەر درا، وەسفکردنی هەناردنی سەتەلایتی بەدەوری زەوی بۆ یەکەم جار لە لایەن یەکێتیی سۆڤیەت، بەناوی سپوتنیك لە ساڵی ١٩٥٧. ئەمە بەو ناتالی شیکردەوە، بە خاڵێکی وەرچەرخان لە مێژوودا دانرا، چونکە ڕووداوەکانی بە یەکەوە گرێدا کە لە دواجاردا بوە هۆی دروستبوونی ئینتەرنێت. باسەکەی کە پێشکەشیکرد دژیەکی نێوان سەردەمی جەنگی سارد و ماوەی دوای جەنگی سارد بوو، هەروەها ئەو شێوازەی کە تیایدا سەردەمێکی مێژوویی بە کتوپڕی و یەکلایی کەرەوە ڕێگە بدات بە ئەوەکەی تر.

بێگومان، سپوتنیك کاتێ ناردرا زۆر بە گرینگی حیسابی بۆ کرا، بەڵام گرینگییەکەی دواتر بە تەواوی جیابوو لەوەی کە خاتوون فریدمان باسی لێوە کرد، چونکە پێشبڕکێی نێودەوڵەتی بە تەواوی جیا بوو. ئەمە ڕوویدا لە لوتکەی ململانێی نێوان ولاتە لیبراڵییە ڕۆژئاواییەکان، بە سەرکردایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان، هەروەها کەرتی کۆمۆنیست بە سەرکردایەتی یەکێتیی سۆڤیەت. لەو کاتەی نیشانە هۆشدارییەکان توند و ترسنا بوون: سپوتنیك دەرکەوت تاوەکو

سوودێکی سەربازی زۆر ببەخشێت بە لایەنی کۆمۆنیست. یەکێتیی سۆڤیەت، ڕۆژئاوا ترسا، دەستەبەری ئەو توانایەی کردبوو کە هێرشێکی وێرانکەر لە ئاسمانەوە بۆ سەر ئەمریکای باکوور بکات. لە وەڵامدا، ویلایەتە یەکگرتووەکان بەرگریان زیادکرد تویژینەوەی زانستیان خێراتر ئەنجامداو سوودیان لە پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا وەرگرت بۆ مەبەستە سەربازییەکان. حکوومەت هانی ئەو خێزانانەی دا ئاگاداری کردنەوە بۆ خەزنکردنی خۆراکی نێو قوتووەکان و بوتڵە ئاو لە نێو ژێرزەمینەکانیان، کە دەبێتە پەناگەیەك بۆیان لە کاتی ڕوودانی ئەم جۆرە هێرشانە.

خاتوون فریدمان نەك هەر تەنها یادگارێکی شەخسی لەمەڕ ئەو ڕووداوانەی نەبوو، هیچ یادگارێکی شەخسیشی لە بارەی بارودۆخە جیۆپۆلەتیکەکان نەبوو کە ڕوویاندا. لە ساڵی (١٩٨٨) دا لە دایك بووە، لە سەردەمێکدا ژیانی بردە سەر، سەردەمێك پڕ لە ڕکابەری گەورەی سەربازی و سیاسی و ئابووری بوو کە زاڵ بوو بەسەر زۆربەی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا، بەڵام لە کتێکدا ئەمانە لەناوچوو، بگرە هیچ ئاسەوارێکیشیان نەما.

بۆیە ئەمە دەوەستێتە سەر ڕێکردنی مێژوو. خاسیەتەکانی ڕووداوێکی مێژوویی، کاتێ ڕوودەدات زۆر گرینگن، بەڵام لە سەردەمێکی دواتردا گرینگی خۆیان لە دەست دەدەن، هەروەها لە کاتێکدا شتێك لە پەراوێزدایە، بەڵام کاتێکی تر یا دەیەك دواتر سەرەنجامی خۆی دەبێت.[*]

* باسێکی تر لە ڕکابەری چەژنی یا یادی مێژوودا ئەم خاڵەی ڕوونکردەوە. جەنگی کرایمینی ساڵی ١٨٥٤-١٦٥٦ وەك ئەو ساتە وەسفکرا کاتێك پەرستاری مۆدێرن بۆ یەکەم جار دەرکەوتن بۆ چاودێریکردنی سەربازە ئینگلیزە برینداڕەکان لە لایەن فلۆرێنسی ناتینگلی ستایشکراو. ڕۆڵی گرینگترین و پڕ یادگاریترین خاسیەتی ئەو ڕکابەریەیە لە دیدی سەدەی بیست و یەکدا. کاتێ جەنگەکە بەرپا بوو، هەر چەند، گرینگی ململانێیەکە دەکەوێتە سەر کاریگەرییەکەی لە سەر مەسەلە گەورەکانی سیاسەتی ئەوروپا، چارەنووسی ئیمپراتۆری شلۆقی عوسمانی مەبەست بوو. بەریتانیای گەورەو فەڕەنسا نیازیان ڕووخانی ئەو ئیمپراتۆرە بوو بە کەمترین دەرفەت، هەروەها ڕووسیا پەلەی کرد لەو بارەیەوە، گەر دەستی درێژ کردبا بۆ هەرێمەکانی نێو زلهێزەکانی ئەوروپا ئەوا شەڕێکی زۆر گەورە بەرپا دەبوو لە نێوانیاندا. سەدە و نیوێك دواتر، هەموو ئەوەی کەمایەوە بە پرسی ڕۆژهەڵات ناسرا، کە بوو بە پرسێکی زەق لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی نێو وڵاتانی ناوەوەی جیهان، هەندێ ناوچەی ڕۆژهەڵات پێك هاتبوون لە چەند پارچەیەك کە سەردەمێك لە ژێر دەستی عوسمانییەکاندا حوکم دەکران. لە پاش جەنگی جیهانی یەکەمدا، بەشێك لە یۆگسلافیاو کێشەکانی بۆسنیا و کۆسۆڤۆ زۆریان ئاژاوە نایەوە و بوون بە بەربەستێکی پۆلاین لە بەردەم سیستەمی نێودەوڵەتی.



گۆڕانی گرینگی سپوتنیك لە ڕوانگەی مێژووییەوە تەنها ئەوەی خستەڕوو چۆن بە خێرایی ئەم جۆرە گواستنەوەو گۆڕانکاریانە لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا ڕوودەدەن.

ئەو جیهانەی کە هەناردنی سپوتنیك تیایدا بە ڕووداوێکی زۆر پێشکەوتوو دانرا لە پێشبڕکێیەکی چەکداری ترسناکدا، هەرچەند ئەو ڕووداوە پێی نایە نێو دەیەی هەشتاکان، بە هۆی گۆڕانی سەدەکە، نزیکەی نموونەکەی خاتوون فریدمان بوو و تەمەنی دەگەڕێتەوە کاتی سستە مەزنەکەی بازاڕ یانیش شەڕی ناوخۆی ئەمریکا. بۆ ئەوان ڕووداوێکی شایەن بوو کە لە ڕێگەی دروستبوونی سیستەمی پەیوەندییەکان ئازارێکی زۆریان چەشت هەروەها لە پڕۆسەی گواستنەوەی ڕێگای بازرگانی کە ئەو کات مامەڵەی لەگەڵ کرا. گرینگی گۆڕانی سپوتنیك بە ئاشکرا گۆڕانی پێشداگیرکاری حکوومەتەکان دەردەخات لەگەڵ سەرەتای ململانێی گەورەی ئایدیۆلۆیا لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا لە پاراستنی سنوورەکانیان بۆ هاوکاریکردنی بەدیهاوردەی ڕەفاهییەت.

بردنەوەی خەڵاتی ناتالی فریدمان خاسیەتێکی بێگومانی جیهانی دوای جەنگی سارد دەردەخات: چەند جیا بوو لە جیهانی جەنگی ساردا. هەروەها پەیوەست بوو بە یەکێکی تر، زۆر جار مشتومڕ هەبوو لە نێوان هەردووکیاندا. بەڵگەی خستە بەردەست لە بەرژەوەندی ئەو بۆچوونەی کە جیهان شوێنێکی باشترو دڵخۆشترە لە پاش کۆتایی جەنگی سارد بە بەراورد لەگەڵ کاتی جەنگی سارد و پێشتریش.

بێگومان، دەیەیەك دوای ئەنجامی جەنگی سارد هەموو بەشێکی جیهان لە پڕۆسەی ژیانێکی خۆشدا نەبوون بە بەراورد لەگەڵ کاتەکانی پێش خۆیاندا. بەڵکو هەندێ ناوچە، هەندێ کۆمەڵگا، هەندێ گەل باری گوزەرانیان خراپتر بوو لە چاو پێشتر.. کۆتایی ململانێی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات جەنگی هێنایە بەڵکان. زۆربەی ناوچە ئەفریقییەکانی بە ئاژاوەتر کرد. ڕووسیای دوای کۆمۆنیست دژیەکی گەندەڵی توندتر کرد، ئەمەش بە پێی هەندێ خەملاندن، لە چاو ئەوەی کە وڵاتانی ناوەوەی جیهان سستە گەورەکەی بازاڕدا دووچاری بوونەوە. کەواتە جیهانی دوای جەنگی سارد باشترین جیهان نەبوو کە پێشبینی دەکرا. جیهانێك دەبێت کە تیایدا کۆمەڵگا سیاسییەکان بە قەد وڵاتانی ناوەوەی دیموکراسی و پیشەیازی ئازاد بە ئاشتی و بەخۆشی دەژیان. ئەمە لە دەوڵەتێکی سەرنجڕاکێش و پێشکەوتوودا، بەڵام نەك ئەو دەوڵەتەی کە دەکرا دانی پیا بنرێت لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا.

وێڕای ئەمە، لە ڕوانگەی مەسەلە لیبراڵییەکاندا، کە زیاتر جەخت لە سەر تاکدا دەکاتەوە تاکۆ، سیستەمە سیاسی و ئابوورییەکان و سیاسەتەکانی ئاسایش و دڵخۆشی بەخۆیان نابەخشن. بازاڕەکان دەرفەت دروست دەکەن بۆ ئابووری تاك، لە کاتێکدا دیموکراسی و ئاسایشی گشتی بەرەبەست ڕەق دەکەن بۆ دوو سەرچاوە: دڵساردی، ستەمکاری و جەنگ. لەگەڵ ئەوەشدا، قەناعەت یان هەتا هەستی زۆرینە مسۆگەر ناکرێت بۆ بەدیهاوردەی ئاواتەکانی تاك. دێرە شیعرێکی ساڵی سییەکان لە لایەن ویلیەم بوتلەریتس لە بارەی چارلس ستووەرت پارنێڵ، پاڵەوانی خەباتی سەربەخۆیی ئێرلەندا، ئەو خاڵەی دروستکرد کە سەربەخۆیی نەتەوەیی بە پێی پێویست جموجۆڵی ئابووری بەرەو پێشەوە نابات، خەڵکی وڵاتانی ناوەوەی جیهان کە حوکمدەکران لە لایەن هێزە ئیمپراتۆرییەکان دەرسێك فێربوو لە لایەن ملۆینەوە:

***پارنێڵ لە ڕێگاکەدا هاتە خوارەوە، بە پیاوێکی دڵخۆشی گووت***

***" ئێرلەندە ئازای خۆی بەدەست دێنێت و تۆش هێشتا خەریکی بەرد شکاندنی"***

ئێستاش، سەبارەت بە پەیوەندی نێوان جیهانی دوای جەنگی سارد و دڵخۆشی مرۆڤ ڕەنگە دوو دەرەنجام بەدیبێن. یەکەمیان بە واقیعی دڵخۆشییەوە دەست پێدەکات، لانی کەم لە ڕێگەی یەك پێناسە کە بەرهەمی مۆدێرنیتەیە. تا ئێستا وا دادەنرێت و وجودی ئیختیارێك لە نێو سەرنجام و ئەزموونە جیا جیا کانی ژیاندا، کە هەندێکیان گونجاون بۆ ئەوانی تر، دڵخۆشی تەنها بە دروستکردنی (کە بە ڕەوتی شۆڕشی فەرەنسی و پیشەسازی دانرا) بەدیل بۆ جیهانی تەقلیدی توند کە تیایدا ژیانی کەسێك دووبارەی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری باوانیەتی.(*) هەروەها لە سەرەنجامی جەنگی ساردا، هەرچەندە هەموو کەسێك لە کۆی شەش بلیۆن خەڵکی سەر ئەم ئەستێرەیە دڵخۆش نین، بۆ یەکەم جار لە سەردەمی مۆدێرندا سەرژمێرییەك لە سەر هەلومەرجی

* بێگومان، زۆر جار مشتومڕ لەسەر ئەوە کراوە کە بە پێچەوانەوە، مۆدێرنیتە دڵتەنگییەکی نوێ و جۆرە ژیانێکی ناوازی بە نێو جیهان ناساند لە ڕێگەی شکاندنی کۆتە توند و تەقلیدی و کۆمەڵایەتی و شلکردنەوەی کۆتەکانی خۆشی مرۆڤ. هەستی دڵتەنگی و بێ شوێنی و نە سازان، کە دورخێن پێی و وت ئەنۆمیا، مارکس ناوی لێنا نامۆیی، هەروەها فرۆید و جێگرەوەکانی وەك پسپۆرانی پزیشکی پەرەیان بەم چەمکەدا، تەنها لە سەردەمی مۆدێرندا دەرکەوتن. باخچەی ئیدن پاش هەموو شتێك شوێنێکی تەقلیدی و لادێی بوو. هەرچەندە ئەم مشتومڕە لە تیۆردا قەناعەت پێکەرە، بەڵام لە پراکتیزدا کەم و کوڕی زۆری هەیە.

لە سەدەی نۆزدە و بیستەمدا، داب و نەریت ڕێگای بۆ مۆدێرنیتە لە هەموو شوێنێکدا خۆش کرد.



ئابووری و سیاسی و ڕەوتە نێودەوڵەتییەکاندا کرا سەردەمی مۆدێرن زۆرترین کەس دڵخۆش و خۆش گوزەریان دەکرد. بۆ دڵخۆشی هەمووانیش لیبراڵیزمی تاك پێوەرێکی زیندووە.

دووەم دەرەنجام ئەمەیە: لە کاتێکدا سەرکەوتنی جیهانی ئاشتی و دیموکراسی و بازاڕی ئازاد کۆمەڵێك کێشەیان بۆ یەکتر ئاڵوگۆڕکرد، لە مەسەلەی خۆشگوزەرانی مرۆڤەوە، نەوەی نوێ خۆزگە بە کۆن دەخوازێت. جەنگ لە سەردەمە تەقلیدییەکاندا، وەك بۆنەیەك خزمەتی کرد لە خستنەڕووی هەندێ سیفەتی سەرنجڕاکێشی مرۆڤ: ئەوانیسش بوێری، هاوکاری کۆمەڵایەتی، خۆکردنە قوربانی بوون، بەڵام ئەمەش ئیفلیج بوو بە بەراورد لەگەڵ ئەو مردن و وێرانکارییەی کە جەنگ تووشی جێهانی مۆدێرنی کرد. بە هەمان شێوە، دیموکراسی هەندێ جار شلۆقییەکی ترسناك و هاوکات ئارامی هەیە کاتێ یەکەمجار دەناسرێت، بەڵام دیموکراسی جێگەی زۆردارانی سەدەی بیستەمی گرتەوەو بۆیەش ئازارەکانی مرۆڤ زیادی کرد. سەبارەت بە بازاڕی ئازادیش، کارە ئاساییەکانیان کاریگەری ناپێشوازیکراو لەگەڵ خۆیان دەهێننە ئاراوە. بازاڕ تێکدەچێت بازاڕی دیکە جێگەی پڕ دەکاتەوە. هێرش دەکاتە سەر ژینگە سروشتییەکان. کەرەستەی نایەکسان دروست دەکات و دەرخواردی ئیرەیی و تووڕەیی دەدات، بەڵام نەبوونی کارکردنی بازاڕی ئازاد دەبێتە هۆی هەژاری و توندوتیژی و نەخۆشی و ئیفلیجبوون. کەواتە، لەو شوێنەی کە دڵخۆشی بایەخی پێدەدرێت، دوو وڵاتی مێژووی مۆدێرن ئەوەیان خستەڕوو کە لە تەواوی سەر ڕووی زەمیندا، کە دووسەد وڵاتی خاوەن سەروەری و شەش بلیۆن خەڵکی تێدا دەژی، تاکە شتێك کە خراپتر بێت لە سەرکەوتنی ئەو ئایدیانەی کە دەستیان بەسەر جیهاندا گرت (ئاشتی و دیموکراسی و بازاڕی ئازاد) شکستی ئەمانە.